# دین و ژین

## له ژێر رۆشنایی راسپاردەکانی (رب العالمین)

فاتح مەلا رەسوڵ شارستێنی




چاپی دووەم

١٤٢٨کۆچی - ٢٠٠٧زایینی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قل تعالوا أتل ما حرم ربكم عليكم ألا تشركوا
به شيئا وبالوالدين إحسانا ولا تقتلوا أولادكم من
إملاق نحن نرزقكم وإياهم ولا تقربوا الفواحش ما
ظهر منها وما بطن ولا تقتلوا النفس التي حرم
الله إلا بالحق ذلكم وصاكم به لعلكم تعقلون *ولا
تقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن حتى يبلغ
أشده وأوفوا الكيل والميزان بالقسط لا نكلف
نفسا إلا وسعها وإذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا
قربى وبعهد الله أوفوا ذلكم وصاكم به لعلكم
تذكرون* وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا
تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم
به لعلكم تتقون﴾

الأنعام (151-153)

## ئەم کتێبە پێشکەشە بە:

دایك‌وباوکـــی ئازیزم کەهەموو ئاواتیان ئەوەبوو ببم بەخزمەتکارێکی ئەم ئیسلامە.

بەهـەموو ئەو مـامـۆستا خـــۆشەویستانەم کەلێیان سوودمـــەند بووم.

بەهاوسەری بەڕێزم (سێوەخان)و جگـــەرگــۆشەکانم (محمدو ئیبراهیم‌و ئاسودە).

مەلا فاتح

# پێڕست

| بابـــــــەت | لاپـــــەرە |
|---|---|

وەصیەتی سێیەم

﴿ وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾



وەصیەتی چوارەم

﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾

| بابـــــــەت | لاپـــــەڕە |
|---|---|

# پێشەکی

نحمد لله رَبّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين

خوێنەری بەڕێز: ئەم کتێبەی بەردەستت, زنجیرە ووتارێکە کە لەمینبەری مزگەوتی عومەری حەمەعەلی)یەوە لەشارۆچکەی پیرەمەگروون پێشکەش کراوەو بە (CD) زۆرێك لەگوێبیستانی لەمامۆستایانو خوێندکارانو ڕۆشنبیران بەباشیان زانی کەکۆبکرێنەوەو لەتوێی کتێبێکدا پێشکەش بەخوێنەرانی کورد زوبانی موسڵمان بکرێت. بەندەش, هەرچەندە ئەمەم بەکارێکی قورس زانی, چونکە زمانی قسەکردن لەگەڵ زمانی نووسین جیاوازی زۆرە, بەڵام پشتیوان بەخوای گەورە دەستم پێکردو سەرەنجام ئەم کتێبەی لێ دەرچوو. جا لەبەر ئەوەی ئەم زنجیرە ووتارە لەخزمەت قورئانی پیرۆز ـ ئایەتی ژمارە (151 ـ 153)ی سوورەتی (الأنعام)بوو کەپێی دەگوترێ (الوَصایا العَشْر) دە وەصیەتو ڕاسپاردەکەی پەروەردگار, ئەم دە وەصیەتەش بوارەکانی عەقیدەو بیروباوەڕو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو لایەنی ڕەوشت بەرزیو داوێن پاکیو بازاڕو ئابووریو چەند بابەتی تری تێدایە کەدەتوانین بڵێین ئەم دە وەصیەتە هەم باسی دونیایە هەم باسی قیامەتە, بۆیە ناوم نا (دینو ژین) بەئومێدی پتەوتربوونی بیروباوەڕو ئیمانو دینەکەمان وەخۆشی ژینەکەمان لەژێر ڕۆشنایی دینەکەماندا.

بەڵێ, بەفەزڵی خوا بابەتەکە ئامادەکرا, بەڵام دیارە چاپکردنو بڵاوکردنەوەی لەتوانای دارایی مندا نەبوو, بۆیە بەنووسراوی دەستنووس مایەوە, تا ئەوەبوو خێرخوازی ناوچەکەمان, جەنابی حاجی محەمەدی شارستێنی, ئامادەیی خۆی نیشان دا کە لەبواری خێری هاوکاریمان بکاتو نووسراوەکە بگاتە چاپخانە, خوای گەورە پاداشتی بداتەوەو تەمەن درێژو لەش ساغی بکاو کوڕەکانی تەمەن درێژ بکاو خوای گەورە زیاتری پێ ببەخشێو هەروا جێگادەستی خێرخوازی لەئاوەدانکردنەوەی مزگەوتو پرۆژە خێرییەکاندا زیاتر دیاربێو ئەم بەرهەمەش صەدەقەیەکی جاری بێ بۆیوماڵی ئاوابێ.

جا ئەوە ئێوەو ئەوە کتێبەکە, بەئومێدی ئەوەم کە خوای گەورە لێم قبووڵ بفەرموێو بیکاتە توێشووی قیامەتمو مایەی سوودگەیاندنبەموسڵمانان..

جا ئەگەر ئێوەی خوێنەریش مایەی ڕەزامەندیتان بوو ئەوە دوعای خێرمان بۆ بکەنو

خۆ ئەگەر هەڵەیەکیشتان بینی ئەوە لەمنەوەیەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام لێی بێبەرییەو مرۆڤیش لەهەڵە خاڵی نیە.

بەپێویستیشی دەزانم چەند تێبینییەك بخەمە بەرچاوی بەڕێزتان:

1 ـ هەندێ ووتار دووورودرێژە, کاتی خۆی لەووتارەکەدا لەوانەیە نیو ئەوەندە بووبێ بەڵام دوای نووسینەوەی و ـ الحمدُ لله ـ دەستکەوتنی سەرچاوەی زیاتر لەسەر ئەو بابەتە, گەیشتۆتە ئەو ئاستەو حەزیشم کردووە باسەکەو ووتارەکە بەتەواوی بنووسم و بەبەهانەی دووورودرێژی کورتی نەکەمەوە.

2 ـ لەدوای هەر وەصیەتێکدا سەرچاوەکانم نووسیوە, وەبەپێویستم نەزانی لەهەموو لاپەڕەیەکدا ئاماژە بەسەرچاوەکەو لاپەڕەکەی بکەم, چونکە ئەمە لەگەڵ شێوازی ووتارنووسیندا گونجاو نیەو بیری خوێنەر دەپچڕێنێ, ئەم بابەتەش لێکۆڵینەوە نیە تا سەرچاوەکان بەلاپەڕەو بەرگەوە دیاری بکرێ.

بەئومێدی ئەوەی ببێتە سوودی زۆر بۆ هەموو لایەك إنشاءَ الله ..

مەلا فاتح شارستێنی

شارۆچکەی پیرەمەگروون

2005 /8 /22

# وەصیەتی یەکەم

﴿ ألاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾

(الأنعام 151)

# ووتـاری یەکەم

## شیرکی هەرە گەورە

### بەشی یەکەم

قالَ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالى

﴿ ولَا تَـدْعُ مِـنْ دُونِ اللّـهِ مَـا لا يَنْفَعُـكَ وَلا يَـضُرُّكَ فَـإِنْ فَعَلْـتَ فَإِنَّـكَ إِذاً مِـنَ الظَّالِمِينَ وَإِنْ يَمْسسْكَ اللَّهُ بِضُرّ فَلا كَاشفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِنْ يُـرِدْكَ بِخَيْـرٍ فَـلا رَادَّ لِفَـضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾(يونس 106 ـ 107)

قالَ رَسُولُ آللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( لَعَنَ آللهُ آلْيَهُودَ وآلنَّصَارَى إِتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيائِهِمْ مَسَاجِدَ )( مُتفقٌ عليه)

قالَ شَيْخُ آلإسلام ـ إبنُ تَيْمِيَّة (رَحمَهُ آلله):

(إِنَّ آلـشِّرْكَ بِقَبْـرِ آلرَّجُـلِ آلَّـذِي يَعْتَقِـدُ صَـلاحُهُ أقـرَبُ إلى آلنُّفُـوسِ مِـنَ آلـشِّرْكِ بِخَشَبَةٍ, أو حَجَرٍ, ولِهذا تَجِدُ أَهْـلَ آلـشِّرْكَ يَتَـضَرَّعُونَ عِنْـدَها, وَيَخْـشَعُونَ, وَيَخْـضَعُونَ, وَيَعْبُدُونَ بِقُلُوبِهِمْ عِبَادَةً لا يَفْعَلُونَهُمْ في بُيوتِ آلله وَلا وَقْتَ آلسَّحَر. وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْجُدَ لَها. وَأَكْثَرُهُمْ يَرْجُونَ مِنْ بَرَكَةِ آلصَّلاة عِنْدَها, وآلدُّعاءِ ما لا يَرْجُونَهُ في آلْمَسَاجِدِ).

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِهِ أجمعين إلى يَومِ الدِّين ..

ئيماندارانی بەڕێزو خۆشەویست, سەلامو ڕەحمەتی خواتان پێشكەش بێ.

خۆشەویستانم: قورئانی پیرۆز هەمووی ڕەحمەتەو هەمووی مایەی هیدایەتی ئینسانەكانە, بەڵام بۆ كێ؟ بۆ ئەو كەسەی كەخاوەنی دڵێكی زیندوو و كراوەیە, خاوەنی عەقڵێكی سەلیمە, بەرچاوی ڕوونە.

بەڵێ ئەو قورئانەی مایەی ڕزگاركردنی ئینسانە لەتاریكیەوە بۆ ڕووناكی ﴿الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾( ابراهيم 1 ), واتە: ئەم قورئانە كتێبێكە ناردوومانە بۆ تۆ ئەی محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) تا خەڵكی لەتاریكی كوفرو سەرلێشێواوی (لەبەر ڕۆشنایی ڕێنموونەكانیەوە) بەویستی پەروەردگاریان بەرەو ڕێبازو بەرنامەی خوای باڵادەستو شایستەی سوپاسگوزاری ببەیت.

جا ئازیزانم: فەرموون با بەیەكەوە بچینە خزمەت قورئانی پیرۆز, بەڵام كاتێ دەچینە خزمەتی" دەبێ وەكو چۆن بەجەستەو بەرگی خاوێنەوە دەچینە خزمەتی, دەبێ بەهەمان شێوەش دڵیشمان خاوێن بێ, چۆن بەگوێی سەر گوێی بۆ دەگرین" بەگوێی دڵیش ئاگادار بین, لەمەیدانی كردەوەدا جێبەجێی بكەین, چونكە زانینی بێ كردەوە, دەبێتە بەڵگە (حُجَّة) بەسەرتەوەو ئەو كاتە قورئان شكاتت لێدەكات. بەڵام كاتێ گوێت بۆ قورئان گرتو ئەوەی بیستتو فێری بووی بەكردەوە لەژیانی ڕۆژانەتدا جێبەجێت كرد" ئەو كاتە قورئان شاهیدیت بۆ دەداتو دەبێتە شەفاعەتكار بۆت لەڕۆژی قیامەتداو, لەژیانی دونیاشدا دەبێتە ڕۆژی ڕووناككەرەوە بۆ ڕێنماییتو ڕزگاریت لەتاریكیی ژیان.

جا كاتێك ئێمە لەم كاتەدا دەچینە خزمەت قورئانو دەیكەینەوە, تەماشا دەكەین خوای گەورە" لەسوورەتی ئەنعام: ئایەتی (151)دا فەرمان بەپێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەكات كە بەئیمانداران ڕابگەیەنێ. كەواتە: ووتارەكەمان چوونە خزمەت پێغەمبەری خواشە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم. (اللهُ أكبَر) چەند گەورەیە! فەرموودەی رَبُّ العالَمين لەسەر زوبانی فَخرُ الأنْبياء وَالْمُرْسَلِين حەزرەتی محمدی ئەمین عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام

ئێمەی ئیماندار گوێ بیستی دەبین.

رەبیعی کوڕی خەیثم (رەحمەتی خوای لێبێت) بەکابرایەکی هاوڕێی خۆی گوت: (أيَسُرُّكَ أنْ تُؤْتى بِصحيفَةٍ منَ النَبيِّ صلَّى اللهُ عَليهِ وَسلَّم لَمْ يُفَكّ خاتمَها؟ قالَ نَعَمْ). رەبیع یەکسەر ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ألاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾(الأنعام 151 )، واتە: ئەی محمد صلَّى اللهُ عَليه وسلَّم پێیان بڵێ: خەڵکینە وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کەپەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان.

بەڵێ ئیمانداران، کاتێ تەواوی ئایەتەکە دەخوێنینەوە کەئایەتی ژمارە (151)ی سوورەتی ئەنعامە، دەبینن پێنج وەصیەتی تێدایە، ئایەتەکە باسی پێنج شت دەکات کەخوای گەورە لەسەر عەبدو بەندەکانی خۆی حەرام کردوون. دووبارە ئایەتی ژمارە (152)ی هەمان سوورەتیش چوار شتی تر لەقەدەغەکراوەکانی خوا باس دەکات. ئینجا ئایەتی ژمارە (153)ش قەدەغەکراوو حەرامکراوی دەیەمی تێدایە.

واتە سێ ئایەتی ژمارە (151 ـ 152 ـ 153)ی سوورەتی ئەنعام بریتیە لە (10) وەصیەتی خوای گەورە بۆ عەبدو بەندەکانی. جا بەڕاستی چاکترین ئامۆژگاریی و وەصیەتێك کەئینسان بەدڵ گوێی بۆ بگرێو بەقسەی بکاو فەرامۆشی نەکات" ئامۆژگاریی خوای پەروەردگارە کەخالقی ئینسانە، چونکە هەر خالق دەتوانێ ئامۆژگارییەکی وای ئینسان بکات کەکالآیەك بێ پڕ بەبالآی ئەو ئینسانە. جا کاتێك دەچینە خزمەت ئەو سێ ئایەتە قورئانییە کەئەو (10) وەصیەتو (10) شتە قەدەغەکراوانەمان بۆ باس دەکەن، دەبینین هەموویان جێبەجێ کردنەکەیان یەکسان دەبێ بەبەختەوەریی ژیانی دونیاو سەرفرازیی ڕۆژی دوایی بۆ ئینسان.

کەواتە با لەوەندە زیاتر چاوەڕێ نەبینو راستەوخۆ بچینە ناو باسەکەمانەوەو بزانین یەکەمین وەصیەتو ئامۆژگاریی خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالَى" یەکەمین قەدەغەکراوو حەرامکراوی لەسەر بەندەکانی چیە؟ لەخوا دەپاڕێمەوە کە بەڕەحمو بەزەیی خۆی منیشو ئێوەش بکات بەیەکێ لەعەبدە صالحەکانی خۆی، لەو کەسانەی کەئەم ئامۆژگارییانەی خوای پەروەردگار بەدڵو بەگیان وەردەگرنو

لەسایەو سێبەری وەصیەتەکانی خوای گەورەدا" لەدونیاو قیامەتدا لەغەزەبی خوا ئەمین دەبن.. أللّهُمَّ آمین.

ئازیزان: یەکەم وەصیەتی خوای گەورە" یەکەم شت کەخوای گەورە حەرامی کردووە لەسەرمان ئەوەیە کەدەفەرموێ ﴿ ألاَّ تُشْرِكُوا بِه شَيْئاً ﴾, واتە: هیچ شتێك نەکەن بەشەریكو هاوەڵ بۆی (بۆ خوا). کەواتە دەتوانین بڵێین یەکەم شت کەخوای گەورە داوای دەکات لەعەبدو بەندەکانی ئەوەیە کە: (یەکتاپەرست بن), ئەویش بەدوورکەوتنەوە لەشەریكو هاوبەش دانان بۆ خوا ـ خوا پەنامان بدات.

جا هاوبەش بۆ خوا دانان (الشِّرْك) بریتیە لەوەی کەبیروباوەڕت وا بێ کەخوای گەورە لەذاتو صیفاتیدا هاوبەشی هەیە. لەبەر ئەوە, شیرك پێچەوانەی تەوحیدو یەکتاپەرستیە. کەواتە: ئینسانی موشریك بڕوای بەخوا هەیە, بەڵام شەریكو هاوبەشێکیش بۆ خوا بڕیار دەدات, بەپێچەوانەی کافرەوە, چونکە کافر بڕوای بەبوونی خوا نیە (نَعوذُ بِالله).

لەبەر ئەوە, پێغەمبەری خوا صلّی اللهُ عَلَیه وَسلَّم کاتێ خوای گەورە کردی بەپێغەمبەر, بۆ ڕاستکردنەوەی عەقیدەی پووچو بەتاڵی خەڵکانی ئەو سەردەمە بوو کەبڕوایان وابوو کەخوا هەیەو لەئەرزو ئاسماندا دەسەڵاتی هەیە, ئەو خوایە ئینسانو ئەرزو ئاسمانی دروستکردووە, بەڵام لەهەمانکاتدا دەیانگوت: خوای گەورە شەریكو یارمەتیدەریشی هەیە لەهەڵسووڕاندنی کاروباری گەردووندا. ئەوانە بەمە خۆیان گومڕا کردبوو, ئەمە بیروباوەڕی ئەبوجەهلو ئەبو لەهەبەکان بوو وەکو قورئان بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِمَنِ الْأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ, سَيَقُولُونَ لِلَّه قُلْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ, قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ, سَيَقُولُونَ لِلَّه قُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ﴾(المؤمنون 84 ـ 87).

واتە پێیان بڵێ: باشە زەویو ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین" کێ خاوەنیانە ئەگەر زیرەكو هۆشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟! سەرەنجام هەر دەدان بەڕاستیدا دەنێنو دەڵێن: هەر خوا خاوەنیانە, هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە. ئەوسا پێیان بڵێ: جا ئەوە بۆچی یادەوەری وەرناگرن؟! پێیان بڵێ: ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیەو, کێ پەروەردگاری عەرشو تەختی فەرمانڕەوایی گەورەو فراوانە؟ (ئاسمانەکانو زەوی

لەبەرامبەر عەرشی پەروەردگاردا وەکو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لەپاڵ چیایەکی گەورەدا)، سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە. ئەوسا پێیان بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان لەخەشمو قینی ناپارێزن؟ ئاخر ئێوە لەکێ یاخی دەبن؟

جا خۆشەویستان: بەپشتیوانیی خوای گەورە، لەم وتارەدا باسی جۆرەکانی شیرک دەکەین، تا موسڵمانان لێی ئاگادار بنو خۆیانی لێ بپارێزن، چونکە شیرك لەهەموو گوناهێك گەورەترەو، خوای گەورە تەنها لەگوناهی شەریك بۆ خوا قەراردان خۆش نابێت، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّه فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً بَعِيداً ﴾(النساء 116)، واتە: بەڕاستی خوا هەرگیز خۆشنابێت لەوەی کەهاوەڵو شەریکی بۆ بڕیار بدرێت، وەجگە لەو (گوناه و گومراییە) لەگوناهانیتر بۆ هەرکەس کەشایستە بێتو (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت. بەڕاستی ئەوەی شەریكو هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات ئەوە زۆر گومڕایەو سەرلێشێواوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

بەڕێزان: شەریك بۆ خوا دانان سێ جۆری هەیە، یەکەم: شیرکی گەورە، دووەم: شیرکی بچووك، سێیەم: شیرکی شاراوە

## یەکەم: شیرکی گەورە

ئەمجۆرە شیرکە" خاوەنەکەی بەهەمیشەیی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەهێڵێتەوەو لەکۆمەڵی موسڵمانان دەریدەکات، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّه فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾(المائدة 72)، واتە: دڵنیابن کەئەوەی شەریكو هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات ئەوە خوا بەهەشتی لەسەر حەرام کردووەو شوێنو جێگەی ئەو دۆزەخە، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە. جا شیرکی گەورە لەم جۆرانە پێکدێت:

### هاوبەش بۆ خوا دانان لەدوعاو پاڕانەوەدا

ئەمجۆرە شیرکە بریتییە لەداواکردنو پاڕانەوە لەغەیری خوا بۆ ئەوەی رزقو رۆزیت زیادبکات، یان وەکو دەڵێن: مەقصوودی حاصڵ بکات. هەروەها نیەتی ناو دڵی ئەو کەسە وابێت کەئەو شتەی لێی دەپاڕێتەوە کاریگەری هەیە. بەواتایەکی تر" ئەو کەسە بڕوای بەخوا هەیەو دەزانێ کەخوا رازیقو شافییە، بەڵام لەهەمانکاتدا عەقیدەو باوەڕیشی وایە

کەئەو شتەش کەئەم داوای لێدەکاتو لێی دەپاڕێتەوە" دەنگی بەخوا دەگەیەنێ, چونکە (بەلایەوە) ئەم زۆر گوناهبارەو خۆی بەڕاستەوخۆ دەنگی بەخوا ناگات. جا جیاوازیی نییە ئەو شتەی کە مرۆڤ لێی دەپاڕێتەوە دارێك بێ, بەردێك بێ, گۆڕی پێغەمبەرێك یان زاناو خواناسو پیاوچاکێك بێ. چونکە کاتی خۆی کەموشریکەکان ئەو بتانەیان دەپەرست کە لەدارو بەرد دروستکرابوونو دەچوونە بەردەمیانو داوای رزقو فەڕو بەرەکەتو شیفایان لێدەکردن" لەبەر ئەوە نەبوو کەبڕوایان بەخوا نەبووبێت, بەڵکو دەیانووت: ئەم بتانە دەنگمان بەخوا دەگەیەنن, وەکو خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ﴾(الزمر 3), واتە: ئەو کەسانەی کەجگە لەزاتی (الله) کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانو دەڵێن: ئێمە ئەم بتو شتانە بۆیە دەپەرستین تا لەخوا نزیکمان بخەنەوە.

خۆشەویستان: بەنیسبەت چوونە سەر گۆڕو مەرقەدی پیاوچاکانەوە کە بەڕاستی تا ئێستاش خەڵکانێك هەن زۆر بەنەزانانە ئەو کارە ئەنجام دەدەنو (پەنا بەخوا) مەگەر خوا بەنەزانیی خۆیان بیانبەخشێ ئەگینا تووشی شیرکی گەورە دەبن. بۆ نموونە: زۆر کەس هەیە بەتایبەت خوشکانی بەڕێز" کاتێك تووشی نەخۆشی یەك دەبن, بۆ نموونە وەکو رۆماتیزمە کەپێی دەڵێن باداری, دەچنە سەر گۆڕی شێخی گەیلانی, یان گۆڕی شێخ ئیسماعیلی عەولان, یان گۆڕی کاك ئەحمەدی شێخ, هەزاران رەحمەتو بەرەکەتی خوا بەسەر گۆڕی پیرۆزیاندا برژێ, بەڕاستی هەموو ئومەتی ئیسلامی قەرزاری عیلمو زانستی ئەو شێرەپیاوانەی ئیسلامە, خوای گەورە بەلوطفی خۆی لەجیاتی موسڵمانان پاداشتیان بداتەوە. دەڵێین: زۆرجار بینیومانە کەسانێك بەدەوری گۆڕی ئەم پیاوچاکانەدا دەسووڕێنەوەو داروبەردیان ماچ دەکەنو هاواریان لێدەکەن کەدەبێ شیفام بدەی!! نارۆم تا چاکم نەکەیتەوە!! دەبێ بۆم لەخوا بپاڕێیتەوە کەمرادو مەقصوودم حاصڵ بێو.. لەم جۆرە قسانە!

تەنانەت بەچاوی خۆم بینیومە کەنامە نووسراوەو لەسەر گۆڕی پیاوباشێکی وەکو (پیرەمەگروون) دانراوە" کەداوای شتی وای لەو مردووە کردووە, ئەوە تەنهاوتەنها هەر بەزاتی (بێشەریکی) خوای گەورە سُبحانَهُ وَتَعالی ـ دەکرێت!!

جا ئیمانداران: تکایە واز لەم جۆرە کردارانە بێنن, گوێ بۆ فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بگرن قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَلا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنْفَعُكَ وَلا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذاً مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾(یونس 106)

واتە: هاناو هاوار نەبەیت بۆ کەسێك یان شتێك لەجیاتی خوا کە نەقازانجت پێ بگەیەنێ نە زەرەر (چونکە قازانجو زەرەر هەر بەدەست خوایە), خۆ ئەگەر کاری وا بکەیت ئەوە ئیتر تۆ لەریزی ستەمکاراندایت. وشەی (الظَّالِمِينَ) لێرەدا بەمانای (المُشرِكين) هاتووە. لەم ئایەتە قورئانیەدا, خوای گەورە بەئاشکرا ئاگادارمان دەکاتەوە کەهەر کەسێك داوای رزق‌وڕۆزیو چاکبوونەوەی نەخۆشیو لابردنی بەلاو موصیبەت لەغەیری خوا بکات ئەوە بەڕاستی هاوبەشی بۆ خوا بڕیارداوە.

خۆشەویستانم: با گوێ لەپێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بگرین, بزانین دەربارەی ئەو کەسانەی کەنوێژ لەناو مەرقەدی پیاوچاکاندا دەکەنو ڕۆژانی چوارشەممە" ژنو پیاو تێکەڵ دەبنو چەندین جۆر خواردنو میوە دەبەن بۆ سەر مەرقەدی فلان شێخو مەلاو وەکو سەیرانو ئاهەنگی لێدەکەن" با بزانین پێغەمبەری خۆشەویستمان لەم بارەیەوە چی دەفەرموێ؟ خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (ألا إنَّ مَنْ كانَ قَبلَكُمْ كانُوا يَتَّخذُونَ قُبُورَ أنبِيائِهِمْ مَساجِدَ, ألا فَلا تَتَّخذُوا القُبُور مَساجِدَ, فَإنِّي أنهاكُمْ عَنْ ذلِكَ)(رَواهُ مُسلِم), واتە: ئەی ئومەتم ئاگادار بن, ئەوانەی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکردە مزگەوت, بەڵام ئێوە گۆڕەکان مەکەن بەمزگەوت, چونکە من ڕێی ئەوەتان پێنادەم.

بەداخەوە کە بەچاوی خۆم" بینیومە کەموسڵمانی وا بووە لەو ژوورەدا کەگۆڕەکەی تێدایە, نوێژی بەرامبەر بەگۆڕەکە کردووە. بەڵام گوێ بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بگرە کەدەفەرموێ: (لا تَجْلِسُوا عَلى القُبُورِ وَلا تُصَلُّوا إلَيْها)(رَواهُ مُسلِم), واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشنو لەبەرامبەریدا نوێژ مەکەن.

بەڕێزان: ئەمجا با بزانین هەڵوێستی شەرع دەربارەی ئەو گومەزانەو دروستکردنی ئەو خانوانەی کە لەسەر گۆڕو مەزاری پیاوچاکاندا دروستکراون چیە؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لَعَنَ اللّهُ زائِراتِ القُبُورِ والمُتَّخِذينَ عَلَيْها المَساجِدَ والسُّرُجَ),

واتە: نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانە بێت کەسەردانی گۆڕەکان دەکەن, هەروەها نەفرەتی خوا لەو کەسانەش بێت کەگۆڕ دەکەن بەمزگەوتو چرای لەسەر دادەگیرسێنن یان وەکو ئەمڕۆ کە بەچاوی خۆمان دەبینین کارەبای بۆ رادەکێشنو گڵۆپی تێدا دادەگیرسێنن.

هەروەها ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)" بۆمان دەگێڕێتەوە کە: (أنَّ آلنَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم أمَرَهُ ألاَّ يَدَعَ قَبْراً مُشْرِفاً إلاَّ سَوَّاهُ) ( رواهُ مُسلِم)

دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسلَّم ـ ناردمی" فەرمووی: هەرچی گۆڕێکت بینی بەرزکرابۆوە تەختی بکە.

لەسونەنی ئەبو داوددا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم قەدەغەی کردووە کەجگە لەبەردو گڵی گۆڕەکە" زیاتر شتی تری تێدا بکرێ.

جابر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: (نَهى رسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم عَنْ تَجصيصِ آلقَبْرِ وَأنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ وَآنْ يُبْنَى عَلَيْهِ بِنَاءً)(رواهُ مُسلِم), واتە: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ـ قەدەغەی کردووە کەوا گۆڕ هەڵبەسترێ, یان لەسەری دانیشن, یان خانووی لەسەر دروست بکرێ.

هەروەها دەربارەی کۆبوونەوەی ڕۆژانی چوارشەممانو نان خواردن لەسەر گۆڕی پیاوچاکانو کردنی بەجەژنو ئاهەنگ" پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەفەرموێ: (لا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً, وَلا تَجْعَلُوا قَبْري عِيداً, وَصَلُّوا عَلَيَّ, فَإنَّ صَلاتَكُمْ تَبْلُغَني حَيْثُ كُنْتُمْ)(رواهُ أبو داود), واتە: ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕ ـ نوێژی سوننەت لەماڵەوە بکەن ـ گۆڕی منیش مەکەن بەجەژنگا ـ بەشێوەیەك بێن کە بەکۆمەڵ لەسەر گۆڕەکەم کۆببنەوە وەکو ئەوەی جەژن بگێڕن.

(باشە ئەمە ئەگەر لەسەر گۆڕی پیرۆزی حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دروست نەبێ ئەی چۆن لەسەر گۆڕی پیاوچاکانی ئومەتەکەی دروستە؟!) بەڵکو فەرمووی: صەڵاواتم بۆ بنێرن, لەبەر ئەوەی دڵنیابن کە لەهەر شوێنێکەوە صەڵاواتم بۆ بنێرن ئەوە دەمگاتیو خوای گەورە ئاگادارم دەکات.جا خۆشەویستانم ئێستا هەر لەئێوە دەپرسم: ئایا پیاوانێکی وەکو شێخی گەیلانیو.. هتد, ئەگەر ئێستا

زیندوو بوونایه" ئایا بەدەستی خۆیان ئەو گومەزو خانوانەی کە بەسەریانەوە کراوەو بەملیۆن دیناریان تێچووە" ئایا نەیاندەڕووخاندن؟! بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە بەڵێیە, چونکە ئەو پیاوچاکانە" خزمەتکاری قورئانو سوننەت بوونو بەموو لێیان لایان نەداوە.

گوێ بۆ شێخی گەیلانی بگرن بزانن چی دەفەرموێ؟ دەفەرموێ: هەر حەقیقەتێك شەریعەتی لەگەڵدا نەبێت ئەوە زەندیقایەتیە, بەدوو باڵی قورئانو سوننەت بەرەو لای پەروەردگار بفڕە. هەروەها هەموو جارێ بەموسڵمانانی دەفەرموو: شوێنکەوتووی قورئانو سوننەت بنو خۆتان لەخۆتانەوە شتی تازەبابەتو نامۆ دامەهێنن, گوێڕایەڵی قورئانو سوننەت بنو هەرگیز سەرپێچی مەکەن.

هەروەها دەیفەرموو: هەرکاتێ هەستت بەوە کرد لەهەندێك سنووری شەرعیی لاتداوە, بزانە ئەوە تووشی فیتنە بوویتو شەیتان یاریی پێکردووی, تا زووە بۆ لای حوکمی شەرع بگەڕێوەو دەستی پێوە بگرەو واز لەئارەزووەکانت بێنە, چونکە هەموو شتێك" ئەگەر شەرع شایەتیی بۆ نەدات ئەوە بزانە کەپووچەڵە.

بەڵێ ئیماندارانی خۆشەویست, ئەم شێخانە ئاوا پەیڕەوی قورئانو سوننەتیان کردووە, ئەوانە کۆلکەشێخ نەبوون, بەڵکو زۆر زۆر عالمو زانا بوون. بۆ نموونە: جارێکیان کابرایەك دێتە خزمەت شێخ عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کابرا کێشەی تەڵاق خواردنی هەبووە کە بەهیچ کام لەمەلاو زانایانی ئەو سەردەمە وەڵام نەدراوتەوە, پرسیارەکەشی ئەمەبوو: ئەو کابرایە سێبەسێ تەڵاقی خواردبوو کەدەبێ بەچەشنێکی وا خوا بپەرستێ کەکەس بەو شێوەیە لەو وەختەدا ئەو خواپەرستییە نەکا. جا کابرا سەری لێشێوابوو نەیدەزانی چی بکات, ئایا چ خواپەرستییەك بکات کەلەو وەختەدا کەسی تر ئەوجۆرە خواپەرستییە نەکات؟ کەپرسیارەکەی عەرزی شێخی گەیلانی کرد" شێخ کتوپڕ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: بچۆ بۆ مەککەو لەنیوەشەودا کەدەوری بەیت چۆڵوهۆڵە" داوا بکە لەو کاتەدا با کەس طەوافی کەعبە نەکاتو بۆ خۆت بەتەنیا حەوت جار طەواف بکە, ئەو کاتە تەڵاقەکەت ناکەوێ ! !

زانایانی عیراق هەموویان بەم وەڵامە سەریان سوڕمابوو, چونکە هەموویان لەوەڵامی

ئەو پرسیارەدا بێدەنگو کوڵەوار بووبوون (الطبقات الكبرى للشعراني، ص127).

أبـو الحـسَن النَـدوي لەکتێبەکەیـدا (رِجـال الفِكـر والـدَّعوَة) دەڵـێ شـێخی گـەیلانی فەرموویەتی: سوپاس بۆ خـوا کـەپێنج هـەزار گـاورو جوولەکـە لەسـەر دەسـتم موسـڵمان بوون‌و، زیاتر لەصەدهەزار پیاوخراپیش لەسەر دەستم تۆبەیان کردووە.

کەواتە هەموو ئەو کەسانەی کەپیاوچاکانیان خۆش دەوێ لەجیاتی ئەوەی بچن بەردو داری سەر گۆڕو مەرقەدەکەی ماچ بکەن" یا چاو لەڕێبازەکـەی بکـەن، شـاگردی ڕێگاکـەی عەبدولقادری گەیلانی بن، ئەولادەکانتان بخەنە بەر خزمـەتی ئـەو شـەریعەتەوە کەشـێخی گەیلانی ئاوا تێیدا شارەزابوو، وەکو ئەو ڕێنموونیی خەڵکی دوور لـەئاین بکـەن، بـۆ مـاڵی خواو بۆ ئاینی خوا، ئەگەر وەکو ئەویش گاورو جوولەکـە موسـڵمان ناکـەن مـەهێڵن مـاڵو منداڵەکانتان" کوڕو کچتان ببنە گـاورو جوولەکـە. بەداخـەوە زۆربـەی ئەوانـەی کەدەچـنە زیارەتی ئەو پیاوچـاکانە" ئـەو ئافرەتانـەن کەجلوبـەرگی گـاورو جوولەکـەیان لەبەردایـە، نەتانبینیون کاتێ دەچنە ژوورەوە لەگەڵ سترێجەکەیدا سەرپۆشێك بەسەریدا دەدا، بـەڵام کەهاتە دەرەوە لەمەرقـەد" سـەرپۆشـەکەی دادەنـێو دەیخاتـەوە نـاو جانتاکەیـەوە. ئایـا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەشەرم لەشێخ دەکات بەمردوویی بەڵام شەرم لەخوای شێخ ناکـات کە لەدەرەوەو لەناوەوە دەیبینێو، خوا بەئایەتی قورئانِ پۆشینی لەسەر واجبکردووە؟!

جا هەر ئەمە بۆ خۆی شەریك بۆ خوا بڕیاردانە، کەشەرم لەخواو لەئەمری خـوا ناکـەی بەڵام شەرم لەشێخێکی مردوو دەکەی، کەهەموو ژیانی ئەو پیاوە باشـانە بـۆ ئـەوە بـووە کەخەڵکان بەئەمرو فەرمانەکانی خوای گەورە ئاشنابکەن.

بەڕێزان، مەسـەلەیەکی تـر کەپێویـستە باسـی بکـەین ئەوەیـە کـەزۆر کـەس لەوانـەی سەردانی گۆڕو مەزاری پیاوچاکان دەکەن پـارە دەخەنـە نـاو مەرقـەدو سـەر گۆڕەکانیـان بەناوی خێرکردن‌و بەنیازی ئـەوەی کـەخاوەنی ئـەو گـۆڕە پێـی خۆشـەو داوای بـۆ لـەخوا دەکات کەشیفای نەخۆشیی بۆ بنێرێ، لەدواییشدا چەند کەسێك لەخزم‌و کەسـوکاری ئـەو خاوەن مەزارە" کـە بەداخـەوە لـەم سـەردەمەدا زۆربـەیان هـەر نوێـژیش ناکـەن" پارەکـە دەردێنن‌و لەنێوان خۆیاندا بەشیدەکەن. بەڕاستی ئـەم دیاردەیەشتێکیزۆر ناڕەوایەو شـێخی خواناسـی عـالم" کـاتی خـۆی کـە لەژیانـدا بـووە

ئەصڵەن پارەی لەخەڵك وەرنەگرتووەو بەسواڵ نەژیاوە, ئیتر دوای مردن پارەی خەڵكی بۆ چییە؟!

هەر شێخی گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: (من ئامۆژگاریتان دەكەمو لەبەرامبەریشەوە پاداشتم ناوێت, چونكە كرێی خۆم لای پەروەردگار وەرگرتووە). لەوەصیەتەكانیشیدا دەیفەرموو: (بەهۆی كاسپی دەستی خۆتەوە نان بخۆ, بەهۆی دینەكەتەوە نان مەخۆ, كاسپی بكەو تێبكۆشەو بخۆ, ئەمجا یارمەتیی خەڵكیش بدەو دڵنەواییان بكە).

بەڵێ, شێخ عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵانی گرانیی كە لەسەردەمی ئەودا بەسەر بەغدادا هات" كرێكاریی دەكردو پارەی كرێكارییەكەی دەدا بەنان, نانەكەشی بەسەر هەژاراندا دابەش دەكرد, خۆیشی گیای دەخوارد. كەپێشیان ووت بۆچی وا دەكەی؟ فەرمووی: (لەبەر ئەوەی من" پێش گرانی, مەعیدەی خۆمم بەو جۆرە گیایانە ڕاهێنابوو, بەڵام خەڵكی خۆیان لەسەر ئەو پەروەردەكردنە ڕانەهێنابوو).

بەڵێ ئیمانداران, بەرهەمی ئەم دڵپاكیو هەژاردۆستیو دڵ خاوێنی یە بووە كەئەو پیاوە باشانەی گەیاندۆتە ئەو ئاستەی كەكاتێ لەخوا پاڕاونەتەوەو دوعایان بۆ خۆیان یان بۆ خەڵكی كردووە" خوا لێی قبووڵ كردوون.

بۆ نموونە, كاك ئەحمەدی شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) كەهەموو ژیانی بەخزمەتكردنی زانستو خزمەتكردنی هەژارو بێنەوایان بەسەربردووە" جارێكیان پیاوێكی شارەزووری كەناوی (مام قادر) بوو" لەكاتی گەرمادا تا نوێژی عەسر خەریكی بێڵكاری دەبێ, بەهۆی ماندووبوونی لەڕادەبەدەرو تینوێتیی زۆرەوە هەردوو چاوی كوێر دەبێت. مام قادر كەیەكێك لەدۆستانو ناسیاوانی كاك ئەحمەدی شێخ دەبێت" هەر خێرا سواری وڵاخ دەبێو لەگەڵ كوڕەكەیدا كەناوی (مەعرووف) دەبێ" دێ بۆ شاری سلێمانی, مەعرووف دەچێتە خزمەتی كاك ئەحمەدو عەرزی دەكات: (قوربان, باوكم كوێر بووەو زۆر ناڕەحەتە, وا هاتووین بۆ خزمەت جەنابتو لەماڵە خزمێكدا دامناوە بەڵكو دوعایەكی خێری بۆ بكەی). كاك ئەحمەد خۆی دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (منیش زۆر دڵم بۆی سووتاو لەنیوەشەودا {صَلاةُ الحاجَة}م بۆ كردو زۆر لەخوا پاڕامەوە كەشیفای چاوەكانی

مـام قـادر بـدات. بـۆ سبەینێ کـەنزیك بـانگی بـەیانی بـوو" لەگـەڵ شـەبەقدا رۆیـشتم بـۆ مزگەوت, لەدەرگای مزگەوتدا چاوم بەمام قادر کەوتو پێم ووت: کەفارەتی گوناهـت بـێ, خەم مەخۆ, ئینشائەڵڵا تا من مابم نەفەقەی تۆ دەدەم)!

تەماشـا بکەن, کاك ئەحمەد چاوەڕێی پاداشتو سەرقەڵەمانەی دوعـای لـەمام قـادری داماو نەبوو, بەڵکو لەنیوەشەودا کەغەیری خوا کەس ئاگای لەکاك ئەحمەد نەبووە, لەگەڵ ئەوەدا کە لەخوا پاڕاوەتەوە شیفای چاوەکانی مام قادر بدات یەکسەر نیەتی دڵیشی ساغ کردۆتەوە کە لەسەر گیرفانی خۆی" بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە ئەم کابرا هەژارو نـەدارە بەخێو بکات تا مردنیو نەهێڵێ موحتـاجی دەسـتی کـەس بێـت, بەتایبـەتی لـەو زرووفـو زەمانەی ئەو کاتەدا کەهیچ دامودەزگایەك بـۆ یارمەتیـدانی پەککەوتـەو هـەژاران نـەبووەو باری ئابووریی خەڵکیش زۆر خراپ بووە.

کـاك ئەحمـەد دەفـەرموێ: مـام قـادر گـوتی: یاشـێخ مـژدە بـێ ئیمـشەو چـاوم چـاك بۆتەوەو لەزەمانی گەنجیەتیم باشتر چاوم دەبینـێ! دەفـەرموێ: منـیش بەبیـستنی ئـەم موژدەیـە گـەلێك سوپاسـی خـوام کـردو دوعـاو دروودم بـۆ گیـانی پـاکی پـڕ بەرەکـەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم نارد (کاك ئەحمەدی شێخ, ئەندازیار عُثمان محمد, ل 46).

بەڵێ بەڕێزان, ئەو پیاوچاکانە ئاوا نەك هەر چاوەڕێی خەڵاتو بەراتی خەڵکی نـەبوون کەبۆیان بـەرن" بـەڵکو هـەموو ئاواتیـان سـەرف کردنـی مـاڵی خۆیـان بـووە بـۆ خزمـەتی موسڵمانانی هەژارو داماو. جا کەسێك بەزینـدوویی تـەماعی لـەماڵی کەسـدا نـەبووبێ" تـۆ بڵێی دوای وەفاتی حەز بکات خەڵك پارە بخاتە سەر گۆڕەکەیو نەوەکانی لەدوای خـۆی" کـەهیچ پەیوەندیـیـەکیان لەگـەڵ دیـن نـەماوەو تـەنها بـۆ خۆژیانـدن ئیـشیان بـەباوكو باپیرانیانە" دەڵێین تۆ بڵێی ئەوانە حەز بکەن پارە بەو جۆرە کەسانە ببەخشی؟!

کەواتە هەرگیز پارەی خێر مەخەرە ناو مەرقەدەوە, بەڵکو بـەنهێنی بیخـەرە دەسـتی هەژارێکی موستەحەقەوە کەسواڵی پێ ناکرێ, ئەمەیان دەبێتە مایـەی ڕەزامەنـدیی خـواو لادانی بەڵاو موصیبەت لێتو هاتنی شیفا بـۆ نەخۆشـییەکەت.بـەڵێ بـاوەڕداران, زۆر شـت هەیە لەناو میللەتی ئێمەدا دەکرێو خەڵکانێك هەن باوەڕی تەواویان بەڕاسـتیی ئـەو شـتە هەیە, کەئەمەش 100٪ شیرکی گەورەیەو خاوەنەکەی پێی دەبێتە موشـریكو مـاڵوێرانی

دونیاو قیامەتی دەکات. بۆ نموونە، لەناو ئافرەتاندا قسەیەکی باو هەیە کەدەڵێ: ئەگەر ئافرەتێك حامیلە بێو بەلای گۆڕی پیاوچاکێکدا بڕوات، یان بۆ ئەوەی منداڵی ببێ بچێتە سەر گۆڕی پیاوچاکێك" دوایی کەمنداڵەکەی بوو" ئەگەر خاڵێکی سوور بەلەشیەوە بوو دەڵێن ئەوە مۆری فلان شەخصو پیاوچاکی پێوەیە! واتە (پەنا بەخوا) ئەو پیاوچاکە ئاگای لەدروست بوونی منداڵەکە هەبووە بۆیە نیشانەو عەلامەتی خۆی پێوەناوە!

کەبەڕاستی ئەمە شیرکێکی صەریحەو هاوبەش بۆ خوا دانانی هەرەگەورەیە. خوای گەورە هەرگیز لەو کەسە خۆش نابێت کەخاوەنی ئەو بیرو بڕوایەیە، چونکە خالیق هەر الله یەو غەیری خوا توانای خەڵق و دروست کردنی باڵەمێشوولەیەکی نیە. یان ئەو کەسانەی کەدەچنە سەر گۆڕو داوای کوڕو کچی لێ دەکەن وەکو ئەو قسەیەی کەدەڵێ: (بابەگوڕگوڕ، بەگوڕ هاتم، بۆ کوڕ هاتم)، ئەمەش شەریك بۆ خوا دانانی گەورەیە.

جا خۆشەویستانم، دەبێ موسڵمان زۆر بەئاگا بێ لەوەی کە بەهۆی ئەمجۆرە بیروباوەڕە خوڕافیاتانەوە تووشی شیرك ببێتەوە، چونکە کاتی خۆی کەبتپەرستی دروست بوو، هەر لەئەنجامی بەگەورەگرتنی پیاوباشان و خواناسان بوو زیاد لەسنووری خۆی، چونکە لەزەمانی حەزرەتی ئادەمەوە تاوەکو حەزرەتی نووح" هەموو خەڵکی یەکتاپەرست بوون و موشریکێکیان تێدا نەبووە. لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەئبن عەباس(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: (نێوان ئادەم و نووح دە سەدە بووە، هەرهەموویان لەسەر ئیسلام بوون)، ئەی باشە یەکەم جار بتپەرستی لەچیەوە پەیدابوو؟! دووبارە لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کە: ئبن جورەیج لەعەطاوە ئەویش لەئبن عەباسەوە" لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا کەدەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا لا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلا تَذَرُنَّ وَدّاً وَلا سُوَاعاً وَلا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْراً ﴾(نوح 23)، واتە: وتیان خەڵکینە نەکەن واز لەخواکانتان بێنن!! نەکەن واز لە ( وَدّ و سُواع و يَغُوث و يَعُوق ونَسْر ) بێنن. ئبن عەباس(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: ئەم ناوانە" ناوی هەندێ پیاوچاکی گەلی نووح بوون و زۆریش نزیکی حەزرەتی نووح بوون، کاتێ کەمردن و وەفاتیان کرد" شەیتان هات بۆ لای خەڵکەکەو قەناعەتی پێکردن کە لەمەجلیسی دانیشتن و دیوەخانەکاندا پەیکەریان بۆ داتاشن و بەناوی ئەوانەوە ناویان بنێن. بۆ نموونە: ئەوە نەزرگای سواعە، فیعلەن

شەیتان ئەم ئیشەی پێکردن‌و بتەکانیان دروستکرد, بەڵام نەیاندەپەرستن. بەڵام کاتێ ئەو نەوەیە مردن‌و زانست‌و دینداریيان بەرەو لاوازی چوو" نەوەی دوای ئەوانە" بتەکان کە لەسەر شکڵی ئەو پیاوچاکانە دروستکرابوون پەرستیانن‌و دەچوونە لایان‌و داوای کوڕو کچ‌و شیفای نەخۆشی‌و رزق‌وڕۆزییان لێدەکردن, بەنیازی ئەوەی کەئەمانە کاتی خۆی پیاوچاك بوون‌و لەخوا نزیك بوون‌و دەتوانن قسەو داواکارییەکانی ئەمان بگەیەنن بەخوا. بەم شێوەیە, ئەمە یەکەم لاڕێ بوون بوو لەمێژووی مرۆڤایەتیدا, جا ئیشی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) راستکردنەوەی ئەم بیروباوەڕە چەوت‌و گومڕاکەرە بوو.

هەروەها بتپەرستی لەناو عەرەبەکانی مەککەو مەدینەشدا هەر لەئەنجامی لەڕادەبەدەر رێزلێنانی پیاوباشان‌و خێرەومەندانیانەوە بوو. بۆ نموونە: یەکێك لەو بتانەی کە لەناو مەککەدا دەپەرسترا" ناوی (لات) بوو. (لات) کاتی خۆی پیاوێك بووە لەطائف ئاردی گەنم‌و جۆی لەسەر بەردێك بۆ حاجییەکان دەکرد بەهەویر. کاتێ کەمرد (عەمری کوڕی لیحیی) کەکابرایەکی دەوڵەمەندو دەسترۆیشتووی ناو مەککە بوو" لەکاتی حەجدا نان‌و بەرگی زۆری بەحاجیان دەبەخشی. ئەم عەمرە گوتی: (لات) ئەو پیاوە چاك‌و خێرەومەندە نەمردووە بەڵکو چۆتە ناو ئەو بەردەوەو خۆی لەخەڵك شاردۆتەوە, کەواتە پێویستە بیپەرستین‌و داوای شتی لێ بکەین. ئیتر بەمجۆرە ئەو بەردە بوو بەبت‌وپەرسترا.

دەگێڕنەوە کەهەر ئەو عەمرەی کوڕی لیحیی بوو کەدروشمی (لَبَّيْكَ)ی گۆڕی, کەهەر لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمەوە (عَلَيْهِ آلسَّلام) تا ئەو کاتە هەر بەمجۆرە بوو (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك. لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ). جارێکیان عەمر بەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوەو لەبەیکەی دەووت, لەو کاتەدا شەیتان خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێکی پیرو لەگەڵ عەمردا (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك)ی دەگوت, عەمر گوتی: لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ, پیاوی پیر گوتی: (إِلاَّ شَرِيكاً هُوَ لَكَ). عەمر ئەم قسەیەی پێناخۆش بوو, گوتی: ئەمە چییە؟ چۆن خوا شەریکی هەیە؟! شەیتان کە لەشکڵی پیرەمێردەکەدا بوو گوتی: بڵێ (تَمْلُكُهُ وَما مَلَكَ), ئەوە بڵێ ئاسایيە. عەمریش بەقسەی کردو دەنگی لێ هەڵبڕی‌و خەڵکەکەش لەگەڵیدا طوافی کەعبەیان دەکرد, چونکە عەمر ریش سپی‌و پیاوماقووڵی ناویان بوو, لەگەڵ ئەوەدا (إِلاَّ شَرِيكاً هُوَ لَكَ)یان ووتەوەو هاوبەشیان بۆ خوا بڕیاردا. کەواتە شەیتان پێی نەدەوتن خوا

نیە, بەڵکو دەیووت بڵێن خوا هەیە بەڵام شەریكو یارمەتیدەری هەیە. ئینجا هەر لەم ڕێگایەوە بەدرێژایی مێژوو خەڵکانی لەڕێگای تەوحیدو خوا بەیەکناسی لاداوەو گومڕایکردوون.

بەڵێ ئیمانداران, مێژوو بۆمان باس دەکات کەسەرەتای بتپەرستیو دارو بەرد پەرستی لەلای عەرەبەکانی نیوەدوورگە لەوەوە بوو کەئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییان بۆ داروبەردی کەعبە دەردەبڕی, وەکو ئبن ئیسحاق بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: سەرەتای لاڕێبوونی عەرەب لەنەوەی پێغەمبەر ئیسماعیلەوە کەچۆن تووشی بەردپەرستی بوون" ئەوەبوو لەسەرەتادا کەعبەیان زۆر پێ گەورە بووەو بەجێیان نەدەهێشت تا ژمارەیان زۆربوو و جێگایان تەنگ بوو, جا هێدی هێدی بەڕووی زەویدا بڵاوەیان دەکرد تاوەکو جێگای نیشتەجێبوونیان فراوان بێ. جا هەرکەسێك مەککەی بەجێدەهێشتو لەکەعبە دووردەکەوتەوە بەردێکی لەکەعبە هەڵدەگرتو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد, لەبەر ئەوەی بەلایانەوە پیرۆزو گەورەبوو. جا لەهەر جێگایەك هەواریان هەڵبدایە بەردەکەیان لەوێ دادەناو بەدەستووری تەوافی کەعبە بەدەوریدا دەسووڕانەوە, پاشان هەر بەردێکی تریان پێ جوان بوایە ئەویان دەپەرست.

جا تەماشاکەن, سەرەتا لەخۆشویستنو ڕێزگرتنی لەڕادەبەدەری شتێکی پیرۆزەوە دەستی پێکردووە, پاشان گەیشتۆتە ئاستی پەرستن, هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەردەوام ئومەتەکەی ئاگادارکردۆتەوە کەتووشی ئەو هەڵە گەورانە نەبنو جارێکی تر شیركو بتپەرستی لەناو ئومەتەکەیدا بڵاونەبێتەوە.

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: لەکاتی نەخۆشی یەکەی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" ئوم سەلەمەو ئوم حەبیبە (کەهەردووکیان چووبوون بۆ وڵاتی حەبەشە) باسی کەنیسەیەکیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسلَّم کە لەحەبەشە بینیبوویان پێی گوتراوە (ماریە), گوتیان بەڕاستی زۆر جوان دروستکرابوو و بەجوانترین شێوە وێنە لەسەر دیوارەکانی دروستکرابوو. عایشە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم یەکسەر سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (أُولئِكَ إِذا كانَ فيهِمُ ٱلرَّجُلُ ٱلصَّالِحُ بَنُوا عَلى قَبْرِهِ مَسْجِداً, ثُمَّ صَوَّرُوا تِلْكَ ٱلصُّوَر, أُولئِكَ شِرارُ ٱلْخَلْقِ عِنْدَ ٱللهِ

يوم ٱلقيامَة)(رواهُ البُخاري ومُسلِم), واته: پێغەمبەری خۆشەویست عَلَیْـه ٱلـصَّلاةُ وٱلـسَّلام فەرمووی: ئەوانـە ئەگـەر پیاوچـاکێكو خواناسـێکی گـەورە لەناویانـدا بمردایـە" دەچـوون مزگـەوتیان لەسـەر قەبرەکـەی دروسـت دەکـرد, پاشـان دەهـاتن ئـەو وێنانـەی کـەئێوە بینیوتـانن (کەوێنـەی پیاوچـاکەکەیە) لەسـەر دیوارەکـانی دروسـتیان دەکـرد, ئەوانـە خراپترین دروستکراوی خوای گەورەن لەرۆژی قیامەتدا.

بەڵێ خۆشەویستان, ئەمە گرنگیی ئەم باسە دەردەخات کەوا پێغەمبـەری خـوا صـلّی الله عَلَیـه وَسَـلَّم" لـەو کـاتی نەخۆشـییەیدا کـەگوێی لەخێزانـە بـەڕێزەکانی بـوو کەسەرسوڕمانیی خۆیـان دەردەبڕن لـەبارەی جـوانیی ئـەو کەنیسەیەوە کـە لەحەبەشـە بینیبوویـانو لەسـەر گـۆڕی پیاوچـاکێك دروسـتکرابوو و وێنەکەیـشی لەسـەر دیوارەکـانی دروستکرابوو, بەو نەخۆشییەو ئازارەوە هەستا فەرمووی: ئەوانە خراپترین خەڵقی خـــوان لەرۆژی قیامەتدا, وەکو ئەوەی بفەرموێ: نەکەن ئێوەش ئەو هەڵە گەورەیە بکەنو قەبری مـــنو زانایـــانو چـــاکانو پاکـــانی ئومـــەتم" مزگـــەوتی لەســـەر دروســـت بکـــەنو وێنـــەکـــەیان هەڵواسن.

پێشەوا ئبن حەجەری هەیثمي (ڕەحمەتی خـوای لێبێـت) لەلاپـەڕە (326)ی بـەرگی یەکەمی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (الزَّواجِر عَن ٱقتِراف ٱلكَبائِر) دەفەرموێ: گوناهی گـەورەی ژمارە (93 ـ 94 ـ 95 ـ 96 ـ 97 ـ 98) ئەمانەن: (إتِّخاذ ٱلقُبُورِ مَساجِدَ, وَإِيقـاد ٱلـسُّرجِ عَلَيها, وَٱتِّخاذها أوثاناً والطَّوافُ بِها, وَاسْتِلامِها, وَالصَّلاة إِلَيها).

واتە: قەبر کردنە مزگەوت (کە لەسەر قەبرەکە مزگەوت دروست بکرێت)و داگیرساندنی چراو گڵۆپ لەسەریو, کردنی بەبت بەوەی وەکـو بتپەرسـتەکان داوای شـتی لێ بکـرێ بـۆ بەدەست هێنانی قازانجو لادانی زەرەرو, سووڕانەوە بەدەوری قەبرداو دەست لێدانو مـاچ کردنیو نوێژکردن بەرامبەر قەبر). بەڵێ ئبن حەجەری هەیثمـي" ئەمانـەی هـەموو لـەڕیزی گوناهــە گەورەکانــدا ژمــاردن.ئیمــامی قــورطــوبــیش لەلاپــەڕە (38)ی بــەرگی دەیــەمی تەفسیرەکەیدا دەفــەرموێ: (قـالَ عُلَماؤُنـا: وَهـذا يُحـرِّم علـى المُسلمينَ أنْ يَتَّخـذُوا قُبُـور ٱلأنبِياء والعُلَماءِ مَساجِدَ). واتە: زانایانمان فەرموویانە: حەرامە لەسەر موسڵمانان کەگۆڕی پێغەمبەرانو زانایان بکەن بەمزگەوت.

هەروەها ئیمام ئبن قەیّم لەلاپەرە (571 ـ 572)ی بەرگی سێیەمی کتێبەکەیدا (زاد المعاد) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسلَّم چۆن (مَسجِد الضِرار)ی سووتاندو فەرمانی کرد بەڕووخاندنو تێکدانی" لەکاتێکدا کەمزگەوت بوو و ناوی خوای تێدا دەبرا, چونکە بوونی ئەو مزگەوتە بووبووە مایەی ئاژاوەو جیاوازی خستنە نێوان ئیمانداران و بووبووە مۆڵگەی دووڕووەکان. ئیمام ئبن قەیّم دەفەرموێ: جا بەهەمان شێوە هەر جێگایەك ئەوە حاڵوباڵی بێو ببێتە مایەی فیتنەی دینو دونیا بۆ موسڵمانان پێویستە پێشەوای ئیمانداران یەکێ ئەو شوێنە بخاو لەناوی بەرێ" ئیتر یان بەڕووخاندن, یان بەسووتاندن, یان بەگۆڕینی شێوەکەیو دەرکردنی لەو بارەی کەتیایەتی. پاشان ئبن قەیّم دەفەرموێ: (وَإذا كانَ هذا شَأْنُ مَسْجِدِ آلضِّرار, فَمَشاهِد آلشِّرك آلّتي تَدْعُوا سَدَنَتها إلى إتِّخاذ مَنْ فيها أَنْداداً مِن دونِ آللهِ أحَقُّ بِالْهَدمِ وَأوْجَب), واتە: ئەگەر ئەمە حاڵی مزگەوتی (ضرار) بێ ئەوە ئەو شوێنانەی کەبوونە هۆی بتپەرستی بەهۆی ئەو گۆڕانەی کەخاوەنەکانیان لەجیاتی خوا دەپەرسترێن (داوایان لێدەکرێ بۆ کوڕو کچو شیفای نەخۆشی) ئەوا ئەو شوێنانە لایەقترن بەڕووخاندن, بەڵکو لەمزگەوتی (ضرار) واجبترە کەبڕووخێنرێن.

خۆشەویستانم: گەورەترین خەڵاتی خوا بۆ ئێمەی عەبدو دروستکراوی خۆی ئەوەیە کەبووینەتە هەڵگری شەهادەی (لا إلـهَ إلاّ آللهُ وَمُحَمَّد رَسُولُ آلله), جا گەورەترین تاوان کەئینسان بەرامبەر بەخۆی بیکات ئەوەیە کەئەو خەڵاتە گەورەیە لەدەست خۆی بداتو ئەو شایەتمانەی کەمایەی رزگاربوونیەتی لەدۆزەخ" هەڵیبوەشێنێتەوە. جا یەکێك لەو شتانەی کە (لا إلهَ إلاّ آلله)و یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە بریتیە لەوەی کەئینسان لەبواری دوعاو پاڕانەوەو داوا لێکردندا شەریك بۆ خوا بڕیار بدات, وەکو شێخ محەمەد عەبدولوەهاب باس لە (10) شت دەکات کەپێیان دەووترێ هەڵوەشێنەرەوەکانی (لا إلـهَ إلاّ آلله), دەفەرموێ کەیەکێ لەوانە: هەرکەسێك داوا لەمردوویەك بکات (بۆ بەدەست هێنانی قازانجێك, یان لابردنی زەرەرێك), یان هیوا پێبوونو پشت بەستن بەمردوو, یان دڵ پەیوەست بوون پێوەی, یان خۆشویستنی وەکو خۆشویستنی خوا, یان چەمینەوەو ملکەچ کردن لەبەرامبەریدا, یان سووڕانەوە بەدەوری گۆڕدا, یان حەیوان سەربڕین بۆی,

یان هاوشێوەی ئەمانە لەجۆرەکانی پەرستش (عیبادەت)، دەفەرموێ هەرکەسێ ئەمانە بۆ غەیری خوا ئەنجام بدات ئەوا شەهادەتەکەی بە (لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَمُحَمَّد رَسُولُ اللهِ) بەتاڵ بۆتەوەو بۆتەوە بتپەرست (صحيح وصايا الرَّسُول، ج 1، ص36).

بەڵێ ئیمانداران، ئەمە بەشی یەکەم بوو لەشیرکی گەورە کەبریتی بوو لەهاوبەش بۆ خوا دانان لەدوعاو پاڕانەوەو رێز لێگرتندا.. خوای گەورە بەلوطفی خۆی هەموو لایەکمان لەم جۆرە شیرکە بپارێزێ. ئامین.

خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم" بەردەوام بەبیری صەحابەکانی دێنایەوەو دەیفەرموو: (جَدِّدُوا إيمانَكُمْ)، واتە: ئیمانەکەتان تازەبکەنەوە. صەحابەکانیش دەیانفەرموو: چۆن چۆنی ئیمانەکەمان تازە بکەینەوە؟ پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەیفەرموو: (أكْثِرُوا مِن قَولِ لا إلهَ إلاَّ اللهُ)، دەیفەرموو: زۆر بڵێن لا إلهَ إلاَّ اللهُ (رواهُ أحمد والطَبَراني بإسنادٍ حَسَن).

بەڵێ بەڕێزان، بەم شێوەیە پێغەمبەری خۆشەویست عَلَيهِ الصَّلاة وَالسَّلام" هەرچی دەرگاو رێگا هەیە کەدەستی ئینسان رابکێشێ بۆ شیرکو بۆ ئەفسانەو بۆ شەیتان پەرستی، دایخستووەو هەر رێگاو دەرگایەکیش دەستمان بگرێ بەرەو خوا" بەرەو یەك خوا پەرستی، بەرەو بەهەشت، بەرەو سەربەرزیو ئازادیی دونیاو قیامەت، فێری کردووینو دەستی بۆ لا گرتووین.. سەلامو رەحمەتی خوا لەو پێغەمبەرە خۆشەویستە بێ.. وەفایش ئەوەیە کەئێمەش لەسەر نەخشەو بەرنامەی ئەو بڕۆین، چۆن ئەو دەیفەرموو لا إلهَ إلاَّ اللهُ، چۆن لەگەڵ لا إلهَ إلاَّ اللهُ معامەلەی دەکرد" ئێمەش ئاوا بڵێین لا إلهَ إلاَّ اللهُ، تاوەکو لا إلهَ إلاَّ اللهُ ببێتە دروشمو شیعار لەدڵماندا" لەدەمارو خوێنماندا رەنگ بداتەوە، ببێتە چرای قەبرەکەمانو ببێتە پسوولەی شەفاعەتی لای پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم و ببێتە بیطاقەی چوونە ناو بەهەشتمان. ئەگینا بەدەم بڵێیت لا إلهَ إلاَّ اللهُ و کەچی بەدەوری قەبردا بسووڕێیتەوە حەیوانی بۆ سەربڕیو داوای ئەوە بکەی لەو عەبدە هەژارە کە بەخوا نەبێ ناکرێ، ئەوە پەنا بەخوا" ئەگەر نوێژیش بکەیتو بێیتە مزگەوتو حەجی ماڵی خواش بکەیتو هەر ناوێکی ئاینیت لەسەر بێ" دەچی بۆ جەهەنەم.

ئومێد دەکەم خوای گەورە ئومەتی ئیسلام بپارێزێ لەهەموو بەلایەك, لەهەموو گومڕایی‌و بەدبەختی‌و کوێرەوەرییەکی دونیاو قیامەت, بەتایبەتی لەشیرك‌و قەبرو داروبەرد پەرستی‌و داواکردن‌و پاڕانەوە لەغەیری خوا.

یارەبی خوایە: (أغْننا بِفَضْلكَ عَمَّنْ سِواكَ, وَاكْفنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامكَ, وَاجْعَلْ رَغْبَتَنا فيما لَدَيْكَ, يا حَيُّ يا مَنَّان .. يا رحِيمُ يا رَحْمن)

# ووتـاری دووەم

## شەریك بۆ خوا دانـانی گەورە

**بەشی دووەم**

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ ولَقدْ أُوحِيَ إلَيْكَ وَإلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ولَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ، بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾( الزُمَر 65 ـ 66 ).

قالَ رسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

(مَنْ ماتَ يشرِك باللهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّار) (رَواهُ البُخاري) .

قالَ الشَّيخ مُحمد إقبال لاهوري:

(سَجْدَةٌ لله الأحَدِ تُنْجيكَ مِنْ ألْفِ سَجْدَةٍ للعَبيدِ)

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصّلاةُ والسّلامُ على سَيّدنا مُحَمّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدّين..

موسڵمانەکان: سەلام‌و ڕەحمەتی خوا لەهەموومان بێت. لەوتاری ڕابردوودا باسی شیرکی گەورەمان کرد, بەشی یەکەممان لەشیرکی گەورە باسکرد کەبریتی بوو لەشەریك بۆ خوا بڕیاردان لەبواری پاڕانەوەو دوعاو داوای یارمەتیکردن لەغەیری خوا. پشتیوان بەخوای گەورە, لەم وتارەدا باسی جۆری دووەم لەشیرکی گەورە دەکەین کەبریتییە لە: (هاوبەش بۆ خوا دانان لەگوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرێتیدا), واتە: یەکسانکردن‌و دانانی غەیری خوا لەگەڵ خوادا لەیاسادانان‌و حوکم‌و فەرماندا. کەحوکم دانان‌و یاسادانانیش تەنها مافی خوایە, وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾(الأنعام57).

کەوابوو هەرکەسێك بڵێ: دین‌و دەوڵەت لەیەکتری جیابکرێنەوە, یان لەقانوونی وولاتدا با هەندێکی لەئیسلام وەرگیرێ‌و هەندێکی لەقانوونی فەرەنسی, یان دین هەر بۆ چوارچێوەی مزگەوتەو نابێت بچێتە سەر مێزی مەحکەمە, یان دەبێ حەڵاڵ‌و حەرام بەپێی دەنگداتی پەرلەمان بێت.. ئەمە شەریك بۆ خوا دانانی هەزەگەورەیەو هەرکەسێکیش بەم قسانە ڕازی بێ" دەبێت بەموشریك, لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی تۆ ڕازی بی کەخوای گەورە دەستووری دەسنوێژو نوێژو جومعەو جەماعەت‌و نان خواردنت بۆ دیاری بکات" بەڵام لەبواری ئابووری‌و ڕامیاری‌و ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتیدا بەلاتەوە یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی بەکەڵك نایەن‌و, پێویستە قانوونێکی غەیری ئیسلام" دەستووری وولات لەم بوارانەدا دیاری بکاو حەڵاڵ‌و حەرام بڕیاربدات. کەواتە: تۆ شەریکت بۆ خوا بڕیاردا, کەئەمجۆرە شیرکەش پێی دەووترێ (شیرکی فەرمانڕەوایی ـ الحاكميّة).

بەڕێزان: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ئەم ئایەتە قورئانییەی دەخوێندەوە: ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ ﴾(التوبة 31), واتە: جوولەکەکان زاناکانیان" مەسیحییەکانیش قەشەو مالمەکانیان کردبوو بەخوای خۆیان‌و لەجیاتی خوای گەورە دەیانپەرستن لەو کاتەدا عەدی کوڕی حاتەمی طائي لەخزمەت پێغەمبەردا بوو صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم, ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا, مـن لـەنـاو گـاور جوولەکەکاندا ژیاوم, ئەوان زاناو قەشەکانیان نەدەپەرستن, ئەی چۆن خوا وادەفەرموێ؟

پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: باشە, ئەو زاناو قەشانە" حەڵاڵیان بۆ حەرام نەدەکردن و حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن و ئەوانیش بەقسەیان نەدەکردن؟! عەدی گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم وابوو. حەزرەت فەرمووی: فتلكَ عِبادَتُهُم إِیَّاهُم), واتە: دەی ئەوە پەرستنی ئەوان بوو بۆ قەشەو مالمەکانیان. (تفسیر إبن کثیر, ج4, ص119), واتە: مادەم لەحەڵاڵو حەرامیەتدا بەقسەی دەکەی ئەوە پەرستووتە.

جا خۆشەویستانم: زۆر ئاگاداربن, ئەگەر ئەمڕۆ شەیطانو شەیطان سیفەتان ناتوانن خەڵکی فێری داروبەرد پەرستی بکەن و بیانکەن بەموشریك" ئەوا لەم ڕێگەیەوە" لەڕێگەی شیرکی حەڵاڵو حەرامیەتەوە دەیانەوێت خەڵکی بکەن بەموشریك. ئەوەتا بەئاشکرا هاوار دەکرێ کەئاینی ئیسلام هەر بۆ چوارچێوەی مزگەوت باشەو نابێت بچێتە ناو کاروباری وڵاتو بازاڕو بنەماکانی ئابووریو رامیاریو کۆمەڵایەتی یەوە. یان دەڵێن: ئەم برگەیە لەفیقهی ئیسلامی (مەبەستمان ئەوەیە کە بەنەص چەسپاوە) بۆ ئەمڕۆ بەکەڵك نایەتو پێویستە فلان مادەی قانوونی جێگەی بگرێتەوە, یان ئەوەی ئیسلام حەرامی کردووە بۆ ئەمڕۆ بەکەڵك نایەتو باوی نەماوەو شتێکی مۆدێرنەو دەبێ خەڵك بەسەربەستی ئەنجامیبدەن.

بەڵام زانایانی ئیسلام دەفەرموون: ئەگەر فەرمانڕەوایەك حوکمی بڕینی دەستی دزی گۆڕی بۆ پەنجا ساڵ زیندانی" ئەوا هەرچەندە دەست بڕینەکە لەسەر کابرای دز ئاسانتر بێ لەوەی کەپەنجا ساڵ لەزینداندا دابڕزێ" ئەو حاکمە بەدەرکردنی ئەو حوکمە کافردەبێ.

کەواتە ئیمانداران: زۆر ئاگاتان لەمەسەلەی حەڵاڵو حەرام بێت, نەکەن لاسایی دوژمنانی ئیسلام بکەنەوەو بڵێن: تۆ نوێژو ڕۆژووی خۆت ئەنجام بدەو ئیتر ئەم حەڵاڵو حەرامە چیە باسی دەکەی, خۆ فلان شتەکە شەرع دەڵێ حەرامە, خۆ قانوون بەحەڵاڵی دەزانێ! ئامان ئەو قسانە بەدەمتاندا نەیەت, لەبەر ئەوەی ئبلیس (علَیهِ اللّعنّة) کاتێك ویستوویەتی زەفەر بەپیاوباشان بەرێت" نەچووە پێیان بڵێ: تۆ نوێژو خواپەرستی مەکە, بەڵکو لەڕێگەی حەڵاڵو حەرامەوە بۆیان چووە. بۆ نموونە: شێخ عەبدولقادریگەیلانی

(ڕەحمەتی خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕۆژێکیان بەتەنیا بەبیابانێکدا دەڕۆیشتم، بەئاسمانەوە نوورو ڕووناکی‌یەکی گەورەم بینی، پاشان وێنەیەکی تێدا دەرکەوتو بانگی دەکردم ئەی عەبدولقادر من خوای پەروەردگاری تۆم، هەرچی شتێك حەرامە ئێمە بۆمان حەڵاڵ کردی. منیش گوتم: بڕۆ هەی بەلەعنەت بی! دەفەرموێ: هەرئەوەندەم ووت کاتێکم زانی ئەو نووره بوو بەتاریکی‌و وێنەکەش بوو بەدووکەڵ، پاشان پێی گوتم: ئەی عەبدولقادر تۆ بەهۆی یارمەتی خواو زانستە زۆرەکەتو زۆرانبازیت لەگەڵ نەفسىتدا ڕزگارت بوو، ئا بەم چەشنە تا ئێستا حەفتا کەسم لەگەورەپیاوانی تەریقەت لەسەر ڕێگەی ڕاست لاداوە! منیش ووتم: فەزڵ هەر بۆ خوایە. جا لێیان پرسی: چۆن زانیت ئەوە شەیتانە؟ فەرمووی: بەو قسەیەدا کەگوتی حەرامىمان بۆ حەڵاڵ کردی.

هەروەها دەگێڕنەوە کاتێك کەمەولەوی زاناو شاعیری بەناوبانگی کورد" سەردانی کاك ئەحمەدی شێخ دەکات لەسلێمانی، کاك ئەحمەد بەمەولەوی دەفەرموێ: مەولەوی ئامۆژگاریم بکە. تا سێ جار ئەمە دەڵێتەوە، ئینجا مەولەوی دەفەرموێ: لەجاری یەکەمو دووەمدا ڕوانیم چی فەرزو سوننەتە هیچت نەبواردووەو هەموویت بەجێهێناوە، لەسێیەم جاردا ئەوە دەڵێم کەشەیتان وا لەکەمیندایە بۆت، ووریابە فرسەتت لێ نەهێنێ!

بەڵێ، شەیتان لەچیدا فرسەت لەخواناس دێنێ؟ لەبواری حەڵاڵو حەرامدا کەئینسان لەجێگەی ئەو شتانەی کەخوا حەرامی کردوون بڵێ ئەم شتانە حەڵاڵن‌و زەمانی ئەم حەڵاڵی‌و حەرامییە نەماوەو ئەمڕۆ سەردەمی پێشکەوتن‌و ئازادی‌یە. تۆ نوێژو ڕۆژوو و حەجی خۆت بکەو ئیتر ئیسلامەتی هەر ئەوەیەو تەواو. یان وەك دەووترێ: قورئان کتێبێکی پیرۆزەو پێویستە هەر لەبواری عیبادەتدا سوودی لێ وەربگیرێ‌و قورئان دەنگی لەچوارچێوەی دیواری مزگەوتەوە نەچێتە دەرەوەو، ئەگەر قورئان لەمزگەوت هێنرایە دەرەوە ئەوە هەر بۆ پیرۆزی‌و سوێندخواردن لەچەند پارچە قوماشێکەوە بپێچرێ‌و لەسەر مێزی مەحکەمە دابنرێ‌و خەڵکی سوێندی پێ بخۆن. ئیتر جەنابی حاکم نابێ قورئانەکە بکاتەوەو چی لەناودا نووسراوەو بەپێی ئایەتەکانی ئەو قورئانە موشکیلەی کەسە ناکۆکەکان چارەسەربکاتو، ئەو کەسەش کەدەچێتە بەردەم قورئانەکە" چونکە لەناو قورئانەکە حاڵیی نی‌یەو چاوی هەر پەڕۆو بەرگی قورئانەکە دەبینێ‌و سامێکی

تایبەتی لێدەکات, گەلێ جار وەکو ئەو کابرایەی لێدێت کەمامۆستای خوالێخۆشبوو (محەمەد شێخ تەها بالیسانی) لەلاپەڕە (50)ی کتێبی (دەنگی دەروون) چەند دەرسێك لەتەفسیری سوورەتی (ن)دا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: جارێکیان کابرایەك لەدادگای سلێمانی داوای قەرز لەسەر کەسێکیتر تۆمار دەکات. ڕۆژی دادگاییکردن, لەبەر ئەوەی داواکار شاهیدی نەبوو" حاکم داوالێکراو بەقورئان سوێند دەداتو کابراش دەست بەقورئانەکەدا دەداتو سوێند دەخوات کەقەرزی فلان کەسی لەسەر نییە. بەلام داواکار دەلێت: باشە جەنابی حاکم تۆ چۆن بەم قورئانەی سەر مێزی دادگا سوێندی دەدەیت؟ حاکم دەلێ: ئەی بەچی سوێندی بدەم؟ کابرای خاوەن قەرز گوتی: قوربان من هەرگیز بەمە ڕازی نابم, چونکە قورئانی دادگا سواوەو ئەوەندەی سوێند پێ خوراوە هیچ کار ناکات. من دەمەوێ لەمەرقەدی کاك ئەحمەدی شێخ" بەقورئانەکەی کاك ئەحمەد سوێندم بۆ بخوات! !

بەلێ, حاکم ناچار بۆ براندنەوەی کێشەکە" پۆلیسێکیان لەگەلدا دەنێرێت کەبچن لەمەرقەدی کاك ئەحمەد سوێندی بۆ بخوا.. لەدەرگای مەحکەمە دێنە دەرەوەو بەرەو مزگەوتی گەورە دەڕۆن. کابرای سوێندخۆر دەلەرزێتو دەلێت: من هەرگیز بەقورئانەکەی کاك ئەحمەد سوێند ناخۆم, من حەقی ئەو کابرایەم لایەو قەرزارمو پارەکەی دەدەمەوە! !

یا حَسْرَةً عَلی العِباد. ئەمە بەرهەمی ئەوەیە کەخەلك" قورئان هەروەکو کتێبێکی موقەدەس سەیربکەن, بەلام بێئاگابن چی تیایە بۆ بەختەوەریی دونیاو دواڕۆژی مرۆڤایەتی, تا وای لێ بێ خەلك لەقورئانی دادگا نەترسنو لەقورئانی ناو مەرقەد بترسن, بێئاگا لەوەی کەقورئان هەمووی هەر یەك قورئانە, گەورە بێت یان بچووك, لەدادگا بێت یان لەمەرقەد, لەمزگەوت بێت یان لەهەر جێگایەکی تر, بەرگی سەوز بێت یان سپی.

بەڕێزان: کاتی خۆی پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام صَلَّی اللهُ عَلَیه وَسلَّم کەعەرەبەکان گومڕابوونو لەئاینی ڕاستی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَیْهِ ٱلسَّلام لایاندا, ئەوەبوو کە بەگوێی سەرکردەیەکیان کرد کەحەلالی لێ حەرام کردنو حەرامی بۆ حەلال کردن, وەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەعەرەبەکان لەسەر ئاینی ئیبراهیم پێغەمبەری

باپیره‌گه‌وره‌یان بوون (سه‌لامی خوای لێبێت)، تا نزیکه‌ی چوارسه‌د ساڵ به‌ر له‌هاتنی حه‌زره‌تی محمد المُصْطَفی صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم هه‌روا له‌سه‌ر دینی راست‌ودروست بوون، تا ئه‌و کاته‌ی که‌سه‌رکرده‌یه‌کی وایان له‌ناودا په‌یدابوو که‌خه‌ڵکی گوێدێری قسه‌کانی ده‌بوون‌و که‌س له‌فه‌رمانی ده‌رنه‌ده‌چوو، ئه‌و سه‌رکرده‌یه ناوی عه‌مری کوڕی عامری خوزاعی بوو که‌وا ئاینه‌که‌ی گۆڕین.

له‌صه‌حیحی بوخاریدا هاتووه که‌خاتوو عائیشه(ڕه‌زای خوای لێبێت) ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فه‌رموویه‌تی: (رَأیتُ جَهَنَّمَ یُحَطِّمُ بَعضُهُ بَعضاً، وَرَأیتُ عَمْراً یَجُرّ قَصبه، هُوَ أَوَّلُ مَنْ سیبَ السیوب). واته: دۆزه‌خم بینی خۆی تێکوپێك ده‌شكاند، عه‌مریشم بینی ریخۆڵه‌کانی‌و هه‌ناوی به‌دوای خۆیدا راده‌کێشا، یه‌که‌مین که‌س بوو که‌سائیبه‌ی داهێنا. (سائیبه بریتی بوو له‌وه‌ی که‌هه‌ر حوشترێك دوانزه جار به‌مێ زابێ، ئیتر سوود لێ وه‌رگرتنی حه‌رامه).

به‌ڵێ ئیمانداران، وه‌ڵڵاهی هه‌رکه‌سێك" حه‌ڵاڵێك که‌خوا حه‌ڵاڵی کردووه به‌حه‌رام بزانێ، یان حه‌رامێك که به‌نه‌صی قورئان یان فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم حه‌رام بووبێ" هه‌رکه‌سێك ئه‌و حه‌رامه به‌حه‌ڵاڵ بزانێ، با بڕوای به‌هه‌موو قورئان‌و حه‌دیثی پێغه‌مبه‌ریش ببێ‌و هه‌موو عیباده‌ته‌کانیش ئه‌نجام بدات، ئه‌وه ده‌بێته موشریك‌و شیرکی گه‌وره‌ی ئه‌نجام داوه‌و فڕێ به‌سه‌ر دینی ئیسلامه‌وه نامێنێ. هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ش که به‌هه‌ر ناوێکه‌وه حه‌ڵاڵ‌و حه‌رام ده‌گۆڕن، ئه‌وا له‌ڕۆژی قیامه‌تدا سزایان وه‌کو سزای عه‌مری کوڕی عامری خوزاعی ده‌بێت که به‌ناو ئاگردا ریخۆڵه‌کانی به‌دوای خۆیدا راده‌کێشا.

خۆشه‌ویستان: بۆئه‌وه‌ی زیاتر روونی بکه‌ینه‌وه که‌چۆن ئینسان ده‌بێته موشریك کاتێ نوێژو ڕۆژوویشی هه‌یه" به‌ڵام بۆ به‌ڕێوه‌بردنی ژیان‌و ژیانی تاك‌و خێزان‌و ناو کۆمه‌ڵ به‌گوێره‌ی شه‌رعی خوا هه‌نگاو نانێ، ئه‌وه مانای ئه‌وه‌یه که‌ئه‌و که‌سه به‌زمانی حاڵ ده‌ڵێ: خوایه تۆ گه‌وره‌ی، سوژده‌ت بۆ ده‌به‌م، دێم حه‌جی ماڵه‌که‌ت ده‌که‌م، له‌ترسی تۆ به‌ڕۆژوو ده‌بم، به‌ڵام بۆ ژیانی ڕۆژانه‌م‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و ژن هێنان‌و شووکردن‌و ژیانی خێزان‌و کۆمه‌ڵ‌و بواری ئابووری‌و کۆمه‌ڵایه‌تی‌و رامیاریم" خوایه له‌مه‌یاندا به‌قسه‌ی تۆ ناکه‌م، چونکه دینه‌که‌ی تۆ کۆنه‌په‌رستی‌یه‌و بۆ ئه‌م سه‌رده‌م‌و زه‌مانه نابێ، ئه‌وه‌ی خوا

حەرامی کردووە ئێستا مۆدیەتیو نابێ لێی دوابکەوم, ئەو ئیعلانی کردووە کە: خوایە تۆ دەپەرستم بەڵام غەیری تۆش دەپەرستم, بەقسەی تۆ دەکەم بەڵام بەقسەی غەیری تۆش ـەکەم کە (پەنا بەخوا) ئەمە شیرکی گەورەیەو ئینسان ئەگەر ئەم بیروبڕوایەی هەبوو ئەوا ماڵوێرانو سەرگەردانی هەردوو دونیا دەبێت.

بەڕێزان: بابزانین ئایا یەکەم جار ئەم بیرۆکەی جیاکردنەوەی دین لەقانوونی دەوڵەت چۆنو لە چ وڵاتێ سەری هەڵداو بەرهەمی ئەم شیرکە گـــــەورە بۆ سەر ژیانی هاووڵاتیان چیە؟!

وڵاتی میصر یەکەم وڵاتی ئیسلامییە کەوازی لەشەریعەتی ئیسلامی هێنا, ئەوەش لەکاتێکدابوو کە (محمد علی) هاتە سەر حوکمو لەساڵی 1828ی زاینیدا (بعثات)ی نارد بۆ دەرەوە تا لەفەرەنسا دیراسەی قانوونی وەضعي بکەن. جا کاتێ ئەوانە گەڕانەوەو گوێیان بەبەرنامەی ڕۆژئاواو یاساکانی ئاودرابوو" بوونە سەرەتایەك بۆ رۆیشتن بەرەو قانوونی وەضعي و (مەدرەسەی حقووق )یش بۆ ئەو مەبەستە دامەزرا. ئینجا داگیرکردنی میصر لەلایەن ئینگلیزەوە زیاتر هانیدان بۆ ئەم کارەو بەردەوام هێرش دەکرایە سەر شەریعەتی ئیسلامی, تا لەساڵی 1885دا قانوونی فەرەنسی خرایە جێی شەریعەتی ئیسلامیو ئەوا زیاتر لەسەد ساڵە میصر وازی لەپەیڕەوکردنی شەریعەت هێناوە.

میصرییەکان لەساڵی 1937دا کاتێك لەکۆنگرەی جنێڤدا داوایانکرد کەشەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەی یاسادانان بێت" دوژمنان ڕازی نەبوونو گوتیان: بەمەرجێك (إمتیازاتي بیاني) لەمیصر لادەبەین کەکار بەیاساکانی شەریعەتی ئیسلام نەکەنو یاسا وەضعییەکان بەرقەراربێ. تا ئێستاش هەرکاتێ گەلی میصر" داوای (تطبیق)کردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکات ئەوا حکومەتی میصری دەستی بەدەستییان پێدەکات بەبیانووی ئەوەی کەگوایە کەمایەتی گاورەکان (قبطییەکان) ناڕازین!!

دوای میصریش تورکیا" لەساڵانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا ملکەچ بوو بۆ مەرجـــەکانی دوژمنـــان کـــەووتیان: بەمـــەرجێك ســـەربەخۆیی بـــەتورکیا دەدەیـــن کەدەستبەرداری یاساکانی شەریعەتی ئیسلام بێت. پاشان مستەفا کەمال ئەتاتورکی خائینیان هێناو کردیان بەپەرستراوی جەماوەری بێئاگای دوور لەخوا. ئەویش هەرچی

پێکرا کردی لەبردنی تورکیا بەرەو ڕۆژئاواو یاساکانی ڕۆژئاوا. هەرچەندە ئێستا هەموو وولآتانی بەناو ئیسلامی" وەکو میصرو تورکیایان لێ هاتووەو یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیان لابردووەو لەجێگەیدا یاسای پڕ خلّتەی بەشەریان لەجێگادا داناوە !

بەلآم ئێمە کەنموونەمان بەتورکیاو میصر هێنایەوە وەکو یەکەمین وولآتی ئیسلامی کەوازیان لەشەریعەتی ئیسلامی هێنا بۆ حوکم کردنی کۆمەلگا, کەئەم دوو وولآتە گەورەترین وولآتی ئیسلامیی ئەو کاتە بوون, چونکە میصر زانکۆی ئەزهەری لێبوو, تورکیاش مەرکەزی خەلافەتی ئیسلامیی لێبوو. لەو سەردەمەدا لەهەموو وولآتانی دونیاوە بۆ فێربوونی هەموو بوارەکانی زانستو زانیاریو بینینی شوێن دەستی زانایانی ئیسلام لەهەموو بوارەکانیدا ڕوویان دەکردە میصرو تورکیا. دانیشتوانی ئەو دوو وولآتە زۆر بەختەوەرو دەولّەمەندو تێروتەسەل بوون. بەلآم با بزانین ئایا کاتێك ئەم دوو وولآتە ئیسلامیە وازیان لەشەریعەتی ئیسلامی هێناو دینو دەولّەتیان لەیەکتری جیاکردەوەو, وایان لەخەلّکی گەیاند کەئیسلامو قورئان هەر باسی نوێژو ڕۆژووەو تەواو". ئایا وەکو ئەوەی بەمیللەتیان دەووت: ئێمە بۆیە دواکەوتووین چونکە بەیاسای فەڕەنسی ئیش ناکەین, ئێمە بۆیە پێش ناکەوین چونکە ئافرەتانمان پۆشاکی موسلّمانانەیان لەبەردایە ! ئایا کاتێ وازیان لەئیسلام هێنا" لەوەی کەتێیدا بوون پێشکەوتووتر بوون؟! یان قازانج سەری مایەی خواردو ئەوەی هەیشیان بوو ڕۆیو (خَسِرَ ٱلدُّنيا والآخِرَة) بوون؟!

تەماشای وولآتی میصر بکە, میصرو یابان هەردووکیان لەیەك سالّدا لەژێردەستی داگیرکەر ڕزگاریان بوو, یابانیەکان دەستیاندایە زانستو زانیاریو ئەو وولآتەی لێدەرچوو کەهەیە, هەر شتێك لەسەری نووسرابێ (یابان JAPAN) ئیتر 100٪ دلّنیا دەبی لەچاکیی ئەو بەرهەمە. بەلآم تورکەکانو میصریەکانو عەرەبەکان بەگشتی وایان دەزانی کەئەوان بۆیە دواکەوتوون چونکە شەریعەتی ئیسلامی حوکمی پێدەکرێ لەوولآتەکانیاندا.. چونکە ئافرەتەکانیان ئەو پۆشاکەیان لەبەردایە کەخوای گەورە لەسوورەتی (النور)دا بۆ ئافرەتی دیاریکردووە. کاتی خۆی (گلادستۆن)ی ئینگلیز گوتی: بۆ ئەوەی هێزی ئیسلام نەهێلّین پێویستە لەچکی سەری ئافرەتان لابەینو قورئانی پێ داپۆشینو سەرقالّی ماددە بێهۆشکەرەکانو سەرخۆشکەرەکانیان بکەین.

بەڵێ ئیمانداران, یەکەم هەنگاو بۆ لێدانی ئیسلام و دوورخستنەوەی ئیسلام لەژیان و ژینگە" بریتی بوو لەداڕنینی پۆشاکی حەیاوشەرم لەئافرەت. هەنگاوی دووەم کەهەر لەمیصردا بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام بەکارهات" بریتی بوو لەلابردنی زانستە ئاینیەکان لەخوێندندا یان گرنگی پێنەدانیان. ئەوەبوو کاتێ (کرۆمەر) حاکمی ئینگلیز بوو لەمیصر" قەشە (دانلووپ)ی کردە راوێژکاری وەزارەتی مەعاریفی میصری. ئەم دوانە, بیریان لەوە کردەوە کەبۆئەوەی زانستە ئیسلامیەکان لەخوێندنگەکاندا کەم بکەنەوە" دەبێ کاربکەن لەسەر پەرەپێدانی ئەزهەر بەجۆرێکی وا کەبەرنامەی خوێندنی ڕۆژئاوا قبوولّ بکات و زانستە ئاینییەکان بخاتەلاوە. دیارە کاریشیان بۆ ئەمە کرد, بەلاّم هەر بەوەوە نەوەستان چونکە کاریگەرییەکەی کەم بوو. لەلایەکی ترەوە کەوتنە کردنەوەی قوتابخانەو زانکۆی مەدەنیو خۆیان پرۆگرامیان بۆ داڕشتن و زمانی ئینگلیزی کرا بەزمانی خوێندن و گرنگیی زۆری پێدراو, وانەی ئاین کرا بەوانەیەکی وەك وانەی وەرزش و وێنەکێشان و کەنارکراو شتانێکی تێدا دەخوێنرا کەڕووکەشی ئاین بوون. ئەمجا بۆ ئەوەی کەقوتابیان روو لەخوێندنگە ئاینیەکان نەکەن و بچنە قوتابخانی مەدەنییەکان و سەرەنجام ژمارەی زانایانی ئاینیی ئیسلام کەم بێتەوە, هاتن بریاریاندا کەمامۆستایەکی دەرچووی ئەزهەر بە (سێ جونەیە) دامەزرێ, کەچی ئەوانەی لەقوتابخانە مەدەنییەکان دەردەچوون مووچەی چەوریان دەدانێ بۆ ئەوەی پلەوپایەی ئەزهەر لەدڵی خەڵکیدانەهێڵن!

زۆر بەداخەوە دەڵێم کەلەم وولاتەی ئێمەشدا, لەسەر دەستی حکومەتی دژ بەئیسلامی بەعسدا" هەمان رێگا کە لەمیصر بۆ لاوازکردنی ئیسلام بەکار دەهێنراو دەهێنرێ, لەعێراقیشدا پەیڕەوکراو بەردەوامە. ئەوەبوو پۆشاکی ناشەرعی بوو بەبەرگی ئافرەتانی موسڵمان و حوجرەو خوێندنگە دینیەکان رەواجیان نەما بەوەی کە: کەسێك خوێندنی مەلایەتیی تەواو دەکردو دەبوو بەمەلا, هەرگیز مووچەی مانگانەی نەدەگەیشتە ئاستی مووچەی بچووکترین کارمەندی حکومەت. ئینجا لەجێگەی حوجرە پڕ لەعیلمەکاندا پەیمانگەی ئیسلامیو کۆلیجی شەریعە دامەزرا کەدەرسەکانی زۆر بەهێز نەبوون و گرنگییان پێ نەدەدراو زۆریەی ئەوانەش کەلەو پەیمانگەو کۆلیجانە وەردەگیران

خەڵکانێکی بێدین‌و سەر بەفیکرەی ئیلحادی بوون، مەبەستیان ئەوەبوو شتێك لەئیسلام شارەزابین‌و دوایی دژایەتیی ئیسلامی پێبکەن، کەنموونەی ئەو جۆرە کەسانەمان زۆر بووەو زۆرە کەدەرچووی پەیمانگەی ئیسلامی، یان کۆلیجی شەریعەن‌و هەندێ ئایەت‌و حەدیث‌و علوومی شەرعی فێربووە بەڵام فیکرەی خواناسی‌و لەخواترسی نەچۆتە مێشکیەوەو زۆربەی جار قورئانەکەش بەڕەوانی نازانێ کەبیخوێنێتەوە، کەچی بەحسابی خۆی پسپۆڕە لەئیسلامداو دەست دەکات بەنووسینی کتێبێك لەسەر ئیسلام‌و لەسەر قورئان‌و لەسەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّهُ عَلَيه وسَلَّم بۆ سەر لێشێواندنی خوێندکارو گەنجەکانمان‌و دوورخستنەوەیان لەئیسلام، کە لەڕاستیدا هەموو ئەو نووسینانە درۆودەلەسەو ساختەچیەتین‌و هەڵوەشاندنەوەیان زۆر ئاسانە، بەڵام ئینسانی شارەزا لەئیسلامی دەوێت کەلێی تێبگات‌و پەردە لەسەر رووی درێوی هەڵبماڵێ، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە کتێبانە کە لەژێر ناوی ئیسلامداو بەهێنانەوەی بەڵگە بەقورئان‌و حەدیث‌و فەرموودەی پێشەوایانی ئیسلام دەیانەوێت رەخنە لەئاینی ئیسلام‌و پێغەمبەرەکەی بگرن، وەکو نموونەی ئەو کەسە وایە کەپیاڵەیەك هەنگوین دێنێ" هەنگوینێکی پاك‌و خاوێن‌و خالیص، بەڵام لەناوەڕاستی ئەو هەنگوینەدا" یان لەژێرەوەیدا چەند دڵۆپە زەهرێکی تێ بکرێ، ئەمجا پێشکەش بەئینسانێکی برسی بکرێ.. ئایا چی روودەدات؟! بێگومان مەرگ سەرەنجامی بخۆرەکە دەبێت. جا بەهەمان شێوە، خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە بۆ کەسی نەشارەزا وەکو هەنگوینە ژەهراوییەکە وایە، بەڵام نەك لاشە لەناو دەبات" بەڵکو عەقیدەو بیروباوەڕی پیرۆزی ئیسلام کەبۆ ئینسان لەڕۆح زەروورترە لەدەست دەدات‌و هەستیش ناکات کەچۆن‌و بە چ فێڵێك گومڕایان کرد! جا لەبەر ئەوە، پێویستە گەنجە رۆشنبیرەکانمان کەسەرەتایانە لەخوێندنەوەی پەڕاوی ئاینی ئیسلامیدا" زۆر بەوریاییەوە موتاڵابکەن‌و خۆیان لەو جۆرە کتێبە ژەهراوییانە بپارێزن.

خۆشەویستان: با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. ئایا وڵاتێکی وەکو میصر کەوازی لەشەریعەتی ئیسلامی هێنا" ئایا هیچ دەستکەوتێکی زانستیی بەدەست هێنا؟! هیچی وای هێنایەبەرهەم کەئاماژەی بۆ بکرێ کەئەمە بەرهەمی وڵاتی میصرە؟! بێگومان نەخێر. هەموو بەرهەمی ئەو دوورکەوتنەوەیە لەئیسلام چەند بەناو فەنان‌و هونەرمەندێکی

دوور لەئاینو رەوشت بوون. بەڵێ وولاتی میصرو هەموو وولاتانی ئیسلامی" کاتێك وازیان لەشەریعەتی ئیسلامی هێنا لەبواری بەڕێوەبردنی وولاتدا, ئەوا نەك هەر پێش نەکەوتن" بەڵکو ئەوەی هەشیان بوو لەدەستیان چوو. هەموو کاتێ زەلیلو سەرشۆڕن کەئەم هەموو نەوتو کانزایانە لەوولاتیاندایە کەچی میللەت هەر برسیەیە, هەر شەڕوشۆڕە, هەر داپڵۆسینە. بەهەموو وولاتانی ئەورووپاو ئەمریکا بەقەدەر یەك دوو وولاتی عەرەبی بەناو ئیسلامی" خەڵك لەناو زیندانو گرتووخانەکاندا نیە! کەهەمووی لەبەدبەختیو چارەڕەشی خۆی بەهۆی نەبوونی حوکمی خوا لەسەری" بەگژ حکومەتدا دەچێو سەرەنجام بەئاگرو ئاسنو کوشتنو بەندکردن" سەرکوت دەکرێ.

ئایا چ وولاتێك وا نیە؟ لە چ وولاتێکدا شەڕ نیە؟! لەکوێ حکومەتو میللەت لەدوو سەنگەری دژ بەیەکدا نین؟! دەبێ هەرواش بێ, چونکە ئەم شەریعەتی ئیسلامە رەحمەتە, کە رەحمەتت نەویستو لاتبرد" دەبێ هەر زەحمەت شوێنی رەحمەت بگرێتەوە!

ئەمجا با باسێکی تورکیای دوور لەئاینو هەموو بنەمایەکی ئەخلاقیو ئیسلامی بکەین, ئەو تورکیایەی کە بەهۆی ئیسلامەوە دەیان ساڵ لەوێوە سەرکردایەتی گەلانی موسڵمان دەکرا. ئەی کاتێ ئەتاتورکی دژ بەئیسلام هاتە سەر حوکم لەتورکیا (ئەتاتورك واتە: باوکی تورك) کەڕەگەزپەرسترین کەسەو غەیری میللەتی تورك" هیچ میللەتێکیتری بەئینسان نەدەزانی, بەتایبەتی خوێنخۆری سەری میللەتی موسڵمانی کوردبوو, ئەم مورتەدە چی بەئیسلام نەکرد؟! بەڵام ئایا تورکیا کەوازی لەئیسلام هێنا" پێشکەوت؟ ئایا جاران کە لەژێر چەتری پڕ خێروبەرەکەتی ئیسلامدا لەڕیزی پێشەوەی وولاتان بوو" ئایا لەژێر ئاڵای لادینیدا" نەك لەپێشەوەی وولاتان ئایا لەڕیزی وولاتانیشدایە؟! نەخێر, بەڵکو دەتوانین بڵێین: تورکیا لێقەوماوترین دەوڵەتی دونیایە. ئێستا تورکیا هەویەو ناسنامەی خۆی بزر کردووە. بۆ خۆیشی نازانێ شەرقییە یان غەربییە, ئاسیاییە یان ئەورووپییە؟ ئێستا تورکیا هەمووی ناڵەی دێ لەدەست برسێتی, نەبوونی, بێکاری, بەدڕەوشتی, فەسادی ئیداری. هەموو ساڵێ حکومەتو کابینەی وەزارەتەکان دەگۆڕن, کەچی هیچی چاری دەردیان ناکات.

ئێستا باری ئابووریی داڕووخاوی تورکیا لەئامارەکاندا دەردەکەوێت کەدەڵێن: قەرزی دەرەکیی تورکیا لەساڵی 1980دا: (15) ملیارو (700) ملیۆن دۆلار بوو, کەساڵیی یەك ملیۆن دۆلار سووی دەدا لەگەڵ دانەوەی قەرزەکەدا. لەساڵی 1999دا, ئەو قەرزە دەرەکییە بوو بە (100) ملیارو ساڵانەش (5) ملیار دۆلار سووی دەدا لەگەڵ دانەوەیقەرزەکەدا.

قەرزی ناوخۆی تورکیاش لەساڵی 1980دا (7) ملیارو (900) ملیۆن دۆلار بوو, لەساڵی 1999دا بوو بە (63) ملیارو (200) ملیۆن دۆلار. زیادەڕۆییو خراپیی حکومەت بۆتە مایەی بەفیڕۆدانی (195) ملیارو (300) ملیۆن دۆلار لەماوەی دەساڵدا (1990 ـ 2000). نزیکەی سەد ملیار دۆلاریش لەبانقەکاندا دزراوە بەناوی قەرزدان بەبازرگانو کۆمپانیا وەهمییەکان, کەئەوانەی قەرزیان دەکرد, خۆیانو پارەکانیان رایان دەکرد بۆ دەرەوە.

جا موسڵمانی خۆشەویست: ئەمە دوو نموونە بوون کەبۆم باسکردن, کەسەرەنجامی وازهێنان لەدین چۆن ئیفلاسی پێکردن. دەبا ئێمەی میللەتی کوردی دینداری خاوەن ڕەوشتی بەرز" دەرسیان لێ وەرگرین کەهەزاران سوپاس بۆ خوا بۆ یەکجاری گەلەکەمان ڕزگاری بوو لەژێر دەستی حکومەتی بەعس, حکومەتێك کەبناغەکەی لەسەر بێدینی دامەزرابوو. لەیەکێ لەقسەکانی صەدام حسەینی دیکتاتۆردا کەبۆ ئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی بەعسی کردووەو لەکتێبەکەیدا بەناوی (نَظرة في الدين والتُراث)دا هاتووە, دەڵێ: (الفِقه الإسلامي فِقهٌ رجعِيٌ مُتَحَجِّر, وَجامِد, لا يَتَوافَق معَ مُتطلَّبات العَصر, نحنُ لا نَنسَخُ ولا نَسْتَنسِخُ مِن الماضي, نحنُ لا نُريد مِن الدَّولَة أو الحزب أن يُطبِّق التَعاليم الدِّينية في دائرتِه, لأنّ ذلك يُؤَدي إلى التَفرقة الطائفية, وبذلكَ نَخسَر شَعبَنا, ونُريد مِن رجُل الدين أنْ لا يَتَدَخَّل في شؤون الدولة).

واتە: فیقهی ئیسلامی شەریعەتێکی کۆنەپەرستی ووشكو بێخێرە, ناگونجێ لەگەڵ داواکارییەکانی سەردەمدا, ئێمە ئاوڕ بۆ رابردوو نادەینەوەو بەرنامەی خۆمان لەرابردوو وەرناگرین. ئێمە نامانەوێ لەدەوڵەت یان حزب کەوا تەعالیمە ئاینییەکان لەفەرمانگەکانیاندا جێبەجێ بکات, لەبەر ئەوەی ئەمە دەبێتە جیاوازیی طائفیو بەمەش

گەنەکەمان زەرەرمەند دەبێت, وەداوامان وایە کەنابێت پیاوی ئاینی لەکاروباری دەوڵەتدا تەدەخول بکات.

خۆ هەموومان بەرهەمی ئەم حکومەتە بێدینەشمان بینی, هەر منداڵێکی کورد بگری دەتوانێ چەند سەعات لەسەر زوڵمی بەعسی کافر قسەبکات. دەی با شوکری خوا بکەین‌و دەرس لەهەموو ئەو دەوڵەتانە وەربگرین کەوازیان لەشەریعەتی ئیسلامی هێنا, چۆن بەدبەخت بوون, چۆن هەژارو نەدار بوون, چۆن بوون بەکلك‌و سەربەخۆییان لەدەستدا. با سوپاسی هەرکەس‌و وولاتێك بکەین کەیارمەتی داوین, بەڵام مساوەمە لەسەر دینەکەمان‌و ئیمانەکەمان نەکەین. با سەرکردەو سیاسەتمەدارانی گەلەکەشمان ئەو راستیە حاشاهەڵنەگرە بزانن کەچۆن کوردایەتی لەمێشك‌و خوێندا رەگی ‌داکوتاوە" ئیمان‌و ئیسلامەتیش زیاتر لەگەڵ رۆح‌و گیانیدا تێکەڵ بووە. هەرکەسێك بیەوێت ئیسلام لەکورد دابڕێت ئەوە رۆحی لێ ساندۆتەوەو لاشەی بێ رۆحیش کەڵکی چیە؟! وەبا هەمووشمان شانازی بەموسڵمانبوون‌و ئیمانداریی خۆمانەوە بکەین, چونکە هەرکەسێك سووکایەتی بەئاین‌و رەوشت‌و کەلەپوورو رەسەنایەتیی میللەتی خۆی کرد خۆی پێی سووك دەبێ.

هەرکەسێکیش بەموقەدەسی باسی عەقیدەو ئیمانداری‌و رەوشتی رەسەنی خۆی لەلای بێگانە بەموقەدەسی‌و بەفەخرەوە باسکرد, ئەوا قەدرو حورمەتی خۆی پێی زیاد دەبێ. نموونەیەکتان لەسەر ئەم حەقیقەتە بۆ باس دەکەم.. زاناو بانگخواز (عبدُالله الحَكيمي) کەسەرۆکی جالیەی عەرەبی یەمەن بوو, لەبەریطانیا بانگ کرا بۆ سفرەوخوانی شاهانە لەگەڵ گەورەپیاوانی وولات‌و باڵوێزی وولاتاندا. لەکاتی نوێژدا (عبدُالله) عەباکەی شانی داناو وەکو بەرماڵ رایخست‌و لەهۆڵەکەدا زۆر بەئاسایی نوێژەکەی کرد. زۆربەی ئامادەبوان هەرچەند موسڵمانیش بوون, ئەمەیان پێناخۆش بوو! ترسان کاریگەریی خراپی ببێ لەسەر ئامادەبوان, کەچی بەپێچەوانەوە, شاژنی بەریطانیا دوای نوێژەکەی رووی تێکردو ووتی: ئێمە بەرێزەوە سەیری ئازایەتی‌و شانازیەکەت دەکەین بەئاینەکەتەوە لەبۆنەیەکی وەك ئەمڕۆدا, بۆیە بەڕاستی حەزدەکەین دیارییەکی بەنرخت پێشکەش بکەین! عبدُالله گوتی: دیاری یەك کەپێشکەش بەمن‌و بەئامادەبوان‌و خەڵکی (مەملەکەتی مُتَّحدە)ی بکەی ئەوەیە: کەموسڵمان بوونی خۆت ڕابگەیەنی.

ئەویش پێکەنی‌و ووتی: من سوورم لەسەر ئەوەی دیارییەکی بەنرخت بدەمێ، ڕێگام بدە پارچە زەوییەکی گەورەو چەند خانوویەکت بدەینێ. (عبدُالله)ش فرسەتەکەی قۆستەوەو ووتی: دیارییەکەتم وەرگرت، بەڵام ڕێمان بدەن مزگەوتێکی لەسەر دروست بکەین. ئەویش ڕازیبوو. بەمەش مزگەوتی (کاردف)ی یەکەم دروست کرا کەتا ئێستا موسڵمانان ڕووی تێدەکەن‌و خواپەرستیی تێدا ئەنجام دەدەن!!

جا هەرکاتێ ئێمەش ئاوا قەدرو حورمەتی دین‌و عەقیدەی ئیسلامی خۆمانمان پاراست" ئەوا لای خوای گەورە ڕێزدار دەبین‌و لای هەموو کەس‌و حکومەتێکیش خاوەن شەخصیەت‌و کەسایەتیی ڕێز لێگیراو دەبین.

خۆشەویستان: با بزانین زانایان دەربارەی حاکمیەتی خوا چییان فەرمووە

- ئبن تەیمیە بەڕەحمەت بێ دەفەرموێ: هەرکەسێك ئەزەرێك حەڵاڵ بکات ئەوا بەگوتەی تێکڕای زانایان کافر دەبێت، هەروەك لەتەنانێك حەرام بکات دیسان بەگوتەی تێکڕای زانایان کافر دەبێت.

- سەید قُطب بەڕەحمەت بێ دەفەرموێ: ئەگەر ئەم ئاینە بچوێنین بەدراوێك ئەوا دەبینین لەڕووی یەکەمی نووسراوە (لا إلهَ إلاَّ الله)و لەڕووی دووەمی نووسراوە (حاکمیەتی خوا). کەواتە خوا بەیەك زانین‌و حاکمیەتی خوا دوو ڕووی یەك حەقیقەتن.

- شەهید دکتۆر (عبدالله عزَّام) بەڕەحمەت بێ دەفەرموێ: (لا إلـهَ إلاَّ الله) واتە حوکم کردن بەقورئان، هەرکەسێك حوکم بەقورئان نەکات واتە: خوایەتیی خوای ڕەتکردۆتەوە. هەروەها دەفەرموێ: ئەوەی لەژیانیدا بەردەوام عەرەقی خواردبێتەوە ئەوە کافر نابێ، بەڵام ئەوەی تەنها جارێك بڵێ (ئارەق خواردنەوە) دروستە" ئەگەر لەژیانیشیدا عەرەقی نەخواردبێتەوە ئەوە کافر دەبێ‌و تەڵاقیشی دەکەوێ، بەمەرجێ پەشیمان نەبێتەوەو تەوبەی لەدوا نەکات!!

هەروەها لەمێژووی ئیسلامدا دەربارەی حاکمیەتی خوا زۆر نموونە هەن، لێرەدا تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە، ئەویش کە لەئبن عەباس (ڕەزای خوا لەخۆی‌و باوکی بێ) گێڕدراوەتەوە کەڕۆژێکیان کابرایەکی جوولەکەو کابرایەکی دووڕوو (مُنافق) لەسەر شتێك دەبێتە کێشەیان. ئەوانیش کێشەکە دەگەیەننە لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم،

ـوی گوێگرتن لەهەردوو لا" پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم حەق دەدا بەکابرای جووەکە, بەڵام منافیقەکەبەم حوکمە ڕازی نەبوو, بۆیە گوتی: حەز دەکەم سەرێکیش لەئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێبێت) بدەین‌و بزانین ئەو دەڵێ چی سەبارەت بەم کێشەیەمان.
کەی کاتێ چوونە لای حەزرەتی ئەبوبەکر, ئەویش هەمان حوکمی پێغەمبەری خوای دا, بەڵام کابرای موونافیق هەر دڵی دانەمرکا بۆیە گوتی: حەزدەکەم سەرێکیش لەعومەری کوڕی خەطابیش (ڕەزای خوای لێبێت) بدەین‌و بزانین ئەو دەڵێ چی. بەڵێ کەهاتنە لای ئیمامی عومەر, کابرای جوولەکە قسەی کردو ووتی: ئەی عومەر, ئێمە چووینە لای پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّمو حوکمێکی دا, بەڵام ئەم پیاوە دڵی ئاوی نەخواردەوەو بۆیە گوتی: با بچین بۆ لای ئەبوبەکر, کاتێ چووین, ئەویش هەمان حوکمی دا, بەڵام ئەم کابرایە هێشتا دڵی دانەمرکا, وا ئێستا هاتووینە لای تۆ بزانین حوکمی تۆ چیە؟! ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا حوکمی داو ڕازی نەبوو؟!
گوتی: بەڵێ. فەرمووی: پاشان ئەبوبەکریش حوکمی دا هەر ڕازی نەبوو؟! گوتی بەڵێ.
ئیمامی عومەر فەرمووی: دەتۆزێك بوەستن ئێستا دێمەوە, چووە ژوورەوەو شمشێرێکی لەگەڵ خۆی هێناو لەملی کابرای موونافیقی داو فەرمووی: ئەمەش حوکمی عومەرە.
کەواتە: هەر کەسێك بەحوکمی خوا ڕازی نەبێ, حوکمەکەی شمشێری ئیمامی عومەرە (تفسير القرطبي, ج5, ص264).
بەڕێزان: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ کەلەوانەیە مێشکی زۆربەی کەسی بەتایبەتی چینی خوێندەوارو ئەو کەسانەی حەز لەبواری سیاسەت دەکەن ورووژاندبێ. پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا کاتێ شەریعەتی ئیسلام قانوونی وواڵت بێ" ئەی مەسیحی‌و جوولەکە چی بکەن؟ ئەی ئەوانەی کەمولحیدن‌و هیچ دینێکیان نیە چی بکەن؟ ئایا ئیسلام هەموویان دەکوژێ؟ ئایا لەحکومەتدا هیچ ئیش‌وکارێکیان پێ دەسپێرێ یان نەء؟ لەووڵامدا دەڵێین: بەنیسبەت ئازادیی هەڵبژاردنی دین‌و هەر بیروباوەڕێکەوە کە لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا بگونجێ یان نا, ئەوا خوای گەورە ئینسانی سەرپشك کردووەو حەزدەکا ئینسان بەئازادیی تەواوەوە ئاینی ئیسلام قبوول بکات.پیاوێکی ئەنصار لەبەنی سالم کوڕی عەوف کەناوی (الحصني) بوو خۆی

موسڵمان ببوو, دوو كوڕیشی هەبوو هێشتا هەر گاور بوون. ئەم پیاوە موسڵمانە حەزی دەكرد فشار بخاتە سەر هەردوو كوڕەكەی بۆئەوەی موسڵمان بن. خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەر ئەم كابرایە ناردە خوارەوە: ﴿ لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ﴾(البقرة 256), واتە: زۆركردن نیە لەئایندا, هەق و ناهەق روونكراوەتەوەو ئازادن دوای چی دەكەون.

عتاب كوڕی شمیر دەڵێ: گوتم بەپێغەمبەری خوا, ئەی نێردراوی خوا: باوكێكی پیرو برایەكم هەیە, با بیانهێنمە خزمەتت بەڵكو لەسەر دەستی جەنابتدا موسڵمان بن. حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: زۆریان لێ مەكەو ناڕەحەتیان مەكە. ئەگەر موسڵمان بن چاكترە بۆیان, خۆ ئەگەر لەسەر ئاینی خۆیشیان بمێننەوەو موسڵمان نەبن ئەوا ئیسلام سینگی فراوانە!

لەمێژووی ئیسلامیشدا ئەم سنگ فراوانیو زۆرنەكردنە هەر بەردەوام بووەو رێز لەشوێنی پەرستنو مەراسیمی ئەهلی كیتاب (گاورو جوولەكە) گیراوە, بۆیە دەبینین لەهەموو جیهانی ئیسلامدا كەنیسەو پەرستگاكان ماونو ئەهلی ئەو ئاینانە بەئازادیو سەربەستی" مەراسیمی ئاینی خۆیان جێبەجێ دەكەن.

(إبن العَطَّار الأَنْدَلُسِّي) لەسەدەی چواری كۆچیدا دەڵێ: بۆ موسڵمان بوونی هەرگاورێك یان جوولەكەیەك, دەبێت بەڵگەنامەیەك لەلای قازییەوە بهێنێ كەشایەتیی چەند كەسێكی لەسەر بێت كەكەس زۆری لێنەكردووەو بەئازادیو هەموو حەزو ئارەزووی خۆیەوە ئاینی ئیسلامی هەڵبژاردووە!

بەڵێ, ئەم دابین كردنی ئازادیو سەربەستی فیكرییەی ئیسلام وایدەكرد كەخەڵكانێكی غەیرە موسڵمان ئیسلامیان لا شیرین ببێ, هەروەها رەفتاری جوانو مامەڵەی بەڕێزی موسڵمانانیش هاندەرێكی چاك بوون بۆ ئەم مەسەلەیە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێ: (إِنَّكُم لا تَسَعُونَ النَّاس بِأَمْوالِكُمْ, وَلَكِنْ لِيَسَعْهُم مِنْكُمْ بَسْطَ الْوَجه وَحُسْنَ الْخُلُقِ). واتە: ئێوە بەپارەو ماڵ دەستتان ناگات بەخەڵكیدا تا بیانهێنن بەرەو ئیسلام, دەی ئەگەر وایە با ڕووخۆشیو ڕەفتار جوانیتان خەڵكی بگرێتەوەو بیانهێنێ بەرەو حەقو راستی.

بەڵێ: ئیسلام ئەو دینە کراوەیە کەشوێنکەوتوانی ئاوا فێردەکات چۆن بتوانن بژین لەگەڵ هەر فیکرەیەکی دژ بەئیسلامو هەڵگرانی بیروباوەڕی غەیری ئیسلامی.

بۆ ئەو پرسیارەش کەئایا ئیسلام ڕێگا دەدات لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا کەئیسلام قانوونی وولات بێ" کاروبارو وەزیفە بدرێتە گاورو جوولەکەو بێدین, لەووڵامدا دەڵێین: بەڵێ, لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا غەیرە موسڵمانان پۆستی گەورەیان پێ سپێردراوە, بۆ نموونە: هاروونە ڕەشید گشت قوتابخانەکانی خستە ژێر چاودێریی (یۆحەننا بن ماسویة) کەپیاوێکی مەسیحیبوو, هەروەها (جۆرجیس بن بەختیشوع) دکتۆری خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصوور بوو. تەنانەت (سرجیوس ود القدیس یۆحەننا دیمەشقی) خەزێنەداری (بَیتُ المال) بوو لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا!

بەڵێ لەدەوڵەتێکدا کەشەریعەتی ئیسلامی حوکمی پێدەکرێ" غەیرە موسڵمانان لەسەر بنەمای (لَهُمْ مَا لَنا وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْنا) مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت کە بەواژەی ئەمڕۆ پێی دەووترێت (مافی هاووڵاتیبوون).

لەکۆتایی ئەم ووتارەشدا داوا دەکەم لەخوای گەورە, کەخۆشەویستیی خۆیو شەریعەتە پاکو بێگەردەکەی لەدڵودەروونماندا بچەسپێنێو, ئێمەو هەموو گەلانی سەر ڕووی زەوی لەژێر سایەی حوکمی پڕ خێرو بەرەکەتی ئیسلامدا بحەسێنێتەوە. ﴿ رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴾

اَللّهُمَّ آمين

# ووتـاری سێیەم

## شیرکی هەرە بچووک ( الشِّرْك الأَصْغَر )

**بەشی یەکەم**

قالَ آللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى:

﴿ إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ, وَحِفْظاً مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ, لا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَأَ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ, دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ, إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴾( الصافات 6 ـ 10 ) .

قالَ رَسولُ آللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

(مَنْ أَتى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيءٍ فَصَدَّقَهُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أَرْبَعِينَ يَوماً)

(رواهُ مُسلِم)

(لأَنْ أُحْلِفُ بِالله كاذِباً, أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَحلِفُ بِغَيرِهِ وَأَنا صادِقٌ)

(عبدالله بن مسعود رَضِيَ الله عَنهُ)

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَعين الى يوم الدِّين

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلامی خوا لەهەموومان بێت. خۆشەویستان, لەدوو ووتاری رابردوودا باسی شیرکی هەرە گەورەمان کرد, بەپشتیوانیی خوای گەورە لەم ووتارەشماندا باسی شیرکی هەرە بچووك (الشِّرْك الأصْغَر) دەکەین کەبەشی دووەم یان بڵێین جۆری دووەمی شیرکە.

شیرکی هەرە بچووك بریتییە لەو شیرکەی کەخاوەنەکەی" پێی لەکۆمەڵی موسڵمانان ناچێتە دەرەوەو بەهەمیشەیی لەئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە, لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە بنەمای خوا بەیەك گرتن ڕەت ناکەنەوە, بەڵام بەتێرو تەواوو کامڵی دانانێن. شیرکی هەرە بچووکیش ڕێگە خۆشکەرە بۆ گەیشتن بەشیرکی گەورە ئەگەر خاوەنەکەی زوو تۆبەی لێنەکات. ئینجا هەریەك لەبەشەکانی شیرکی هەرە بچووك بەگوناهی کەبیرە دادەنرێ. جۆرەکانی شیرکی هەرە بچووکیش ئەمانەن:

رووپامایی (الرِّياء): واتە ئینسان شتێك, کردەوەیەك, چاکەیەك, خێرێك, خواپەرستییەك دەکات بەڵام بۆ ئەوەی دەکات کەخەڵك باسی بکەن‌و مەدحی بکەن‌و ئەمیش بەو مەدح کردنە" زۆر دڵخۆش دەبێت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە دەفەرموێ: (إنَّ أَخْوَفَ مَا أخافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ ٱلأصْغَر ـ الرِّياء, يَقولُ اللهُ يَومَ ٱلقِيامَةِ إذا جَزِيَ ٱلنَّاسُ بِأَعْمالِهِمْ: إذْهَبوا إلى الَّذينَ كُنْتُمْ تُرَاؤُونَ في ٱلدُّنْيا فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدونَ جَزاءً)(حَديث صحيح ـ رَواهُ الإمام أحمَد).

واتە: گەورەترین شت کە بەهۆیەوە لێتان بترسم شیرکی هەرە بچووکە کەڕیایە, بۆیە ڕۆژی دوایی خوای گەورە لەکاتی پاداشت دانەوەی خەڵکیدا دەفەرموێ: ئەی ریاکاران بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە لەدنیادا لەبەر خاترو رەزامەندیی ئەوان ئیشی چاکەتان دەکرد بزانن ئایا ئەو کەسانە هیچیان بەدەستە لەم ڕۆژەدا تا پاداشتی ئێوەی پێ بدەنەوە؟! بێگومان نەخێر.

جا موسڵمانان: بەداخـــەوە ئـــەمڕۆ ریاییکردن لەناوماندا زۆرە, بەڕاستی زۆربـــەی کردەوەکانمان خالیص بۆ خوای گەورە نییە, زۆربەی بۆ لابردنی گلەیی خەڵکـــە, بـــۆ

ئەوەیە خەڵکی سوپاسمان بکەن. با نموونەیەکی بچووک بێنینەوە هەر لەمەسەلەی مردنو تەعزیەدا: کاتێ هەژارێکو بێکەسوکارێك دەمرێ" زۆر زۆر بەکەمی موسڵمانان لەسەرقەبرانو مەجلیسی تەعزیەدا دەبینی, بەڵام کاتێ دەوڵەمەندێك دەمرێ" نە سەرقەبرانو نە پرسەخانە جێگای خەڵکی لێ نابێتەوە!! کەئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئیشەکانمان بۆ خاتری رەزامەندیی خوای گەورە نییەو بۆ خاتری خەڵکە, بۆ الله نیەو بۆ عبدالله یە, کەئەمەش پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم زۆر لێی ترساوە کەئومەتەکەی تووشی ببنو بەشیرکی بچووکی ناوبردووە.

بەڵێ خۆشەویستان, جۆری دووەم لەشیرکی هەرە بچووك بریتییە لـە (سوێندخواردن بەغەیری خوا). عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت), جارێکیان گوێی لەکابرایەك بوو دەیگوت: (لا وَالْكَعْبَةِ), واتە: نەخێر, سوێند بەکەعبە. ئبن عومەز فەرمووی: (لا تَحْلِفْ بِغَيْرِ الله), واتە: کاکە گیان, سوێند بەغەیری خوا مەخۆ, چونکە من لەپێغەمبەرم بیست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەیفەرموو: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ الله فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ), واتە: هەرکەسێك سوێند بخوا بەشتێکی تر جگە لەخودا" ئەوە کوفر دەکات, یان فـەرمووی: ئەوە هـاوبەش بـۆ خـــوا بڕیاردەدات ( رَواهُ التُّرمذي وقالَ حَديثٌ حَسَن).

خۆشەویستان: هەندێ کەس هەیە" کاتێ سوێند دەخوا, سوێند بەسەری باوکی دەخوا, دەڵێ: بەسەری باوکم وابوو, یان بەسەری باوکم دەبێ وابێ. با بزانین حوکمی ئەمجۆرە سوێندخواردنە چیە؟! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إِنَّ اللهَ تَعالى يَنْهاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبائكُمْ, فَمَنْ كانَ حالفاً فَلْيَحْلِفْ بِالله أَوْ لِيَصْمُتْ)(مُتفق عليه). واتە: ئاگاداربن" خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەئێوە کەسوێند بەباوكو باپیرتان بخۆن, جا ئەو کەسەی دەیەوێ سوێند بخوا با سوێند بەخوا بخوا, یان بێدەنگ بێو بەشتی تر سوێند نەخوات.

کەواتە ئیمانداری بەڕێز: شتێك خوا قەدەغەی کردبێ وازی لێ بێنە.

بەڕێزان: هەر لەجۆرەکانی سوێندخواردن بەغەیری خوا, سوێندخواردنە بەئەمانەت, کە لەفەرموودەی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتووە کەفەرموویەتی: (مَنْ حَلَفَ

بالأمانَةِ فَلَيْس منَّا)(رواهُ أبو داود بإسنادٍ صحيح), واتـه: ئـهوەی بەئەمـانەت سوێند بخوات" لەسـەر رەوشتی ئێمە نیە ! !

هەروەها هەندێ جار گوێمان لێ بووە کەکاتێ کەسێك ویستوویەتی کەسـێك قەناعەت پێ بکات کەفلان شتی نەکردووە" یان ئاگای لەفلان شت نیە, سوێندی بۆ خواردووە, بەلام چۆن سوێندخواردنێك! دەڵێ: بێئیمان بم ئاگام لێی نیە! یان نەمبیستووە! پەنا بەخوا. جا گوێ بگرن بزانن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە چی دەفەرموێ, خۆشـەویست دەفەرموێ: (مَنْ حَلَفَ فَقالَ: إِنِّي بريءٌ مِنَ آلإسْلامِ, فَإِنْ كانَ كاذِباً فَهُوَ كَما قالَ, وَإِنْ كانَ صادِقاً فَلَـنْ يَرْجِـعَ إِلى آلإسْلامِ سالِماً)(رَواهُ أبو داود), واتە: هەرکەسێك سوێند لەسەر شتێك بخوات و بڵێ: بەشم لەئاینی ئیسلام بڕابێ ئەمە وایە کەچی واش نەبێ, ئەوە ئەو کەسە بەو سوێندەی لەئاینی ئیسلام بێبەش دەبێ! ! ئەگەر قسەکەیشی ڕاست بوو ئەوا ئەم جۆرە سوێندخواردنە هەر باش نیە, چونکە ئەگەر ڕاستیش بکات ئەوا هەر بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە سەر ئیسلامەتی!

ئیمانداران: گومانی تێدا نیه کەکەسێك" خودا لەهەموو شتێك بەگەورەترو بەرزتر بگرێ ئەوا ڕێگا بەخۆی نادات سوێند بەغەیری خوا بخوات, چونکە ئینسان بۆیە سوێنددەخوات تاوەکو سوێندەکە بکاتە پشتوپەنای, جا ئینسان کاتێ بیەوێ سوێند بخوات, گەورەترین و بەرزترین و پیرۆزترین شت لەفەرهەنگی مێشکیدا هەڵدەبژێرێ و سوێندی پێ دەخوات. کەواتە: سوێندخواردن بەغەیری خوا مەعناو مەبەستێکی زۆر ناماقوڵ و درێو دەگەیەنێ, هەر لەبەر ئەوەشە وەکو لەو فەرموودانەی خوێندمانەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ڕوونیکردەوە کە: هەرکەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوە کافر بووە, یان هاوبەشی بۆ خوا پەیداکردووە.

بەڵام پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کەمەرج نیە ئەو کەسەی سوێند بەغەیری خوا دەخوات" بۆ نموونە: زوبانی ڕاهاتووە دەڵێ: بەسەری باوکم, بەسەری تۆ, بەگـۆڕی فلان کەس, ئەوا مەرج نیە هەموو کاتێ ئەو ئینسانە بەو سوێندخواردنە بچێتە ڕیزی کافرو هاوبەش پەرستانەوە. بەڵکو تەنیا لەکاتێکدا وای لێدێ کەئەو شتەی سوێندی پێ دەخوات" لەلای وەکو خوا یان بەرزتر لەخوا بێ (نَعوذُ بِالله), جا فەرموودەکە ئەم حاڵەتە

تایبەتییە بێتامەی لەبەرچاوگرتووە. وەك ئەم بەسەرهاتە واقیعیە کەمامۆستا مەلامحەمەدی بالیسانی (خوا لێی خۆش بێ) لەلاپەڕە (49)ی کتێبەکەیدا (دەنگی دەروون) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(جارێکیان دەروێشی شێخێك لەلایەن کەسێکەوە شکاتی لێدەکرێو دەیبات بۆ حزووری شێخ, دەڵێ قوربان یاشێخ" من فلان شتم لای ئەم دەروێشەی تۆیەو نامداتەوە, هاتوومە خزمەت جەنابت بۆ خۆت عالمی بەڵکو شەرعمان بکەی. شێخیش کەپیاوێکی بەحەق خواپەرستو مەلایەکی باشو شارەزا دەبێ" شەرعیان دەکا. جا بەپێی شەرع سوێند دەکەوێتە سەر دەروێشەکە, کابرای دەروێش هەر خێرا سوێند بەخواو بەقورئان دەخوا کەئەم حەقەم بەسەرەوە نیە. بەڵام خاوەن حەق دەڵێت: یاشێخ من نامەوێت دەروێش بەخواو بەقورئان سوێندم بۆ بخوات, بەڵکو دەمەوێ بەسەری شێخیش سوێندم بۆ بخوات!! کتوپڕ کابرای دەروێش ڕەنگی تێکدەچێو دەڵێ: من هەرگیزاو هەرگیز سوێند بەسەری شێخ ناخۆم!! شێخی ڕاستەقینەش بۆ دەرکەوتنی ڕاستی" زۆر لەدەروێش دەکات کەسوێند بەسەری ئەو بخوات. دەروێش دەڵێ: قوربان من چۆن سوێند بەسەری تۆ بەدرۆ دەخۆم, قەت غەڵەتی وا ناکەم. ڕاست دەکا, ئەو شتەی لەلامەو دەیدەمەوە! جا شێخی عالمو خواناس کەئەوەی بینی سەری خۆی ڕووت کردو بەدەروێشی گوت: من وام لێ هات کەخەڵك سوێند بەخوا بەدرۆ بخوات بەڵام بەسەری من سوێند بەدرۆ نەخوات. وەڵڵاهی ئەی دەروێش" دەبێ سێ تف لەم سەرەم بکەیت کەوا بەگەورەی دەزانی. هەرچەند دەروێش ئەملاولای کرد" ترسا, لەرزی, شێخ وازی لێ نەهێنا تاوەکو سێ تفی لەسەری شێخ کرد, ئەمجا شێخ بەیەکجاری دەروێشی دەرکرد).

جا بەڕێزان: هەر سوێندخواردنێکی بەغەیری خوا" لەم جۆرەی دەروێش بێو سوێندخۆر ئەو شتەی پێ لەخواو لەقورئان گەورەتر بێ ئەوە بێگـومان پێی دەبێتە موشریك یان کافر! بەڵام ئەو کەسەی کەدەڵێ: بەسەری فلان کەس فلان شت دەخۆی, یان بەسەری باوکم نابێ وا بکەی, ئەوە ئەگەر ئـەو ی ئەوە نەبێ کەسەری فلان کەس وەکو خوا گەورەیە, یان (نَعوذُ بِالله) لەخوا گەورەترە, بەڵکو هەر لەبەر ڕێزو خۆشەویستی بوو بۆی, ئەوە فەرموودەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەربارەی

ئەمجۆرە کەسانە" حوکمەکەی ئەوەیە کەئیمامی نەوەوی لە (رِياضُ الصَّالِحين)دا فەرموویەتی: مەبەست گەورەکردنی تاوانی سوێندخواردنە بەغەیری خوا لەبەرچاوی خەڵکی، تاوەکو بسڵەمنەوەو وازی لێ بێنن.

ئبن حەجەر ئەلهەیثەمي لەکتێبەکەیدا (الزَّواجِر عَن إقتراف الكَبائِر)، سوێندخواردنی بەغەیری خوا" لەریزی گوناهە گەورەکان (الكَبائـر)دا ژمـاردووە

دەشتوانین بڵێین: مەبەست لە (فَقَدْ كَفَرَ أوْ أشْرَكَ ) ئەوەیە: کەسوێندخواردن بەغەیری خوا" عادەتو خووی کافرو هاوبەش پەرستانە. کەواتە: هەرکەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوە یەکێك لەخەسڵەتەکانی ئەوانەی تێدا هاتوتە دی. دیارە مەرجیش نیيە بەخەسڵەتێکی کافران، ئینسان کافر ببێو لەئیسلام بچێتە دەرێ، بەڵکو بەس تاوانبارو لارێیەو هیچی تر. چونکە وشەی (كُفر) لەئەصلی زماندا واتە: داپۆشین، هەرجۆرە سەرپێچیو لاملی یەك لەبەرنامەی خوا دەگرێتەوە، جا چ پەیوەندیی بەبنچینەکان (الأُصول)ـەوە هەبێ" کەئەوکاتە مانای پڕ بەپێستی ووشەکەو ئەوپەڕی چەمك (مَفهوم)ـەکەی دێتەدی، کەکافربوونو وەرگەڕانە لەدین.. وە چ پەیوەندیی بەلقو پۆپەکان (الفُروع)ی ئیسلامەوە هەبێ کەئەو کاتە چەمكو واتای جوزئیو گچکەی ووشەی (كُفر) دێتەدی.

بەهەرحاڵ، دەبێ ئینشائەڵڵا موسڵمانان خۆیان لەم سوێندخواردنە بەغەیری خوا بپارێزن، چونکە موسڵمان ئەوەندە راستگۆیە پێویستی بەسوێندخواردن نیە بۆ سەلماندنی راستیی قسەکانی، وەئەگەر لەجێگایەکیشدا ناچاربوو سوێند بخوات، با بەخوای گەورە سوێند بخوات

خۆشـەویستان: لەوانەیە هەندێ کەس هەبن بڵێـن: ئێمە بۆیـە سـوێند بەغـەیری خوا دەخۆین چونکە زۆرجار سوێندەکانمان لەسەر شتی ناڕاستەو حەز ناکەین ناوی پیرۆزی خوا بەدرۆ سوێندی پێ بخورێ! وولامی ئەو جۆرە کەسانەش دەدەینە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود(رەزای خوای لێبێت) کەفەرموویەتی:( لأنْ أحْلِفُ بِـالله كـاذِباً أحَبُّ إلَيَّ مِنْ أنْ أحْلفُ بِغَيْرِهِ وَأناصادِقٌ)(رواهُ الطَبَرانـي في الكَـبير وَرِجالُـهُ رِجالُ الصَّحيح)

.واته:ئەگەر سوێند بەخوا بەدرۆ بخۆم" لەلام زۆر خۆشترە لەوەی کەسوێند بەغەیری خوا بخۆم‌و ڕاست بکەم!

هەروەها کەسانێك هەن کاتێ کێشەیەکی لەگەڵ کەسێکدا تووش دەبێ‌و دەچنە خزمەت مامۆستایەکی شەرع زانی بەڕێز, کاتێ شەرع سوێندی دا بەداوالێکراو, دەبینی داواکار دەڵێ: من بەوە قەناعەت ناکەم کە بەخوا یان بەقورئان" کەکەلامی خوایە" سوێندم بۆ بخوات, چونکە دەزانم درۆ دەکا, بۆیە من دەمەوێ بەتەڵاق سوێندم بۆ بخوا بۆ ئەوەی ئەگەر درۆیکرد تەڵاقەکەی بکەوێ!

هیچ بەو جۆرە کەسانە ناڵێین, بەڵام بۆ ئینسانی ئیماندارو ژیر" ئەم فەرموودەیەی خۆشەویستمان" تاجی سەرمان محمد المصطفی صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بەسە کەبۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (رأی عیسی آبنُ مَریَمَ رَجُلاً یَسْرِقُ..) حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوایان لێبێت) چاوی لێبوو وا کابرایەك خەریکی شت دزینە, حەزرەتی عیسا بانگی کابرای کردو فەرمووی: (أسَرَقْتَ؟) ئەوە تۆ بووی دزیت کرد؟! عەیبە دزی مەکە. کابرا وەڵامی حەزرەتی عیسای دایەوەو گوتی: (کَلاَّ وَالَّذي لا إلهَ إلاَّ هُوَ), گوتی: نەخێر ئەی عیسا, من دزیم نەکردووەو من نەبووم سوێند بەو کەسەی کەهیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێ ئیللا ئەو خوایە نەبێ من پاکم‌و دز نیم! حەزرەتی عیسا یەکسەر فەرمووی: (آمَنْتُ بِاللهِ وَكَذَّبْتُ عَیني), ئیمانم هەیە بەخواو چاوەکانی من درۆدەکەن (رواهُ البُخاري وَمُسْلِم).

جا سەرنج بدە ئیمانداری بەڕێز: پێغەمبەرێکی بەڕێزی وەکو حەزرەتی عیسا" بەچاوی خۆی چاوی لەکابرا بوو کەخەریکی دزیە, بەڵام کاتێ کابرا سوێندی خوارد بەخوا کەئەو دزی نەکردووە, یەکسەر حەزرەتی عیسا فەرمووی: ئیمانم هەیە بەخواو چاوی خۆم بەدرۆ دەخەمەوەو, تەواو.. تۆ دزیت نەکردووە!!

بەڕێزان: خاڵی سێیەم لەشیرکی بچووك (الشِّرْك الأصْغَر) بریتیە لەفاڵچێتی‌و چوونە لای فاڵچی‌و کتێب گرەوە (الكَهانَة والعَرَّافَة). پێناسەی فاڵچیش ئەوەیە: ئەو کەسەیە کەلافی ئەوە لێدەدات کەگوایە غەیب دەزانێ.. جا فەرموون با بزانین پێغەمبەری چاوساغ‌و پێشەوامان لەبارەی هاتوچۆکردنی ئەو فاڵچی‌و کتێب گرەوە دەستبڕانەوە

چ‌یفه‌رمووه؟ خۆشه‌ویست صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فه‌رموویه‌تی: (مَنْ أتی عَرّافاً أوْ کاهِناً فصَدَّقَهُ بِما یَقُول, فَقَدْ کَفَرَ بِما أُنْزِلَ عَلی مُحَمَّدٍ) (أخرَجَهُ أحمَد والحاکِم عَنْ أبي هرَیرَة بِسَنَدٍ صَحیحٍ), واته: هه‌رکه‌سێك بچێته لای کتێب گره‌وه‌و فالچی یه‌ك, ئه‌وه‌ی ده‌یڵێ به‌ڕاستی بزانێ‌و بڕوای پێ‌بکات, ئه‌وه ئه‌و که‌سه کافره به‌و قورئانه‌ی که‌بۆ سه‌ر محمد صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم هاتۆته خواره‌وه.

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم ده‌فه‌رموێ: (مَنْ أتی عَرّافاً فَسَألَهُ عَنْ شَيءٍ, فَصَدَّقَهُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أرْبَعِینَ یَوْماً)(رَواهُ مُسْلِم), واته: ئه‌و که‌سه‌ی بڕوات بۆ لای فالچیه‌ك‌و له‌باره‌ی شتێکه‌وه پرسیاری لێبکاو به‌ختی له‌لا بگرێته‌وه ئه‌وه نوێژی چل ڕۆژی‌گیرا نابێ!

شارحی عه‌قیده‌ی طَحاویة ده‌فه‌رموێ: (فَإذا کانَتْ هذهِ حالُ اَلسَّائِلِ, فَکَیفَ بِالمَسْئولِ). واته: ئه‌گه‌ر ئه‌مه حاڵی ئه‌و که‌سه‌بێ که‌ده‌چێ بۆ لای فالچی‌و کتێب گره‌وه‌و بڕوا به‌قسه‌کانی ده‌کا کافر بێ به‌دینی محمد المصطفی صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم‌و نوێژی چل ڕۆژی گیرا نه‌بێ, ئایا ئه‌ی ده‌بێ حاڵی فالچی‌و کتێب گره‌وه‌که چۆن بێ له‌لای خوا؟!

خۆشه‌ویستان: زۆرن ئه‌وانه‌ی که‌ده‌ستی خه‌ڵکی ده‌بڕن به‌ناوی ئه‌وه‌ی که‌گوایه شتی نهێنی‌و غه‌یب ده‌زانن‌و دزی ئاشکرا ده‌که‌ن‌و به‌خت ده‌گرنه‌وه, به‌هۆی پیاڵه‌ی قاوه‌وه ده‌ست ده‌خوێننه‌وه‌و ئه‌وه‌ی تۆ به‌ختت چۆنه‌و چیت لێ به‌سه‌ر دێ‌و ئه‌م درۆودەلەسانە, به‌ڵام ئایا غه‌یری خوا هیچ که‌س ده‌زانێ چی ڕووده‌دات‌و چ شتێك دێته‌پێش ئینسان؟

دایکی ئیمانداران عایشه‌ی خێزانی پێغه‌مبه‌ری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ده‌فه‌رموێ: (مَنْ زَعَمَ أنَّهُ یَعْلَمُ ما في غَدٍ, فَقَدْ أعْظَمَ عَلی اللهِ اَلْفَریَّةَ, لأنَّ اللهَ تَعالی یَقول: قُلْ لا یَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَات وَالْأَرْضِ الْغَیْبَ إِلَّا اللَّهُ). واته: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم پێیان بڵێ: جگه له‌خوا" هه‌رچی له‌ئاسمانه‌کان‌و له‌زه‌ویدا هه‌یه, هیچیان ئاگادار نین له‌غه‌یب‌و نهێنی‌و شاراوه‌کان. جا حه‌زره‌تی عائیشه(ڕه‌زای خوای لێبێت) فه‌رمووی: به‌به‌ڵگه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌ی قورئان" هه‌رکه‌سێ گومانی وا بێ که‌ئه‌و ده‌زانێ به‌یانی چی ڕووده‌دا" ئه‌وا گه‌وره‌ترین بوختانی به‌ده‌م خواوه کردووه! چونکه خوا خۆی ده‌فه‌رموێ: غه‌یری من هیچ که‌س هیچ شتێ له‌غه‌یب‌و نهێنییه‌کان نازانێ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلا ضَرّاً إِلاَّ مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوءُ﴾( الأعراف 188), واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویستم" پێیان بڵێ کەمن ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێك بەخۆم بگەیەنم, مەگەر وویستی خوای لەسەر بێ, خۆ ئەگەر غەیبو شاراوەکانم بزانیایە ئەوە کاری چاکەی زۆرم ئەنجام دەدا بۆ خۆمو ئومەتو هیچ ناخۆشییەکیشم بۆ پێش نەدەهات.

خۆشەویستانم: خواو پێغەمبەرەکەی ئاوا دەفەرموون, کەچی بەداخەوە لەکۆمەڵگای موسڵماناندا هێشتا ئەوانە زۆرن کەهەر ڕۆژەی بەناوێکەوەو هەر جارەی لەلایەکەوە کەسێك پەیدا دەبێو بازاڕی بۆ گەرم دەبێ, گوایە بەخت دەگرنەوەو بەختی بەستراو دەکەنەوەو ئافرەتی نەزۆك سك پڕ دەکەنو شتی دزراو بۆ خاوەنی دەدۆزنەوە, هەیانە بەو هەموو جەهالەتەی خۆیەوە دەم لەحەوت تەبەقەی ئاسمان دەکوتێ.

کێ هەیە لەکوردستانی خۆماندا چەند ناوێکی قۆڕ قۆڕو چەند نازناوێکی عەنتیکەی ئەم هونەرمەندە بێهونەرانەی نەبیستبێ؟! وەك: عاسە بیجەڕێنەو فایەقی مۆتێو مەلای چاوڕەشو فاتە کۆڵەنانیو حەمید چکچکانێو خلە سەرژنانیو خاتە کوڕانیو شێخ لوقمانو.. دەیانی تری وەك ئەم ناووناتۆرە ناشیرینانە. بەڵام لەوانەیە کەسانێك هەبن چووبنە لای ئەم فاڵچییانەو هەندێ قسەشیان بەڕاست لێوەرگرتبێو فیعلەن قسەی ئەو فاڵچییانە ڕاست دەرچووبێ, ئایا ئەمە چۆنە؟! دایکی ئیمانداران" خاتوو عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: چەند کەسێك هاتنە خزمەت حەزرەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمو لەبارەی فاڵچیو کاهینانەوە پرسیاریان لەحەزرەت کرد, پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: (لَيْسُوا بِشَيْءٍ), فەرمووی: هیچ نین. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا" ئاخر جارجار قسەکەیان ڕاست دەردەچێ, ئەی ئەوە چیە؟ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ ٱلْحَقِّ يَخْطَفُها الجِنِيُّ, فَيَقُرُّها في أُذُنِ وَلِيِّهِ, فَيَخْلِطُونَ مَعَها مائَةَ كِذْبَةٍ)(رَواهُ البُخاري وَمُسلِم).

فەرمووی: ئەوە ئەو قسە ڕاستە کەکابرای فاڵچی دەیڵێو قسەکەی ڕاست دەردەچێ ئەوەیە کەجنۆکە گوێ هەڵدەخەن بۆ گفتوگۆی فریشتەکانو قسەکە لەدەمی

ئەوان دەفـــڕێنن‌و ئینجا وەك مـریشکێ بلێ قـــرت ئـاوا دەیچپێنن بەگـــوێی برادەرەکەیاندا کەفالچیەکەیە, فالچییەکانیش لەگیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوەدەنێن‌و بلاویدەکەنەوە.

بەڕێزان: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ ئەویش ئەوەیە: ئایا بە چ شێوەیەك جنۆکەکان قسەی فریشتەکان دەدزن‌و بەفالچییە برادەرەکانیان رادەگەیەنن؟! وولامی ئەو پرسیارە بەو فەرموودەیەی ئیمامی بوخاری دەدەینەوە کەخاتوو عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: لەپێغەمبەری خوام بیست صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إنَّ الْمَلائِکَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنانِ ـ وَهُوَ السَّحابُ), فریشتەکان لەناو پەڵەهەوردا لەئاسمانەوە دێنە خوارەوە (فَتَذْکُرُ الأمْرَ قُضِيَ فِي السَّماءِ), ئەم فریشتانە لەنێوان خۆیاندا باسی ئەو کاروبارانە بۆ یەکتر دەکەن کە لەئاسمان بڕیاری لەسەر دەرچووە (فَیَسْتَرِقُ الشَّیْطانُ السَّمْعَ فَیَسْمَعُهُ), جنۆکەو شەیاطینەکانیش بەدزیەوە گوێ لەفریشتەکان دەگرن‌و ئەو پەیامە دەبیستن‌و (فَیُوحِیهِ إلی الْکُهَّانِ) دوایی دەیچپێنن بەگوێی فالچیەکاندا (فَیَکْذِبُونَ مَعَها مائَةَ کَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أنْفَسِهِمْ), ئیتر ئەوانیش لەگیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوەدەنێن.

ئیماندارانی بەڕێز: لـــەکـاتێکـدا خەریکـە موسڵمانان هۆشیار دەبنەوەو ئەو جـــۆرە دەستبڕانە دەوریان نامێنێ‌و بازاڕیان سارد دەبێ, کەچی زۆر بەداخەوە ئێستا لەڕێگایەکی ترەوەو بەناوێکیترەوە فالچیەتی لەناو میللەتاندا زیندوو دەکرێتەوەو لەم ڕێگەیەشەوە دەیانەوێت موسڵمانان تووشی شیرکی بچووك بکەن, ئەویش لەڕێگەی بلاوکردنەوەی بەرنامەی تەلەفزیۆنی‌و ڕۆژنامەکان‌و بەناوی (بورجەکان) وەکو ئەوەی هەموو ڕۆژێ گوێمان لێ دەبێ‌و دەیخوێنینەوە کەدەڵێ: لەدایکبوانی بورجی دووپشك, یان سەتڵ یان تەرازوو و چەند ناوێکی بێمانا کەبۆ خاوەنی ئەم بورجانە دەنووسرێ: تۆ لەم هەفتەیەدا" یان لەم مانگەدا تووشی فلان خۆشی یان فلان ناخۆشی دەبی, یان فلان دەسکەوتی داراییت دەبێ‌و بواری سۆزداریت بەم شێوەیە دەبێ!

بەڕێزان: وەڵلاهی شەرمەزاریە بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن, یان بۆ ڕۆژنامەو گۆڤار" کە بەناو ئەوانەی ئامادەو پێشکەشی دەکەن خەڵکی خوێندەوارو ڕۆشنبیرن" شەرمەزاریە

کەبەرنامەیەکی ئاوا خورافیو بێبناغە پێشکەش بکەن, لەسەردەمێکدا کە بەزەمانی ئەنتەرنێتو شەبەکەی عەنکەبووتیو قەریە صەغیرەو تیکنۆلۆجیاو سەردەمی زانستدا" تازە خەڵکی فێری ئەوە بکرێ کە بەهۆی بورجەکەیەوە بزانێ بەیانی چی لێ بەسەر دێو چۆن ناوکی دەکەوێو چۆن پارەی دەست دەکەوێ!! خۆ ئەگەر موسڵمانێکی مولتەزیم ئەوەی بووتایە ئەوا دەیانووت: تازە بەتازە موسڵمانان خەڵکی دەگێڕنەوە بۆ بیری ئەفسانەو خورافیات.

بەڕێزان: بەڕاستی ئەم بەرنامەی بورجانە کەهەر ناوەکانیان بۆ خۆی شتی ئەفسانەییو بێبناغەنو دوورن لەڕاستی" دەیان گەنجی کوڕو کچیان تووشی مەراقو دوودڵیو گومان کردووە دەیان خوێندکار کەبڕوای بەڕاستیی ئەو بورج خوێندنەوە هەبووە" لەخوێندنو دەرچوون پشتی ساردبۆتەوە.حەقی خۆیەتی بپرسین: ئەی فالچییە مۆدێرنەکان, ئەی دەزگاکانی راگەیاندن: ئایا میللەت پێویستی بەهیچی تر نیە ئەم ئەفسانەگەریو فالچێتییە نەبێ؟! کە بەڕاستی ئەم بەرنامەی بورجانە فالچێتییەکی مۆدێرنەو هەرکەسێ بڕوای پێی بێو بەڕاستی بزانێ تووشی شیرکی بچووک دەبێو ماوەی چل شەوو ڕۆژ نوێژی لێ قبووڵ نابێ! دەی خـــۆزگە ئەو بورجو بورجکارییە" بەرنامەیەکی ئاینیی بەتام, یان بەرنامەیەکی زانستی, پزیشکی, کۆمەڵایەتی بوایە کەپسپۆڕانی بواری دەروونزانیو کۆمەڵناسی" باسی موشکیلەی خەڵکیان بکردایەو چارەسەریان بۆ دیاری بکردایە, ڕێنمایی لەش بەبارو نەخۆشو دڵبەخەماکانیان بکردایە..

بەسە.. تاکەی؟ میللەتتان بێدنیا کرد, بێدینارتان کرد, دە ئیتر بێدینیشی مەکەن.

خۆشەویستان: زۆرجار بیستوومانە کەکەسێك دزی لێکراوەو دزەکە نەناسراوە, جا چوون بۆ لای یەکێ لەو ساحیرو کاهینو کتێب گرەوانە, ئەمیش باسی کەسێکی بۆ دەکات کەڕەنگی وایەو جلوبەرگی بەو شێوەیەو چەند سیفەتێك باس دەکات, بەشێوەیەك کابرای شت لێ دزراو گومانی دەچێتە سەر یەکێك لەو کەسانەی لێی نزیکنو گومانیان لێدەکات, کەزۆربەی کات ئەو کەسە بێتاوانەو ئاگای لەهیچ نیەو سەرەنجام دڵعاجزیو دووبەرەکیو ڕقو قینە لەنێوان ئەو دوو کەسەدا بەبەلاش دروست دەبێت, وەجارجاریش وابووە کەکابرای فالچی" ناونیشانی تەواوی دزەکەی داوەو دزییەکە ئاشکرا بووە! ئایا ئەمەیان

تا چ رادەیەك لەڕاستییەوە نزیكە؟ چۆن كابرای كتێب گرەوە ئەم دزەی دۆزیەوە؟!

ئەوڵامدا دەڵێین: هەموو ئەوجۆرە فالْچیو كتێب گرەوانە، دۆستو هاوڕێیان هەیە لەناو جنۆكەو خراپەكارو شەیاطینەكاندا، جنۆكەش توانایەكی زۆر گەورەیان پێبەخشراوەو ئاگاداری زۆر ڕووداون، جا كاتێ كابرای فالْچی داوا لەجنۆكە شەیطانەكە دەكا كەفلان دزی بۆ ئاشكرا بكا" جاری وا هەیە جنۆكەكە ئاگای لەم دزییە بووەو دزەكە دەناسێو بەفالْچییەكەی دەڵێ، بەڵام ئایا جنۆكەكە چی لەفالْچییەكە دەوێ؟ ئەوەی لێ دەوێ كەوەكو ئەو ببێتە شەیاطینیو لەڕەحمەتی خوا دووربێ. زۆرجار داوا لەفالْچییەكە دەكا كەسوژدە بۆ بتێك بەرێتو خۆی پێ كافر بكات ئەمجا ئەم یارمەتی دەدات. وەكو ئەم بەسەرهاتەی (شێخ مصطفی الحدیدي الطیر)(ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەكتێبەكەیدا (هادي الأرواح)دا دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا كابرایەكی ساحیر هەبوو، خەڵكی لەدەوری كۆدەبوونەوەو ئەویش داوای لەپیاوە ناودارەكان دەكرد كەئەموستیلەكانی دەستیان فڕێبدەنە ناو ئاوی بەحرەوە. كاتێ ئەموستیلەكانیان فڕێدەدایە ناو بەحرەكەوە" ئەم ساحیرە بۆی دێنانەوەو تەسلیمی دەكردنەوە! وەئەم ساحیرە شتی زۆر لەمەش عەجایبتری نیشانی خەڵكی دەدا. كاتێ ئەم ساحیرە مرد" كوڕەكەی دەیویست فێری ئەو پیشەیەی باوكی ببێ كەسیحرە، بەڵام دایكی ئەم كوڕە" كەژنی ساحیرەكەیە" بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەبوو كەكوڕەكەی وەك باوكی ببێ بەساحیر. جا كاتێ كوڕەكە لەدایكی پرسی بۆچی حەز ناكەی وەكو باوكم ببمە ساحیرو دەسكەوتێكی ماددیباشی پێ بەدەست بێنمو یارمەتی تۆش بدەم؟! دایكەكە گوتی: ئێستا پێت دەڵێم بۆچی حەز ناكەم ڕێگای باوكت بگری. هەر هەڵساو چوو دەرگای دۆڵابێكی بۆ كردەوە بتێكی لەبەرد داتاشراوی بۆ كوڕەكـــەی لەدۆڵابەكە دەرهێناو گوتی: ڕۆڵەی خۆم، كاتی خۆی باوكت كە لەژیاندا بوو، هەموو جارێ دەهات سوژدەی بۆ ئەم بتە دەبرد بۆئەوەی جنۆكەكان یارمەتی بدەن بۆ دەرخستنی شتی سەرسووڕهێنەر. جا ڕۆڵە، تۆ خۆت كافر مەكە وەكو باوكت كەكاتی خۆی" خۆی كافر كرد بەوەی سوژدەی بردبۆ ئەم بتە بەردەو خۆی خستەڕیزیشەیطانەكانەوەئەوانیش بەردەوام یارمەتیان دەداو هەندێ هەواڵی

نهێنیی‌ونه‌زانراویان به‌باوکت ده‌داو ئه‌ویش به‌خه‌ڵکی ده‌گه‌یاندو هه‌ندێ شتی ڕاستی لێ ده‌رده‌چوو!

له‌کۆتاییدا داواده‌که‌م که‌خوای گه‌وره به‌ڕه‌حمی خۆی ئاشنامانکا له‌گه‌ڵ خۆی، له‌گه‌ڵ دینه‌که‌ی، له‌گه‌ڵ عیلم، له‌گه‌ڵ حیلم، له‌گه‌ڵ ڕه‌وشتی په‌سه‌ندو ڕه‌سه‌ن خوای گه‌وره هه‌موو لایه‌کمان بکا به‌کلیلی خێر، به‌قفڵی شه‌ڕ. خوای گه‌وره وولاتو میلله‌تمان بپارێزێ له‌ناخۆشی، له‌نه‌خۆشی، له‌ئه‌فسانه‌گه‌ریی‌و دواکه‌وتوویی، له‌شه‌ڕی شه‌یطان‌و به‌لای زاڵمان‌وفیتنه‌ی کتێب گره‌وه‌و فاڵچیان..

اللهُمَّ آمين

# ووتـارى چوارەم
## شیركی هەرە بچووك ( الشِّركُ الأَصْغَر )

**بەشی دووەم**

قالَ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالى:

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلا أُشْرِكُ بِهِ أَحَداً, قُلْ إِنِّي لا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلا رَشَداً, قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللَّه أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً ﴾( الجـن 20 ـ 22)

قالَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

(العِيافَةُ والطِّيرَةُ والطَّرْقُ مِنَ اَلْجِبْتِ)  (رواهُ أبوداو والنائي)

قالَ الإمام إبن الجوزي (رَحِمَهُ اللهُ تَعالَى):

(مادامَ درْعُ اَلإِيمانِ على الْمَرءِ فَإِنَّ نَيْلَ العَدُوِّ لا يَقَعُ فِي مَقْتَلٍ)

**الحمدُ لله رَبّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیمانداران‌و خواناسان: سەلام‌و ڕەحمەتی خواتان لەسەر بێ. لەووتاری ڕابردوودا باسی هەندێك لەو شتانەمان کرد کەئینسان بەکردن‌و بڕوا پێبوونیان تووشی شیرکی بچووك دەبێ, بۆ تەواوکردنی ئەو باسە دەڵێم وَبِالله آلتَّوفيق:

یەکێکیتر لەو شتانەی کەدووره لەبیروباوەڕی پاك‌و بێگەردی ئیسلامەوەو مرۆڤی موسڵمان پێویستە لێی بەدووربێ, بریتییە لە (بەیدوومی) کە بەعەرەبی پێی دەڵێن (الطِّيَرَة), کەئەمەش جۆرە دابونەریتێکی نەفامییەو کەوتۆتە ناو کۆمەڵگاوە. جا ئەم بەیدوومییە زۆر جۆری هەیە" وەکو:

یەکەم: ئەگەر کەسێك خەریکی ئیشێك یان سەفەرێك بێ, لەو کاتەدا بپژمێ, ئیتر ئیشەکە ناکان یان واز لەسەفەرەکەی دێنێ‌و دەڵێ: سەبری بەسەردا هات, یان سەبرم پێوە نایەت! بەڵام بێئاگا لەوەی کەپژمین مانای سەبرکردن‌و پەلەکردنی تێدا نییە, بەڵکو پێغەمبەری چاوساغمان فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك پژمی" با سوپاسی خوا بکات‌و بڵێ (الحَمدُ لله), سوپاسی خوا بکا لەسەر ئەو خەلاتی پژمەیە کەبووە بەهۆی ڕزگاربوونی لەدەیەها ڤایرۆس‌و میکرۆب, نەك بترسێ‌و وا بزانێ کەئەم پژمینە نیشانەی ئەوەیە سەبربگرەو ئەو ئیشە مەکە!

دووەم: لەزۆر شوێن‌و لەبیروبڕوای گەلێك کەسدا ئەوە چەسپیوە کەئەگەر کەڵەشێر لەناوەختدا بخوێنێ ئەوە باش نیەو نیشانەی ئەوەیە بەڵایەك بەسەر ئەهلی ئەو ماڵ‌و شوێنەدا دێت, بۆیە هەر خێرا سەریدەبڕن. بەڵام کاتێ دەچینە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, لێی دەپرسین: ئایا خوێندنی کەڵەشێر لەهەر وەختێکدا بێ مانای چییە؟ خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (هەرکاتێ کەڵەشێر خوێندی ئەوە فریشتەی بینیوەو ئێوەش لەو کاتەدا دوعای خێر بکەن), نەك بچن سەریببڕن‌و وابزانن هەواڵی شەڕی پێیە.

سێیەم: دەوترێ ئەگەر کوندەپەپوو لەسەر ماڵێك بنیشێ یان بخوێنێ, ئەوە ئەو ماڵە وێران دەبێ

وەلآم ئیماندارانی بەڕێز: بابزانین ئایا پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەربارەی ئەوجۆرە کەسانە کەئەوجۆرە بیروباوەڕەیان هەیە" چی دەفەرموێ؟ پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (مَنْ رَدَّتْهُ الطِّيَرَةَ عَنْ حاجَتِه فَقَدْ أشْرَكَ) (رواهُ أحمَد). وتە: ئەگەر کەسێك بۆ شوێنێك چوو, یان ویستی ئیشێك بکات, بەلآم لەبەر شوومیی دەنگێکەوە گەڕایەوە, ئەوە هاوبەشی بۆ خوا بڕیارداوە.

لەفەرموودەیەکیتردا ئبن مەسعوود(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم فەرمووی: (الطِّيَرَةُ شِرْكٌ, الطِّيَرَةُ شِرْكٌ, الطِّيَرَةُ شِرْكٌ)(رواهُ أبو داود). خۆشەویستمان صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: بڕوابوون بەبەیدوومیو بەدقدوومی شەریك بۆ خوا بڕیاردانە.

بەڕێزان: کاتی خۆی عەرەبەکانی مەککە بتێکیان هەبوو ناوی (هوبەل) بوو, بەردێکی بەنرخی ڕەنگ سوور بوو لەشێوەی مرۆڤدا, عەرەبەکان ئەگەر ئاکۆکییان لەکارێکدا ببوایە یان بیانویستایە سەفەرێك بکەن" دەهاتنە لایو (باسکەتیرانە )یان دەکرد. باسکەتیرانەش ئەوەبوو چەند باسکە تیرێکیان دێناو لەسەر هەندێکیان دەنووسی بەڵێ, لەسەر هەندێکی تریش نەخێر, ئەمجا دوای تێکەڵکردنیان تیرێکیان هەڵدەگرتو بەپێی بەڵێو نەخێرەکە بڕیاریان دەدا.

بەڕێزان: ئەمە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام ئەم باسکەتیرانەیە کراوەو خەڵك بڕوای بەم خەرافیاتو شتە پڕوپووچانە هەبووە بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆی. بەلآم ئەوەی جێگای سەرنجە دوای هەزارو چوارسەدو ئەوندە ساڵە دوای هاتنی ئاینی پڕخێرو بەرەکەتی ئیسلام" کەچی هەر شوێن کەوتوانی ئەم دینە پیرۆزە, باسکەتیرانەی بتپەرستەکانی عەرەب دووبارە دەکەنەوە, ئەوەش بەوەی کەڕۆژانی چوارشەممەو جومعان" ژنو پیاوو کوڕو کچ ڕوودەکەنە سەر گۆڕو مەزاری پیاوچاکانو سەرەڕای ئەو داروبەرد پەرستیو شیرکی هەرەگەورەی کە لەسەر گۆڕەکانیان دەکرێو باسمان کرد, سەرەڕای ئەوەش لای زۆربەی ئەو گۆڕانەوە چەند بەردێك دانراون وەکو نیشانە بۆئەوەی ئەگەر کەسێك ویستو ئارەزوو و ئاواتێکی هـــــەبێو بزانێ بـــــۆی دێتە جێ یان نا, ئەوەئەودوو بەردە دەخاتە سەر یەکو ئەگەر خولانەوەو نەکەوت ئەوە

ماناییوایەئیشەکە دەکرێو ئەگەر بۆی نەخولایەوە ئەوە مانای ئەوەیە ئاواتەکەی نایەتەدی.

جا توخوا ئەمە هیچ فەرقی هەیە لەگەڵ باسکەتیرانەکەی جاهلییە بتپەرستەکانی عەرەبدا؟ بێگومان نەخێر, بەڵکو هەر ئەوندە دەڵێم: حەیف بۆ موسڵمان, سەرەڕای ئەو هەموو نوورو رووناکیەی ئیسلام" کەچی خۆی بخاتە تاریکایی نەفامیو بیروباوەڕیپڕوپووچەوە.

خۆشەویستان: لەناو موسڵمانانندا زۆر شت هەیە, بەتایبەتی ئافرەتان زۆر سیقەیان پێیەتیو ئاینی ئیسلام بەپەسەندی نازانێ, وەکو ئەوەی بەهەندێ شت دەووترێ بەدقدوومە, یان فلان ئافرەت کە لەهەموو لایەنێکی ئاینیو ڕەوشتیەوە رێکوپێکە" بەڵام وەکو بوو بەبووکی ئەو ماڵە بەدقدووم بوو, تووشی چەند موصیبەت بوون. یان فلان خانوو هەرچەندە رێکوپێکو خاوێنە بەڵام ماڵی فلان کەس وەکو چوونە ناویەوە خێریان لەخۆیان نەبینی ! وەگەڵێك قسەیتری لەم بابەتە. بەڵام با بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا بزانین ئەو لەو بارەیەوە چی فەرمووە؟ پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (لا عَدْوى وَلا طيـرَةَ, وَيُـعْـجِبُني الفَألُ, قالُوا: وَما الفَألُ؟ قـال: كَلمَةٌ طَيِّبَةٌ) . (مُتّفق عليه).

واتە: نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە بەبێ ڕەزابوونی خوا لەسەری هەیەو نە قراندنو نوقڵانەی خراپ بۆی هەیەو نە پێڕەشیو بەدقدوومیی بۆی هەیە, بەڵام نوخشە لێدانم پێخۆشە. صەحابەکان عەرزیان کرد: قوربان نوخشە لێدان وەکو چی؟ فەرمووی: وەك ئەوەی کارێکتان بەدەستەوەیە دەتانەوێ بیکەنو لەکاتی نیازی کردنەکەیدا ووشەیەکی باش بەر گوێتان بکەوێ. بۆ نموونە: کەسێك شتێکی کڕیوە, تۆ پێی بڵێی: ئینشائەڵڵا خێری لێ دەبینی, یان یاخوا خێرت بۆ بداتەوە, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم ئەم نوقڵانە چاکەی پێ خۆشبووە.

نوقڵانەی خراپیش وەکو ئەوەی: فـلان کەسیش لەوەی تـۆی کڕی بەڵام خێری لێ نەدی, یان هی وا هەیە دەچێ بۆ لای نەخۆشێك سەیری دەرزیو دەرمانەکەی دەکاتو لەجیاتی ئەوەی دڵخۆشیی بداتەوەو بڵێ: ئینشائەڵڵا پێیان چاك دەبی" دەڵێ: بەخوا

منیش لەو دەرزیو دەرمانانەم بەکارهێناو هیچ پێیشی چاك نەبووم. کابرای نەخۆش بەم قسەیە دڵنارەحەتیەکی تووش دەبێ. جا پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم ئەمجۆرە نوقڵانە لێدانەی بەخراپە" پێخۆش نەبووە, چونکە ئازاردانی دڵی موسڵمانانی تێدایە.

عورووەی کوڕی عامر دەفەرموێ: لەخزمەتی پێغەمبەردا صَلَّی اللهُ عَلَیه وسَلَّم باسی نوقڵانە کرا, پێغەمبەر فەرمووی: (أَحْسَنُها الفَأْلُ, وَلا تَرُدُّ مُسْلماً), فەرمووی: نوخشەو نوقڵانە لێدانی باش, شتێکی زۆر باشە چونکە دڵخۆشکردنی موسڵمانانی تێدایە, نوقڵانەی خراپیش موسڵمان ناترسێنێو کۆڵی پێناداو پەکی کاری ناخا کەبڵێ تازە مادەم فلان کەس نوخشەی خراپی لێدا ئیتر خێری لێ نابینم. ئەمجا فەرمووی: (فَإِذا رَأَى أَحَدُكُمْ ما يَكْرَهُ, فَلْيَقُلْ: اللهُمَّ لا يَأْتي بِالحَسَناتِ إِلاَّ أنتَ, وَلا يَدْفَعُ ٱلسَّيِّئاتِ إِلاَّ أنتَ, وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ) (حديث صحيح, رواهُ أبو داود بِإسناد صحيح), واتە: ئەگەر تووشی شتێك بوون لەم بابەتەوە, نوخشەی باشیان بۆ لێنەدا, ئەوە گوێی پێ مەدەنو بەوە لەنیازی باشو کاری خێر پەشیمان مەبنەوەو بۆ دڵنیاییش ئەم دوعایە بخوێننو بڵێن: پەروەردگارم, ئەی خوای من, چاکەو خراپە هەمووی بەدەستی خۆتە, هەر خێرێ تۆ نەیدەی نابێو هەر شەرێ تۆ لەکۆڵی نەخەی لەکۆڵ ناکەوێو, ئەوەی حەزی تۆی لەسەر نەبی نابێ, هێزو توانایی هەر بەدەستی تۆیە.

بەڵێ, ئەمە بیروباوەڕی ئینسانی موسڵمانەو (مَنْ تَوَكَّلَ عَلى اللهِ كَفاهُ) هەرکەسێك پشت بەخوا ببەستێ خوای بەسە, لەبەر ئەوەی موسڵمان بڕوای بەو حەقیقەتە نەگۆڕە هەیە کەئەگەر هەموو دونیا کۆبێتەوە ناتوانن بچووکترین قازانج بەکەسێك بگەیەنن یان بچووکترین زەرەری لێبدەن تەنها بەئیزنو بەوویستی خوای پەروەردگار نەبێ.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەو شتانەی کەئینسان تووشی شیرکی بچووك دەکاتو پێویستە موسڵمانان خۆی لێ بپارێزن" بریتیە لە (پەتو پەڕۆ کردنەدەست) وەکو ئەوەی پارچە پەڕۆیەکی سەوز یان هەر رەنگێکیتر لەسەر گۆڕی پیاوچاکێك هەڵگرێو لەبەدەستی بکات, ئەوەش بەمەبەستی پیرۆزی یان چاکبوونەوە لەنەخۆشی.

رۆژێك پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم" چاوی بەکەسێك کەوت کە لەبەر لاوازیو نەخۆشی" پەتی لەدەستی خۆی ئاڵاندبوو, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم پێی

گوت: (ألا إنَّها لا تَزيدُكَ إلاَّ وَهْناً, إنبذْها فإنَّكَ لَو مُتَّ بِها ما أفْلَحْتَ أبَداً) (رواهُ أحمد), واتـە: ئـەم پـەت لـەدەسـت کردنـەت لاوازیـت زیـاد دەکـات, جـا فرێی دە چونکە ئەگەر بمریتو ئەمەت لەدەستدا بێ بەهیچ جۆرێ رزگارت نابێ (لـەئـاگـر)!

هەروەها زۆرجار دەبینین منداڵی بچووك ملوانکەی شینی لەملدایەو رەسمی چاوێکی پێوەیە, گوایە ئەمە بۆ چاوەزارە, یان هەندێ ماڵ هەیە لەسەر دەرگای حەوشەکەی" ناڵی وولاخ هەڵدەواسێ یان پارچەیەکی شین کەوێنەی دەستێکە لەسەر دەرگاو ناو هەیوان هەڵواسراوە, ئایا حوکمی ئەمە چییە؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (مَنْ تَعَلَّقَ تَميمَةً فَقَدْ أشْرَكَ)( رَواهُ أحمد), واتە: هەرکەسێ موورووی هەڵبواسێ بەمەبەستی لابردنی دەردو بەڵاو نەخۆشی" ئەوە هاوبەشی بۆ خوا بڕیارداوە!

بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێین کەئەو کەسەی ئەوجۆرە شتانە دەکات, کاتێ تووشی ئەم شیرکە دەبێ" وەختێ عەقیدەی وابێ کەئەم مووروووە شینە یان ناڵە گوێدرێژە" خۆی لەخۆیدا تەئسیرو کاریگەریی هەیە بۆ دەفعی چاوپیسیو چاوی حەسوود, بەڵام ئەگەر عەقیدەی وابوو کەئەم شتانە هیچ نینو هەرچی خوا مەیلی لەسەر نەبێ نابێو هەرچی خوا ئینسانی لێ نەپارێزێ هیچ شتێ ناتوانێ ئەو بەڵایەی لێ دووربخاتەوە, بەڵام مەبەستی لەهەڵواسینی موورووی شینو ئەمانە بۆ ئەوە بێ کەکاتێ ئینسانی چاوپیسو حەسوود وویستی سەیری منداڵەکە یان خانوو و ماڵەکە بکات" لەپڕ چاوی کەوت بەو مورووە شینە کەچاوێکی تێدایە, یان ناڵی گوێدرێژ بەسەر دەرگاوە یەکسەر فیکری دەگۆڕێو پێی سەیر دەبێ ئەم چاوە چیە لەملی ئەم منداڵەدا, یان چ پەیوەندییەك هەیە لەنێوان ناڵو خانوودا, لەم بیرکردنەوەدا ئەو حەسوودیو چاوپیسییەی لەبیردەچێتەوە, جا ئەگەر بەم نیەتەی باسمان کرد ئەم شتانە بەکار بێنێ, ئینشائەڵلا پێی گوناهبار نابێ, بەڵام وازهێنان لەم شتانەو پشت بەستن بەخواو خـوێندنی ئـەو سوورەتو ئـایەتانـەی کـە لەقورئاندا هەنو بۆ لابردنی بەڵای چاوپیسو حەسوود دەخوێندرێن" لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کە فەرموویەتی بۆ دەفعی چاوەزارو حەسوودی بیخوێنن, ئەوەیان زۆر باشەو خوای گەورە هەموو لایەکمان لەبەڵای چاوپیسانو دەروونی حەسوودان بپارێزێ.. اللهُمَّ آمین.

خۆشەویستان: یەكێكی تر لەو شتانەی كەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیە وسَلَّم بەشیرك ناوی بردوونو لەناو موسڵماناندا دەبینرێ" بریتیە لە (نوشتەی ناشەرعی ـ الرُّقَی) وەكو ئەوجۆرە دوعا نووسینانەی كەهەندێ كەسی دەستبڕ قوڵی ئینسانە فەقیرحاڵەكان" بەتایبەت خوشكانو دایكانی بەستەزمانی پێدەبڕن، گوایە نوشتەی چاوەزارو منداڵبوونو بەخت كرانەوەو لابردنی جنۆكەیان بۆ دەكەنو لەبەرامبەردا پارەیەكی زۆریان لێدەستێنن، بەبێئەوەی هیچ بناغەیەكی شەرعی بۆ ئەم جۆرە دوعاو نوشتە نووسینانە هەبێ! بەتایبەتی جۆرە نوشتەیەك دەكرێ بەناوی نوشتەی ڕەشیو سپی (التِّوَلَة) كەنوشتەنووسەكان دەینووسن بەمەبەستی ناشیرین كردنی پیاو لەلای خێزانەكەی، كەئەمەش زۆرجار كوشتنی ئافرەتەكەی لێدەكەوێتەوە لەلایەن مێردەكەیەوە یان جیابوونەوە (طَلاق) ڕوودەدات!

پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (إنَّ الرُّقَی والتَّمائِمَ والتِّوَلَةَ شِركٌ)(رواهُ أحمد)، واتە: بەڕاستی هەڵواسینی مووروو بەملی منداڵدا بۆ پاراستنی لەچاوی پیسو نوشتەی ڕەشو سپی" هاوبەش دانانە بۆ خوا.

خۆشەویستان: كەباسی نوشتەنووسینمان كرد با بزانین ئایا هەموو جۆرە نوشتەیەك ناشەرعیيە؟ لەوولامدا دەڵێین: ئیمامی سیوطي دەربارەی نوشتەی ناشەرعی دەفەرموێ: هەندێك لەزانایان دەفەرموون: نوشتە بەچوار مەرج شەرعی یان حەڵاڵە:

یەكەم: بەئایەتەكانی قورئان، یان ناوەكانی خوا، یان بەصیفەتەكانی خوا بێت.

دووەم: بەزمانی عەرەبی بنووسرێتو مانا بدات.

سێیەم: بڕواشت وابێت كەنوشتەكە خۆی لەخۆیدا هیچ سوودی نیە بەڵكو هەموو شت لەژێر وویستی خوادایە.

چوارەم: دەبێ ئەم دوعایە كەقورئانی تێدا نووسراوە لەجێگایەكی پاكدا دابنرێو ئەوەی هەڵی دەگرێ لەشی پیس نەبێ.

كەواتە: نابێ دوعاكەو نوشتەكە بەگوێدرێژو هێسترو مانگای شێتەوە بكرێ، یان لەگەوری مەڕو ماڵاتدا هەلبواسرێ. هەروەها دەبێ بڵێین: ئەوەی كەزۆر گرنگە بۆ ئەوەی ئەو نوشتەیە خوای گەورە بیكات بەسەبەبی شیفای نەخۆشیو لادانی دەردو بەڵا ئەوەیە:

کەدوعانووسەکە ئینسانێکی عالمو خواناسو واریع بێ, معامەلە بەدوعانووسینەوە نەکات, چاك وایە هەر هیچ سەرقەڵەمانە وەرنەگرێ, خۆ ئەگەر کەسێکی موحتاجو دەستکورت بوو, ناچاربوو سەرقەڵەمانە وەرگرێ ئەوە دەبێ خۆی داوا نەکاو ئەگەر شتێکیان دایە بڕێکی کەمی لێ هەڵگرێ.

خۆشەویستان: کاتێ کەباسی نوشتەی ڕەواو شەرعیمان کرد, حەز دەکەم ئەم بەسەرهاتەتان بۆ بگێڕمەوە کەصەحابیی بەڕێز ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کۆمەڵێك لەصەحابە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەسەفەرێکدا بوون, تاوەکو لایاندایە گوندێك لەگوندنشینەکانی عەرەب. صەحابەکان زۆر هیلاکو برسیەو ماندوو بوون, بۆیە لایاندایە لای خەڵکی ئەو ئاوەدانییەو داوای نانو ئاوێکیان لێکردن, بەڵام خەڵکەکە هیچ ڕوویان نەدانێو ئامادە نەبوون میوانداریان بکەنو یارمەتییان بدەن. صەحابەکان زۆر هیلاكو برسی لەقەراخ ئاوەدانییەکەوە بۆ خۆیان دانیشتن ئیسراحەتێك بکەن, لەو کاتەدا سەرۆکی ئەو گوندەو ئاغاکەیان" دووپشکێکی زۆر بەژەهر پێوەیدا, خەڵکەکە هەرچی دەواودەرمان هەیەو بۆ شکاندنی ئازاری پێوەدانی دووپشك بەکاردێ" بۆیان بەکارهێنا بەڵام هیچ سوودی نەبوو, جار لەجار ئازارەکەی زیادی دەکرد. ئەوەبوو هەندێ لەو کەسانەی لەدەوروبەری ئاغاو گەورەکەدا بوون گوتیان: باشە خۆ وا ئێمە هیچمان پێنەکرا بۆ گەورەکەمان کەتۆزێ ئازاری بشکێنێ, باشە بۆ نەچین بۆ لای ئەو کۆمەڵە کە لەدەرەوەی ئاوایی لایانداوەو باریان خستووە, بەڵکو ئەوان کەسێکی وایان لەگـەڵدا بێ دەرمـانێك, شتێکی وای پێبێ کەبۆ ئازاری دووپشك پێوەدان باش بێ. بەڵێ, چوون بۆ لای صەحابەکانو گوتیان: ئەی کۆمەڵە خەڵکینە, گەورەکەمان دووپشك پێوەی داوە, هەرچی لەتوانامان‌دا بوو لەدەرمان بۆمان بەکارهێنا بەڵام سوودی نەبوو, ئایا لەنێو ئێوەدا کەسێکی واتان لەگەڵ نیە کەچارەسەری ئازاری پێوەدانی دووپشك بزانێ؟ ئەبو سەعیدی خودری هەستاو فەرمووی: بەڵێ, ئەرێ بەخوا من دەتوانم دوعای بۆ بەسەردا بخوێنمو خوا شیفای بداو ئازاری نەمێنێ, بەڵام بەخوا ئەوەم هەر لەبیرە کەهاتین بۆ لاتانو داوای نانو ئاوێکمان لێکردن بەڵام ئێوە بەمیوان قبووڵتان نەکردینو دەرگاتان لێ نەکردینەوە, شەرتبێ منیش هیچ

دوعاو نوشتەیەکتان بۆ نەکەم هەتا کرێی تەواوتان لێ وەرنەگرم ! بەڵێ، جەماعەتی ئاغا ڕازیبوونو گوتیان: چەندی کرێتان دەوێ دەتاندەینێ. وەلحاصڵ" لەسەر (30) سەر مەڕ پێکهاتن! بەڵێ، ئەبو سەعیدی خودری چوو بۆ لای سەرۆك کەهاوارو ناڵەی دەهات لەتاو ئازار. حەوت جار سووڕەتی فاتیحەی بەسەر شوێنە پێوەدانەکەدا خوێندو ئەمجا فووی لەشوێنەکە کردو تفی لەشوێنەکە دا. سُبحانَ اللهِ دەست بەجێ کابرای سەرۆك هەستاو وەکو چۆن ئاژەڵ کەچوارپەلی دەبەستنو دوایی دەیکەنەوە ڕاست دەبێتەوە ئاوا ڕاست بۆوەو دەستیکرد بەهاتوچۆو هەرچی پێی بڵێی ئازار لەناو لەشیدا نەما.. بەڵێ ئەوانیش ئەو (30) مەڕەی کەوەعدیان دابوو" دایان بەئەبو سەعیدی خودریو پاشان صەحابەکان گوتیان: دەی با لەنێو خۆماندا بەشی بکەین. ئەبو سەعید کەدوعاکەی خوێندبوو فەرمووی: نا، با بەشی نەکەینو هیچی لێنەخۆین تاوەکو دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم با بزانین ئەو چی دەفەرموێو ئەمری بەچیە! بەڵێ هاتنەوە بۆ شاری مەدینەو چوونە خزمەت پێغەمبەرو تەواوی بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: باشە ئەوە چۆنت زانی کەسووڕەتی فاتیحە بۆ دوعا دەبێو شیفای نەخۆشی تێدایە؟! ئەمجا فەرمووی: (قَدْ أَصَبْتُمْ، أَقْسِموا وَاضْرِبوا لي مَعَكُمْ سَهماً)، فەرمووی: چاکتان کردو دەستتان خۆش بێ کەدوعاکەتان بۆ کردو لەسەرقەڵەمانەکەشتان نەخوارد. تا نەهاتنەوە بۆ لامو پرستان پێنەکردم، دەئێستا بزانن پێتان حەڵاڵەو لەنێوان خۆتاندا دابەشی بکەنو بەشێکیش وەکو بەشەکەی خۆتان بۆ من دابنێن. ئەمجا پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پێکەنی! (ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە).

لەڕیوایەتی ئیمامی بوخاریدا حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إنَّ أحَقَّ ما أَخَذْتُمْ عَلَيهِ أجْراً كتابُ اللهِ)، واتە: بەڕاستی لەهەموو شتێ حەقتر کەکرێی لەسەر وەربگرن کتێبی خوایە کەقورئانی پیرۆزە.

خۆشەویستان: لەسەر مەسەلەی پارەوەرگرتن لەسەر دوعانووسینو نوشتەکردن کەپێی دەڵێن (سەرقەڵەمانە)، ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: (لەم فەرموودەیەدا کەپێغەمبەری خوا

صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: بەشی منیش لەو سەرقەڵەمانەیە دابنێن" ئەوە بەئاشکرا دەردەکەوێ کەدروستە سەرقەڵەمانەو کرێ لەسەر ئەو دوعاو نوشتانە وەربگیرێ کە بەسوورەتی فاتیحەو زیکری خوا دەکرێن‌و دەنووسرێن, وەئەو سەرقەڵەمانەیەش حەڵاڵەو هیچ ناپەسەندی‌یەکی تێدا نیە. هەروەها دروستە ئینسان" قورئان فێری خەڵکی بکاو لەبەرامبەردا کرێ وەربگرێ, ئەمەش مەزهەبی شافعی‌و مالیك‌و ئەحمەدو ئیسحاق‌و ئەبی ثورو کۆمەڵێکی‌تر لەزانایانی پێشین (السَّلَفْ)ـە, عولەماکانی دوای ئەمانەش هەمان بیروڕایان هەیە. بەڵام ئیمام ئەبوحەنیفە فەرموویەتی: حەرامە بەپارە" قورئان فێری خەڵك بکرێ, بەڵام دروستە سەرقەڵەمانەی نوشتەی شەرعی وەربگیرێ).

خۆشەویستان: بەڵام چەند خاڵێك هەیە دەبێ ئاگامان لێبێ‌و هەموو نوشتەنووسێك بەشەرعی نەزانین!

یەکەم: نابێ ئەو کەسەی نوشتە دەنووسێ, ئەمە بکات بەپیشەو شوێنی تایبەتی هەبێ بۆ ئەوەی خەڵك ڕۆژانە بچن بۆ سەردانی‌و ژیانی لەسەر ئەو دوعانووسینە بێ.

دووەم: نابێ ئەو سەرقەڵەمانەیەی کەوەری دەگرێ" پارەیەکی خەیاڵی بێ وەکو ئەو نوشتەنووسانەی کەبۆ نووسینی نوشتەیەك بۆ شێتێك" چوارسەد دیناری چاپی کۆنیان وەرگرتووەو بەحیساب خاتریشیان گرتوون. کاتێکیش دوعاکە دەکەیتەوە تەماشادەکەی جەنابی دوعانووس تاقەتی نەبووە بۆ هەرکەسێك دوعایەکی تایبەت بنووسێ بەڵکو کاغەزێکی ئیستنساخ کردووەو بۆ هەموو نەخۆشەکان هەر ئەوەیەو تەنها ناوی نەخۆشەکان کە لەسەر کاغەزی دوعاکە نووسیونی" فەرقی هەیە.

سێیەم: نابێ ئەم نوشتەنووسە ئەگەر پیاو بێ" ژنان هاتوچۆی بکەن‌و سەرەی بۆ بگرن‌و بەبێ مەحرەم لەلای دانیشن, چونکە ئەمە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامەو نابێ بەناوی ئاینەوە بکرێ.

چوارەم: لەمەترسی‌یەکانی ئەوجۆرە نوشتەنووسانەی کەدەیکەن بەپیشەو شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ ئەوەی خەڵکی لەوێ سەردانیان بکەن بۆ نوشتەنووسین" ئەوەیە کەزۆربەی کات ئەو خەڵکانەی نوشتەکەیان بۆ دەنووسرێ" کاتێ دەبینن ئەو هەموو خەڵکە وا لەلای ئەو نوشتەنووسە کۆبوونەتەوەو هەریەکە بەجۆرێك وەصفی چاکی‌و

قبوولیی دوعاکانی دەکەن، وای لێ دێ ئەو خەڵکانە ئەوەندەی سیقەو متمتنەیان بەچاکیو پاکیی دەمونفووسی دوعانووسەکەیە“ نیو ئەوەندە سیقەیان بەقورئانەکە کە لەناو نوشتەکەدا نووسراوە“ نییە! کەئەمەش گەورەترین خەتەر لەسەر عەقیدەی موسڵمانان دروست دەکات. جا کەواتە: هەرکەسێك کەدوعای بەقورئانو بەسوننەت جاربەجارو حاڵەتی زەروور بۆ موسڵمانان نووسی دەبێ هەموو جارێ ئەوەیان بۆ باس بکا کەئەوە بەرەکەتی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرە صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلَّم کەخوا شیفای ئەو نەخۆشییە دەداتو، ئەم تەنها نووسینی لەسەرەو هیچ بەرەکەتو فەزڵێکی ئەوی تێدا نییە.

پێنجەم: دەبێ دوعانووسەکە پیاوێکی عالمو خواناسو واریعو دەستو دەمو دڵ پاك بێ ئەمجا دوعانووسینەکەی (ئەویش ئەگەر خوا مەیلی لەسەر بێ) سوودی دەبێ، بەڵام ئەگەر بینیتان کەسێك دوعاو نوشتە بۆ خەڵك دەنووسێ بەڵام تا بڵێی پیاوێکی دوور لەدینو حەرام خۆرو بەتەماعو چاو لەدەرو حەز بەمەجلیسی ژنان دەکا“ کەچی خەڵکیش دەڵێن سوودمان لەدوعاو نوشتەکانی بینیوە“ ئەوە بزانن کەشەیطان یارمەتی ئەو دوعانووسە دەدات، وەکو ئەوەی کەجارێکیان عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود(ڕەزای خوای لێبێت) چووە ماڵەوە، تەماشای کرد خێزانەکەی پەتێکی لەملدایە، فەرمووی: ئـافـــرەت ئەوە چیە لەملتایە؟ خێزانەکەی فەرمووی: ئەوە نوشتەیەو دوعای بۆ نەخۆشی بەسەردا خوێندراوە، ئبن مەسعوود هەر پەلاماری پەتەکەی داو پچڕاندیو فرێی داو فەرمووی: ماڵو منداڵی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بێ ئیحتیاجن لەوەی شەریك بۆ خوا بڕیار بدەن، من لەپێغەمبەری خوام صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بیستووە کەفەرمووی: (إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمائِمَ، وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ). خێزانەکەی ئبن مەسعوود فورمووی: باشە تۆ وا دەڵێیو کەچی من چاوم ئازاری تێدابوو، منیش چووم بۆ لای فلان جوولەکە نوشتەی بۆ کردم، چاوم ئازاری تێدا نەما، ئەی ئەمە چیە؟! عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، صەحابیی شارەزاو ئیمان پۆڵایین“ فەرمووی: (إِنَّما ذلِكَ عَمَلُ الشَّيْطان، كانَ يَنْخَسَها بِيَدِهِ، فَإِذا رَقَيتَها كَفَّ عَنْها)، فەرمووی: ئەوە ئیشی شەیطانە، بەدەستی خۆی ئازاری چاوتی داوە، کاتێ نوشتەی بۆ کردووە شەیطانەکە وازی لەچاوت هێناوە!

بەم شێوەیە، ئەم شەیطانە وا دەکات خەڵکی سیقە بەم جوولەکە یان جوولەکە ڕەوشتە بکەن‌و بازاڕی بۆ گەرم ببێ‌و، شەیطان لەم ڕێگەیەوە هاوکاری فاڵچی‌و کتێب گرەوەکان دەکات بۆ ئەوەی موسڵمانان گومڕا بکەن‌و بەرەو شیرك بیانبەن.

جا بەڕێزان: ئەگەر بێتو یەك دوو کەس سوود لەنوشتەی ئەم جۆرە خوانەناسانە وەربگرن، ئەوە وەکو ووتمان فێڵی شەیطانەو بەسەدان کەسی تر بەم دوو کەسەوە دەخەڵەتێن‌و هیچ سوودێك لەنوشتەی ئەم جادووگەرانە نابینن‌و سەرەڕای لەدەست چوونی پارەکانیشیان" عەقیدەی پاکی خۆیشیان دەخەنە مەترسییەوەو لەشیرك نزیك دەبنەوە!

ئیمانداران: بۆ ناسینەوەی ئەو جۆرە نوشتەنووسە دەستبڕانە، چەند نیشانەیەك هەیە، وەکو ئەوەی معامەلە لەسەر نووسینی نوشتەکە دەکاتو پارەیەکی زۆر وەردەگرێ، هەروەها هۆکاری نەخۆشییەکە دیاری دەکات، بەهەندێ کەس بەتایبەت بەئافرتان دەڵێ: ناوی گەرمت لەشەودا ڕشتووەو جنۆکەت سووتاندووە، بۆیە ئەوانیش تۆڵەت لێدەکەنەوەو ناهێڵن منداڵت ببێ!! یان بەکەسێکیتر دەڵێن: چاوی خەڵکت لەسەرەو حەسوودیت پێ دەبەن! وەچەندەها قسەی تر، بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو کەسە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ کەچووە بۆ لای بۆ نوشتەکە وەخۆی وا دەربخا کەگوایە ئاگای لەشتی غەیبییەو زۆر پیاوی چاکەو لەناو خەڵکدا مەدحی بکەن بڵێن: دەڵێی لەگەڵمدا بووە، چۆنی گوت وابوو!! هەروەها هەندێکیتر لەو نوشتەنووسە دەستبڕو خوانەناسانە نیشانەیان ئەوەیە: کەبەو کەسەی داوای نوشتەکە دەکات دەڵێ: دەبێ ئەم نوشتەیە لەناو قەبرێکی تازەدا بشاریتەوەو هەرکاتێ نوشتەکە ڕزی ئەوە ژن‌و مێردەکەش دڵیان لەیەکتر ڕەش دەبێ ! یان دەڵێ: برۆ هێلانەی پەڕەسێلکەیەك تێك بدەو پووش‌وپەڵاشی هێلانەکەی لەگەڵ خوێنی پەڕەسێلکەکەدا تێکەڵ بکەو بیسووتێنە، نەخۆشیەکەت چاك دەبێ!! ئەمەو دەیەها شتیتری بێماناو بێبنچینەو دوور لەدین‌و بەرنامەی پاکی ئیسلام. بۆیەش باسمان کردن تاوەکو موسڵمانان بەم نیشانانە بیانناسنەوەو خۆیان لەم دەستبڕانە بپارێزن‌و بەپارەی عەرەقی ناوچاوی خۆیان" گیرفانی ئەو بێویژدانانە گەرم نەکەن‌و بیروباوەڕی خۆیان لەشیرك بپارێزن.

خۆشەویستان: بەڕاستی جێگای ئەسەفـو داخە کەئەو دەستبڕانە" کە بەناوی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە, بەناوی قورئانی پیرۆزەوە ژیانی خۆیان مسۆگەرکردووەو کاسپیەیەکی ناشەریفانە دەکەنو بوونە میکرۆبی سەرەطان بۆ ژیانی دەیان ژنو مێردی بەختەوەرو بەنوشتەو جادوو لەیەکیان کردن, سەدان شەریكو شەریك, براو برا, دایكو کچیان لەیەکتر کرد بەدوژمنو بوونە مایەی لەناوبردنی سۆزو خۆشەویستیی نێوانیان, ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەگەر کەسێك لەواقیعی ئیسلام شارەزا نەبێ وادەزانێ دین هەر ئەوەیەو قورئان هەر بۆ ئەوە هاتووە بکرێ بەدوعاو نوشتەو سەرقەڵەمانەی لەسەر وەربگیرێ ! بەڵام بێئاگا لەوەی کەقورئان لەجیاتی ئەوەی وەکو نوشتەو دوعا بەکاربهێنرێ بۆ چارەسەری نەخۆشیو بۆ باش کردنی نێوان ژنو مێردی ناکۆكو لەسەر کاغەزێك بنووسرێو ئاوەکەی بخورێتەوەو ئەوەی هەڵیدەگرێو ئاوەکە دەخواتەوە" زۆرجار نوێژێکی بۆ خوا نەکردووە!! بەڵێ, ئینسان دەبێ بچێتە خزمەت قورئانو لاپەڕەکانی بکاتەوەو بیخوێنێتەوەو تێیبگا, ئەمجا دەزانێ کەقورئان چۆن باسی چارەسەری کێشەی نێوان ژنو مێردی ناکۆك دەکا, بەچەند ئایەتێك لەو قــورئانە پیرۆزە وەکو (باحیث)ێکی ئیجتیماعی لەگەڵت دەدوێو چارەسەری گرفتەکانی خێزانت بۆ دەکا.
ئاوا قورئان سوودی لێدەبینرێ, نەك دەستێکی ناپاكو خائین بەقورئان بینووسێتەوەو بیکات بەنوشتەی ڕەشو سپیو ترشو شیرین!! لەجیاتی ئەوەی قورئان بکرێ بەنوشتەو بۆ سەرئێشەو سك ئێشە بەکاربێ" تۆ وەرە خزمەت قورئانی پیرۆزو تێیبگە چۆن فێرت دەکا نان بخۆی, ئاو بخۆیتەوە, چۆن بخەوی, چۆن ئیسراحەت بکەی, چۆن کاسپی بکەی. تۆ وەرە ئەوەی قورئان فەرموویەتی جێبەجێی بکە جا بزانە پێویستیت بەنوشتە دەبێ کە لەسەر پارچەیەك کاغەز بۆت بنووسرێو نەزانی مانای چییە!! ئێمە ئینکاریی ئەوە ناکەین کەقورئان هەمووی شیفایە, بەڵام کاتێ وەکو نوشتەو دوعا سوودی دەبێ" کاتێ چۆن قورئانەکە پیرۆزە" دەمێکی پیرۆزیش بەسەر نەخۆشەکەیدا بخوێنێ, مەبەستی سەرقەڵەمانەو خۆ بەخێوکردن نەبێ, تەنها بۆ ڕەزامەندیی خوا بیخوێنێو مەبەستی دەستکەوتنی خێرو پاداشتی قیامەت بێ, وەنەخۆشەکەش سیقەی بەقورئانەکەو قورئان خوێنەکە هەبێ, ئەوا ئینشائەڵڵا 100٪ پێی چاك دەبێ. بەڵام

بەخوا ئەو دوعانووس‌و دوعاخوێنانە زۆر کەمن، لەکەمیش کەمترن، زۆربەی هەرە زۆریان دەستبڕن‌و خەڵکێکی سادەو ساویلکە دەچێتە بەردەستیان‌و وەکو بەرخۆلە بکەوێتە ژێر چنگ‌و کەڵبەی گورگەوە ئاوا کەوڵی دەکەن‌و بەپارچە کاغەزێك" چەند سەد دینارێکی لێ دەستێنن‌و، بۆ ئەوەش کەکەس بەم کارە دزێوەیان نەزانێ" دەڵێ: ئەم دوعایە نابێت کەس بیکاتەوەو ئەگەر بخوێنرێتەوە ئەوە مەفعوولی نامێنێ‌و کار ناکات!!

بەڕێزان: زۆربەی جار پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەووتارەکانیدا دەیفەرموو: (طُوبى لمَنْ وسَعَتْهُ السُنَّةُ وَلَمْ تَسْتَهوهُ البِدْعَة)، منیش هەر لەسەر بەرەکەتی ئەو فەرموودەیەی حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەڵێم: ئەی ئەو هەموو خوشك‌و برا بەڕێزانەی کەسوپاس بۆ خوا" ئێوە موسڵمانی چاکن، خوای گەورە بەسەریکردوونەوە، بەنەخۆشی لاشەی خۆتان یان منداڵتان نەخۆشە، جا نەخۆشیی لاشەیی بێ یان دەروونی، لەجیاتی ئەوەی قورئان وەکو نوشتە بەملتاندا هەڵبواسن، ڕاستەخۆ بچنە خزمەت قورئانەکەو بیخوێنن، خــۆ ئــەگــەر قورئان نازانن ئــەوە شریتی تــەسجیل، یان سیدی کەقورئانی لەسەر تۆمارکراوە، ڕۆژی چەند سەعاتێك بەدڵ گوێ بۆ قورئانەکە بگرەو مێشکتی بۆ بکەرەوە ئینشائەللا سیقەت هەبێ کەخوای گەورە شیفای هەموو نەخۆشییەکی لاشەیی‌و دەروونیت دەدات.

خۆشەویستان: ئەگەر قورئانیش باش نازانی بخوێنیتەوە، ئەوا دەتوانی دوو سووڕەتی کورت کەپێیان دەگوترێ (المُعَوَّذَتَيْن) لەبەربکەی کەئەوانیش سووڕەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ و قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ن. دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوا لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: هەرکاتێ یەکێ لەماڵ‌و منداڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم نەخۆش بکەوتایە پێغەمبەری خوا ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ و قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ی بەسەردا دەخوێندو فووی لەلاشەی نەخۆشەکە دەکرد. جا عائیشە دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم نەخۆش کەوت، لەو نەخۆشییەدا کەتێیدا وەفاتیکرد، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم خۆی تاقەتی نەمابوو بۆ خۆی ئەم دوو سووڕەتە بەسەر خۆید بخوێنێ، بۆیە من هەردوو سووڕەتەکەم بەسەردا دەخوێندو فووم بەسەر لاشەی پیرۆزی حەزرەتدا دەکردو دەستی پیرۆزی خۆیم دێنا

بەسەر لاشەی خۆیدا, چونکە دەستی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم زۆر زۆر بەبەرکەتترە لەدەستی من (رواهُ مُسلِم ). هەروەها عوسمانی کوڕی ئەبی ئەلعاص(ڕەزای خوای لێبێت) چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم شەکوای حاڵی خۆی کرد لەدەست ئەو ئازارە زۆرەی کە لەلاشەیدایە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: ئەی عوسمان, دەستی خۆت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیەو سێ جار بڵێ (بِسْمِ الله), ئەمجا حەوت جار لەسەر یەك ئەم دوعایە بخوێنە (أَعُوذُ بِالله وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجِدُ وَأُحاذِرُ)(رواهُ مُسلِم).

جا موسڵمانی بەڕێز: تۆش لەکاتی ئازارو نەخۆشیدا ئەمە جێبەجێ بکە: سوورەتی (الفَلَق والنَّاس) بخوێنەو ئەو دوعایەی پێغەمبەری خۆشەویستیش حەوت جار بەسەر شوێنی ئازارەکەدا بخوێنە" پشتیوان بەخوای گەورە شیفات بۆ دێت.

خۆشەویستان: زۆرجار موسڵمانان پێویستیان بەدوعاو نوشتەی چاوەزار هـەیە, بەڵێ چاوپیسی ڕاستەو لەقورئان‌و سوننەتدا باسی‌کراوەو پێویستە موسڵمان پەنا بگرێ بەخوا لەشەڕی دەروونی نەخۆشی چاوپیسان‌و حەسوودان, بەڵام پێویست ناکات نوشتە بنووسیت‌و بەسەر دەرگاو ماڵتدا هەڵیبواسی, بەڵکو چاو لەپێشەواو مامۆستاکەت حەزرەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بکە کە لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەهەرکاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چووبێتە سەر جێگای خەوتن" هەموو شەوێك هەردوو دەستی پیرۆزی دەنا بەیەکەوەو فووی دەکردە ناو هەردوو مشتی‌و ئەمجا ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ی دەخوێندو پاشان دەستی دێنا بەهەر شوێنێکی لاشەی پیرۆزیدا کەدەستی بیگەیشتایە, لەپێشدا دەستی بەسەرو دەموچاویدا دێناو ئەمجا سنگ‌و سکی‌و بەشی پێشەوەی لەشی, وەئەمەی سێ جار دووبارە دەکردەوە.

هەروەهـــــا پێغەمبەری خـــوا صَلَّى اللهُ عَلَيـــهِ وَسَلَّـم بەصەحابەیەکی فەرموو: (قُلْ: قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ والمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِح ثَلاثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ عَنْ كُلِّ شَيءٍ)(حَديث حَسن رواهُ أبو داود).

واتە: هەموو ئێواران‌و هەموو بەیانیان سێ جار ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ بخوێنە, بەستە بۆ هەموو شتێك.

ئیمانداری بەڕێز: خۆ ئەگەر بڵێی ئەم سێ سوورەتەش نازانم, کە﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ زۆربەی زۆری خەڵك لەبەریەتی, ئەگەر ئەوەش نازانی خۆ دەتوانی سوورەتی فاتیحە بخوێنی کەهەرچی موسڵمانە لەبەریەتی‌و دەتوانێ بیخوێنێ. ئیمام ئبن قەیم لە (زاد المعاد)دا لەبارەی گەورەیی سوورەتی فاتیحە فەرموویەتی: (سوورەتی فاتیحە دایکی قورئانە, سەبعول مەثانییە, هەر ئەو شیفای تەواوی تێدایەو باشترین دەرمانە, نوشتەی تەواوەو کاریگەرە, کلیلی دەوڵەمەندی‌و سەرفرازییە, پارێزەری هێزو توانایە, لابەری غەم‌و پەژارەو ترس‌و خەفەتە, بۆ کەسێك قەدرو قیمەتی سوورەتی فاتیحە بزانێ‌و حەقی خۆی بداتێ‌و بەجوانی بەسەر شوێنی ئازارەکەیدا بیخوێنێ). ئیمام ئبن ئەلقەیم هەر لەبارەی گەورەیی سوورەتی فاتیحەوە کەبۆ شیفای نەخۆشی چەند کاریگەرە دەفەرموێ: (ناتوانرێ هەموو نموونەکان باس بکرێن کە لەهەموو سەردەمێکدا تەجرەبەکراوەو سوورەتی فاتیحە بۆتە مایەی شیفای نەخۆشی), جا ئیمام ئبن ئەلقەیم نموونەیەکی ژیانی خۆی باس دەکات‌و دەفەرموێ: (جارێکیان کە لەمەککە بووم, ئازارێکی زۆرم هەبوو, بەشێوەیەك خەریك بوو لەجووڵەی دەخستم, بەباشی تەوافی کەعبەم بۆ نەدەکراو لەغەیری کاتی تەوافیشدا هەر ئازارم زۆر بوو. بۆیە دەستم کرد بەخوێندنی سوورەتی فاتیحەو لەگەڵ خوێندنەوەکەدا دەستم دێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەدا. دەفەرموێ: چۆن ووردەبەرد بەردەبێتەوەو دەجووڵێ ئاوا ئازارەکەم دەجووڵاو نەدەما. ئەمەم چەند جارێك دووبارەکردەوە, دەفەرموێ: هەروەها پەرداخێك ئاوی (زمزم)م هێناو چەند جارێك سوورەتی فاتیحەم بەسەردا خوێندو پاشان ئاوەکەم خواردەوە ئەوەندەم سوود لێبینی‌و هێزو گوڕوتینێکی وا بۆ لاشەم گەڕایەوە کەهەرگیز سوودم لەهیچ دەرمانێکیتر ئاوا وەرنەگرتبوو. وەگەورەیی‌و بەرەکەتی سوورەتی فاتیحە زۆر لەوە زیاترە کەمن باسم کرد, بەڵام سوود لێ وەرگرتن‌و کەڵك گەیاندن بەو کەسەی کەدەیخوێنێ پەیوەندیی هەیە بەهێزی ئیمان‌و ڕاستیی یەقین‌و بڕوا بەگەورەیی‌و بەرەکەتی سوورەتی (فاتیحەوە).

ده‌ی موسڵمانی به‌ڕێز تۆش ئاوا گه‌وره‌یی‌و به‌ره‌که‌تی سووره‌تی فاتیحه‌ له‌دڵ‌و ده‌روونتدا جێگیربکه‌و به‌یه‌قینێکی ته‌واوه‌وه‌ به‌سه‌ر ئازاری نه‌خۆشییه‌که‌تدا بیخوێنه‌ ئینشائه‌للا خوا شیفات بۆ ده‌نێرێ .

خۆشه‌ویستان: له‌ته‌فسیری قورطوبیدا (ج 10, ل 364)دا هاتووه‌ که‌هه‌ر که‌سێك به‌رده‌وام چوار شت بڵێ خوای گه‌وره‌ ئه‌مینی ده‌کاو له‌چوار شت ده‌یپارێزێ:

یه‌که‌م: هه‌رکه‌سێ بڵێ (مَا شاءَ الله لا قُوَّةَ إلاَّ بِالله) ئه‌مین ده‌بێ‌و پارێزراو ده‌بێ له‌چاوی پیس.

دووه‌م: هه‌رکه‌سێ بڵێ (حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيل) پارێزراو ده‌بێ له‌شه‌ڕوفێڵی شه‌یطان‌و شه‌یطان ناتوانێ بیخه‌ڵه‌تێنێ.

سێیه‌م: هه‌رکه‌سێ بڵێ (وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلى الله) ئه‌مین ده‌بێ‌و پارێزراو ده‌بێ له‌فروفێڵی خه‌ڵکی‌و خه‌ڵکی خراپ زه‌فه‌ری پێ نابه‌ن.

چواره‌م: هه‌رکه‌سێ بڵێ (لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِين) ئه‌وا پارێزراو ده‌بێ له‌خه‌م‌و خه‌فه‌ت‌و مه‌حزوونی.

ده‌با هه‌موومان ئه‌م چوار خاڵه‌ له‌به‌ر بکه‌ین‌و بیکه‌ین به‌وێردی سه‌ر زمانمان, به‌ئومێدی ئه‌وه‌ی که‌خوای گه‌وره‌ له‌هه‌موو به‌ڵاو موصیبه‌ت‌و نه‌خۆشی‌و ناخۆشییه‌ك بمانپارێزێ ئینشائه‌للا .

له‌کۆتایی ئه‌م وتاره‌شدا رووده‌که‌مه‌ ئه‌و که‌سانه‌ی که‌دوعاو نوشته‌ به‌پاره‌ ده‌نووسن‌و ده‌ڵێم: خۆزگه‌ به‌ناوی دینه‌وه‌ دنیاتان نه‌خواردایه‌, خۆزگه‌ ده‌رستان له‌و بێدینانه‌ وه‌ربگرتایه‌ که‌ به‌پاره‌و ماڵ‌و سامان‌و کاتی خۆیان خزمه‌تی به‌رنامه‌ی کوفرو گومڕایی خۆیان ده‌که‌ن, که‌چی ئێوه‌ له‌جیاتی ئه‌وه‌ی خزمه‌تی قورئان بکه‌ن‌و دوو سێ منداڵی موسڵمان فێری قورئان خوێندن بکه‌ن, له‌جیاتی ئه‌وه‌ قورئان ده‌که‌ن به‌مایه‌ی کاسپی ده‌ستتان‌و نانی پێ په‌یدا ده‌که‌ن وه‌بشزانن ! گوناهی هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی که‌ به‌هۆی ره‌فتاره‌ ناشیرینه‌کانی ئێوه‌وه‌" دینیان لا ناشیرین ده‌بێ (چونکه‌ خۆیان له‌حه‌قیقه‌تی دینی ئیسلام شاره‌زا نین) گوناهی ئه‌وانیش هه‌مووی به‌ئه‌ستۆی ئێوه‌یه‌. بۆ ڕاستیی‌و سه‌لماندنی ئه‌وه‌ی که‌گوتمان" با گوێ له‌م به‌سه‌رهاته‌ واقیعییه‌ بگرین که‌مامۆستای

بانگخواز (شێخ ئەحمەد قەطّان) باسی باوکی دەکات کەچۆن لەسەرەتاوە دینی لا ناشیرین بوو، پاشان خوای گەورە هیدایەتیداو گەڕایەوە بۆ لای خوا (شێخ ئەحمەد قەطّان) دەڵێ: (باوکم بۆی گێڕامەوەو ووتی: لە( شَطّ العَرَب)دا لەناو کەشتییەکدا بووم، هەورەتریشقە لەکەشتییەکەیداو من تووشی شەلەل بووم! دە ساڵ بەم حاڵەوە مامەوە هیچ چارەسەرێکم نەبوو، هیچ لەماڵمدا نەما، هەمووم دا بەدەرزیو دەرمان. ئاخری بەداماویو نوقصانی بەشەقامەکاندا خۆم دەخشاند، بەڵکو یەکێك خێرێکم پێبکات. لەم کاتەدا کەلەوپەڕی دڵتەنگیو نارەحەتیدا بووم" ناونیشانی کابرایەکی بەناو شێخیان بۆ هەڵدام کەبچمە لایو هەندێ دوعام بەسەردا بخوێنێ. منیش بەخۆ خشاندن زۆر بەنارەحەتی رووم لـەماڵی شێخ کردو گەیشتمە ماڵـەکـەیو داوام لێکرد هـەندێ دوعـام بەسەردا بخوێنێ. بەڵام یەکەم پرسیاری شێخ کەلێی کردم ئەوەبوو: ئایا چەندی پارە دەدەمێ لەجیاتی ئەو دوعا خوێندنە! ! منیش گوتم: من پیاوێکی هەژارمو هیچم لەدارای دنیادا نیە، تۆ بۆ خاتری خوا دوعایەکی خێرم بۆ بکە.. بەڵام کابرای بەناو شێخ قایل نەبوو هیچ دوعایەکم بۆ بکات! بۆیە زۆر بەدڵتەنگیو نائومێدییەوە گەڕامەوە، ئەم رووداوە کەلەو کابرا بەناو ئاینییەم بینی" زۆر رقی هەڵساندمو بەیەکجاری بووم بەدوژمنی دینو لەهەموو کۆڕو مەجلیسێکدا ئەمەم دەگێڕایەوەو گاڵتەم بەزانایانی ئاینی دەکرد. پاش ماوەیەك قەدەری خوا وابوو پیاوێك پێی گوتم: بۆچی ناچی بۆ ئەو نەخۆشخانە ئەمریکییە، خەڵکی زۆر وەصفی دەکەن، بەتایبەتی پـزیشـکـەکـەی کـەنـاوی (سیکدەر)ە، منیش ووتم: من ناتوانم بچم چونکە نەخۆشخانەکە زۆر دوورەو منیش ناتوانم بەپێی خۆم بڕۆم. بەهەرحاڵ، لەبانگی بەیانییەوە بەخشەخشو گاگۆڵکێ وەکو منداڵ کەوتمە رێ بەرەو نەخۆشخانەکەو بۆ نیوەڕۆ گەیشتمە ئەوێ. رۆژەکەش هاوین بوو، بۆیە لەتاو گەرماو هیلاکی بوورامەوە، خەڵکی خێرخواز گواستیانمەوە بۆ ناو نەخۆشخانەکە، پزیشکەکە فەحصیکردمو کەوتە چارەسەرکردنمو پاشان بەئوتومبێلەکەی خۆی هێنامیەوە بۆ ماڵەوە، پێنج روپیەشی خستە گیرفانمەوە. ئەو پزیشکە بۆ کاری (تەبشیر) واتە: موژدەدان بەئاینی مەسیحی" هاتبووە ناوچەکە، بۆیە زۆر لێزانانە کاری دەکردو خزمەتی خەڵکی دەکرد، بەمەش من بووم بەدەروێشو لایەنگری. ئەوەبوو پاش ماوەیەك

چاك بوومەوەو هەڵدەستام بەپێی خۆم دەڕۆیشتم، پزیشکەکەش هەفتەی جارێك سەری لێدەدام. دوای ئەوەی بەتەواوی چاك بوومەوە، کەوتمە کاروکاسپیو ژنیشم هێناو چەند منداڵێکم بوو، کەیەکەمیان ئەحمەد بوو).

جا (شێخ ئەحمەد قەطّان) ئەمەی لەباوکی بیستبوو، پاشان خۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (بەبیرم دێ من پێنج ساڵان بووم باوکم دەیبردم بۆ لای ئەو پزیشکەو پێی دەووتم: دەستی ماچ بکە، ئەو بۆتە مایەی چاك بوونەوەم). (شێخ ئەحمەد قەطّان) دەڵێ: (باوکم هەر بەردەوام بوو لەسەر گاڵتەکردن بەئاین، تا من گەورەبوومو ڕێی ڕاستم دۆزییەوە، هەمیشە دوعای خێرم بۆ دەکردو لەخوا دەپاڕامەوە کـەئاخر خێر بێتو خـــوا هیدایەتی بدات. دوای ئەوەی چەندین کتێبم بۆ پەیداکرد تا لەحەقیقەتی ئاینی پاکی ئیسلام شارەزا بێت. باوکم دوای دیراسەیەکی قووڵ بۆی دەرکەوت: ئەو کەسەی کەبەهۆی ئەوەوە ئاینی ئیسلامی لا ناشیرین بووبوو" ئیسلام خۆی نەفرەتی لێدەکات، بۆیە تەوبەیەکی نەصووحی کردو لەسایەی خواوە باوکم کەوتەوە خواناسی، هەتا لەدنیا دەرچوو دەم بەزیکرو سوپاسو ستایشی خوا بوو).

داواکارم خوای گەورە هەموو لایەکمان هیدایەت بداتو عاقیبەتمان خێرکاو لەدینەکەی خۆی شارەزامانکا.

﴿ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴾.. اللهُمَّ آمين

## ووتـاری پێنجەم
## شیرکی شاراوە ( الشّركُ الخَفِي )

قالَ اللهُ تَعالى:

﴿ حُنَفَاءَ لِلَّه غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّه فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾

( الحج 31 )

قالَ رسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم :

(أخافُ عَلى أُمَّتي مِنْ بَعْدِي ثَلاثاً: حَيْفَ الأئِمَّةِ, وَإيماناً بِالنُّجُومِ, وَتَكْذيباً بِالْقَدَرِ)

(رَواهُ إبنُ عَساكِر, وَقالَ الألْباني صَحيح )

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..

موسڵمانانی بەڕێز: سەلام و ڕەحمەتی خواتان لەسەر بێ, خوای گەورە لەگوناهی ئێمەو دایكو باوكمان و تێكڕای موسڵمانان خۆش بێ آمین.

خۆشەویستان: لەم ووتارەشدا" هەر بۆ تەواوكردنی باسەكانی ڕابردوو, بەپشتیوانیی خوای گەورە هەر باسی شیركو جۆرەكانی شیرك دەكەین و سەرەنجامی شوومو بەدی هاوبەش دانان بۆ خوا لەدونیاو قیامەتدا" ڕوون دەكەینەوە ئینشائەڵلا.

ئیمانداران: یەكێ لەو جۆرانەی شیرك كە لەزۆر كۆنەوە هەبووەو خەڵكان بڕوایان پێی بووە" بریتییە لەئەستێرەگەری (التَّنْجيم), ئەمەش ئەو بیرو بڕوایەیە كەگوایە ئەستێرە پەیوەندیی هەیەو هۆكارو هۆیەكە بۆ ڕوودانی ڕووداو, وەكو ئەوەی بوترێ: فڵانە ئەستێرە ئەگەر ئەو جۆرە شتەی لێ ڕووبدات, یان ئاوای لێبێ, یان ئەگەر مانگ بگیرێ, ئەوا كەسێك دەمرێ, یان بەڵایەك لەسەر زەوی ڕوودەدات! جا هەركەسێك بڕوای وا بێ كەئەستێرە كاریگەری هەیە چ بۆ سەر ژیانی خۆی, یان بۆ دەروبەرو ژیان و ژینگەی, ئەوا ئەو كەسە شیركی هەرەگەورەی ئەنجام داوەو لەمیللەتی ئیسلام دەردەچێت.. خوا بمانپارێزێت. چونكە حیكمەتی دروستبوونی ئەستێرەكان بریتییە لەڕازاوەیی بۆ ئاسمانی دونیاو نیشانەیە بۆ ڕێگا نیشاندان بۆ ئینسانی سەفەری هەروەها هەندێك ئەستێرە بۆ دەركردنی شەیطانەكانن كاتێ دەچن بەرەو ئاسمان تاوەكو گوێ لەدەنگوباسی ئاسمان بگرن, وەك خوای بەرزو بڵند هەواڵی پێداوین.

بەڕێزان: ئەم ئەستێرەگەرییە, هەر لەزەمانی حەزرەتی ئیبراهیمەوە (سەلامی خوای لێبێت) خەڵكان بڕوایان پێی بووە, لەگەڵ خوادا ئەستێرەو مانگو ڕۆژیان پەرستووەو بەسەیركردنی ئەستێرەكان ئەوەیان دیاریكردووە كەدونیا چی لێدێو ئایا خۆشی یان ناخۆشی چاوەڕێیانە! وەكو لەقورئاندا" لەباسی حەزرەتی ئیبراهیمدا بەدرێژی باسكراوە.

هەروەها لەزەمانی پێغەمبەری خۆشماندا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم كاتێك ئیبراهیمی كوڕی حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وەفاتی كرد, لەو كاتەدا ڕۆژ گیرا, موسڵمانان گوتیان: ئەوە ڕۆژ بۆیە گیرا چونكە ئیبراهیم وەفاتی كردووە, یەكسەر پێغەمبەری خوا

صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بیروبڕوا هەڵەیە" یەکسەر موسڵمانانی کۆکردەوەو فەرمووی: (إنَّ الشَّمْس والْقَمَرَ آيَتانِ مِنْ آيات الله, لا يَنْخَسفان لِمَوت أحَدٍ ولا لِحَياتِه, فإذا رَأيْتُم ذلكَ فَادْعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا)( رواهُ البُخاري ومُسلِم).

واتە: ئەی خەڵکینە, ئاگادار بن‌و بزانن کەمانگ‌و ڕۆژ دوو نیشانەو بەڵگەن لەسەر دەسەڵات‌و گەورەیی خوا, نە بۆ مردنی هیچ کەسێك" وەنە بۆ لەدایکبوونی هیچ کەسێك دەگیرێن‌و بەردەبن! بەڵکو ئەگەر دیاردەی ڕۆژگیران یان مانگ گیرانتان بینی" ئەوا لەخوا بپاڕێنەوە کە لەڕووناکی‌و بەرەکەتی مانگ‌و ڕۆژ مەحرووم‌و بێبەشتان نەکات‌و, هەروەها زۆر بڵێن: أللهُ أكبَر, وەنوێژی ڕۆژگیران‌و مانگ گیران بکەن, وەبەپێی توانا‌و دەسەڵاتتان خێرو صەدەقە بکەن‌و یارمەتیی هەژاران بدەن.

هەزاران صەلات‌و ڕەحمەتی خوا لەسەر ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەمان بێ کەهیچ کات لەغەیری ڕاستی‌و دروستی" بەم ئومەتەی خۆی نەگوتووە..

خۆشەویستان: یەکێ لەصەحابەکانی حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم کەناوی زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی‌یە(ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کۆمەڵێ صەحابە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم لەحودەیبیە بووین, شەوێکیان باران باری, بۆ بەیانی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم پێشنوێژیی بۆ کردین‌و کەسەلامی دایەوە ڕووی‌کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئایا دەزانن کەپەروەردگارتان چی دەفەرموێ؟! خەڵکەکە گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم خۆیان باش دەزانن, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێ: ئەم بەیانییە بەهۆی ئەم بارانەوە بەندەکانم بوون بەدوو تاقم, تاقمێکیان باوەڕیان بەمن بوو و تاقمێکیشیان باوەڕیان بەمن نەبوو (فَأمَّا مَن قالَ مُطِرْنا بِفَضْلِ الله وَرَحْمَتِه فَذلكَ مُؤْمِنٌ بي كافِرٌ بِالْكَوكَب), واتە: ئەوەی بڵێ لەسایەی خوتو ڕەحمەتی خواوە ئەو بارانەمان بۆ باریوە ئەوە باوەڕی تەواوی بەمنەهیەو باوەڕی بەبورج‌و ئەستێرەو شتی وا نیە, (وَأمَّا مَن قالَ مُطِرْنا بِنَوءِ كَذا وكَذا, فَذلكَ كافِرٌ بي, مُؤْمِنٌ بِالكَوْكَب), (مُتَّفق عليه), واتە: بەڵام ئەو کەسەی بڵێ: لەفیسارە بورجەوە بارانمان بۆ باریوە, ئەوە باوەڕی بەمن نیە بەڵکو باوەڕی بەبورج‌و ئەستێرەکان هەیە!

جا ئیماندارانی بەڕێز: تەماشای ئەو بارودۆخە بکەن کەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيهِ وسلم ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەی بۆ صەحابەکان باسکرد، هەموو ئیمانداران لەخزمەتی (رَسولُ الله)دان، ماڵو خێزانو منداڵو سەروەتو سامانی خۆیان بەجێهێشتووە بۆ ئەوەی لەخزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بچن عەمرە بکەنو خوا لەخۆیان ڕازیبکەن، ئەمجا بەیانی زوو لەخەو هەڵساونو دەستنوێژیان گرتووەو لەپشت پێغەمبەری خواوە نوێژی بەیانییان بەجەماعەت کردووە، کەچی لەدوای سەلام دانەوە لەنوێژەکە" پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم ئاگاداریان دەکاتەوە کە لەلایەن پەروەردگارەوە" دەربارەی بارانی ئەو شەوە ئاگادارکراوەتەوە، ئەو بارانی ڕەحمەتەی کەئاسمانی پاك کردەوە لەتەپوتۆز، کەگژوگیای پێ دەڕوێ، لەوەڕگەکانی پێ زیندوو دەبنەوە، بەکورتی: باران لەنیوەدورگەدا یەکسانە بەژیان، جا کاتێ کەخەڵکی بەم بارانە دڵخۆش بوونو لەنێو خۆیاندا قسەیان لەسەر کردووە" ئەوەی گوتبێتی: (الحَمْدُ للهِ الَّذي سَقانا، وَأَرْوى أَرْضَنا، وَأَنْزَلَ عَلَيْنا مِنْ بَرَكاتْ السَّماءِ)، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەبارانی بۆ باراندینو تێرئاوی کردینو زەوی بۆ پاراوکردینو بەرەکەتی ئاسمانی بەسەردا باراندین، ئەوە ئیمانداری تەواوە باران بارینەکەی پاڵداوەتە لای خاوەنی بارانەکە کە (الله)یە. بەڵام ئەگەر کەسێك گوتبێتی: بەخوا بەهۆی فلان بورجو فلان ئەستێرەو فلان بارودۆخی کەشو ئاووهەواوە ئەم بارانەمان بۆ باری" ئەوە (پەنا بەخوا) کافرە بەخواو ئیمانی بەئەستێرەو بورج هەیە!

جا سەرنج بدەن، هەرچی خواپەرستیو عیبادەتە بیکەی" بەڵام لەعەقیدەو باوەڕەکەتدا خەلەلێك هەبێ، وابزانی کەغەیری خوای گەورە توانای هەیەو دەسەڵاتی هەیە بۆ باراندنی یەك دڵۆپ باران، ئینسانی پێ کافر دەبێ، ئەگەر بڕوای بەدەسەڵاتی خوا هەبوو بەڵام گوتی فلان ئەستێرەش، یان فلان بورجی ئەم مانگە" باران دەبارێنێ، ئەوە دەبێ بەموشریكو شەریك بۆ خوا قەراردانی هەرەگەورە (الشِّرْك الأكبَر) ئەنجام دەدات!

بەڕێزان: جێگای سەرسووڕمانە کە لەسەدەی بیستو یەکدا" هێشتا ئەستێرەگەرییو بڕوا بەبورجو کەلوو لەمێشکی چەندین کەسدا هەر ماوەو دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بەرنامەی تایبەتیان بۆ تەرخان کردوون بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبڕوا چەوتەکانیان، تەنانەت

رووداوه سیاسی‌یه‌کانی سه‌ر گۆڕه‌پانی ئه‌مڕۆی جیهان ده‌گێڕنه‌وه بۆ فلان بورج و جوولانی فلان ئه‌ستێره له‌شوێنی خۆی ! که‌ئه‌مه‌شیان هه‌روه‌کو فالچێتییه مۆدێرنه‌که‌ی سه‌رده‌مه که‌پێی ده‌ڵێن (بورجه‌کان)" ئه‌مه‌شیان زیندووکردنه‌وه‌ی ئه‌ستێره‌گه‌ری‌یه‌که‌ی زه‌مانی فیرعه‌ون و نه‌مروده‌و به‌هه‌مان ڕێبازو به‌رنامه" ده‌یانه‌وێ بیروباوه‌ڕو عه‌قیده‌ی پاکی ئیمانداران تێك بده‌ن و به‌ره‌و شیرکی گه‌وره‌و ماڵوێرانی و گومڕایی و خه‌رافییان به‌رن.

خۆشه‌ویستان: گوتمان" شیرك سێ جۆری هه‌یه, یه‌که‌م: شیرکی گه‌وره, دووه‌م: شیرکی هه‌ره بچووك, که‌ئه‌م دوو به‌شه‌مان به‌درێژی له‌چوار ووتاری رابردوودا شیکرده‌وه, ئێستاش باسی جۆری سێ‌یه‌می شیرك ده‌که‌ین که‌ئه‌ویش شیرکی شاراوه‌یه (الشرك الخَفي). جا با بزانین شیرکی شاراوه چیه؟

عه‌بدوڵلای کوڕی عه‌باس (ڕه‌زای خوایان لێبێت) که‌ئامۆزای پێغه‌مبه‌ره صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" فه‌رمووی: (جاءَ رَجُلٌ إلى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فَراجَعَهُ في بَعضِ الكَلامِ, فَقالَ: ما شاءَ اللهُ وَشِئتَ, فَقالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم: أجَعَلْتَني مَعَ الله عَدْلاً؟! ـ وَفي لَفظٍ ـ نِداً؟!.. لا, بَل ما شاءَ اللهُ وَحْدَهُ)(حَديثٌ صحيح رَواهُ إبنُ ماجَة).

واته: پیاوێك هاته لای پێغه‌مبه‌ری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هه‌ندێ له‌گه‌ڵیدا دواو گوتی: ئه‌گه‌ر خواو تۆ حه‌زکه‌ن ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا. پێغه‌مبه‌ری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فه‌رمووی: ئه‌وه تۆ به‌و قسه‌یه‌ت منت کرده هاوه‌ڵو یه‌کسان و شه‌ریکی خوا؟!.. نه‌خێر, جارێکی تر وا نه‌ڵێیت, به‌ڵکو بڵێ: ئه‌گه‌ر خوا حه‌زکات به‌ته‌نها.. چونکه هه‌ر شتێك خوا بیه‌وێت هه‌ر ئه‌وه ده‌بێت, ئێمه بمانه‌وێت یان نا.

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" صه‌حابه‌کان و هه‌موو ئومه‌تی ئاگادارکرده‌وه‌و فه‌رمووی: (لا تَقولُوا ما شاءَ اللهُ وَشاءَ فُلانٌ, ولكِن قولُوا: ما شاءَ اللهُ, ثُمَّ شاءَ فُلانٌ)(رواهُ أبو داود بِإسنادٍ صَحيح), واته: مه‌ڵێن ئه‌گه‌ر خوا حه‌زکاو فلان که‌س حه‌زکا ئه‌و کاره وا ده‌بێ, به‌ڵکو بڵێن: ئه‌گه‌ر ویستی خوای له‌سه‌ر بێ له‌ئه‌زه‌لداو ئێستاش فیساره که‌س مه‌یل بکاو حه‌زی لێ بێ" ئه‌و شته وا ده‌بێ!

له‌(حه‌دیث)ێکی صه‌حیحی تردا که‌هه‌ر ئیمامی ئه‌بو داود ڕیوایه‌تی کردووه, ده‌فه‌رموێ: جارێکیان کابرایه‌کی ئه‌عرابیی ده‌شته‌کی" له‌بیابانه‌وه به‌هه‌ڵه‌داوان و شپرزه‌یی

هاته خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم گوتی: (یا رَسولَ الله" جَهَدَتِ الأنْفُس, وضاعَت العِیال, وَنَهَکَتِ الأمْوالُ, وَهَلَکَت الأنْعامُ, فَاسْتَسْقي اللهَ لَنا, فَإنَّا نَسْتَشْفِعُ بِكَ عَلی ـَـ وَنَسْتَشْفِعُ بِالله عَلَیْكَ), واته: کابرای ئەعرابی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا" تینمان بۆ هاتووه, خەریکه ماڵومنداڵمان لەدەست چێ, ماڵمان تەواو بوو, ماڵاتو مەڕمان بەهیلاك چوو لەدەست ووشکەساڵیو بێبارانی, جا داوامان بۆ لەخوا بکە بەڵکو خوا بارانمان بۆ ببارێنێ, خۆ ئێمە کەسمان نیە پەنای بۆ بەرین, ئەگەر ئیشمان بەخوا بێ دەبێ تۆ تکامان بۆ لەخوا بکەیو ئەگەر ئیشیشمان بەتۆ بێ ئەوە دەبێ داوا لەخوا بکەین تکامان بۆ لەتۆ بکات!

پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم کەگوێی لەم قسەیە بوو, لەکابرا تووڕەبوو فەرمووی: (وَیْحَكَ! أتَدْري ما تَقُول؟!), هەی هاوار بۆ تۆ, ئەوە تۆ دەزانی دەڵێی چی؟! ئەمجا پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم بەردەوام دەیفەرموو: (سُبحانَ الله. سُبحانَ الله), تا ئەوەندەی (سُبحانَ الله)ی فەرموو کە لەدەموچاوی صەحابەکاندا بەدی دەکرا کەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم نارەحەتو دڵتەنگە. پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بەکابرای ئەعرابیی فەرموو: (وَیْحَكَ! إنَّهُ لا یَسْتَشْفِعُ بِالله عَلی أحَدٍ مِنْ خَلْقِه, شَأْنُ الله أعْظَمُ مِنْ ذلكَ), فەرمووی: هەی ماڵوێران! بزانە بەڕاستی خوای گەورە ناکرێ بەتکاکار لەسەر هیچ کەس لەدروستکراوەکانی, پایەو حاڵی خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالی زۆر گەورەترە لەوەی کەلەگەڵ مەخلوقو دروستکراوێکی خۆی یەکسان بکرێ!

خۆشەویستانم: زۆر وشە هەیە, ئێمە لەکوردەواریی خۆماندا بەکاریان دێنین, بەڵام بەبەڵگەی ئەو فەرموودانەی باسمان کردن" ئەم جۆرە قسانەش بەر حوکمی شیرکی شاراوە دەکەون, وەکو: (لەسایەی خواو سەری تۆدا, لەپەنای خواو تۆدا, لەخواو ئێوە بەزیاد بێ, خواو پێغەمبەر ئاگای لێی بێ, بەیارمەتیی خواو پێغەمبەر). هەرچەندە لەوانەیە یەکێك بڵێ: کەس مەبەستی ئەوە نیە سەری فلان کەس بەرێتە ڕیزی خواوە, یان مەبەستی ئەوە نیە پێغەمبەری سەروەرو سالار صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم لەگەڵ خوادا یەکسان بکات, کەواتە مادام نیەت وا نیە" واش بڵێی قەیناکات!لەوەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم هەم لەبارەی خۆیەوە" هەم لەبارەی هەرکەسێکی ترەوە

زۆر بەڕوونو ئاشكرایی ئیماندارانی لەو جۆرە قسانە قەدەغەكردووە. هەروەها شەریك بۆ خوا قەراردانیش ئەوەندە حاڵەتێكی قێزەونو دزێوەو تەوحیدو یەكتاپەرستیش ئەوەندە صافو بێگەردە كەبچووكترین پەڵەی ڕەشو پیسی شیرك قبووڵ ناكات, كەجاری وا هەیە لەوانەیە ئێمە هەستیشی پێنەكەین, وەكو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بۆمان ڕوون دەكاتەوەو دەفەرموێ: (الشِّرْكُ أَخْفى في أُمَّتي مِنْ دَبيبِ النَّمْلِ عَلى الصَّفا, في اللَّيْلَةِ الظَّلْماءِ), واتە: شیركو هاوبەش دانان بۆ خوا لەناو ئومەتەكەمدا شاراوەترە لەجێ پێی مێروولە لەسەر شاخی (صەفا) لەشەوێكی ئەنگوستەچاوی زۆر تاریكدا. كەمەبەست لەشیركی شاراوەیە (الشِّرْك الخَفِي), هەر لەبەر ئەوەیە كەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەفەرموودەیەكی صەحیحدا كەئیمامی ئەحمەد ریوایەتی كردووە" هەموو ئومەتەكەی فێردەكات كەبەردەوام بڵێن: (اَللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نُشْرِكَ بِكَ شَيْئاً نَعْلَمُهُ, وَنَسْتَغْفِرُكَ لِما لا نَعْلَمُهُ), واتە: ئەی پەروەردگارمان" ئێمە هەموومان پەنا دەگرین بەتۆ لەوەی كەشەریكت بۆ بڕیار بدەین, لەوەی كەدەیزانینو ئاشكرایە, وەداوای لێخۆشبوونت لێدەكەین لەوەی كەشەریكمان بۆ بڕیاردابێت بەنەزانیو ئاگامان لێ نەبووبێ, وەكو ئەوەی قسەیەكمان كردبێ شیركی شاراوەی تێدا بووبێو ئێمەش هەستمان پێ نەكردبێ, خوایە لێمان مەگرەو لێمان خۆشبە.

خۆشەویستان: ئێستا دوای ئەوەی جۆرەكانی شیركمان ناسی, با بزانین ئایا زیانەكانی شیرك بەگشتی" چین؟

بەڵێ, هاوبەش (شَرِيك) بڕیاردان بۆ خوا" زۆر زیانی گەورەی هەیە, گرنگترینیان بریتین لە:

**یەكەم:** هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا" ئەتكی مرۆڤایەتی دەكات. ئادەمیزاد ئازیزترین دروستكراوە لەدروستكراوەكانی خوا, هەر بۆیە خوای پەروەردگار كردوویەتی بەجێنشین لەسەر زەویو هەموو بوونەوەریشی بۆ خزمەتی ئەو دروستكردووە, بەڵام بەهاوبەش بڕیاردان بۆ خوا" ئینسان لەهەموو شتێك زەلیلتر دەبێو وای لێدێ ببێ بەبەندەی هەموو شتێك, بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾( الحج 31),

واتە: هەولّبدەن هەمیشە شوێن ڕاستی بکەون‌و ملکەچ بن بۆ حەق لەبەر خاتری زاتی خوا، نەکەن هیچ شەریك‌و هاوەڵێکی بۆ بڕیاربدەن، جا ئەوەی هاوەڵ‌و شەریك بۆ خوا بڕیاربدات، وەکو ئەوە وایە لەئاسمانەوە بەربێتەوەو باڵندە پەلاماری بداتو (پارچە پارچەی بکات)، یان ڕەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێت‌و بیبات بۆ شوێنێکی دوورو قووڵ.

بەڵێ، بەدرێژایی مێژوو" مرۆڤی دوور لەخوا شتێکی بۆ خۆی دروستکردووەو ناوێکی لێ ناوەو کەوتۆتە پەرستنی، بەڵێ مرۆڤی وێڵ‌و سەرگەردان هیچ نەما کڕنووشی بۆ نەبا، تەنانەت کڕنووشی بۆ ئاژەڵ‌و دارو بەردو رووبارو شاخ‌و کرم‌و مارو مێرووش برد. نووسەری پەڕاوی (الهند القديمة) ئار. سی. دت، دەڵێ: لەساڵی (600)ی زاینیدا" ئەو خوایانەی کەهندییەکان دەیانپەرستن گەیشتە (330) ملیۆن! ! هەر لەو سەردەمانەشدا، نزیکەی (360) بت هەبوون بەدەوری کەعبەدا، وەهەر کەسەی بەردێ، شتێکی بۆ خۆی دادەتاشی‌و کڕنووشی بۆ دەبردو بەتەمای ئەوەبوو سوودی‌ا‌پێ بگەیەنێ، یان لەخورما دروستی‌دەکردو تا دەیپەرست" دەیپەرست ئینجا کەبرسیشی دەبوو دەیخوارد! ! زۆر کەسیش هەیە هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێ، بەو مانایەی کە لەهەموو شتێکدا دوای هەواو ئارەزوو دەکەوێت هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ ﴾( الجاثية 23). هەندێکی‌تر ماڵوسامان دەپەرستن، حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (تَعِس عَبْدُ الدِّينار، تَعِسْ عَبْدُ الدِّرْهَم)، واتە: بەدبەخت بێ بەندەی دینار، بەدبەخت بێ بەندەی درهەم. هەندێکی تر لەئینسانەکان کە لەڕێبازی یەکتاپەرستیی خوا لایانداوە" دەبنە عەبدو بەندەی گەدەو مەعیدەیان، هەمووو ئاوات‌و خۆشی‌یەکیان دێتە سەر تێرکردنی گەدەیان، هەروەك ڕۆمانی‌یەکان کەپاش ئەوەی تێریان دەخوارد" حەوزی تایبەتیان دروست کردبوو، دەهاتن خۆیان دەڕشاندەوە ناوی‌و، ئینجا پاش ماوەیەك دەستیان دەکردەوە بەخواردن. ئەمەش بۆ ئەوەی زۆرترین لەزەت لەخواردن‌و خواردنەوە وەرگرن.

قورئانی پیرۆز لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوىً لَهُم ﴾(محمد 12)، واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون لەم دنیایەدا، ڕادەبوێرن‌و دەخۆن وەك ئاژەڵ، لەئایندەشدا دۆزەخ جێ‌و شوێنیانە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە کەهەموو هیواو ئاواتیان هەر خواردنو خواردنەوەیە" دەفەرموێ: (ئەوانە وەك ڤاژەلێکن کەزۆر دەخۆنو ئینجا رووەدەکەنە خۆرو کاوێژ دەکەنو میزو پیسایی خۆیان دەکەنو ئینجا دەست دەکەنەوە بەخواردن).

بەڵێ, بەم شێوەیە تێدەگەین کەبانگی یەکخواناسی" رزگارکردنی مرۆڤایەتییە لەملیۆنەهاو ملیارەها بتو پەرستراوی تر بێجگە لەخوا, کەئەوانەش تواناکانی مرۆڤ لەناو دەبەن, بۆ نموونە: پیاوانی کەنیسە لەکاتی خۆیدا بەجۆرێك لایاندابوو وەخۆیان کردبوو بەدەمڕاستی خەڵکی کەهەرچی کەنیسە نەیوتایە ڕاست نەبوو. ئەنجامی ئەم زوڵموزۆرو ستەمانەش نزیکەی (12) ملیۆن کەس لەئەوروپادا کوژرا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا, کەئەمەش دوو ئەوەندەی کوژراوەکانی شەڕی یەکەمی جیهانییە کەنزیکەی شەش ملیۆنو چوارسەد هەزار کەس بوو.. کەواتە یەکخواناسیو رزگاربوون لەپەرستنی زانا ئاینییەکانو کاربەدەستانو ملیۆنەها پەرستراوی تر" خەڵاتێکی گەورەو بەخششێکی خواییە کەچاك وایە پێی بزانینو سوپاسی خوای لەسەر بکەین..

**دووەم:** هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا" چاووگی ئەفسانەو خورافیاتە, بۆ نموونە: ئەو کەسەی وا بزانێ نوشتەو کشتەكو پەتو پەڕۆ بەستن لەدەستوقۆڵو فنجانو قاوەگرتنەوەو بورجو کەلوو.. هتد" ڕێگەچارەن بۆ رزگارکردنی مرۆڤ لەبەڵاو موصیبەتو دەردەسەری" ئەوە ئەو کەسە ئامادەیە بۆ بڕواکردنی بەهەموو جۆرە ئەفسانەیەك. بۆیە دەبینین لەم سەردەمەدا کەسەردەمی زانستو زانیاریو پێشکەوتنو چوونە دەرەوەیە لەزەوی بۆ سەر مانگو مەریخ, کەچی ئەو کەسەی لەیەکتاپەرستیو ڕێبازی ڕاستی ئیسلام حاڵی نەبووە, یان لایداوە لەگەڵ ئەوەشدا شەهادەی بەرزیان هەیە, کەچی چاوەڕێی بورج خوێندنەوەیە تا بزانێ بەیانی تووشی چ دەبێو چی دێتە ڕێ!

**سێیەم:** لەبەڵاو نەگبەتیەیەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان ئەوەیە: هاوبەش بۆ خوا دانان هۆیەکە بۆ ترسنۆکی, ئەو کەسەی ئەقڵی خۆی گیرۆدەی چەند شتێکی ئەفسانە دەکات" ئینسانێکی ترسنۆکی لێ دەردەچێ. چونکە پشت ئەستوورە بەچەند خوایەکی دەستکرد, هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا

تـركو بـئـه ﴾(آل عمران 151), واته: ئەی گرۆی ئیمانداران, دڵنیابن كە لەمەودوا ئێمە ترس و بیم فڕێدەدەینە دڵی ئەوانەی كەبێباوەڕن, بەهۆی ئەوەی كەشەریكو هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە.. بەڵێ هەركەسێ تەنها خوای تاكوتەنهای پەرست ئەوە بەس لەخوا دەترسێو چاوەڕێی قازانجو زەرەر تەنها لەو دەكات. بەڵام ئەو كەسانەی لەگەڵ خوادا" چەودوانی قازانجو زیانو شیفاو ڕزقورۆزییان لەغەیری خواش هەیە ئەوە بەردەوام لەتەپێیانەو لەهەموو شتێك دەترسن, زۆرجار ئەوەندەی لەقەبرێكو داری سەر قەبرستانێك دەترسن كەچلێ داری لێكردۆتەوە, دەترسێ كوێری بكاو تووشی بەلایەكی بكا" نیو ئەوەندە لەخوا ناترسێ كەڕۆژانە دەیان بێفەرمانیی ئەو خوا باڵادەستە دەكات!

**چوارەم:** هاوبەش دانان بۆ خوا دین پارچە پارچە دەكات, ئینسانی موشریك وای لێدێ بڕوای بەهەندێ شت دەبێو بڕوای بەهەندێ شتی تر نابێ, بڕوای بەشتی وا دەبێ كەدین نەهی لێكردووە, كەچی ئەو بەدینی دەزانێ, وا دەزانێ خواپەرستیی ئەنجام داوە! هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَلا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ, مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾( الروم 31 ـ 32), واتە: خەڵكینە ڕووبكەنە پەروەردگارتان, بەملكەچی بگەڕێنەوە بۆ لای, لەو بترسنو خۆتان لەسزای بپارێزن, نوێژەكانیشتان بەچاكی بكەنو مەبن بەو كەسانەی كە شەریكو هاوەڵی بۆ بڕیاردەدەن, لەوانەی كەئاینەكەیان بەش بەش كردووەو بوونەتە چەندەها گرۆو دەستە (بڕوایان بەهەندێكی هەیەو بڕوایان بەهەندێكی نیەو كوێرانە شوێن ڕابەرەكەیان دەكەون) هەر گرۆو پارتێكیش دڵخۆشن بەبەرنامەو نەخشەو پلانی خۆیان (وا دەزانن چاكترین ڕێبازیان گرتۆتەبەر).

**پێنجەم:** بەلای پێنجەمی شەریك بۆ خوا بڕیاردان ئەوەیە كەشیرك گەورەترین زوڵمە, گەورەترین زوڵمە كەئینسان لەخۆی دەكات, لەبەر ئەوەی ئینسانی موشریك ئامادەیە ملكەچ بێو تەنازول بكاتو خۆی بكا بەبەندەی كەسێكی تری وەك خۆی, هەروەكو لوقمانی حەكیم ئامۆژگاریی كوڕەكەی خۆی كردو فەرمووی: ﴿ يَا بُنَيَّ لا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾( لقمان 13),

واتـە: کـوڕە شـیرینەکەم, نەکـەیت شـتێك یـان کەسـێك بـەهاوتاو هاوبەشـی خـوا بڕیاربدەیت, چونکە بەڕاستی هاوتـاو هاوبـەش بـۆ خـوا بڕیـاردان سـتەمێکی زۆر گـەورەو ناڕەوایە.

شێخی ئبن کەثیر لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيم, أي هُو أَعْظَمُ الظُلْم ), واتە: شیرك گەورەترین ستەمە.

ئیمانداران: لێرەدا حەزدەکەم ئەم بەسەرهاتە واقیعیـیـەتان بـۆ بگێڕمـەوە کـەئیمامی ذەهەبیو شێخی ئبن کەثیر باسیان کردووەو دەفەرموون: کابرایەکی شـاعیر هـەبوو نـاوی حەسەنی کـوڕی هـانیء بـوو, ئـەم شـاعیرە جارێکیـان بەنوێنەرایـەتیی قـەومو هۆزەکـەی خۆی" چوو بـۆ سـەردانی یـەکێ لەپاشـا دەسـتەڵاتدارەکانی ئـەو سـەردەمەو, بـۆ ئـەوەی سـەرنجی پاشـا بـەلای خۆیـدا ڕاکێـشێو پاشـا هەنـدێ پـارەو خـەڵاتی پێ‌ببەخـشێ" دەستی‌کرد بەمەدحو ثەنای پاشاو لەدێڕە شیعرێکیدا گوتی:

ما شِئْتَ لا ما شاءتِ الأَقْدارُ فَاحْكُمْ فَأَنْتَ الْواحدُ الْقَهَّارُ ! !

(پەنا بەخوا) خۆی کافرکردو گوتی: ئەی پاشام, هەرچی تۆ بتەوێو تـۆ حـەزت لێ بـێ هەر ئەوە دەبێ, نەك ئەوەی قەدەری خوا مەیلی لێیەتیو حەزی لێیەتی.. جـا جـەنابت ئەمر بفەرموو, چونکە تـەنها هەر تۆی کەتەنها دەستەڵاتدارو زەبروەشێنی!

بـەڵێ, ئـاوا مـەدحی کەسێکی‌کرد کەئـەویش بەشـەرێکە, هیـچی لـەقازانجو زەرەر بـۆ نەفسی خۆیشی بەدەست نیە, چ جای بۆ غەیری خۆی .

بـەڵێ ئیمانـداران, ئـەم شـاعیرە دوژاوە لەسـەفەرەکەی گەڕایـەوەو هەرکـە گەیـشتەوەماڵەوە" تووشـی نەخۆشـیـیەکی کوشـندەی بێ‌دەرمـان بـوو, شـەو تـا بـەیانی هـاواری لێ هەڵدەستاو خەوی لێ نەدەکەوت, وەهەرچـی خـواردنو خواردنـەوە بـوو بـۆی نـەدەخوراو لەسـکیدا دەبـوو بـەئاگر. بـۆ چارەسـەری ئـەم نەخۆشـییە کوشـندەی" هەرچـی دکتـۆرو حەکیمی بەناوبانگ بوو چوو بـۆ لایـان, بـەڵام هـیچ سـوودی نـەبوو, لەبـەر ئـەوەی خـوای گەورە سُبحانَهُ وَتَعالى وویستی هەر لەدنیادا نیشانی بدا کە (الواحِدُ القَهَّار) کێیـە ! بـەڵێ, ئەم شاعیرە کەگەورەترین زوڵمـی لەنەفـسی خـۆی کـرد, کەعەبـدێکی بێدەسـەڵاتی بـردە ڕیزی خوا (نَعُوذُ بِالله) بەڵکو لـەخوای گەورەشـی بـەرزتر کـردەوە" ئـاخری لـەژیانی خـۆی

هیوابڕاو بوو، دڵنیابوو کەتازە چارەسەری نیە، بۆیە بەتەنیا لەسەر جێگا ئەمدیواودیوی دەکردو دەگریاو بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە دەیگوت:

أبْعَيْنِ مُفْتَقِرٍ إلَيكَ نَظَرْتَ لي ... فَأهَنْتَني وَقَذَفْتَني مِنْ خالقي

لَستَ المَعلومَ أنا المَلُومُ لأنَّني ... عَلَّقْتُ آمالي بِغَيرِ الخالقِ

بەڵێ، بەم شێوەیە پەشیمانیی خۆی دەربڕیو دانی بەوەدا نا کەدەبێ لۆمەی خۆی بکا، چونکە هیواو ئاواتەکانی خۆی لەلای غەیری خالیقی ئینسان کە(الله)یە دەبینییەوە. جا لەهەر سەردەمو هەرکاتێکدا، هەرکەسێ بیەوێ کەسێکی دەسەڵاتدار لەخۆی ڕازی بکا، بەوەی کەخوا لەخۆی عاجز بکا، ئەوە بەدڵنیایی یەوە خوای گەورە زەلیلی دەکا، سەرشۆڕی دەکا، ڕۆژێك هەر لەدنیادا نیشانی دەدا کەغەیری (الله) جَلَّ جَلالُهُ هیچ کەسێکی تر" هیچی بەدەست نیەو خوای گەورە ڕازی نابێ کەسی بکرێ بەشەریك.

باوەڕدارانی بەڕێز: بەڕاستی کەرامەتو حورمەتو ڕێزی ئینسان لەخواپەرستیدایە، وەسووك بوونو ریسوابوونو ماڵوێرانبوونی ڕاستەقینەی ئینسان لەوەدایە بێجگە لەخوا" شتێکی ترو هێزێکی تر بپەرستێ، یان لەگەڵ خوادا" خواگەلێکی تر بناسێو بپەرستێ، وەمانەوەو نەمرێو خلوودیی ئەم دینی ئیسلامەی ئێمە بەهۆی قورئانەوەیە، قورئانیش بۆیە زۆر مەزنو گەورەیەو بۆیە تاکە صەیدەلیەو شیفایە چونکە دایکێکی هەیە کەسوورەتی (الفاتحة)یە، کە بەسوورەتی فاتیحە دەووترێ (أُمُّ الكتاب)، یانی: سەرچاوەو دایکی قورئان، ئەم سوورەتەش بۆیە کراوە بەنوێژ" بۆیە گەورەو مەزنە" بۆیە واجبە لەنوێژدا هەر ئەو سوورەتە بخوێندرێو هیچ سوورەتێکی تری قورئان لەجیاتی فاتیحە ناکەوێ لەنوێژدا" چونکە سوورەتی فاتیحە ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ی تێدایە، لەبەر ئەوەی (لا إلهَ إلاّ الله) تەئکید دەکات، چونکە جەخت لەسەر یەکتاپەرستی دەکاو نەفرەتو نەفرین لەشیرك دەکا. بۆیە دەبێ سوورەتی فاتیحە لەهەموو ڕکاتێکی نوێژدا بخوێندرێو گەورەترین روکنی نوێژە، درێژترین ڕوکنی نوێژیش فاتیحەیە بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانان وەکو سوورەتی فاتیحەیان لەبەرە" تەفسیرو ماناکەیشی بزانن، بزانن کە ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ یانی چی؟ یانی: خوایە بەڵێنی دەدەم" پێنج جار لەبیستو چوار سەعاتدا" وەدەیان جار لەسوننەتەکانیشدا" کەوا: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ ) تەنها

پەرستنەکان پێشکەش بەتۆ دەکەم، تەنها پشتوپەنای من تۆی، بێجگە لەتۆ پشت بەکەس نابەستم، هیچ هێزو دەسەڵاتێ ناپەرستم، لەکەس ناپاڕێمەوەو لەهیچ هێزو کەسێکی تر ناترسمو باکم لێی نیە ئیللا تۆ نەبێ، ئەوە مەعنای ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ـە.

جا پێغەمبەران (سەلامو ڕەحمەتیان لێبێت)، هەموویان بۆ ئەوە هاتوون ئەمە بڵێن، هەموو کتێبەکان بۆ ئەوە هاتوون، جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە گەورەیە بکەنو خەڵکان لەمە تێبگەیەنن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هیچی نەویست تەنها (لا إلهَ إلاّ الله) نەبێ، فەرمووی تەنها بڵێن (لا إلهَ إلاّ الله)، ئیتر هەرکەسێ پاشایە" موڵکی خۆی بۆ خۆی، هەرکەسێ دەسەڵاتدارە" دەسەڵاتی خۆی بۆ خۆی، هەرچی هەیە عەرەبیەتو عەجەمیەتی خۆی بۆ خۆی، تەنها هەموو بەیەکەوە (لا إلهَ إلاّ الله) بڵێن تا ڕزگارتان ببێ لەو بتو بتخانەیە، ئیتر هیچی ترم ناوێ ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾(الانبياء 25)، ئەمە بەرنامەی هەموو پێغەمبەرانە (سەلامو ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێ).

خۆشەویستان: خوای گەورە سُبحانهُ وتَعالى لەحەدیثي قودسیدا مژدە دەدا بەئینسانی گوناهبار، ئەمە ئەگەر گوناهی گەورە یان گچکەی کردبێ، بەمەرجێ دڵـەکەی خاوێن بێ، بەمەرجێ تەوحیدیی خالصی بێ، دڵەکەیو عەقیدەکەی شیرکی تێدا نەبێ، بۆگەنی شیرکی تێکەڵ نەبووبێ. ئینسان چەند گوناهبار بێ" ئەگەر بەبێ تۆبەش مردبێ" خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر حەز بکەم لێی خۆش دەبم، گوێ بگرە بۆ فەرموودەی قودسی، فەرموودەی خوا، مژدەی خوا، بەمەرجێ یەکتاپەرست بیو هاوبەشت بۆ خوا دانەنابێ، دەفەرموێ: (مَنْ لَقِيَني بِقُرابِ الأرْضِ خَطيئَةً لا يُشْرِكُ بي شَيْئاً لَقِيتُهُ بِمِثْلِها مَغْفِرَةً)(رواهُ مُسْلِمٌ)، واتە: هەرکەسێك نزیك بەپڕی زەوی بەگوناهەوە بێ بۆ مەیدانی هەقو حیسابی من" بەو مەرجەی کەس نەکا بەهاوبەشم" هیچ مانیعێ نیە کە بەقەد گوناهەکانی بەلێبوردنەوە بچم بەپیریەوەو مادام هاوبەش بۆ من دانەنێ دەتوانم لێی خۆش بم.

هەروەها خوای گەورە موژدەمان دەداتێو دەفەرموێ: (يا إبْنَ آدَمَ إنَّكَ لَوْ أتَيْتَني بِقُرابِ الأرْضِ خَطايا، ثُمَّ لَقيتَني لا تُشْرِكُ بي شَيْئاً لأتَيْتُكَ بِقُرابِها مَغْفِرَةً)(رَواهُ التُرمذي)،

واتە: ئەی بەنی ئادەم، ئەی ڕۆڵەی ئادەم، ئەگەر ڕۆژی قیامەت هاتیتە لای منو نزیکەی پڕ بەم زەوییە گوناهت لەگەڵ خۆتدا هێنا" بەمەرجێ شیرکت بڕیار نەدابێ بۆ من. بەمەرجێ عەقیدەکەت خاوێن بێ، ئەفسانەو شتی پڕوپووچی تێدا نەبێ، ئەوا من ئەو لاپەڕەو جێگەی گوناهانەت پڕدەکەمەوە لەمەغفیرەتو لێت خۆش دەبم، قەڵەمی عەفو دێنم بەسەر هەموو گوناهو تاوانەکانتدا، بەمەرجێ شیرکت نەبێ. بەڵام ئەگەر بەقەدەر ئەرزو ئاسمان عەمەلی صالح بێنیو عەقیدەکەت ریاو شیرکی تێدابێ، خوای گەورە دەفەرموێ: (تَرَكْتَهُ وَشِرْكَهُ وَلا أُبالِي)، دەفەرموێ: دەڵێم بڕۆ کاروکردەوەت بۆ کێ کردووە، عەمەلو کردەوەکەت بۆ ئەو، من کردەویەکم ناوێ شیرکی تێدابێ، چونکە خوا (أَغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكَ)، خوای گەورە دەوڵەمەندە (غَنِيٌّ حَمِيدَ )ە. لەبەر ئەوە، ئیسلامی ئێمە شیفایە، صەیدەلیەیە، چرایە، پێغەمبەرەکەمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چرایە، ئەم دینەی ئێمە ئیصلاحە بۆ دڵەکان، بۆ دەستو ئەندامەکان، بۆ چاوەکان، بۆ گوێکان، بۆ ژیان، بۆ ژینگە، بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، بۆ دونیا، بۆ ئاخیرەت، بێجگە لەم شیفا ئاسمانییە، شیفایەکی تر نەماوە، (قَدْ عَجِزَ الدَّواءُ وَفَشِلَ الطَّبِيبُ)، ئەم دینەی ئێمە نەبێ، ئەویش میفتاحو کلیلەکەی (لا إِلهَ إِلاّ الله)یە..

(قُولوا: لا إِلهَ إِلاّ اللهَ تُفْلِحُوا)، ئێمەش بەردەوام ئەمە دروشمو شیعارمانە: (لا إِلـهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحيِي وَيُمِيتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِير).

داوادەکەم لەخوای گەورە لەسەر (لا إِلهَ إِلاّ الله) بژینو لەسەر (لا إِلهَ إِلاّ الله) بمرینو بچینەوە لیقای خوا ..

اللّهُمَّ آمین.

## سەرچاوەکان


1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ رياض الصَّالحين, الإمام النَوَوي, وەرگێڕانی: نوری فارس, چاپی یەکەم

3 ـ التَرغيب والتَرهيب, للحافظ عَبدُالعَظيم المُنذِري, دار إبن الهَيثَم, ط 1, القاهرة 2001 .

4 ـ صَحيح وصايا الرَّسُول, سَعد يوسف أبو عَزيز, المكتبة التَوفيقية, ط 1, القاهرة 2001 .

5 ـ تَفسير القُرآن العَظيم, للحافظ إبن كَثير, دار الكُتب العلمية, ط 1, بيروت 1998

6 ـ جَواهر الخُطَب المُختارة, إعداد: عَدَد من الخُطَباء والعُلَماء, دار إبن كَثير, ط 2, دمشق 2003

7 ـ المِسك والعَنبَر في خُطَب المِنبَر, د.عائض القَرَني, مكتبة العبيكان, ط 1, الرِّياض 2002 .

8 ـ بیروباوەڕی ئیسلامی لەدوو توێی قورئان‌و سوننەتدا, هێمن عبدالعزیز, چاپی دووەم, 1998

9 ـ موسڵمانی کامڵ (بیروباوەڕی موسڵمان), عەلی باپیر, هەولێر, چاپی یەکەم, 1997

10 ـ بیروباوەڕبوون بەخوا, د. عومەر سلیمان ئەشقەر, وەرگێڕانی: ئارامی گەلاڵی, نوسینگەی تەفسیر, هەولێر, چاپی یەکەم, 2000 .

11 ـ شێخی گەیلانی, ئازاد ڕەئووف قەزاز, چاپخانەی الحَوادث, بغداد, چاپی یەکەم, 1988

12 ـ بەرچاوڕوونی, ئەندازیار عُثمان محمد رشید, چاپی سێیەم, 2002 .

13 ـ گۆڤاری ڕێگای ڕاست, دەستەیەك لەمامۆستایانی ئاینی دەریدەکات, ژمارە (2), پایزی 1423ی کۆچی .

14 ـ گۆڤاری پەیامی زانایان, یەکێتیی زانایانی ئاینی ئیسلامیی دەریدەکات, ژمارە (2), 2001 .

15 ـ لەخزمەت قورئاندا, ئەندازیار عُثمان محمد رشید, چاپی یەکەم, 2001

# ووتـاری شەشەم

## مـافـی دایـكو بـاوك

**بەشی یەكەم**

قالَ اللهُ تَعالى:

﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً, وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴾

(الاسراء 23 ـ 24)

قالَ رسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( لا يَجْزِي وَلَدٌ والِدَهُ إِلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكاً فَيَشْتَرِيَهُ فَيَعْتِقَهُ )

(رَواهُ مُسلِم )

الحمدُ لله رَبّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين ى يومِ الدِّين..

ئيمانداران‌و خواناسانی بەڕێز: سەلام‌و ڕەحمەتی خوا لەهەموومان بێت لەووتارەکانی ـبرنوودا لەخزمەت وەصیەتی یەکەمی خوای پـەروەردگـاردا بووین کەفەرمووی: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾(الأنعام 15), واتـە: ئـەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" پێیـان بڵێ: خەڵکینە وەرن ئەو شتانەتان بۆ باس بکەم کەپەروەردگارتان لەسەرتانی حەرام کردوون, یەکەمیان ئەوەیە: ﴿ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾, هاوەڵو شەریکی بۆ بڕیار مەدەن. لەپێنج وتاردا باسی جۆرو زیانەکانی شیرکمان کرد, لەم وتارەشدا" پشتیوان بەخوای گەورە باسی وەصیەتی دووەمی رَبُّ العالَمین دەکەین بۆ نێمەی عەبدو بەندەی خۆی. جا دیارە ئەو وەصیەتەی کەدوای باسی شیرك دێ" کەشەریك بۆ خوا بڕیارنەدان مافی تایبەتی خوای گەورەیە, دەبێ ئەوەی کەدوای ئەوە خوای گەورە فەرمانی پێدەکات زۆر گەورە بێ. بەڵێ وەصیەتی دووەم بریتییە لە: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً ﴾, واتە: چاك ڕەفتار بن لەگەڵ دایك‌و باوكتاندا.

دە فەرموون با بچینە خزمەت ئەم باسە گرنگ‌و شیرینەو بزانین خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەربارەی مافی دایك‌و باوك لەسەر ئەولادو ڕۆڵەکانیان چییان فەرمووە!

خۆشەویستان: پێش هەموو شتێك پێویستە ئەو حەقیقەتە بزانین کەدایك‌و باوك هۆکارو سەبەبی بوونی ئەولادن, ڕاستە ئینسان خوای تاك‌وتەنیا دروستی دەکا" دروستکردنی ئینسان‌و هەموو شتێك تەنها هی خوایەو غەیری خوای گەورە دەسەڵاتی دروستکردنی باڵە مێشوولەیەك‌و بچووکتریشی نیە, بەڵام خوای گەورە سەبەبیشی داناوە بۆ پەیدابوونی ئەو منداڵە. دایك‌و باوك سەبەبن بۆ دروستبوونی منداڵ, کەوابوو: ئەگەر دایك‌و باوکمان نەبوایە خوای گەورە ئێمەشی خەڵق نەدەکرد. بەڵێ, خالیق هەر خوایەو دایك‌و باوکیش سەبەبی دروستبوونی منداڵن. شتێکی مەعلووم‌و زانراوە لای هەموو کەس کەیەك قەترە ئاو لەپشتی پیاو دێتە دەرەوەو دەچێتە ناو ڕەحمی دایك, ئەمجا لەوێدا ئەو منداڵە پەروەردە دەبێ‌و گەورە دەبێ, تا دێتە سەر زەوی. کەوابێ ئەولاد پارچەیەکـــــە

لەدایكو باوك, بۆیە زۆر پێویستە ئێمە قەدرو رێزی دایكو باوكمان بزانین. منداڵ بەماڵی دایكو باوكی گەورە دەبێ, چۆن مۆمێك خۆی دەتوێنێتەوە بۆ ئەوەی دەوروبەرەكەی رووناك بكاتەوە" دایكو باوكیش ژیانو گەنجێتیو ئیسراحەتی خۆیان دەتوێننەوە بۆ ئەوەی ئەو منداڵە گەورە ببێ. واتە: خۆیان رێگای مردن دەگرن بۆ خاتری ژیانی ئەولادیان.. نابینی باوك" حەرام حەلاڵ دەكاو حەلاڵ حەرام دەكا, سەرماو گەرمای ساڵ بەخەسار ناداو ئەم شارو ئەو شار دەكاو زۆرجار خوای گەورە لەخۆی عاجز دەكا لەبەر خاتری ئەوەی پارەی باشتر پەیدا بكاو ژیانێكی خۆشتر بۆ منداڵەكانی دابین بكا! لەولاشەوە دایك" خوێنی خۆی, ژیانی خۆی, ئیسراحەتی خۆی, هەمووی بەمنداڵەكەیدەبەخشێ!

بەڵێ, دایكو باوكمان, ئێمەیان ئاوا گەورە كردووە, ئێمە هەروا بەئاسانی پێنەگەیشتووینو گەورەنەبووین, بەڵكو بوونی ئێمە یەعنی توانەوەی دایكو باوكمان. بەلام بەخوا ئینسان هەتا خۆی منداڵی خۆی نەبینێ هەرگیز وەكو پێویست نازانێ دایكو باوكی چییان بۆ كردووەو چۆن خوێنیان بووە بەئاو لەپێناو گەورەكردنی ئەودا. خۆت جەرگی خۆت ببینە بزانە سۆزو رەحمی تۆ چۆنە بەرامبەر منداڵەكەت, دڵنیابە كەسۆزو خۆشەویستیی ئەوان لەمنداڵیدا بۆ تۆ" زۆر لەوە زیاتر بووە!

بەرێزان: ئێستا با بچینە خزمەت قورئانی پیرۆزو بزانین خوای گەورە چۆن باسی چاكەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا دەكات, كاتێ سەرنجی قورئان دەدەین دەبینین خوای گەورە كەباسی چاكەكردنمان لەگەڵ دایكو باوكدا بۆ دەكات لەكوێدا باسیدەكات؟ لەتەنیشت عیبادەتی خۆیدا باسیدەكات, واتە: خوای گەورە" چاكەكردنی لەگەڵ دایكو باوكدا بەعیبادەتی خۆیەوە بەستۆتەوە وەكو دەفەرموێ: ﴿ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً ﴾ (النساء 36), واتە: (ئەی خەڵكینە, تەنها هەر خوا بپەرستنو هیچ جۆرە شەریكو هاوەڵێكی بۆ بڕیار مەدەن, وەچاكەكار بن لەگـەڵ دایكو باوكتاندا) تەماشاكەن خوای گەورە سُبحانَهُ وَتَعالى لەتەنیشت فەرمانكردن بەعیبادەتی خۆی فەرمانیشی كردووە بەچاكەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا. واتە: چاكەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا بەعیبادەتی خوا حسێبە!

هەروەها خوای گەورە لەئایەتێکی تری سوورەتی ئیسراءدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً, وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴾ (الاسراء 23 ـ 24).

﴿ وَقَضَى رَبُّكَ ﴾ واتە: (وَأمَرَ رَبُّكَ). خوای گەورە بڕیاری داوەو ئەمری کردووە! جا ئیمانداران, ئاگاداربن بڕیاری خوایەو ئەمری خوایە, گوێتان لێبێ خوا ئەمر دەکا, ئەمر دەکا بەچی؟! ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ﴾, واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کەجگە لەو کەسی تر نەپەرستن, ﴿ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً ﴾ هەروەها چاکەکاریش بن لەگەڵ دایكو باوکتاندا. تەماشاکەن, لێرەشدا خوای گەورە لەدوای عیبادەتی خۆی" باسی چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا دەکات. کەوابوو: چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك, بەستراوەتەوە بەعیبادەتی خوا! پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا ﴾ هەرکاتێ یەکێکیان یان هەردووکیان بەپیری کەوتنە لای تۆ" پەککەوتە بوون" وایان لێهات کەموحتاجی تۆ بن تا بەخێویان بکەی ﴿ فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ ﴾ تەنانەت ئۆفیان لەدەست مەکەو هەرگیز پێیاندا هەڵمەشاخێ, قەت نەچی قسەیەکی زبرو ڕەقیان بەرامبەر بکەی, قەت نەڵێی ئۆف لەدەستت چی بکەم, واتە: هەرگیز هیچ وشەیەکی ناڕەزاییان بەرامبەر بەکارمەهێنە. چونکە کەلیمەی (أُفٍّ)" یان بۆ خۆی فیعلە, یان ئیسمی فیعلە, واتە: هیچ کەلیمەیەکی ناڕەزایی بەرامبەریان بەکارمەهێنە, بەڵکو ﴿ وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً ﴾, بەردەوامیش قسەو گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاکو جوانو بەجێ بێت, بەزمانی ڕێزو ئیحتیرام قسەیان لەگەڵدا بکە ﴿ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ ﴾ باڵی میهرەبانیی خۆتیان بۆ ڕابخەو ملکەچ بە بۆیان. ئیمامی قورطوبي دەفەرموێ: بەحوکمی ئەم ئایەتە" پێویستە ئینسان لەگەڵ باوكو دایکیدا لەوپەڕی ملکەچیو خۆ بەکەم زانیندا بێ, لەقسەکردنو لەهەڵسانو دانیشتنو تەماشاکردندا نابێ لەکاتی تەماشاکردنی بۆ دایكو باوکی خۆی چاوی بز بکاتەوە, چونکە ئەوە تەماشاکردنی ئینسانی تووڕەیە ﴿ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴾ بەردەوام دوعایان بۆ بکەو میهرەبان بە بۆیان, هەروەکوچۆن ئەوان ڕەحمیان بەمن کردو

منیان پەروەردەکردووە بەبچووکیو بەمنداڵی.

خۆشەویستان: خاڵی دووەم لەفەزڵی ئیحسانو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا ئەوەیە کاتێ ئینسان سوپاسی دایكو باوکی دەکات ئەوە وەکو ئەوە وایە سوپاسی خوای خۆی کردبێ, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا الْأِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾(لقمان14), واتە: ئێمە فەرمانمان داوە بەئادەمیزاد بەچاك ڕەفتاری لەگەڵ دایكو باوکیدا, بۆچی؟ چونکە ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ ﴾, چونکە دایك بەئێش‌وئازارو لاوازیو بێتاقەتییەکی زۆرەوە بەپێستی سکی" نۆ مانگ هەڵیگرتووە, نارەحەتی لەدوای نارەحەتی بەو منداڵەوە بینیویەتی, تاوەکو بەژان ئەو منداڵەی لێ جیابۆتەوە. بیری لێبکەنەوە! هەروا ئاسان نیە نۆ مانگ ئەو دایکە بەچەرمی سك" ئەو منداڵە هەڵدەگرێ! تۆ ئەگەر درکێکی بچووك بچێتە پەنجەتەوە, هەر بچێتە ژێر پێستەوە نەك ناو گۆشتیش ئایا چ ئازارێکت دەدا؟ کەوابوو هەرشتێکی غەریبو نامۆ بچێتە ناو لەشی ئینسان بەرگەی ناگرێو تەحەمولی ناکات, دەبێ فڕێی بداتە دەرو لێی جیابێتەوە, وەکو لەزانستی پزیشکیدا دەڵێ: لەناو خوێندا دوو جۆر خڕۆکە هەیە, خڕۆکەی سوورو خڕۆکەی سپی, خڕۆکە سپیەکان ئەوانەن کەوەکو وەزارەتی بەرگری وان, بۆئەوەی هەر شتێکی نامۆو غەریب بچێتە ناو لەشی ئینسانەوە" یان دەریبکەنە دەرەوە, یان خۆیان لەو پێناوەدا لەناودەچن! بەڵام تۆ نۆ مانگ لەناو سکی دایکتدا بووی, ئەو دایکە هەڵیگرتی, ئێش‌وئازار لەدوای ئێش‌وئازار, تا بەژان لەلاشەی دێتەدەرەوە.

﴿ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ﴾ وەپاش ئەوەی دوو ساڵ لەشیری مەمکەکانی داویەتی بەو منداڵە ئەمجا لەشیری بڕیوەتەوە, کەشیریش خوێنی دایکەکەیەو بەشیر, دایك لاواز دەبێو مادە سوودبەخشەکانی ناو لەشی دەچن بۆ مەمکەکانی تاوەکو شیر بۆ منداڵەکە دروست ببێ, جا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ ﴾, فەرمانماندا بەئینسان کەئەی ئینسان" سوپاسگوزاری منیشو دایكو باوکیشت بە. کەوابوو سوپاسکردنی دایكو باوكو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا" بەجێگاو مەنزیلەی سوپاسکردنی خوای گەورەیە.

﴿ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾ دلّنیابن كەگەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە, وەكو ئەوەی خوا بفەرموێ: ئەی ئینسان بزانە دەگەڕێیتەوە بۆ لای منو ئەگەر وەكو من فەرمانم پێكردووی ئاوا چاكە لەگەڵ دایكو باوكتدا نەكەی ئەوە ڕۆژی قیامەت دەگەڕێیتەوە بۆ لای منو, من تۆڵەی بێئەمریی دایكو باوكت لێدەكەمەوە.

ئیمانداران: بۆچی خوای گەورە بەتایبەت باسی دایكو باوك دەكاتو دەفــــەرموێ: ﴿ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ ﴾؟ لەوولامدا دەڵێین: هەروەكو گوتمان بەڕاستی هـەڵگرتنی منداڵ لەلایەن دایكیەوە بەسكی بۆ ماوەی نۆ مانگ" هەروا شـتێكی سـادە نیـیە. چونكە بیربكەوە ئایا ئەو منداڵە لەناو سكی دایكیدا چی دەخوات؟ ئایا شیر دەخوا؟ نـەخێر, بـەڵكو خـوێنی دایكـی دەخـوا. (عەلەقـە) وەكـو زەروو وایـە, خـۆی بـەڕەحمی دایكـەوە هەڵواسیوە, ڤیتامیناتو ئۆكسجین لەخوێنی دایكەوە وەردەگرێ, ئـەو خواردنـەی كـەدایك دەیخوات" بەشێكی بـۆ ئـەو منداڵـە دەچـێ, كـەوابوو منـداڵ لـەناو سـكی دایكیـدا لەسـەر خـوێنو خـواردنی دایكـی گـەورە دەبـێو دەژی. پـاش لـەدایكبوون ئـەوجا شـیری دایكـی دەخوات. دایك" لەمنداڵ بەخێوكردندا ئیسراحەتی نیە.

بەڵێ, لەو ساتەوە كەمنداڵ نوطفیەو دەكەوێتە ناو رەحمی دایك" ئەو دایكە بەدەست ئەو منداڵەوە ئیسراحەتی نیەیە هەتا دەمـرێ. تەماشـاكەن, دایـك منـداڵ بەچـەرمی سـكی هەڵدەگرێ, پاشـان لەسـەر دەسـتی هەڵیـدەگرێ, پاشـان لەژیانـدا هەڵیـدەگرێ, ئـەولاد كەگەورەش دەبێ" كەژنیش دێنێ" خەمەكەی هەر بۆ دایكە, كەماڵیشی جیادەبێتەوە ئـەو دایكە كەخواردنێك دەخوا ئەولادەكەی هەر لەبیرەو دەڵێ: خۆزگە ئەویش لێرە بوایەو لـەو خواردنــەی بخواردایــە. بــەڵێ, دایــك هــەتا دەمــرێ هــەموو دەقیقەیــەك هــەر لەخــەمی ئەولادەكانیـەتی. جـا بۆیـە هەرچـی بكـەین بەرامبـەر دایكـەكانمان نـاتوانین چـاكەیان بدەینەوە, هەروەكو جارێكیان كەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم عەرزیكرد: ئـەی پێغەمبـەری خـوا" مـن لەیەمەنـەوە بـەكۆڵی خـۆم حـەوت جـار دایكمـم هێناوە بۆ حەج! (ئەو كاتە ئوتومبێلو فرۆكە نەبووە, بەپشتی خۆی دایكـی هـەڵگرتووەو بـەپێ حـەوت جـار دایكـی لەیەمەنـەوە هێنـاوە بـۆ حـەج!), ئـەوجا كـابرا گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خوا" ئایا دایكم حەقی لەسەرم ماوە؟ پێغەمبەری خــــوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم

وولامی دایەوەو فەرمووی: نەك هەر حەوت جار, بەڵكو ئەگەر حەفتا جاریش بەكۆڵ بیهێنیو بیبەی هێشتا بایی ئازاری یەك ژان نییە كەدایكت لەكاتی لەدایكبوونی تۆدابینیویەتی!

كەواتە: بەڕاستی حەقی دایك نادرێتەوە, بۆیە پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم لەوولامی ئەو كەسەدا كەهاتە خزمەتیو عەرزیكرد: (یا رسولَ الله, مَنْ أحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صحابَتي؟!) ئایا چ كەسێ لایەقترینو شایستەترین كەسە كەمن زۆر ئاگام لێی بێو زۆر خزمەتی بكەم؟ (قالَ: أُمُّكَ) فەرمووی: دایكت, (ثُمَّ مَنْ؟) ئەی لەدوای دایكم؟ (قالَ أُمُّكَ) فەرمووی: هەر دایكت, (قال: ثُمَّ مَنْ ؟), كابرا لەجاری سێیەمدا عەرزی كردەوە: ئەی پێغەمبەری خوا" ئەی دوای دایكم چاكە لەگەڵ كێیتردا بكەم؟ خۆشەویست صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أُمُّكَ), هەر دایكت, كابرا لەجاری چوارەمدا گوتی: (ثُمَّ مَنْ؟!), ئەی لەدوای دایكم لایەقترین كەس كەبەردەوام لەخزمەتیدا بمو ئاگام لێی بێ كێیە ؟ ئەمجا حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أبوكَ) باوكت. ( مُتَّفق علیه )

هەر لەبارەی گەورەیی دایكەوەیە كەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرموویەتی: (الجَنَّةُ تَحْتَ أقْدامِ الأُمَّهات). بەهەشت لەژێر پێی دایكاندایە, واتە: هەركەسێ حەزی لەبەهەشتە" با لەخزمەت دایكیدا بێت!

خۆشەویستان: ئەبو بەردە" كەكوڕی صەحابیی بەڕێز ئەبو مووسای ئەشعەرییە (ڕەزای خوای لێبێت) دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: عەبدوڵلای كوڕی ئیمامی عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێت) لەدەوری ماڵی بەیت چاوی بەكابرایەك كەوت وا دایكی كە لەبەر پیری زۆر بچووك بۆتەوەو وەكو منداڵی لێهاتۆتەوە, بەدەوری كەعبەی پیرۆزدا دەیگێڕێو تەوافی پێدەكات. كەكابرا چاوی بەعەبدوڵلای كوڕی ئیمامی عومەر كەوت" ئەم شیعرەی خوێندەوە كەباسی حاڵی نێوان خۆیو دایكی دەكاتو دەڵێ:

إنِّي لَها بَعيرُها المُذَلَّلْ إنْ أُذْعِرَتْ رِكابُها لَمْ أُذْعَرْ

اللهُ رَبِّي ذُو الجَلالِ الأكْبَرْ

حَمَلْتُها أكْثَرَ مِمَّا حُمِلَتْ فَهَلْ تَرى جازَيْتُها يابْنَ عُمَرْ؟!

ئەم كابرایە باسی خۆی دەكات كەچۆن لەخزمەتی دایكیایەتیو دەڵێ: مـن بۆ دایكم

وەك حوشترێكی زەلیلو لەسەرخۆ وام، هەركات بێتە سەر پشتم ئازاری نادەمو بەئارەزووی ئەو دەجوولێمەوە، وەئەمەش كەدەكەم بۆ رەزامەندیی خوایەو دەزانم خوای گەورە چەند بالآدەستو بەدەسەلآتە. پاشان دەلێ: ئەی ئبن عومەر، ئەوەندەی دایكم منی لەكۆلكردووە بەخوا زۆر لەوە زیاتر لەكۆلم كردۆتەوەو بەكۆلی خۆم گێراوەمە، ئایا تۆ كەصەحابیو خۆشەویستی پێغەمبەری خوایو شارەزای قورئانو سوننەتی تۆ بلێی توانیبێتم پاداشتی دایكم دابێتەوە؟ عەبدوللای كوری ئیمامی عومەر فەرمووی: نەبەخوا، بەو هەموو خزمەتەی كەتۆ كردووتە هێشتا بایی ژانێكی مندالبوون نیە، بەلآم تۆ ئەولادێكی باشیتو (واللهُ يُثيبُكَ عَلى القَليلِ كَثيراً) خوای گەورەش لەسەر كردارێكی جوانو باش كەبەرامبەر دایكت كردووتە پاداشتێكی زۆرت دەداتەوە.

بەرێزان: بەراستی پاداشتی دایك نادرێتەوە، لەبەرئەوەی خۆ دایك هەرئەوەی بۆ ئەولادەكەی نەكردووە كە بەخێوی بكاو خزمەتی بكاو بەباوەشو بەكۆل هەلیبگرێ، كەسێكیش دایكی گەیشتە ئەو ئاستەی كە لەبەر پیری هیچ پاكو خاوێنیەكی خۆی پێنەدەكراو لەدەستو چاوو قاچی خۆی بووبوو" ئەم ئەولادەی بەپشتی خۆی" ئەم دایكەی هەلدەگرتو چۆن ئەم بەمندالی" دایكی پاكی كردۆتەوە" ئاوا دایكی خۆی خاوێن دەكردەوە، هێشتا نەیتوانیوە پاداشتی دایكی بداتەوە، وەكو ئەوەی كەجارێكیان كابرایەك بەئیمامی عومەری كوری خەتابی گوت: ئەی پێشەوای موسلمانان: (إنَّ لي أُمّاً بَلَغَ مِنْها الكِبَر أنَّها لا تَقْضي حاجَتَها إلاّ وَظَهْري مطِيَّة لَها، فَهَلْ أدَّيْتُ حَقَّها؟!)، كابرا گوتی: دایكم ئەوەندە بەسالدا چووەو وا پەكی كەوتووە كەبۆ هەر پێویستیەكی دەبێ بەكۆلی خۆم بیبەمو بیهێنم، ئایا حەقی دایكمم داوەتەوەو توانیومە پاداشتی بدەمەوە؟

ئیمامی عومەر فەرمووی: لا، نەخێر. كابرا گوتی: بۆچی؟ ئیمامی عومەر فەرمووی: (لأنَّها كانَتْ تَصْنَعُ بِكَ ذلِكَ، وَهيَ تَتَمَنَّى بَقاءك، وأنْتَ تَصْنَعُهُ وَتَتَمَنَّى فِراقَها)، بۆیە قەت ناتوانی پاداشتی دایكت بدەیتەوە چونكە تۆ" كاتی خۆی كەمندال بووی" ئەوەی ئێستا تۆ باسی دەكەی دایكت هەمووی بۆ تۆ كردووە، لەگەل ئەوەشدا هەر دوعای كردووە كەخوا تۆی بۆ بێلێو تەمەن درێژ بی، بەلآم تۆ هەرچەند كورێكی بەوەفاو باش بیو بەجوانترین شێوە خزمەتی دایكت دەكەی" كەچی ئاواتت ئەوە نیە دایكت تەمەنی درێژتر بێ، بەلـــكـــو

دوعای بۆ دەکەی ئیمانی سەلامەت بێو لەوە زەلیلتر نەبێ, واتە: بەمردنی زۆر دڵناڕەحەت نی, بەڵام ئەگەر تۆ بەمنداڵی بمردیایە" دایکت جەرگی دەسووتاو هەرگیز لەبیری نەدەچوویەوە! بۆیە هەرگیز هیچ کەسێك ناتوانێ پاداشتی دایکی بداتەوە.

خاڵی سێیەم لەگەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوكدا ئەوەیە کە: چاکەکردن لەگەڵیاندا یەکێکە لەخۆشەویسترین کردەوەکان لای خوای گەورە. تۆی موسڵمان ئەگەر دەپرسی ئایا چ کردەوەیەك بکەم لای خوای گەورە زۆر خۆشەویست بێ, ئەوا چاکە لەگەڵ دایكو باوکتدا بکە, وەکو ئەوەی کەڕۆژێکیان عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێبێت) لەپێغەمبەری خوای پرسی: (أيُّ العَمَلِ أحَبُّ إلى الله؟), ئایا چ کردەوەیەك خۆشەویسترین کردەوەیە لای خوای گەورە؟ پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (الصَّلاةُ عَلى وَقْتِها) نوێژکردن لەکاتی خۆیدا, هەر کەبانگی فەرموو نوێژەکەت بکەیو دوای نەخەیت. عەبدوڵڵا پرسی: (ثُمَّ أيُّ؟) لەپاش ئەوە چ کردەوەیەك زۆر خۆشەویستە لای خوا؟ خۆشەویستمان صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (بِرُّ الْوالِدَيْنِ), لەگەڵ دایكو باوکتدا باش بیو دڵیان نەشکێنی. عەرزی کرد: (ثُمَّ أيُّ؟) لەدوای ئەوە چیتر لای خوا زۆر خۆشەویستە؟ (قالَ: الجِهادُ في سبيلِ الله) فەرمووی: لەپاشان جیهادکردن لەپێناوی خوادا. (رواهُ البُخاري ومُسلِم).

تەماشاکەن, چاکەکردنی لەگەڵ دایكو باوکدا پێشخست بەسەر جیهادکردن لەپێناوی خوادا, بەڵام ئاگاتان لێ بێ مەبەست لەم فەرموودەیەدا جیهادی فەڕزر کیفایەیە, چونکە جیهاد دوو جۆرە: فەڕزی کیفایەو فەڕزی عەینە, لەجیهادی فەڕزی کیفایەدا خزمەت کردنی دایكو باوك گەورەترە, بەڵام لەجیهادی فەڕزی عەیندا ئەوە جیهادەکە خێرتروگەورەترە.

جارێکی تریش کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم داوای لێکرد کەئیزنی بدا بۆئەوەی بەشداریی جیهاد بکات (دیارە لەو کاتەدا ترس لەسەر موسڵمانان نەبووەو ژمارەی موجاهیدان زۆر بووەو زەروور نەبووە ئەو کەسە بەشداریی جیهاد بکات), پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أحَيٌّ والِداكَ؟) ئایا دایكو باوکت زیندوون؟ (قالَ: نَعَمْ) گوتی: بەڵێ باوكو دایکم هەردووکیان لەژیاندان. (قالَ: فَفِيهِما

فَجاهِدْ) حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلّم فەرمووی: دە بچۆ خزمەتی دایكو باوكت بكە ئەوە وەكو ئەوە وایە جیهادت كردبی لەپێناوی خوادا. ( رواهُ البُخاري ومُسلِم )

موسڵمانان: بەڕاستی جێگای داخە ئەمڕۆ موسـڵمانان بەشـێوەیەكی گشتی لـەم سـێ كـردەوە گـران بـەهاو بـەنرخو خۆشەویـستانەی لای خـوا كەمتەرخـەمن! نوێـژەكانمان لەكاتی خۆیدا ناكەین, زۆربەمان وەكو خواو پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وسَلّم داوایـان كردووە ئاوا لەخزمەت دایكو باوكماندا نین, خـۆ غیرەتـی جیهادكردنیـشمان زۆر كزبـووە! كەچی دەشمانەوێ بەعیزەت بین, دەشمانەوێ خوا بەرەكـەتمان بـۆ بنێـرێ, دەشمانـەوێ دوژمنانی دینەكەمان زەلیل بن, كەچی ئەم سێ كردەوە زۆر خۆشەویـستەی كـەخوا زۆری پێ خۆشن وازمان لێ هێناونو پشت گوێمان خستوون! خـوا بـەلوطفـی خـۆی هیدایـەتمان بداو ئەو سێ كردەوەیەمان لەلا خۆشەویست بكاو یارمەتیمان بدا بۆ جێبەجێكردنیان.

خاڵی چوارەم لەفەزڵو گەورەیی چاكەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا ئەوەیە كەچـاكەكردن لەگەڵیاندا" مایەی چوونە بەهەشتە. بەڵێ, هەركەسێك لەگەڵ دایكو باوكیـدا چـاكەكار بـێ ئەوە خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەرانو چاكانو پاكاندا دەیخاتـە بەهەشـتەوە. جارێكیـان كەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی كرد: (يـا رسُـولُ الله صَـلّى اللهُ علَيْـهِ وَسَلّم. شَهِدْتُ أن لا إلـهَ إلاّ الله وَأنّـكَ رَسُـولُ الله, وَصـلّيْتُ الْخَمْـس, وَأدّيْـتُ زَكـاةَ مـالِي, وَصُـمْتُ رَمَضانَ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم" من شاهیدیم داوە كەغەیری الله هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێ, وەباوەڕم تەواوە كــەتۆ پێغەمبەری خــوای, پێنج فەرزەی نوێژەكانیشم بەجێدێنمو زەكاتیماڵەكەم دەدەمو مـانگی رەمـەزانیش بـەڕۆژوو دەبم (وەكو ئەوەی بڵێ: ئایا بەم كردەوان دەچمە بەهەشت؟), پێغەمبەری خوا صَـلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرمووی: (مَنْ ماتَ عَلى هذا كانَ مَعَ النَّبِيِّينَ والصِّدِّيقِينَ والـشُّهَداء يَـوْمَ الْقِيامَـة هكَذا ـ وَنَصبَ أُصْبُعَيْهِ ـ ما لَمْ يَعُقَّ والِدَيْه) فەرمووی: هەركەسێك لەسەر ئەوەی تۆ دەیڵێی بمرێ" ئـەوە رۆژی قیامـەت لەگـەڵ پێغەمبـەرانو راسـتگۆیانو شـەهیداندا دەبـێو لەگـەڵ ئەواندا دەچێتە بەهەشتەوە, وەكـو ئـەو پەنجانـە (لـەم كاتـەدا پێغەمبـەری خـوا" پەنجـە پیرۆزەكانـی دەسـتی خـۆی جـووت كـرد) بـەڵام یـەك مـەرجی تـر هەیـە ئـەویش ئەوەیـە: لەدونیادا خراپەی لەگەڵ دایكو باوكیدا نەكردبێ! (حَديث صَحيح رواهُ أحمَد والطَبَراني)

جارێکی تریش کابرایەك لەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم پرسی: ئایا باوك و دایك مافیان لەسەر منداڵەکانیان چیە؟ پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرمووی: (هُما جَنَّتُكَ وَنارُكَ)، ئەوان بەهەشت و دۆزەخی تۆن. واتە: ئەگەر لێت رازی‌بن بەهەشت جێگاتەو خۆ ئەگەر خوانەکردە لێت تووڕەبن ئەوا دۆزەخ شوێنتە لەقیامەتدا. (رواهُ إبن ماجَة)

هەروەها یەکێ لەصەحابەکانی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم کەناوی (جاهیمە) بوو" هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی‌کرد: (یا رَسُولَ الله، أرَدْتُ أنْ أغْزُوَ، وَقَدْ جِئْتُ أُسْتَشیرُكَ) گوتی: ئەی رەسوولی خوا، من خۆم ئامادەکردووەو نیەتم لێ هێناوە کەغەزا بکەم لەپێناوی خواداو هاتووم راوێژ بەجەنابت بکەم، ئایا فەرمانت بەچیە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (هَلْ لَكَ مِنْ أُمّ؟) ئایا دایکت ماوە؟ گوتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا فەرمووی: (فَألْزِمْها، فَإنَّ الجَنَّةَ عِنْدَ رِجْلِها) فەرمووی: دەی بڕۆوە بۆ خزمەت دایکت و دەستی پێوە بگرەو ئاگات لێی بێ، چونکە بەهەشت وا لەژێر پێی دایکتدایە! (حَدیث صَحیح رَواهُ النسائي)

خۆشەویستان: حەزرەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەرو دایکی ئیمانداران (خوای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: چوومە بەهەشت گوێم لەدەنگی قورئان خوێندنی کەسێك بوو! پرسیم: ئەوە دەنگی کێیە وا لەبەهەشتدا قورئان دەخوێنێ؟ گوتیان: ئەوە دەنگی حاریثە ی کوڕی نوعمانە. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: (کَذاكَ البِرُّ، کَذاكَ البِرُّ، وَکانَ أبَرَّ النّاسِ بِأُمِّهِ)، فەرمووی: بەڕاستی چاك بوون لەگەڵ دایکدا هەروا دەبێ، بەڕاستی چاك بوون لەگەڵ دایکدا هەروەك حاریثە دەبێ، ئەم حاریثەیە باشترین کەس بووە لەچاکەکردن لەگەڵ دایکیدا. (حَدیث صَحیح ـ رَواهُ أحمَد)

لەم فەرموودە پیرۆزەدا" پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم سەبەبی چوونە بەهەشتی حاریثە ی کوڕی نوعمانی بەوە لێکدایەوە کەزۆر بۆ دایکی باش بووەو دیارە پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ئاگای لێبووە کەئەم پیاوە چەند لەخزمەتی دایکیدا بووە. جا ئەی ئەو کەسانەی کە لەخزمەتی دایکتاندان" مـوژدەتان لێ بێ ئینشائەڵلا

بەهەشتی بەرین جێگاتانە.

بەڕێزان: خاڵی پێنجەم لەفەزڵی چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوكدا ئەوەیە کـــــەدوعـــای دایكو باوك بۆ ئەولاد قبووڵ دەبێ. جا ئەی نەوەو رۆڵەکان، ئاگاتان لەدوعای دایكو باوك بێ، هەوڵبدەن بەردەوام دوعای خێرتان بۆ بکەن، چونکە دوعای دایكو باوك" خوای گەورە قبووڵی دەکات ئینشائەڵلا.. دەگێڕنەوە ڕۆژێك لەڕۆژان حەزرەتی مووسا (عَلَیْهِ السَّلام) قسەی لەخزمەت خوای گەورەدا دەکرد، حەزرەتی مووسا فەرمووی: ئەی خوای گەورە، حەزدەکەم کەوا جیرانی خۆمم نیشان بدەی لەبەهەشتدا، حەزدەکەم هەر لەدونیادا نیشانم بدەی. خوای گەورە فەرمووی: ئەی مووسا، لەفلان شوێنو لەفلان کاتدا رابوەستە، کێ بەوێدا رابورد ئەو کەسە دراوسێو جیرانی تۆیە لەبەهەشتدا. حەزرەتی مووسا چووە ئەو شوێنەو لەکاتی دیاریکراودا چاوەڕێی هاتنی ئەو کەسەی کرد. بەڵێ، کابرایەك بەوێدا تێپەڕی، حەزرەتی مووسا بەشوێن کابرادا ڕۆیشت، تەماشایکرد وا کابرا چووە خانوویەکی زۆر بچووکی پەرپووتەوە، لەناو ئەو خانووە بچووکەدا ژنێکی پیری بەساڵداچووی تێدابوو کە لەبەر پیری" زۆر بچووك ببۆوە. کابرا چوو پیرەژنەکەی بەباوەش هەڵگرتو جوان پاکیکردەوەو جلوبەرگی بۆ گۆڕی، چۆن منداڵ بەساوایی خاوێن دەکرێتەوە ئاوا خاوێنیکردەوەو پاشان نانوئاوی دایەو پارووی بەدەمەوە کـرد تا تێری خوارد، ئەمجا بەباوەش بردیەوە جێگای خۆی. حەزرەتی مووساش وا لەدەرەوە وەستاوەو لەدەرگاکەوە سەیریان دەکات. دوای ئەوەی کابرا تەواو خزمەتی ژنەکەی کرد هاتە دەرەوەو دەرگاکەی پێوەداو دایخست. کەهاتە دەرەوە" حەزرەتی مووسا لێی پرسی کەئەو ماڵە هی کێیەو ئەو پیرەژنە چی بوو، ئەوە چی تۆیە وا خزمەتت کرد؟! کابرا وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەوە دایکمە، من هەموو ڕۆژێ ئاوا بەدەستی خۆم خاوێنی دەکەمەوەو نانوئاوی دەدەمێ، دوای ئەوەی هیچی پێویست نابێ ئەمجا دەچمەوە سەر ئیشەکەم. حەزرەتی مووسا فەرمووی: باشە ئەو دایکەت کەتۆ ئاوا خزمەتی دەکەی" هیچ دوعات بۆ ناکات؟ کابرا

گوتی: بەڵێ، دوعام بۆ دەكات، بەڵام دوعای دایكم هەر یەك دوعایەو نەیگۆڕیوە. حەزرەتی مووسا فەرمووی: دوعاكەی چیە؟ گوتی: هەركاتێ خاوێنی دەكەمەوەو تێری دەكەم دەستی بەرزدەكاتەوەو گوێم لێیە دەڵێ: خوایە من لەم كوڕەم ڕازیم، خوایە تۆش لێی ڕازیبەو بیكە بەجیرانی مووسای كوڕی عیمران لەبەهەشتدا. ئەمجا حەزرەتی مووسا زەردەخەنەی كردو فەرمووی: دە موژدەت بدەمێ من مووسای كوڕی عیمرانمو تۆش لەسەر ئەم خزمەتەی دایكت بەردەوام بەو ئینشائەڵڵا لەبەهەشتدا دراوسێی من دەبی!!

مامۆستایەكی ئاینیی بەڕێز گێڕایەوەو فەرمووی: جارێك میوانی ماڵێك بووم، خاوەن ماڵەكە دایكێكی پیری هەبوو، دایكەكە نەخۆشو پەككەوتەبوو. دەفەرموێ: چوومە لای دایكەكە دانیشتمو لێم پرسی: ئەم كوڕەت لەگەڵت چۆنە؟ گوتی: مامۆستا دوعای بۆ بكە، چونكە من هەر دوعام ئەوەیە دەڵێم: خوایە لەم كوڕەم ڕازیبە، چونكە من زۆری لێ ڕازیم. مامۆستاكە دەفەرموێ: منیش ڕووم لەكوڕەكە كردو پێم گوت: تۆ هەر ئەوەندەت بەسە، لەسەر خواپەرستیو خزمەتی ئەم دایكە پیرەی خۆت بەردەوام بە ئینشائەڵڵا بەهەشت مسۆگەر دەكەی. پاشان بەدایكەكەم گوت: دوعا بۆ كوڕەكەت بكەو بڵێ خوایە ئەم كوڕەم بكەی بەجیرانی پێغەمبەری خوا ـ حەزرەتی محمد المصطفى ـ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەبەهەشتدا، ئینشائەڵڵا دوعاكەت قبووڵ دەبێو پاشان بەسەرهاتەكەی حەزرەتی مووسام بۆ گێڕایەوە. دوعای دایكو باوك ئاوا قبووڵە، دە كارێك بكەن دایكو باوكتان لێتان ڕازیبنو دوعای خێرتان بۆ بكەن.

خۆشەویستانم: هەركەسێك بمرێو دایكو باوكی لێی ڕازیبنو دڵی نەڕەنجاندبن، ئەوە خوای گەورە لەپلە هەرە بەرزەكانی بەهەشتدا دایدەنێ. حەزرەتی مووسا تەماشایكرد وا كەسێك لەژێر عەرشی خوادایە، حەزرەتی مووسا خۆزگەی پێ خواستو پرسیاری لەخوای گەورە كرد كەناوی ئەو كەسەی پێ بڵێ، خوای گەورە فەرمووی: پێت ناڵێم ناوی چیە، چونكە ئەوەیان گرنگ نیە بزانی كێیەو ناوی چیە، بەڵام سێ كردەوەت پێ دەڵێم كەئەو كەسە كردوویەتیو بەهۆی ئەو سێ كردەوەیەوە هاتۆتە ژێر عەرشی منەوە:

یەكەم: هەرگیز حەسوودی بەهیچ كەسێك نەبردووە بەوەی كەخوا پێی بەخشیوە.

دووەم: هەرگیز بێدڵیی دایكو باوكی نەكردووەو قەت دڵی نەڕەنجاندوون.

سێیەم: زمانی سەلامەت بووەو لەهەموو ژیانیدا قسەی كەسی بۆ كەس نەبردووەو دووزمانیی نەكردووە. (حديث صحيح رواهُ أحمد)

بەڵێ, هەركەسێك لەهەر زرووفو زەمانێكدا" خاوەنی ئەم سێ رەوشتە بەرزە بێ ئینشائەڵڵا لەژێر سێبەری عەرشی خوادا ئیسراحەت دەكات.

بەڕێزان: خاڵی شەشەم كەپێویستە هەموومان ئاگامان لێی بێ ئەوەیە كەماڵو سامانێك كەهەمانە" هەمووی هی باوكمانە, نابێ كاتێ یارمەتییەكی باوكت دا" پارەیەك, شتێكت دایە" منەتی بەسەردا بكەی, چونكە تۆ خۆتو ماڵەكەشت هی باوكتە. رۆژێك كابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خوا, من كابرایەكم ماڵوسامانم هەیە, ماڵومنداڵیشم هەیە, ئێستا باوكم داوای ماڵوسامانم لێ دەكا, بەڵكو پێی بڵێی هیچی تر داوام لێنەكا. پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناردی بەشوێن باوكەكەداو فەرمووی: خاڵە گیان بۆچی ئەوەندە داوا لەكوڕەكەت دەكەی سەروەتو سامانت بداتێ ؟ باوكەكەش پیاوێكی پیر, گۆچانێك بەدەستەوە, پشتی چەمابۆوە, خەمو خەفەتی دونیاو ماڵومنداڵ ئەو پیاوەی پیركردبوو, هێزو توانای نەمابوو, باوكەكە وەڵامیدایەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا, ئەو كاتەی كەئەم ئەولادەم بێهێزو توانا بوو, منداڵبوو, من هەموو شتێكم هەبوو, جا لەو كاتەدا من ماڵی خۆمم دەدایەو خزمەتم دەكرد, كەچی ئێستا وەكو دەبینی وا من پەكم كەوتووەو بێ ماڵوحاڵ بووم, ئەویش وا گەورە بووەو ژنو منداڵی هەیەو هەموو ئاواتی من ئەوەبوو ئاوا ببینم, شكور خوا ماڵێكی زۆری داوەتێو پیاوێكی بەهێزو توانایە, كەچی كەدەچمە بەردەرگاكەی داوای چەند درهەمێكی لێدەكەم بۆ ئەوەی ئیحتیاجیو موحتاجی خۆمی پێ دەفع بكەمو نەچمە دەرگای خەڵك" ئەم كوڕەم دەرم دەكاو وا ئێستا شكاتی لای جەنابت لێ كردووم! جا ئەی پێغەمبەری خوا, جەنابت چی دەفەرمووی من لەسەر سەرمە. پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, پێغەمبەری رەحمەت, پێغەمبەری دڵ پڕ لەسۆزو بەزەییو رەحم" كەگوێی لەقسەی ئەم كابرایەبوو" چاوی لەوەزعو حاڵی بوو, گریاو فرمێسك بەچاویدا هاتە خوارەوەو فەرمووی: (ما مِنْ حَجَرٍ يَسْمَعُ هذا إلاّ بَكى) ئایا ئەگەر بەرد گوێی لەم پیاوە

مەغدووری داماوە بێ, توخوا گریانی بۆ حاڵی نایەت؟ ئینجا روویکردە کوڕەکەو فەرمووی: (أنْتَ ومالُكَ لأبيكَ), فەرمووی: تۆ خۆت‌و ماڵ‌وسامانەکشت هی باوکتن. (رواهُ إبن ماجة)

جا با ئەو کەسانەی کەباوك‌و دایکیان موحتاجەو ئەمانیش هەیانە, گوێیان لێ بێ‌و بزانن کەئەگەر خۆتان بەموسڵمان دەزانن ئەوە فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوامانە صلّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم کەئەولاد" خۆیشی‌و ماڵ‌وسامانەکەیشی هی باوکیەتی, ئیتر چ منەتێك بەسەر باوکت یان دایکتدا دەکەی کاتێ یارمەتییەکی دەدەی؟!

ئیماندارانی بەڕێز: خاڵی حەوتەم لەبەرەکەتی چاکەکردن لەگەڵ دایك‌و باوکدا ئەوەیە کەچاکەکردن لەگەڵیاندا" دەبێتە هۆی ئەوەی خوای گەورە دەرگای رزق‌وڕۆزی لەسەر ئەولادەکە بکاتەوەو, خوای گەورە تەمەنی ئەو ئینسانە درێژ دەکات. خۆ ئەگەر بڵێی تەمەن چۆن خوا کەدیاریی کردووە زیادوکەم ناکات, ئەوا مانای ئەوەیە: هەرکەسێك بۆ دایك‌و باوکی باش بێ, خوای گەورە ژیانی خۆش‌و ئاسوودە دەکاو لەشی ساغ دەکاو لەئەنواع بەلاو موصیبەت دووری دەخاتەوە, ژیانی ئارام‌و ئاسوودەش ئەگەر یەك ساڵ بێ لەدە ساڵ تەمەنی پڕ ناخۆشی‌و نەخۆشی چاکترو درێژترە.

جا فەرموون با گوێ لەپێغەمبەری سەروەرو سالارمان صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بگرین‌و بزانین چی دەفەرموێ! خۆشەویستمان دەفەرموێ: (مَنْ سَرَّهُ أنْ يُمَدَّ لَـهُ في عُمُرِه, وَيَزْدادَ في رِزْقِهِ فَلْيَبَرَّ والِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)(رَواهُ أحمَد), واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە کەتەمەنی درێژ بێت‌و رزق‌وڕۆزیی زۆر بێت, با چاك بێ لەگەڵ دایك‌و باوکیداو سیلەی رەحم‌و خزمایەتی بەجێ بهێنێت. لەفەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (مَنْ بَرَّ والِدَيْهِ طُوبى لَـهُ زادَ اللهُ في عُمُرِهِ)(رَواهُ أبو يَعْلي), واتە: خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کەچاك بێت لەگەڵ دایك‌و باوکیداو خوای گەورەش تەمەنی زیاد دەکات.

بەڵێ ئیمانداران, وەڵڵاهی دڵنیابن‌و یەقینتان ببێ" هەر ماڵێك رێزی باوك‌و دایکی پیری تێدا بگیرێ خوای گەورە رزق‌وڕۆزییان بەشێوەیەك زیاد دەکات کەخۆیشیان بیریان لێنەکردۆتەوە, لەدەیان موصیبەت‌و شەڕی شەیطان‌و بەلای زاڵمان‌و فیتنەی منداڵی خراپ خوای گەورە ئەهلی ئەو ماڵە دەپارێزێ ئینشائەڵڵا.

خـالّی هەشـتـەم: چـاكەكردن لەگـەلّ دایـكو باوكـدا دەبێتـە هـۆی ئـەوەی خـوا لەگوناهەكانت خۆش ببێ. كابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبـەری خـوا صَـلّی اللهُ عَلَیـه وسَلّم گوتی: (إِنِّي أَذْنَبْتُ ذَنْباً عَظِيماً, فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خـــوا, مـــن گوناهێكی گەورەم كردووە, ئایا بۆم هەیە تەوبە بكـەم؟ پێغەمبـەر صـلّی اللهُ عَلَیـه وسَلّم فەرمووی: (هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ؟) فەرمووی: ئایا دایكت ماوەو لەژیاندایە؟ (قالَ: لا) كابرا گوتی: نەخێر, دایكم وەفاتی كردووە. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم فەرمووی: (هَلْ لَكَ مِنْ خالَة؟) ئەی پوورت ـ خوشكی دایكت ـ ماوە؟ (قالَ نَعَمْ), كابرا گوتی: بەلّێ, پوورم مـاوە. حـەزرەت صـلّی اللهُ عَلَیـه وسـلّم فـەرمووی: (فَبِرَّهـا), دە چـاكە لەگـەلّ پوورتـدا بكـە. (رَواهُ التُّرمذي)

لـەم فەرموودەیـەدا" پێغەمبـەری خـوا صَـلّی اللهُ عَلَیـه وسَلّم ئامـاژەی بـۆ ئـەوە كـرد كەچاكەكردن لەگەلّ دایك یان پوور ـ كەخوشكی دایكەو وەكـو دایـك وایـە, خـوای گـەورە دەیكـات بەكـەفارەتي گونـاهی گـەورە. جـا بەڕاسـتی ئێمـە هـەموومان خـاوەنی چـەندان گوناهین, ئەگەر لەگوناهی گەورەش خوا پاراستبێنی ئـەوە نامـەی كردەوەمـان لـەگوناهی بچووك پڕە. جا بۆ ئەوەی خوا لەگوناهەكانمان خۆش بێ, با چاكە لەگەلّ دایكو باوكماندا بكەینو ڕێزو حورمەت لەخوشكی دایكمان بگرین.

خۆشەویستان: هەر لەبارەی ئەوەی كەچاكەكردن لەگەلّ دایكو باوكدا بەتایبەت دایك" دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهو تاوانەكانی مرۆڤ, ئیمامی بوخـاری ئـەم فەرموودەیـەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە: پیاوێك هاتە خزمەت عەبدوللّای كوڕی عـەباس (ڕەزای خـوای لێبێـت) عەرزی كرد: من لەتافی لاویەتیمدا دلّم چووە سەر ئافرەتێكو پاشان خوازبێنیم كرد, بەلّام ئافرەتەكە شووی پێنەكردم. پاش ماوەیەك كەسێكی تـر چـووە خوازبێنیی‌و ئافرەتـەكـە شووی بەو كرد, منیش زۆر پێی دلّگران بووم, بۆیە ئافرەتەكەم كوشت. ئایا ئێستا ئەگـەر تۆبە بكەم" تۆبەم بۆ هەیەو خوا لێم خۆش دەبـێ؟ عەبـدوللّای كـوڕی عـەباس فـەرمووی: ئایا دایكت ماوە؟ كابرا گوتی: نەخێر. فەرمووی: دە بەدلّ تـەوبە بكەو بەگوێرەی توانـات لەخوا نزیك ببەوەو كرداری چاكە بكە, ئینشائەللّا خوا لێت دەبـوورێ. جـا ئەوانـەی لـەوێ بوون لەئبن عەباسیان پرسی: قوربان ئەو كابرایە باسی تەوبەی لەتۆ پرسـی, كەچـی تـۆ

پرسیاری ئەوەت لێکرد کەئایا دایکی ماوە, ئەوە هۆی چی بوو؟ فەرمووی: چونکە ئەوەندەی من لەدین شارەزابم, هیچ کردەوەیەکی چاکە شك نابەم کەببێتە کەفارەتی گوناهی گەورەو ئینسان لەخوا نزیك بکاتەوە" وەکو چاکەکردن لەگەڵ دایکدا!

کۆتایی وتارەکەمان (وَخِتامُهُ مِسْكٌ) بەفەرموودەیەکی مامۆستا سەعیدی نەورەسی (رەحمەتی خوای لێبێت) دێنین کەفەرموویەتی: ئەی ئەو کەسەی کەباوکێك یان دایکێکی پیر لەماڵەکەتدا دەژی, بزانە: بەرزترین حەقیقەت لەدونیادا بریتییە لەشەفەقەتی دایکانو باوکان بەرامبەر رۆڵەکانیانو بەرزترین مافیش بریتییە لەرێز لێنان لەبەرامبەر ئەو شەفەقەتو میهرەبانیەیەوە, چونکە ئەوان بەهەموو لەزەتو بەختەوەرییەکەوە ژیانیان دەکەنە قوربانیی ژیانی رۆڵەکانیان, لەبەر ئەمە" هەموو رۆڵەیەك ئەگەر مرۆڤایەتی خۆی لەدەست نەدابێو نەبووبێتە درندە, دەبێ بەئیخلاصەوە رێز لەو خۆشەویستە بەرێزە قوربانیدەرە راستگۆیانە بگرێتو راستگۆیانە خزمەتیان بکاتو هەوڵی بەدەست هێنانی رەزامەندییان بداتو دڵیان لەخۆشی پڕ بکات, خوشكو برای باوك لەحوکمی باوكو خوشكو برای دایکیش لەحوکمی دایکدان.

ئەی ئەو مرۆڤەی لەخەمو خەفەتی ژیاندایە, بزانە کۆڵەکەی بەرەکەتی ماڵەکەتو هۆی بوونی رەحمەت تێیداو مایەی دوورخستنەوەی بەلاو موصیبەت لێی" تەنها ئەو دایكو باوکە پیرەی ماڵەکەتە, کەبوونیت بەلاوە گرانە, چونکە ئەگەر لەناوچەوانی ئەو پیرانەوە بەرەکەتت بەسەردا نەبارایە ئەوا بێگومان ژیانو گوزەرانت زیاتر تاڵ دەبوو. بەڵێ, بەدیهێنەری (ذُو الْجَلالِ وَالإِكْرام) کەخۆی (الرَّحْمنُ الرَّحِيم و اللَّطيفُ الْكَرِيم)ە, بەشاهیدی ئەوانەی کەوان لەگەردووندا, هەر کەخوای گەورە منداڵێ دەنێرێتە سەر رووی دونیا, خێرا لەوپەڕی لوطفدا رزقورۆزیی خۆیانیان بەدوادا دەنێرێ, وەك دەرپەڕینی شیری ناو مەمکەکان بۆ ناو دەمیان بەوێنەی کانیاو, هەروەها رزقی ئەو پەککەوتانەی کەگەڕاونەتەوە ریزی منداڵان" بەڵکو ئەوان بەسۆزو میهرەبانیی شیاوترو ئاتاجترن, رزقی ئەوانە" خوای پاكو بێگەرد لەشێوەی بەرەکەتدا دەینێرێت بۆیانو ژیاندنی ئەوانە ناخاتە ئەستۆی مرۆڤە پیسکەکانو ئایسپێرێ پێیان, ئەو حەقیقەتەش کەئەم ئایەتە پیرۆزانە دەیگەیەنن: ﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾(الذاريات 58)و ﴿ وَكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لا

تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾(العنكبوت 60)" حەقیقەتێکی پڕ سەخاوەتەو زمان حاڵی هەموو گیانلەبەرە بەدیهێنراوە جۆربەجۆرەکان دەریدەبڕێ. جا وەنەبێ هەر رزقی دایکو باوکو پیرەکان لەشێوەی بەرەکەتدا بۆیان بێت, بەڵکو هەتا هەندێ گیانلەبەر" کەبۆ هاوەڵیەتیو دۆستایەتیی مرۆڤ دروستکراون" بەوێنەی پشیلە" رزقی ئەوانیش لەشێوەی بەرەکەتدا لەگەڵ رزقی مرۆڤدا بۆیان دەنێرێت. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەمە: ماوەیەکی زۆر بەشە خۆراکێکی رۆژانەم هەبوو, کەنیو کولێرە بوو, کولێرەی ئەو شوێنەش (کەلێی بەند کرابووم) زۆرجار بەشی نەدەکردم وپێم تێر نەدەخوارد پێی. پاشان چوار پشیلە هاتنە ئەو قاوشەیەوە کەمن تێیدا بەندکرابوومو بوون بەمیوانم! منیش ئەو نیو کولێرەیەم بەتەنها نەدەخوارد, بەڵکو پارچەپارچەم دەکردو لەگەڵ پشیلەکاندا بەیەکەوە دەمانخوارد. کەچی ئەمجا نەك هەر پێم تێر نەدەخوارد بەڵکو ئەو نیو کولێرە بچووکە" بەشی منیشو ئەوانیشی دەکردو بگرە هەندێ جاریش لێی دەمایەوە! ئەم حاڵەتە چەند جارێك لەگەڵمدا دووبارەبۆوە, بەڕادەیەك کەقەناعەتێ تەواوم کرد کەمن لەبەرەکەتی ئەو پشیلانە سوودم وەردەگرتو ئێستاش بەشێوەیەکی گومانبڕ ئاشکرای دەکەم کەئەو پشیلانە هیچ کات بەسەر شانی منەوە بار نەبوونو لەژێر منەتی منەدا نەبوون, بەڵکو من لەژێر منەتی ئەواندا دەبووم!

جا موسڵمانی خۆشەویست, کە گیانلەبەرێکی درندەئاسا دێتو دەبێتە میوانی ماڵێك, دەبێتە تەوەرەی بەرەکەت. ئەی ئەگەر بەڕێزترین بەدیهێنراو کەمرۆڤەو کاملترین کەس کەئیماندارەو ئەوانەی کەدەسەوسانو نەخۆشی بەتەمەنن لەنێوان ئەهلی ئیماندا, وەئەوانەی کەدڵسۆزترین دۆستو, راستگۆترین خۆشەویستن" کەدایكو باوکن" بێنە ئەو ماڵەوە چۆن بەرەکەتو رەحمەتێك بەسەر ئەو ماڵەدا دەبارێ؟! خۆت دەتوانی لێکیبدەیتەوە کەئەمە هۆیەکی چەند گەورەیە بۆ بەرەکەتو راکێشانی سۆزو رەحمەتو دوورخستنەوەی بەڵاو موصیبەت, هەروەك لەمانای فەرموودەی شەریفدا دەردەکەوێ: ئەگەر پیرە خواناسەکان نەبوونایە, بەڵاو موصیبەت بەسەرتاندا دەباری.

لەکۆتاییدا دەڵێم: اللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّم عَلى مَنْ قالَ: (الجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدامِ الأُمَّهات) وَعَلى آلِه وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين, سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاَّ ما عَلَّمْتَنا, إِنَّكَ أَنْتَ العَلِيمُ الْحَكِيم

# وتـاری حەوتەم

## مافی دایك و باوك

### بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ وَوَصَّيْنَا الْأنسَانَ بِوَالِدَيْـهِ إِحْسَاناً حَمَلَتْـهُ أُمُّـهُ كُرْهـاً وَوَضَـعَتْهُ كُرْهـاً وَحَمْلُـهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْراً حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَـالَ رَبِّ أَوْزِعْنِـي أَنْ أَشْـكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِـي فِـي ذُرِّيَّتِـي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ ( الاحقاف 15 ).

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( ثَـلاثُ دَعَـواتٍ مُـسْتَجاباتٌ لا شَـكَّ فـيهِنَّ: دَعْـوَةُ الْمَظلُـوم, وَدَعْـوَةُ الْمُـسافِر, وَدَعْوَةُ الْوالِدِ عَلى وَلَدِهِ ) ( رَواهُ أبو داود ).

**الحمدُ لله رَبّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آلِه وصَحبِه أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست, سەلامو ڕەحمەتی خوا لەئێمەو لەهەموو ئیماندارانی ئومەتی محمد المصطفى صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم.

خۆشەویستان:وتاری رابردوو باسی مافی دایکو باوکمان کرد لەسەر ئەولاد, پشتیوان بەخوای گەورەلەم وتارەشدا درێژە بەو باسە گەورەو گرنگە دەدەینودەڵێم وَبِالله التَّوْفيق:

چاکەکردن لەگەڵ دایکو باوکدا دیارترین سیماو سیفەتی پێغەمبەرانی خوایە (سەلامی خوایان لێبێت). کاتێ دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز زۆر بەڕوونی ئەم راستیەمان بۆ دەردەکەوێ, کاتێ باسی پێغەمبەران دەکات باسی ئەوەیان دەکات کەچەند بەسۆزو چاکەکار بوون لەگەڵ دایکو باوکیاندا. بۆ نموونە, خوای گەورە لەسەر زمانی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لێبێت) فەرموویەتی: حەزرەتی عیسا لەبێشکەدا بوو کەولامی ئەو کەسانەی دایەوە کە بەمەریەمەی داوێن پاکیان دەگوت: ئەگەر داوێن پیسیت نەکردووە, ئەی منداڵەکەت لەکوێ بوو, لەکاتێکدا تۆ هێشتا شووت نەکردووە؟ مەریەمە فەرمووی: لەو منداڵەی باوەشم بپرسن, واتە لەعیسا بپرسن. ئەوانیش گوتیان: ئەوە تۆ دەڵێی چی؟! چۆن قسە لەگەڵ منداڵی سەربێشکەدا دەکرێت؟! لەم کاتەدا حەزرەتی عیسا بەفەرمانی خوا هاتە قسەو بەدەنگە ناسکەکەی فەرمووی: ئەی خەڵکینە, من بەندەی خوام, خوای گەورە کتێبی ئینجیلی پێبەخشیوم و دەمکاتە پێغەمبەری خۆی, پاشان فەرمووی: خوای گەورە منی موبارەکو پیرۆز کردووە لەهەر کوێدا بم, وەئامۆژگاریی کردووم کەهەتا لەژیاندا بم نوێژەکانم بکەمو لەزەکات دانیش درێغی نەکەم, هەروەها خوای گەورە فەرمانی پێداوم کە ﴿ وَبَرّاً بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّاراً شَقِيّاً ﴾(مریم 32), واتە: خوای گەورە فەرمانی پێداوم کەچاك ڕەفتار بم لەگەڵ دایکمداو نەیکردووم بەکەسێکی زۆردارو بەدڕەفتار.

هەروەها باسی حەزرەتی ئیبراهیممان بۆدەکات(سەلامی خوای لێ بێ) کاتێ پاڕایەوەو فەرمووی:﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴾ (ابراهيم 41),

واتە: پەروەردگارا لەخۆمو دایکو باوکمو ئیمانداران خۆش ببە لەو

ڕۆژەداکەلێپرسینەوە بەرپا دەبێ.

هەروەها قورئانی پیرۆز باسی حەزرەتی نووح دەکات (سەلامی خوای لێبێت) کەکاتێ لەخوا پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِناً وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ﴾(نوح 28), واتە: پەروەردگارا لەخۆمو دایکو باوکمو ئەوانەش خۆش ببە کە بەئیمانو باوەڕەوە دێنە ماڵم, هەروەها لەسەرجەم ئیمانداران خۆش ببە بەژنو پیاوەوە.

وەکاتێ خوای گەورە وەسفی پێغەمبەرێکی گەورەو بەڕێزی وەکو حەزرەتی یەحیای کوڕی حەزرەتی زەکەریای کردووە (سەلامی خوایان لێبێت) لەوەسفیدا باسی یەکێ لەڕەوشتە بەرزەکانی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَبَرّاً بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ جَبَّاراً عَصِيّاً ﴾(مریم 14), واتە: هەروەها یەحیا چاك ڕەفتارو جوان ڕەفتار بوو لەگەڵ باوكو دایکیدا, کەسێکی دڵڕەقو یاخیو ناڵەبار نەبوو.

بەڵێ بەڕێزان, چاك ڕەفتاریو زمان شیرینیو دوعای لێخۆشبوون بۆ دایکو باوك" لەڕەوشتە پاكو بێگەردەکانی پێغەمبەرانی خوایە (سەلامی خوایان لێبێت), دڵڕەقیو یاخیبوونو ناڵەباریو هەڵسوکەوتی ناشیرین کردن لەگەڵ دایکو باوکدا" هەر ڕەوشتو سیفەتی ئەو کەسانە بووەو دەبێ کە بەڕێبازی پێغەمبەراندا نەڕۆیشتوونو بڕوایان بەدینی خواو قیامەت نەبووە!

ئیمانداران: با بچینە خزمەت سەرداری پێغەمبەرانو سالاری چاکانو پاکان حەزرەتی محمد المصطفی صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم با بزانین ئەو زاتە بەرزە ڕەفتاری لەگەڵ دایکو باوکیدا چۆن بووە؟

خۆشەویستان: شتێکی زانراوو ئاشکرایە کەپێغەمبەرمان صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم هێشتا لەسکی دایکیدا بوو کەباوکی وەفاتی کردو تەمەنی پیرۆزی شەش ساڵان بوو کەدایکی بەڕێزیشی وەفاتی کرد. واتە" پێغەمبەری خوا لەتەمەنێکدا دایکی نەبینیوە کەبتوانێ چاکەی لەگەڵدا بکا, بەڵام ڕەفتار جوانیو ڕەوشت بەرزی ئەو زاتەی کەخوا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾(القلم 4) لەگەڵ دایکو باوکیدا ئەگەر بمانایەو بگەیشتنایە تەمەنێك کەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم بتوانێ خزمەتیان بکا" لەوەدا دەردەکەوێ کەپێغەمبەری خوا چەند بەڕێزو حورمەتەوە هەڵسوکەوتیکـــــــردووە

لەگەڵ باوكو دایكە شیرییەكەیدا كە بەمنداڵی لەماڵی ئەواندا گۆشكراو بەخێو كرا.
عەمری كوڕی سائیب دەفەرمونێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا دانیشتبوو, لەو كاتەدا دایكو باوكی شیریی هاتن, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم لەبەریان هەستاو پێشوازیی گەرمی كردنو چمكێكی عەبای پیرۆزی بۆ باوكی شیریی ڕاخستو ئەویش لەسەری دانیشت, پاشان پێشوازیی لەدایكی شیریی كردو لایەكەیتری عەباكەی بۆ ڕاخستو ئەویش لەسەری دانیشت, پاشان برا شیرییەكەی هات, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم لەبەر ئەویش هەستاو لەبەردەمی خۆیدا دانیشاند. ( رواهُ أبو داود )

هەروەها جارێكیتریش كەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم لەجەعرانە كەشوێنێكە لەنزیك مەككە" گۆشتی دابەش دەكرد, لەو كاتەدا حەلیمەی سەعدیە كەدایكی شیریی پێغەمبەری خوایە" هاتو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەبەری هەستاو زۆر بەخێرهاتنی كردو زۆری حورمەت لێگرتو پاشان عەباكەی سەر شانی خۆی داناو بۆ خاتوو حەلیمەی ڕاخستو ئەویش لەسەری دانیشت, وەچەند جاری تر خاتوو حەلیمە سەردانی پێغەمبەری خوای كردووەو ئەویش زۆر یارمەتیی پێشكەش كردووە.

بەڵێ خۆشەویستان, ئەگەر ئەمە ڕەفتاری پێغەمبەری خوا بێ لەگەڵ دایكو باوكی شیرییدا كەتەنها شیری خواردوون, ئەی دەبێ چۆن بوایە بۆ دایكو باوكی كەلەوان لەدایكبووە, ئەگەر لەتەمەنی گەورەیی حەزرەتدا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەژیاندا بوونایە؟ بێگومان بەباشترین شێوەو چاكترین هەڵسوكەوت ڕەفتاری لەگەڵدا دەكردن.

موسڵمانانی بەڕێز: ئێستا با بچینە خزمەت صەحابە بەڕێزەكانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" ئەو بەڕێزانەی كەهەموو هەڵسوكەوتو ڕەوشتێكی پێغەمبەری خوا تیایاندا ڕەنگیدابۆوەو غەریبی تازەهاتوو دەیگوت ئەمە پێغەمبەرستانە! خۆ هەركام لەصەحابەكانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بگری, ڕەفتاری جوانترین شێوەیە لەچاكەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا, بەڵام با بچینە خزمەت صەحابەیەكی پێغەمبەری خوا كەهەموو ئیماندارانی ئەم ئومەتی ئیسلامە" ناویان بیستووەو هەموو موسڵمانێك خۆشی دەوێو لەدڵی هەموو ئیماندارانـدا شیرینە كەئەویش حەزرەتی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێت), فەرموون با بەئەدەبەوە بچینە خزمەت ئەو زاتە گەورەو بەڕێزەو ئەویش

باسی خۆیو دایکیمان بۆ بگێڕێتەوە.

حەزرەتی ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: (ما خَلَقَ اللهُ مُؤْمِناً سمِع بي وَلا يراني إلاَّ أحَبَّني) واتە: خوای گەورە هیچ ئیمانداریکی لەم سەر زەوییە دروس نەکردووە کەناوی منی بیستبێو خۆشی نەویم با چاویشی پێم نەکەوتبێ. عەرزیان کرد: بەچیدا دەزانی؟ فەرمووی: لەبەر ئەوەی من زۆر لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم, تەنانەت خەلکی دەلێن: هۆی چیە ئەبو هورەیرە ئەم هەموو فەرموودەیەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە؟ منیش دەلێم: برا یاریدەدەرە مەدینییەکان خەریکی ئیشوکاری کشتوکالو زەویوزار بوونو برا کۆچکارە مەککەیی یەکانیش بەکڕینو فرۆشتنو ئیشی ناو بازاڕەوە خەریك بوون, بەلام من هەرئەوەندە سکم تێر بوایە ئیتر گوێم بەکارو کاسپی نەدەداو بەردەوام لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووم, بۆیە زۆر فەرموودە کەحەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەیفەرموو" ئەوان بەهۆی خەریك بوونیان بەکارو کاسپی یەوە لەبیریان دەچۆوە, بەلام من مەجالم هەبوو, فەرموودەکەم لەبەر دەکردو بەباشی ڕەوانم دەکرد, سەرەڕای ئەوەش, هۆیەکی زۆر گرنگ هەیە بۆ ئەوەی من بتوانم ئەو هەموو فەرموودە پیرۆزانەی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه .وسَلَّم لەبەربکەم, ئەویش ئەوەیە کەڕۆژێکیان حەزرەت فەرمووی: کامتان دەیەوێ کەفەرموودەی من وەربگرێو لەبیری نەچێتەوە با جلوبەرگەکەی خۆی ڕابخاتو لەم فەرموودانەی کەمن دەیلێم تێی بکاتو لەپاشان کەمن لەقسەکردن بوومەوە با جلەکەی کۆبکاتەوەو بینێت بەسنگیەوە, ئیتر لەوە بەدواوە هەر قسەیەك لەمن بیبیستێ قەت لەبیری ناچێتەوە. ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: منیش بەرمالێکم بەسەر شانەوەبوو, دامناو لەبەردەم پێغەمبەردا صَلّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم ڕامخست, پێغەمبەریش دەستیکرد بەقسەکردنو زۆر فەرموودەی فەرموو, کاتێکیش لەفەرمایشتەکانی لێبۆوە منیش چمکەکانی بەرمالەکەم کۆکردەوەو گرتم بەسینگو بەرۆکمەوەو ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە" پێغەمبەری خوا هەرچی فەرمووبێ پێم, فەرامۆشم نەکردووەو قسەی ئەوم لەبیرنەچۆتەوە.

بەڵێ خۆشەویستان, حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) هەروا باسی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: من باوکم مردبوو, لەگەڵ دایکم دەژیام, دایکم بتپەرست بوو, زۆر مەراقم بوو وەکو من موسڵمان ببێ, بەڵام دایکم ئارەزووی موسڵمانبوونی نەدەکردو ملی نەدەدا, تا ڕۆژێکیان بەتەواوی بەرگوێم داو داوام لێکرد کەئیمان بێنێو موسڵمان ببێ, بەڵام دایکم نەك هەر بەقسەی نەکردمو موسڵمان نەبوو, بەڵکو قسەی ناشیرینیشی بەپێغەمبەری خوا گوت. منیش زۆر دڵتەنگ بوومو زۆرم پێ ناخۆش بوو, بەڵام خۆ دایکمەو ناتوانم هیچی پێ بڵێم, بۆیە بەدڵی غەمگینو بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە ماڵەوەم بەجێهێشتو چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّمو عەرزم کرد: ئەی خۆشەویستی خوا, ماوەیەکە دەمەوێ دایکم موسڵمان بکەم, بەڵام بەقسەم ناکاو حەزی لەدینی ئیسلام نیە, تاوەکو ئەمڕۆ بەتەواوی رووم لێنا کەموسڵمان ببێ, بەڵام بەگوێی نەکردمو سەرەڕای ئەوەش قسەی ناخۆشی بەجەنابت گوت کە بەڕاستی دڵم پێی تەزیو زۆرم پێ ناخۆش بوو, جا ئەی پێغەمبەری خوا, بەڵکو داوا لەخوای گەورە بکەی کەدایکم هیدایەت بداو ڕێگای راستی نیشان بدا. پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: (اللّهُمَّ اهْد أُمَّ أبي هُرَيْرَةَ) فەرمووی: خوایە ڕێنموونی دایکی ئەبو هورەیرە بکەو هیدایەتی بدە. دەفەرموێ: منیش بەدڵێکی خۆشەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە, چونکە یەقینم هەبوو کەدوعای پێغەمبەر گیرایەو خوا رەتی ناکاتەوە. ئەوەبوو کاتێ گەیشتمە بەردەرگای ماڵی خۆمان" دایکم کەگوێی لەخشپەی پێم بوو" بانگیکردمو گوتی: ئەبو هورەیرە لەشوێنی خۆت بوەستە. منیش وەستامو کەگوێم گرت وا خوڕەو شڵپەی ئاو دێ, دایکم خەریکی خۆ شتن بوو, دوای ئەوەی کە لەخۆ شتن بۆوەو کراسەکەی لەبەرکردەوە دەرگاکەی کردەوەو لەخۆشییاندا لەبیری چوبوو سەرپۆشەکەی بەسەر سەریدا بدا, فەرمووی: أشْهَدُ أن لا إلَـهَ إلاّ الله وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ, سوپاس بۆ خوا دایکم موسڵمان بوو.

اللهُ أكبَـر.. ألله أكبَـر لەگەورەیی ئەو پێغەمبەری ئیسلامەو قبوول بوونی دوعاو پاڕانەوەکانی لای خوای گەورە! تەماشاکە هیدایەتی خوا بۆ دایکی ئەبو هورەیرە, لەئەبو هورەیرە زووتر گەیشتە دایکی.

بەڵێ ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: کەدایکم ئیمانی هێنا" ئەمجارەیان بەدڵخۆشییەوە گەڕامەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خـــــوا, بەڵام جیاواز لەجاری پێشوو! ئەمجارەیان لەخۆشییاندا دەستم کرد بەگریان, گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا موژدەت لێ بێ, خوای گەورە دوعاو نزاکەی تۆی گیراکرد, لەسایەی خواوە دایکم موسڵمان بوو, ڕێی حەقی گرت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم حەمدو سەنای خوای کرد, ئەمجا عەرزم کرد: وا لەخوا بەزیاد بێ بەبەرەکەتی دوعای جەنابت دایکم ئیمانی هێنا, دەی ئەمجارەش لەخوای گەورە بپاڕێوە بۆمان کەمنو دایکم لەلای هەموو ئیماندارانی ئومەتی ئیسلام خۆشەویست بکاو.هەموو موسڵمانانیش لەلای منو دایکم خۆشەویست بکا. پێغەمبەریش دوعای بۆ کردینو فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَبِّبْ عَبْدَكَ وَأُمَّهُ إِلى عِبادكَ اَلْمُؤْمِنِينَ, وَحَبِّبْهُم إِلَيْهِ) فەرمووی: خوایە ئەم عەبدەی خۆت کەئەبو هورەیرەیە لەگەڵ دایکیدا" هەردووکیان خۆشەویست بکە لای موسڵمانانو موسڵمانانیش لای ئەمان خۆشەویست بکە. ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: بەبەرەکەتی ئەم دوعایەی پێغەمبەرەوە" هەر ئیماندارێك ناوی منو دایکمی بیستبێ" با چاویشی پێمان نەکەوتبێ, خۆشی دەوێین.

بەڕێزان: بەم شێوەیە ئەبو هورەیرە ئاواتی هاتەدیو دڵی ئارام بوو, چاوی ڕۆشن بوو بەوەی کەدایکی خۆشەویستی لەبەڵاو نەگبەتیی شیرك.ڕزگاریبوو کەمایەی تیاچوونی ئینسانەو سەرەنجامی دۆزەخە.

با بزانین حەزرەتی ئەبو هورەیرە لەدوای موسڵمانبوونی دایکی" چۆن چاکەی لەگەڵدا کردووە؟ جارێکیان ئەبو هورەیرە بەتەواوەتی برسێتی تینی بۆ دێنێو لەدایکی دەپرسێ کەئایا هیچ شك دەبەی کەبیخۆم ؟ دایکی دەفەرموێ: بەخوا هیچ جۆرە خواردنێك لەماڵماندا نییە! ئەبو هورەیرە لەبرسان ماڵەوە بەجێدێڵێو بەرەو مزگەوت بەڕێدەکەوێ. کەدەچێتە مزگەوتی رَسولُ الله" تەماشا دەکا وا چەند کەسێکیتر لەیارانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم وا لەمزگەوتن, لەئەبو هورەیرە دەپرسنو دەڵێن: ئەرێ ئەوە بەم گەرمایە چ شتێك لەماڵەوە هێناویە دەرەوە؟ دەفەرموێ: چیتان پێ بڵێم.. بەخوا غەیری برسێتی هیچ شتێکی تر وای لێنەکردووم لەم کاتەدا لەماڵ بێمە دەرەوە! ئەوانیش گوتیان: ئێمەش هەر لەبرسان لەماڵ هاتووینە دەرەوەو خۆ هیچ شوێنێکیش شك

نابەین تەنها ماڵی پێغەمبەری خۆشەویستمان نەبێ, با هەموومان بڕۆین بۆ خزمەتی.
دەفەرموێ: کە لەدەرگامان داو پێغەمبەری خوا دەرگای لێکردینەوەو چاوی پێمان کەوت" فەرمووی: (ما جاءَ بِكُمْ هذه السَّاعَة) ئەوە خێرە گەیشتوونەتە ئێرە؟ گوتمان: بەخوا برسێتی پاڵی پێوە ناوین لەم کاتەدا بێینە خزمەتت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم زۆر بەدەموچاوێکی گەش و روویەکی بەزەردەخەنەوە یەك بەیەك بەخێرهاتنی کردین و فەرمووی: با بزانین لەماڵی ئێمە هیچمان هەیە؟ کەچووە ژوورەوە فەرمووی: خەمتان نەبێ, وا پارچەیەك خورمای لێیە.. سُبحانَ الله.. لەهەموو ماڵی پێغەمبەردا تەنها پارچەیەك خورمای لێیە کەچەند دەنکە خورمایەکە! بەڵام ئەو زاتە بەرزە, کە لەهەموو کەس سەخیترو دەست واڵاتر بوو" هەر خێرا خورماکەی هێناو هەر کەسەی دوو دەنك خورمای خستە دەستیانەوەو فەرمووی: (كُلُوا هاتَيْنِ التَمْرَتَيْنِ, واشْرِبوا عَلَيْهِما مِنَ المَاءِ, فَإنَّهُما سَتُجْزِيانِكُمْ يَوْمَكُمْ هذا) فەرمووی: هەریەکەتان ئەم دوو دەنکە خورمایە بخواو ئاوی بەسەردا بخۆنەوەو خەمتان نەبێ, ئەمڕۆ لەبرسیایەتی رزگارتان دەکات و بەستانە! حەزرەتی ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: من دەنکە خورمایەکم خواردو دەنکەکەی ترم هەڵگرت و شاردمەوە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چاوی لێبوو, فەرمووی: (يا أبا هُرَيْرَةَ لِمَ رَفَعْتَ هذِهِ التَمْرَةَ؟) ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە بۆچی ئەو دەنکە خورمایەت هەڵگرت و نەتخوارد؟ منیش گوتم: قوربان بۆ دایکمم هەڵگرت, بەخوا ئەویش وەکو من برسیەتی و هیچ خواردنێکیش لەماڵماندا نیە, هەرچەندە بۆ خۆم زۆرم برسییە بەڵام ئەم دەنکە خورمایەیان با بۆ دایکم بێ و ئەویش تۆزێك لەبرسیایەتیەکەی لاچێ و لەو بەرەکەتەی جەنابت بەری بکەوێ! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (كُلْها, فَإِنَّا سَنُعْطِيكَ لَها تَمْرَتَيْنِ) فەرمووی: ئەو دەنکەشیان بۆ خۆت بخۆ, دوو دەنکە خورمای ترت دەدەینێ بیبەرەوە بۆ دایکت. دەفەرموێ: منیش ئەمجا دەنکە خورماکەی ترم خواردو دوو دەنکیشم بۆ دایکم وەرگرت و بۆم بردەوە بۆ ماڵەوە!

ئەمەیە دڵسۆزی, ئەمەیە وەفاداری, ئەمەیە چاکەکاری کەلەوپەڕی برسیەتیدا دایکت لەبیر نەچێ و لەیادی نەکەی, ئەمە ئیسلامە رۆڵەی ئاوا پەروەردە دەکا, ئەوە بەرهەمی

(رسول الله)یە کەئەو دلانە ئامادە دەکا! نەك وەك ئەو کەسانەی کەتا خۆی تێر نەخوا" دایکی هەر لەبیر نیەو دایکی بەسزمان دەبێ چاوەڕێی بەرماوەی کوڕەکەی بێ بیخوا!

خۆشەویستان: هەر لەخزمەتی حەزرەتی ئەبو هورەیرەداینو بزانین کاتێ کە لەماڵ دەچووە دەرەوە چۆن گفتوگۆی لەگەڵ دایکیدا دەکرد؟ یەکێ لەنزیکانو دراوسێکانی ئەبو هورەیرە" ناوی ئەبو مورەیە, دەفەرموێ: هەموو جارێ ئەبو هورەیرە کە لەماڵ دەچووە دەرەوە سەلامی لەدایکی دەکردو دەیفەرموو: (رَحمَك اللهُ كَما رَبَّيْتَني صغيراً) واتە: دایە گیان خوا رەحمت پێبکات وەکو چۆن تۆ بەمندالی رەحمت بەمن کردو پەروەردەت کردم! دایکیشی وولامی سەلامەکەی دەدایەوەو دەیفەرموو: (يا بُنَيَّ, وَأنْتَ فَجَزاكَ اللهُ خَيْراً وَرَضِي عَنْكَ كَما بررْتَني كَبيراً), واتە: کوڕی خۆشەویستم, یاڕەبی تۆش خوا پاداشتی چاکەت بداتەوەو خوای گەورە لێت رازیبێ وەکو چۆن بەگەورەیی لەگەڵمدا چاك بوویت! (رَواهُ البُخاري)

ئای چ گفتوگۆیەکی جوانە, چەند مانایەکی بەپێزە, چۆن دڵ ئاوی پێ دەخواتەوەو دەبووژێتەوە, ئەمە شێوازی گفتوگۆی نێوان دایكو کوڕێکی بیابان نشینی بیستویەك سەدە لەمەوبەرە کە لەهیچ زانکۆو پەیمانگەیەکی پێشکەوتوودا نەیانخوێندووە, بەلام دەرچووی مەدرەسەکەی (رَسولُ الله)ن ئاوا بەو ووشە دلڕفێنە" هەست بزوێنانە یەکتری دەدوێنن. بەلام لەسەردەمی عەولەمەو ئینتەرنێتو تیکنۆلۆجیای پێشکەوتوودا" ئەوانەی دوورن لەبەرنامە پاكو بێگەردەکەی ئیسلامو گاڵتە بەناوی ئەبو هورەیرە دەکەن, کاتێ بانگی دایکیان دەکەن زۆرجار پێیان عەیبە بڵێن دایە, دەڵێن: حاجی ژن, یان بەناوی خۆیەوە بانگیدەکەن, خۆ ئەگەر لەماڵیش چوونە دەرەوە مەگەر بڵێ: ئەرێ گورەویەکەت بۆ شتووم؟ کەهاتیشەوە ماڵەوە: ئایا چیمان هەیە بیخۆین؟! ئایا ئەم دوو کەسەو ئەم دوو پەروەردەیە چەندیان فەرقە ؟! ئایا موسڵمانان رۆشنبیرن یان ئەوانەی لەئیسلام دوورن؟ وولامەکەی ئاشکرایە..

خۆشەویستان: حەزرەتی ئەبو هورەیرە, ئەوەندە لەخزمەتی دایکیدا بوو ئامادە نەبوو هەرگیز" بۆ هیچ مەبەستێك لێی دووربکەوێتەوە, تەنانەت تا دایکی وەفاتی نەکرد ئەبو هورەیرە حەجی ماڵی خوای نەکرد!! لەکاتێکدا لەمەککە نزیك بووەو هەموو ساڵێ

تـ ـ ی هەبووە حەج بکا, بەڵام بۆ ئەوەی دایکی بەتـەنها بەجێنـەهێڵێو دایکـی بێتاقـەت بـەیـ ـ حەجی ماڵی خوای نەکرد!

ئێمەش دەڵێین: (اللّهُمَّ إنَّا نُحبُّ أبا هُرَيْرَة, وَنَثِقُ فيه, وَنُحبُّ أُمَّهُ, فَـاجْمَعْنا بِهِمـــا يَوْمَ ـ ـدِين) خوایـە گیـان, ئـەبو هورەیرەمـان خـۆش دەوێو دایکیمـان خـۆش دەوێو داوات ـ ـ دەکەین لەگەڵ ئەواندا لەقیامەتو لە بەهەشتی بەریندا کۆمان بکەیتەوەو هەموومان بـەر شـەفاعەتی پێغەمبەری خۆشەویست بکەوین اللّهُمَّ آمين..

ئیمانداران: ئێستا با باسی یەکێ لەتابعین بکەین کەئەوان چۆن بوون بەرامبـەر دایـكو باوکیـان. تـابعی بـەو کەسـە دەڵـێن کەپێغەمبـەری خـوای نـەبینیوە, بـەڵام صـەحابەی پێغەمبەری بینیوە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم. جـا بـا بـچینە خزمـەت گـەورەی هـەموو تـابعین کەئەویش وەیسی قەرەنییە.

وەیسی قەرەنی لەگەڵ دایکیدا دەژیا لـەوڵاتی یەمـەن, ئەوەنـدە لەخزمـەتی دایکیـدا بوو قەت بەجێی نەدەهێشت, تەنانەت لەبەر خاتری مانـەوە لەخزمـەت دایکیـدا" نـەیتوانی بەخزمەت پێغەمبەری خوا بگات کەتەنها بەچاوپێکەوتنی حەزرەت" یەکسەر لەتابعیـیـەوە دەبوو بەصەحابە. ئەم زاتە زۆر عاشق بەدیداری حـەزرەتی فـەخری عالـەم بـووە, بـەڵام وەکـو گوتمـان چـونکە کـەس نـەبوو لای دایکـی بمێنێتـەوە ئـەوە ئـەم ئاواتـە گـەورەی نەهاتەدی. بەڵام ئینسانی موخلیـصو چاکـەکار لەگـەڵ دایکـدا" ڕەنـجو ئـاواتی بـەفیڕۆ نـاڕوا, بۆیـە پێغەمبـەری خـوا صَـلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّم" ڕۆژێکیـان کـە لەشـاری مەدینـەی پیرۆزبوو, بەصەحابەکانی فەرموو: ڕۆژێك دەبێ کەمن نامێنم, کابرایەك کەناوی (ئوەیـسی کوڕی عامرە)و خەڵکی وڵاتی یەمەنەو لەهـۆزی موڕادەو لـەدوای ئـەو لـەهۆزی قـەڕەنـە لەگەڵ سوپای موسڵمانان کـە لەیەمەنـەوە دێـن بـۆ کۆمـەکیو یارمـەتیی موسـڵمانان بـۆ مەدینە, ئەو کابرایەشیان لەگەڵدایەو نیشانەیەکتان پێ دەڵێم بۆ ئەوەی بیناسنەوەئەویش ئەوەیـە: ئـەم ئوەیـسە کـاتی خـۆی تووشـی نەخۆشـیی بەڵـەکی بـووەو هـەموو لەشـی گرتۆتەوە, بەڵام پاشان خوای گەورە شیفای بۆ ناردووەو تەنها بەقەدەر دیرهـەمێکی لـەو بەڵەکییە پێـوە مـاوە, ئـەم پیـاوە دایکێکـی پـیری هەیـە, زۆر لەخزمـەتی دایکیدایـەو زۆر گوێڕایەڵیەتی, ئەم ئوەیسە ئەوەندە لای خوا ڕێـزو حورمـەتی هەیـە" ئەگـەر سـوێند بخـوا

کەخوا دەبێ ئەو ئیشەی بۆ بکا" خوای گەورە سوێندەکەی ناخاتو ئیشەکەو داواکاری‌یەکەی بۆ جێبەجێ دەکات! جا پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیە وسَلَّم بەئیمامی عومەری فەرموو: ئەگەر هاتو چاوت پێکەوتو توانیت پێی بڵێی کەداوای لێخۆشبوونت بۆ لەخوا بکا, ئەوا داوای لێ بکەو تکای لێبکە با دوعات بۆ بکات!

اللهُ أکبَر لەگەورەیی ئەم زاتە لای خوا! چۆن خوای گەورە ناوەکەی‌و هۆزەکەی‌و وڵاتەکەی بەپێغەمبەری خوا گەیاندو ئەوەشی پێ گوت کەچەند بۆ دایکی باشەو خزمەتی دەکات, پێغەمبەری خواش بەپیاوی وەکو حەزرەتی عومەر" کەعومەر ئەوەندە بەرزە لەناو ئیسلامدا (غَنيٌّ عَنِ التَّعريف)و کەس نیە لەموسڵمان‌و نا موسڵمان" ناوی عومەری لا ئاشکرا نەبێ, کەچی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێ: ئەی عومەر ئەگەر چاوت پێکەوت پێی بڵێ با داوای لێخۆشبوونت بۆ لەخوا بکا!!

بەڵێ پێغەمبەری خوا وەفاتی‌کردو حەزرەتی ئەبوبەکریش وەفاتی کردو لەخەلافەتی ئیمامی عومەردا" ئوەیسی قەرەنی لەگەڵ سوپای یەمەن هات بۆ مەدینەو حەزرەتی عومەر بەو نیشانانەی کەپێغەمبەری خوا بۆی باسکردبوون" وەیسی ناسییەوەو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای صَلَّی اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بۆ باسکردو داوای لێکرد کەداوای لێخۆشبوونی بۆ لەخوا بکات. ئەویش دوعای بۆ کرد, پاشان حەزرەتی عومەر فەرمووی: حەزدەکەی لەکوێ نیشتەجێ بیت؟ فەرمووی: حەزم لەکووفەیە. حەزرەتی عومەر فەرمووی: با نامەت بۆ بنووسم بۆ کاربەدەستی کووفە تا ئاگاداریت بکاتو یارمەتیت بدات. فەرمووی: نەخێر, حەز ناکەم ناوم بکەوێتە ناو ناوانەوە, دەمەوێ لەگەڵ ئەو خەڵکە رەش‌وڕووتە بژیم. پاشان خواحافیزیی کردو سەرەنجام لەئێران لەجیهاددا شەهیدکرا. هەزاران رەحمەتی خوا لەسەر گەورەی تابعین‌و ئوەیسی قەرەنی.

بەڵێ خۆشەویستان, ئەوە رەفتارەی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیە وسَلَّم لەگەڵ دایك‌و باوکە شیری‌یەکەیداو, ئەوەش هەڵسوکەوتی بێوێنەی صەحابەو تابعین لەگەڵ دایك‌و باوکیاندا. دە فەرموون با چەند نموونەیەکی ترتان بۆ باس بکەم لەو کەسانەی کەشوێن کەوتووی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەن‌و لەمەدرەسەی رسولُ اللهدا دەرسی چاکەکردن لەگەڵ دایك‌و باوکیاندا خوێندووە.

محەمـەدی کـوڕی سـیرین (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) کاتـێ لەبـەردەمی دایکیـدا دەوەستا" وەکو سەربازێکی ملکەچ وابوو لەبەردەم گەورەکەیدا, هەرگیز بـەدەنگی بـەرز قسـەی لەگـەڵ دایکیدا نەکـردووەو ئەوەندە بەڕێزو حـورمەتەوە لەخزمەت دایکـیدا دانیشتووە" ئەوانەی کەشارەزای نەبوون وایان زانیـوە نـەخۆش‌و بێتاقەتـە! بـەڵام کاتـێ لەدایکیان پرسیوە: محەمەد بۆچی وا بێتاقەت‌و نەخۆشە؟ دایکـی فەرموویـەتی: نـەخۆش نییە, بەڵکو ئەوەندە شەرمم لێدەکا کاتێ لام دادەنیشێ ئاوا ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ!

یـەکێکی تـر لەپیاوچاکان‌و زانایـانی ئیـسلام نـاوی طَلقـی کـوڕی حەبیبـە, ئـەم زاتـە زانایەکی زۆر ناودارو پیاوێکی بەحەق خواپەرست بووە. دایکی پیر ببوو لەلای ئەم کوڕەی بوو, دەفـەرموون: ڕۆژی چـەند جـار ئـەم کـوڕە عـالم‌و خواناسـە لـەماڵ بـچوایە دەرەوەو بهاتایەوە ژوورەوە" ئیللا سەری دایکی ماچ دەکردو دەستی مـاچ دەکـرد! وەئـەم پیـاوە باشە هەرگیز بەسەربانێکدا نەڕۆیشتووە کـەدایکی لـەژێر سـەقفی ئـەو خـانووەدا بوویـێ, لەبەر حورمەت‌و ڕێزدانان بۆ دایکی!

هەروەها موحەمەدی کوڕی مونکـەدیر (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) ڕوومـەتی دەخـستە سەر زەوی‌و بەدایکی دەگـوت: وەرە قاچـت بخـە سـەر ڕوومـەتم‌و تـۆزاویی بکـە, نـەوەکو جارێك بێفەرمانییەکم کردبێ!

هەروەها فوضَیلی کـوڕی عـەیاض (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) کـەعالم‌و زانایـەکی زۆر نـاودارە دایکی پیر دەبێ‌و گــوێی گــران دەبێ‌و باش گــوێی لــەقسە نابێ, فوضیلیش ئەوەندە حورمەتی دایکی لا بووە پێی شەرم بووە بەدەنگی بەرز لەخزمەتیدا قـسەبکات, تەنانەت یەك جار کەفوضیل خەریکی ئیشوکار بـووە لەحەوشـەی مـاڵی خۆیانـدا" دایکـی بانگیکرد, ئەویش فەرمووی: بەڵێ دایە گیان چی دەفەرمووی؟ بەڵام چونکە دایکـی گـوێی گران بوو" هـەر بـانگی دەکـرد فوضَـیل کـوڕم ئیـشم پێتـە, گوێی لەبەڵێیەکـەی فوضَـیل نەدەبوو, ئەوەبوو فوضَیلی کوڕی عەیاض" کەدەستی لەناو قوڕو ئاودا بـوو, ئـەمجارەیان بۆ ئەوەی ئیشەکە بەجێ نەهێڵێ‌و بشزانێ دایکی چی پێویستە" بۆ ئەوەی دایکی بەباشـی دەنگی ببیـستێ, تـۆزێ زیـاتر دەنگـی بـەرزکردەوەو فـەرمووی: بـەڵێ دایـە گیـان, چـی دەفەرمووی؟ هەر لەو کاتەدا پەشیمان بۆوەو فەرمووی: ئای چیم بەخۆم کرد! ئای چۆن

ئـەوە مـنم دەنگـم بەسـەر دایکمـدا بـەرزکردەوە ؟ زۆر داوای لێخۆشـبوونی لـەخوا کـردو خێرێکی زۆریکرد بۆ ئەوەی خوا لەو تاوانەی خۆش ببێ! وەهەر ئەو کاتە وازی لەو ئیشە هێناو دەستو قـاچی خۆی شۆشتو چووە خزمەت دایکیو دەمی بەگـوێی دایکیەوە ناو قسەی لەخزمەتیدا کرد!

هـەروەها مێژوونووسـان بۆمـان دەگێڕنـەوە کـە فـەزڵی کـوڕی یـەحیا لەگەڵ باوکیـدا بەیەکەوە لەزیندان دەبن, باوکی عـادەتی وا دەبـێ لەبـەر نەخۆشـیو لاوازی, لەزستاناندا بەئاوی گەرم نەبێ ناتوانێ دەستنوێژ بشوات, فەزڵیش لەزینداندا ئاوی گەرم لەکوێ پەیدا بکات بۆ باوکی؟ بۆیە کەدەزانێ هیچ ڕێگەچارەیەك نىیـە بـۆ ئـەوەی ئـاوی گـەرمی بـۆ باوکی دەست بکەوێ" هەرچەند لەکاتی ئـاوادا دروستە تەیـەموم بکـرێو لەبـەر نەخۆشـی ئاوی سارد بەکار نەهێنرێ, بەڵام فەزڵ بۆ ئەوەی ئەرکیسەرشانی ئەوەندەی لەتوانایدایـە بەرامبەر بەباوکی جێبەجێ بکا" هەستا مەسینە مسەکەی پڕکرد لەئاوو لەسەر سکی خۆی بەڕووتی داینا بەڵکو هیچ نەبێ بەگەرمیی لاشەی" هەندێك تینی ساردی ئاوەکـە بشکێنێو باوکی بتوانـێ سـوودی لێ ببینـێ! سُبحانَ الله, لەچلەی زستاندا مەسـینە ئـاوی سـاردی دەخستە سەر سکیو, پێستی ورگـی خـۆی دەتەزانـدو لەسـەرمان خـەوی لێنەدەکـەوت, تەنها بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کەئەوەندەی لەتوانایدا بێ درێغی ناکات لەخزمەتی باوکی!

لەکتێبی (عُیونُ الأخیار)یشدا دەفەرموێ: فەزڵی کوڕی یەحیا کاتێ کە لـەگەڵ باوکیدا لەزیندان دەبێو باوکی پێویستی بەئاوی گەرم دەبێو لێپرسراوی زیندانەکەش ناهێڵێ ئاو گەرم بکەن, فەزڵ شـەو هـەتا بـەیانی نەدەخـەوت, بـەڵکو مەسـینە مـسەکەی پـڕ دەکـرد لەئاوو دەیهێنا لەگڕی چرایەکەی نزیك دەکردەوەو هەتا بەیان رایدەگرت تا هەندێ لەتینی سـاردیی ئاوەکـە بـشکێنێو بـاوکی بتوانـێ بـۆ بـەیانی کـە لەخـەو هەسـتا دەسـتنوێژی پێبگرێت!

بەڵێ خۆشەویستان, ئەمە پەروەردەی ئیسلامە, نەیگوت: بابە گیان ئەمە زیندانەو تۆ عـوزرت هەیـەو بـۆ ئەوەنـدە خۆمـان عەزیـەت بـدەینو ئـەملاولای نـەکرد, بـەڵکو خـەوو ئیسراحەتو گـەرمیی جێگـا بـەقوربانی رەزامەنـدیو خزمـەتی دایـكو بـاوکی دەکـات, بەئومێدی ئەوەی کەخوای گەورە لێی رازی بێت!

بەڵێ، هەر لەو کەسانەی کە بەنموونە دەیانهێنینەوە، کەچۆن لەخزمەت دایکو باوکیاندا بوون، پیاوێکیتری صاڵحە کەناوی (عومەری کوڕی ذەڕ)ە. لەم پیاوەیان پرسی: کوڕەکەت لەگەڵت چۆنە؟ فەرمووی: بەخوا من چۆن بووم بۆ باوکم" ئەویش ئاوایە لەگەڵمدا، هەرکات بەڕۆژ لەگەڵ کوڕەکەم بەیەکەوە بەڕێگادا بڕۆین" لەدوامەوە دەڕوات، ئەگەر بەشەو بەیەکەوە بڕۆین لەپێشمەوە دەڕوات نەوەکو چاڵێك، ئاوێك، قوڕاوێك لەپێشمانەوە هەبێو من چاوم لێی نەبێ! بەخوا چەند جار ئیشی هەبووە" توانیویەتی بەپەیژەدا لەسەربانەوە بچێ بۆ ئەو شوێنە بەڵام ئەوەی نەکردووە، بەڵکو چەند کۆڵانی بڕیوەو پێچی کردۆتەوە تا گەیشتۆتە ئەو شوێنە، بۆیەش بەسەربانەکەدا نەڕۆیشتووەو ئەو هەمووە خۆی ماندوو کردووە چونکە من لەژێر ئەو سەربانەدا دانیشتووم. واتە: قەت بەسەربانێکدا نەڕۆیشتووە کەباوکی لەژێریدا بووبێ!

بەڵێ ئیمانداران، ئەمە ئیسلامە کەئینسان فێردەکات ئاوا لەگەڵ دایکو باوکیدا رەفتاری جوان بێ، کەئەولاد وا پێدەگەیەنێو تێدەگەیەنێ کەنەك هەر خزمەتی دایكو باوك بكاتو خراپەیان لەگەڵدا نەكات" بەڵكو فێری دەكات كە بەجوانترینو ناسكترین رەفتار هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكات، وەكو ئەو چەند نموونەی كەباسمان كردن. ئەی لەسایەی دوور لەدینیدا؟! ئەی لەپەروەردەی دوور لەئیسلامدا رۆڵە چۆن دەبێ بەرامبەر بەدایكو باوكیو چۆن چاكەی ماندووبوونو رەنجی ساڵەهایان دەداتەوە؟ گوێ بۆ ئەم رووداوە واقیعییە بگرن:

كوڕێكی خوێندكاری دەرچووی زانكۆ، بەبۆنەی دەرچوونی لەزانكۆو تەواوكردنی خوێندنەكەیەوە" هاوڕێكانی كە لەكۆلیجەكەیدا لەگەڵی بوون دەعوەتیان دەكات بۆ ماڵی خۆیان، بەڵام پێشتر بەباوكی پیری بەساڵداچووی دەڵێ: من ئەو میوانانەم دێت، ئیشی تایبەتی خۆمم پێیانە، تۆ مەیەرە ژوورەوە! بەڵێ، میوانەكان دێنو لەسەر گیرفانی باوكی حەماڵو دەست قلێشاو سفرە دەڕازێنرێتەوە. باوك جلی شڕو پیناوی لەبەردایە بۆ ئەوەی كوڕەكەی لەزانكۆو ناو هاوڕێكانیدا چاكەتو پانتۆڵی تازەو ئاخر مۆدی لەبەردابێ. بەڵێ باوكە وەكو پیاوێكی دنیادیتەو خاوەن قەدرو حورمەت بۆ هەركەسێك كەرووی كردبێتە ماڵەكەی" دەڵێ با بچم بەخێرهاتنیان بكەمو هەر لەقاپیەكەوە مەرحەبایان دەكەمو ناچمە

ژوورەوە با ئیشەکەیان لێ تێك نەدەم. بەڵێ بەم دەروونە پاکەوە دەرگا دەکاتەوەو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان دەکاتو دەڵێ: هیوادارم پێ لەکوڕەکەم نەبڕنو وەکو برایەکی دڵسۆز ئاگاتان لێی بێ. هەر ئەم قسەیە دەکاتو هەموو سەرسوورمانیان پێوە دیار دەبێو بەکوڕە دەڵێن: ئەی تۆ نەتگوت باوکم نەماوەو مردووە, ئەی ئەم پیاوە چیە؟! کوڕەی هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەڵام بزرکەری بڕوانامەی ئیسلامو ئیمان" کوڕەی دەرچووی زانکۆ بەڵام دور لەمزگەوتو قورئان" بەشپرزەیییەوە دەڵێ: ئەوە باوکم نیە, ئەوە خزمەتکاری ماڵەکەمانە بەڵام لەبەر خۆشەویستی بەمن دەڵێ کوڕم!

يا حَسْرَةً عَلى العباد! ئەوە نەگبەتیە, ئەوە بەدبەختییە, ئەوە رەنج بەفیڕۆ چوونە, ئەوە مایەی هاتنی غەزەبی خوایە بۆ سەر ئەو کۆمەڵگایەی ئاوا رەفتار لەگەڵ دایكو باوکیاندا دەکەن. هەزاران" بەڵکو ملیۆنەها صەلاتو سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەری بەڕێزمان بێ کەهەزارو چوارسەد ساڵ زیاترە" هەواڵی بەبوونی ئەو جۆرە کوڕانە داوەو فەرموویەتی: (إذا فَعَلَتْ أُمَّتي خَمْس عَشَرَةَ خَصْلَةً حَلَّ بِها الْبَلاءُ.. وَأطاعَ الرَّجُلُ زَوجَتَهُ وَعَقَّ أُمَّهُ, وَبَرَّ صَديقَهُ وَجَفا أباهُ). ( رَواهُ التِّرمذي )

واتە: هەرکاتێ ئومەتەکەم پانزە خەسڵەتیان ئەنجام دا, ئەوا بەڵاو نەگبەتی روویان تێدەکات, یەکێ لەو پانزە خەسڵەتانە ئەوەیە: پیاو بەقسەی ژنەکەی دەکاتو ئازاری دڵی دایکی دەدات, وەکوڕ چاکە لەگەڵ هاوڕێو برادەریدا دەکاتو دڵیان رادەگرێو یامەتییان دەدات بەڵام قسەی رەقو ناوچەوانی گرژو تاڵوترش دەبێ لەگەڵ باوکیداو لەجیاتی ئەوەی یارمەتیی بدات, دڵی ئازار دەدات!

صدَقَ رسولُ الله. بەخوا بەچاوی خۆمان هەمویمان بینیوە, وەئەو هەموو بەڵاو موصیبەتو نەگبەتیو بێڕەحمییەی کەبڵاوبۆتەوە یەکێ لەسەبەبەکانی ئەو خراپ رەفتارکردنەیە لەگەڵ دایكو باوکدا.

موسڵمانانی بەڕێز, ئەی ئەو کەسانەی کەهێشتا دایكو باوکتان لەدەست نەچووەو هێشتا ئەو بەرەکەتو رەحمەتە ماوە دەستتان پێی بگات, زۆر ئاگاتان لێیان بێ, ئاگاتان لەدڵی ناسكو هەستی بەسۆزیان بێ, لەبەر ئەوەی دڵڕەنجاندنیان دەبێتە هۆی بەهیلاك

جوریـو پەشیمانیو پەنجەگەزین, با گویّ بۆ پێغەمبەری خوا بگرین بـزانین لـەم بارەیـەوە جیـغـ ـی بۆ باس دەکات:

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرمویّ: لەئومەتانی پێش ئێمەدا کوڕێك هەبوو ناوی جورەیج) بوو, ئەم کوڕە دایکی هـــــەبوو, ڕەزامەندیی دایکی وەرگـــرتو لـــەخـــەڵکی ـیورکەوتەوەو ڕوویکردە شاخێکو بۆ خۆی ژوورێکی بچکۆلەی تێدا دروست کردو ـەستیکرد بەخواپەرستیو شەوو ڕۆژ هەر خەریکی نوێژو عیبادەتی خوا بوو, بەڵام خوێندەواری نەبوو, بەڵکو سۆفیلکە (ڕاهیب) بوو, گەلیّ جار دایکی سەری لێدەداو لەئاوەدانییەکەوە دەچوو بۆ ئەشکەوتەکە بۆ لای جورەیجی کوڕی. ئەوەبوو جارێکیان" دایکی کەپیر ببوو, ئەژنۆکانی هێزو توانایان نەمابوو, زۆر بەناڕەحەتی لەدێیەکەوە بەرەو شاخەکە بەڕێکەوتو زۆر بەناڕەجەتی سەرکەوتە سەر شاخەکەو گەیشتە خەڵوەتخانەکەی جورەیجو چووە ژوورەوەو زۆر بەدڵێکی لەکوڵەوە سەلامی لەجورەیج کرد, بەڵام لەو کاتەدا جورەیج نوێژی دەکردو لەدڵی خۆیدا گوتی: خوایە گیان, وڵامی دایکم بدەمەوە یان نوێژەکەم تەواو بکەم (نوێژەکە نوێژی سوننەت بوو), ئاخری نوێژەکەی نەبڕیو وڵامی سەلامەکەی دایکی ماندووی نەدایەوە. نوێژەکەی ئەوەندە درێژ بوو دایکی بێتاقەت بوو, ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. بۆ بەیانی هەمان شت کەباسمان کرد ڕوویدایەوەو ئەمجارەشیان جورەیج نوێژەکەی نەبڕیو دایکی دووبارە بەدڵشکاوی گەڕایەوە. بۆ ڕۆژی سێیەم, دایك دیسان ئاگری جگەر هەڵیگرتو بۆ ئەوەی دوو قسە لەگەڵ کوڕە تاقانەکەیدا بکاتو بزانیّ حاڵو وەزعی چۆنە" ئەمجارەشیان ملی هەورازی گرتو دوای شەکەتیو ماندووبوونێکی زۆر گەیشتەوە لای جورەیج. بەڵام سُبحان الله, ئەمجارەشیان جورەیجی عابید هەر خەریکی نوێژکردن بوو, دایکی سەلامی لێکرد, بەڵام جورەیج ئەمجارەشیان نوێژەکەی نەبڕیو جوابی سەلامەکەی دایکی نەدایەوە, بۆیە دایکی بەساڵداچوو" کەدڵی وەکو منداڵ ناسك ببۆوە, تووڕەیی گرتیو گوتی: خوایە, ئەم کوڕەی من نەمرێنیّ هەتا ڕووی ئافرەتی داوێن پیسی نیشان نەدەی!

دایك ئەم دوعایەی کردو بەدڵی پڕو چاوی پڕ لەفرمێسکەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە..

جا ئازیزان, با بزانین سەرەنجامی ئەم دوعای دایکە لەم کوڕە خواپەرستە چی دەبیّ!

بێگومان دەنگوباسی ئەم گەنجە خواپەرستە لەناو هەموو (بەنی ئیسرائیلدا) دەنگی دابۆوەو لەهەموو مەجلیس‌و دانیشتنێکدا باسی خواپەرستی‌و چاکی‌و پاکیی جورەیج دەکرا. رۆژێکیان کەکۆمەڵێك خەڵك دانیشتبوون‌و باسی جورەیجی عابیدو خواپەرستیان دەکرد، ئافرەتێکی سۆزانی‌و داوێن پیس کەزۆر جوان بوو" بەجوانییەکەی خۆی دەنازی، بەخەڵکەکەی گوت: ئەگەر حەز دەکەن دەچم لەخشتەی دەبەم‌و وازی پێ لەخواپەرستی دێنم! خەڵکەکە گوتیان: ناتوانی کاری لێ بکەی. گوتی: بزانن دەتوانم یان نا.

بەڵێ ئافرەتەکە خۆی رازاندەوەو روویکردە شاخ‌و گەیشتە لای جورەیج‌و هەرچۆن بوو خۆی بۆ دەرخست‌و زۆر هەوڵی لەگەڵدا، بەلام جورەیج هیچ ئاوڕی لێنەدایەوەو رووی تێنەکرد، بۆیە ژنەکە بەنائومێدی‌و بەدڵی پڕ لەقینەوە هاتە دەرەوەو لەژوورێکی خەڵوەتخانەکەدا کابرایەکی شوان هەبوو کەبۆ خۆی شەوانە لەوێ دەحەوایەوە، ئافرەتەکە چوو بۆ لای شوانەکەو خۆی خستە بەردەستی‌و ئەویش خۆی بۆ نەگیراو زینای لەگەڵدا کرد، ئەوەبوو لەو زینایە ئافرەتەکە حامیلە بوو، پاشان منداڵی بوو. خەڵکی ئاوایی گوتیان: ئەو منداڵەت لەکوێ بوو، خۆ تۆ مێردت نییە. گوتی: ئەوە منداڵی ئەو جورەیجە خواپەرستەیە کەئێوە دەتانگوت ناتوانی کاری لێ بکەی، ئەوەتا چووم بۆ لای‌و زینای لەگەڵدا کردم‌و ئەو منداڵە هی ئەوە!

خەڵکەکە کەئەوەیان گوێ لێبوو" سێ‌و دوویان لێنەکردو بەگەورەو گچکەوە هەڵیانکوتایە سەر جورەیج‌و هێنایانە دەرەوەو خەڵوەتخانەکەیان رووخاندو دەستیان کرد بەلێدان‌و تف لێکردنی.

جورەیجی بێتاوانیش ئاگای لەهیچ نییە، بۆیە بەسەرسووڕمانەوە گوتی: باشە ئەوە چیتانە، بۆچی وام لێدەکەن؟ گوتیان: جا چیت نەکردووە، زینات لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا کردووەو منداڵی لێت بووە، بەناوی گۆشەگیری‌و خواپەرستییەوە خەریکی ئیشی بەدڕەوشتیت؟ جورەیج فەرمووی: کوا ئافرەت‌و منداڵەکە؟ چوون هێنایانن بۆ لای، هەر کەجورەیج سەری هەڵبڕی‌و تەماشایکرد وا ئافرەتێکی داوێن پیس بەرامبەری وەستاوە" یەکسەر زانی ئەمە دوعاکەی دایکی بوو لێی گیرا بووە وا بەرامبەر ئافرەتی داوێن پیس راگیرا، ئیتر تەواو سزای خۆی وەرگرت‌و دڵنیابوو خوا رزگاری دەکات، بۆیە چووە

پێشەوەو دەستی خستە سەر سکی منداڵە مەلۆتکەکەو فەرمووی: رۆڵە باوکی تۆ کێیە؟! منداڵەکە بەزمانێکی رەوانو دەنگێکی ناسك گوتی: باوکی من ئەو شوانەیەو جورەیج بێتاوانە! خەڵکەکە کەئەوەیان بیست روویان کردە جورەیجو دەستو قاچیان ماچ کردو خۆیان تێهەڵدەسوو بۆ تەبەرِوك, ئەمجا پێیان گوت: گەردنمان ئازاد بکەو خەڵوەتخانەکەت لەزێرِ بۆ دروست دەکەینەوە, ئەویش فەرمووی: نەخێر, هەروەکو جاران لەقورِ بۆم دروست بکەنەوە. ئەوانیش لەقورِ بۆیان دروست کردەوە. (رَواهُ البُخاريومُسلِم)

لە( فَتْحُ الباري )دا, لەشەرحی ئەم ریوایەتەدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (لَوْ كانَ جُرَيْجٌ عالماً, لَعَلم أنَّ إجابَتَهُ أُمَّهُ أوْلى منْ عِبادَةَ رَبِّه), واتە: ئەگەر جورەیج عالمو زانا بوایە (چونکە گوتمان راهیبو نەخوێندەوار بوو) ئەوا دەیزانی کەوڵامدانەوەی دایکی لەپێشترە لەعیبادەتە سوننەتەکەی بۆ پەروەردگاری!

واتــــە: چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا لەپێشترەو خێری زیاترە لەنوێژو عیبادەتی سوننەت. جا ئەی گەنجە بەرِێزە خواناسەکان, زۆر ئاگاتان لەدڵی دایكو باوکتان بێ, کارێکی وا نەکەن دڵیان گەرد بگرێو دوعای خراپتان لێبکەن, چونکە دوعای دایكو باوك لای خوا قبووڵەو رەت نابێتەوە!

با هەموومان بەگوێی دڵ گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرینو پەندو عیبرەتی لێ وەربگرین. گۆڤاری (الدَّعوَة) لەژمارەی رۆژی (12 / ذي القعدَة / ساڵی 1409ی کۆچی), ئەم رووداوەی نووسیوەو دەڵێ: کابرایەك خاوەن ژنو چەند کورِو کچێك دەبێو هەموو ئاواتو هەوڵی ئەم باوکە بۆ ئەوە دەبێ کەنانێك بۆ منداڵەکانی بەحەڵاڵیو ئارەقەی ناوچەوانی پەیدابکات. بەڵێ دوای چەندان ساڵ, کورِە گەورەکەی خوێندن تەواو دەکاتو دەبێتە مووچەخۆری میری, باوکەش زۆر شوکری خوا دەکات کە لەمەودوا کورِەکەی پێگەیشتووەو تۆزێك باری سەرشانی ئەم سووك دەبێ. جا بۆ ئەوەی کورِەکەی ببێتە خاوەن خێزانو منداڵی خۆیو ئەمیش کورِەزاکانی لەباوەش بگرێو هیواو ئاواتەکانی بێنەدی, بەقەرزوقۆڵەو یارمەتیی خزمانو دۆستان" ژن بۆ کورِەکەی دێنێو هەموویان بەیەکەوە لەخانووەکەیاندا دەژین. بەڵام پاش ماوەیەك باوکە هەست دەکات کورِەکەی

زۆر بەبێحورمەتی تەماشای دەکات, لەمەش خراپتر ژنەکەیشی, واتە دایکی کوڕەکە لایەنگری کوڕە گەورەکەی دەبێو دژایەتیی مێردەکەی دەکات!

باوکە" کەتەماشا دەکات وا هەموو هیواو ئاواتەکانی دەبنە بلّقی سەر ئاو, بۆیە تووشی داڕووخانی دەروونیی دەبێو زۆر خەفەت دەخوا بۆ ئەو هەموو زەحمەتو رەنجەی بۆ پێگەیاندنی ئەم کوڕەو, ئەم ژنەیشی کەچەندین ساڵە بەیەکەوە دەژین کەچی لەپیریدا خێزانەکەی نەفرەتی لێدەکات, تا ئەو کاتەی ڕۆژێکی جومعە کوڕە گەورەکە چەند کیلۆ گۆشتی جوانو چەند جۆر میوەی تازە پێگەیشتوو دەکڕێتو دەڵێ ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ دەیکەین بەئاهەنگو خۆشیو کۆمەڵێك برادەری خۆشەویستم دێن بۆ سەردانو میوانیم.

بەڵام کوڕە گەورەکە بەدایکی دەڵێ: کەس بەباوکم نەڵێت کەئەم نیوەڕۆیە ئەم خواردنە خۆشەمان ئامادە کردووەو میوانمان هەیە, چونکە من رازیی نیم باوکم بەشداریمان لەگەڵ بکات, وەبە دایکیشی دەڵێ ئەگەر باوکم لەنوێژی جومعە هاتەوە بەتەنها هەندێ برنجی سادەی بۆ بکەرە قاپێکەوەو با لەژوورەکەی خۆیدا بیخوات.

بەڵێ باوکی بەسەزمانو بەساڵداچوو" کاتێ لەنوێژی جومعە دەگەڕێتەوەو دێتەوە بۆماڵەوە, هەست دەکا جموجووڵی کچو کوڕەکانی ئاسایی نییەو شتێك هەیەو ئەم پێی نەزانیوە, بەڵام نازانێ ئەو شتە چییە. بۆیە لەخێزانەکەی خۆی دەپرسێ: ئەرێ ئەوە چییە تۆزێ مشەوەش دیارن؟ ئەویش دەڵێ: هیچ نییە, مەچۆرە ژووری نان خواردن, بووکەکەمان هەندێ ئافرەتی دراوسێو ناسیاوی خۆی دەعوەت کردووەو وا خەریکی نان خواردنن, با شەرم نەکەنو نان خواردنەکەیان لێ تێك نەچێ ئەوە نانو چێشتەکەتو بڕۆ لەژوورەکەی خۆت بیخۆو پاشان بڕۆ ماڵی دراوسێیەك" دۆستێکی خۆت, چونکە ئەو ئافرەتانە پێویستیان بەئیسراحەت هەیە. کابراش هیچی لەدڵدا نیەو ئاگای لەهیچ بەرنامەو پیلانێك نیە بڕوا بەقسەی ژنەکەی دەکاتو بەپەلە خواردنەکەی دەخواو دەڕواتە دەرەوە بۆ ئەوەی بچێ لەماڵە دراوسێیەکیان تۆزێ ئیسراحەت بکاو تا ئێوارە ئەو میوانە ژنانەیاز دەڕۆن نەیەتەوە بۆ ماڵەوە, بەڵام هەر چەند هەنگاوێك لەماڵ دووردەکەوێتەوە کەچەند ئوتومبێلێك لەبەردەرگای ماڵی ئەمان رایدەگرنو چەند کوڕی گەنجی لێ دێنە خوارەوەو لەدەرگای ماڵیان دەدەن, یەکسەر کوڕە گەورەکەی دێتە دەرەوەو زۆر بەگەرمی

بەخێرهاتنیان دەكاتو پێشوازییەكی گەرمیان دەكاتو دەیانباتە ژوورەوە. باوكی نساف یەكسەر دڵی خورپە دەكاو دەڵێ باشە ئەوان گوتیان ژنمان میوانن, ئەی ئەم پیاوانە بۆچی چوونە ژوورەوە؟ بۆیە یەكسەر دەگەڕێتەوەو دێتە ژوورەوەو لەبووكەكەی دەپرسێ: ئەرێ رۆڵە ئەوە چیەو ئەو پیاوانە كێن؟ ئەویش راستییەكەی پێدەڵێو دەڵێ: ئەوانە میوانمانن‌و دەعوەتمان كردوون, برادەرو هاوڕێی كـــوڕەكەتن. كابرا دەڵێ: ئەی میوانە ژنەكان؟ بووكەكە دەڵێ: هیچ میوانی ژنمان نییەو بۆیەش وایان پێ گوتووی چونكە حەز ناكەن تۆ لەماڵەوە بیو كوڕەكەتو ژنەكەت رازی نابن لەسفرەیەك نانیان لەگەڵدا بخۆی!

كابرا كەئەمە دەبیستێ" تف لەدەمیدا ووشك دەبێو ماوەیەك بیردەكاتەوە, تۆ بڵێی ئەمە راست بێ من دەیبیستمو خەون نەبێ؟ بەڵێ راستەو تازە ئــەم لەم ماڵەدا جێگای نابێتەوە, بۆیە بەپەلە ماڵەوە بەجێدێڵێو ڕوودەكاتە مزگەوت, دەستنوێژێكی جوان دەشواو بەدڵی پڕ لەگریان‌و چاوی پڕ لەفرمێسكەوە دوو ركات سوننەتی دەستنوێژو تەحیەتول مەسجید دەكاو دەست بەرز دەكاتەوەو دەڵێ: ئەی خوای پەروەردگار, تۆ حاڵی منت ئاگا لێیە, خوایە لێت دەپاڕێمەوە (اللّهُمَّ اجْعَلْهُ حَسيراً كَسيراً ما دامَ في حَياتِهِ وَحَتّى مَمَاتِهِ), دەڵێ: خوایە گیان, ئەم كوڕە گەورەم زەلیل‌و زەبوون بكەی, وەكو پەڕۆی دڕاوی لێبكەی لەژیانیدا هەتا دەمرێ. ئەمجا دوعا لەژنەكەی خۆیشی دەكاو دەڵێ: یا رەبی خوایە, ئەم ژنە بێوەفایەشم وەكو كوڕەكەم لێبكەیو خوایە تووشی عەزابی قەبرو قیامەتی بكەی.

ئەمجا لەمزگەوت دێتە دەرەوەو دەچێتە ماڵی برادەرێكیو ئەو شەوە لەوێ دەخەوێ. دە گوێ بگرن بزانن خوای گەورە چۆن دوعای ئەم پیاوە قبوول دەكات. بۆ رۆژی شەممە, كوڕە گەورە كەمیوانەكانی بەرێدەكاتو شەو لەگەڵ خێزانەكەیدا زۆر بەئیسراحەتو تێری لەسەر ئەو دۆشەكو راخەرە نەرمانە دەخەوێ كە بەخوێن‌و عەرەقی ناوچەوانی باوكی كڕدراون" دەخەوێو بەیانی هەڵدەستێ بۆ دەوامو هیچ كەس ناپرسێ ئەرێ ئەم پیاوە بەتەمەنە, ئەم باوكە, ئەم هاوسەرە, چی لێ هاتو بۆ كوێچوو؟كوڕە گەورە كەدەڕوات بۆ دەوام لەڕێگای پەڕینەوەدا لەشەقامێك ئوتومبێلێك

لێی‌دەداو دەیخات‌و یەکسەر ئۆتۆمبێلێکی تریش بەسەریدا دەڕوات‌و هەردوو قاچی‌و هەردوو ڕانی وورد دەکات. دەیبەنە نەخۆشخانەو سێ مانگ لەنەخۆشخانە دەمێنێتەوەو هەموو لەشی لەجوولە دەکەوێ‌و دکتۆرەکان ناتوانن هیچ چارەسەرێکی بۆ بکەن, بۆیە لەنەخۆشخانە دەری‌دەکەن‌و دێتەوە بۆماڵەوە, بەلام چی؟ وەکو پارچە گۆشتێك یان منداڵێکی ناو بێشکەی لێدێ‌و توانای هیچ جووڵانێکی نابێ. دایکیشی, (خێزانی پیاوەکە) حەفتەیەك دوای ئەم کارەساتە دەمرێ‌و کوڕە گەورەش ماوەی دوو ساڵ‌و نیو بەم حاڵە نەژی‌و نەمرەوە دەمێنێتەوەو پاشان بەئازارێکی زۆرەوە دەمرێ‌و بەئاخ‌و حەسرەتەوە دونیا بەجێ‌دێڵێ‌و هەر خواش خۆی دەزانێ چ عەزابێکی توندی لەقەبرو قیامەتدا بۆ ئامادە کردوون!

لەکۆتایی ئەم وتارەشدا لەخوای گەورە دەپاڕێمەوەو دەڵێم:

ئەی خوای پەروەردگار: ڕەحم بەدایك‌و باوکمان بکە وەکو ئەوان لەمنداڵی ئێمەدا ڕەحمیان بەئێمە کردو ئێمەیان پەروەردە کرد.

ئەی خوای پەروەردگار: هەرکەسێ بۆ دایك‌و باوکی باشەو چاکەیان لەگەڵدا دەکات“ زیاتر یارمەتیی بدەی‌و دامەزراوتری بکەی.. هەرکەسێکیش ئازاری دڵی دایك‌و باوکی دەدا“ خوای گەورە بەڕەحمی خۆت هیدایەتی بدەو.. دڵی نەرم بکەو.. ڕێگای چاکەکردنی لەگەڵ دایك‌و باوك نیشان بدە..

﴿ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴾

# ووتـاری هەشتەم

## مافی دایكو بـاوك

### بەشی سێیەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾( التوبة 105 )

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصِلَ أَباهُ في قَبْرِهِ فَلْيَصِلْ إِخوانَ أَبِيهِ بَعْدَهُ )

( رَواهُ إبنُ حَبَّان في صَحيحِهِ)

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين، والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيمانداران‌و خواناسان: سەلامی خواتان لێبێت.. لەدوو ووتاری رابردوودا باسی هەندێك لەمافەكانی دایك‌و باوكمان كرد لەسەر نەوەو رۆڵەكانیان، جا ئەوەی تا ئێستا باسمان كردووە چاكەكردن بوو لەگەڵ دایك‌و باوك لەكاتێكدا كە لەژیاندا بوون.. بەڵام ئایا دوای وەفاتیان" دوای مردنی دایك‌و باوك، ئایا هیچ مافیان لەسەر ئەولادەكانیان دەمێنێ؟ وەئایا پێویستە چی بكرێ بۆ دایك‌و باوك كەدونیایان بەجێهێشتووەو وەفاتیان كردووە؟

بەڕێزان: هەروەكو دایك‌و باوك لەكاتێكدا لەژیاندان واجبەو پێویستە لەسەر شانی نەوەو رۆڵەكانیان كە لەخزمەتیاندابن‌و مافی دایك‌و باوكیان بدەن، بەهەمان شێوەش پێویستە دوای وەفات‌و لەدونیا دەرچوونیشیان لەیاد نەكرێن‌و ئەم مافانەیان بپارێزرێن، وەكو پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم مافەكانی دایك‌و باوكی دوای وەفاتیان لەسەر نەوەو رۆڵەكانیان لەم فەرموودەیەدا باسكردووە.

جارێكیان كابرایەك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا كردو عەرزی كرد: (يا رَسُولُ الله، هَلْ بَقِي مِنْ بِرِّ أَبَوَيَّ شَيءٌ أَبَرُّهُما بِهِ بَعْدَ مَوْتِهِما ؟) ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا باك‌و دایكم لەپاش مردنیان هیچ چاكەو حەقێكیان لەسەرم دەمێنێ كەپاش مردنیان بۆیان بكەم؟ (قالَ: نَعَمْ، الصَّلاةُ عَلَيْهِما، وَالإسْتِغْفارُ لَهُما، وَإِنْفاذُ عَهْدِهِما مِنْ بَعْدِهِما، وَصِلَةُ الرَّحِمِ الَّتي لا تُوصَلُ إِلاَّ بِهِما، وَإِكْرامُ صَدِيقِهِما). ( رَواهُ أبو داود )

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: بەڵێ، لەدوای مردنی دایك‌و باوك" ئەم مافانەیان لەسەر ئەولاد هەر دەمێنێ: دەبێ دوعای خێریان بۆ بكەی، نوێژی مردوویان لەسەر بكەو بۆیان بپاڕێرەوەو لەپاش خۆیان بەڵێن‌و ڕاسپاردەكانیان جێبەجێ بكەو هەروەها قەدرو ڕێزی ئەو خزمانەت ڕابگرە كە بەهۆی دایك‌و باوكتەوە دەبن بەخزمت وەكو (مام، پوور، خاڵ‌و منداڵی ئەمانە)، هەروەها قەدرو ڕێزی دۆست‌و برادەرانیان بگرە.

جا ئێستا لەبەر رووناكیی ئەم فەرموودەیەی حەزرەتدا مافەكانی دایك‌و باوك لەدوای مردنیان لەسەر ئەولادەكانیان باس دەكەین ئینشائەڵڵا.

**یەکەم:** پارانەوە لەخوا کەخوا لەگوناهیان خۆش بێ. بەڵێ واجبە لەسەر ئەولاد کەهەر وەختێ دوعای کردو لەخوا پاڕایەوە کەخوا لەگوناهی خۆش بێ" دەبێ یەکسەر بێ: خوایە لەگوناهی دایکو باوکیشم خۆشبە, خوایە رەحمیان پێبکە, چۆن ئەوان بەمندالّی رەحمیان بەمن کردو گەورەیان کردم, چونکە دایکو باوك سوودی زۆر لەم دوعای ئەولادەیان وەردەگرنو خوا لەگوناهیان خۆش دەبێ, وەکو لەحەدیسی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتووە کەفەرموویەتی:

یەکێ لەو شتانەی کەسوود بەئینسان دەگەیەنن لەدوای مردنی" ئەوەیە: (.. وَوَلَدٍ صالِحٍ يَدْعو لَهُ), واتە: ئەو کەسەی مردووە" لەدوای خۆی منداڵێکی صالحو چاکی هەبێ کەبۆی بپاڕێتەوەو دوعای خێری بۆ بکا.

لەفەرموودەیەکی تردا حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إِنَّ اللهَ لَيَرْفَعُ الدَّرَجَةَ لِلْعَبْدِ الصَّالِحِ في الجَنَّة, فَيَقولُ: يا ربِّ! أنَّى لي هذِهِ؟! فَيَقولُ: بِإسْتِغْفارِ وَلَدِكَ لَكَ). (رَواهُ أحمَد), واتە: خوای گەورەو بالآدەست" پلەوپایەی بەندەی چاك لەبەهەشتدا بەرزدەکاتەوە, بەندەکەش دەڵێ: ئەی خوای پەروەردگار! ئەمەم لەکوێ بوو؟ خوایە بەهۆی چ کردەوەیەکمەوە گەیشتمە ئەم شوێنو پلە بەرزەی بەهەشت؟! خوای گەورەش دەفەرموێ: بەهۆی پاڕانەوەو دوعای خێری کوڕەکەتەوە کە لەدوای مردنی تۆ" دوعای بۆ دەکردیو دەیگوت: خوایە لەگوناهی دایكو باوکم خۆشبە.

جا کەواتە ئیمانداری بەڕێز, هەرگیز درێغی نەکەی لەدوعای خێر بۆ دایكو باوکت, کە لەدونیا دەرچوونو لەدوای هەموو نوێژێك دەست بەرز بکەوەو بڵێ: (خوایە لەمنیشو لەدایكو باوکیشم خۆش بێ), چونکە ئەم دوعایە ئەوەندە گەورەیە لای خواو ئاوا دایكو باوکتی پێ خۆشحاڵ دەکەی لەدوای مردنیان.

**دووەم:** ئەگەر قەرزاربوون قەرزیان بۆ بدەیەوەو ئەگەر حەجیان نەکردبوو حەجیان بۆ بکەی. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: ( مَنْ حَجَّ عَنْ أبَوَيْهِ أوْ قَضى عَنْهُما مَغْرَماً بُعِثَ يَوْمَ الْقِيامَة مَعَ الأبْرارِ)(رَواهُ الدارقُطني), واتە: هەرکەسێك دایكو باوکی مردبنو حەجیان نەکردبێ, یان قەرزی خەڵکیان لەسەر بێ, ئەولادەکەیان حەجیان بۆ بکا

یان قەرزەکەیان بۆ بداتەوە ئەوا خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا ئەم کورە (یان کچە) لەگەڵ چاکەکارانو ئەو کەسانەی خوا لێیان رازییە زیندوو دەکاتەوە!! سَبحانَ الله چەند موژدەیەکی خۆشە!

جا ئەی ئەو کەسەی کەدایكو باوکت وەفاتیکردووە، ئەگەر حەجیان نەکردبوو تۆش خۆت حەجت کردبوو ئەوا هەوڵبدە حەجیش بۆ ئەوان بکەی، یان کەسێکی شارەزاو خواناس (کەخۆی حەجی کردبێ) بۆیان بەکرێ بگرەو مەسرەفی حەجەکەی بۆ بدەو لەجیاتی باوكو دایکت حەج بکات، ئەگەر قەرزاریشن ئەوا ئەوەندەی لەتواناتدایە قەرزیان بۆ بدەوە ئینشائەڵڵا بەر ئەو فەرموودەیەی خۆشەویستی خوا دەکەوی کەفەرمووی: لەرۆژی قیامەتدا لەریزی چاکەکاراندا زیندووی دەکاتەوە.

بەرێزان: گەلێك جار ئەو پرسیارە دەکرێ: ئایا حەج کردن بۆ مردوو هیچ سوود بەمردووەکە دەگەیەنێ؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە" ئەم چەند فەرموودەیەی پێغەمبەرتان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم عەرز دەکەم

1 ـ ئەنەسی کوری مالیك (رەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خوا" باوکم مردو ماڵو دارایی باشی هەبوو، بەڵام حەجی نەکرد، ئەو حەجی ئیسلامەی کۆڵەکەیەكو روکنێکی ئیسلامەتییە" باوکم نەیکرد، ئایا ئەگەر من کەبۆ خۆم حاجیمو حەجم کردووە" لەجیاتی ئەو حەج بکەم دروستەو خێری ئەو حەجە بەباوکم دەگات؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أرَأيْتَ لَوْ كانَ عَلى أبيكَ دَيْنٌ أكُنْتَ تَقْضيهِ عَنْهُ؟) واتە: ئایا ئەگەر باوکت قەرزێکی خەڵکی لەسەر بوایە" ئایا تۆ قەرزەکەت بۆ دەدایەوە؟! کابرا گوتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَإنَّهُ دَيْنٌ عَلَيْهِ فَاقضِهِ) فەرمووی: دە ئەوەش کەتوانای بووەو حەجی نەکردووە" ئەوە قەرزە لەسەریو تۆش کەتوانات هەیە قەرزەکەی بۆ بدەوەو حەجەکەی لەجیاتی بکە. (رَواهُ البَزار والطَبَراني)

2 ـ زەیدی کوری ئەرقەم (رەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إذا حَجَّ الرَّجُلُ عَنْ والِدَيْهِ تَقَبَّلَ اللهُ مِنْهُ وَمِنْهُما وَأُسْتُبْشِرَتْ أرْواحَهُما في السَّماء وَكُتب عِنْدَ الله باراً)(رواهُ الدارقُطني)،

واتە: ئەگەر کەسێك لەجیاتی باوکی" یان دایکی، حەج بکات، ئەوا خوای گەورە لەو کەسە خۆیو لەدایكو باوکیشی قبوولّ دەکاتو رۆحی ئەو دایكو باوکە مردووە لەئاسماندا خۆشحالّ دەبنو لای خواش ئەو کەسەی کەحەجی بۆ دایكو باوکی کردووە بەچاکەکار دەنووسرێتو خوا لێی رازی دەبێت.

3 ـ لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە کەجابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیە وسَلّم فەرمووی: (مَنْ حَجَّ عَنْ أبیهِ وَأُمِّه قَضی عَنْهُ حَجَّتَهُ، وَکانَ لَهُ فَضْل عَشرَ حَجَجٍ)(رواهُ الدارقُطني)، واتە: هەرکەسێك لەجیاتی دایکیو باوکی حەج بکات" ئەوا حەجەکەی بۆ قەزا کردوونەتەوەو بۆ خۆیشی چاکەی دە حەجی بۆ دەنووسرێت!!

ئەی ئەو کەسانەی کەتواناتان هەیە: حەج بۆ دایكو باوکتان بکەن کەخۆیان بەهەر هۆیەکەوە بوویێ" لەژیانی خۆیاندا حەجیان نەکردووە، درێغی مەکەنو ئەو خێرو سەوابە گەورە لەدەست خۆتانو ئەوانیش مەدەن.

*سێیەم*: خێرکردن بۆیان. لەبەر ئەوەی هەر خێرێك بۆ مردوو بکرێ خوای گەورە پێی دەگەیەنێ" بەتایبەت خێری ئەولاد بۆ دایكو باوك چونکە مالّو سامانی ئەولاد هی دایكو باوکە وەکو پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم بەکابرایەکی فەرموو: (أنْتَ وَمالُكَ لأبیكَ) واتە: تۆ خۆشتو مالّەکەشت هی باوکتن. واتە: وەکو دایكو باوکەکە بۆ خۆیان بەزیندوویی خێرەکەیان کردبێ وایە.

بوخاریو موسلیم لەعەبدوللای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیە وَسَلّم کردو گوتی: دایکم مردووە، ئایا ئەگەر خێری بۆ بکەم" سوودی پێدەگات؟ حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: بەلّێ، پیاوەکە گوتی: دەی وا تۆم کرد بەشاهید ئەی پێغەمبەری خوا کەوا حوشترێکی پشت نەکراوم هەیە وا بۆم کرد بەخێر.

کەواتە: دەتوانرێ حەیوانێك" جا حوشتر بێ یان رەشەولاخ یان مەڕو بزن بێ بکرێ بەخێری دایكو باوكو سەرببڕدرێو گۆشتەکەی بەسەر هەژاراندا دابەش بکرێ.

هەروەها دایکی ئیمانداران" حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ:

پیاوێك بەپێغەمبەری خوای (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) گوت: قوربان, من دایكم كتوپڕ كۆچی دوایی‌كرد, بەڵام من وا دەزانم ئەگەر ئاوا مردنەكەی كتوپڕ نەبوایەو پێش ڕۆح دەرچوونی" مەجالی قسەكردنی هەبوایە ئەوا خێرێكی بۆ خۆی بڕیار دەداو وەسیەتی دەكرد كەشتێكی بۆ بكەم بەخێر. ئایا ئێستا كەئەو هیچ وەسیەتی نەكردووە بۆ ئەوەی خێری بۆ بكەم, ئەگەر من خێری بۆ بكەم" ئایا هیچ پاداشت بەدایكم دەگاتو خوای گەورە خێری بۆدەنووسێ؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم فەرمووی: بەڵێ, هەروەكو بەدەستی خۆی خێرەكەی بۆ خۆی كردبێ ئاوا خێری بۆ دەنووسرێ. (رَوَاهُ البُخاري ومُسلِم)

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: (ما عَلى أحَدٍ إذا أرادَ أنْ يَتَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ), واتە: هیچی تێناچێتو كارێكی باشو ئاسانە" هەركەسێك كەویستی خێرێك بكات" با خێرەكە بەناوی دایكو باوكیەوە بكاتو بڵێ: خوایە ئەمە خێری دایكو باوكمە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەفەرموێ: ئەگەر دایكو باوكی ئەو خێركەرە موسڵمان بوون ئەوا پاداشتی ئەو خێرە بۆ دایكو باوكی دەبێتو بۆ خۆیشی بەقەدەر خێری دایكو باوكی" خێری بۆ دەنووسرێ بەبێ ئەوەی كەهیچ لەخێرو پاداشتی دایكو باوكەكە كەم بێتەوە.

جا موسڵمانی بەڕێز: بەڕاستی ئەمە موژدەیەكی گەورەیەو هەركاتێك خێرێكت كرد" ماڵێكت بەخشی" یەكسەر بەدڵ نیەتی ئەوەی لێ بێنە كەئەمە بەخێری دایكو باوكم دەبەخشم, ئەوا خێرەكە بەدایكو باوكت دەگاتو بۆ خۆشت بەقەدەر ئەوان خێرت دەگاتێو لەخێری كەستان كەم نابێتەوە.. هەزاران سوپاس بۆ خوای گەورە كەئەوەندە بەڕوحمو بەلوتفە لەگەڵ عەبدو بەندەكانی خۆی.

خۆشەویستان: هەروەكو ڕوونمان كردەوە, باوكو دایك" ئەگەر وەفاتیان كرد, با هیچ وەسیەتیشیان نەكردبێ كەكوڕەكەیان یان كچەكەیان خێریان بۆ بكەن ئەوا هەر خێریان بۆ دەكرێو دەبێتە كەفارەتی گوناهەكانیان, وەكو حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای كرد: باوكم مردووەو ماڵو سەروەتو سامانیشی لەپاش خۆی بەجێهێشتووەو هیچ وەسیەتێكی نەكردووە

کەخێرێکی بۆ بکەین, ئایا من ئەگەر خێرێکی بۆ بکەم" دەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهەکانی؟ پێغەمبەری خوا صلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرمووی: بەڵێ, ئەو صەدەقەو خێرەی تۆ بۆی دەکەی" خوای گەورە دەیکاتە مایەی هەڵوەرینی گوناهەکانی باوکت.

(رواهُ ابن خُزَیمَة فی صحیحه)

ئیمانداران: باشترین خێریش کەئینسان بۆدایکو باوکی کۆچکردووی بیکاتە خێرێکی نەبڕاوە" ئەوەیە: کە لەشوێنێکدا کەبێ ئاوییەو خەڵکی زۆر موحتاج بەئاون, بیرێك هەڵکەنێ, یان کانیەك کەکوێر بۆتەوەو ئاوەکەی سوودی لێ نابینرێ" پاکی بکەیتەوەو ئاوەکەی دەربخەیتەوە.. ئەوە گەورەترین خێرە, وەکو ئەو فەرموودەیەی کەئەبو داودو نەسائی لەسەعدی کوڕی عوبادەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویانەتەوە کەفەرموویەتی: ڕۆژێکیان چوومە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزم کرد: قوربان, وەکو ئاگاداری" دایکم وەفاتی کردووەو منیش دەمەوێ خێرێکی بۆ بکەم کەئینشائەڵلا سوودی پێبگەیەنێ, بەڵام هێشتا خێرەکەم بڕیار نەداوە, هاتووم بۆ خزمەت جەنابت بۆ ئەوەی پێم بڵێی چ شتێك لەهەموو شتێ خێرەکەی زۆرترو باشترە با ئەوەی بۆ بکەم بەخێر. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم فەرمووی: ئاو لەهەموو شتێك خێری زۆرترە, بڕۆ بیرە ئاوێك هەڵبکەنەو بەخێری دایکت با خەڵك ئاوی لێ بخۆنەوەو سوودی لێ ببینن. بەڵێ, لەسەر فەرموودەکەی حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم" سەعد بیرە ئاوێکی هەڵکەندو فەرمووی: خوایە هەرکەسێكو هەرشتێك لەم ئاوە دەخواتەوە خێری دایکم بێت.

بەڕێزان: لەبارەی گەورەیی خێری ئاوەوە, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرموویەتی: هەرکەسێك بیرە ئاوێك هەڵبکەنێت, جا هەرکەسێکی تینوو لەجنۆکە, یان لەئینسان, یان باڵندە لەو ئاوە بخواتەوە ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەسەر ئەوەی کەئەم تینووە" لەو ئاوەی تێر خواردۆتەوە, پاداشتی ئەو کەسە دەداتەوە کەئەو بیرەی هەڵکەندووە! (رَواهُ ابن خُزَیمَة فی صحیحه)

هەروەها لەو خێرو صەدەقانەی کەدەتوانرێ بۆ مردوو بکرێنو خێری نەبڕاوەن ئەوەیە: مزگەوتێکیان بۆ دروست بکەی, جا هەتاوەکو ئەو مزگەوتە عیبادەتو جومعەوجەماعەتی تێدا بکرێ ئەو باوكو دایکە خێریان بۆ دەچێو ئەو کەسە خۆیشی خێرتەواوی بۆ دێ.

هەروەها لەخێری نەبڕاوە کەبۆ دایكو باوك بکرێ ئەوەیە: قورئانێك یان کتێبێکی تەفسیری قورئان, یان کتێبێك کەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوای صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم تێدا نووسراوە, بکڕدرێو بکرێ بەوەقف بەخێری دایكو باوك. جا هەتاوەکو ئەو قورئانە" یان کتێبی تەفسیرو حەدیسە بمێنێتەوەو کەسێك تەماشای بکاو سوودی لێ ببینێ ئەوا بەردەوام خێر بۆ دایكو باوکەکە دەچێو ئەو کەسەش کەکردوویەتی بەوەقف" خێری تەواوی نەبڕاوەی بۆ دەنووسرێ, وەچاك وایە ئەو کتێبە ئاینیەیانە کەکران بەوەقف" تەسلیم بەزانایەکی ئاینیی شارەزاو خواناسو حەق بێژ بکرێو ئەویش ئامۆژگاریی موسڵمانانی پێ بکاو دوعاش بۆ مردووەکان بکا.

**چوارەم:** لەمافەکانی دایكو باوك لەسەر ئەولاد دوای وەفاتیان ئەوەیە: چاکەکارو ئینسانی خواناسو باش بن لەگەڵ خەڵکیدا, بەمەش دایكو باوك لەقەبردا دڵخۆش دەبن. موفەسیری بەناوبانگ (إبـن كـثير) لەتەفسیرەکەیدا" لەتەفسیری سوورەتی (التَوبَـة)دا ئایەتی ژمارە (105) کەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾, شێخی ئبن کەثیر دەفەرموێ: باسکراوەو هاتووە کەکارو کردەوەی ئینسانی زیندوو" نیشانی مردووی خزمو قەومو کەسە نزیکەکانی دەدرێت لەناو ژیانی قەبردا کەپێی دەوترێ بەرزەخ.

پاشان ئبن کەثیر (رەحمەتی خوای لێبێت) ئەو فەرموودەیەی هێناوەتەوە بەبەڵگە کە (أبـو داود الطيالـسي) هێناویەتی بەسەنەدی خۆی لەجابیرەوە کەدەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرمووی: (إِنَّ أَعْمالَكُمْ تُعْرَضُ عَلى أَقارِبِكُمْ وَعَشائِرِكُمْ, فَإِنْ كانَ خَيْراً إِسْتَبْشِرُوا بِهِ, وَإِنْ كانَ غَيْر ذلكَ قالُوا: اَللَّهُمَّ أَلْهِمْهُمْ أَنْ يَعْمَلُوابِطاعَتِكَ).

واتە: کاروبارەکانتان نیشانی مردوانی خزمو هۆزتان دەدرێت, خۆ ئەگەر چاك بوون پێی دڵخۆش دەبن, ئەگەر کردەوەکانیشتان باش نەبونو ناشەرعیبوون, ئەوا مردوەکان لەدایكو باوكو خزمو نزیکان, کەچاویان بەکردەوەی کەسە زیندوەکەیان دەکەوێت کەبێفەرمانی خوایکردوە, ئەوا دڵتەنگ دەبنو دوعا دەکەن بۆ زیندووەکەو دەڵێن: ئەی خوایە یارمەتییان بدەی تا کارو کردەوەیان بەپێی ئەمرو فەرمانی تۆ بێت, خوایە

هیدایەتیان بدەی, خوایە چاکیان بکەیو واز لەخراپەو تاوان بێنن.

پاشان ئبن کەثیر ئەو فەرموودەیەی ئیمام ئەحمەدی بەسەنەدی خۆی لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هێناوە کەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (إنَّ أعْمالَكُمْ تُعْرَضُ عَلی أقَارِبِكُمْ وَعَشَائِرِكُمْ مِنَ الأمْوات, فَإنْ كانَ خَیْراً إسْتَبْشِرُوا بِهِ, وَإنْ كانَ غَیْرَ ذلكَ قالُوا: اَللّهُمَّ لا تُمِتْهُمْ حَتّی تَهْدِیهِمْ كَما هَدَیْتَنا), واتە: کارو کردەوەکانتان نیشانی خزمانی نزیكو کەسوکاری مردووتان دەدرێ, خۆ ئەگەر کردەوەکانتان چاك بوو" ئەوا دڵخۆش دەبن پێی, خۆ ئەگەر وەهاش نەبوو, کردەوەکانتان خراپەو تاوان بوو" ئەوا ئەو دایكو باوكو خزمە نزیکە مردووە ئیماندارانەتان دەڵێن: خوایە ئەو کەسە زیندووانەمان نەمرێنی هەتا هیدایەتیان دەدەی, هەروەك چۆن ئێمەت هیدایەتدا.

هەروەها ئیمام ئبن مبارك بەسەنەدی خۆی لە (ئەبو دەرداء)ەوە گێڕاویەتیەوە کەفەرموویەتی: کارو کردەوەی ئینسانی زیندوو نیشانی مردووەکان دەدرێت, ئەوانیش بەکردەوەی چاکە دڵخۆش دەبنو بەکردەوەی خراپەی زیندووەکانیان دڵگران دەبن. جا صەحابیی بەڕێز (ئەبو دەرداء) ڕەزای خوای لێبێت" دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لەوەی کەکردەوەیەك بکەم کەببێتە مایەی ناشیرین بوونم لای عەبدوڵڵای کوڕی رواحەی خاڵم, چونکە لەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: (تُعْرَضُ الأعْمالُ یَوْمَ الإثْنَیْنِ وَالْخَمیسِ عَلی اللهِ تَعالی, وَتُعْرَضُ عَلی الأنْبِیاء وَعَلی الآباء وَالأُمَّهاتِ یَوْمَ الْجُمُعَةِ, فَیَفْرَحونَ بِحَسَناتِهِمْ وَتَزْدادُ وُجُوهَهُمْ بَیاضاً وَإشْراقاً, فَاتَّقُوا اللهَ وَلا تُؤْذُوا مَوْتاكُمْ), واتە: کارو کردەوەی ئینسان ڕۆژانی دووشەممەو پێنجشەممە" نیشانی خوای گەورە دەدرێت, ڕۆژانی هەینیش نیشانی پێغەمبەرانو باوکانو دایکان دەدرێت, بەکارو کردەوەی چاکیان دڵخۆش دەبنو ڕوویان زیاتر سپیو گەش دەبێتەوە, دەی ئێوەش لەخوا بترسنو تەقوای خواتان هەبێتو ئازاری مردوانتان مەدەن.

ئەی موسڵمانی بەڕێز: ئەی ئەو کەسەی کەدایكو باوکت وەفاتی کردوە, بەردەوام هەوڵی ئەوە بدە خواپەرستی زیاتر بکەیو لەگەڵ خەڵکدا نزیكو دۆست بی, لەبەرئەوەی چۆن لەدنیادا, کاتێ دایكو باوك زیندوون, دڵخۆشن بەوەی ڕۆڵەو نەوەکانیان ئینسانی ڕێکوپێكو باشبن, بەهەمان شێوەش لەدوای مردن دڵخۆش دەبن بەچاکەو چاکەکانیان.

خۆشەویستان: زۆر کەس هەیە, کاتێ باوکو دایکی لەژیاندابوون, وەکو پێویست خزمەتی نەکردون, بەڵکو جاری وا بوە دڵیشی ئازار داون, ئێستا پاش وەفاتیان پەشیمانەو هەست دەکا چی لەدەست چووە, جا بۆ ئەوەی دڵی دایکو باوکی خۆشکاو خوای گەورە لەخۆی رازی بکاو ئەو زەرەرە گەورەیە کەدڵ رەنجاندنی دایکو باوکە پڕیکاتەوە, با لەدوای وەفاتیان هەوڵبدا کارو کردەوەی جوان بکاو خواو خەڵك لێی رازیبن, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ بَرَّ قَسَمَهُما وَقَضی دَیْنَهُما وَلَمْ یَسْتَسِبَّ لَهُما کُتِب باراً وَإِنْ کانَ عاقاً في حَیاته, وَمَنْ لَمْ یَبَرَّ قَسَمَهُما وَیَقْضي دَیْنَهُما وَاسْتَسَبَّ لَهُما کُتِب عاقاً وَإِنْ کانَ باراً في حَیاته)(رَواهُ الطَبَراني).

واتە: هەرکەسێ دایکو باوکی وەفات بکاتو دوای مردنیان سوێندو وەعدو بەڵێنێك کەداویانە بەجێی بهێنێتو قەرزێك کە لەسەریانە بۆیان بداتەوەو نەبێتە هۆی جنێو پێدانیان, ئەوا بەچاکە کار دەنووسرێت ئەگەرچی لەژیاندا گوێڕایەڵیان نەبووبیت, بەڵام کەسێك باوكو دایکی وەفات بکاتو لەپاش مردنیان گوێڕایەڵی سوێندیان نەبێتو توانای دارایی باش بێتو قەرزەکانیان بۆ نەبژێرێتو ببێتە هۆی جنێو پێدانیان بەوەی ئینسانێکی نالەبارو خراپەکاربێتو جنێو بەدایکو باوکی خەڵکی بڵێو ئەوانیش جنێو بەدایکو باوکی بدەنەوە, ئەوا ئەو کەسە بەسەرکەشو نا گوێڕایەڵ بەرامبەر دایکو باوکی ناوی تۆمار دەکرێت, بالەکاتی ژیانی دایکو باوکیاندا بۆشیان باش بووبنو گوێڕایەڵیان بووبن.

کەواتە: دەبێ چۆن تا باوکو دایك لەژیاندان ئاگامان لێیان بێ, بەهەمان شێوەش دوای وەفاتو لەدونیا دەرچوونیان" کارێك نەکەین کەرۆحیان ئازار بدرێ .

بەرێزان: هەمو ئەو کەسانەی کە لەدنیادا ئازاری دڵی دایکو باوکیان داوە بێگومان رۆژێك کەدایکو باوکی وەفاتیان کردو لەدونیا دەرچوون, ئەوجا هەست دەکات چ تاوانێکی بەرامبەر کردوونو ئەو کاتە پەنجەی پەشیمانی دەگەزن, بەڵام ئایا تازە ئینسان هیچی بۆ دەکرێ بۆ ئەوەی دڵی دایکو باوکی ئاشت بکاتەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە گوێ لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا بگرن. خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إنَّ الرَّجُلَ یَموتُ والِداهُ أوْ أحَدُهُما, وَإنَّهُ لَعاقٌ لَهُما, فَما یَزالُ یَدعو لَهُما

وَيَسْتَغْفِرُ لَهُما حَتَّى يَكْتُبُهُ اللهُ بَرّاً) (رواهُ إبن عَساكر).

واته: بەڕاستی پیاوی وا هەیە دایكو باوكی" یان یەكێكیان دەمرێو ئەمیش لەژیانیاندا دڵی رەنجاندوون، بەڵام زۆر خۆی بەتاوانبار دەزانێو تەوبە دەكاو ئەوەندە لەخوا دەپاڕێتەوە كە لەدایكو باوكی خۆش بێ خوای گەورە ناوی ئەو كەسە لەخراپەكار لەگەڵ دایكو باوكەوە دەگۆڕێ بۆ چاكەكار لەگەڵ دایكو باوك.

**پێنجەم:** لەمافەكانی دایكو باوك دوای مردنیان ئەوەیە: ئەگەر رۆژوو قەرزار بوون" رۆژووەكانیان بۆ بگرێتەوە، بەمەرجێ ئەو كەسەی كە لەجیاتی دایكو باوكی بەرۆژوو دەبێ" خۆی قەرزاری رۆژوو نەبێ. ئافرەتێك لەپێغەمبەری خوای پرسی: دایكم مردووەو رۆژووی دوو مانگی لەسەرە، چی بۆ بكەم؟ پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرمووی: (صُومِي عَنْها)، واتە: لەبری ئەو بەرۆژوو بە. (رَواهُ الحاكم)

**شەشەم:** لەمافەكانی دایكو باوك دوای مردنیان ئەوەیە: سەردانی ئەو كەسانە بكەی كە لەكاتی خۆیدا دۆستو برادەرو خۆشەویستی باوكو دایكت بوون، وەیارمەتییان بدەیو چاكەیان لەگەڵدا بكەی.

ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خوای لێبێت) لەعەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) گێڕاویەتیەوە كەعەبدوڵڵا عادەتی وابوو ئەگەر بڕۆیشتایە لـەمەدینـەوە بەرەو مەككە، گوێدرێژێكی هەبوو، كاتێ كە لەسواری حوشتر بێزار ببوایە، سواری گوێدرێژەكە دەبوو. هەروەها مێزەرێكیشی هەبوو" لەسەری دەبەست، رۆژێكیان كە لەرێگادا سواری گوێدرێژەكەی بوبوو، تووشی پیاوێكی دەشتەكی بوو، سەلامی لێ كردو پێی گوت: ئەرێ تۆ كوڕی فلان كەس نیت؟ كابرا گوتی: بەڵێ كوڕی ئەوم. عەبدوڵڵا لەگوێدرێژەكەی دابەزیو فەرموی: وەرە سواری ئەم گوێدرێژە ببەو ئەم مێزەرە لەسەر ببەستە! بەڵێ كابرا لەبەر ئەوەی لەو دەشتو بیابانە زۆر بەپێ رۆیشتبوو و زۆر ماندوبوو، بەخۆشحاڵییەوە سواری گوێدرێژەكەبوو و مێزەرەكەشی لەسەر بەست، هەندێ لەبرادەرەكانی عەبدوڵڵا لۆمەیان كردو پێیان گوت: خوا عەفوت كا، ئەم كابرا دەشتەكییە چییە وا بەو شێوەیە رێزت لێگرتو بۆ خۆت بەپێ دەڕۆیو گوێدرێژەكەت دا بەو سواری بێ، خۆت سەرت رووت كردوەو مێزەرەكەت دا بەو تا سەری پێ ببەستێ؟!

عەبدوڵلا فەرموی: من لەبەر خاتری ئەو فەرموودەیەی حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ئەمەم کرد" کەخۆم لەدەمی پیرۆزیەوە گویّم لێبوو، فەرمووی: (إنَّ مِنْ أبَرِّ البِرِّ صِلَةُ الرَّجُلِ أهْلَ وُدِّ أبيهِ بَعْدَ أنْ يُوَلّي).

واتە: چاکترین چاکە ئەوەیە کەپیاو کەسوکارو ئاشناو دۆستو برادەری باوکی خۆی بەسەربکاتەوە دوای مردنی باوکی، ئینجا فەرمووی: (إنَّ أبا هذا كانَ وُداً لعُمَرَ بْنِ الْخَطّابِ)، باوکی ئەو کابرایەش دۆستی عەمەری باوکم بوو!

بەڕاستی ئەوەیە وەفاداری بەرامبەر بەباوک، کەنەك دۆستەکەی باوکی بەڵکو کوڕی دۆستەکەی باوکیشی بەسەرکردۆتەوەو ئەوپەڕی حورمەتو ڕێزی لێگرتووە، کەئەمەش تەنهاو تەنها بەپەروەردەی ئیسلامی دەبێ، کەئاوا ئینسان نەك باوکی لەبیرناچێتەوە، بەڵکو وەفاداریش دەبێ بەرامبەر دۆستەکانی باوکیشی.

هەروەها (ئبن حەببان)یش لەصەحیحەکەیدا، لە(ئەبو بەردەوە) گێڕاویێتیەوە کەفەرموویەتی: چووم بۆ شاری مەدینە، لەوێ عەبدوڵلای کوڕی عومەر هات بۆ لامو فەرمووی: دەزانی لەبەرچی هاتووم بۆ لات؟ گوتم: نەخێر، فەرمووی: لەبەرئەوەی گویّم لەپێغەمبەری خـــــــوابوو دەیفەرمــــوو: ( مَــنْ أحَـبَّ أنْ يَصِلَ أباهُ في قَبْرِهِ فَلْيَصِلْ إخْـــوانَ أبيهِ بَعْدَهُ)، واتە: هەرکەسێ پێی خۆشە لەناو قەبردا سیلەی رەحمی باوکی بەجێ بێنێو باوکی دڵخۆش بکا باسەردانی دۆستو برادەرەکانی باوکی بکا دوای وەفاتی باوکی، منیش بیرم کردەوە کە لەنێوان باوکی من" کەعومەرەو باوکی تۆدا" برایەتیو دۆستایەتییەکی پتەوو بەهێز هەبوو، منیش حەزم کرد ئەو فەرموودەیەی حەزرەتی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم جێبەجێ بکەمو ڕۆحی باوکم لەقەبرەکەیدا شادبکەم بەوەی کەسەردانی کوڕی برادەرو دۆستێکی خۆشەویستیم کردوە!

جا خۆشەویستانم: زۆر ئاگاتان لەدۆستو خۆشەویستانی باوکتان بێ، دوای مردنی باوکتان بەردەوام هاتوچۆیان بکەن، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم فەرموویەتی: (إحْفَظْ وُدَّ أبيكَ، لا تَقْطَعْهُ فَيُطْفِيءُ اللهُ نُورَكَ)(رَواهُ الطَبَراني).

واتە: دۆستایەتی باوکت بپارێزەو مەیپچڕێنە، چونکە ئەگەر پچڕاندت خواش ڕووناکیت دەکوژێنێتەوە.

ئیماندارانی بەڕێز: لەگەڵ ئەوەدا کەخوای گەورە گوێڕایەڵی دایكو باوکی فەرز کردوە، بەڵام ئەگەر دایكو باوك ویستیان ئەم فەرزە بقۆزنەوە بۆ شتێك کەخوای گەورە فەرمانی پێ نەکردبێت، یان قەدەغەی کردبێت، بۆ نمونە: باوکێك بەکوڕەکەی بڵێ وەرە عەرەق بخۆرەوە، یان نوێژ مەکەو بەقسەم بکە، چونکە خوا ئەمری کردوە ئەولاد بەگوێی دایكو باوکی بکات، لەم کاتەدا خوای گەورە مۆڵەتی داوە بەکوڕو کچی موسوڵمان کەبەگوێی دایكو باوکیان نەکەن کاتێ شتێکیان لێ داواکردن کەبێفەرمانی خوای گەورەی تێدابێ، وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لا طاعَةَ لِبَشَرٍ في مَعْصِيَةِ الله، إنَّما الطَّاعَةُ في الْمَعْروفِ)(رَواهُ البُخاري وَمُسلِم)، واتە: گوێڕایەڵبوونو گوێڕایەڵی بۆ هیچ ئینسانێك ناکرێ لەشتێکدا کەسەرپێچیی خوای گەورەی تێدابێت، بەڵکو گوێڕایەڵی بوون لەشتی چاکدایە.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خوای لێبێت)، باسی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کاتێ کەموسڵمان بووم، دایکم سوێندی خوارد کەهەتا ماوم قسەم لەگەڵدا ناکاتو خواردنو خواردنەوەش ناخوات تاوەکو لەدینی ئیسلام پەشیمان نەبمەوە..

هەروەها پێی گوتم: ئەی سەعد تۆ دەڵێی ئەم دینی ئیسلامەی من بڕوام پێی هێناوە، ئامۆژگاریمان دەکات کەبۆ دایكو باوکمان باش بین، دەی ڕۆڵە خۆ من دایکتمو ئەمرت پێدەکەم کەواز لەدینی محەمەد بهێنی، دە وەرە بەقسەم بکە. سەعد دەفەرموێ: دایکم ماوەی سێ شەوو ڕۆژ نەنانی خواردو نەئاو تاوەکو لەبێهێزیو برسیەتیدا بووڕایەوە، تا ئەوەبوو براکەم کەناوی (عەممارە)بوو، ئاوی بەزۆر پێ خواردەوەو هۆشی هاتەوە سەر خۆی، ئەمجا دەستی کرد بەدوعاکردن لێم. منیش نەمدەزانی بڵێم چی، ئەوە دایکمەو دەڵێ دەبێ واز لەئیسلام بێنی، خواش ئەمری بەئیمانداران کردووە بەگوێی دایكو باوکیان بکەن، ئایا من چی بکەم؟! سەعد دەفەرموێ: لەم کاتانەدا بوو کەخوای گەورە ئەم ئایەتانەی قورئانی پیرۆزی بۆ پێغەمبەری خوا نارد" کەدەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا الْأِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً وَإِنْ جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾(العنكبوت 8)، واتە: ئێمە ئامۆژگاریی ئادەمیزادمان کردوە بەوەی کەچاك ڕەفتار بن لەگــەڵ دایكو باوکیاندا، بەڵام ئەگەر دایكو باوکت زۆریان لێکردیت تا

هاوەڵو هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت ئەوا مل کەچیان مەبەو بەگوێیان مەکە, دڵنیابن کەگەڕانەوەتان بۆلای منە, ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کەئەنجامتانداوە.

هەروەها خـوای گـەورە فـەرمـووی: ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَـــا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ﴾ (لقمان15).

واتە ئەگەر دایکو باوکت کۆششیان لەگەڵتدا کرد تا بەبێ هیچ بەڵگەو زانیارییەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت, ئەوا بەقسەیان مەکە, بەڵام ئاگاداربە ﴿ وصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً ﴾, بەڵام لەدنیادا بۆ کاروباری دنیایی هاوڕێو هاوەڵو خزمەتگوزارێکی چاکبە بۆیان (لەهەموو بارودۆخێکدا).

بەڵێ ئەمە بەرنامەی ئیسلامە بۆ پەروەردەی ئینسان کەدەبێ دوو شت تێکەڵ نەکرێن: لایەنی بیرو باوەڕو عەقیدە دەبێ لەپێش هەموشتێکەوە بێو بۆ هیچ کەسێكو لـــەبەر خـــاتـــری دڵی هیچ کـەسێك وازی لێ ناهێنرێ, بەڵام لایەنی پەیوەندیی نێوان باوكو دایكو نەوە جیاوازی ئاینو بیرو باوەڕ نابێتە ڕێگر لەبەردەم چاکەکردنی ئینسان لەگەڵ دایكو باوکیدا, وەکو ئایەتەکە فەرمووی: ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً ﴾, وە لەمەیدانی کردەوەشدا ئەم حەقیقەتە جێبەجێکراوە, هەروەکو لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە کەئەسمائی کچی حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرموێ: لەصوڵحی حودەیبیەدا, کاتێ کەکافرەکانی قورەیش پەیمانی شەڕ وەستاندنیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا مۆر کرد, دایکم کەتا ئەو کاتە بێباوەڕ بوو" هات بۆ سەردانم بۆ مەدینە, منیش گوتم: دایە گیان تۆ کافرو بێ بڕوای, منیش موسڵمانو ئیماندارم, ناتوانم پێشوازیت بکەمو خزمەتت بکەم تاوەکو پرس بەپێغەمبەری خوا نەکەم. ئەوەبوو چوومە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا, دایکم هاتووە بۆ لامو بێ باوەڕو موشریکە, بەنیازیشە دەستگیرۆیی بکەمو یارمەتی بدەم, جا ئایا دروستەو خواو پێغەمبەری خوا ڕێگا دەدەن کۆمەکی بکەمو خزمەتی بکەم, لەکاتێکدا دایکم بێ باوەڕە؟! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی (نَعَمْ صلي أُمَّكِ) بەڵێ, سیلەی ڕەحمی دایکت بەجێ بهێنەو خزمەتی بکـــەو یارمەتیبدە. لەهـــەمان کاتدا دەبێ ئینسان

لەگەڵ دایکو باوکی بێباوەڕو کافردا لەهەوڵی ئەوەدا بێ کەقەناعەتیان پێبکاو هانیان بدا بۆ ئیمان هێنان بەخواو بەپێغەمبەری خوا, بەلاّم لەم بانگ کردنەدا دەبێ ئەوپەڕی پەرۆشیو سۆزو بەزەییو ڕێزو زمانی شیرین بەکاربهێنێ, وەکو حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيهِ السَّلام) کەکاتێ داوای لەباوکی کرد کەئیمان بێنێ" فەرمووی: (يا أبَتِ), کەئەم بانگ کردنە زۆری فەرقە لەگەڵ (يا أبي) چونکە (يا أبي) واتە: ئەی باوکی خۆم, بەلاّم (يا أبَتِ) واتە: ئەی باوکی بەڕێزم, ئەی باوکی ئازیزم, ئەی باوکی خۆشەویستم. بەم شێوازە جوانە بانگی باوکی کرد بۆ لای خواو دینی خوا, کە بەڕاستی دەبێ گەنجە موسڵمانەکان زۆر ئاگایان لەم بابەتە بێو لەکاتی قسەکردنو هەڵسوکەوت لەگەڵ دایکو باوکیاندا" کەبیروباوەڕێکی دژ بەئیسلامیان هەیە, ئەوپەڕی حورمەتو ڕێزو وشەی جوان بەکاربێنن, نەك بەناوی ئەوەی کەباوکیان" یان دایکیان دژی ئیسلامە" ئیتر بەلایاندا نەچنو مەرحەبایان نەکەنو قسە بەبیروباوەڕەکەیان بڵێنو ئەوەندەیتر بەڕەفتاری ناشیرینو قسەی زبر ئیسلامیان لەبەرچاو بخەن.

خۆشەویستان: بەسە بۆ گەورەیی مافیدایکو باوك, کە لەئاینی ئیسلامدا چەند یاسایەك بۆ دایکو باوك تێك دەدرێو شمولی ئەوان ناکات. بۆنموونە: هەرکەسێك" کەسێك بەناحەق بکوژێ, ئەوا دەبێ بکوژرێتەوە, بەلاّم ئەگەر باوك ئەولادی خۆی بکوژێ" با بەعەمدیش بێ ئەوا هەرچەندە بەقاتیل حیسابەو گوناهی کوشتنی ناحەقی لەسەر دەنووسرێ, بەلاّم لەدادگای ئیسلامدا حوکمی کوشتنەوەی بەسەردا نادرێ, بەلاّم ئەگەر ئەولاد دایکو باوکی بکوژێ, دەبێ بکوژرێتەوە.

هەروەها لەئاینی ئیسلامدا چەسپاوە, ئەگەر کەسێك دیاری یان شتێکی بەکەسێك بەخشی بۆی نیە لێی پەشیمان ببێتەوەو لێی وەربگرێتەوە. بەلاّم ئەم یاسایە لەنێوان باوکو ڕۆڵەدا کاری پێناکرێو هەرکاتێ باوك شتێکی بەکوڕێکی بەخشی یان دیارییەکی پێشکەش کرد ئەوا هەر وەختێ حەزی لێ بێ دروستە لێی پەشیمان بێتەوە, هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أنْ يُعْطي عَطيَّةً أوْ يَهَبَ هِبَّةً, ثُمَّ يَرْجِعُها فيها إلاّ الْوالِدُ فيما يُعْطي وَلَدَهُ, وَمَثَلُ الَّذي يُعْطي الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فيها" كَمَثَلِ الْكَلْبِ فَإذا شَبِعَ قاءَ ثُمَّ يَعُودُ في قَيْئِه), (رَواهُ التُّرمذي).

واتە: دروست نىيەو حەلاڵ نىيە بۆ كەسێك كەشتێك ببەخشێ يان بيكاتە دياری، پاشتر لێی پەشيمان ببێتەوە تەنها باوك نەبێت كەبۆی هەيە پەشيمان ببێتەوە لەوەی كەبەخشيوێتی بەمنداڵەكەی خۆی، وێنەی ئەو كەسەش كەشتێك دەبەخشێتو لێی پاشگەز دەبێتەوە، وەك سەگ وايە كەهەر دەخوات ئينجا كەتەواو تێر بوو دەڕشێتەوە، پاشان دێتەوەو ڕشانەوەكەی خۆی دەخوات.

موسڵمانانی بەڕێز: بەڕاستی دايكو باوك هەروەكو لەسەرەتاوە مايەی ڕەحمەتو بەرەكەت بوون بۆ ڕۆڵەكانيانو بوونو گەورەبونو پێگەياندنی ئەولاد دەگەڕێتەوە بۆ دايكو باوكی، بەهەمان شێوەو بگرە زۆر زياتريش لەكاتی بەساڵداچوونی دايكو باوكو بێهێزیو لاوازيدا، ئەو كاتەی چاوەڕوانی ئەوەن كەمێك پاداشتی ئەو هەموو ماندوبوونو ڕەنجەی لەگەڵ ڕۆڵەكانيان داويانە" وەربگرنەوە، لەم كاتەدا دايكو باوك نەك هەر بارگرانیو ئەرك نين لەسەر ڕۆڵەكانيان، بەڵكو زياتر مايەی بوونی بەرەكەتن لەماڵەكاندا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمُرِهِ، وَيَزْدادَ فِي رِزْقِهِ فَلْيَبَرَّ والِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رحِمَهُ)(رَواهُ أحمَد)، واتە: هەركەسێك پێی خۆشە كەتەمەنی درێژ بێتو ڕزقوڕۆزی زۆر بێت، با چاك بێت لەگەڵ دايكو باوكيداو سيلەی ڕەحمو خزمايەتی بەجێبهێنێت. كەواتە: چاكەكردن لەگەڵ دايكو باوكدا مايەی ئاسوودەبوونی ژيانو بەرەكەتی تەمەنو زۆربوونی ڕزقوڕۆزين.

بەڵێ ئازيزان" هەتا ئينسان لەچاكەكردن لەگەڵ دايكو باوكيدا دڵسۆزتر بێو زياتر مەبەستی ڕەزامەندیی خوا بێ ئەوا لەدنياو دواڕۆژدا پاداشتی گەورەترو زياترە، وەدەبێتە مايەی ڕزگاربوونی ئينسان لەتەنگوچەڵەمەكانی ژيانو لەكاتە تاريكە قەترانیيەكاندا لەو كاتەدا كەئينسانی تێدا دەكەوێتە تەنگانەيەكی واوە هەموو دەرگاكانی لەسەر دادەخرێنو دەگاتە دوا هەناسەكانی، لەو كاتەدا كەغەيری دەرگای (الله) هەموو دەرگاكانیتری بەڕوودا دادەخرێن، ئەوا پاداشتی چاكەكردن لەگەڵ دايكو باوكدا دەبێت بەمايەی ڕزگاربوونیو خوای گەورە دەرووی لێدەكاتەوە.

جا خۆشەويستان، بۆ زياتر دڵنيابوون لەم حەقيقەتە، با گوێ لەسەرداری پێغەمبەران، تاجی سەرو نووری چاومان حەزرەتی محەمەد المصطفى بگرينو بەڵام پێش

ئەوەی ئەو سالاری دنیاو دینە ڕووداوەکەمان بۆ بگێڕێتەوە, با هەریەکەمان لەئاستی خۆیەوە بڵێ: اللّٰهُمَّ صَلِّي عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّد وَعَلى آله وصَحْبِهِ وَسَلِّم ..

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ: جارێکیان سێ کەس لەئوممەتانی پێشوو بۆ کاروکاسپیو پەیداکردنی بژێوی ژیانیان لەماڵ چوونە دەرەوە تا تەواو لەئاوایی دوورکەوتنەوە. دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ, باران دایکردو ئەوانیش بۆ ئەوەی بارانەکە تەڕیان نەکاو هەر بۆ ئەوەی شەویش لەدەرەوە نەبن" لایان دایە لاپاڵی شاخێك کە ئەشکەوتێکی تێدابوو. چوونە ناو ئەشکەوتەکەوەو هێشتا تەواو پشوویان نەدابوو, کەتاشەبەردێکی گەورە لەکێوەکەوە کەوتە خوارەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی گرتو ناو ئەشکەوتەکەی ئەوەندەیتر تاریك کرد. هەرسێکیان پاڵیان بەبەردە گەورەکەوە نا, بەڵام هیچ جووڵەیان بۆ پێنەکرا, جا کەهیچ ئومێدو هیوایەکیان نەما کەبتوانن بەردەکە لاببەن, یان کەسێك بەو شوێنەدا بێو هاواریان بەرێتە دەرەوە, چونکە زۆر لەرێگاکە دوورکەوتبوونەوە دانیشتنو لەنێوان خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ قسەیان هاتە سەر ئەوە کەهیچ شتێ لەم ناو ئەشکەوتە تاریکەدا ڕزگاریان ناکاتو ئەم بەردەیان بۆ لانابات, تەنها بەوە نەبێ کەبەو کردەوە چاکانەی کە لەبەر خاتری خوا پێشتر کردوویانە" لەخوا بپاڕێنەوە بەئومێدی ئەوەی کەخوا دەرگایەکی رەحمەتیان لێ بکاتەوە. یەکێکیان گوتی: خوایە خۆت عالمی من دایكو باوکێکی پیرم هەبوو, ئیشم شوانی بوو, هەمو ئێواران کەدەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە, بەدەستی خۆم شیری مەڕەکانم بۆ دەدۆشینو هیچ کەس لەماڵو منداڵم پێش دایكو باوکم لەو شیرەیان نەدەخوارد, ئەمجا کەئەوان تێریان دەخوارد, ماڵو منداڵم دەستیان دەکرد بەخواردن, تا ڕۆژێکیان بەهۆی گەڕان بەدوای لەوەڕی باشدا زۆر دوورکەوتمەوەو وەختێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە شەو داهاتبوو, بەپەلە شیرم بۆ دۆشینو بۆم بردن, بەڵام تا من گەیشتمە لایان, سەیر دەکەم خەویان لێکەوتووە. حەزم نەکرد خەبەریان بکەمەوە چونکە لەخەوێکی خۆشدا بوون, گوتم: چاوەڕێیان دەکەم تا لە خەو هەڵدەستن. خوایە خۆت ئاگاداری من ئەو ڕۆژە لەهەموو ڕۆژێك ماندووتر بووم, بەڵام بەپێوە شیرەکەم بەدەستەوەبوو, لەسەر سەریان وەستامو منداڵەکانیشم لەقاچوقولم ئاڵابوون داوای قاپە شیرەکەیان دەکردو لەبرسا دەکڕووزانەوە,

هەتا بانگی بەیانی من بەسەر سەریانەوە وەستامو شیرەکەم نەدا بەمنداڵەکانم لەکاتێکدا جەرگم بۆیان دەکوڵا, تا بەیانی کەدایكو باوکم خەبەریان بۆوە ئەمجا شیرەکەم دانێو تێرم کردن. خوایە ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکی بەرەحمەتمان لێبکەرەوەو ئەم بەردەمان بۆ لادە. بەئەمری خوا بەردەکە لەجێگای خۆی جووڵا, بەڵام هێشتا نەیاندەتوانی لێی بێنە دەرەوە!

دووەم کەسیان گوتی: خوایە خۆت ئاگاداری کەمن کچە مامێکم هەبوو, خۆشەویستترین کەس بوو لەلام, ئەوپەڕی خۆشەویستیی پیاو چەندە بۆ ئافرەت“ ئەوەندەم خۆشدەویست, ڕۆژێکیان داوای ئیشی ناشەرعیم لێکرد, بەڵام ئەو خۆی بەدەستەوە نەداو وەڵامی نەدامەوە. ڕۆژانو ساڵان هاتنو چوون, هەتا ساڵێکیان کەخەڵکی تووشی گرانیو قاتوقڕی بوون“ ئەو کچە مامەم لەبەر برسیەتیو نەبوونی هات بۆ لام, چونکە لەو کاتەدا من دەست ڕۆیشتوو و هەبوو بووم. هات بۆ لامو داوای یارمەتیی لێکردم, منیش سەدو بیست دینارم پێدا بەو مەرجەی خۆیم بدات بەدەستەوە, بەناچاریو لەبەر نەبوونیونەداری قبوولی کرد. جا کاتێ دەستم لێی گیربوو لەنێوان قاچەکانیدا دانیشتم, هاوارێکی کردو گوتی: لەخوا بترسەو ئەو مۆرە بەناهەق مەشکێنە. منیش ترسی خوا هاتە دڵمەوەو لەترسی خوا وازم لێهێنا ئەگەرچی خۆشەویستترین کەسیش بوو لەلام, پارەکەشم لێ وەرنەگرتەوە. جا خوایە گیان, ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکە. ئەمجارەشیان بەردەکە جووڵا, بەڵام هێشتا نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە.

سێیەم کەسیش گوتی: خوایە خۆت دەزانی کەمن جارێکیان چەند کرێکارێکم بەکرێ گرت, کەئیشەکەیان تەواوکرد کرێی هەموویانم دا, تەنها یەکێکیان نەبێ کەکرێیەکەی خۆی وەرنەگرتو خۆی تووڕەکردو ڕۆیشت, منیش کرێی ئەو ڕۆژەیم بۆ خستە معامەلەو ئیشەوە, هەتا بوو بەماڵو دارایییەکی زۆر ماوەیەکی زۆری پێچوو, ڕۆژێکیان کرێکارەکە هاتەوەو گوتی: ئەی عەبدی خوا, کرێیەکەی ئەو ڕۆژەم لەلاتەو بمدەیە ,منیش گوتم: کاکە گیان, ئەوەی دەیبینی لەحوشترو گاگەلو مەڕ“ هەمووی بەرهەمی کرێی ئەو ڕۆژە کرێکارییەی تۆن, فەرموو بۆ خۆت بیانبە! گوتی: تکایە گاڵتەم پێ مەکە. منیش گوتم:

بەخوا گاڵتەت پێناکەمو بەڕاستمە. جا کەدڵنیابوو کەگاڵتەی لەگەڵدا ناکەم, هات ئەو هەموو مەڕوماڵاتەی پێش خۆی داو بردیو هیچی لێ بەجێنەهێشت. جا ئەی خوایە" ئەگەر ئەوەم لەپێناوی ڕەزامەندیی تۆدا کردووە ئەوا دەرووبەکمان لێ بکەرەوەو لەم تەنگانەیە رزگارمان بکە. ئەمجارەیان بەردەکە بەتەواوی لاچوو و هەرسێکیان هاتنە دەرەوەو ڕزگاریان بوو.

بەڵێ موسڵمانان, هەرکەسێك بەدڵسۆزیو بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە چاکە لەگەڵ دایكو باوکیدا بکات ئەوا خوای گەورە لەهەموو تەنگانەیەك رزگاری دەکات.

مامۆستا سەعیدی نەوڕەسی (رەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: برایەکی قیامەتیم هەبوو ناوی (خوللوصی مصطفی)بوو, کەسەرنجم دەدا ئەم پیاوە لەکاروباری دینو دنیایدا لەهەردووکیاندا سەرکەوتووبوو, منیش نهێنی ئەمەم نەدەزانی, پاشان هۆی سەرکەوتنەکەیم زانی کەئەمەیە: ئەم پیاوە صاڵحە مافی دایكو باوکی پێدەزانیو زۆر بەچاکیش ئەو مافانەی دەپاراست, ئیتر ئەوەبوو بەبەرەکەتی ناوچەوانی ئەوانەوە حەسانەوەو ڕەحمەتی خوایی دەستگیر بوبوو. هیوادارم قیامەتەکەیشی ئینشائەللا ئاوا ئاوەدان کردبێتەوە.

لەکۆتایی ئەم وتارەشدا, لەخوای گەورەو باڵادەست دەپاڕێمەوە: یارەبی خوایە لەگوناهی هەموو ئەو دایكو باوکانە خۆش بی کەدونیایان بەجێهێشتووەو لەناو جیهانی بەرزەخدا دەژین, خوایە لەعەزابی قەبر بیانپارێزە, ئەو دایكو باوکانەش کە لەژیاندا ماون خوایە لەشیان ساغ بکەی, دڵخۆشیان بکەی, زەلیلی سەر جێگایان نەکەی, عاقیبەتی ئێمەو ئەوانیش خێر بکەی..

اللَّهُمَّ آمین

# وتـارى نۆيەم

## مافى دايكو باوك

### بەشى چوارەم

قالَ اللہ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ﴾ ( الأحزاب 4 )

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم

( إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهاتِ, وَوَأْدَ الْبَناتِ, وَمَنْعاً وَهاتِ, وكَرِهَ لَكُمْ قيلَ وَقَالَ, وكَثْرَةَ السُّؤالِ, وَإِضاعَةَ الْمالِ )

( رَواهُ البُخاري )

**الحمدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِهِ أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی خۆشەویستو بەڕێز, سەلامو رەحمەتی خوا لەئێمەو لەهەموو ئیماندارانی ئومەتی مُحَمَّد الْمُصْطَفى بێ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, رەحمەتو لێخۆشبوونی خوا برژێت بەسەر ئێمەو دایكو باوكەكاندا ئەوانەی زیندوون وەئەوانەشیان كە بەڕەحمەتی خوا شاد بوون ئینشائەڵڵا.

خۆشەویستان: لەسێ وتاری ڕابردوودا باسی چاكەكردنمان بۆ كردن لەگەڵ دایكو باوكدا, چ لەكاتی ژیانیاندا چ لەدوای وەفاتیان, وەبەرهەمی ئەو چاكەكردنەشمان باسكرد كە لەدنیاو پاشەڕۆژدا بۆ ئەولادی مەردو چاكو بەوەفاو دڵسۆز لەگەڵ دایكو باوكدادانراوە.

پشتیوان بەخوای گەورە لەم وتارەشدا باسی خراپەكردنو دڵ ئازاردانی دایكو باوك دەكەین, لەبەرئەوەی ئێستا ئێمە لەزەمانێكدا دەژین كە بەڕاستی دەتوانین بڵێین: ئەوانەی ئازاری دڵی دایكو باوكیان دەدەن زۆر زیاترن لەو كەسانەی كەدڵیان رادەگرن. جا ئەم وتارە ئینشائەڵڵا " با ببێتە بەبیرهێنانەوەو بەخۆداچوونەوەیەك بۆ ئێمەو بۆ هەموو ئەو كەسانەش كەتا ئەم كاتەش باش نەبوون لەگەڵ دایكو باوكیاندا, ئینشائەڵڵا ئەم بابەتە ببێتە مایەی تەوبەكردنیانو ئاشت كردنەوەی دڵی عاجزبووی دایكو باوكیان.

ئازیزان: مافی دایكو باوك بەسەر نەوەو ڕۆڵەی خۆیەوە ئەوەندە گەورەیە كە بەڕاستی زمان لەئاستی باسكردنی دەوەستێو قەڵەم ناتوانێ حەقی خۆی بداتێ, بەسە بۆ گەورەیی مافی دایكو باوك كە بەهیچ شێوەیەك لەئاینی ئیسلامدا رێگەنەدراوە كەمنداڵێك ناوو نەژادی خۆی لەباوكو دایكی خۆی دابڕێ, یان خەڵكانێك دایبڕنو بیكەن بەمنداڵو نەژادی كەسێكی تر, تەنانەت ئەگەر ئەو كەسە گەورەترین خەڵقی خواش بێ كەحەزرەتی محەمەدە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, هەروەكو ئەوەی كەئاینی ئیسلام باسای (التَّبَنِّي) واتە (بەكوڕكردن)ی هەڵوەشاندەوە, چونكە پێش ئاینی پیرۆزی ئیسلام, كەسانێك منداڵی كەسێكیان وەردەگرت, یان منداڵی وا بو لەشەڕدا دەگیراو دەكرا بەبەندەو كۆیلە, پاشان ئەو كەسەی كەمنداڵەكەی دەكڕیو ئازادی دەكرد منداڵەكەی

دەكرد بەئەولادی خۆیو خەڵكی بەناوی ئە كەسەوە بانگیان دەكرد, كەفلان كەس كوڕی فلان كەسەو لەڕاستیشدا كوڕی ئەوان نەبوو. با بچینە خزمەت قورئانی پیرۆزو ژیاننامەی پڕ بەرەكەتی حەزرەتی رَسُولُ اللهو بزانین ئیسلام چۆن باسی ئەم مەسەلەیە دەكات.

پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ببێتە پێغەمبەرو وەحی بۆ بێ" كوڕێك لەماڵی حەزرەتدا دەژیا كەناوی زەیدی كوڕی حاریثە بوو, ئەم كوڕە لەشەڕێكدا بەدیل گیرابوو, پاشان بەپێی یاسای ئەو سەردەمە كرابوو بەكۆیلەو بەندەو لەبازاڕدا دەفرۆشرا. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەبازاڕی بەندەفرۆشتنی مەككەدا ئەم كوڕەی كڕیەو بردیەوە بۆ ماڵەوە. ئەم (زەید)ە ئەوەندەی رێزو حورمەت لەلایەن پێغەمبەری خواو خاتوو خەدیجەی خێزانیەوە لێدەگیرا كەهەرگیز بەچاوی كۆیلەو خزمەتكار تەماشای نەدەكرا. بۆیە خەڵكی دەیانگوت خۆ زەید كۆیلە نیە لەماڵی محەمەددا, بەڵكو وەكو كوڕی ماڵیان وایە. بۆیە لەناو هەموو قورەیشدا بەزەیدی كوڕی حاریثە دەگوترا: زەیدی كوڕی محەمەد. ساڵان هاتنو ساڵان چوونو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وەحی بۆ هاتو یەكەم بەندە لەئیسلامدا كەئیمانی بەپێغەمبەری خوا هێنا زەیدی كوڕی حاریثە بوو. دوای ماوەیەك باوكو براو كەسوكاری زەید هاتنە مەككەو هەواڵی زەیدیان پرسیو دۆزییانەوە كە لەماڵی پێغەمبەری خوادایە, چوونە خزمەتی پێغەمبەرو داوایان لێكرد كەزەیدیان بداتەوەو لەجیاتی ئەو چەندی دەوێ پارەیان لێوەربگرێ, پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بانگی زەیدی كردو فەرمووی: ئەوە باوكو براو كەسوكارت هاتوون بەشوێنتدا, جا تۆ ئازادی لەگەڵیان دەڕۆیتەوە یان لای من دەمێنیتەوە, خۆت سەرپشكیە, زەید بەبێ دوودڵیو بیركردنەوە, فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا من ژیانی خزمەتی تۆ بەهیچ ژیانێكی تر ناگۆڕمەوەو هەرگیز ناتوانم لێت دوور بكەومەوە! بەم شێوەیە باوكو براو كەسوكارەكەی زەید بەدەستی بەتاڵی ڕۆیشتنەوەو ئیتر بەتەواوی ناوی زەید گۆڕا بەزەیدی كوڕی محمد.

چەند بەختەوەرییە ئینسان لەباوەشی پێغەمبەری خوادا گەورە بێو لەماڵێكدا بژی كەپەیتا پەیتا وەحی خوای تیا دێتە خوارو قورئانی تێدا نازڵ دەبێ. خۆ پێغەمبەری خوا بەنەصی قورئان لەهەموو ئیماندارێك لەپێشترە لەخۆی بۆ خۆی, وە خێزانە پاكو

بەڕێزەکانیشی دایکانی ئیماندارانن:﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾( الأحزاب 6).

کەچی لەگەڵ ئەم حەقیقەتە گەورەیەدا قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿ وما جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾(الأحزاب 4), واتە: ئەو کەسانەی کە بەقسەی خۆتان دەیکەن بەکوڕی خۆتان, خوا نەیکردوون بەکوڕتان, ئەوانە قسەیەکن کە بەزارتان دەیڵێن, خواش حەق ویژەو هەر ئەو ڕێبازی ڕاستو دروست نیشانی بەندەکانی دەدات: ﴿ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ ﴾( الأحزاب 5 ), واتە: ئەو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بەرنو بانگیان بکەن, ئەوە پەسەندە لای خوا..

بەڵێ, لەوکاتەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم ڕایگەیاند کەدەبێ بەزەید بگوترێ: زەیدی کوڕی حاریثە نەك زەیدی کوڕی محەمەد, لەبەر ئەوەی باوکی زەید حاریثەو لەپشتی ئەوەو هەڵگری سیفاتە بۆماوەییەکان (وراثي)و ڕەوشتو خووی باوکی خۆیەتیو نابێ بکرێ بەکوڕی کەسێکیتر با ئەو کەسە لەباوکیشی زۆر زۆر بۆی دڵسۆزتر بێ کە پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم.ئیتر لەو کاتەوە یاسای (التَّبَنِّي) بەکوڕکردنی منداڵی خەڵکی ـ لەئیسلامدا هەڵوەشایەوەو پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەچەند فەرموودەیەکدا تەئکید لەسەر ئەم حەقیقەتە نەگۆڕە دەکاتەوەو لەفەرموودەیەکدا کەبوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (لَيْس مِنْ رَجُلٍ إدَّعى بِغَيْرِ أبِيه" وَهُوَ يَعْلَمُ" إلاَّ كَفَرَ), واتە: هەر پیاوێك نەژادو نەسەبی خۆی بەکەسێکی تری جگە لەباوکی خۆی ببەستێو بشزانێ ئەو کەسە کەئەم خۆی کردووە بەکوڕی" لەڕاستیدا باوکی خۆی نیە, ئەوە ئەگەر بە حەڵاڵی بزانێ ئەوا کافر بووە ! !

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ إدَّعى إلى غَيْرِ أبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أنَّهُ غَيْرُ أبِيهِ" فَالْجَنَّةُ عَلَيْه حَرامٌ). واتە: هەرکەسێك خۆی بەنەژادی کەسێکی تری جگە لەباوکی خۆیەوە ببەستێو بشزانێ ئەو کەسە باوکی خۆی نیە" ئەوە بەهەشتی لێ حەرامە. لەفەرموودەیەکی تریشدا: (فَعَلَيْه لَعْنَةُ الله وَالْمَلائكَة وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ)(رَواهُما البُخاري وَمُسلِم).

واتە: ئەو کەسەی خۆی بکات بەکوڕی کەسێكو بشزانێ کە لەڕاستیدا ئەو کەسە باوکی نیە" ئەوە لەعنەتی خواو مەلائیکەو خەڵکی لەسەر بێ.

هەروەها دەربارەی درۆکردن لەبوونی نەژاددا" پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم دەفەرموێ: (أيُّما رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْه, إحْتَجَبَ اللهُ عَنْهُ وَفَضحَهُ عَلى رُؤوسِ الأَوَّلينَ وَالآخرينَ)(رَواهُ أبو داود), واتە: هەر پیاوێك بەمنداڵی خۆی بڵێ منداڵی من نی یەو و بشزانێ منداڵی خۆیەتی" ئەوە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا خۆی نیشان ناداو ڕووڕەشی دەکا لەبەرچاوی هەموو خەڵك.

لەکتێبی (ڕووناکی رَبِّ العالَمين, ڕوونکردنەوەی منهاج الطّالبين, ب 3, ل 229) دەفەرموێ: لەعنەتو هەڕەشەی ئەو حەدیسانە" ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە لەسەردەمی ئێستادا منداڵێك لەکەسێك وەردەگرن یان منداڵێك دەدۆزنەوە ئینجا لەبەڕێوەبەرایەتیی ڕەگەزنامەو ناسنامەدا نەژادی منداڵەکە بەخۆیانەوە دەبەستنو دەیکەنە کوڕی خۆیان, یان کچی خۆیان. جا بەهۆی ئەو تاوانە گەورەیە, پاشەڕۆژێکی پڕ ترسو ناشەرعیی چاوەڕوانی خێزانەکەو منداڵەکە دەکا, چونکە منداڵەکە بەحەرامی تێکەڵی ئەو خێزانە دەبێو بەناشەرعی میرات لەو خێزانە دەگرێو گشتیان دەبنە ماڵوێرانی ڕۆژی قیامەت.

کەوابوو, هەر ئێستا لەسەر ئەندامانی خێزانەکە واجبەو هەم هەرکاتێك منداڵەکەش بلووغی بوو" لەسەری واجبە بەپەلە خۆیان لەو گوناهە گەورەیە ڕزگار بکەنو ئەو نەژادە درۆزنە هەڵبوەشێننەوە نەوەك بەردەوام لەبەر لەعنەتی خوادا بمێننەوە.

خۆشەویستان: بۆمان دەرکەوت کە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە بۆ ئەو کەسانەی کەخۆیان منداڵیان نیەو منداڵی کەسێکیتر وەردەگرن بۆ بەخێوکردن, یان منداڵێك دەدۆزنەوەو لەگەڵ منداڵەکانی خۆیاندا بەخێوی دەکەن, دروست نییە هەویەو جنسیەیان بەناوی خۆیانەوە بۆ دەربێننو بیانکەن بەئەولادی خۆیان, لەبەر ئەوەی ئەو لایەنە یاساییە کەهەویەی بەناوی فلان کەسەوەیەو کوڕ یاخود کچی فلان کەسە, بەڵام لەڕوانگەی شەرعەوە بایەخی نیەو پێویستە بەزمانێکی خۆشو زۆر بەهێمنانە ئەو منداڵە حاڵیی بکرێ کەئەو" ئەولادی ڕاستەقینەی ئەوان نیە هەرچەندە وەکو منداڵی خۆیان ڕێزو

حورمەتی لای ئەم ماڵە هەیە.. لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم راستییە ئاشکرا نەکرێ ئەوا لەپاشەڕۆژدا ئەم منداڵە کەبلووغی بوو, دەستی بەدەستی بەناو دایکەکەی دەکەوێو بەدایکی خۆی دەزانێ, بەڵام لەڕووی شەرعییەوە دەستنوێژی لێی دەشکێو حەرامە دەستی بەدەستی بکەوێو بەتەنها لەگەڵیدا دانیشێ, وەئەگەر ئەم منداڵە کچ بێ, کوڕی ئەو ماڵە بەبرای خۆی دەزانێ, بەڵام وەکو گوتمان نامەحرەمن بەیەکتریو حەرامە تەماشای یەکتر بکەنو, دەستنوێژیان لەیەکتری دەشکێ با دڵیشیان بەرامبەر یەکتر وەکو خوشکو برای حەقیقی وابێ. هەروەها ئەگەر منداڵێك تەسکەرەی بەناوی کەسێکەوە بۆ دەربێت ئەوا لەڕووی یاساوە دەبێتە منداڵی ئەو کەسەو هەروەختێ ئەو کەسە مرد" ئەم منداڵە بەپێی یاسا میرات لەو ماڵە وەردەگرێو ئەمەش لەڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە حەرامەو زوڵمە لەمیراتگرە راستەقینەکان.

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: بەڕاستی بەخششو خەڵاتەکانی خوای گەورە کە بەخشیونی بەمرۆڤ زۆرنو لەژماردن نایەن, وەزۆرن ئەو خەڵاتو بەخششانەی کەزۆر جار بەسادەیی بەسەریاندا تێدەپەڕینو بیری لێناکەینەوە, بەڵام لەڕاستیدا زۆر گەورەو بەنرخن. یەکێ لەو خەڵاتو ڕێز لێنانە خواییانە بۆ ئینسان ئەوەیە کەئینسان ئەصڵو نەسەبی خۆی دەزانێو دەزانێ کوڕی کێیەو باوکو باپیری کێیەو خزمی کێیە, بەڕاستی هەر ئەو کەسانە هەست بەم خەڵاتە گەورەیە دەکەن کەنازانن باوکو دایکیان کێیە. ئەو کەسانە بەردەوام دەروونیان نائارامە, ئەو کەسانە هەرچەندە پاکو بەڕێز بن, کەچی لەبەرچاوی خەڵکیدا بەسووکی سەیر دەکرێنو خەڵکی لێیان نزیك نابێتەوە.

کەواتە: ئێمەی ئیماندار پێویستە بەردەوام سوپاسی خوای گەورە بکەین بۆ ئەو خەڵاتە گەورەیەی کەهەریەکێك لەئێمە نەژادو نەسەبو پشتی خۆی دەناسێو دەزانێ کێ باوكو دایكو خوشكو برایەتی, خوای گەورەش شەریعەتێکی ناردووە کەپارێزگاری لەشێواندنو تێکچوونی ئەو نەژادە دەکات.

بەڵێ ئازیزان: هەموو بەرەکەتی ئەم دینە پیرۆزەی ئیسلامە کەئێمە دەزانین کوڕی کێینو باوكو دایکمان کێیەو نەسەبو پشتمان کامەیە. دەی کەواتە: چۆن ئینسان دیفاع لەباوكو دایکیو بنەماڵەو هۆزو عەشرەتی خۆی دەکات, دەبێ زۆر لەوە زیاتر ئیسلامی

بەلاوە موقەدەسترو ئازیزتر بێو دیفاعی لێبکات، چونکە بەرهەمی ئەم دینە پاکەیە کە بەحەلاڵی ژنو پیاوێك پێك دەگەنو هەموو خەڵکی بەچاوی رێزو دوور لەتۆمەتی بەدرەوشتیەوە تەماشای ئەو خێزانە دەکەن، کەمنداڵیشیان بوو ئەم منداڵە دایكو باوکی خۆی دەناسێو لانەو باوەشێکی بەسۆزو ئارام چاوەڕێی دەکات.

جا با وەکو پێمان ناخۆشەو قبوڵی ناکەین تەعنەو تانە لەنەژادو دایكو باوکمان بدرێ دەبێ زۆر لەوە زیاتر غیرەتمان بجوولێو قبووڵ نەکەین کەس بەدەمی پیسی تانەوتەشەر لەئیسلامو شەریعەتی ئیسلام بدات، وە لێرەوە ئەو راستیەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کەهەر کەسێك دژایەتی ئیسلام بکاتو بەدینی ئیسلام رازی نەبێ ئەوە دیارە لەهەوڵی ئەوەدایە کەنەسەبو نەژادی ئینسانەکان بشێوێنێو ئیتر خوشكو برایەتیو دایكو باوكو ئەولادایەتیو رێزو حورمەتو کەرامەتی ئینسان نەمێنێ! وە ئەوەی دژی ئیسلام بێو رازی نەبێ بەوەی کەشەریعەتی ئیسلامی قانونو یاسای وڵات بێو کاری پێ بکرێ، ئەوە بێگومان بن دژی ئەوەشە کەکاتی خۆی دایكو باوکی بەنیکاحی ئیسلامی بەحەلاڵی بەیەك گەیشتبن، ئەوەش کەدژی مارەکردنی موسوڵمانانە بێ دەبێ کاتێ لەدایك دەبێ ڕەزیلترینو بێنرخترین ناوی لێ بندرێ کەشیاوی ئەوە نیە لێرەدا بیلێین!

ئەمە بریتی بوو لەخاڵی یەکەم، بەڵام خاڵی دووەم ئەوەیە: کاتێ کەسەیری شێوازی قورئان دەکەین کاتێ ئامۆژگاریمان دەکات لەبارەی دایكو باوکمانەوە، هەموو قورئان بخوێنەرەوە ئایەتێك نیە بفەرموێ: (لا تَعْتَدوا علی الْوالِدَیْنِ) یان بفەرموێ: (لا تُؤْذُوا الْوالِدَیْنِ)، ئازاری دایكو باوکتان مەدەن، بەڵکو قورئان مەسەلەی خراپەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا هەر باس ناکات، چونکە ئەوە شتێکی وایە کەهەر کەسێ ئینسانیەتی خۆی لەدەست نەدابێ بیر لەئازاردانی دایكو باوکی ناکاتەوە، بەڵکو قورئان یەکسەر فەرمان دەدات بەچاکەکردن لەگەڵیاندا. واتە" نەك هەر نابێ خراپەیان بەرامبەر بکرێ بەڵکو" دەبێ زۆر چاکیش بن لەگەڵیاندا، کەئەمەش بەڕاستی جێی سەرنجە. کاتێ دەچینە خزمەت قورئان، دەبینین لەپێنج جێگای قورئاندا بەژمارەی پێنج فەرزەی نوێژ خوای گەورە ئەمرو فەرمانی کردووە بەوەی کەئینسان لەخزمەتی دایكو باوکیدا بێو هەوڵی رازیکردنی دڵیان بدات. ئەمەش ئەو خاڵە گرنگەیە کەجیاوازی دەخاتە نێوان پەروەردەی

ئیسلامی‌و بەرنامە دەستکردەکانەوە.

وەکو گوتمان‌" ئیسلام نەك هەر فێری ئەوەمان دەکات کەخراپە لەگەڵ باوك‌و دایکماندا نەکەین بەڵکو" بەوە فەرمانمان پێدەکات کەدەبێ چاکەکار بین‌و لەخزمەتیاندا بین, بەڵام پەروەردەی غەیری ئیسلام" ئەگەر 100٪ سەرکەوتووبن ئەمجا دەتوانن ئنسانێك قەناعەت پێبکەن کەخراپە لەگەڵ دایك‌و باوکیدا نەکات, ئیتر مادام خراپەیان لەگەڵدا ناکەن ئەوا چاکەشیان لەگەڵدا نەکەن گرنگ نیە! بۆ زیاتر روونکردنەوە با سەرنج بدەین:

لەدەوڵەتە مادیە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆی دونیادا, کاتێك کەدایك‌و باوك پیر دەبن, پشتیان دەچەمێتەوەو دڵیان وەك منداڵ ناسك دەبێتەوە, ئەولادەکانیان, کوڕو کچەکانیان کەگەورەن‌و خاوەن خێزان‌و منداڵن‌و لەهیچ شتێك کەمیان نیە, خانووی گەورەو باش, پارەی زۆر, خواردنی هەمەجۆر لەبەردەستیاندایە, کەچی کاتێ دایك‌و باوکیان پیر دەبن ئامادە نین یەك رۆژ بەخێویان بکەن, بەڵکو دەیانبەن تەسلیمی ئەو بنکانەیان دەکەن کەبۆ بەخێوکردنی پیرو پەککەوتەکان دانراوە کەپێی دەڵێن (خانەی بەساڵداچوان). بەڵام ئایا ئەو شوێنە چۆنە؟ لەم خەڵوەتگای پیریەدا هەموو جۆرە خواردن‌و خواردنەوەو جێگایەکی ئیسراحەت هەیە, بەڵام لەلایەنی نەفسی‌و دەروونییەوە گۆڕستانی زیندوانە! ئینسانی بەساڵداچوو هەست دەکا پێش قەبری حەقیقی کەدوای مردنی دەچێتە ناوی هەر لەدونیادا لەو قەبرەدایە, لەبەر ئەوەی ئەو دایك‌و باوکە پیرە لەو خەڵوەتگای پیریەدا دابڕاوە لەکوڕو کچ‌و دۆست‌و رەفیق‌و دراوسێ. ئەو کەسەی کەڕۆژانە خزمەتیدەکات زۆر رەفتاری وشکەو بێسۆزە, تەنها وەکو کارمەندێك کەمووچە بەرامبەر خزمەتکردنی ئەو بەساڵداچوانە وەردەگرێت رەفتار دەکات.

خۆشەویستان: وا مەزانن کەئەو باوك‌و دایکانەی کەدەخرێنە ئەو شوێنانەوە کوڕو کچەکانیان دەستکورت‌و هەژارن, یان ئینسانی نەخوێندەوارو ناحاڵین.. نەخێر, بەڵکو زۆربەیان سەرمایەداری گەورەن‌و دەرچووی کۆلیجەکانن‌و شەهادەی بەرزیان هەیە, بەڵام چونکە لەسەر ئیسلام پەروەردە نەبوون, چونکە بڕوایان بەپاداشتی خوا نیە لەقیامەتدا, ئەوا وا تێگەیشتوون کەمافی دایك‌و باوك لەسەر ئەولاد هەر ئەوەندەیە کەخراپەی لەگەڵدا نەکات, کەلێی نەدات‌و قسەی ناشیرینی پێنەڵێ‌و نان‌و ئاوێکی بداتێ! خۆ ئەگەر جار

ناجارێك بیری دایكو باوكی كردەوە ئەوا دەچێ بۆ سەردانیان بۆ ئەو خەڵوەتگای پیرییەو چەند دەقیقەیەك لەو قەبرەی دونیادا تەماشایان دەكاتو لەژێر سەرنجی ووردی ژنو منداڵەكەیدا كە لەترسی ئەوان ناوێرێ زۆر قسەیان لەگەڵدا بكات, چەند دەقیقەیەك لایان دەمێنێتەوەو پاشان بەتەنها بەجێیان دێڵێ. بەم شێوەیە, ئەم باوكە, یان ئەم دایكە, چەندان شەو, بەو پیرییە نەخۆش بێ, كەس نیە بەلایەوە بێو دڵخۆشییەكی بداتەوە, تا سەرەنجام بەدڵتەنگیو كەساسییەوە دوور لەئەولادو خۆشەویستانی" سەردەنێتەوەو شارەوانی بەخاكی دەسپێرێ! ئەمە ئەگەر ئەولادەكەی باش بێ, بەڵام خۆ ئەگەر ئەولادێكی خراپ بێ, ئەوا هەر ناشیبات بۆ ئەو شوێنی بەساڵداچوانە بەڵكو فرێی دەداتە درەوەی ماڵو بەكەساسیەوە دەمرێت!

خۆشەویستان: فەرموون با بەچەند خاڵێك سەرەنجامی ئەو كەسانە بخەینە روو كە لەگەڵ دایكو باوكیاندا خراپن.

**یەكەم:** عاجزكردنی دڵی دایكو باوك دەبێتە هۆی تووڕەكردنی خوای گەورە! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (رِضا اللهِ في رِضا الْوالِدِ, وَسَخَطُ اللهِ في سُخْط الْوالِدِ) (رواهُ التُّرمذي), واتە: رازیبوونی خوا لەرازیبوونی دایكو باوكەوەیە, غەزەبو تووڕەیی خواش لەتووڕەیی دایكو باوكەوەیە. كەواتە: هەركەسێ حەزدەكات خوای گەورەی لێ رازی بێ" با دڵی دایكو باوكی رازی بكات, هەركەسێكیش دڵی دایكو باوكی ئازار بداتو تووڕەیان بكات ئەوا با دڵنیابێ كەخوای گەورە لێی تووڕەیە!

لەفەرموودەیەكیتردا, خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (رَغِمَ أَنْفُهُ, ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ, ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ), واتە: قوڕی بەسەرو لووتی بشكێ (سێ جار وای فەرموو), (قيلَ مَنْ يا رَسُولَ اللهِ؟!) عەرزیان كرد ئەوە كێیە ئەو ماڵوێرانە؟ قالَ: (مَنْ أَدْرَكَ والِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ أَو أَحَدَهُما, ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الجَنَّةَ), (رَواهُ مُسلِم), فەرمووی: بەڕاستی ئەو كەسە قوڕبەسەرو ماڵوێرانە كەوا دایكو باوك یان یەكێكیانی هەبێ, بەهۆی ئەو دایكو باوكەوە نەچێتە بەهەشت. واتە: ئەگەر بەهەشت بەدەست نەهێنی بەهۆی خزمەتكردنی دایكو باوكتەوە, ئەوە تۆ خەسارەتمەندی!

**دووەم:** سزای دووەمی ئەو کەسەی کەبەرامبەر دایكو باوکی خراپەکارە ئەوەیە لەکاتی سەرەمەرگدا شایەتمانی بۆ نایەت, کە بەڕاستی ترسناکترین کات لەژیانی ئینساندا بریتییە لەکاتی ڕۆح دەرچوون, لەبەر ئەوەی هەرکەسێك لەکاتی سەرەمەرگدا بەشایەتمانەوە نەمرێ" بۆ هەتاهەتایە بەدبەختو چارەڕەش دەبێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ كانَ آخرُ كَلامه لا إلهَ إلاَّ الله دَخَلَ الجَنَّةَ), واتە: هەرکەسێك ئاخر قسەو گوفتاری لەکاتی لەدونیا دەرچونیدا بریتی بێ لە (لا إلهَ إلاَّ الله)" ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە. بەڵام ئەو کەسەی لەژیانیدا بۆ دایكو باوکی باش نەبووبێ" ئەو شەرەفە گەورەی لەدەست دەچێو ئەو کەلیمە پیرۆزەی شایەتمان نایەتە سەر زمانی, هەروەکو ئیمامی ئەحمەدو تەبەرانی لەصەحابیی بەڕێز عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویانەتەوە کەفەرموویەتی: ڕۆژێکیان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووین, لەو کاتەدا کەسێك بەپەلەو هەڵەداوان هاتە خزمەتیو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, کوڕێکی گەنج وا لەسەرەمەرگدایەو خەریکە ڕۆحی دەردەچێ, هەرچەندە لەلای دەڵێین: لا إلهَ إلاَّ الله" بەڵام ئەو نایڵێو شایەتمانی بۆ نایەت! پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئایا ئەم کوڕە گەنجە لەژیانیدا نوێژی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ قوربان, زۆر نوێژی باشی دەکرد. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرمووی: دە هەستن با بەکۆمەڵ بڕۆین بۆ لای ئەو گەنجە. بەڵێ کاتێ پێغەمبەرو صەحابەکان گەیشتنە لای گەنجەکە بینیان حاڵی پەرێشانەو لەدەقەو سەعاتدایە کەدونیا بەجێبێڵێ, جا حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چووە نزیك سەری گەنجەکەوەو فەرمووی: ئەی کوڕی گەنج بڵێ لا إلهَ إلاَّ الله. گەنجەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا" زمانم ئەو قسەی بۆ نایەت! پێغەمبەری خوا ڕووی لەخەڵکەکە کردو فەرمووی: کێ لەئێوە زۆر لەم کوڕە نزیك بووەو ئاگای لەڕەوشتو کرداری بووە, ئایا ئەم کوڕە گەنجە کردەوەکانی چۆن بوە لەژیانیدا؟ عەرزیان کرد: ئەم کوڕە گەنجە هیچ ڕەوشتو کردەوەیەکی خراپی نەبووە, تەنها ئەوە نەبێ زۆر بۆ دایکی خراپ بوە! پێغەمبەری خوا فەرمووی: دایکی زیندووە؟ گوتیان: بەڵێ, فەرمووی: بڕۆن بۆم بانگ بکەن. جا کاتێ دایکی کوڕەکە هات, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەدایکی کوڕەکەی فەرموو: تۆ دایکی ئەم کوڕەی؟ گوتی بەڵێ,

فەرمووی: (أَرَأَيْت لَوْ أُجِّجَتْ نارٌ ضَخْمَةٌ, فَقيلَ لَك: إِنْ شَفَعْت لَهُ خَلَّيْنـا عَنْـهُ, وَإِلاَّ أحْرَقْنَـاهُ بِهذِهِ النَّارِ, أَكُنْتِ تَشْفَعينَ لَهُ؟) واتە: ئەی دایکی ئەم کوڕە گەنجە, ئەگەر ئێستا ئـاگرێکی گەورە بکرێتەوەو بیانەوێت کوڕەکەتی تێ بخەن, خەڵکیش پێت بڵێن: ئەگەر تۆ تکای بـۆ بکەی ئەوا وازی لێدەهێنین ئەگینا بەو ئاگرە دەیسووتێنین, ئایا تۆ تکای بـۆ دەکـەی کـە نەیخەینە ناو ئاگرەکەوە؟ ئافرەتەکە گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا, تکای بۆ دەکەمو هەرگیز دڵم قبووڵ ناکات لەبەرچاوی خـۆم بـەئاگر بیـسووتێنن! ئـەمجا پێغەمبـەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَأشْهِدي اللهَ وَاشْهِديني قَدْ رَضيتِ عَنْـهُ), فـەرمووی: دەی کەواتە خوای گەورە بکە بەشاهیدو منیش بکە بەشـاهید کـەتۆ لـەو کـوڕەت ڕازی بوویـت, چونکە ئەگەر تۆ لێی ڕازی نەبی" خواش لێی رازی نابێو بـەئاگری دۆزەخ دەیـسووتێنێ! دایکی کوڕە گەنجەکە گوتی: خوایە وا تۆ دەکـەم بەشـاهید, وەپێغەمبەرەکەشـت دەکـەم بەشـاهید کـەمن لـەم کـوڕەم رازی بـووم‌و وا گـەردنیم ئـازاد کـرد لـەو هـەموو خراپەیـەی کەبەرامبەر بەمن کردوویەتی! سُبحانَ الله لەگەورەیی ئەو پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەچەند بەحیکمەت‌و چۆن دەروونناسە, سۆزو هەستی ئەو دایکـەی جووڵانـدو وای لێکرد کەبـەزەیی بەکوڕەکەیـدا بێتـەوەو گـەردنی ئـازاد بکـات. بەڕاسـتی ئـەو پێغەمبـەرە خـۆشەویستە بۆ هـەموو کەسێکی ئومەتەکەی دڵسۆزترە لەدایك‌و باوك بۆ رۆڵەی خۆیان, هەروەکو لەم ڕووداوەدا کەئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم نەبوایە" ئەو دایکە هەرگیز گەردنی ئەو کوڕە گەنجەی خۆی ئازاد نەدەکردو, کوڕەکەی بۆ یەکجاری مـاڵوێران دەبوو! هەروەها دەبـێ بڵـێین اللهُ أكْبَـر لەسـۆزی دایك بەرامبـەر بەئـەولاد. ئـەم پیرەژنـە لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی کە لەلایەن کوڕەکەیەوە پێی گەیشتووە, کەچـی هەرکەبیـستی لەبەرچاویدا کوڕەکەی دەخرێتە ناو ئاگرەوە, جـەرگی ئـاگری تێبـەربوو, یەکسەر هـەموو ئەو رابردووە تاڵەی لەبیر چۆوەو رۆیشتەوە ئەو دۆخەی کەتازە منداڵەکەی لێ جیـابۆوەو لەدایك بووبوو, یەکسەر گوتی: قەت قبووڵ ناکەم منداڵەکـەم لەبـەر چـاومدا بـسووتێنرێ‌و من هیچ داوایەکم لەسەری نیەو تکا دەکەم وازی لێ بێنن!

بەڵێ خۆشەویستان, ئەمجا پێغەمبـەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّم چـووە لای سـەری کوڕە گەنجەکەو فەرمووی: (يا غُلامُ, قُلْ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْـدَهُ لا شَريكَ لَهُ, وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً

عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، واتـه: رۆڵـه گیـان، بڵـێ جگـه لـەالله هـیچ خوایـەکی دیکـە نیـەو هـیچ هاوبەشێکی نیـەو شـاهیدیش دەدەم کەمحەمـەد بەنـدەو پێغەمبـەری خوایـە. کوڕەکـەش یەکسەر بەدوای پێغەمبەری خوادا شایەتمانی هێناو پاشان وەفاتی کـرد. جـا پێغەمبـەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيـه وسَلّم فـەرمووی: (اَلْحَمْدُ لله الّذي أنْقَذَهُ بِي مِنَ النَّارِ)، فـەرمووی: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەهۆی منەوە لەئاگر ڕزگاری کرد!

جا با ئەمە دەرس‌و عیبرەت بێ بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەئازاری دایك‌و باوکیان داوە، هـەتا نەگەیـشتوونەتە حاڵـەتی سـەرەمەرگ‌و ڕۆح دەرچـوون‌و وەکـو ئـەو کـوڕە گەنجـە زمانتان نەبەستراوە لەشایەتمان هەر ئێستا بـچنە خزمـەتیان‌و پێیـان بڵـێن: داوای گـەردن ئازادیتان لێدەکەین، خۆ ئەگەر گەردنیـشمان ئـازاد نەکـەن ئـەوا خـوای گـەورە بـەئاگری دۆزەخ دەمانسووتێنێ، بەم شێوەیە هەروەکو پێغەمبـەری خـوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسـلّم زۆر بـەحـەکیمانـە" هەسـت‌و سـۆزیـان بجـوولێنن‌و دەسـت‌و قاچیان مـاچ بکـەن‌و گـەردنی خۆتانیان پێ ئازاد بکەن.

سزای سێیەم بۆ ئەو کەسەی کەخراپە لەگەڵ دایك‌و باوکیدا دەکـات ئەوەیـە کـەخوای گـەورە لەڕۆژی قیامەتدا بەچاوی ڕەحمەت تەماشای ناکـات‌و نایخـاتە بەهەشتی بەرینی خۆیەوە، وەکو پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (ثَلاثَةٌ لا يَنْظُرُ اللهُ إلَيْهِم يَوْمَ القِيامَة ) واتە: لەڕۆژی قیامەتدا سێ کـەس هـەن کـەخوای گـەورە بەچـاوی ڕەحمـەت تەماشایان ناکات‌و غەزەبیان لێ دەگرێ! سُبْحانَ الله. دەبێ ئەو سێ کەسە کێ بن؟! باش گوێ بگرە نـەوەکو تـۆش یـەکێ بـی لـەو سـێ کەسـە! یەکـەمیان: (العاقُّ لِوالدَيْـه)" ئـەو کەسەی کە دڵی باوك‌و دایکی خۆی ئازار داوەو دڵیان دەشکێنێ.. دووەم: (وَمُدْمِنُ الْخَمْر)" ئەو عەرەق خۆرەی کەتەویە ناکاو بەردەوامـە لەسـەر عـەرەق خـۆری، سـێیەم: (وَالْمَنَّـانُ عَطاءهُ)، ئەو کەسەی کاتێ خێـر دەکـات منـەت دەکـات بەسـەر ئـەو کەسـەی خێرەکـەی پێکردوەو بەردەوام بە چاویدا دەداتەوە.

بەڵێ" ئەم سێ کەسە لـەڕۆژی قیامەتـدا خـوای گـەورە بەچـاوی ڕەحمـەت تەماشـایان ناکات! وە فـەرمووی: (وَثَلاثَـةٌ لا يَدْخُلُونَ الجَنَّـةَ)، سـێ کەسـیش هـەن ناچـنە بەهەشـتی بەرینی خواوە" ئیلا مەگـــەر خـــوا بەڕەحمی خـــۆی دوای سووتانێکی زۆر لەجەهەنەمدا

عەفویان بکات ئەوانیش, یەکەم: (الْعاقُّ لِوالِدَیْهِ), ئەو کەسەی خراپەی بەرامبەر دایكو باوکی کردوەو لەژیانیدا نەیهێشتووە دڵیان گەشی‌و خۆشییەکی پێدا بێت! دووەم: (الدَّیُّوثُ )" پیاوی دەیوث, یان ژنی دەیوث ناچێتە بەهەشتەوە, دەیوث کێیە؟ ئەو کەسەیە کەغیرەتی ناجووڵێ لەسەر شەرەفو ناموسی خۆی, ئەگەر ژنەکەی بەرووت‌وقووتی لەماڵ بچێتەدەر غیرەتی نیە بڵێ خۆت داپۆشە, ئەگەر کچەکەی قاچو قۆڵی خۆی رووت کردو لەهەموو حەفلەو شاییەکدا بەشداری کردو لەدەستی هەموو نامەحرەمێکدا هەڵپەڕیو دایکەکەش نەیدەگوت کچم ئەوە بێشەرعییە بەڵکو ئەگەر باوکیشی قسەیەکی بکردایە ئەوە دایکەکە دیفاعی لەکچەکە دەکرد, بەکورتی: هەرکەسێك" جا دایکە, یان باوکە" رازی بوو بەبێڕەوشتیی ماڵو منداڵەکەی ئەو کەسە دەیوثەو ناچێتە بەهەشتەوە!

**سێیەم**: (الرَّجِلَة), ئەو ئافرەتەی کە لەهەڵسوکەوتو قسەکردنو جلوبەرگ لەبەرکردندا لاسایی پیاوان دەکاتەوە. بۆ نموونە ژنەو چاکەتو پانتۆڵی پیاوان لەبەر دەکات! ئەم سێ کەسەش ئەگەر لە دنیادا تەوبە نەکەنو لەو کردەوانەیان پەشیمان نەبنەوەو واز نەهێنن, ئەوا مەگەر خوا بەڕەحمی خۆی عەفویان بکات, ئەگینا ناچنە بە هەشتەوە (تاوەکو لەدۆزەخدا سزای کردەوە خراپەکانی خۆیان وەرنەگرن).

**چوارەم**: هەر کەسێ لەگەڵ دایكو باوکیدا خراپ بێ, ئەوە خوای گەورە کردەوەکانی تریشی لێ وەرناگرێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەفەرموێ: (ثَلاثَةٌ لا يَقْبَلُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْهُمْ صَرْفاً وَلا عَدْلاً ), واتە: سێ کەس" خوای گەورە نە فەرزو نە سونەتیان لێ قبووڵ ناکات, یەکەم: (عاقٌّ) ئەو کەسەی خراپە لەگەڵ دایكو باوکیدا دەکات, دوەم: (وَلا مَنَّانٌ), ئەو کەسەی ئەگەر چاکەی لەگەڵ کەسێکدا کرد زۆر منەتی بەسەردا دەکات. سێیەم: (وَلا مُكَذِّبٌ بِقَدَرٍ), ئەو کەسەی کە قەزاو قەدەری خوایی بەدرۆ دەزانێو بڕوای پێی نیە .           (رَواهُ الطَّبَراني).

بەڵێ بەڕێزان, با ئاگامان لە خۆمان بێ, کارێك نەکەین کەدڵی دایكو باوکمان پێی بڕەنجێ, لەبەر ئەوەی هەرچەندە کردەوەی چاکمان هەبێ لەنوێژ, لەڕۆژوو, لەحەجو زەکاتو نوێژو ڕۆژووی سونەت, خوای گەورە لێمان وەرناگرێ هەتاوەکو بۆ دایكو باوکمان

باش نەبین. هەروەکو لەفەرموودەیەکی تری پێغەمبەری خۆشەویستماندا هاتووە کەفەرموویەتی: سێ کردەوە هەیە" هەرکەسێ هەرسێکیان یان یەکێك لەو سێ کردەوانە بکات ئەوا خوای گەورە هیچ کردەوەیەکی چاکەیتری لێ قبوول ناکات, ئەو سێ کردەوەیەش, یەکەم: شەریك بۆ خوا بڕیاردان, دووەم: ئازاردانی دڵی باوكو دایك, سێیەم: راکردن لەمەیدانی غەزاو جیهادداو پشت کردنە دوژمنو چۆڵکردنی سەنگەری شەڕ لەو کاتەدا کەموسڵمانانو کافران لەشەڕدان دژ بەیەکتر.

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێت), کەشارەزاترین صەحابەی پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەتەفسیری قورئان, فەرموویەتی: سێ ئایەت هەن لەقورئاندا لە هەر ئایەتێکدا خوای گەورە فەرمانی بەدوو شت کردوە, هیچ کام لەو دوو کردەوەیە بەبێ ئەویتریان قبوول ناکات.

یەکەم: فەرموودەی خوا کەفەرموویەتی ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ ﴾( محمد 33), واتە:(گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەر بن), جا هەر کەسێك گوێڕایەڵی ئەمرو فەرمانی خوای گەورە بێ, بەڵام بەگوێی فەرموودەو فەرمایشتەکانی حەزرەتی رسُولُ الله نەکات ئەوا خوای گەورە لێی قبوول ناکاتو وەکو ئەوە وایە بەگوێی خواشی نەکردبێ.

دووەم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ﴾(البقرة 43), واتە: نوێژەکانتان بەچاکی بکەنو زەکاتیش بدەن. جا هەرکەسێ هەرچەندە بەرێکوپێکی نوێژەکانی بکات بەڵام زەکات نەداتو حەقی فەقیرو هەژاران لەسەروەتوسامانی خۆی دەرنەکات, خوای گەورە نوێژەکانیشی لێ قبوول ناکات.

سێیەم: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾ (لقمان 14), واتە: ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیشو دایكو باوکیشت بە.

جا هەرکەسێك هەرچەندە سوپاسی خوای گەورە بکاتو گوێڕایەڵی خوا بێ, بەڵام سوپاسی دایكو باوکی نەکات ئەوە وەکو ئەوە وایە سوپاسی خوایشی نەکردبێو خوا لێی قبوول ناکات!

**پێنجەم:** هەرکەسێك بێئەمریی دایكو باوکی بکات" ئەوە یەکێك لەگوناهە گەورەکانی ئەنجام داوە, وەکو لەهەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە" کەڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم رووی لەصەحابەکان کردو فەرمووی: (ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأكْبَرِ الْكَبائِرِ؟ - ثَلاثاً -) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئایا ئاگادارتان نەکەم بەوەی کەگوناهە هەرە گەورەکان کامانەن ؟ صەحابەکان فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئاگادارمان بکە, با خۆمانیان لێ بپارێزین. فەرمووی: گوناهە هەرە گەورەکان ئەمانەن, یەکەم: (الإشراكُ بِاللهِ) شەریك بۆ خوا قەراردان, دووەم: (وَعُقُوقُ الْوالِدَيْنِ) ئازاردانی دڵی دایكو باوك, سێیەم: (ألا وَشَهادَةُ الزُّورِ, أوْ قَوْلُ الزُّورِ - وكانَ مُتَّكِئاً فَجَلَس, فَما زالَ يُكَرِّرُها حَتَّى قُلْنا لَيْتَهُ سَكَتَ), فەرمووی: سێیەم گوناه لەتاوانە هەرە گەورەکان بریتییە لەشاهیدیی درۆ, یان فەرمووی: لەقسەی درۆ, پێغەمبەری خوا (کەشانی دادابوو) دانیشتو بەردەوام هەر دەیفەرموو ئاگاتان لەشاهیدی درۆ بێو خۆتانی لێ بپارێزن. تا ئەوەندەی دووبارەکردەوە کەصەحابەکان لەدڵی خۆیاندا گوتیان: خۆزگایە پێغەمبەری خوا هیچیتر دووبارەی نەکردایەوەو ئەوەندە خۆی عەزیەت نەدایە!

بەڵێ خۆشەویستان زۆرێك لەموسڵمانان وا دەزانن گوناهی کەبیرە تەنها هەر قەتڵو زیناو ریباو خواردنی ماڵی هەتیوە, بەڵام زۆر جار ئازاردانی دڵی دایكو باوك بەگوناهی گەورە نازانن و بێئاگان لەوەی کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم لەریزی گوناهە هەرە گەورەکاندا باسی بێئەمریی دایكو باوکی کردووە, خۆ شتێکی ئاشکراشە کەهەر کەسێك گوناهە گەورەکان ئەنجام بداو تەوبەیەکی راستەقینە نەکات ئەوە دەبێ لەئیمانی خۆی بترسێو بزانێ بەدبەختیو شەرمەزاریی رۆژی قیامەت بەشی دەبێ!

هەر لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرموویەتی: (مِنَ الْكَبائِرِ شَتْمُ الرَّجُلِ والِدَيْه), واتە: لەگوناهە گەورەکانە کەمرۆڤ جنێو بەدایكو باوکی بدات! صەحابەکان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا" ئایا کەسی وا هەیە کەجنێو بەدایكو باوکی بدات؟! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرمووی: (نَعَمْ, يَسُبُّ أبا الرَّجُلِ, فَيَسُبُّ أباهُ, وَيَسُبُّ أُمَّهُ, فَيَسُبُّ أُمَّهُ) فەرمووی: بەڵێ, جنێودان بەباوكو دایك" بەوە دەبێ کەجنێو بەباوکی کەسێك دەداتو ئەویش جنێو بەباوکی ئەم دەداتەوە,

هەروەها جنێو بەدایکی کەسێك دەداتو ئەویش جنێو بەدایکی ئەم دەداتەوە!

کەواتە: ئەو کەسانەی کە بەناوی گاڵتەوگەپو شەڕەجنێو لەگەڵ ڕەفیقو هاوەڵانیاندا" جنێو بەدایكو باوکی ئەو کەسە دەدەنو ئەوانیش جنێو بەدایكو باوکی دەدەنەوە" با بزانن کەبەر ئەم هەڕەشەیەی پێغەمبەری خوا دەکەونو یەکێ لەگوناهە هەرە گەورەکانیان کردووەو پێویستە هەرچی زووە وازی لێبێننو تەوبە بکەن.

هەروەها دەتوانین بڵێین: ئەو کەسانەش کەڕەفتارو کردەوەیان ئەوەندە ناشیرینە کەخەڵکی ناچاردەکەن بەنەزانی" جنێو بەدایكو باوکیان بدەنو ئەوەندە لێیان پەست بن" بڵێن: ڕووی باوکی ڕەش بێ، یان ڕووی دایکی ڕەش بێ، ئەو جۆرە کەسانەش (واللهُ أعْلَمْ)" بەر ئەو هەڕەشەیە دەکەونو وەکو ئەوە وایە بۆ خۆی جنێوی بەدایكو باوکی خۆی دابێ، چونکە ئەگەر بەهۆی خراپەی ئەمەوە نەبێ" خەڵکی ناوی باوكو دایکی بەخراپە ناهێننو جنێوی پێنادەن

بەڕێزان: کاتێ پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئینسان جنێو بەدایكو باوکی بدا ئەوە گوناهێکی هەرە گەورەی ئەنجام داوە، صەحابەکان زۆر بەسەرسوڕمانەوە فەرموویان: بۆچی ئەولادی وا دروست دەبێ کەجنێو بەدایكو باوکی بڵێ؟! ئەم پرسیارەیان ئەوە دەگەیەنێ کە لەکۆمەڵگای موسوڵماندا، ئەمە شتێکی خەیاڵەو نابێ وجودی ببێ! بەڵام بەداخەوە، ئەمڕۆ هەر ڕۆڵەی موسڵمانە کە بەڕاستەوخۆ جنێو بەدایكو باوکی دەڵێو بەلاشیەوە شتێکی ئاسایی یە!

ئیمانداران: خاڵی کۆتایی لەسزای ئەو کەسەی کەجنێو بەدایكو باوکی دەدات ئەوەیە: کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (كُلُّ الذُّنُوبِ يُؤَخِّرُ اللهُ مِنْها ما شاءَ إلى يَوْمِ القِيامَةِ إلاَّ عُقُوقَ الْوالِدَيْنِ، فَإنَّ اللهُ يُعَجِّلُهُ لِصاحِبِهِ فِي الْحَياةِ قَبْلَ المَماتِ)، (رَواهُ الحاكِم وَصَحَّحَهُ) واتە: هەموو گوناهێك" خوای گەورە بەویستی خۆی سزاکەی دوادەخات بۆ ڕۆژی قیامەت، تەنها دڵڕەنجاندنی دڵی دایكو باوك نەبێت، کەخوای گەورە لەدونیاداو بەر لەمردن سزاکەی بەخاوەنەکەی دەچێژێ!

وتاربێژی بەناوبانگو چاونەترسو حەقبێژ" شێخ عەبدولحەمید کشك، خوای گەورە پلەی لەبەهەشتدا بەرز بکا، لە یەکێك لەوتارەکانیدا کەباسی مافی دایكو باوك دەکات،

ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کوڕێکی دەوڵەمەند, دوا مردنی باوکی" دایکی دەباتە لای خۆی بۆ ئەوەی لەلای ئەو ژیان بباتە سەرو ئاگای لەدایکی بێ‌و پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکات. بەڵام کاتێ ئەم کوڕە ژن دێنێ, ژنێك دێنێ کەتەنها هەر خۆی خۆش دەوێ‌و غەیری خۆی کەسی تر بەشایەنی ئەوە نازانێ ژیانێکی خۆشی هەبێ! واتە: تا بڵێی ژنێکی خۆپەرستو لووت بەرزو خۆ بەزلزان بوو. هەر کەئەم ژنە هاتە ئەمماڵەوە, ژیانی لەدایکی کوڕەکە تاڵکردو بەردەوام هەڕەشەوگوڕەشەی لێدەکردو ئەو ماڵە گەورەیەی لێکردبوو بەقەبر, هەموو ئێواران کەکوڕەکە لەئیش دەگەڕایەوە پێش هەموو شتێك ئەم ژنە شکاتی لەدایکی مێردەکەی دەکردو دەیان بوختانی بۆ هەڵدەبەست. چەند مانگێکی پێچوو, دایکی داماو هەموو ئەو سووکایەتییەی لەلایەن بووکەکەیەوە پێیدەکرا, دەیخستەوە ناو دڵی خۆی‌و لای کەس باسی نەدەکرد بۆ ئەوەی خەڵکی نەڵێن لەگەڵ بووکەکەیدا ئیدارە ناکات. تا ئەوەبوو ئەوەندەی خەفەت خوارد تووشی نەخۆشی (فێ) لێهاتن بوو کەجۆرێکە لەشێتی‌و هەرکاتێ ئەو فێیەی لێدەهات هیچ ئاگای لەخۆی نەدەماو وەکو شێتی لێدەهات تا دەبووڕایەوە, ئەمجا ژنەکە بەتەواوی ڕایگەیاند کەنابێ خەسووی لەو ماڵەدا بێ! ئەوەبوو بەمێردەکەی گوت: یەکێ لەم دوانە هەڵبژێرە: (یان من, یان دایکت, ئەگەر دەتەوێ من لەگەڵتدا بژیم‌و لەم ماڵەدا بم ئەوا دەبێ دایکت لێرە لابەی‌و لەبەرچاوم نەمێنێ, ئەگەر دایکیشت دەوێ ئەوا من هەر ئێستا ماڵەکە بەجێدێڵم‌و دەبێ لەیەکتری جیاببینەوە. جا خۆت بڕیاری خۆت بدە!).

بەڵێ, یەکەم جار کوڕەکە هەندێك دوودڵ بوو بەڵام دوایی بڕیاری کۆتایی دا, کەئەوەبوو لەدەست دایکی ڕزگاری بێ‌و ژنەکەی لەدەست نەچێ! بەڵام ئایا چی لەدایکی بکا؟ خۆ ئەم تاقانەی دایکیەتی‌و, دایکی جگە لەم کوڕی تری نیە, کچیشی نیەو ماڵە براو خوشکێکیشی نییە تاوەکو دایکی بباتە لای ئەوان‌و لەماڵەکەی ئەمدا نەمێنێ! بەڵام کام ماڵ؟ ئەو ماڵەی کەئەم دایکە لەگەڵ ئەو هەموو سەروەتو سامانەی کوڕەکەیدا" کەباوکی بۆی بەجێهێشتبوو تێر سکی خۆی نانی لێ نەخوارد نەوەکو کوڕەکەی موحتاجو هەژار بێ! ئەو ماڵەی کەدایکی داماو چەندان ساڵ بەهیوای ئەوەوە چاوی دەچووە خەو" کەڕۆژێك کوڕە تاقانەکەی ببێتە خاوەنی ژن‌و منداڵی خۆی‌و لەسایەی بووکەکەیدا هەندێك

پشوو بدات! بەڵام وا ئێستا ئــەم مـــاڵە جێگای ئـــــەوی تێدا نابێتـەوەو دەبـــێ بڕواتە دەرەوە.

بـەڵێ, کوڕەکـە هـەر لـەبیری ئـەوەدابوو کەچـۆن دایکـی لـەکۆڵ خـۆی بکاتـەوەو دڵـی ژنەکەی ڕازی بکا, لەم کاتەدا شەیطان ئەم پیلانەی بەمێشکدا هێنـا.. ئایا چـی لـەدایکی دەکات؟! شەوێکی ساردو سەرمای زسـتان, لەنیوەشـەودا کـە هـەموو خـەڵکی لـەجێگای گـەرمی خەوتنـدا بـوون, لـەو تاریکـە شـەوەدا, کەژنەکـە دوا ئاگـاداری دا بەمێردەکـەی کەدەبێ هەر ئەمشەو دایکت لـەم ماڵـە بەرێتـە دەرەوەو ئـەم شـێتەم لـەکۆڵ بکەیتـەوە! کوڕەکـە دایکـی لـەکۆڵکردو بردیـە سـەربانی ماڵـەوەیان و لـەوێوە لەسـەر سـەر" دایکـی فڕێدایـە خـوارەوە" هـەر کەدایکـە کەوتـە خـوارەوە چـەند هەناسـەیەکیداو بـۆ دواجـار چاوەکانی لێکناو ئەو ماڵەی بەجێهێشتو مرد. بۆ بەیانی کەڕۆژ بۆوە" کوڕەکەو ژنەکەی" دەرودراوســێو خـەڵکیان ئاگـادارکردەوە کەئەمـشەو کاتــێ ئـەوان خـەوتوون, دایکـی فێیەکەی لێهاتووەو چـۆتە سـەربان و خـۆی خستۆتە خـوارەوەو مـردووە! بـەم شـێوەیە هەموو کەس بڕوای پێکردن و پرسەی بۆ دانراو کۆتایی پێهـاتو ژنەکـە ئافـەرینێکی باشـی مێـردە دڵڕەق و دڕندەکـەی کـرد! بـەڵام چـەند سـاڵێك دوای ئـەوە, کتـوپڕ" دەسـتی پـەروەردگار کەوتـە کـارو دادگـای ئاسمـان مەحکەمـەی ئـەم کـوڕە ناکەسبەچـەی کـرد, دادگاییەك پڕ بەپێستی خۆی. ڕۆژێکیـان کەئەم پیاوە لەئێش گەڕایەوە" زۆر ساغوسەلیم و بێعـەیب بـوو, بـەڵام لـەناکاو فێـی لێهـاتو وەکـو شـێتی لێهـات! سُبحانَ الله. هـەمان نەخۆشـیی دایکـی" تووشـی ئـەمیش بـوو! تـا دوای ماوەیـەك کەژنـە خۆپەرسـتە لـووت بەرزەکەی" چۆن کاتی خۆی لەدایکی بێزاربوو ئاواش لەمێردە شێتەکەی بێزاربوو. شەوانە دەرگای ژوورەوەی لەسـەر خـۆی دادەخـستو مێردەکـەی لەحەوشـە دەخەوانـد, تـاوەکو وەرزی زستان هاتو شەوێکیان ئەم پیاوە کەژنەکەی کردبوویە دەرەوە لەنیوەی شـەودا, لەهەمان ئەو کاتەدا کەدایکی فڕێدایە خوارەوە لەسەربان و هەر لەو شوێنەشـەوە کـەکاتی خۆی دایکی لێ فڕێدابووە خوارەوە, لـەو شـوێنەوە خـۆی خستە خـوارەوەو کەوتـە ئـەو شوێنەی کەکاتی خـۆی دایکـی لێـی کەوتـە سـەر زەویـو ئـەمیش چـەند هەناسـەیەکیداو ڕۆحی پیسو بێڕەحمـی بەرەو بـەرزەخ بەڕێکــــەوت تـا لـەوێ بـەتـەواوی سـزای ئـەو

خراپەكاریيەی كەبەرامبەر دایكی كردی" وەربگرێتەوە (والجزاءُ مِنْ جِنْسِ الْعَمَل)، قورئانیش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَلكَ لَعِبْرَةً لمَنْ يَخْشَى ﴾(النازعات 26). بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەركەسێك كەترسی خوای لەدڵدا هەبێت!

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز، زانایان فەرموویانە: (إِنَّ الْعُقوقَ دَيْنٌ لابُدَّ مِنْ قَضائِهِ فِي الدُّنيا قَبْلَ الآخِرَةِ) واتە: بەڕاستی خراپەكردن بەرامبەر دایكو باوك قەرزێكە، پێویستە ئەو قەرزە بدرێتەوە لەدنیادا پێش ئاخیرەت.. بەڵێ، هەركەسێك خراپە لەگەڵ دایكو باوكیدا بكات ئەوا خوای گەورە هەر لەدنیادا ئەولادێكی وای دەداتێ كەئەویش ئاوا لەگەڵ دایكو باوكیدا خراپ بێتو هەر لەدنیادا تۆڵەیان لێبكاتەوە. لەفەرموودەیەكی صەحیحدا كەئیمامی ئەحمەد ریوایەتی كردووە" پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (اِثْنانِ يُعَجِّلُهُما اللهُ فِي الدُّنيا، البَغي وَعُقوقُ الْوالِدَيْنِ) واتە: دوو تاوانی گەورە هەن كەخوای گەورە هەر لەدنیادا پێش قیامەت تۆڵە لەئەنجام دەرانی دەستێنێ، زوڵمو ستەم كردن، وەخراپەكردن لەگەڵ دایكو باوكدا.

بەڵێ خۆشەویستان، هەموومان بەچاوی خۆمان ئەم حەقیقەتەمان بینیوە، هەركەسێك زاڵم بووبێو زوڵمی لەخەڵك كردبێ ئەوا خوای گەورە هەر لەدنیادا" پێش هاتنی قیامەت تۆڵەی لێكردۆتەوەو سووكوڕیسوای كردووەو حەقی مەزلوومەكەی لێ وەرگرتۆتەوە، هەمووشمان ئەو كەسانەمان بینیوە كەبۆ دایكو باوكیان خراپ بوون" چۆن خوای گەورە ئەولادی خراپی داونێو هەر لەدنیادا خوای گەورە بەهۆی ئەولادی خراپی خۆیانەوە تۆڵەی لێكردوونەتەوەو ئەوە سزای قیامەتیش هەر خوا خۆی دەزانێ چی بۆ ئامادەكردوون!

ئەی باوكو برا بەڕێزەكان: بەدڵ گوێ بۆ ئەم رووداوە راستەقینانە بگرنو پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرن: كوڕێكی خراپ لەگەڵ دایكو باوكیدا" دوای مردنی دایكی" باوكی بەناچاری روودەكاتە ماڵی كوڕەكەیو لەگەڵ ئەواندا دەژی، دوای ئەوەی باوكە بەساڵدا دەچێو پشتی دەچەمێتەوەو لیكی بەدەمدا دێتە خوارەوەو هۆشو بیری تێك دەچێو پاكوخاوێنیی خۆی پێ ناپارێزرێ" ژنی كوڕەكە داوا لەمێردەكەی دەكات كەباوكی فڕێبداتە دەرەوەو لەماڵەكەیان لایبات بۆ ئەوەی منداڵەكانی تووشی نەخۆشی نەبن لەباپیریانەوە! كوڕەكەش وەكو هەموو ئەو كوڕانەی كەنەبوونیان باشترە" بۆ رەزامەندیی

دڵی خانمەکەی دەستی باوکی دەگریو بەپاڵ دەیکاتە دەرەوەو دەڵێ جارێکی تر نەیەیتەوە بەم ماڵەدا, لەو کاتەدا منداڵێکی چوار - پێنج ساڵانەی ئەم کوڕە نەگبەتە" بۆ باپیری دەگریو دەڵێ: باوکە بۆچی بابەگەورەت ئازارداو کردتە دەرەوە؟ ئەویش دەڵێ: رۆڵە بۆ ئەوەی ئێوە نەخۆشیی ئەو نەگرنەوەو لەوەوە تووشی نەخۆشی نەبن! ئەو منداڵە" بەو کەم تەمەنیەی خۆیەوە (وەکو ئەوەی خوا بیخاتە سەر دەمی) روو لەباوکی دەکاتو دەڵێ: زۆر چاکە بابە گیان, بەخوا پاش چەند ساڵێکیتر ئێمەش گەورە دەبینو تۆ چیت لەباپیرمان کرد ئاوات لێ دەکەینەوە !

کوڕێکی تر باوکە پیرە بەساڵداچووەکەی لەسەر دەموچاو رادەکێشاو لەماڵ دەیکردە دەرەوە, باوکە پیرەکەش هاواریدەکردو بەدەنگی بەرز دەگریا, خەڵکی کەگوێیان لەهاوارو ناڵەو گریانی ئەم پیاوە پیرە بوو بەدەست کوڕەکەیەوە, زۆر بەزەییان پێدا هاتەوەو کۆمەڵێکیان چوون پەلاماری کوڕەکەیاندا کەلێی بدەنو باوکە پیرەکەی لەژێر دەستو قاچ دەربێنن. کاتێ لەکوڕەکە نزیك بوونەوە, باوکەکە هاواری کرد: واز لەکوڕەکەم بێنن! گوتیان: بۆ؟ باوکەکە زۆر گریاو پاشان گوتی: سوێند بەخوا" بیست ساڵ لەمەوبەر, منیش وەکو ئەم کوڕەم کەچۆن بەزەیی بەمندا نایەتەوە, منیش ئاوا بەزەیم بەباوکمدا نەدەهاتەوەو لەم شوێنەدا لەسەر دەموچاو رامکێشاو لەماڵ کردمە دەرەوە, ئەمە پاداشتی خۆمە وەریدەگرمو شایانی ئەوەم کەوام لێبکرێ, (العُقوقُ دَيْنٌ لابُدَّ مِنْ قَضائِه) ئەوە قەرزەو دەبێ رۆژێك بدرێتەوە.

خۆشەویستان: ئەم بەسەرهاتانە (شیخ محمد حَسَّان) کەووتاربێژێکی بەناوبانگی میصریە" لەووتارەکانیدا بۆمان دەگێڕێتەوە, لەبەسەرهاتێکی تردا دەفەرموێ: بەهەمان شێوەی ئەوانی پێشوو, کوڕێك قاچی باوکی گرتبوو بەدوای خۆیدا رایدەکێشا بۆ ئەوەی لەماڵ بیکاتە دەرەوە, هەتا گەیشتنە دەرگای حەوشە, لەو کاتەدا باوکەکە بەدەم گریانەوە گوتی: (كَفى يا بُنَي, كَفى يا بُنَي, إلى البابِ فَقَط) رۆڵە گیان بەسە, رۆڵە گیان وا گەیشتینە دەرگای حەوشەکە, ئیتر وازم لێبێنە! بەڵام کوڕەکە گوتی: (لا, بَل إلى الشَّارِع), نەخێر بەس نیە, بەڵکو دەتبەمەسەر جادەکە فرێت دەدەم. باوکەکە گوتی: (واللهِ ما جَرَرْتُ أبي مِنْ رِجْلَيْهِ إلاَّ إلى البابِ فَقَط), سوێند بەخوا رۆڵە گیان, من کاتی خۆی

هەر تادەرگای حەوشە بەقاچ باوکمم راکێشاو کەگەیشتینە ئێرە وازم لێ هێنا. ئێستا من تا ئێرە حەقی خۆمە وەریدەگرمەوە, بەڵام لێرە زیاتر رامکێشی ئەوە زوڵمت لێکردوومو ناحەقیم لەگەڵدا دەکەی!

موسڵمانی بەڕێز: هەر ئێستا کەئەم رووداوە راستەقینانەت بیست, ئەگەر رۆژێك لەرۆژان ئازاری دڵی دایكو باوکتت داوە" ئەوا هەر ئێستا برۆ دەستو قاچیان ماچ بکەو داوای لێبوردنیان لێبکەو لەمەودوا تا لەدەستت نەچوون" چاکەیان لەگەڵدا بکە, پێش ئەوەی بمرنو دڵیان لێت رەنجابێو بەهۆی ئەوەوە تووشی ئەولادی خراپ ببی کەهەر لەدنیادا تۆڵەت لێ بکەنەوەو ژیانی دونیاو قیامەتت تاڵو رەنجەڕۆیی بێ!

بەڕاستی ئەمڕۆ ئێمە لەرۆژگارێکدا دەژین کەرۆژانە دەیان دیمەنی دڵتەزێنو ویژدان هەژێن بەچاوی خۆمان دەبینین کەچۆن باوكو دایکە بەتەمەنەکان" بێ حورمەتییان پێدەکرێ, چەند دایکی سەرسپی بەساڵداچوو هەیە کەخاوەنی چەند کوڕو کچە کەچی خەڵك خێری پێدەکەنو لەکەلاوەیەکدا دەژیو شەوان بەتەنها رۆژ دەکاتەوە, هیچکام لەکوڕو بووكو کچەکانی ئامادە نین بیبەنە لای خۆیانو لەگەڵیاندا بژی!

خۆ کاتێ گۆڤارو رۆژنامەکان دەخوێنیتەوە" کەم ژمارەیان هەیە کەهەواڵی کوشتنی باوکێك, یان دایکێکی تێدا نەبێ کە لەلایەن کوڕەکەیەوە کوژراوە! کەئەمەش بەڕاستی ئەو فەرموودەیەی صادق الأمین" حەزرەتی رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەردەخات کەفەرموویەتی: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جارَهُ, وَأَخاهُ, وَأَباهُ) واتە: قیامەت دانایەت هەتاوەکو وای لێدێ پیاو" دراوسێو براو باوکی خۆی نەکوژێت! واتە: هەرکاتێ دراوسێ" دراوسێی خۆی کوشت, برا" برای خۆی کوشت, رۆڵە دەستی چووە خوێنی باوکیو کوشتی, ئەوە یەکێکە لەنیشانە بچووکەکانی هاتنی قیامەتو کۆتایی پێ هاتنی دونیا!

بەڵێ, صَدَقَ رَسُولُ الله, بەخوا هەموویمان بیستووەو بینیوە!

مامۆستا سەعیدی نەورەسی (رەحمەتی خوای لێبێت) لەبارەی ئەو کەسانەی کەباوكو دایکی خۆیان دەکوژنو حەز بە لەناوچوونو نەمانیان دەکەن فەرموویەتی: (ئای چ زوڵمێکی نا هەمواری چ بێویژدانییەکە, کەکەسێك ئاوات بۆ لەناوچوونی ئەو کەسە

بخوازێ کەهەموو ژیانی کردبێتە قوربانی لەپێناوی ژیانی ئەودا! جا بەڕاستی بارگران بوون بەبوونی ئەو پیرە موبارەکانەو حەزکردن بەمردنیان چەند بێویژدانییە, بگرە چەند نزمیو کەم نرخییە!) پاشان مامۆستا سەعیدی نەوڕەسی دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانی بەڕێز: سەرنج بدەو پەند وەربگرە بزانە, ئەگەر نەمریت ئەوا چار نیەو دەبیتە پیرێکی بەتەمەن, جا ئەگەر ڕێز لەدایكو باوكت نەگریت ئەوا ڕۆژێكت بەسەردا دێ کەمنداڵەکانیشت ڕێز لەخۆت نەگرن, ئەمەش بەپێی ئەو نهێنییەی کەخوا لەڕستەی (الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَلْ)دا دایناوە, لەبەر ئەمە, ئەگەر قیامەتی خۆتت خۆشدەوێ ئەوا گەنجینەیەکی گەورە وا لەبەردەمتدا کەئەمەیە: خزمەتی دایكو باوكت بکەو ڕەزامەندییان بەدەست بهێنە, خۆ ئەگەر دنیاشت خۆش دەوێ, ئەوا ئەوان ڕازی بکەو سوپاسیشیان بکە هەتا ژیانت بەئیسراحەت بەسەربەریتو بەبۆنەی ئەوانیشەوە ڕزقی پڕ بەرەکەتت بۆ بێت. ئەگینا بەقورس زانینی بوونیانو ئاوات خواستنی مەرگیانو زامدارکردنی دڵی ناسكو هەستیاریان وات لێدەکەن کەحەقیقەتی ئایەتی پیرۆزی ﴿ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ﴾(الحج 11) بەسەردا بچەسپێ.. خۆ ئەگەر سۆزو ڕەحمەتی ﴿ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾یشت دەوێ" ئەوا ڕحم بکە بەسپاردەکانی ئەو ﴿ الرَّحْمَٰنِ ﴾ەو بەو سپاردانەش کە لەماڵەکەتدا پێی سپاردوویت!

جا خۆشەویستانم: لەکۆتایی ئەم وتارەدا" بۆ زیاتر ئاشنابوون بەمافەکانی دایكو باوك دەچینە خزمەت ئەو فەرموودەیە کە (إبن السني) لەئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتیەوە کەجارێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" چاوی بەپیاوێك کەوت کوڕێکی لەگەڵدابوو, بەکوڕەکەی فەرموو: ئەم پیاوە چیتە؟ کوڕەکە گوتی: ئەوە باوکمە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَلا تَمْشِ أمامَهُ, وَلا تَسْتَسِبْ لَهُ, وَلا تَجْلِسْ قَبْلَهُ, وَلا تَدْعُهُ بِإسْمِهِ) فەرمووی: مادام باوکتە, مافی باوکیەتی لەگەڵدا بەجێ بێنەو بەم شێوەیەبە لەگەڵیدا: لەڕێگادا لەپێشیەوە مەڕۆ, مەبە بەهۆی جنێو پێدانی, لەپێش ئەودا دامەنیشەو بەناوی خۆیەوە بانگی مەکە..

جا موسوڵمانان: با ئێمەش چاکە لەگەڵ دایكو باوکماندا بکەین, ڕێزیان لێبگرین, بەئەدەب بین لەگەڵیاندا, ئەگەر ئەوان موحتاجی ئێمە بوون" بەخۆمانو ماڵمانەوە

لەخزمەتیانـدا بـین بەبێمنـەت, لـەکاتی قـسەکردندا دەنگمـان بەسـەر دەنگیانـدا بـەرز نەکەینەوە, لەناو خەڵکیدا زیاتر لەهەمووکات حورمەتیان بگرین, دەسـتیان مـاچ بکـەین, داوای دوعای خێریان لێبکەین, دڵیان رابگرین, گوێ لەنەصیحەتو ئامۆژگاریییەکانیان بگرینو بەقسەیان بکەین. چونکە بزانن" هەرکەسێك دایكو باوکی هەیە, ئەگـەر بمێنـێو خوای گەرە مەیلی لەسەر بێ رۆژێك دەبێتە دایكو باوك, هـــەر کچەو لەپاشەرۆژدا دەبێتە دایك, هەر کورەو لەموستەقبەلدا دەبێتە باوك, جا چی بـچێنی ئـەوە دەدووریتـەوە (کَما تَدينُ تُدانُ), ئەگەر لەگەڵ دایكو باوکت بـاش بـی" منداڵەکەشـت لەگەڵتـدا بـاش دەبێـت, ئەگەر لەگەڵیاندا خراپ رەفتار بـی ئـەوا منداڵەکانیـشت لەگەڵتـدا خـراپ دەبـن, هـەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (بِرُّوا آباءكُمْ تَبَرُّكُمْ أبْناؤُكُمْ) (رواهُ الطَبَراني).

داوا دەکەم لـەخوای گـەورە رەحـم بەئێمـەشو دایـكو باوکیـشمان بکـات, ئـەو بـاوكو دایکانەی لەژیاندان خوای گەورە لەشیان ساغ بکاو ئەوانەشیان کـەمردوون خـوای گـەورە لەگوناهیان خۆش بێ, خوای گەورە یارمەتی هەموو ئەو کورو کچانە بدات کـە لەخزمـەتی دایكو باوکیاندان, ئەوانەش کەدڵی دایكو باوکیان ئازار داوە خوای گەورە بەرەحمی خۆی هیدایەتیان بداو ببنە ئینسانی چاکەکار لەگـەڵ دایكو باوکیانـدا ﴿ رَبِّ اغْفِرْ لِـي وَلِوَالِـدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِي مُؤْمِناً وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾(نوح 28).

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز.

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمد أمین, چاپخانەی بزرگ قرآن کریم, قُم, چاپی چوارەم, 2002.

3 ـ بەرنامەی پێغەمبەر بۆ پەروەردەی منالآن, وەرگێرانی: سهام بەرزنجی, رێدار ئەحمەد, نووسینگەی تەفسیر, هەولێر, چاپی یەکەم.

4 ـ رووناکی ( رَبِّ العالَمین ), عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی, چاپی یەکەم, هەولێر, 2002.

5 ـ صَحیح وصایا الرَّسُول, سَعْد یوسف أبو عزیز, المکتبة التوفیقیة, القاهرة, ط 1, 2001.

6 ـ الترغیب وَالتَّرهیب, لِلحافظ المُنذري, دار ابن الهیثم, القاهرة, ط 1, 2001.

7 ـ صَوتُ المنْبَر, د. صالح محمد الونیان, دار الصمیعي, الریاض, ط 1, 2000.

8 ـ صَحیح قصص الرَّسول, سَعْد یوسف أبو عزیز, المکتبة التوفیقیة, القاهرة, ط 1, 2001.

9 ـ خُطَبْ الشَیخ مُحَمَّد حَسَّان, مُحَمَّد حَسَّان, دار إبنُ رَجَبْ, القاهرة, ط 1, 1998.

10 ـ المِسْكُ والعَنْبَرْ في خُطَبِ المِنْبَرْ, د. عائض القَرَني, مکتبة العبیکان, الریاض, ط 1, 2002.

# وەصیەتـــــی سێیەم

﴿ وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾

# ووتـاری دەیەم

## مافی منداڵ

### بەشی یەکەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلادَهُمْ سَفَهاً بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّه قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴾ ( الأنعام 140 )

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ, فَإِنِّي مُكاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ )

( رَواهُ أبو داود )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیمانداران‌و خواناسان, سەلام‌و ڕەحمەتی خواتان لەسەر بێ..

خۆشەویستان: پشتیوان بەخوای گەورە, لەم وتارەدا دەچینەوە خزمەت قورئانی پیرۆزو, هەر لەسورەتی (الأنعام) ئایەتی ژمارە (151), کەبریتی بوو لە (10) وەصیەتی رَبُّ العالَمین بۆ عەبدەکانی خۆی. لەزنجیرە وتارەکانی ڕابردوودا دوو وەصیەتمان لەو دە وەصیەتە شیکردەوە, ئینشائەللا لەم وتارەشدا وەصیەتی سێهەم شیدەکەینەوە کەبریتی یە لەفەرموودەی خوا کەدەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ مِنْ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾(الأنعام 151), واتە: منداڵانی خۆتان لەبەر برسیەتی‌و نەداری مەکوژن, چونکە ئێمە پەکتان ناخەین, ڕزق‌وڕۆزیی ئێوەش‌و ئەوانیش دەدەین.

ئەوەی لەم وەصیەتەی پەروەردگاردا بۆمان دەردەکەوێ, بریتییە لەدیاریکردنی پەیوەندیی نێوان دایک‌و باوک‌و ڕۆڵەی تازە لەدایک بوو.

خۆشەویستان: نیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەر عەبدەکانی لەژمارە نایەن: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ﴾(ابراهيم 34). یەکێ لەبەخشش‌و خەڵاتە هەرە گەورەکان کەخوا بەئینسانی بەخشیوە بوونی منداڵە. لەوانەیە ئەوانەی خاوەنی چەند منداڵێکن, زۆر چاک هەست بەم بەخششە گەورەیە نەکەن, بەڵام ئەوانەی کەمنداڵیان نیەو هەتا دەمرن بەئاواتی ئەوەوەن دەنگی گڕوکاڵ‌و گریانی منداڵ لەماڵی خۆیاندا ببیستن, ئەوانە دەزانن کەمنداڵ خەڵات‌و بەخششێکی چەند گەورەیە کەخوا دەیبەخشێ بەئینسان. جا ئەم بەخششە گەورەیە, وەکو چۆن خوای گەورە بەقودرەت‌و دەسەڵاتی خۆی بەدایک‌و باوکەکانی دەبەخشێ, لەهەمان کاتدا ئەو ڕێگایانەشی دیاریکردوە کەئەم منداڵەی پێ خۆشبەخت بکرێ‌و سەرەنجامیش خێر بۆ دایک‌و باوکی بداتەوە.

کەواتە ئینسان بۆی نیە بەئارەزووی خۆی چۆنی حەز لێبێ ئاوا ڕەفتار لەگەڵ‌بەخششی منداڵدا بکات, بەڵکو چۆن دایک‌و باوک مافیان هەبوو لەسەر منداڵ وەکو لەوتارەکانی رابردوودا باسمانکرد,بەهەمان شێوەمنداڵیش مافی هەیەبەسەردایک‌و باوکیەوە, وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی:

(يَلْزَمُ الْوالدُ مِنَ الْحُقُوقِ لِوَلَدِهِ ما يَلْزَمُ الْوَلَدُ مِنَ الْحُقُوقِ لِوالِدِهِ) (رَواهُ إبنُ النَجَّار عَن أبي رافِع)، واته باوك مافى منداڵەكەى لەسەريەتى، هەروەكو چۆن منداڵ مافى باوكى لـەسـەريـەتى..

موسڵمانان: يەكەم مافى منداڵ بەسەر دايكو باوكەوە بريتييە لەمافى ژيان (حَقُّ الحَياة)، لە بەر ئەوەى هەر تەنها خواى خاليق ژيان بەئينسان دەبەخشێو غەيرى خواش هيچ كەسێك بۆى نيە ئەو مافە پێشێل بكاتو ژيان لەكەسێكى تر بسێنێتەوەو بيكوژێو بێبەشى بكات لەژيان. ئايەتە قورئانييەكە فەرمووى: منداڵەكانتان مەكوژن لەبەر هەژارىو نەدارى چونكە ئێمە ڕزقى ئێوەشو ئەوانيش دەدەين، هۆى هاتنە خوارەوەى ئەم ئايەتە ئەوەبوو كە: لەزەمانى جاهيليى پێش ئيسلامدا عەرەبەكان عادەتيان وابوو، بەتايبەت ئەوانەيان كەدەستكورتو نەداربوون، دەهاتن بۆ ڕێگرتن لەزۆربوونى خێزانەكەيان" بەرگرى منداڵبوونيان دەكرد، يان كاتێ خێزانەكەيان حاميلە دەبوو، بەلێدان .يان بەدەرمان منداڵەكەيان پێ لەبار دەبرد. خۆ ئەگەر منداڵەكە لەبار دايكى نەچوايەو بەزيندوويى لەدايك ببوايە، ئەوا لەدواى لەدايك بوونى دەيانكوشت بەبيانووى ئەوەى كەئەمان خۆيان هەژارنو نەدارنو بەهەزار حاڵ خۆيان پێ تێردەكرێ ئيتر چۆن بتوانن نانى منداڵيان پەيدابكەن. لە بەر ئەوە، مافى ژيانيان بەو كۆرپە بێتاوانە ڕەوا نەدەبينىو دەيانكوشت. جا خواى گەورە بەم ئايەتەى قورئان، ئەو جۆرە كەسانەى ئاگاداركردەوە كە هيچى تر تاوانى وانەكەن، چونكە خوا چۆن ئێستا .ڕزقوڕۆزيى ئەوانىداوە، ئەوا ڕزقى منداڵەكانيشيان دەدات، لەبەر ئەوەى ڕزقوڕۆزيى دايكو باوكيشو منداڵيش" هەر خواى گەورە دابينى دەكات.

كۆمەڵێكى تر هەبوون كەدەوڵەمەندو دەست ڕۆيشتوو بوون، بەڵام ئەمانيش حەزيان بەمنداڵ نەدەكردو منداڵيان لەبار خێزانەكانيان دەبرد، ياخـــود دواى لـەدايك بـوونيانبەزيـــنـــدوويـــى زيـنـــدەبـــــەچاڵيان دەكـــردن! بيانووى ئەمانەش ئەوەبوو دەيانگوت: ئێمە ئێستا وەزعمان باشەو نان هەيە بيخۆين، بەڵام لـەوە دەترسين ئەگەر منداڵمان ببێو منداڵەكان زۆر ببنو ژمارەى خێزانمان زياد ببێ ئەم بەرهەمەى ئێستا بەشمان ناكاو تووشى هـــــەژارىو لەبرسان مردويى ببين! خواى

گەورە وەڵامی ئەو خەیاڵە بەتاڵەو ئەو وەسوەسە شەیطانییەی ئەوانیشی دایەوەو فەرموی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئاً كَبِيراً ﴾(الاسراء 31), واتە: نەکەن منداڵەکانتان لەترسی گرانیو برسێتی بکوژن, چونکە پەروەردگارتان ڕۆزیبەخشو میهرەبانە, ئێمە ڕزقوڕۆزی دەبەخشین بەئەوانیشو بەئێوەش, چونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناه و تاوانێکی زۆر گەورەیە! لێرەدا خوای گەورە فەرموی:

﴿ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾, ڕزقوڕۆزیی ئەوانیش (منداڵەکانتان)و ئێوەش دەدەین, واتە ئەو منداڵەی کەهێشتا شیری دایکی دەخواو نانو ئاوی سەر سینیو سفرەی ئێوە نەچۆتە ناو گەدەیەوە, هەر ئێستا ڕزقی خۆی بۆ دیاریکراوەو پێش ئێوەی باوكو دایك کەگەورەنو توانای کارو کاسپیتان هەیە ڕزقی ئەو منداڵە لای خوا دیاریکراوەو ڕزقوڕۆزیی ئێوەش هەر خوا دەیداو هی ڕەنجو تێکۆشانو ماندووبوونی خۆتان نیە!

جا خوای گەورە لەبارەی هەردوو جۆرە کوشتنەکەوە چ ئەوانەی کەنەدارنو منداڵەکانیان لەترسی برسێتی دەکوژن چ ئەوانەشیان کەهەبوونو لەداهاتوو دەترسن کە بەهۆی منداڵەکانیانەوە تووشی نەداریو برسێتی ببن, لەبارەی هەردوو بۆچوونە بەتاڵو بێبناغەکەوە فەرمووی: ﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهاً بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴾(الأنعام 140), واتە: بەڕاستی ئەوانە خەسارەتمەندو زەرەرمەندن کەمنداڵەکانی خۆیان کوشت بەناحەقو ناڕەواو دوور لەهەموو زانستییەك, وەئەوەی خوا پێی بەخشیبوون لەخۆیان حەرام کردو لەناویان برد, هەموویشی بەهۆی درۆ هەڵبەستنەوە بەدەم خواوە, بەڕاستی ئەوانە گومڕانو ڕێبازی هیدایەتیان نەگرتۆتە بەرو هیدایەت دراو نین.

ئیمانداران: لەوانەیە هەندێ کەس وا بیربکەنەوە کەئەم تاوانە گەورەیە کەپێشێلکردنی یەکەم مافی کۆرپەیە, کەئەویش مافی ژیانە, ئەمە تەنها لەزەمانی پێش ئیسلامداو سەرەتای هاتنی نووری ئیسلامەوە بووەو ئیسلام بەڕەحمەتی خۆی ئەو زوڵمو تاوانەی قەڵاچۆ کرد, بەڵام دەبێ هەموومان ئەو ڕاستیە بزانین کەنەفامیو جەهالەت, مەرج نیە هەر لەیەك بەرگوکاڵاو لەژێر یەك دروشمو ناونیشاندا بێتو بەهەمان

کرداریەڕێوە بچێت,بەڵکولـــەهەمـــوو سەردەمێکدا کردارە جاهیلیەکان دووبارە دەبنەوەو هەرچەندە ناوو بەرگیان جیاوازە بەڵام لەناخو ناوەڕۆکدا وەك یەکن, وەکو ئەوەیلەڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئەم کوشتنو زیندەبەچاڵکردنی منداڵە لەشێوەو شێوازێکی ترداهەیە, ئەویش ئەوەیە کەژنو مێرد ڕێکدەکەون لەسەر ئەوەی کەمەنعی منداڵبوون بکەن, یان کەمنداڵەکە چووە ڕەحمی دایکیەوەو تەواو دروست بوو لەناویبەرنو وا بکەن ئافرەتەکە منداڵەکەی لەبار بچێ.

جا بەپێویستی دەزانم, بچینە خزمەت شەریعەتی ئیسلامیو بزانین حوکمی شەرع چیە لەم بارەیەوە, کەزۆربەی موسڵمانان بۆ ئەوەی تووشی ئەو گوناهە گەورەیە نەبن پێویستیان بەشیکردنەوەی ئەم باسە هەیە !

بەڕێزان: هەر ژنو مێردێك کەتازە لەسەرەتای هاوسەرایەتیدانو هیچ کێشەو گرفتێکی لاشەییو تەندروستییان نیە" بەتایبەت لەلایەن دایکەوە, تەنها لەبەر خاتری ئەوەی کەئەمان تازە سەرەتای ژیانی نوێیانەو با جارێ بەهۆی منداڵەوە ژیانیان لێ تێك نەچێو بۆ خۆیان بەئیسراحەت رابوێرنو ئەملاوئەولا بکەن, دێن مەنعی منداڵبوون دەکەن, یان کەزانییان منداڵەکە خەریکە دروست دەبێو ئافرەتەکە حامیلەیە, بەهۆی دەرزیو دەرمانەوە یان بەهۆی خۆ عەزیەت دانی دایکەکەوە (بەمەبەستی لەباربردنی منداڵەکە) ئەم منداڵە لەباردەبەن, یان هێشتا تەنها یەك منداڵیان هەیەو تەواو گەورە بووەو هیچ گیروگرفتێکی تەندروستی نیە بۆ دایکەکە, دووبارە مەنعی منداڵبوون دەکەن یان لەباری خۆیدەبات, ئەوەش تەنهاو تەنها بۆ ئەوەی بەهۆی ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەوە ژیانیان قورسو گران نەبێ.

ئەوە با ئەو جۆرە کەسانە بزانن کەحوکمیان" هەروەکو ئەو جۆرە کەسانە وایەکەکاتی خۆی لـــەسەردەمی نەزانیدا حەزیان بەمـــنداڵ نەدەکردو بەبروبیانووی ناڕەوا منداڵـــەکانیان دەکوشت. وە بەپێویستی دەزانم بەدایکانو خـــوشکـانی موسڵمان رابگەیەنم کەهەرگیز ئیشی وا نەکەنو نەچن لەسەرەتای ژیانی هاوسەریەتیەوە مەنعی منداڵبوون بکەن یان منداڵ لەبار خۆیان بەرن, لەبەر ئەوەی ئەمە لەڕوانگەی پزیشکیەوە کارێکی زۆر مەترسیدارە بۆ سەر دواڕۆژی ئەو دایکەو باری منداڵبوونی, لەبەر

ئەوەی ئافرەت ئەگەر لەحەملی یەکەمدا منداڵی لەبارچوو ئەوا زۆر مەترسی ئەوەی لێدەکرێ کەجارێکی ترمنداڵێکی ببێو لەبێ‌منداڵی رزگاری ببێ!

مامۆستایەکی ئیماندارو بەتەقوا ئەم بەسەرهاتە واقیعییەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کوڕو کچێك دوای بەیەك گەیشتنیان دوای ساڵێك خوای گەورە کوڕێکیان پێدەبەخشێت, بەڵام هەرچەندە زۆر خۆشحاڵ دەبن بەبوونی ئەم کوڕە جوانە نۆبەرەیان, لەگەڵ ئەوەشدا گرفتی ئەوەشیان بۆ دروست دەبێ کەچۆن ئەم منداڵە بەخێوبکەن, بەهۆی ئەوەی کەدایکی منداڵەکە فەرمانبەر دەبێو رۆژانە لەبەیانییەوە تا نیوەڕۆ دەوامی دەبێو ناتوانێ لای منداڵەکەی بێ, باوکەکەش کاسبکاری بازاڕەو بەیانی تا ئێوارە ناتوانێ بێتەوە ماڵەوە, لەبەر ئەوە دەبێ رۆژانە ئەم منداڵە ساوایە بەرن بۆ ماڵی دایکی ژنەکە, یان دایکی کوڕەکە, یان لای دەروددراوسێ بەجێی بێڵن! بەم شێوەیە دەروونیان نا ئارام دەبێو بەردەوام دڵیان لای کوڕەکەیان دەبێ. بۆیە ئەم دایكو باوکە بڕیاردەدەن کەمەنعی منداڵبوون بکەنو نەهێڵن منداڵی تریان ببێ چونکە بۆیان بەخێوناکرێ. بەڵێ منداڵەکەیان دەبێت بەپێنج ساڵانو رۆژێکیان دایکەکە هەست دەکات کەحەملی هەیەو بەپەلە دەچێت بۆ لای پزیشکی ئافرەتانو دوای ئەنجامدانی فەحصی پزیشکی, دکتۆرەکە دەڵێ: تۆ سکت هەیەو حامیلەیت, ئافرەتەکە بەم هەواڵە زۆر دڵتەنگ دەبێتو پاشان کەهەواڵەکە بەمێردەکەی دەدات ئەویش بەهەمان شێوە حەز بەبوونی ئەم سکە ناکاتو بڕیاردەدەن بچنەوە.بۆ لای دکتۆرەکەو داوای لێبکەن بەهەر شێوەیەك بێ, لەم سکە رزگاریان بکات, فیعلەن دەچنە لای دکتۆرەکەو داواکارییەکەیانی پێڕادەگەیەنن بەڵام ئەو رازی نابێ ئەو ئیشە بکاتو دەرمانێك بدات بەژنەکە تا بەهۆیەوە سکەکەی لەباربچێت, بەڵام ئەوەندەیان پێ دەڵێت کەژنەکە دەتوانێت بەهۆی خۆخستنە خوارەوە لەشوێنی بەرزەوە سکەکەی لەبارخۆی بەرێت. بەڵێ دێنەوە

ماڵەوەو کوڕە تاقانەکەیان لەماڵی دراوسێیەکیان دادەنێنو دەچن بۆ بناری شاخێك بۆ ئەوەی ژنەکە بەسەر شاخەکەدا سەرکەوێو لەهەندێ شوێنی بەرزەوە بازبدات بۆ ئەوەی کەمنداڵەکەی ناوسکی لەباربچێ! بەڵێ پاش چەند سەعاتێك کەژنەکە بەتەواوی خۆی ئازار دەدات, تووشی ژانەسك دەبێو سواری ئۆتومبێلەکەیان دەبنو دێنەوە بۆ

ماڵەوە, بەڵام کاتێ کــــەنـــزیـــك دەبـنـــەوە قەرەباڵغییەکی زۆر لەدەوروبەری ماڵی خۆیان دەبینن! کاتێ کەدەگەنە ماڵەوە بۆیان دەردەکەوێ کەئەمە کوڕەکەی خۆیانە کەلای ماڵە دراوسێ بەجێیان هێشتبوو چۆتە سەربان و کەوتۆتە خوارەوەو دەست بەجێ مردووە! هەر کەژن و پیاوەکە ئەم هەواڵە دەبیستن, هێشتا ناچنە سەر لاشەی کوڕەکەیان کەدەچن بۆ لای دکتۆرەکەو داوای لێدەکەن کە بەهەر شێوەیەك بێ نەهێڵێ ژنەکە منداڵەکەی سکی لەباربچێ, چونکە وا کوڕە تاقانەکەیان مردووەو ئەگەر ئەم منداڵەی ناو سکی لەباربچێ ئیتر بەبێ منداڵ دەمێننەوە! ئەمجا هەزار دوعاو پاڕانەوە دەکەن بۆ ئەوەی خوا ڕەحمیان پێبکاو وەکو ئەو تاقە کوڕەی لێ وەرگرتوونەتەوە, لەجیاتی ئەوە ئەم کۆرپەی ناو سکی دایکەکەیان بۆ بێڵێ!

موسڵمانان: هەرگیز ناڕەحەت نەبن کاتێ خێزانەکەتان حامیلە دەبێ و خەمی ئەوەتان بێ کەناتوانن بەخێوی بکەن چونکە منداڵی تریشتان هەیە, بەڵکو حەمدو سەنای خوای لەسەر بکە, لەبەر ئەوەی ئەگەر پێی ناشکور بی, ئەوە دوور نیە وەکو ئەو بەسەرهاتەی باسمان کرد, خوای گەورە منداڵەکەی تریشت لێ وەربگرێتەوەو پاشان بەخۆت بزانی کە چ هەڵەیەکی گەورەت کردووە!

ئیمانداران: لەگەڵ ئەوەدا کەئاینی ئیسلام هانی موسـڵمانانی داوە کەڕۆڵـەیان زۆربـێ و ژمارەی منداڵ ڕوو لەزیادبوون بکات وەکو پێغەمبەری خۆشـەویسـتمان صَـلَّی اللهُ عَلَیـهِ وَسَلَّم فـەرمـوویـەتـی (تَزَوَّجُوا, فَإِنِّي مُكاثِرٌ بِكُمُ الأُمَم)(رَواهُ أبو داود), واتـە: هـەولْبـدەن ژن بێنـن, چـونکـە من لەناو ئومەتەکاندا خۆمتان پێوە دەنوێنم.. وە لەبواری دنیاییـشدا, هـەر گـەلێ ژمـارەی زۆر بـێ, بەرهـەمی زیـاترە, وولاتـی ئـاوەدانترە, توانـای بـەرگری لەخۆکردنی زۆرتـرە, وەکـو گـوتراوە: ( إِنَّمـا العِـزَّةُ للكـاثِرِ ). بـەڵام لەگــــەڵ ئــەوەشدا پێویستە ئەوەش بڵێین کەدروستە ژمارەی منداڵ بەڕەزامەنـدیی ژن و پیـاو دیـاری بکـرێ, کـە لەئەوەنـدە منداڵـە زیاتریـان نـەبێ. جا ئـەم بەرگریکردنـە لـەبوونی منـداڵ بـەوە بـێ کەپیاوەکە تۆماوی خۆی نەکاتە نـاو ڕەحمـی ژنەکەیـەوە, بـەڵکو مەنیەکـەی لـەدەرەوە بیڕێژێ بۆ ئەوەی منداڵ دروست نەبێ, کە لەم حاڵەتـەدا پێویـستە ژنەکـەش ڕەزامەنـدی لەسەر ئەم کارە بێ, یاخود مەنعی منداڵ بوونەکـە بـەهۆی خـواردنی حـەب, یـان دانـانی

لەولەب, یان هەڵگێڕانەوەی ڕەحم بێ لەژێر چاودێریی دکتۆرێکی پسپۆڕدا ئەوە ئەو مەنع کردنە لەحاڵێکدا دروستە کەیەکێ لەم حاڵانە بێتەجێ:

1 ـ کاتێ ئەو ژنو پیاوە کۆمەڵێ کوڕو کچی وا زۆریان بێ کەلەوە زیاتر نەتوانن پەروەردەیان بکەن بەپەروەردەیەکی دروستو ئیسلامی, منداڵەکانیان وا زۆر بن کەدایکو باوك نەتوانن وەکو پێویست بەبواری پەروەردەیان ڕابگەنو ئامۆژگاریی چاکەیان بکەن.

2 ـ کاتێك ئافرەتەکە لەلایەن پزیشکێکی پسپۆڕ لەبواری ژنانو منداڵبووندا پێی بگوترێ کەئەگەر ئەم ژنە هیچی تر منداڵی ببێ لەوانەیە تووشی نەخۆشیی ترسناك ببێ لەکۆئەندامی زاوزێیدا, یان ئەو ژنە بەهۆی نەخۆشیی تری لاشەیەوە وا لاوازو بێهێز بووبێ کەئیتر بەرگەی منداڵبوون نەگرێو حامیلەبوونی مەترسی هەبێ بۆ سەر ژیانی خۆیو کۆرپەکەی ناو سکیو, کەئەمەش وەکو گوتمان دەبێ لەلایەن پسپۆڕێکی بواری ژنانەوە پێی ڕاگەیەندرابێ نەك خۆی لەخۆیەوە بڕیار بدات.

3 ـ کاتێ پیاوەکە باری ئابووریی زۆر کز بێو دەرامەتی زۆر کەم بێو منداڵی زۆری هەبێو هیچیان کاسپییان پێنەکرێ, باوکەکەش لەوە نەترسێ کەمنداڵەکانی لەبرسان دەمرن, بەڵکو یەقینی ببێ کەخوای گەورە ڕزقی هەموویان دەدات, بەلاّم دیارە هەموو سەردەمەکان وەکو یەکتری نین, منداڵی ئەم سەردەمە پێویستی بەچوونە قوتابخانە هەیەو بێگومان ئەمەش دەرامەتی باشی پێویستە, جا بەمەبەستی ئەوەی منداڵەکانیان وا زۆر نەبن کەبەم مووچەو دەرامەتە کەمە نەتوانن خزمەتیان بکەنو بەڵکو ئەگەر ژمارەی منداڵەکان کەم بن ئەوا باشتر دەتوانن خزمەتیان بکەنو وەکو منداڵانی خەڵکی ژیانیان مام ناوەندی بێ, ئەوە لەم حاڵەشدا لەبەر خاتری بەرژەوەندی منداڵەکانیان دروستە مەنع بکرێ, لەبەر ئەوەی زۆرکات منداڵی زۆر نەك هەر خزمەت بەدایكو باوكو کۆمەڵگا ناکات بەڵکو زەرەرو زیانێکی زۆریان لێدەدات!

بەداخەوە زۆر دایكو باوك تەنها هەر ئەوەیە دەزانن منداڵیان هەیەو نانو ئاوێکیان دەدەنێو ئیتر بەرەو قوتابخانە دەیاننێرنو کەهاتیشنەوە لێیان ناپرسنەوە چییان خوێندووەو چییان لەسەرە بۆ بەیانی, بەڵکو دوای دەوامی قوتابخانە ڕەوانەی کۆڵانیان دەکەنو ئیتر لەوێش لێیان ناپرسنەوە, بەم شێوەیە ئەم منداڵە هەم دواڕۆژی خۆی

دەفەوتێ، هەم دواڕۆژی هاوڕێکانیشی دەفەوتێنێ. کەواتە: ئەگەر ژن و پیاوێك خاوەنی دوو منداڵ بن و بتوانن پەروەردەیەکی دروستیان بکەن و پێیان بخوێنن و پاشەڕۆژ بیانکەن بەهەڵگری بڕوانامەیەك و خزمەتی کۆمەڵگای موسڵمانیان پێبکەن ئەوە ئەو دوو منداڵە زۆر باشترن لەدە منداڵ کە بەدوای یەکدا لەدایك ببن و خۆشیان نەزانن مانای بوونیان لەژیانداچی یە.

4 ـ ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: هەر لەو حاڵەتانەیە کەدروستە مەنعی منداڵبوون بکرێ، کاتێ کەژنەکە لەخۆی بترسێ کە بەهۆی منداڵبوونی زۆرەوە" جوانیەکەی بڕواو سەرەنجام مێردەکەی لەبەرچاوی بکەوێ و دڵی بچێتەسەر ئافرەتێکی تر ئەوە لەم کاتەدا مەنعی منداڵبوون بەڕەزامەندی ژن و مێردەکە دروستە، ئەوەش دوای ئەوەی کەدوو سێ منداڵیان بووە، بەمەبەستی پاراستنی خۆشەویستی نێوان ژن و مێردو دوورکەوتنەوەی ئاژاوەو پشێوی لەخێزاندا!

خۆشەویستان: مەسەلەیەکی تر کەپێویستە موسڵمانان لێی ئاگادارین بریتییە لە: لەباربردنی منداڵی ناو سك. بەڵێ هەرکاتێ ئافرەت حامیلەبوو، ئەگەر تەمەنی سکەکەی نەگەیشتبووە چوار مانگ واتە سەدو بیست ڕۆژ، کەتا ئەو کاتە وێنەی نهێنیی منداڵەکە هێشتا نەکێشراوە، بەڵکو هەر پارچە گۆشتێکە، ئەوە حەرامە ئافرەت دەرمان بخوا بەمەبەستی لەناوبردنی ئەو کۆرپەیەی ناو سکی. بەڵام ئەگەر لەبار برا ئەوە تۆڵە ناکەوێتە سەر ئەو کەسەی کارەکەی کردوە! بەڵام ئەگەر تەمەنی کۆرپەی ناوسك گەیشتە سەدو بیست ڕۆژ، واتە چوار مانگی تەواو کرد، ئەوە حەرامە منداڵ لەبار ببرێ و هەر کەسێ ئەم کارە بکا ئەوا تۆڵەی دەکەوێتە سەر.

ئیمامی زەرکەشی فەموویەتی: ئەگەر دایکەکە دوای حامیلەبوونی، بەهۆی سکەکەیەوە تووشی مەترسی بوو، دکتۆرەیەکی پسپۆڕی لەخواترسی زۆر شارەزا" دوای پشکنینی تەواو بەهۆی سۆنەرەوە یەقینی بۆ پەیدابوو کەئەم دایکە بەهۆی ئەم کۆرپەیەی ناو سکیەوە ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوەو (90٪) لەوانەیە بمرێ و ئەو منداڵەی لێ جیانەبێتەوە، یان بەهۆیەوە تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەنی مەترسیدار ببێ، ئەوە دروستە دەرزی یان حەب بەکاربێنێ بۆ ئەوەی منداڵەکەی لەباربچێ و ژیانی خۆی

پارێزراوبێ. بەڕێزان: بابزانین ئایا تۆڵەی کۆرپەی ناوسک (دِيَّةُ الجَنين) چی یە؟! ئایا کەسێك ببێتە هۆکار (سَبَبْ) بۆ لەبارچوونی منداڵێك چی دەکەوێتە سەر؟ خوێنی کۆرپەی ناو سك کە بەهۆی دەستدرێژی کردنەسەر دایکەکەوە, منداڵەکە بەمردوویی لەدایك بێت, جا فەرقی نیە کوڕ بێ یان کچ بێ, کۆرپەیەکی تەواو بێ یان هەر پارچە گۆشتێکی وێنەکراو بێ, هەرکەسێك ببێتە هۆی لەبارچوونی ئەم منداڵە, ئەوا پێویستە کۆیلەیەکی نێر یان مێ بدا لەخوێندا. جا ئەگەر وەکو ئەم زەمانە کۆیلە نەبوو, دەبێ پێنج وشتر یان نرخی پێنج وشترەکە بدرێ بەمیراتگرانی ئەو کۆرپە لەبارچووە.

ئیمانداران: ئەم ئیسلامە پیرۆزە, ئەوەندە گرنگیداوە بەپاراستنی مافی ژیان بۆ هەموو ئینسانێك, با ئەو ئینسانە کۆرپەیەکی ناو سکیش بێ, کەئەم مەرجانەی داناوە بۆ ئەوەی مافی کەس نەفەوتێ‌و کەس نەتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەر دایکێك کەکۆرپەی لەسکدایە, جا هەرکاتێك کەسێك ئەم مەرجانەی لێ هاتەجێ دەبێ خوێنی کۆرپەکە بدات:

**یەکەم:** ئەو کەسەی لەئافرەتەکەی داوە, دەبێ بەلێدانێکی وا توند بووبێ کەبگوترێ ئەم لێدانە بوو بەهۆی لەبارچوونی ئەم منداڵە, وەکو شەقێکی بەهێز, یان زللەیەکی توند کەئافرەتەکە بخاتە سەر زەوی, یان بەردێك بەسکی ئافرەتەکەدا بدا, یان دارێك گۆچانێکی لێ بدا, یان بەزۆر دەرمانێکی وای دەرخواردی ئافرەتەکەدا کەدەبووە هۆی لەبارچوونی کۆرپەکەی, ئەوە لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا خوێن دەکەوێتە سەر ئەو کەسەی کەبوو بەهۆی لەبارچوونی کۆرپەکە. بەڵام ئەگەر کەسێك بەحاڵ دەستی لەئافرەتەکەداو منداڵەکەی لەبارچوو, ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر.

**دووەم:** مەرج بۆ ئەوەی خوێنی کۆرپەی ناوسك واجب بێ ئەوەیە کەمنداڵەکە بەمردوویی لەدایکی جیاببێتەوە, بەڵام ئەگەر کەسێك لەدایکەکەی داو دایکەکە بەو لێدانە مردو, منداڵەکەش لەسکیدا مردو لێی جیا نەبۆوە, ئەوا هەر خوێنی دایکەکە واجب دەبێ‌و خوێنی منداڵەکە واجب نابێ.

**سێیەم:** وەکو گوتمان دەبێ منالەکە بەمردوویی لەدایکی جیابووبێتەوە, بەڵام ئەگەر لەئەنجامی ئەو لێدان‌و ئازاردانە توندەدا, منداڵەکە بەزیندوویی لەدایکی هاتە دەرەوەو لەبارچوو, ئەوا تەماشا دەکەین" ئەگەر منداڵەکە ماوەیەك ژیاو هیچ ئازاری نەبوو, دوای

ئەوە مرد, ئەوا هیچ خوێنێك ناكەوێتە سەر ئەو كەسەی كە لەئافرەتەكەی داوە, چونكە لەوانەیە ئەو منداڵە دوای جیابوونەوە لەدایكی" بەهۆكارێكی تر مردبێ, بەڵام ئەگەر لەكاتی جیابوونەوە لەدایكی منداڵەكە زیندوو بوو, بەڵام هەر كە لەدایكی جیابۆوە یەكسەر مرد, یان ماوەیەك بەئازارەوە ژیاو پاشان مرد, ئەوا خوێنێكی تەواو واجب دەبێ, واتە ئەگەر منداڵە لەبارچووەكە كوڕ بێ, دەبێ لەم حاڵەتەدا, سەد حوشتر بدرێ بەوارثی ئەو كۆرپە لەبارچووە !

وەنیشانەكانی ژیانیش دوای جیابوونەوەی كۆرپەلە لەدایكی یەكێكە لەمانە: دەنگی لێ بێ, هەناسە بدا, دەم بجولێنێو مەمك بمژێ, یان بەتوندی قاچو دەستی بجولێنێ, ئەوە لەبەر ئەوەی بەزیندوویی لەدایكی جیابۆتەوەو بەئازارەوە ژیاوە, دوای لەبارچوونو مردنی, خوێنی ئینسانی گەورەی بۆ دیاریدەكرێ. بەڵام ئەگەر كەسێك لەئافرەتێكی دا ئافرەتەكە حامیلەبوو و ئەم ئافرەتە بەم لێدانە مرد, دوای مردنی دایكەكە منداڵەكەش بەمردوویی لەدایكی جیابۆوە, ئەوا دەبێ خوێنی دایكەكە بدا كەخوێنی تەواوە, خوێنی كۆرپەلە لەبارچووە مردووەكەش بدات كەپێنج حوشترە, یان قیمەتی پێنج حوشترەكە بدات..

ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەصەحیحەكەیدا لەحەزرەتی ئەبو هورەیرەوە ( ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە كەفەرموویەتی: جارێكیان دوو ژنی هوذەیلی بوو بەشەڕیان, یەكێكیان بەردێكی گرتە ئەوی تریان كەئەوەی بەردەكەی بەركەوت" حامیلەبوو, ئیتر بەم بەردە خۆیو منداڵەكەی ناو سكی مردن. جا بۆ چارەسەری ئەم كێشەیە هەردوو بنەماڵە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر صَلّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم, پێغەمبەری خواش بڕیاریدا كەخوێنی كۆرپە دەكاتە بەندەیەك {جا نێر بێ یان مێ, ئەگەر بەندە دەستنەدەكەوت پێنج حوشتر دەدرێ} , وەفەرمووی: خوێنی ژنە كوژراوەكەو خوێنی كۆرپەكەی ناوسكی لەسەر كەسوكاری ژنە قاتیلەكەیە نەك لەسەر ژنە تاوانبارەكە خۆی, وەمیراتی ژنە كوژراوەكەیشی دا بەمنداڵەكانیو خزمە میرات بەرەكانی ژنەكە. جا كاتێ پێغەمبەری خوا ئەم بڕیارەیدا, كابرایەك بەناوی (حەمەل) كەكوڕەزای نابیغەی هوذەلیەیە, لەمەجلیسەكەدا بوو, بەم شەرعە ناڕازی بوو,

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چی بڵێم, ئاخر منداڵێك نە ئاوی خواردۆتەوە, نە نانی خواردوە, نە ورتەی لەدەم هاتۆتە دەرەوە, نە نقەی لێوە هاتووە, شتی وا چۆن خوێنی هەیە؟! پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرمووی: خەڵکینە ئەوەی من گوتم شەرعی خوا وایەو فەرمانی خوا وایە, بەڵام ئەم کابرایە بەم قسە قوتانەی" وا دەردەکەوێ کە لەدەستەی کۆڵەنانیو فاڵچیو کاهینانە.

بەڕێزان: هەروەکو چۆن ئەگەر کەسێ لەئافرەتێکی حاملە بداتو منداڵەکەی لەباربەرێت خوێنی دەکەوێتە سەر, بەهەمان شێوە ئەگەر کەسێك ئافرەتێکی حاملە بترسێنێو بیتۆقێنێو بەو هۆیەوە منداڵەکەی لەبارچێ دەبێ خوێنی ئەو کۆرپەیە بدات. هەروەکو مێژووی ئیسلام بۆمان دەگێڕێتەوە کەجارێکیان لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابدا ( ڕەزای خوای لێبێت) کابرایەك دەچێتە خزمەت ئەمیری ئیماندارانو شکاتی ئەوە دەکات کەژنەکەی زۆر لەگەڵیدا خراپە, بەڵکو ئیمامی عومەر تۆزێ بۆی نەصیحەتو ئامۆژگاری بکاتو دووبەرەکیو ناکۆکی لەخێزانەکەیان بچێتە دەرەوە. کاتێ ئیمامی عومەر بەدوای ژنەکەدا دەنێرێ, ژنەکە لەو کاتەدا حاملە دەبێ, کەدەڵێن وا ئیمامی عومەر بانگت دەکاو مێردەکەت شکاتی لای ئەو لێکردووی, دەزانێ خەلیفەی موسڵمانان لەگەڵ ئەو هەموو سۆزو شەفەقەتەی کە لەگەڵ ڕەعیەتو ژێردەستەکانیدا هەیەتی, بەڵام مافی کەسیش بەسەر کەسەوە ناهێڵێو تۆڵەی لێ دەستێنێو هەر تەمبێی دەکات. ئەمیش خۆی دەزانێ چەند خراپەی لەگەڵ هاوسەرە باشەکەیدا کردووە, لەبەر ئەوە ترسێك دێتە دڵیەوەو منداڵەکەی لەباردەچێ. کاتێك ئەم هەواڵە بەئیمامی عومەر دەگاتەوە هەموو گەورەپیاوانی صەحابە کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی ڕاوێژیان پێبکات دەربارەی ئەوەی کەئایا خوێنی ئەو منداڵە لەبارچووەی دەکەوێتە سەر کە بەهۆی ترسان لەوەوە لەبارچووە؟! زۆربەی صەحابەکان ڕەئیان لەسەر ئەوەبوو کە: نەخێر هیچت ناکەوێتە سەر, چونکە خۆ تۆ ڕقت لەو ئافرەتە نەبووەو لەسەر خۆت بانگت نەکردووە, بەڵکو تۆ وەکو نەصیحەتکارو باوکێك بانگت کردووەو بۆ مەصڵەحەتی خۆیو ماڵو مێردی خۆی بووە, بەڵام ئیمامی عەلی فەرموی: نەخێر من لەگەڵ ئەم ڕەئیەدا نیم, بەڵکو من دەڵێم مادام ئەو کۆرپەیە بەهۆی ترسی دایکیەوە لەتۆ

لـــەبــارچـــووە، ئـــەوا خوێنـت دەکـــەوێتە سـەرو دەبێ پێنج حـــوشتر بـــدەی بەدایــکو بـاوکــی ئەو مــنـداڵە !

ئیمامی عومەر ڕەئیەکەی ئیمامی عەلی پەسەند کردو پێنج حوشـتری لـەماڵی خـۆی دا بەدایکو باوکی منداڵەکە !

خۆشەویستان: یەکێکی تر لەو شتانەی کەئاینی پـیرۆزی ئـیسلام زۆر گرنگـی پێداوەو یەکێکە لەمافەکانی ژیانی منداڵو پێویستە دایکو باوك پێش بەیـەك گەیشتنیان ئـەنجامی بدەن بریتییە لەپشکنینی پزیشکی پێش هاوسەر گرتن (الفَحْص الطِّبِّي قَبلَ الزَّواج) کەزۆر لەحکومەتەکانی ئێستا چەند یاسایەکیان دەرکـردووە سـەبارەت بەپێویسـتی بـوونی ئـەم فەحصە پزیشکییانە پێش بەهاوسەربوونی کوڕو کچەکە. دیـارە ئـیسلام پێشینەی هەیـە سەبارەت بەم مەسەلەیە، بەڵام جێی داخە ئەو تاقیکردنەوە پزیشکییە زۆر لەپزیـشکەکان تەساهولی تێدا دەکـەنو بەهەنـدی نـاگرنو کـوڕو کـچیش لەبـەری هەڵدین، کـە بەڕاسـتی ئەمەش ئاکامەکەی خراپ دەکەوێتە سەر منداڵەکانیان. یان زۆرجار لەوڵاتی ئێمە کوڕو کچ دوای بەیـــەك گەیـــشتنیان ئـــەمجا بەمەبەســـتی عەقـــدی زەواجـــی لای حـــاکم ئـــەم فەحصانەدەکەن !

دکتۆر (وَجیه زَین العابدین) لەڕیسالەکەی (الإسلام والتَّربیة الجِنسیَّة)دا گوتوویەتی: پێویـستە لـەنیزامی ئـیسلامیدا کـچو کـوڕ پـێش ئـەوەی بەیـەك بگـەن فـەحص بکـرێن، بەتایبەتی بۆ زانینی باری زاوزێی ئافرەتەکە کەئایا منداڵی دەبێ یان نـا، هـەروەها دەبـێ فەحصی پیاوەکە بکرێ، نـەوەکو نەخۆشـییەکی درمـی نـەزۆکی یـان شـێتی هـەبێت، بـۆ ئـەوەی پـێش بەیـەك گەیـشتنیان چارەسـەریان بـۆ بدۆزرێتـەوەو چارەسـەربکرێنو دوای ماوەی ژنو مێردایەتی دڵتـەنگیو نارەحـەتی ڕوویـان تێنـەکات. جـا یـەکێ لـەو شـتانەی کەپێویـستە بکرێـت، پـشکنینی گرووپـەکانی خـوێنی ژنو مێـردە، لەبـەر ئـەوەی چـوار ئیحتیمال هەیە ڕەنگە ڕووبدات:

ئیحتیمـالی یەکـەم: گرووپـــی هەر یەك لەژنو مێرد، خوێنەکەیان گرووپی (+) بێت.

ئیحتیمـالی دووەم: گرووپـــی خوێنی ژنو مێردەکە (–) بێت.

ئیحتیمالی سێیەم: گرووپی خوێنی ژنەکە (+) بێتو گرووپی خوێنی پیاوەکە(ـ)بێت.
جا ئەگەر گرووپی خوێنەکان بەم شێوەیەبوو, ئەوا هیچ گیروگرفتێکی خوێنی لەنێوان ئەو ژنو مێردەدا نابێتو دەتوانن بەیەك بگەن. بەڵام ئیحتیمالی چوارەم ئەوەیە: گرووپی خوێنی ژنەکە (ـ) بێتو هی مێردەکەی (+) بێت, ئەو کاتە گرووپەکانی خوێنی ژنو مێرد ڕێك نابێتو جیاواز دەبێت کەخۆشبەختانە ئەم ئیحتیمالی چوارەمە زۆر کەم ڕوودەداتو, لەم حاڵەتەدا ڕەنگە منداڵەکە گروپی ئیجابیی باوکی هەڵبگرێتو لەلای دایك دژە مژادی خوێنەکەی کە (ـ) گرووپە دروست دەبێت, ئەمەش لەئاکامی سك پڕی بەمنداڵێکی ئیجابی (+) گرووپ خوێن. جا لەوانەیە منداڵی یەکەم ئاسایی بێت, بەڵام لەمنداڵی دووەمو سێیەمدا, منداڵ تووشی حاڵەتێکی نائاسایی دەبێتو زۆر جار ئەو منداڵانە گرۆیی و لەڕوولاوازو ئیفلیج دەردەچن. جا لەبەر ئەوە, بۆ ئەوەی ئەو منداڵە بێگوناهە لەخۆشیی ژیان مەحروم نەبێ, واجبەو زۆر زەرووره کەکوڕو کچ پێش ئەوەی بچنە کەژاوەی هاوسەرایەتییەوە ئەو شیکاری گرووپی خوێنەیان ئەنجام بدەن, بۆ ئەوەی ئەگەر گرووپی خوێنەکەیان لەئیحتیمالی چوارەم بوو, لەلایەن دکتۆری پسپۆڕەوە چارەسەریان بکرێتو ژیانی کۆرپەکە نەکەوێتە مەترسییەوە!
هەروەها یەکێکی تر لەو شتانەی کەئاینی ئیسلام نەك هەر نەهی لێ نەکردووەو بەتاوانی نەزانیوە, بەڵکو زۆر بەزەرووری پێویستیشی داناوە ئەوەیە کەئافرەتی حامیلە ناو بەناو سەردانی پزیشکی (سۆنەر) بکات بۆ دڵنیابوون لەبارودۆخی ئاسایی کۆرپەکەی‌ناو سکی!
هەروەها دەبێ بەواجبێکی دینی بزاندرێ کاتێ ئافرەت حامیلەبوو, لەو کاتەدا لەلایەن هاوسەرەکەی‌و کەسانی دەوروبەریەوە, ئەوپەڕی ئیسراحەتو دڵخۆشیی‌و ژینگەیەکی ئارامی بۆ دابین بکرێ, لەبەر ئەوەی زانایانی پزیشکی دەفەرموون: کاتێك منداڵ لەسکی دایکیدا دەگاتە تەمەنی حەوت مانگی, لەو کاتەدا ئەگەر دایکەکەی دڵخۆش‌و ئارام بێ, ئەو منداڵە دەست دەکات بەسەماکردن‌و زۆر خۆشحاڵ دەبێ, بەڵام ئەگەر دایکەکە دڵتەنگو نائارام بێ, ئەوا منداڵەکەش لەناو سکیدا نائارام دەبێ‌و هەست بەناڕەحەتی دەکاتو ئەمەش کاردەکاتە سەر باری تەندروستیی منداڵەکەو تەنانەت

لەسکی دایکیدا لەرو لاوازی دەکاتو کە لەدایکیش بوو, تا گەورەییش منداڵێکی خەمۆكو خەفەتبار دەردەچێت. بەڵام ئەگەر دایکەکە دڵخۆش بوو, ئەوا منداڵەکەش ئارام دەبێتو تەندروستی لەبارو باش دەبێتو لەدوای لەدایك بوونیشی منداڵێکی ڕووخۆشو دەموچاو کراوە دەبێت.

خۆشەویستان: ئەم ئاینی ئیسلامە کەسەرتاپا ڕەحمەتە, هەمووی هەر مافی ئینسانە, مافی ئینسانیش لەئیسلامدا ئەوەندە بەرزو بەڕێزە, ئەوەتا لەم بابەتی پاراستنی ژیانی کۆرپەدا جیاوازی ناکات ئایا ئەو منداڵەی کە لەسکی دایکیدایەتی دایكو باوکەکەی موسڵمانن یان کافرن, با دایكو باوکەکەی دوژمنی خواو پێغەمبەریش بن, لەبەر خاتری کۆرپەکەی ناوسکی, نابێ دایکەکەی بترسێنرێو تووشی دڵەڕاوکێ بکرێو ئازاری دەروونی بدرێ, نەوەکو ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەکەو مردنی, یان ناڕەحەت بوونی کۆرپەلەکە لەناو سکی دایکیدا بەهۆی ناڕەحەتبوونی دایکیەوە وەکو باسمان کرد, کەکۆرپەلە بەناڕەحەت بوونی دایکی نائارام دەبێو خەفەت دەخوا.

جا ئازیزان: ئەوەی کەدەیڵێین ئەوە نەبێ هەر قسەبێ, بەڵکو بەکردارو بەڕەفتار ئەم حەقیقەتە سەلمێنراوە. با نموونەیەك باس بکەین: سەرکردەی پاڵەوانی کوردزوبانی ئیسلام صەلاحەدینی ئەیووبی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بۆ دەستگرتنەوە بەسەر شاری ئەینەوادا, هێرشێکی دلێرانەی کردە سەر شارەکە, جا لەو کاتەدا خێزانی پاشای موصڵ سکی پڕ بوو, وەکاتی لەدایکبوونی کۆرپەکەش نزیك ببۆوە, هەموو دەستەو دائیرەی پاشا لەناو کۆشکدا خەمی ئەوەیان لێهات کە لەوانەیە شاژن لەم جەنگە سامناکەدا بترسێتو بەو هۆیەوە سکەکەی لەباربچێت, بۆیە دوای گفتوگۆو گەڕان بەدوای چارەسەری ئەم مەسەلەیەدا, دایکی شاژن گوتی: من دەچم بۆ لای سەرکردەی موسڵمانان کەصەلاحەدینی ئەیووبییەو تکای لێدەکەم کەدوو مانگی تر ئەم جەنگە دوابخات تا کچەکەم بەهێمنیو بێدڵەڕاوکێ شازادەی ببێت. پاشا بەخەسووی گوت: وابزانم ڕۆیشتنەکەت بێسوود دەبێت, چونکە سۆزو بەزەیی لەناو جەنگدا کۆنابێتەوەو لەکاتی شەڕدا خاترو خۆشی لەنێوان دوژمنەکاندا نیە. بەڵام دایکی شاژن لەتاوی کچەکەی هەر سووربوو لەسەر بڕیاری خۆیو ئەوەبوو کاتێ گەیشتە خزمەت صەلاحەدینو

داواکارییەکەی خستەڕوو سەرکردەی ئیسلام, پەروەردەی مەکتەبی قورئان بەبێ وەستان و دوودڵی فەرمووی: ئێمەی موسڵمان نابینە هۆی دڵداکەوتن و تۆقاندنی ژنانی سك پڕو لەبارچوونی کۆرپە بێگوناهەکانیان, ئەوا بڕیارمدا تا دوو مانگیتر جەنگ بوەستێ و هەمووتان دڵنیابن کەهێرشتان ناکەینە سەر تا ئەو کاتەی دوای دوو مانگەکە شاژن منداڵەکەی بەئاسوودەیی دەبێ!

بەڕاستی شانازییە بۆ ئێمەی کورد, کەسەرکردە موسڵمانەکانمان ئاوا بەچاکی لەرەحم و ڕەحمەتی ئیسلام گەیشتوون و, هیچ شتێ لەم حەقیقەتە گەورەیە لای نەداون. صەلاحەدین نەیفەرموو: جا ئەوە کەی موشکیلەی منە, خۆ ژنی خەلیفەی موسڵمانان حامیلە نیە! نەیفەرموو: باوك و دایکی ئەو منداڵە دوژمنی سەرسەختی ئیسلامن و کۆرپەکەشیان هەروا دەبێ, کەواتە هەر ئێستا بمرێ باشترە! نەیفەرموو: ئاخر ئەمە جەنگەو ئێوە تا دوو مانگی تر تەواو خۆتان کۆدەکەنەوەو کۆمەك و یارمەتیتان لەملاولاوە بۆ دێت و ئەم مۆڵەت دانەتان بەزەرەری ئیسلام و لەشکری ئازادیبەخشی ئیسلامی تەواودەبێ!

ئازیزان: هەرچەندە ئەمانە هەمووی حەقیقەتن و سەرکردەی سەربازیی ئەمانە باش دەزانێ, بەڵام هێشتا ئەم ڕاستییانە نابنە هۆکار بۆ ئەوەی ژیانی کۆرپەیەکی ناوسکی دایکێکی کافر بخرێتەوە مەترسییەوە!

ئیماندارانی بەڕێز: با بزانین ئایا دوای تەواوبونی دوو مانگەکەو لەدایکبوونی کۆرپەکە بەسەلامەتی, دوای ئەوە چی ڕوودەدات؟ بەڵێ پاش کۆتایی هاتنی دوو مانگەکە, پاشای موصڵ و خێزانەکەی بەمەلۆتکەوەو دایکی شاژن و وەزیرو دەست وپێوەندیان, چوونە خزمەت سەرکردەی کوردی موسڵمان و بەبێ شەڕوگەڕ کلیلی شاری نەینەوایان خستە بەردەستی و فەرمووی هاتنە ژوورەوەیان لێکرد! چونکە تێگەیشتن ئەمانە نەهاتوون خاك و وڵاتی هیچ نەتەوەیەك داگیربکەن, بەڵکو فیعلەن ڕزگارکەرن و هەموو ئاواتیان بەئازادی و ئارامی ژیانی مرۆڤەکانی سەر زەوییەبەجیاوازی ئاین و بیرو بڕواشەوە! بەڵێ, ئەمەیە ڕۆڵی گرنگیدان بەئینسان لەکاتی جەنگدا! دەی دەبێ لەئاشتیدا چۆن بێت؟! دەبیهێنە خەیاڵی خۆت, کەسەرکردەیەکی پاڵەوانی

سەرکەوتووی پشتی خاچ پەرستان شکێن, ئا بەو جۆرە گرنگی تەنانەت بەساوایەکی هێشتا لەدایك نەبوو بدات, ئیتر دەبێ مافی مرۆڤە گەورەکانو گەنجو پیرەکانی چۆن پاراستبێ؟!

داوا دەکەم لەخوای گەورە رەحم بەخۆمانو دایکو باوکمانو خێزانو منداڵمان بکات..لەگەڵ هەموو ئیماندارانی ئومەتی محمد المُصطفى صَلّی اللهُ عَلَیه وسلّم دا, لەدینەکەمان زیاتر شارەزامان کا..

هەموو لایەکمان سەرفرازو سەرکەوتووی دونیاو دوارۆژکا..

اللّهُمَّ آمین..

# وتـارى ژماره يانزه

## مافى منداڵ

### بەشى دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ وزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لا تَذَرْنِي فَرْداً وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ, فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴾

( الانبياء 89 ـ 90 )

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ, إِذْ أَتَى أَهْلَهُ, قال: بِسْمِ اللهِ, اللَّهُمَّ جَنِّبْنا الشَّيْطان, وَجَنِّبِ الشَّيْطانَ ما رُزِقْتَنا, فَيُولَدُ بَيْنَهُما وَلَدٌ, فَلا يُصيبُهُ الشَّيْطانُ أَبَداً )

( رَواهُ البُخاري وَمُسلِم )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آلـه وصَحبِهِ أجمعـين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيماندارانى بەڕێزو خۆشەویست, سەلامو ڕەحمەتى خوا لەهەموو لایەکمان بێت, لەوتارى رابردوودا باسى ئەوەمان کرد کەخواى گەورە ئامۆژگاریمان دەکات سەبارەت بەنەوەو ڕۆڵەکانمانو فەرمووى: ئەولادو منداڵەکانتان مەکوژن لەترسى ئەوەى نەتوانن ڕۆزییان بۆ دابین بکەن, چونکە من ڕزقوڕۆزیى ئێوەشو ئەوانیش دەدەم.

جا خۆشەویستان: لەڕاستیدا وەکو کوشتنى حەقیقىو راستەقینە هەیە وەکو ئەوەى منداڵەکەت بخەیتە چاڵێکەوەو گڵى بخەیتە سەر تاوەکو تەواو ڕۆحى دەردەچێو دەمرێ, بەهەمان شێوەش منداڵ لەلایەن دایکو باوکەوە دەکوژرێو ژیانى دەفەوتێنرێ, ئەوەش کاتێ کەپەروەردەیەکى دروستى نەکەنو ئەو مافانەى کەخواى گەورەو پێغەمبەرى ئیسلام صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بۆ منداڵیان داناوە بەرامبەر منداڵەکەیان جێبەجێى نەکەن. کەواتە لەم ڕۆژگارو سەردەمەدا ئەگەرچى منداڵ لەلایەن باوك یان دایکەوە لەترسى برسیەتى زیندەبەچاڵ ناکرێو ناکوژرێ, بەڵام بەجۆرێکى تر ژیانى منداڵ لەناو دەبرێو ژینى لێ دەکرى بەژان, ئەویش بەوەى کەباوكو دایکانێکى زۆر هەن زۆر کەم تەرخەمن بەرامبەر ڕۆڵەکانیانو هەر لەسەرەتاوە هیچ مافێکى منداڵەکانیان نەداوە, بەڵام دواتر کەمنداڵەکانیان گەورەبـوون ئەمجا چاوەڕێى ئەوەن کەڕۆڵەکانیان کەکچو کوڕەکانیان خزمەتیان بکەنو مافى دایـكو باوکیان بزانن, بەڵام بێئاگـا لـەوەى کەچۆن دایكو باوك مافیان لەسەر منداڵ هەیە, منداڵیش لەتەمەنى منداڵیدا مافى لەسەر دایكو باوکى هەیە, وەکو پێغەمبەرى خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویـەتى: (كَما أنَّ لِوالِدِكَ عَلَيْكَ حَقاً, كَذلكَ لِوَلَـــــدِكَ عَلَيْكَ حَـــقٌّ ) (رواهُ البُخاري).

واتە: هەروەکو چۆن تۆ مافت بەسەر منداڵەکەتەوە هەیە, بەهەمان شێوەش منداڵەکەت مافى لەسەر تۆ هەیە, لەفەرموودەیەکى تردا خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ سائِلٌ كُلُّ راعٍ عَمَّا اسْتَرْعـاهُ, أحَفِـظَ أمْ ضَيَّعَ, حَتَّـى يُسْـأَلَ الـرَّجُـلُ عَنْ أهْـــلِ بَيْتِـــهِ)(حَديثٌ صحيح رواهُ إبنُ حَـبَّـــان),

واتە:خوای گەورە پرسیالەسەرکارەکان دەکات دەربارەی ئەوەی کە لەژێر دەستیاندا بووە, کەئایا مافی پاراستوون یان فەوتاندوویەتی, تەنانەت پیاویش دەربارەی خاووخێزانەکەی پرسیاری لێدەکرێت.

بەرێزان: منداڵ یەکێکە لەنیعمەتە هەرە گەورەکان کەخوا بەعەبدی خۆی دەبەخشێ, وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لا یَدَعَ أَحَدُکُمْ طَلَب الْوَلَد, فَإِنَّ الرَّجُلَ إِذا ماتَ وَلَیْس لَهُ وَلَدُ إِنْقَطَعَ إِسمُهُ)(رَواهُ الطَبَراني وإسنادُهُ حَسَن), واتە با هیچ کەس لەئێوە واز نەهێنێت لەداواکردنی خستنەوەی منداڵ, لەبەر ئەوەی ئەگەر ئینسان مردو منداڵی نەبوو, ئەوا ناوی دەبڕێتەوە !

لەفەرموودەیەکی تردا خۆشەویستمان صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (ما وَلَدَ في أَهْلِ بَیْتٍ غُلامٌ, إِلاّ أَصْبَحَ فیهِمْ عِزٌ لَمْ یَکُنْ)(رَواهُ الطَبَراني في الأوسَط), واتە: هەر ماڵێك منداڵێکیان ببێ, ئەوا سەربەرزیەکیان بۆ دەبێت کەپێشتر نەبووە.

موسڵمانانی بەرێز: فەرموون با ئێستا باسی مافەکانی منداڵ بکەین هەر لەپێش لەدایکبوونیەوە تا کاتی لەدایکبوونو گەورەبوونی ئینشائەڵلا.

بەڵێ بەرێزان, مافی منداڵ ئەوەندە گەورەیە نەك هەر کاتێ کەمنداڵەکە لەدایك دەبێ یان پێشتر کە لەسکی دایکیدایەتی مافی بەسەر دایکو باوکیەوە هەیە کەئاگایان لەژیانی بێو مافی ژیانی بپارێزن, بەڵکو لەکاتێکدا کەهێشتا منداڵ نەچۆتە رەحمی دایکەوەو هێشتا هەر ئاوە لەپشتی باوکو سنگی دایکدا. بزانین لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم چی پێویست کردووە لەسەر باوکو دایکان کەبەرامبەر رۆڵەکانیان ئەنجامیبدەن.

**مافی یەکەم:**

هەڵبژاردنی هاوسەری باشو خواناس لەکاتی ژن هێناندا, لەبەر ئەوەی ئەمە رۆڵێکی گەورەی هەیە لەسەر منداڵەکە لەداهاتودا, بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێت: (تَخَیَّروا لِنُطَفکُمْ, فَإِنَّ العِرْقَ دَسَّاس) (رَواهُ إبنُ ماجَة).

بەڵێ, لەهەموو پەیڕەوێکی پەروەردەییدا هەوڵ دەدرێت مرۆڤ وا پەروەردەبکرێت کە لەداوڕۆژدا بتوانێ نانی خۆی پەیدا بکاتو زەرەرو زیانی نەبێ بۆ گەلو کۆمەڵو

نیشتمانەکەی, ئەمە مەبەستێکی زۆر بەرزو پیرۆزە, بەڵام ئاینی ئیسلام هەوڵ دەدات کەئینسان لەو مەبەستەش زیاتر پەروەردە بکات کەبریتییە لەجێبەجێکردنی پەیامەکەی خوای گەورە, چونکە دەزانێ کەمرۆڤ لەوە زیاتری پێیە کەزەرەر نەدات لەکۆمەڵ بەڵکو سوود بەکۆمەڵگەی خۆی ببەخشێ, مەسەلەی پەروەردەش لەمنداڵەوە دەست پێدەکات.

ئیسلام زۆر بەقووڵی نەخشە بۆ پەروەردەی منداڵ دەکێشێ, ئیسلام نەخشەی داناوە کەپیاو لەسەر چ بناغەیەك هاوسەری خۆی بدۆزێتەوە, هەروەها ئافرەتیش لەسەر چ پێشینەیەك هاوسەری خۆی بدۆزێتەوە, پێوانەی داناوە, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم دەفەرموێت: ئافرەت لەبەر چوار هۆ لەلایەن پیاوەوە دەخوازرێت یەکەم: جوانی, دووەم: عەشرەتو کەسوکارەکەی, سێیەم: سامانەکەی, چوارەم: دینەکەی. ئینجا فەرمووی: تۆی موسڵمان خاوەن دینەکە هەڵبژێرە, چونکە ئەوە بناغەیە, لەبەر ئەوەی جوانی یان پارەو پوولو سامان لەوانەیە بەشەوو رۆژێك نەمێنێت, بەچەند چرکەیەك لەناوبچێت, بەڵام دینو بیروباوەڕ کەسەرچاوەی رەوشت جوانییە ئەوا هەر دەمێنێت. کەواتە: پێویستە کوڕ کچێك بخوازێ کەخاوەنی دوو شت بێت, یەکەم: دین, دووەم: رەوشتو ئەخلاق. بەهەمان شێوەش کچ شوو بەکوڕێك بکات کەخاوەنی ئەو دوو صیفەتە بەرزە بێت (دینُهُ وَخُلُقُهُ). هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم" کچو کوڕ ئاڕاستە دەکاتو دەفەرموێ: (تَزَوَّجُوا فِي الْحِجْرِ الصَّالِحِ),(رَواهُ الدیْلَمي), واتە: ببنە هاوسەری یەکێك کە لەخێزانێکەوە هاتبێت کەدایكو باوکەکە صالح بن, چونکە وەکو چۆن شیر بەو منداڵە دراوە, ئاواش رەوشتی دراوەتێ, جا دایكو باوکی صالحو چاکەکار, صالحیەتەکەی خۆیان داوە بەو منداڵەش. ئیسلام ئەم هەموو نەخشەیە بۆ ئەوە دەکێشێ کەئەو منداڵە لەدەوروبەرێکی ئاسوودەدا چاوبکاتەوە, لەشوێنیکدا کەئامادە بێت رەوشتو بەها جوانەکانی تێدا وەربگرێت.

کەواتە: یەکەم مافی پەروەردەیی منداڵ لەسەر دایكو باوکی ئەوەیە کەپیاو ئافرەتێکی دینداو رەوشت بەرز بخوازێ, وە ئافرەتیش شوو بەپیاوێکی خواناسو ئەخلاق جوان بکات, بۆ ئەوەی ئەم منداڵە لەباوەشی بەسۆزی دایكو باوکێکی میهرەبانو لەخواترسو ئەخلاق جواندا پەروەردە ببێو رەوشتی بەرزی ئەوان لەو ماڵە

پاکەدا ڕەنگ بداتەوە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ فَإِنَّ النِّسَاءَ يَلِدْنَ أَشْبَاهَ إِخْوانِهِنَّ وَأَخَواتِهِنَّ)(رَوَاهُ إِبنُ عَساكِر), واتە: ئافرەتی چاك بۆ نوطفەكانتان هەڵبژێرن, چونكە ئافرەتان هاوشێوەی براو خوشكەكانی خۆیان دەبێت.

(ماوردي) هەڵبژاردنی ژن بەمافی منداڵ دادەنێت لەسەر باوكی, ئەمەشی لەقسەی ئیمامی عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزایخوای لێبێت) دەرهێناوە كەدەڵێ: یەكەمین مافی منداڵ لەسەر باوكی هەڵبژاردنی دایكیەتی, دەبێ باوك ئافرەتێكی جوانو خانەدانو بەدینو پاكو ژیر هەڵبژێرێ.

بەڵێ خۆشەویستان, لەوانەیە كەسێك بڵێ: باوكو دایك تەئسیرو كاریگەری نیە بۆ سەر چاكیو خراپیی منداڵ, بەڵام نەخێر وا نیە, ئایا ئەو منداڵەی كە لەناو خێزانێكی خواناسو نوێژكەرو دەم پاكدا پەروەردە دەبێ وەكو ئەو منداڵە وایە كە لەناو خێزانێكی عەرەق خۆرو قومارچیو دەم پیسدا دروست دەبێ؟! بێگومان هەرگیز وەكو یەكتری نین! تەنانەت ئەگەر باوك پیاوی چاك بێ خوای گەورە لەبەر خاتری ئەو پیاوە چاكە, ڕەحم بەمنداڵە ساواكانی دوای خۆیشی دەكاتو دڵی كەسێكی چاكیان بۆ نەرم دەكات كەیارمەتییان بداتو ئیشوكاریان بۆ ڕاپەڕێنێت, ئەمەش لەقورئاندا سەلمێنراوە, ئەوەتا گەورەمان (خضر) بەخۆڕاییو بەبێ وەرگرتنی كرێ دیوارێك كەخەریكە دەڕووخێ هەڵیدەوەشێنێو دوایی چاكیدەكاتەوە, جا كاتێ سەردارمان (مووسا) (عَلَيْهِ السَّلام) پرسیاری لێدەكات كەبۆچی كرێ وەرناگرێ لەكاتێكدا خەڵكی ئەو دێیە ئامادە نەبوون میوانداریيان بكەنو نانێكیان بدەنێ؟ خدر وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً ﴾ واتە: ئەو دیوارە كەخەریك بوو بڕووخێ, ئەوە لەژێریدا كوپەیەك ئاڵتوون هەیە, هی دوو منداڵە كەهێشتا هەتیوو بێدەسەڵاتن, خەڵكی ئەم دێیەش بەم خوانەناسی یە ئەم ئاڵتوونەیان بەردەست كەوێ ئەوا دەیخۆنو نایدەنەوە بەم منداڵە هەتیوانە, بۆیە خوای گەورە ئەمری پێكردم دیوارەكەیان بۆ چاك بكەمەوە تا ئەم جارەش وەختی ڕووخانی دێتەوە منداڵەكان گەورە دەبنو ئەو هەتیوانە باوكیان پیاوێكی چاكو بۆ خوا صوڵحاو بوو.ئبن كەثیر لەتەفسیرەكەیدا دەربارەی ئایەتی ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً ﴾ فەرموویەتی: (فيهِ دَليلٌ عَلى أَنَّ الرَّجُلَ الصَّالِح يَحْفَظ في ذُرِّيَتِهِ وَتَشمل بَرَكَةَ عِبادَتِهِ لَهُمْ في

الدُّنيا وَالآخِرَةِ بِشَفَاعَتِه فِيهِمْ), واتە: ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەپیاوی چاكو خواناس خوای گەورە نەوەو ڕۆڵەکانی دەپارێزێو بەرەکەتی عیبادەتی ئەو باوکە منداڵەکانی لەدونیاو قیامەتدا دەگرێتەوە, ئەوەش بەهۆی تکاکردنی باوکەکە بۆ ڕۆڵەکانی.

هەر شێخی ئبن کەثیر دەفەرموێ: پشتی حەوتەم (باپیرەی حەوتەمی) ئەو دوو منداڵە هەتیوە پیاوێکی چاك بووەو خوای گەورە لەبەر خاتری ئەو نەوەکەی لێ سوودمەند کردووەو پیاوێکی وەکو حەزرەتی خدری ناردووە کەپارێزگاری سامانەکەیان بکات. ئیمامی فەخری رازییش لەتەفسیرەکەیدا هەر لەسەر ئایەتی ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً ﴾ فەرموویەتی: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەچاکەکاریی باوك سوودی بایەخدان بەکاروباری منداڵەکانی تێدایە.

خۆشەویستان: هەر لەبەر کاریگەریی چاکیی باوكو دایك لەسەر نەوەکانیان زانای پایەبەرز سەعیدی کوڕی موسەیب ( ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: من هەرکاتێك نوێژ دەکەم کوڕەکەم یاد دەکەوێتەوە, بۆیە نوێژەکەم زیاتر دەکەم! واتە: باوك هەتا نوێژو خواپەرستیی زۆرتر بێ ئەوا منداڵەکانی زیاتر صالح دەبنو خوای گەورە بەهۆی خواناسیی باوکەکەوە بەرەکەتیش بەسەر منالّکانیدا دەرێژێ!

هەروەها سەهلی توستەری (ڕەحمەتی خوای لێبێت), پەیمان بەمنداڵەکەی دەدات کەهێشتا هەر لەپشتیدایە, جا دەڵێ: بەڵێن بێ هەر کاری چاك بکەم بەئومێدی ئەوەی کەخوا ئەولادی چاکم پێببەخشێ! هەروەها دەفەرموێ: من بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدەم کەئەوەی خوای گەورە لەسەری واجب کردووم ئەنجامی بدەم, وە ئەوەی حەرامی کردووەو لێی قەدەغە کردووم لێی بەدوور بم, وەمن بەردەوام چاودێریی منداڵەکانم دەکەم لەو کاتەوەی لەپشتمدان هەتا خوای گەورە دەیانهێنێتە جیهانی بینرانو دەرکەوتن, واتە: من ئێستا کاری چاکە دەکەم کەهێشتا خێزانم نیە, بۆ ئەوەی خوای گەورە لەدواییدا منداڵی چاكو صالحم پێببەخشێ.

**مافی دووەم:**

مافی دووەمی منداڵ لەسەر دایكو باوك پێش ئەوەی بچێتە ڕەحمی دایکیەوە بریتی یە لەناوهێنانی خوای گەورەو داواکرن لەخوا کە لەکاتی جیماع کردندا خۆیانو ئەو

منداڵەی کەپێیان دەبەخشێ لەشەیطان بیانپارێزێ, وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لَوْ أنَّ أحَدَهُمْ, إذا أتى أهْلَهُ قالَ: بِسْمِ اللهِ, أللَّهُمَّ جَنِّبْنا الشَّيْطانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطانَ ما رُزِقْتَنا, فَيُولَدُ بَيْنَهُما وَلَدٌ فَلا يُصيبُهُ الشَّيْطانُ أبَداً) (رَواهُ البُخاري وَمُسلِم), واتە: ئەگەر یەکێك کەدەچێتە لای خێزانەکەی‌و گوتی: بەناوی خوا, خوایە شەیتانمان لێ دووربخەرەوەو شەیتان لەوەش دووربخەرەوە کەپێمان دەبەخشی, جا ئەگەر هەر منداڵێکیان بوو, ئەوا شەیتان هەرگیز ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ!

هەروەها عەبدولرەزاق لەحەسەنەوە دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ئەگەر پیاو چووە لای ژنەکەی با بڵێ: (بِسْمِ اللهِ, أللَّهُمَّ بارِكْ لَنا فيما رَزَقْتَنا, وَلا تَجْعَلْ لِلشَّيْطانِ نَصيباً فيما رَزَقْتَنا), واتە: بەناوی خوا, خوایە بەرەکەت بخە ئەوەی کەپێمان دەبەخشی, وەهیچ بەشێکی شەیتان مەخەرە ئەوەی پێت بەخشیوین. دەفەرموێ: ئەوا ئومێد هەیە, ئەگەر ژنەکە سکی پڕ بوو منداڵێکی چاکی ببێت. کەواتە: ئەو منداڵە ئەو مافەی لەسەر دایك‌و باوکیەتی کەذیکری خوا بکەن‌و پەنا بگرن بەخوای گەورە کەشەیتان نەتوانێ زەرەر بدات لەو منداڵەی کەلەو جیماعەدا دروست دەبێ!

ئەی ئەو منداڵەی کەباوکی بەسەرخۆشی دەچێتە لای دایکی‌و بۆنی دەمی فریشتەکان دووردەخاتەوەو لەجیاتی ذیکری خوا شەیتان لەناو دڵو دەروونیدایە, دەبێ چ زوڵمێك لەو منداڵە بکەن کەلەو جیماعە دروست دەبێ! یەکێکیش لەو کەسانەی کەهاوبەش‌و شەریکی ئەو زوڵمەیە کەلەو نُطفەیە دەکرێ کەناوی خوای لەگەڵدا نابرێ, ئەو باوکەیە کەکچەکەی خۆی داوەتە ئەو عەرەق خۆرە! بەڵێ, ئەو باوکەی کەکچی خۆی دەداتە نوێژنەکەرو خوانەناس‌و مولحید کەدوژمنی (بِسْمِ اللهِ)یەو دۆستی شەیتانە, تەنها لەبەر ئەوەی زاواکەی دەوڵەمەندە, یان پلەوپایەیەکی دونیایی هەیە, ئیتر حیساب بۆ ئەوە ناکات کە بەهۆی ئەم کوڕە خوانەناس‌و دوور لەدینەوە" دینی کچەکەی‌و دینی ئەو منداڵەش دەفەوتێنێ! دەبێ چ زاڵمێکی گەورەبێ!

بەڵێ موسڵمانی بەڕێز:

ئـــومـــەتـــــــی مـــحمد الــــمصطفی صَلَّـــــى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەبێ بەناوی الله, لــــــــەپەنای الله دا,لەقەڵای الله دا گۆش بکرێ‌و پەروەردە بکرێ‌و لەشەڕی

ئیبلیس‌و ئیبلیس ڕەوشتەکان بپارێزرێ! ئەوە مافی دووەمی منداڵە کەهێشتا نەچۆتەسکی دایکیەوە!

**مافی سێیەم:**

مافی سێیەمی منداڵ لەسەر دایك‌و باوك پێش ئەوەی لەدایك ببێ ئەوەیە: زۆر جار ژن‌و مێرد، دوای ماوەیەکی زۆر لەبەیەکەوە ژیانی هاوسەریەتییان منداڵیان نابێ، لەم کاتەدا دایك‌و باوك پێویستە داوابکەن لەخوای گەورە کە لەمنداڵی خواناس‌و چاکەخواز بێبەشیان نەکات‌و هەوڵ بدەن هۆکاری منداڵ نەبوونەکەیان بدۆزنەوە. ئیمام ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەموسنەدەکەیدا لەجابری کوڕی عەبدوللاوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە کە: پیاوێك لەئەنصاریەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم‌و عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خوا، چەند ساڵێکە ژنم هەیەو تا ئێستا خوا منداڵی پێ نەبەخشیوین‌و هیچ منداڵمان نیە، ئەی پێغەمبەری خوا، بەهۆی ئەوەوە دڵی خۆم‌و خێزانم زۆر تەنگە، باشە چی بکەین؟ پێغەمبەر صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَأيْنَ أنْتَ مِنْ كَثْرَةِ الإسْتغْفارِ وكَثْرَةِ الصَّدَقَة، تُرْزَقُ بِها)، واتە: باشە تۆ فلان کەس لەگەڵ زۆر داوای لێبوردن کردن لەخوا (أَسْتَغْفِرُ الله)و گوتنی ئەم زیکرە، هەروەها خێرو خێرات کردن‌و بەخشینی ماڵدا چۆنی تا بەهۆی ئەوەوە خوا منداڵت پێ ببەخشێ؟ واتە: پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم کابرای ڕێنموونیی کرد بۆ دوو شت، یەکەم: زۆر زیکری (أَسْتَغْفِرُ الله) بکات، دووەم: بەپێی تواناو دەسەڵاتی مادیی خۆی لەخێرو خێرات کردن درێغی نەکات!

بەڵێ، کابرا دوای ئەوە زۆر خێری دەکردو یارمەتیی هەژارو نەدارانی دەداو بەردەوام زیکری (أَسْتَغْفِرُ الله)ی دەکرد. جابر (ڕەزای‌خوای لێبێت) دەفەرموێ: دوای ئەوە ئەو کابرایەم بینیەوە، خوای گەورە نۆ کوڕی پێ بەخشی.. الحَمدُ لله.

(مەلا عەلی ئەلقاری) لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: ڕەنگە ئەوە لەو ئایەتەی قورئان وەرگیرابێ کە لەسەرگوروشتەی حەزرەتی نووحدا (عَلَیْهِ السَّلام) دەفەرموێت ﴿ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً، يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً، وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَاراً ﴾(نوح 10 ـ 12).

بەڵێ، ئەمە موژدەی قورئانە، هەرکەسێ داوای چاوپۆشی گوناه و تاوانەکانی خۆی لەخوای گەورەو میهرەبان بکات خوای گەورە زۆر خەڵاتو بەخششی پێ دەبەخشێ، یەکێ لەوانە (بَنين) نەوەو منداڵ. هەروەها لەفەرمودەی پێغەمبەردا صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتووە کەفەرموویەتی: هەرکەسێك زۆر أستَغفِرُ الله بکات، ئەوا خوای گەورە لەهەموو پەژارەو ناسۆرێکدا دەرووی لێدەکاتەوەو لەهەموو تەنگانەیەکدا رزگاری دەکاو رزقوڕۆزییەکی زۆری پێدەدات ،بەجۆرێکی وا کەهەر بەخەیاڵیشیدا نەهاتووە (ئەحمەدو ئەلحاکم لەئبن عەباسیان گێڕاوەتەوە).

بەداخەوە زۆر جار ئەوانەی کەمنداڵیان نیە پەنا دەبەن بۆ نوشتەی ناشەرعیو بۆ لای پاڕانەوە لەقەبرو ماچ کردنی بەردو پەڕۆ، بەڵام با ئەو کەسانە لەجیاتی ئەو کارە پڕ شیركو خوڕافیاتانە با بەفەرموودەی قورئانو پێغەمبەری ئیسلام صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم، با بێن زۆر داوای لێخۆشبوون لەخوا بکەن، بەزمان بڵێن أستَغفِرُ الله، بەدڵیش ڕوو لەپەروەردگار بکەنو بڵێن: یا الله: من عەبدێکی گوناهبارم، خەجاڵەتی بەر قاپیی تۆم، خوایە من ددان دەنێم بەگوناه و تاوانەکانمدا، تۆش خوایەکی کە (أَرْحَمُ الرَّاحِمِين)ی، تۆ خوایەکی ئەوەندە میهرەبانی کەس لەدەرگات مەئیووس نابێ، خوایە کەمن بەهۆی گوناهباریمەوە لەمنداڵ بێبەش بووم، خوایە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەمو تۆش ڕەحمم پێ بکەیو لەو خەڵاتە گەورە بێبەشم نەکەی.. بەم شێوەیە بەدڵ لەخوا بپاڕێتەوەو ئەگەر تواناو دەسەڵاتی مادیشی هەبوو، بەپێی دەست ڕۆیشتنی خۆی صەدەقەو خێروخێرات بکات بەداماوو لێقەوماوان، سیقەشی هەبێت کەخوا بێبەشی ناکات، ئینشائەڵلا خوای گەورە دەرووی ڕەحمەتیان لێدەکاتەوەو چەند منداڵێکیان پێدەبەخشێ.

ئیمانداران: خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی دوو پێغەمبەرمان بۆ دەکات (سەلامی خوایان لەسەر بێت) کەتەمەنێکی زۆریان هەبووەو ریشیان سپی بووە، بەڵام ئەولادیان نەبووە، ئەو دوو زاتە بەڕێزەش، یەکەمیان: حەزرەتی ئیبراهیمی خَلِيلُ الله یە، ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە (سەلامی خوای لێبێت)" خێزانی یەکەمی ناوی سارا خاتون بووە، پیربوو، هیچ منداڵی نەبوو، بۆیە داوای لەحەزرەتی ئیبراهیم کرد کە (هاجەرە) مارە

بكات بەڵكو خوا منداڵێكیان پێ ببەخشێ, چونكە خۆی پیر بووەو ئەمەلی منداڵ بوونی نەماوە. ئەوەبوو حەزرەتی ئیبراهیم, هاجەرە خاتونی مارەكردو زۆر بەكوڵ لەخوا پاڕایەوەو فەرمووی ﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾(الصافات 100), ئەوەبوو خوای گەورە وەڵامی دوعایەكەی دایەوەو ئیسماعیلی پێ بەخشی. لەمەش خۆشتر ئیماندارانی بەڕێز ئەوەبوو كەسارا خاتون كەگوتمان پیر بوبوو, لەوە مەئیووس بوبوو كەتازە منداڵی ببێ, لەئاخرو ئۆخری تەمەنیدا كەمووی رەش لەسەریدا نەمابوو, رۆژێكیان كۆمەڵێك میوانی زۆر نەجیبو جوان روویان كردە ماڵی حەزرەتی ئیبراهیم, حەزرەتی ئیبراهیمیش كە لەهەمو كەس زیاتر میوان دۆست بووە, ماوەیەكی زۆربوو میوانی نەهاتبوو, لەخۆشیی ئەوەی میوانی هاتووە خێرا چوو گوێرەكەیەكی قەڵەوی سەربڕیو سووری كردەوەو برژاندیو هێنای لەبەردەم میوانەكانیدا دایناو فەرمووی: یاخوا بەخێربێن, فەرموون بخۆن. بەڵام ئەوان ئینسان نەبوون, بەڵكو فریشتە بوونو لەسەر شێوەی مرۆڤ خۆیان نیشانی حەزرەتی ئیراهیمو خێزانەكەی دا, بێگومان فریشتەش خواردن ناخوات, بۆیە كەزانییان حەزرەتی ئیبراهیم زۆر ناڕەحەتە بەوەی كەئەوان خواردنەكەی ناخۆن, خۆیان ئاشكرا كردو گوتیان: ئێمە فریشتەین, خوای گەورە ئەمری پێكردووین كەبچین خەڵكی سەدوومو عامووره لەناوبەرین كەقەومی حەزرەتی لوطن (سەلامی خوای لێبێت) لەبەر ئەوەی خوای گەورە بەهۆی بەدڕەوشتییانەوە غەزەبی لێگرتوون, ئەمجا فـــریشتەكـــان بەحـــەزرەتی ئیبراهیمیان گوت: ئێمە بۆیە لێرە لاماندایە لای تۆ تاوەكو موژدەت بدەینێ كەخوای گەورە لەم ژنەت كەسارا خاتونە كەپیر بووەو تا ئێستا منداڵی نەبووە, كوڕێكت پێدەبەخشێ ناوی بنێ ئیسحاق, وە موژدەبێ ئیسحاقیش گەورە دەبێو ئەویش كوڕێكی دەبێ ناوی یەعقووب دەبێ. لە وكاتەدا سارا خاتون لەپشت دەرگاكەوە گوێی لەم موژدەیە بوو, زەردەخەنە گرتیو لەخۆشییان بەسەرسوڕمانەوە فەرمووی ﴿ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخاً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ ﴾(هود 72), واتە: سارا خاتون فەرمووی: هەی شەرمەزار خۆم, باشە چۆن من منداڵم دەبێت لەكاتێكدا من پیر بوومو بوومە پیرێژن, ئەوەش ئیبراهیمی مێردمە, پیرو بەساڵداچووەو پیرەمێردێكە, بەڕاستی ئێمە لەم تەمەنەدا منداڵمان ببێ ئەوە شتێكی سەرسوڕهێنەرە ﴿ قَالُوا أَتَعْجَبِينَ

مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ﴾(هود 73)، فریشتەکان فەرموویان: ئەی سارا خاتون! ئایا سەرت سوڕدەمێنێ لەفەرمانو کاری خوا؟! هەموو شتێ بەلای خواوە زۆر ئاسانە..

پاش ماوەیەك خوای گەورە حەزرەتی ئیسحاقی پێ بەخشین!

خۆشەویستان: پێغەمبەری دووەم کە لەتەمەنی گەنجیەتیدا خوای گەورە منداڵی پێ نەبەخشیبوو تا ئەو کاتەی کەخۆیو خێزانەکەی بەتەواوی کەوتنە تەمەنەوەو سەریان سپی بوو، پاشان لەخوای گەورە پاڕایەوەو منداڵی پێبەخشی، ئەو زاتەش حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەرە ـ سەلامی خوا لەویشو لەهەموو پێغەمبەران، بەتایبەت سەرداری پێغەمبەران، حەزرەتی محمد المصطفی صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم بێ.

قورئانی پیرۆز باسی حەزرەتی زەکەریامان بۆ دەگێڕێتەوە کەچۆن لەخوا پاڕایەوە کەخوا ئەولادێکی صالحی پێ ببەخشێ، دەفەرموێ: ڕۆژێکیان حەزرەتی زەکەریا کەتەماشای خۆی کرد وا بەتەواوی پیریی لێدەرکەوتووەو منداڵی نیە، چوو بۆ شوێنی نوێژکردنو خواپەرستیی خۆیو زۆر بەکوڵو دڵ بەم شێوەیە لەخوا پاڕایەوە، فەرموی: یا ئیلاهی، یا رَبَّ الْعالَمین، خۆت لەحاڵم بەئاگایت، وا پیری بەتەواوی یەخەی گرتووم، ئەوە ئێسکەکانم نەرم بوون، پشتم چەماوەتەوە، سەرم لەسپیەتیدا بریسکەی دێ، خوایە گیان من زۆر بەئومێدەوە دوعا دەکەمو لێت دەپاڕێمەوە کەدوعاکەم لێ وەربگریو منداڵێکی صالحم پێ ببەخشی، یا ڕەبی خوایە من کەداوای منداڵت لێدەکەم، خۆت عالمی مەبەستم ئەوە نیە لەکاروباری دنیادا یارمەتیدەرو کاسبکارم بێ، یان هەر حەز بەبوونی ئەولاد بکەم، بەڵام ئەوەی من بەلامەوە گرنگە ئەوەیە: وا ئەم قەومەم کەزۆربەیان خوانەناسن، کەسێك شك نابەم لەدوای خۆم ئامۆژگاریی چاکەیان بکاتو بۆ ڕێگای خواناسی بانگیان بکات، هەرچەندە ئەی خوای گەورە دەزانم خێزانەکەم نەزۆکەو ئەوە چەندین ساڵە خێزانمە منداڵی نەبووە، بەڵام یەقینم هەیەو من وا تۆ دەناسم کەتۆ ئەوەندە خوایەکی بەتواناو دەسەڵاتی کەزۆر لای تۆ ئاسانە کەدوعاکەم قبووڵ بکەیو منداڵێکم پێ ببەخشی کەدوای خۆم خزمەتی دینی تۆ بکاتو ڕێبازی پێغەمبەران بگرێ.

قورئان پاڕانەوەکەی حەزرەتی زەکەریای بەم چەند ئایەتە تۆمار کردوە، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً, وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِنْ وَرَائِي وَكَانَت امْرَأَتِي عَاقِراً فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً, يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوب وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيّاً ﴾(مريم 4 ـ 6).

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز، کاتێك حەزرەتی زەکەریا ئاوا بەکوڵ لەخوا پاڕایەوە، یەکسەر خوای گەورە دوعاکەی قبووڵ کردو فریشتەی نارد بۆ لایو فەرمووی: ﴿ يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيّاً ﴾(مريم 7)، واتە: ئەی زەکەریا" ئێمە مژدەت دەدەینێ بەوەی کەکوڕێکت پێ دەبەخشینو ناویشی یەحیایە، پێش ئەو کەسمان هاوناوی ئەو نەکردوە.

لێرەدا خوای گەورە لەگەڵ مژدەداندا بەوەی کەپاڕانەوەکەی قبووڵکردووەو منداڵی پێدەبەخشێ، مژدەی ئەوەشی پێدا کەمنداڵەکەی کوڕ دەبێو ناویشی (یەحیا) دەبێ! اللهُ أكْبَر، خوا بۆ خۆی بۆی ناو ناون (یەحیا)! جا حەزرەتی زەکەریا کەئەو مژدە خۆشەی بیست لەخۆشییان فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِراً وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيّاً ﴾(مريم 8)، فەرمووی: پەروەردگارا، چۆن کوڕم پێدەبەخشی لەکاتێکدا هاوسەرەکەم منداڵی نابێتو نەزۆکەو منیش گەیشتوومەتە ئەوپەڕی پیریو پەککەوتەیی، بەڵام هەموو شت لای تۆ ئاسانە! خوای گەورە فەرمووی: ئەی زەکەریا، پەروەردگاری تۆ هەر بەو شێوەیە بڕیاری داوەو فەرمووشیەتی کەئەو کارە لای من زۆر ئاسانە، بەڕاستی پێشتریش تۆم دروست کردووە، وەنەبێت شتێك بووبیت، نە ناوت هەبووە نە بوون! حەزرەتی زەکەریا ئەمجارەشیان لەخۆشیی ئەو مژدە گەورەیە فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً ﴾، فەرمووی: ئەی پەروەردگارا نیشانەیەکم پێ ببەخشە تا دڵنیا ببم کەئەو مژدەیە هاتۆتە دی ﴿ قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاس ثَلاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزاً وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيراً وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴾(آل عمران 41)، خوای گەورە فەرمووی: نیشانەو بەڵگەت لەسەر بوونی ئەو کوڕە ئەوەیە کەنابێت سێ شەوو سێ ڕۆژی تەواو قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت.بەڵێ، کاتێ خێزانەکەی حەزەتی زەکەریا حامیلە بوو، فیعلەن حەزرەتی زەکەریا ماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژ زمانی بەستراو بەئیشارەتو

ئاماژەکردنی ئەم قسەیەی بۆ ئەگەڵ خەڵکی نەدەکرا. لەئایەتی ژمارە (39)ی سوورەتی ئالی عیمراندا خوای گەورە کەباسی دوعاکردنی حەزرەتی زەکەریا دەکات بۆ منداڵ بوون و وڵامدانەوەی لەلایەن خواوە, خوای گەورە لەگەڵ ئەوەدا کەموژدەی دەداتێ بەوەی کەخوا کوڕێکی پێ دەبەخشێ ناوی (یەحیا) دەبێ موژدەی ئەوەشی دەداتێ کەهەرچی زەکەریا ئاواتی بووە لەو کوڕەدا هەبێ, خوای گەورە بۆی دێنێتەجێ, وەکو دەفەرموێ: ﴿ فَنَادَتْهُ الْمَلائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقاً بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّداً وحَصُوراً وَنَبِيّاً مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾(آل عمران 39), واتە: حەزرەتی جوبریل هات بۆلای حەزرەتی زەکەریاو فەرمووی: بە ڕاستی خوای گەورە موژدەت دەداتێ بەبەخشینی کوڕێك ناوی (یەحیا)یە, بەڕاستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایەو گەورەو ڕێزدارەو خۆ پارێزە لەگوناهان و پێغەمبەرێکە لەچاکان!

بەڵێ ئازیزان: ئەوەیە قودرەت و دەسەڵاتی خوا ﴿ كَذَلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴾ (آل عمران 40 ). بەڵێ, خوای گەورە هەرچییەکی بوێ دەیکات.

باسی ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزەم بۆیە کرد, تاوەکو ئەوانەی ئەولادیان نییە چاو لەم دوو زاتە بەرزە بکەن کەئیبراهیم و زەکەریایە, ئینشائەڵڵا چۆن خوا ئاواتی ئەوانی هێنایەدی, ئاواتی هەموو ئیماندارانی ئوممەتی محمدیش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دێنێتەجێ, بەڵام بەو مەرجەی ئاوا بەدڵ و بەنیەتێکی خاوێن و بۆ خوا سوڵحاوانەوە لەبەر خوا بپاڕێتەوەو دەم بەزیکرو یادی خوا بێ, بەتایبەت لەدەمەوئێوارەو بەیانیاندا, وەکو خوای گەورە بەحەزرەتی زەکەریای فەرموو: ﴿ وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيراً وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴾ (آل عمران 41), هەروەها وەکو حەزرەتی ئیبراهیم بەخشندە بن و خێرو صەدەقە زۆر بکەن ئینشائەڵڵا خوای گەورە دوعاکانتان قبووڵ دەکاو هیواو ئاواتەکانتان دێنێتەدی!

ئیماندارانی بەڕێز: زۆر جار خوای گەورە بۆ ئەوەی نیشانی عەبدەکانی خۆی بدات کەئەگەر ویستی لەسەر دروستکردنی منداڵ یان هەر شتێکی تر هەبوو ئەوا (كُنْ فَيَكُون)ێکی تێدەچێ و ئەوەی بەعەقڵی ئینسان نابێ ببێ بۆ قودرەتی خوا ئاسانە گوێ بۆ ئەم ڕووداوە بگرن:

لەمانگی تەمووزی ساڵی 2003 دا, منداڵێکی کوڕی تەمەن حەوت ساڵان کەبەردەوام سك ئێشەی هەبوو و ڕۆژ بەڕۆژ سکی گەورە دەبوو و هەڵدەئاوسا, لەلایەن کەسوکاریەوە نیشانی پزیشکی تایبەت بەهەناو درا, دوای ئەوەی چەند پزیشکێك منداڵەکەیان بینی, هەموویان بڕوایان وابوو کەئەم هەڵئاوسانەی سکی ئەم منداڵە بەهۆی هەوکردن (إلتهابات) یان زیادەگۆشت لەناو سکیدا دروست بووە, بەڵام دوای ئەوەی نەشتەرگەرییان بۆ کرد, بۆیان دەرکەوت کەمنداڵێکی گەشەنەکردوو لەناو سکی ئەم منالەدایەو لەبراکەیەوە خۆراکی وەرگرتووەو تەنانەت قژەسەریشی ڕواوە, بەڵام مردبوو. پاشان منداڵەکەیان لەسکی دەرهێناو لە ئازار رزگاریبوو, ئەم منداڵە خەڵکی کازاخستان بوو. وە ئەوەی کەماوەو پێویستە بیڵێین ئەوەیە کەزۆر جار منداڵ نەبوون, هۆکارەکەی ئەوە نیيە کەپیاوەکە یان ژنەکە نەزۆك بن, بەڵکو بەهۆی نەخۆشی لەکۆئەندامی زاوزێدا بۆتە هۆی ئەوەی منداڵ دروست نەبێ, ئەمەش لەڕێگای چوونە لای پزیشکی پسپۆڕو شارەزاو بەکارهێنانی دەرمان یان هەندێ جار نەشتەرگەرییەوە“ چارەسەری ئەو منداڵ نەبوونە دەکرێ. کەواتە“ نەك هەر حەرام نیيە وەکو هەندێ کەس وا حاڵی بوون“ بەڵکو زۆریش پێویستە کەئەو ژن‌و مێردانەی منداڵیان نابێ, لەگەڵ ئەوەدا کە لەخوا دەپاڕێنەوە وەکو باسمان کرد, لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە سەردانی دکتۆر بکەن‌و چارەسەری نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێیان بکەن. بەم شێوەیە, ئەگەر خوای گەورە مەیلی لەسەر بێ ئەو (نوطفە)یەی بەهۆی نەخۆشیيەوە فەوتاوەو نەبۆتە کۆرپە“ مافی ژیانی بۆ دەگەڕێتەوەو لەڕەحمدا قەراردەگرێ‌و ژن‌و مێردیش لەو خەڵاتە بێبەش نابن.

بەڵێ بەڕێزان: ئەوانەی باسمان کرد مافەکانی منداڵ بوون پێش لەدایك بوونی, ئێستا با بزانین مافەکانی منداڵ لەسەر دایك‌و باوکی“ لەدوای لەدایك بوونەوە چین؟!

**مافی یەکەم:**

ئاگاداریکردنی منداڵ‌و پشتگوێ نەخستنی, بەتايبەت دایك کەدەبێ زۆر ئاگای لەکۆرپە ساواکەی بێ‌و ئاگاداربێ زیاد لەسنووری خۆی منداڵەکەی نەگری‌و نەهێڵێ برسی ببێ. ئەم چاودێریکردنەی منداڵیش ئەوەندە گرنگە“ ئەوەتا پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَم لەنوێژی بەیانیاندا“ لەڕکاتی یەکەمدا شەست ئایەتی قورئانی لەدوای فاتیحەوە

دەخوێند, بەڵام ئەگەر گوێی لەگریانی منداڵێك ببوایە ئەوا لەڕکاتی دووەمدا تەنها سێ ئایەتی دەخوێندو بەزوویی سەلامی دەدایەوەو پەلەی لەنوێژەکەدا دەکرد, ئەمەش بۆ ئەوەی ئەوەکو دایکی ئەو منداڵە" لەڕیزی جەماعەتدا بێتو منداڵەکەی زۆر بگری, بەڵکو با خێرا نوێژەکەی بەجەماعەت بکاتو زوو لەمزگەوت بچێتە دەرەوەو بچێت بەلای منداڵەکەیەوە! (ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا صَلَّی اللهُ عَلَیه وسَلَّم" ئافرەتان بۆ نوێژی بەیانیش دەهاتن بۆ مزگەوتوماڵەکانیشیان لەمزگەوتەوە نزیك بووە, بەڕادەیەك کە لەمزگەوتەوە دەنگی گریانی منداڵەکانیان لەماڵەوە بیستراوە!).

هەروەها شیری دایكو باوەشی دایك زۆر گرنگە, بۆیە ئاینی ئیسلام لەکاتی جیابوونەوەی ژنو مێردیشدا, هەقی داوە بەئافرەت کەمنداڵەکەی لای خۆی بێتو شیری بداتێ, بەرامبەر بەمەش" پیاوەکە ناچار دەکرێت کەنەفەقەی منداڵەکەشو ژنەکەش دابین بکاتو هەموو پێویستییەکی ژیانیان بۆ ئامادەبکات! وەئەم ماوەی شیردانەش بەمنداڵ لەلایەن دایکیەوە, قورئان دوو ساڵی بۆ دیاریکردوە.

ئیمانداران: لەکۆمەڵگای کوردەواریی ئێمەدا, لەکاتی جیابوونەوەی ژنو مێرد لەیەکتری بەهۆی تەڵاقدانەوە, زوڵمێکی زۆر گەورە لەژنو لەمنداڵ دەکرێ, ئەویش بەوەی کاتێ ژنەکە" واتە: دایکی منداڵەکە تەڵاقدرا" یەکسەر منداڵەکە لەلایەن باوکی منداڵەکەو کەسوکاری پیاوەکەوە, لەباوەشی دایکی دەردەهێنرێو ئەو کۆرپە بێتاوانە لەسۆزو باوەشو شیری مەمکی دایکی بێبەش دەکرێت, تەنانەت بیستوومانەو بینیومانە کەجاری وابووە ئافرەت حامیلە بووە, کەکاتێ تەڵاقدراوەو چۆتەوە ماڵی باوکی, لەماڵی باوکی هەر کەمنداڵەکەی بووە یەکسەر کەسوکاری ژنەکە منداڵەکەیان خستۆتە پارچە پەڕۆیەکەوەو بۆ ماڵی باوکیان ناردۆتەوە! تەنانەت نەیانهێشتووە بۆ تاقە جارێکیش مەمکی دایکی بمژێو لەژەکی مەمکی دایك بێبەشیان کردوە! ئای لەو زوڵمە گەورە کە لەمنداڵە ساواکە دەکرێ, هەروەها لەو زوڵمە کەلەو ئافرەتە تەڵاقدراوەش دەکرێ کەسەرەڕای ماڵوێرانیو قوڕبەسەری" تووشی جەرگبڕان دەکرێ بەهۆی لێسەندنەوەی کۆرپەکەی!

بەڵام با بزانین ئایا ئاینی ئیسلام لەو بارەیەوە چی دەفەرموێ؟! ئایا ئەو ستەمو ناڕەواییەی کەخەڵکی موسڵمان لەژنو منداڵی دەکات لەکاتی جیابوونەوەی ژنو مێردا,

خەڵكی دژ بەدین لەسەر دینی پاكو بێخەوشی ئیسلامی حیساب دەكەن, ئایا ئەم دینەو ئیسلام بەمە رازییە؟!

بەڕێزان: صەحابی بەڕێزو زانا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ( ڕەزای خوای لێبێت), ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (أنَّ إمرأةً قالَتْ: يا رَسُولَ الله, إنَّ إبني هذا" كانَ بَطْني لَهُ وِعاءً, وَثَدْيَي لَهُ سِقاء, وحِجْري لَهُ حِواءً, وَإنَّ أباهُ طَلَّقني, وَأرادَ أنْ يَنْتَزِعَهُ منِّي, فَقالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم: أنْتِ أحَقُّ بِهِ ما لَمْ تَنْكِحي)(رَواهُ أبو داود وأحمَد وصَحَّحَهُ الحاكم), واتە: ژنێكی تەڵاقدراو هاتە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خوا, ئەم كوڕە بچكۆلەی كە لەباوەشمدایە, پێش ئەوەی كە لەدایك ببێ" سكم بۆی كیسە بووە, نۆ مانگ بەچەرمی سكم هەڵمگرتووە, دوای لەدایكبوونیشی مەمكم كوندەئاوی ئەو بووە, وە باوەشم یاتاغو ڕاخەری ئەو بووەو تیا خەوتووەو ئیسراحەتی كردوە, ئێستا باوكی منی تەڵاق داوەو دەیەوێ لەمنی وەربگرێتەوە (بەخوا نازانم لەتاوی ئەم جگەرگۆشەیەم چی بكەم, ئایا دەتوانێ لێم بستێنێتەوەو بیباتەوە بۆلای خۆی؟!) پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموی: تۆ مافت زیاترە كەمنداڵەكەت لا بێو بۆ خۆت بەخێوی بكەی تا ئەو كاتەی شوو بەپیاوێكی تر دەكەی!

كەواتە: منداڵ لەكاتی جیابوونەوەی دایكو باوكی بەهۆی تەڵاقەوە" دەدرێتەوە بەدایكی, بەمەرجێ دایكەكە شوو نەكاتەوە, كاتێ كەشووی كردەوە بەپیاوێكی تر, ئەوە لەم كاتەدا منداڵەكە لەدایكی وەردەگیرێتەوەو دەدرێتەوە بەباوكی, ئەمەش هەر لەبەرژەوەندیی منداڵو دایكەكەیە! لەبەر ئەوەی ژن" ئەگەر بیەوێ شوویكاتەوەو منداڵی ساوای هەبێ, هەموو كەس ئامادە نیە ئەو ژنە بخوازێو منداڵی خەڵك بەخێوبكات, لەم كاتەدا ئەگەر منداڵەكەی لابێ لەوانەیە لەشووكردنەوە دوا بكەوێ! بەنسبەت منداڵەكەشەوە, شتێكی بەڵگەنەویستە كەهەموو كاتێ باوكی خۆی زۆر بۆی بەپەرۆشترە لەباوەپیارەی!

بەڵێ خۆشەویستان: وەكو باسمان كرد, ئافرەت حەقی ئەوەی هەیە شوونەكاتەوەو منداڵەكەی لای خۆی بێڵێتەوەو شیری بداتێو بەخێوی بكات, ئینجا واجبە لەسەر پیاوەكە كەمەسرەفی منداڵەكەشو دایكە شیردەرەكەش دابین بكات! وەئەگەر هاتو ژنو

مێرد لەیەکتری جیابوونەوەو لەو کاتەدا منداڵی وایان هەبوو کە لەشیرخواردن براببۆوەو گەورەو فامیدە بوو, ئایا ئەم منداڵە دەدرێ بەباوك یان بەدایك؟ حەزرەتی ئەبوو هورەیرە (ڕەزایخوای لێبێت) دەفەرموێ: جارێکیان پیاوو ژنێك بەهۆی تەڵاقەوە لەیەکتری جیاببونەوە, ئەم ژنو پیاوە کوڕێکی فامیدەیان هەبوو کەتەواو گەورە ببوو, لەهەموو شتێك دەگەیشت, ژنەکە دەیگوت کوڕی خۆمەو دەبێ لای من بێ, پیاوەکەش دەیگوت: نەخێر, تازە من تۆم تەڵاقداوەو کوڕ کوڕی خۆمەو لای خۆم دەبێت! جا بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم تا بزانن ئەم کوڕە دەدرێ بەکامیان! پێغەمبەری خواش صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم بانگی کوڕەکەی کردو فەرمووی: (یا غُلامُ هذا أبُوكَ, وَهذِهِ أُمُّكَ, فَخُذْ بِيَدِ أيُّهُما شِئْتَ) پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: ئەی منداڵی جوان: ئەم پیاوە باوکتەو ئەم ژنەش دایکتە, هەردووکیان داوای تۆ دەکەن, جا تۆ حەز دەکەی لای کامیان بمێنیتەوەو لەگەڵیدا بژی" دەستی ئەوەیان بگرە! (فَأخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ)(رَواهُ أصحابُ السُّنَنْ بِسَنَدٍ صَحيحٍ), دەفەرموێ: منداڵەکە دەستی دایکی گرتو دایکەکەش لەگەڵ خۆیدا بردی.

موسڵمانانی بەڕێز: ئەمەیە مافی منداڵ لەئیسلامداو بەڕاستی هەر ئاینی ئیسلامیش ئەوەی کە بەقسە فەرموویەتی" بەکردەوە جێبەجێی کردووە, بەڵام زۆرن ئەوانەی کە بەقسەو بەرنامەو دروشم داوای مافی منداڵ دەکەن, بەڵام زۆر جار لەبەرژەوەندیی خۆیانو مەرامی سیاسییان" بەهەزاران منداڵ برسی دەکرێو ئاگرو ئاسنی بەسەردا دەبارێو بەهاری ژینی دەکرێ بەخەزانی پایز! بەڵام لەئیسلامدا پاراستنی ژیانی منداڵ کەهێشتا هەر لەسکی دایکیدایە, بەپێویست دانراوە, تەنانەت ئەگەر دایکی ئەو منداڵە تاوانێکی وای کردبێ کەموستەحەقی کوشتن بێ, دەبێ ئەو کوشتنی دایکە دوابخرێو حەددی شەرعیی لەسەر جێبەجێ نەکرێ تا ئەو منداڵەی لێی جیادەبێتەوە, وەپاشان لەشیردەبڕێتەوەو فێری خواردن دەبێ, بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە, سەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن کەلەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ڕوویدا:

ئـــافرەتێك لەقـــەبیلەی غامیدە, لەدێی غامیدە, کە بەئافرەتەکە دەگوترێ (المرأة الغامدِيّة), ئەو ئافرەتە دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم کە لەو

کاتەدا حەزرەت" لەگەڵ کۆمەڵێك لەیارانیدا دانیشتبوو, ئەم ئافرەتە هاتو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا, من تووشی گوناهی زینا بووم, وا هاتووم خواو پێغەمبەرەکەی چی دەفەرموون دەربارەی ئافرەتێك کەشووی کردبێو پاشان زینای کردبێ, ئەو حوکمەم بەسەردا جێبەجێ بکەن, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم فەرمووی: دەبڕۆ واز بێنە, بڕۆ لەنێوان خۆتو خوادا تۆبە بکەو باسی مەکە, مادام کەس پێی نەزانیوی, ئیتر تۆش پەردەپۆشی بکەو با کەس پێی نەزانێ! بەڵێ ئەو ڕۆژە ئافرەتەکە ڕۆیشتو بۆ ڕۆژی دوایی دیسان هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا, والله ی دەبێ لەم گوناهە خاوێنم بکەیتەوە, بەڕاستی من بەرگەی عەزابی جەهەننەم ناگرم, بەخوا قەسەم ئەی خۆشەویستی خوا, من نەك هەر زینام کردوە بەڵکو سکیشم پڕبووە لەزیناکەو حەملم هەیە, کۆرپەکە وا لەناو سکمدا دەجووڵێتەوە, ئیتر چۆن پێم دەڵێی بڕۆ باسی مەکە! پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: دەی مادام سکت هەیە هێشتا هەر نابێ بتکوژین, چونکە ئەو کۆرپەیەی ناو سکت مافی ژیانی هەیە, لەبەر خاتری ژیانی کۆرپەکەی ناو سکت", بڕۆوە بۆ ماڵی خۆتان, خۆت پەنادە هەتا منداڵەکەت دەبێ ئەمجا وەرەوە بۆ لام. بەڵێ لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم" ئافرەتەکە ڕۆیشت, نزیکەی چوار پێنج مانگی تری پێ چوو تا منداڵەکەی بوو, منداڵی زینا! بەلام لەم هەموو شەوو ڕۆژانەدا, لەم هەموو حەفتەو مانگانەدا, بەو ئازاری ژانی منداڵبوونە, ئەم ئافرەتە لەبیری نەچوو کەحەقێکی خوایی لەسەرە. بەڵێ, منداڵ دەگرێ بەباوەشەوەو دێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خواو دەفەرموێ: یا رَسولُ الله, ئەوە منداڵەکەم بووەو هاتووم حوکمی خوام بەسەردا جێبەجێ بکەن! ئەمجارەشیان پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئاخر ئیستا تۆ دایکی! حەقی ئەم منداڵە" مافی پاراستنی ژیانی ئەم منداڵەو بەخێوکردنی بەشیری دایکیو گەورەبوونی لەباوەشی گەرمی دایکیدا" لەپێش حەقی خواوەیە! لەبەر خاتری ئەم منداڵە بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە دوو ساڵی تر سزاکەت دوا دەخرێ! بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە کەس ناتوانێ هیچت پێ بڵێ, بڕۆ دوو ساڵی تەواو شیر بەم مناڵە بدە تاوای لێدێ پێویستی بەشیرخواردنو بەدایك نامێنێ, جا هەرکاتێ وای لێهات نانی خواردو پێویستی بەمەمكو شیری تۆ نەبوو ئەو کاتە

وەرەوە بۆلام! بەڵێ، ئافرەتەکە دەڕواتەوە دوو ساڵی تریش بەخێوی دەکا، ئەمجا دوای دوو ساڵەکە دێتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خواو دەڵێ: یا رَسُولُ الله، تەماشاکە! هاها منداڵەکەم نانەڕەقەی بەدەستەوەیەو بەددانی نانەڕەقە دەخوا! ئێستا پێویستی بەشیری من نەماوە، دەی ئەمجارە مەمنێرەوەو لەو گوناهە گەورە پاکم بکەرەوە. ئەمجا پێغەمبەری خوا، فەرمان دەدات بەڕەجم کردنیو بەپاکی بەرەو لای رَبُّ الْعالَمِین بەرێدەکەوێ.

جا موسڵمانانی بەڕێز تەماشاکەن، ئەم ئافرەتە یەکێ لەگوناهە گەورەکانی ئەنجام داوە کەزیناکردنە، سنووری خوای گەورەی شکاندووە، لەکەو کەموکوڕی بەناوچاوی بنەماڵەکەیەوە بەجێهێشتوە، کەچی لەبەر پاراستنی ژیانی منداڵەکەو شیر پێدانو بەخێوکردنی" نزیکەی دوو ساڵو چەند مانگ ئەم حەددە شەرعیە دوادەخرێو کەسیش بۆی نابێ بڵێ بەئافرەتەکە تۆ وات کردووەو دەبێ لەناو ببرێی، ئەمە هەمووی لەبەر خاتری ئەو منداڵە! سُبْحانَ الله، ئەمەیە پاراستنی مافی ژیانی منداڵ لەدینی پاکی خوای پەروەردگاردا.

داوادەکەم لەخوای پەروەردگار، باشتر لەدینەکەی خۆی شارەزامان بکاتو بتوانین مافی منداڵەکانمان جێبەجێ بکەین ..

﴿ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴾

اللَّهُمَّ آمين

# ووتـاری ژماره دوانزه

## مـافی منداڵ

**بەشی سێیەم**

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ, تَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُـوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ألا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾

(النحل 58 ـ 59)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

(مَنْ عالَ جارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغا" جاءَ يَوْمَ الْقِيامَةِ أنا وَهُوَ كَهاتَيْنِ ـ وَضَمَّ أصابِعَهُ).

( رَواهُ مُسْلِم )

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آلـه وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست, لەدوو وتاری رابردوودا باسی مافەکانی منداڵمان کرد, وتاری ئەمڕۆشمان" پشتیوان بەخوای گەورە تەواوکەری وتارەکانی پێشووەو لەم بەشەدا ئاماژە بۆ مافەکانی منداڵ دەکەین لەکاتی لەدایکبوونیەوە تا حەوتەمین ڕۆژی تەمەنی کۆرپە, کەپێویستە دایکو باوکو دەوروبەر بۆی فەراهەم بکەن.

**مافی یەکەم:** مافی میراتگری

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إذا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِثَ)(رَوَاهُ أبو داود), واتە: منداڵ کاتێ لەدایك بوو" نیشانەی ژیانی پێوەبوو, ئەوە بۆتە میراتگر. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەفەرموودەیەکی تردا بۆمان روون دەکاتەوە کەنیشانەکانی ژیان چین, دەفەرموێ: (وَاسْتِهْلالُهُ أنْ يَصيحَ أو يَعْطِسَ) (رَوَاهُ أحمَد), واتە: لەنیشانەکانی ژیانی منداڵ کەمافی میراتگرتنی دەداتێ" ئەوەیە کەدەست بکات بەقیژەقیژو هاوارکردن, یان بپژمێ, یان بگری.

خۆشەویستان: لەشەریعەتی ئیسلامیدا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك مردو خێزانەکەی حامیلەبوو, واتە ئەو کۆرپەی ناو سکە" کەیەکێکە لەمیراتگرەکان هێشتا لەدایك نەبووبوو" ئەوا میراتی بۆ دەوەستێنرێت. واتە میراتەکە دابەش ناکرێت تا کۆرپەکە لەدایك دەبێت. جا ئەگەر بەزیندوویی لەدایك بوو ئەوا میراتی دەدرێتێو وەکو کەسێکی گەورە بەشەمیراتی باوکی وەردەگرێ. بەڵام ئەگەر بەمردوویی لەدایکی جیابۆوە ئەوا میراتی نادرێتێ, بەڵکو میراتی مردووەکە دەدرێت بەکەسانی تری میراتگری پیاوەکە. بەڵام ئەگەر منداڵەکە بەزیندوویی لەدایکی جیابۆوە" ماوەیەك ژیاو دوای ئەوە مرد" ئەوا میراتی بۆ دادەنرێو میراتی ئەو منداڵەش دەدرێتەوە بەمیراتگرەکانی. نیشانەکانی زیندوویێتیو ژیانی منداڵیش ئەمانەن: پژمین, یاخود هەناسەدان, یان باوێشکدان, یان جووڵانی ئەندامێکی لاشەی.

بەڵێ ئیمانداران, ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم مافەی بۆ منداڵگێڕایەوە

چـونکه لەپێش ئیسلامدا منداڵ تا بلووغی نەبوایە میراتی بۆ دانەدەنرا, بەڵام خـوای گـەورە ئـەو مافـەی بـۆ گێڕایـەوەو هـەر لەگـەڵ لـەدایك بـوونی بەزینـدوویی, تـەواوی بەشەمیراتی خۆی بۆ دیاری دەکرێ.

**مافی دووەم:** مزگێنیو پیرۆزبایی

دووەمین مـافی منـداڵ لـەکاتی لـەدایك بوونیـدا بریتییـە لـەمزگێنیو پیرۆزبـایی کـردن بەبۆنەی لەدایکبوونی کۆرپەی نوێوە. واتە" سوننەتێکی ئیسلامییە کاتێ منـداڵ لـەدایك دەبێ" کەسێك یان کەسانێك بەپەلە هەواڵ بۆ باوکی یـان دایکـی یـان هـەر کەسـێکی ئـەو بنەماڵەیە ببەنو موژدەی لـەدایکبوونی کۆرپـەی نوێیـان پێڕابگەیـەنن, ئەمـەش دەبێتـە هـۆی جۆشـدانی خۆشەویـستی لـەناو کۆمـەڵگای موسـڵماندناو بەشـداریکردن لەخۆشـیی یەکتریداو وەکو بەخێرهاتنێکیشە لەکۆرپەی نوێ کـەتازە دێتـە ئـەو کۆمەڵگایـەوە. بـەڵام ئەوەی پێویستە زۆر ئاگاداری بین لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە: فەرقی مزگێنیدانو پیرۆزبـایی کردن بۆ منداڵی کوڕو کچ نەکرێ, چونکە کۆرپەی تـازە لـەدایك بـوو, کـوڕ بێـت یـان کـچ, ئەوە بەخـششو خـەڵاتی خوایـە بـۆ بەنـدەکانی. پێغەمبـەری خـوا صَلَّی اللهُ عَلَیـە وَسَلَّم دەفەرموێ: کاتێك کچ لـەدایك دەبێـت" خـوای گـەورە فریـشتەیەکی بـۆ لا ڕەوانـەدەکاتو خێروبەرەکـەت بـەخێرایی دێنـێو دەڵـێ: زەعیفەیـەك" زەعیفەیـەکی بـووە. ئـەو کەسـەی سەرپەرشتیی گـەورەکردنو بـەخێوکردنی ئـەو کـچە دەکـات" تـا ڕۆژی قیامـەت یارمـەتی دەدرێت. ئەگەر کـوڕیش لـەدایك بـوو, خـوای گـەورە فریـشتەیەك لەئاسمانـەوە دەنێـرێو نێوچـاوانی مـاچ دەکـاتو دەڵێـت: خـوای گـەورە سـڵاوت لێـدەکات. (طَبَراني لەئبن عەباسەوە گێڕاویەتیەوە)

بەڵام بەداخەوە, بەهۆی تێنەگەیشتن لەئیسلام, هەندێ کەس کاتێ مـوژدە دەبـەن بـۆ باوكو کەسـەکاری منـداڵی کـچی لـەدایك بـوو, بەتایبـەت ئەگـەر پێشتر ئـەو ماڵـە چـەند کچێکیان بووبێو کوڕیان نەبووبێ, ئەوا هەواڵەکەیان بەشەرمو دڵەتەنگییەوە دەداتـێ, یان ڕووی نایەت بڵێت کچتان بووە! یـان زۆر لەخۆشـکان" کاتـێ دەچـن بـۆ لای ئافرەتێـك کەکـچی بـووەو چـاوەڕێی کـوڕ بـووە, لـەجیاتی ئـەوەی بڵـێ: خـوا لێتـان نەسـێنێو

لەخوابەزیاد بێ کەئەم کچە جوانەی پێبەخشیون" دەموچی بەیەکدا دەداو وەك مەکر نواندن دەگریو بەدایکی منداڵە کچەکە دەڵێ: بەخوا پێم ناخۆش بوو کچتان بووە!

جێگای داخە هێشتا لەکۆمەڵگای ئێمەدا" کاتێ کوڕ لەدایك دەبێ دەیان کەس موونافەسە لەسەر ئەوە دەکەن کەکامیان زووتر موژدە بەباوکی بدەنو بەخشش وەربگرن. بەڵام کاتێ کچ لەدایك دەبێ" مەگەر دەگمەن, ئەگینا کەس موژدە نابات بۆ باوكو کەسوکاری منداڵە کچەکە بڵێن: پیرۆزتان بێ, موژدەتان لێبێ خوای گەورە کچی پێبەخشیون! کە لەڕاستیدا کوڕو کچ هەردوکیان بێ هیچ جیاوازییەك خەڵاتو دیاریی پەروەردگارن, پێشکەش بەو دایكو باوكو بنەماڵەیە کراون, بەڵکو زۆرجار کچ زیاتر مایەی خێروبەرەکەتە بۆ دایكو باوك. ئینسانی خواناس بەبوونی کچ خۆشحاڵترە, ئەوەتا ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێبێت)" کاتێ هەواڵیان بدایە کەکچتان بووە زۆر خۆشحاڵ دەبوو, دەیفەرموو: پێغەمبەران باوکی کچان بوون!

یەکێکی تر لەپیاوە صاڵحەکان کەناوی یەعقووبی کوڕی بەختانە" دەفەرموێ: حەوت کچم هەبوو, هەموو جارێ کەکچمان دەبوو" دەچوومە خزمەت ئیمامی ئەحمەد, ئەویش پێی دەگوتم: ئەی یەعقووب, ئەمجارەشیان کەکچتان بووە" دیارە خوا تۆی خۆشدەوێ, چونکە پێغەمبەرانیش باوکی کچ بوون, وەهەر من دەزانم لــــەبارەی گەورەیی کچانەوە چی گوتراوە!

بەڵێ, پێغەمبەران زۆربەیان هەر کوڕیان نەبوو, یان کەبویانە مردوونو هەر کچیان بۆ ماوە, بۆ نموونە حەزرەتی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێت) هەموو منداڵەکانی کچ بوونو هیچ کوڕی نەبوون, تەنانەت کچەکانی شوانیی مەڕوماڵاتەکەیان دەکرد. وەحەزرەتی محمد المصطفی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم" هەموو کوڕەکانی بەمنداڵی وەفاتیان کردو تەنها باوکی کچان بوو!

بەڵام هێشتا زۆرن ئەو دایكو باوکانەی کەخوا هەر کچیان دەداتێ, لەجیاتی حەمدوسەنای خوا" لەجیاتی گوێزەبانە بەخشینەوەو هەدیە پێشکەش کردن بەو کەسەی کەهەواڵی ئەوەی داوەتێ کەکچیان بووە, لەجیاتی ئەوە" هەر دەڵێی خۆڵودۆی بەسەردا ڕژاوەو دەموچاو بەیەکدا دەداو کەس ناتوانێ قسەی لەگەڵدا بکاتو

لەتووڕەیی‌و پەستیی خۆیدا روو لەماڵەوە ناکاتەوەو ناچێتە سەر منداڵەکە ماچی بکات‌و حەمدوسەنای خوا بکات‌و دوعای خێر بۆ خێزانەکەی بکات! یان دایکەکە کەهەر کچی دەبێ, لەجیاتی سوپاسی خوا" دەست دەکات بەگریان‌و بەزەیی بەخۆیدا دێتەوە. بەڵام ئەو دایك‌و باوکانەی کەبەو شێوەیە پێشوازیی لەبوونی کچ دەکەن, ئاوا مافی منداڵ (کەدڵخۆشبوونە بەلەدایك بوونی) جێبەجێ‌دەکەن, دەبێ ئاگاداربن‌و بزانن, لەدین‌و ئیمانی خۆیان بترسن, چونکە ڕەوشتی نەفامیی پێش ئیسلامیان زیندووکردۆتەوە. قورئانی پیرۆز باسی ئەو سەردەمە تاریکەمان بۆ دەگێڕێتەوە کەهێشتا نووری قورئان" ئەم سەر زەوییەی ڕووناك نەکردبۆوە, ئەو سەردەمەی کەپێش مافی هەموو ئینسانەکان" مافی کۆرپەی تازە لەدایك بووی بێتاوانی کچ, پێشێل دەکراو مافی ژیانی پێ ڕەوا نەدەبینرا, ئەو کاتەی کەکەسێك خەبەری دەدرایە کەکچی بووە" چۆن پەست دەبوو, ناوچاوانی بەیەکدا دەداو رەش دادەگیراو خۆشی لەناو دڵی خۆی‌و ژن‌و خێزانەکەی هەڵدەگرت. لەم بارەیەوە قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ, )يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ (النحل 58 ـ 59), واتە: خۆ ئەگەر موژدەی بوونی کچ بدرێت بەیەکێك لەو نەفامانە, ڕووی گرژو تاڵ دەبێت‌و ڕەش دادەگیرسێت‌و سینەی پڕ دەبیت لەغەم‌و پەژارە, لەداخ‌و خەفەتی ئەو موژدە ناخۆشە" خۆی لەخەڵکی دەدزێتەوەو بەتەنها بیردەکاتەوە, ئایا بیهێڵێتەوەو بەزەلیلی‌و سووکی‌و بێ‌نرخی, یاخود زیندەبەچاڵی بکات‌و بیخاتە توێی خاکەوە, ئای کەچەند بڕیارێکی نابەجێ‌و ستەمکارانەیە!

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: ئیسلام ئافرەتی ڕزگارکرد, چونکە وەکو ئایەتەکە بۆمان دەگێڕێتەوە, پێش ئیسلام" کەسێك کچی ببوایە هەر بەمنداڵی زیندەبەچاڵی دەکردو دەیخستە چاڵێکەوەو بەزیندوویی گڵی دەکردە سەر, تاوەکو دەمرد! لەترسی ئەوەی نەوەکو ئەم کچە گەورە ببێ‌و خـــەڵکی بێنە خوازبێنی‌و پاشان بڵێن: کچەکەی" ژنی فڵان کەسە!

گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن: سەردەمی بەختەوەرییەو ڕۆژی زێڕینی ئیسلام بەسەر هەموو زەویدا بڵاوبۆتـــەوە, صەحابەکان لـــــەمـزگـــــەوتی پێغەمبەردا

صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" لەخزمەت رَسولُ الله دانیشتوون‌و هەموو لاشەیان بۆتە گوێچکە بۆ ئەوەی فەرمایشتێك لەو دەمە پیرۆزە بێتە دەرەوەو ئەوانیش وەریبگرن‌و دونیاو قیامەتی خۆیانی پێ ئاوەدان بکەنەوە. جاروبارەش قسەی خۆش‌و پرسیارو وەڵامێك دەکەوێتە نێوان رَسولُ اللهو صەحابە دڵسۆزو وەفادارەکانیەوەو خۆشەویستی خوا" زەردەخەنە دەیگرێ‌و ددانی پیرۆزی وەك گەوهەرو مرواری" بەڵکو زۆر جوانتر دەدرەوشێنەوە. صەحابەکانیش زەردەخەنەو پێکەنین دێتە سەر لێویان‌و نێوچەوانیان دەدرەوشێتەوە.. اللهُ أکبَر لەو دیمەنە, اللهُ أکبَر لەو مەجلیسە پڕ بەختەوەرییە! داوا دەکەم لەخوا منیش‌و ئێوەش‌و هەموو ئیمانداران لەبەهەشتی بەریندا" بەخزمەت مەجلیسی پێغەمبەرو هاوەڵانی بگەیەنێ اللّهُمَّ آمین.. بەڵێ, پێغەمبەری خوا" یەك بەیەك سەرنجی صەحابەکانی دەداتو لێیان وورد دەبێتەوە, لەناو هەموویاندا وا کابرایەك دانیشتووە, بەڵام غەمبارە.. دڵی خۆش نیە, بەڵکو زۆربەی کات چاوەکانی پڕن لـــەفرمێسکی قـــەتیس ماو! باشە دەبێ چی لێ قەومابێ؟!

خۆشەویستمان, خەمخۆری هەموو ئومەتی ئیسلام, حەزرەتی محمد المصطفی صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, ڕوو لەو کەسە دەکاتو دەفەرموێ: ئەرێ دەکرێ پێم بڵێی هۆی چیە وا غەمباریت؟ هۆی چیە زەردەخەنە لەسەر لێوت تۆراوە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو باسی خۆی دەگێڕێتەوە.. دەی ڕەحمەتی خواتان لێبێ باش گوێ بگرن, بەتایبەت ئەو کەسانەی کەبەردەوام هەر لەخەمی مافی ئافرەتدان‌و دروشمی ئازادیی ئافرەتیان بەرزکردۆتەوە, با ئەوان باشتر گوێ لەم ڕووداوە بگرن‌و چاکتر تێبگەن کەئیسلام" ئافرەتی لە چ ماڵوێرانیی‌و مەزڵوومیەتێك ڕزگارکرد.

بەڵێ, کابرا دەست بەگێڕانەوەی هۆی غەمگینییەکەی دەکاو دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا, من لەزەمانی جاهلیمدا" پێش موسڵمان بوونم" گوناهێکم کردووە, زۆر دەترسم هەرچەندە موسڵمانیش بووم, بەڵام خوا لەو گوناهە گەورەم خۆش نەبێت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: بۆم باس بکە ئەو گوناهە گەورەیە چیە کەتۆ کردووتە! کابرا گوتی: قوربان, من یەکێك بووم لەو کەسانەی کەزۆر ڕقم لەبوونی کچ بوو, بەڵام ئەوەبوو کاتێ کەژنم هێناو منداڵمان بوو" کچمان بوو, ویستم هەر

بەمەنۆتکەیی بیخەمە ژێر گڵەوەو بیکوژم, بەڵام ژنەکەم زۆر لێم پاڕایەوە کەوازی لیٚ بێنم‌و نەیکوژم, چونکە تۆبەرەیەتی‌و دڵی پێی دەکرێتەوەو ئاودەنگی‌یەکە لەماڵەوە لەگەڵیدا. منیش لەبەر خاتری خێزانەکەم دڵم نەرم بوو و وازم لێهێنا. بەڵێ ساڵ بەساڵ ئەم کچە گەورەبوو, تا باڵغ بوو, ئەوەندە جوان بوو لەجوانترین کچی ئەو دەوروبەرە دەژمێردرا. ئەوەبوو خەڵکی دەهاتن بۆ خوازبێنی, منیش بەمە زۆر ناڕەحەت بووم! دەمارگیریی جاهلیم جووڵاو بیرم کردەوە, ئەگەر بیدەم بەشوو" هەر عەیبەو کەموکوڕییە بۆم‌و چۆن خەڵکی ببن بەزاوام! خۆ ئەگەر بەشوویشی نەدەم‌و لەماڵەوە بیهێڵمەوە هەر خەڵکی باشم باس ناکەن‌و پێی عەیبدار دەبم! بۆیە لەدڵی خۆمدا بڕیارمدا کەبیکوژم! بۆ ئەم مەبەستەش, خێزانەکەمم بانگ کردو گوتم: کچەکەمان حازر بکە, دەمەوێ سەردانی خزمانمان بکەم‌و ئەویش لەگەڵ خۆمدا دەبەم. خێزانەکەم گوتی: نەکا نیازت بەرامبەری خراپ بێ‌و لەناوی بەری! گوتم: نەخێر, چۆن شتی وا دەکەم. ژنەکەم گوتی: دە سوێندم بۆ بخۆو پەیمانم بدەرێ کە بەسەلامەتی دەیهێنیتەوە بۆم! منیش وەعدو بەڵێنم پێداو لەگەڵ کچەکەم بەڕێکەوتین تا گەیشتینە چۆڵەوانی یەك, دەستی کچەکەمم گرت‌و بردم بۆ لای بیرێکی قووڵ, سەیری ناو بیرەکەم کرد زۆر قووڵ بوو, لەدڵی خۆمدا گوتم: زۆر باشە, لەم بیرەدا دەیخنکێنم‌و هەرگیز ناتوانێ لەم بیرە قووڵە بێتە دەرەوە! جا کاتێ سەیری ناو بیرەکەم دەکردو سەیری کچەکەمم دەکرد" کچەکەم حاڵیی بوو کەنیازی لەناوبردنیم هەیە, چونکە ئەویش دەیزانی کەبوونی کچ مایەی عەیب‌وعارە لەو کۆمەڵگایەدا. بۆیە زۆر بەتوندی باوەشی پێداکردم‌و ماچی کردم‌و دەستی کرد بەگریان‌و زۆر پاڕایەوە کەنەیکوژم, منیش سۆزم جووڵاو بڕیارمدا کە لەناوی نەبەم. بەڵام دیسان دەمارگیریی نەزانی‌و نەفامیم جووڵایەوەو پێی گوتم: چۆن قبووڵ دەکەی کچت هەبێ‌و خەڵکی بێنە خوازبێنی‌و کچەکەت ببێتە ژنی خەڵك! بۆیە ئەمجارەیان زۆر بەتوندی پەلاماری کچەکەمم داو لەسەر سەر فڕێم دایە ناو بیرەکەوەو ئەویش قیژاندی‌و هاواریکرد: بابە گیان لەسەر چی منت کوشت؟ ئیتر هەر هاواری دەکردو دەپاڕایەوە تا ئەوەبوو دەنگی نەماو بەتەواوی خنکا. ئێستاش ئەی پێغەمبەری خوا, ئەو دەنگەی ﷺگوێی (بابە گیان لەسەر چی منت کوشت)" هەر لەمێشکمدایەو لەبیرم ناچێتەوە, جا لەوە دەترسم

هەرچەندە موسڵمان بووم‌و زۆر لەو کردەوەیەم پەشیمانم، بەڵام تاوانەکەم ئەوەندە گەورەیە دەترسم خوا لێم خۆش نەبێ!

کاتێ کابرا قسەکانی تەواوکرد" پێغەمبەری خوا فرمێسک بەچاوە پیرۆزەکانیدا هاتە خوارەوەو زۆر گریا، هەموو صەحابەکانیش دەستیان کرد بەگریان. ئەمجا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم" بەو کابرایەی فەرموو: (لَوْ أُمِرْتُ أَنْ أُعاقب أَحَداً بِما فَعَلَ في الجَاهِلِيَّةِ لَعاقَبْتُكَ)، واتە: ئەگەر فەرمانم پێبدرایە سزای کەسێك بدەم لەسەر ئەو کردەوانەی کە لەسەردەمی نەفامیدا (پێش موسڵمان بوونی) کردوونی ئەوا من سزای تۆم دەدا لەسەر کوشتنی ئەو کچە بەستەزمانە بێتاوانەت!

بەڵێ، ئەمە نموونەیەك بوو لەناو کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی پێش ئیسلام" کەئاوا دژی کچ بوون‌و بێحورمەتییان بەکچ دەکردو بەبێتاوان" هەر بەزیندوویی زیندەبەچاڵیان دەکرد. جا قورئانی پیرۆز ئەو دیمەنەمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ، بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ ﴾(التكوير 8 ـ 9)، واتە: (کاتێك کەکچی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری لێکرا لەسەر چ گوناهێك" بە چ تۆمەتێك کوژرا) کەمەبەست لەڕۆژی قیامەتە.

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: وا مەزانن کەزیندەبەچاڵکردنی کچ‌و کوشتنی بەناحەق،تەنها بەتاوانی ئەوەی کچەو کوڕ نیییە" هەر لەزەمانی پێش ئیسلامدا بووەو ئێمە وەکو حیکایەت لەقورئاندا بیخوێنینەوە، بەڵکو لەم سەردەمەشدا" هێشتا خەڵکانێك هەن کەلەوانەیە ئەهلی مزگەوت‌و جومعەو جەماعەتیش بن، لەوانەشە هەبێ حەجی ماڵی خوایشی کردبێ، کەچی کچەکەی زیندەبەچاڵ دەکات‌و دەیکوژێ، ئەمیش هەر لەبەرئەوەی کەئەو منداڵەی کچەو کوڕ نیە! لەوانەیە بڵێن چۆن شتی وا دەبێ‌و کوا شتی وا ڕوویداوە! لەوڵامدا دەڵێم: ئەی ئەو کەسەی کە لەماڵەوە چوار تا پێنج کچی هەیە بەڵام یەك تاقە کوڕیشی هەیە، کوڕەکەی ناودەنێ شوان" ئەوەش بەو مەبەستەی شوانی خوشکەکانی بێ، وەکو ئەوەی کچەکانی خۆیان ئینسان نەبن‌و نەزانن ژیان‌و چاکەو خراپە چیە، پاشان هەرچی خواردنی خۆش‌و خزمەتە" لەلایەن دایك‌و باوکەکەوە پێشکەش بەم کوڕە تاقانە دەکرێ‌و تەنانەت زۆرجار گۆشتی برژاو بۆ کوڕەکە دانراوە‌و لەبەرچاوی خوشکەکانیدا خواردوویەتی‌و ئەو بێتاوانانەش دەمیان لەگۆشت نەداوە!

وەهەر جارەی جۆرە جلوبەرگو پێلاوێك بۆ كوڕەكە دەكەن‌و كچەكانیشیان جەژناو جەژن‌" ئەگەر پۆشاكو پێلاوێكیان بۆ بكرێ، ئەویش بەدڵی خۆیان نا. جا ئایا هەموو ژەمێك" هەموو ڕۆژێك" ئەم كچە كەتەماشادەكات چۆن جیاوازی دەكرێت لەنێوان ئەوو براكەیدا" تەنها لەبەر ئەوەی ئەم كچەو ئەو كوڕە، ئایا هەموو ڕۆژێ مردنێك نابینێ؟ بەڵێ، دەمرێ، هەرچەندە لاشەی نەمرێ، بەڵام هەستی دەمرێ، دەروونی دەكوژرێ، هەست دەكا كەزۆر بێ‌نرخە، ئەو هەستەی لا دروست دەبێ كەئەم" چونكە كچە" ئەوا زیادەیە لەو ماڵەداو ئەركە بەسەر دایكو باوكیەوە!

بەڵێ بەڕێزان: ئەو كچانەی كەئاوا ڕەفتاریان لەگەڵدا دەكرێ" سەد خۆزگەیان بەزیندەبەچاڵكراوەكانی زەمانی جاهیلی بكا، كەئەوان یەك جار دەكوژران، بەڵام ئەمان ڕۆژی دەیان جار!

بەڵێ خۆشەویستان: دەبێ ئیمانداران ئاگاداربن، خۆ بپارێزن لەڕەوشتی جاهیلەكانی پێش ئیسلام، كەبەبوونی كچ دڵتەنگ دەبوون، لەبەرئەوەی ئێمە، پێغەمبەرەكەمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمانمان پێدەكات كەبەچاوی سووك تەماشای‌كچان نەكەین، دەفەرموێ: (لا تَكْرِهُوا الْبَناتَ، فَإِنَّهُنَّ الْمُؤْنِساتِ الْغالِيات)(رَواهُ أحمد والطَبَراني)، واتە: ڕقتان لەكچان نەبێت، چونكە ئەوان هاودەم‌و دڵنەوای بەنرخ‌و خاوەن بەهان.

خۆشەویستی خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەفەرموودەیەكی‌تردا دەفەرموێ: (مَنْ عالَ جارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغا" جاءَ يَوْمَ الْقِيامَة أنا وَهُوَ كَهاتَيْنِ - وَضَمَّ أصابِعَهُ)(رَواهُ مُسلِم)، واتە: هەركەسێ دوو كچۆڵە بەخێو بكا هەتا لەخەم دەڕەخسێن" من‌و ئەو وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا جووت پێكەوە دەچینە ناو بەهەشت

بەڕێزان، ئەی ئەو كەسانەی كەخوای گەورە كردوونی بەباوكی كچ، بەتایبەت ئەوانەتان كە لەسێ كچ زیاتریان هەیە" گوێ بگرن بۆ ئەو موژدە خۆشەی كەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پێتان ڕادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: (مَنْ كانَ لَهُ ثَلاثُ بَناتٍ، أو ثَلاثُ أخَواتٍ أو إبْنَتانِ أو أُخْتانِ، وَأحْسَنَ صُحْبَتَهُنَّ، وَاتَّقَى اللهَ فِيهِنَّ فَلَهُ الجَنَّةَ)(رَواهُ التِرْمِذي)، واتە: هەركەسێ سێ كچ" یان سێ خوشك" یان دوو كچ" یان دوو خوشكی

هەبێویەجوانی ڕەفتارو گوزەرانیان لەگەڵدا بکاو لەترسی خوا" ناهەقییان لێ نەکا" ئەوا ئەو کەسەبەهەشتی یە!

بەڵێ موسڵمانی بەڕێز: ئەی ئەو کەسەی کەکچ یان خوشکت هەیەو تۆ سەرپەرشتیی دەکەی, ئەگەر ڕەفتارت باش بێ لەگەڵیاندا ئەوا جێگات بەهەشتە.

هەروەها دەربارەی ئەو کەسانەی کەتەنها یەك کچیان هەیە" ئەم موژدە گەورەیە هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەدەفەرموێ: (مَنْ كانَتْ لَهُ أُنْثى, فَلَمْ يَئِدْها وَلَمْ يُهِنْها, وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ عَلَيْها أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ)(رَواهُ أبو داود) واتە: هەرکەسێ مێینەی هەبێو زیندەبەچاڵی نەکاتو سووکوڕسوای نەکاتو بەچاوی بێڕێزەوە تەماشای نەکاتو نازی کوڕی بەسەردا نەدات" ئەوە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە!

موسڵمانانی بەڕێز: بەڕاستی کچ بۆ دایكو باوك" هەم لەدنیادا بەرەکەتەو ئەوەندەی کەکچ دڵسۆزە بۆ ماڵی باوکیو لەخزمەتی دایكو باوکیدایە" نیو ئەوەندە کوڕ سوودی بۆ دایكو باوکی نیەو ناتوانێ خزمەتیان بکات, بۆ قیامەتیش هەروەکو لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتووە" حورمەت گرتنی کچو باش بوون بۆی" دەبێتە هۆی چوونە بەهەشتو دوورکەوتنەوە لەدۆزەخ! فەرموون گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن:

پیاوێك" خوای گەورە شەش کچی دابوویە, خێزانەکەی حاملەبوو بەمنداڵی حەوتەم. ئەم پیاوە لەوە دەترسا کەژنەکەی" ئەمجارەشیان هەر کچی ببێ, لەدڵەوە خۆزگەی دەخواست کەئەمجارە کوڕیان ببێ, بۆیە لەدڵی خۆیدا بڕیاری کۆتایی داو گوتی: شەرت بێ ئەمجارە ژنەکەم کچی ببێ تەڵاقی دەدەمو لەم ماڵە دەری دەکەم. باشە, من حەوت کچ چی لێبکەم! بەڵێ, بەم مەراقەوە شەو خەوی لێکەوت, لەخەونیدا وای بینی کەوا ڕۆژی قیامەتە, وا جەهەننەم تاوی سەندووەو ئاگرەکەی وەکو کێو بەرزدەبێتەوەو هەموو کەس لەترسان چاوی ئەبڵەق بووە. بەڵێ کابرا دەڵێ: لەخەوەکەمدا مەلائیکەت منیان گرتو بردیانم بۆ ئەوەی بمخەنە جەهەننەمەوە, بەڵام لەهەر دەرگایەکی جەهەنەم نزیکیان دەکردمەوە" یەکێك لەکچەکانم دەهاتو دەپاڕایەوەو نەیدەهێشت بمخەنە جەهەننەمەوە.لەشەش دەرگای دۆزەخەوە, لەهەر دەرگایەی یەکێ لەشەش کچەکەم وەستابوونو تکایان بۆ دەکردم, دەیانگوت: توخوا واز لەباوکمان بێنن, باوکمان بۆ ئێمە

زۆر باش بووەو زۆری خزمەت کردووین. بەڵێ لەو شەش دەرگایە ڕزگارم بوو, ئەمجارەیان بەرەو دەرگای حەوتەمیان بردم, بەڵام لەبەردەم دەرگای حەوتەمی دۆزەخدا هیچ کەسێك نەبوو دیفاعم لێبکات, منیش لەترسان بەخەبەرهاتم. ئەمجار زانیم چ خەیاڵێکی خراپو گوناهی گەورەم کردووە, بۆیە پەشیمان بوومەوەو تۆبەم کردو ئەمجارەیان بەدڵ لەخوا پاڕامەوەو گوتم: (أللَّهُمَّ أرْزُقْنا السَّابِعَة), ئەی پەروەردگارم: ئەمجارەشیان منداڵی حەوتەممان کچ پێببەخشە, بۆ ئەوەی هەر حەوت دەرگاکەی جەهەننەمم بۆ بگرنو خوای گەورە بەهۆی کچەکانمەوە لەتاوانەکانم بمبەخشێتو بەبەهەشت شادم بکا!

ئیمانداران: خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەربارەی بەخشینی کوڕو کچ دەفەرموێ: ﴿ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثاً وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ, أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَاناً وَإِنَاثاً وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيماً إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ (الشورى 49 ـ 50), واتە: خوا خاوەنی هەموو ئاسمانەکانو زەویشە, هەرچی بوێت دروستی دەکات, بەهەرکەس کەخۆی بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێتو, بەهەرکەس کەبیەوێت تەنها کوڕ دەبەخشێت, یاخود لەهەردوو جۆر ـ لەکوڕو لەکچ ـ بەهەندێ خێزان دەبەخشێت. هەیشە" کەویستی خوا وایە کەهیچی نەداتێو نەزۆك بێت, بەڕاستی ئەو زاتە زاناویەدەسەڵاتە.

دەچینە خزمەت زانای بەناوبانگ ئبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بۆ ئەوەی تەفسیرو ڕوونکردنەوەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەمان بۆ بخاتە ڕوو. ئبن قەیم لە (أحكام المَولود, ص20)دا دەفەرموێ: خوای گەورە لەسوورەتی (الشورى)دا" حاڵو باری ژنو مێردی لەڕووی بوونی منداڵەوە بۆ چوار حاڵەت دابەش کردووەو, هەواڵیشی داوە کەئەو منداڵەی لەنێوان ژنو مێرددا دروست بووە, خوای گەورە پێی بەخشیونو ئازایەتی ئەوانی تێدا نییە, چوار حاڵەتەکەش ئەمانەن:

1 ـ هەیە هەر کچی هەیە.

2 ـ هەیە هەر کوڕی هەیە.

3 ـ هەیەکچو کوڕی هەیە.

4 ـ ژنو پیاوی واشە نەزۆکەو منداڵی نابێ.

جا هەرکەسێك ناڕازی بێ بەو بەشەی کەخوا لەم چوار حاڵەتە یەکێکیانی بۆ هەڵبژاردووە ئەوە بەڕاستی بەر تووڕەیی‌وخەشمی خوای گەورە دەکەوێ. پاشان ئبن قەیم دەفەرموێ: خوای گەورە بەباسکردنی بوونی کچ دەستی پێکردووەو فەرموویەتی: ﴿ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثاً ﴾. لێرەدا زانایان دوو بۆچوونیان هەیە, هەندێکیان دەفەرموون: بۆیە خوای گەورە لەسەرەتاوە باسی بەخشینی کچی کردو فەرمووی: بەهەرکەس کەبیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت" ئەمە بۆ ئەوەیە تا دایكو باوك (کەزۆربەیان کچیان بەلاوە بەڕێز نیە) بزانن کەکچ لای خوای گەورە چەند بەڕێزەو لەبەر ڕێزداری کچە کە لەبەخششی یەکەمدا باسیکردووە.. واتە, ئەی دایكو باوکەکان: ئێوەش قەدرو حورمەتی کچەکانتان بگرن" کەبەخششو خەڵاتی خوان بۆ ئێوە.

هەندێ لەزانایانیش فەرموویانە (کەبۆچوونی ئەم زانایانە بەهێزترە): خوای گەورە" لەبەر ئەوە باس کردنی کچانی لەئایەتەکەدا پێش خستو فەرمووی: ﴿ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثاً ﴾, ئەمە بۆ ئەوەیە تا ئینسان تێبگات کەخوای گەورە مەیلو حەزی لەچی بێ هەر ئەوە دەبێ. چونکە دایكو باوك" بەزۆری تەنها کوڕیان دەوێت, خوای گەورەش هەواڵی ئەوەی داوە: ئەوە دەبەخشێت کەخۆی مەبەستیەتی نەك ئەوەی کەدایكو باوك حەزی لێدەکەن کەبوونی کوڕە.

پاشان دەفەرموێ: لەبەر ئەوەی کچ لای نەفامەکان نەك هەر ڕێزی نەبوو بەڵکو زیندەبەچاڵیشیان دەکردن‌و مافی ژیانیان پێ ڕەوا نەدەبینین" وەکو ئبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: ئەوانەی کە لەزەمانی نەفامیدا زۆر دژ بەبوونی کچ بوون, کاتێ خێزانەکانیان حامیلە دەبوون" لەو کاتەدا کەوەختی لەدایکبوونی منداڵبوونەکە نزیك دەبۆوە" ژنەکەیان دەبردە سەر چاڵێکی پێشتر هەڵکەندراوو ئامادەکراو, جا کاتێ منداڵەکەی دەبوو" ئەگەر کچ بوایە ئەوا هەر خێرا فڕێیان دەدایە ناو چاڵەکەوەو گڵەکەیان بەسەردا دەکردەوەو زیندەبەچاڵیان دەکرد, خۆ ئەگەر منداڵە لەدایك بووەکە کوڕ بوایە" خـــۆشحـــــاڵ دەبـــوون‌و دەیانهێنایەوە بۆ ماڵەوە! جا خوای گەورە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بیرکردنەوە گەندەڵو بۆگەنە" لەئایەتەکەدا باسی کچی پێش خستوەکو ئەوەی بفەرموێ: ئەوەی بەلای ئێوەوە ئەوەندە بێنرخە کەزیندەبەچاڵی

دەكەن, لای من ئەوەندە ڕێزدارە كە لەپێش كوڕدا (كەلای ئێوە زۆر ڕێزدارە) باسیدەكەم! خۆشەویستان: لەو ئایەتەی سووڕەتی شووڕادا, خوای گەورە باسی كچی پێش خستووە بەسەر باسی كوڕدا, جا بۆ ئەوەی مافی ئەو پێش خستنو دواخستنە بدات" كچانی بە (نەكیرە) باسكردووەو فەرموویەتی (إِناثاً), بەڵام بۆ كوڕ فەرموویەتی (الذُكور)و بە (مەعریفە) باسیكردووە. جا بەپێش خستن" كەموكورتیی مێینەی قەرەبوو كردۆتەوە, كەئەمەش ئیعجازێكی زانستی زمانەوانیی قورئانەو جێگای سەرنجو بیر لێكردنەوەیە!

موسڵمانان: ئایا ئەو كەسەی كەموژدەی ئەوەی دەدرێتێ كەمنداڵی بووە" دەبێ چی بڵێ؟ پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: (ما أَنْعَمَ اللهُ عَلى عَبْدٍ نِعْمَةً مِنْ أَهْلٍ, أو قالَ: أو وَلَدٍ, فَيَقُولُ: ما شاءَ الله لا قُوَّةَ إِلاّ بِالله, فَيَرى فيهِ آفَةً دُونَ الْمَوْتِ)(رَواهُ أبو يَعلى), واتە: هەركاتێك خوای گەورە نیعمەتی كەسوكاری بەبەندەی خۆی بەخشی, یان فەرمووی: خوای گەورە منداڵی پێبەخشی, ئەو كەسە بڵێت: ما شاءَ الله لا قُوَّةَ إِلاّ بِالله, واتە: هەرچی خوا بیەوێ هەر ئەوە دەبێو بەڕاستی بوونی منداڵو كەسوكار" هەمووی فەزڵی خوایەو هیچ هێزو تواناو ئازایەتییەكی منی تێدا نیە, بەڵكو خوا ڕەحمی بەمن كردوە كە ئەو منداڵو ژنو كەسو كارەی پێ بەخشیوم, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموی: هەركەسێك ئەمە بڵێتو بە دڵیش بڕوای پێ هەبێ, ئەوا هیچ بەڵاو موصیبەتێك لەو منداڵو كەسوكارەی نابینێ جگە لەمردن, واتە: خوای گەورە ئەو منداڵەی بۆ لەهەموو موصیبەتێك دەپارێزێو لەهەموو بەڵایەك بەدوری دەكات, تەنها مردن نەبێ, كەمردن هیچ شتێك نیە ڕەتی بكاتەوەو هەر كەسەو لەئەجەلو كاتی دیاریكراوی خۆیدا دەمرێت.

كەواتە: مافی دووەمی منداڵ لەدوای لەدایكبوونی" بریتی یە لەدڵخۆشبوونو حەمدوسەنای خواكردنو گوتنی ما شاءَ الله و جیاوازی نەكردن لەنێوان كوڕوكچدا.

**مافی سێیەم:** بانگدان بەگوێی منداڵدا

بەڵێ ئیمانداران, مافی سێیەمی منداڵ دوای لەدایكبوونی بەسەر دایكو باوكەوە, ئەوەیە كەبانگ بدەن بەگوێی ڕاستی منداڵە تازە لەدایك بووەكەداو, قامەت

خوێندن بەگوێی چەپیدا.. لەوانەیە کەسێك بپرسێ: باشە ئەو منداڵە چ سوودێك لەو بانگە دەبینێ لەکاتێکدا کەهێشتا گوێی لەهیچ نیە؟

ئیمام ئبن ئەلقەیم" لەکتێبی (أحْكامْ المَوْلود)دا, نهێنی یەکانی بانگ خوێندن بەگوێی منداڵدا ئاشکرا دەکاتو دەفەرموێت:

1 ـ بۆ ئەوەی کەیەکەمین شت کەئینسان لەسەرەتای هاتنە ناو ژیانەوە بەگوێی دا دەدرێت, ووشەکانی گەورەیی‌و مەزنیی خوای پەروەردگاری لەخۆگرتبێت, لەگەڵ ئەو شایەتمانەی کەیەکەمین شتە کە بەهۆیەوە ئینسان پێی دەچێتە ناو ئیسلامەوە, ئەوەش هەروەکو تەلْقین وایە بۆی کەدروشمێکی ئیسلامی‌یە لەکاتی هاتنە ناو دنیاوە, هەروەك لەکاتی ماڵئاوایی لەدنیادا تەلْقینی بەیەك خوا پەرستیدا دەدرێت.

2 ـ هیچ جێی نکوولی نیە کەکاریگەریی بانگدان دەگاتە دلّی منداڵو کاری لێدەکات, با هیچ هەستیش بەوە نەکات.

3 ـ بەهۆی ووشە پیرۆزەکانی بانگەوە شەیتان هەڵدێتو واز لەو منداڵە ساوایە دێنێت کەهەر لەیەکەم ساتی لەدایك بوونیەوە شەیتان ئازاری دەدات, هەروەکو لەفەرموودەی پێغەمبەری خوادا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتوە کەیەکەم زیراندنی منداڵ" لەبەر ئەوەیە کەشەیتان ئازاری دەدات.

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی (ما مِنْ بَني آدَمَ مَوْلُودٍ إلاَّ نَخَسَهُ الشَّيْطانُ حِينَ يُولَد, فَيَسْتَهِلَّ صارِخاً مِنْ نَخْسِهِ إيَّاهُ, إلاَّ مَرْيَمَ وَإبْنِها), واتە: هەموو ئادەمیزادێك کە لەدایك دەبێت" شەیتان لەکاتی لەدایکبوونیدا چرنوقی لێدەداتو ئازاری دەداتو چرنوقی لێدەگرێت, ئیللا نەیتوانیوە لەمەریەمەو عیسای کوڕی بدات. حەزرەتی ئەبو هورەیرە" کەئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە, فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەن بزانن کەچۆن عیساو مەریەمەی دایکی لەچرنوقی شەیتان ڕزگاریان بووە, ئەم ئایەتەی قورئان بخوێننەوە کەدەفەرموێ: ﴿ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ (آل عمران 36), واتە: دایکی مەریەمە" کاتێ مەریەمەی بوو فەرمووی: خوایە من تۆ دەکەمە پەناگای ئەم کچەم کەمەریەمەیەو هەروەها نەوەکەشی" کەبیانپارێزیت لەشەیتانی ڕەجم کراو.. بەڵێ, خوای گەورەش

وەڵامی داواکاریەکەی دایەوەو مەریەمەو نەوەکەی لەشەیتان پاراستو نەیتوانی ئازاریان بدات. جا هەر لەفەرموودەی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتوه کەشەیتان" کاتێ گوێی لەدەنگی بانگ دەبێت، هەڵدێتو لەو ناوە دووردەکەوێتەوە، جا کەواتە: ئەی موسڵمانانی بەڕێز، هەرکاتێ منداڵت بوو ئەوا بیخەرە ناو باوەشتو بانگ بدە بەگوێی ڕاستیداو قامەت بکە بەگوێی چەپیدا، مەرجیش نیە زۆر دەنگ بەرز بکەیتەوە، هەروەها سوورەتی الفاتیحة و قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ و قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ و قُلْ هُوَ اللّهُ أحَدٌ" یەکی سێ جار بەسەر منداڵەکەدا بخوێنە ئینشائەڵڵا خوای گەورە لەشەیتانو چاوی پیسو هەموو بەڵایەك بەدووری دەکاتو لەپاشەڕۆژدا منداڵێکی لێدەردەچێ بۆ دونیاو قیامەت سوودی لێ دەبینی ئینشائەڵڵا.

بەڵێ خۆشەویستان، پێویستە منداڵی موسڵمان، ئاوا پێشوازی لێبکرێ نەك وەکو ئەو دابودەستورەی کە لەگەڵێك شوێنی کوردەواریدا" بەتایبەت لەگوندەکاندا ئەنجام دەدرا" کەکاتێ مناڵ لەدایك دەبوو، چەند کەس لەگەنجو هەرزەکار" لەماڵی ئەو کەسەی کەمنداڵی بووە" کۆدەبوونەوەو لەو ژوورەدا کەئافرەتەکەو منداڵەکەی لێیە" تا بەیانی شەوارەیان دەگرتو خەریکی قومارکردنو چەند یاریی بێمانا دەبوونو تا بەیانی نەدەخەوتنو ئیسراحەتیشیان لەژنەی بەستەزمان هەڵدەگرت، سەرەڕای ئەو هەموو سوێندو درۆو قسەی ناڕەواو ناشرینەی کە لەپشت سەری منداڵەکەوە دەیانکرد (لەجیاتی بانگو قامەت خوێندن بەگوێیدا)، سەرەڕای ئەوەش قورئانی پیرۆزیان دەهێناو لەچەند بەرگەوە دەپێچراو لەپشت سەری منداڵەکەوە دادەنرا! ئەمەش بۆچی؟! ئەم قورئان دانانو ئەم شەوارەگرتنە بۆچی؟! بۆ ئەوەی (شەوە!) منداڵەکە نەباتەوەو منداڵەکەنەمرێ!!

جا بەڕێزان: بزانن ئەم شتانە، شەوەو منداڵبردنو شەوارەگرتن بۆی، هیچ بناغەیەکی ڕاستی نیە لەئاینی ئیسلامداو بەڵکو شتێکی خورافیو بێ مانایەو دەبێ موسڵمانو ماڵی موسڵمان" لەم شتانە بەدووربێ. وەهەرگیز ڕەوا نیە کەقورئانی پیرۆز لەپشت سەری ئافرەتی زەیستانەوە دابنرێ، بەڵکو لەجیاتی ئەوە قورئانی پیرۆز (بەتەسجیل بێ یان بەسیدی) با لەوژوورەدا کەژنو منداڵەکەی لێیە" یان هەر لەماڵەکەدا لێبدرێو چاودێریی ئیسراحەتی دایکی منداڵەکەش بکرێ، وەئەوەی باسمانکرد لەخوێندنی بانگو

قامەت و سوورەتەکانی قورئان بەسەر منداڵەکەدا بخوێندرێ، ئەوە کافییەو دەبێ بڕوات بەخوای گەورە قایم بێت کەهیچ شتێ ناتوانێ کار لەو منداڵە بکات.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز، با هەوڵ بدەین زیاتر لەدینەکەمان شارەزا ببین، بەفەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" منداڵەکانمان پێبگەیەنین و مافی جگەرگۆشەکانمان بدەین، بەئومێدی ئەوەی کەئینشائەللا لەدواڕۆژدا کەسانێکیان لێدەربچێ کەژیانی خۆیان بەختەوەر بێ و ئێمەش لەسایەیاندا بحەسێینەوەو کۆمەڵگاش لێمان بەهرەمەند بێ.

أقولُ قَوْلي هذا وَأسْتَغْفِرُ اللهَ الْعَظيمَ لي وَلَكُمْ وَلِسائِرِ الْمُسْلمينَ مِنْ كُلِّ ذَنْبٍ، فَاسْتَغْفِرُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحيم..

# ووتاری ژماره سیانزه

## مافی منداڵ

### بەشی چوارەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى:

﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلادَكُمْ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾

(البقرة 233 )

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( تَسَمَّوا بِأَسْماءِ الأنْبِياءِ, وَأَحَبُّ الأَسْماءِ إلى الله تَعالى عَبْدُالله وعَبْدُالرَّحمن, وَأَصْدَقُها حارِثٌ وَهَمَّام, وَأَقْبَحُها حَرْب وَمُرَّة )

( رَواهُ أبو داود والنَّسائي )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست, سەلامو ڕەحمەتی خوا لەهەموومان بێ.. لەووتاری رابردوودا باسی هەندێك لەمافەكانی منداڵمان كرد لەسەر دایكو باوكو دەوروبەر, بۆ تەواوكردنی ئەو باسە شیرینە" دەڵێم وَبِاللهِ التَّوفیق: یەكێكیتر لەو شتانەی كەئاینی ئیسلام بەشتێكی بەسوودی داناوە بۆ منداڵ ئەوەیە: كەشیرینییەك لەدەمی منداڵ وەربدرێ لەكاتی لەدایكبوونیدا, یان چەند ڕۆژێك دوای لەدایكبوونی. لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) هاتووە كەئەبوموسا (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: خوای گەورە منداڵێكی كوڕی پێبەخشین, منیش هەڵمگرتو بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم, پێغەمبەر ناوینا ئیبراهیم, ئینجا دەنكە خورمایەكی لەناو دەمی خۆیدا بۆ نەرمو شل كردەوەو دەمی منداڵەكەی پێشیرین كرد" ئینجا دوعای خێری بۆ كرد كەخوای گەورە بەرەكەت بخاتە ژیانو تەمەنیەوە, پاش ئەوە منداڵەكەی دامەوە.

هەروەها ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەصەحیحەكەیدا لەدایكی ئیمانداران" عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە كەخاتوو عائیشە فەرموویەتی: موسڵمانان لەمەدینە" هەر كاتێ خوای گەورە منداڵی پێدەبەخشین دەیانهێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا, ئەویش دوعای فەڕوبەرەكەتی بۆ منداڵە ساواكە دەكردو لەباوەشی خۆیدا دایدەناو بەدەمی پیرۆزی خۆی" خورمای بۆ شل دەكردەوەو پاشان دەیخستە دەمی منداڵەكەوەو دەمی منداڵەكەی پێ شیرین دەكرد. جارێكیان منداڵێكیان هێنا بۆ خزمەتی, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم منداڵەكەی خستە باوەشیەوە, لەو كاتەدا كەدوعای بەسەردا دەخوێند" منداڵەكە میزی كرد بەباوەشی پێغەمبەری خواداو بەرگی پیرۆزی میزاویی بوو, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم داوای ئاوی كرد و شوێنی میزەكەی ئاوپرژێن كرد (دیارە منداڵەكە كوڕ بووە, چونكە میزی كچ" دەبێ شوێنەكەی بشۆردرێتەوە).

ئیمامی نەوەوی (ڕحمەتی خوای لێبێت) لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا فەرموویەتی:

ئەوەی لەم فەرموودانەوە وەردەگیرێ ئەوەیە:

1ـ زۆر پەسەندەو بەسوودە کەمنداڵی تازە لەدایك بوو دەمی شیرین بکرێ.

2ـ چاك وایە ئەو کەسەی دەمی منداڵەکە شیرین دەکا" ئینسانێکی چاکەخوازو خاوەن فەزڵو داناو زانابێ.

3ـ سونەتە کەمنداڵی لەدایك بوو" لەکاتی لەدایك بونیدا, یان چەند ڕۆژ دواتر, هەڵبگیرێو ببرێ بۆ لای ئینسانێکی خواناسو بەتەقواو زانا, ئەویش لەباوەشی بگرێو دوعای خێری بۆ بکات, چونکە ئەمە سوودی بۆ منداڵەکە هەیەو بەبەرەکەتی ئەو پیاوە باشەوە, منداڵەکە بەرەکەت وەردەگرێ.

4 ـ هەروەها ئەوەی لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ ئەوەیە کەئینسانی موسڵمان" بەتایبەت پیاوچاكو زانا" دەبێت زۆر بەڕەحمو بەزەییو نەرمونیان بێ بەرامبەر منداڵی خەڵکانی تر, وەکوچۆن خۆ بەکەم زانینو هاوسۆزی هەیە بۆ منداڵی خۆی, بەهەمان شێوەش بۆ ڕۆڵەی هەمو ئیمانداران وابێو لەباوەشیان بگرێو دوعای خێریان بۆ بکات.

خۆشەویستان: هەرچی ئەم پێغەمبەری ئیسلامە صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرموویەتی, یان بەکردەوە نیشانی داوین, کەئێمەی ئومەتی جێبەجێی بکەین, بێگومان بێ هیچی بێحیکمەت نیەو هەمووی بۆ سوودی خۆمانە, ئەوەتا لەبارەی دەم شیرین کردنی منداڵەوە بزانین زانستی نوێ چی دەڵێ؟!

دکتۆر فارووق مساهل" لەگۆڤاری (الأُمـة)ی قەتەری ژمارە (50)" لەوتارێکیدا بەناونیشانی (إهتمام الإسلام بتَغذيَة الطفل ـ گرنگیدانی ئیسلام بەخۆراکی منداڵ لەسەر فەرموودەی دەم شیرین کردنی منداڵ ـ التّحْنيك) دەفەرموێ: ئەو شیرینی مژینە ــ جا خورمابێت یان هەر شیرینییەکی تر ـ بەهەموو پێوانەیەك موعجیزەیەکی پزیشکیی پێغەمبەری خوایە صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم کەمرۆڤایەتی" چواردە سەدەی بەسەردا تێپەڕی ئەمجا ئاشنابوون بەئامانجو حیکمەتی شیرینکردنی دەمی منداڵ. ئێستا بۆ پزیشکەکان ڕوون بۆتەوە کەهەموو منداڵێکی بچووك ( بەتایبەت تازە لەدایك بوو و شیرەخۆرە ), ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە ئەگەر ئەم دوو شتەیان لێ ڕوویدات:

1 - بەهۆی برسێتیەوە بڕی شەکر لەخوێندا کەم ببێت.

2 - ئەگەر پلەی گەرمیی لەشی منداڵەکە" بەهۆی بەرکەوتنی هەوای زۆر ساردەوە" هاتە خوارەوە, ئەوا لەوانەیە منداڵەکە بمرێ.

بەڵێ ئازیزان: کاتێ ئەو شیرینییە دەخرێتە دەمی ئەو منداڵەوەو دەیمژێ, ئەوا لەمەترسیی دابەزینی ڕێژەی شەکر لەخوێنیدا, ڕزگاری دەبێ, بەڵام ئەوەش پێویستە کەبڵێین: مەرج نیە هەر خورما بدرێت بەمنداڵ" بەتایبەت کەزۆر جۆری خورما لەبەر ڕەقیو کۆنی" هەر بەکەڵکی ئەوە نایەت کە بەمنداڵ بدرێ, ئەگەر خورمایشی پێدرا, دەبێ کەمێك بێو زۆر نەرمو خاوێن بێ, ئەوەکو منداڵەکە بۆی قووت نەچێو تووشی مەترسی بکا, هەروەها دەتوانرێ بەهەنگوینی پاڵفتە, یان بەشەکراوێکی کەم" دەمی منداڵەکە شیرین بکرێ.

ئیمانداران: ئەمە ئەو شتانەبوون کە لەڕۆژی یەکەمی لەدایکبوونی منداڵەوە تا ڕۆژی حەوتەم بۆ منداڵ جێبەجێ دەکرێ, ئێستا با بزانین لەڕۆژی حەوتەمی منداڵدا" پێویستە چی بۆ بکرێ.

**یەکەم:** ناونانی منداڵ, بەوەی ناوێکی چاكو جوانو ناسكو پیرۆزی لێ بنرێت, چونکە ناو لەمنداڵیو گەورەییشدا" کاریگەری لەسەر دەروونی منداڵ دەبێت, تەنانەت لەڕۆژی قیامەتیشدا کاریگەریی ناو" هەر لەسەر ئینسان هەیە, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلّم دەفەرموێت: (إنَّكُم تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيامَةِ بِأَسْمائكُمْ وَأَسْماءِ آبائِكُمْ, فَأَحْسِنُوا أَسْماءَكُمْ), واتە: ئێوە لەڕۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتانو باوکتانەوە بانگ دەکرێن, جا لەبەر ئەوە ناوی چاك لەخۆتان بنێن.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلّم" ناوە خۆشەکانی بۆ دیاریکردووین کەفەرموویەتی: (تَسَمَّوا بِأَسْماء الأنْبِياء, وَأحَبُّ الأَسْماءِ إلى الله تَعالى عَبْدُالله وعَبْدُالرَّحمن, وَأَصْدَقُها حارِثْ وَهَمَّام, وَأَقْبَحُها حَرْب وَمُرَّة)(رَواهُ أبو داود والنَّسائي),

واتە: منداڵەکانتان بەناوی پێغەمبەرانەوە ناو بنێن, خۆشترین ناویش لای خوای گەورە (عَبْدُالله وعَبْدُالرَّحمن)ە, ڕاستگۆترین ناویش (حارِثْ وَهَمَّام)ە, ناشرینترین ناویش (حَرْب وَمُرَّة)ەیە.

موسڵمانانی بەڕێز: زۆر لەموسڵمانان" لەناونانی منداڵدا وا دەزانن کەواجبە ناوی منداڵەکە ناوی پێغەمبەران بێ (سەلامی خوایان لێبێت), یان ئەگەر ناوەکەعەرەبی نەبێت باش نیە, بەڵام کاتێ لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم وورد دەبینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەچاکترین‌و خۆشترین ناو (عَبْدُالله وعَبْدُالرَّحمن)ـە, هەروەها ناونانی منداڵ بەناوی پێغەمبەرانی خواوە, بەڵام لەهەمان کاتدا پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم ئەوەی نەکرد بەواجب, بەڵکو فەرمووی: (وَأصْدَقُها حارِثْ وَهَمَّام), واتە: راستگۆترین ناو (حارِثْ وَهَمَّام)ـە, حارِثْ بەکوردی واتەی جوتیارو کاسبکار دەگرێتەوە, کەواتە: ئەگەر کەسێك ناوەکەی کوردی بوو" ئەم ناوەش مانای کارو کاسپی دەگرێتەوە, ئەوا لەئیسلامدا ئەم ناوە ناوێکی پەسەندو جوانە, وەکو ناوی: جووتیار, کرێکار, کارزان, کاردروست. وەفەرمووی یەکێکی تر لەناوە جوانەکان (هَمَّام)ـە, واتە ئینسانی بەهیمەت‌و چاونەترس‌و نەبەزیو, جا هەر ناوێکی کوردی مانای بەهیمەتی‌و ئازایی‌و کراوەیی تێدابێ ئەوە ناوێکی پەسەندە. بۆ نموونە: هیوا, ئاوات, ئەژی (ئەژی واتای ناوی یەحیایە" کەناوی پێغەمبەرێکی بەڕێزە), یان بۆ کچ گەشبین. ئەی چ ناوێك خراپە؟ فەرمووی: (وَأقْبَحُها حَرْب وَمُرَّة), حەرب واتە: شەڕو جەنگ, بۆ نمونە کەسێك ناوی: جەنگی, جەنگیز, هێرش, هەڵۆ, وەهەموو ئەو ناوانەی کەمانای شەڕو خراپەیان تێدایە وەکو: رێگر, ئەمانە ناوی ناشەرعین‌و پەسەند نین. وەمُرَّة واتە: تاڵ, وەکو لەکوردەواریی خۆماندا منداڵی وا بووە ناوی (محمد) بووە کەچی پێیان گوتووە (حەمەتاڵ)! محەمەدیان کردووە بەحەمە, ئەمە بۆ خۆی ناپەسەندە, (تاڵ)یشیان بۆ زیادکردووە کەناوێکی ناشیرین‌و ناڕەوایە!

بەکورتی: چاکترین ناو دوای عَبْدُالله وعَبْدُالرَّحمن‌و ناوی پیرۆزو بەڕێزی پێغەمبەران(عَلَیْهِمُ السَّلام)" ئەو ناوەیە کەمانای ئاسوودەیی‌و گەشبینی‌و خۆشی‌و خۆشەویستی لەناوەکەدا هەبێت, هەروەها چاك وایە ناو" پیتەکانی کەم بێت, لەسەر زمان سانا بێت, هەروەها چاك وایە لەدەربڕینـدا ئاسان بێت, خێرا ببیسترێت‌و ناوێکی قورس‌و غەریب نەبێت.

خۆشەویستان: ئەگەر کەسێك لەمنداڵیدا ناوێکی ناخۆشی لێنرابێ ئەوا ئێستا کەخۆی گەورە بووە" یان دایكو باوکی لەو ناوە ناخۆشەی پەشیمانن, ئەوە دروستەو بەڵکو سوننەتیشە کەئەو ناوە ناخۆشە بگۆڕدرێ بەناوێکی خۆش, لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" زۆر ناوی ناخۆشی گۆڕیوە, بۆ نموونە: کچێك منداڵ بوو, ناوی عاصیە بوو, بەکوردی واتە یاخیو تاوانبار, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناوینا جەمیلە, واتە جوان!

ترمذی لەخاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هێناویەتی کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناوی ناشیرینی دەگۆڕی. جارێکیان کوڕێکیان هێنایە خزمەتی ناوی (إِصْرَم) بوو, بەکوردی واتە ڕێگر, وەکو زۆر منداڵ لەکوردەواری خۆماندا ناونراوە ڕێگر! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناوەکەی گۆڕی بە (زُرْعَة) کە بەمانای گەشەکردنو یارمەتیدان دێت, بەکوردی یانی (هاوکار), واتە حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناوی ڕێگری گۆڕی بۆ هاوکار. کەسێکی تر ناوی (حَرْبْ) بوو, واتە شەڕانی, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ناوەکەی گۆڕی بۆ (سَلیم) واتە ئاشتی.

بەڵێ ئازیزان: لەمەوە تێدەگەین کەئەگەر ئەمڕۆ بوایە" پێغەمبەر ناوی جەنگیزو جەنگیو هەڵۆو هێرشو ئەو ناوانەی کەمانای شەڕیان تێدایە" دەیگۆڕین بەهێمنو ئاشتیو ئاسوودەو ئەو ناوانەی کەمانای سەلامەتیو ئاشتی دەگەیەن. کەواتە: هەرناوێك بەدبینیو دڵتەنگیو بێئومێدی لێ بخوێندرێتەوە" لەئاینی ئیسلامدا ناوێکی ناپەسەندە وەکو: پەشێو, بێخەو, بێچارە, هەژار, مەغدور, بێبەش..

ئیماندارانی بەڕێز: شەیتان کەدوژمنی هەرە گەورەو ئاشکرای ئەم مرۆڤەیە, تەنانەت لەکاتی ناونانی منداڵیشدا واز لەئینسان ناهێنێ, بەڵکو دەیەوێت ناوێکی ناشەرعی لەمنداڵەکەت بنێیت, وەکو ئیمامی تورمذی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە(سَمُرَة بن جُنْدُب)ـەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لَمَّا حَمَلَتْ حَوَّاء ـ عَلَيْهَا السَّلام ـ طافَ بِها إِبْليسُ, وكَانَ لا يَعيشُ لَها وَلَدٌ, فَقالَ: سَمِّيهِ عَبْدُالْحارِث فَإِنَّهُ يَعيشُ, فَسَمَّتْهُ فَعاشَ, وكانَ ذلكَ مِنْ وَحْيِ الشَّيْطانِ وَأَمْرِهِ), واتە: کاتێك حەوا سکی هەبوو, شەیتان بەدەوریدا سوڕایەوە, دایە حەوا کوڕی بۆ

ئەدەما، هەموو دەمردن، شەیتان پێی گوت: ئەمجارە ئەم سکەت کە لەدایکبوو" ئەگەر کوڕ بوو ناوی بنێ (عَبْدُالْحارِثْ) ئەوا ئەگەر وای ناو بنێی منداڵەکەت دەژی‌و نامرێ، دایە حەواش کەمنداڵەکەی بوو کوڕ بوو، ناوی نا (عَبْدُالْحارِثْ)، منداڵەکە ژیاو نەمرد، پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلَّم فەرمووی: ئەوەش لەنیگاو سروشتی شەیتان‌و فەرمانەکانیەتی، (چونکە دروست نیە ووشەی عَبْدْ جگە لەناوەکانی خوا" پاڵ بدرێتە لای هیچ ناوێکی تر). (عَبْدُالْحارِثْ) واتە بەندەی جوتیار، ئەوەش ناوێکی ناشەرعییەو شەیتانیش هەموو هەوڵ‌وتەقەلای بۆ ئەوەیە ئینسان تووشی کارێك بکات کەناشەرعی بێ، تەنانەت ئەگەر ناونانی منداڵەکەت ناشەرعی بێت، ئەو هەر پێی خۆشە.

وەلەم فەرموودەیەوە ئەوەش وەردەگیرێ کە لەکوردەواریدا" زۆر ماڵ هەیە دەڵێن: ئێمە فلان ناومان پێوە نایەت، یان فلان ناومان بۆ ڕاناگیرێ، لەبەر ئەوەی تاقیمان کردۆتەوە، هەر منداڵێکمان بەو ناوە ناو نابێ مردوەو بۆمان ناژی ئەمەش هەروەکو ئەوەی دایکە حەوامان، هەر لەنیگاو سروشتی شەیتان‌و فەرمانەکانیەتی‌و ناوی منداڵ پەیوەندی بەژیان‌و مردنەوە نیە.

موسڵمانان: دڵنیابن ئەو ناوانە بەسەر ناچن‌و بێ‌نرخ نابن کەئاینی ئیسلام پێیان ڕازییە، بەڵام ئەو کەسانەی کەناوی منداڵەکانیان بەناوی سەرکردە زاڵمەکانەوە دەکەن‌و ناوی بێ‌دین‌و مولحیدەکان لەمنداڵەکانیان دەنێن، ئەوا ڕۆژێك دێ ئەو منداڵانە بەو ناوانەوە گرفتار دەبن‌و ناچار دەبن ناوەکانی خۆیان بگۆڕن، بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەم قسەیەشمان ئەوەتا (500) هاوڵاتی میصری لەساڵی (2004)دا کەناویان (صَدّام) بووە، داواکارییان پێشکەشی دادگاکانی میصر کردووە بۆ گۆڕینی ناوەکانیان ئەم داواکارییانە هاوزەمانە لەگەڵ ئەو ڕێنمایی یە نهێنییانەی کە ئاڕاستەی نووسینگەکانی تۆمارکردنی لەدایکبوون کراوە بۆ ڕێگرتن لەبەکارهێنانی ناوی صَدّام بۆ منداڵانی تازە لەدایك بوو.

هەروەها هەر لەوڵاتی میصر" لەو هەڵمەتی ناو گۆڕینەدا (12) هەزار کەسی تر ناوی خۆیان گۆڕی کە(5) هەزار کەسیان ناوی ناڕێکی وەك (بەعرور، حەنەش، حیمار)یان هەڵگرتبوو. هەروەها ژمارەیەکی زۆریش لەو ناوە گۆڕاوانە ناویان (هیتلەر) بووە، بەڵام ئەو ناوانەی کەئیسلام پێیان ڕازییە، چۆن لەسەرتاوە کەدایك‌و باوك ئەو

ناوەیان لەمنداڵەکەیان ناوە, جێگای شانازییان بووەو ناوێکی هەڵبژاردە بووە" هەتا ڕۆژی قیامەتیش ئەو ناوانە هەرگیز کۆن نابن, هەر بۆ نموونە: ناوی بەرزو بەڕێزی (مُحَمَّدْ)" هەرگیز کۆن بوون بەخۆیەوە نابینێتو ساڵ دوای ساڵ" ئەو ناوە پیرۆزە ژمارەی ڕوو لەزیادبوونە, ئەوەتا لەساڵی (2003)دا" لەهەموو جیهاندا (65) ملیۆن کەس ناوی محمدە, هەموویشی شانازی بەناوەکەیەوە دەکات!

ئەوەی کە لەباسی ناونانی منداڵدا ماوە بیڵێین ئەوەیە کە: بەڕاستی جێگای داخە, خێزانی موسڵمان ناوی منداڵەکانی بەناوی خوانەناسانەوە ناو بنێ, لەکاتێکدا خوانەناسێك منداڵی خۆی بەناوی موسڵمانانە ناو نانێت!

ئیمانداران: یەکێکی تر لەو شتانەی کە لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی منداڵدا پێویستە بۆی بکرێ (العَقيقَة)یە, بەکوردی واتە حەوتم, یان: هۆزەبانەی منداڵ, کەحەوتم لەوەوە هاتووە کەئەو ئاژەڵەیە کە لەڕۆژی حەوتەمینی لەدایکبوونی منداڵەکەدا سەردەبڕدرێ تا ببێتە ئاشکراکردنی دڵخۆش بوون بەو بەخششەی کەخوای گەورە پێشکەشی کردوون کەئەو منداڵە چاوگەشەیە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (كُلُّ غُلامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سابِعِهِ ويُحْلَقُ ويُسَمَّى), واتە: گشت منداڵێك بەبارمتەی حەوتمەکەی دانراوە کە لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیدا بۆی سەردەبڕدرێ. واتە ئەگەر حەوتمی بۆ نەکرێ (ئەمجا ئەو منداڵە بەمنداڵی بمرێ) ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت بۆ دایكو باوکی ناکات! (ئەگەر توانایان هەبێو بەئەنقەست حەوتمەکەی بۆ نەکەن!). هەروەها فەرمووی: لەڕۆژی حەوتمدا" منداڵ سەری دەتاشرێو ناوی لێدەنرێ.

بەڕێزان: لەبەر گرنگیو گەورەیی حەوتمە کەسەلەفی صالح فەرموویانە:

ئەگەر کەسێك پارەی نەبوو کەحەیوانێکی پێ بکڕێو بۆ حەوتمی منداڵ سەری ببڕێ, ئەوا با لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی منداڵەکەیدا" ئەگەر هیچی دەست نەکەوت, با چۆلەکەیەك سەرببڕێ! لەو بارەیەوە" ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەکتێبی (المُوَطَّأ)دا, بەسەنەدی خۆی لەمحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی حارثیی تەمیمی دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: گوێم لەباوکم بووە دەیگوت: حەوتم چاکە بکرێت

ئەگەر بەچۆلەکەیەکیش بێت ..

لێرەدا مەرج نیە کەنەتبوو حەیوان بکڕی" بچی چۆلەکەیەك سەر ببڕی, بەڵکو بچۆ کیلۆیەك گۆشت بکڕەو بایی ئەوەندە نان حازر بکەو یەك دوو دراوسێ بانگ بکەو منداڵەکە ناو بنێو ناوی حەوتمی لێبێنە, با ئەو موناسەبەتە بەبەلاش نەڕوات..

ئیمانداران: ئەگەر بەخێوکەری منداڵەکە لەو حەوت ڕۆژەدا نەداربوو, تا ماوەی زۆرترینی ماوەی زەیستانییش ڕۆیشت ئەو هەر دەستکورتو هەژار بوو, ئەو کاتە حەوتمەکەی لەسەر لادەچێو دەتوانێ نەیکا, بەلام ئەگەر لەحەوت ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵەکەوە" یان پێش تەواوبوونی زۆرترینی ماوەی زەیستانی توانای حەوتمی پەیدا بوو, ئەو کاتە سونەتەکەی لەسەر جێگیر دەبێو سونەتە کەحەوتم بکا, چونکە تا منداڵەکە بلوغی دەبێ" کاتی حەوتمەکەی بۆ بەخێوکەرەکەی هەر دەمێنێ, واتە: هەرکاتێك منداڵەکە بلوغی بوو, ئەوا سونەتەکە لەسەر بەخێوکەرەکەی لا دەچێو دەکەوێتە سەر منداڵەکە خۆی, کەواتە: ئەگەر منداڵەکە بلوغی بوو, حەوتمیشی بۆ نەکرابوو, ئەو کاتە سونەتە کەبۆخۆی حەوتم بۆ خۆی بکا. هەروەها ئەگەر دەگونجا حەوتمەکەی بۆ بکرێ, بەلام منداڵەکە پێش ڕۆژی حەوتەم مرد, یان لەدوای ڕۆژی حەوتەم" پێش بلوغ بوون مرد, ئەو کاتەش هەر سونەتە حەوتمی بۆ بکرێ.

وەبزانن: ئەو حەیوانەی کەدروستە بکرێتە حەوتم, لەتەمەنو سیفاتەکانیدا وەکو حەیوانی قوربانیی وایە, وەسونەتە ڕانی ڕاستەی حەیوانی حەوتمەکە بەتەواوی بدرێتە مامانەکە, چونکە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ئاوا فەرمانی بەفاطمة کرد. وە مەرجە لەکاتی سەربڕینی حەیوانەکەدا, نیەتی حەوتمەکە بێنێ. کەوابوو, ئەو کەسەی حەیوانی حەوتمەکە سەردەبڕێ" بابلێ (بِسْمِ اللهِ, وَاللهُ أكْبَرْ, اللّهُمَّ لَكَ وَإلَيْكَ, اللّهُمَّ هذِهِ عَقيقَةُ فُلانٍ)(رَواهُ البَيْهَقي بِإسْنادٍ حَسَنٍ), واتە: بلێ, بِسْمِ اللهِ, وَاللهُ أكْبَرْ, خوایە ئەمە حەوتمی فلان منداڵەیە, ناوی منداڵەکە بێنێ.

موسڵمانانی خۆشەویست: هەر لەو سونەتانەی لەڕۆژی حەوتمی لەدایکبوونی منداڵدا پێویستە بۆی بکرێ ئەوەیە: لەڕۆژی حەوتمی لەدایکبوونیدا, دوای سەربڕینی حەیوانی حەوتمەکە, هەموو سەری منداڵەکە بتاشرێ, جا لەم سونەتەشدا جیاوازی کوڕو

کچ نیە, ئینجا سونەتە بەقەد گرانایی مووە تاشراوەکە زێڕ یاخود زیو بکرێتە خێر, ئەوەی دەوڵەمەندە زێڕو, ئەوش کەهەژارە زیو, چونکە (فاطمـة)" کاتێ (حُسَیْن)ی بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پێی فەرموو (يا فاطِمَةُ, أحْلقي رَأْسَهُ وَتَصَدَّقي بِزِنَةِ شَعْرِهِ فِضَّةً), واتە: ئەی فاطمَة, سەری بتاشەو هێندەی کێشی قژی" زیوو بکە بەخێر.

ئەم سەرتاشینەش لەلایەنی تەندروستییەوە سوودی بۆ مووی سەری منداڵەکە زۆرەو یارمەتییەکی باشیشە بۆ هەژاران" کەباوکو دایکی کۆرپەی تازە لەدایکبوو" وەکو شوکرانەبژێری دەیدەن بەهەژارو داماوان.

خۆشەویستان: مافێکیتری منداڵ لەسەرەتای لەدایك بوونیەوە ئەوەیە: ئەو منداڵە لەشیری دایکی بێبەش نەکرێت, خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾( البقرة 233 ), واتە: دایکان با شیر بدەن بەمنداڵەکانیان بۆ هەرکەس کەدەیەوێت شیری تەواو بدات .

ئێستا هەموو دونیا, تەنانەت رێکخراوی تەندروستیی جیهانییش" بانگەشە بۆ ئەوەدەکات کەدەبێت شیری دایك بەمندالان بدرێت. دەرکەوتووە کەشیری دایك" ڕۆژانە بەگوێرەی تەمەنی ئەو منداڵە دەگۆڕێ, وەمادەیەکە هەرسی ئاسانە, وەزۆر پاکژە, هەروەها پلەی گەرمییەکەی بەو شێوەیە کەبۆ منالەکە پێویستە لەهاوینو لەزستاندا (لەزستانانددا شیری دایك گەرم دەبێت بۆ ئەوەی ناوسکی منداڵەکە گەرم بکاتەوە, لەهاوینانیشدا ساردو فێنك دەبێت بۆئەوەی منداڵەکە لەتینوایەتی پارێزراو بێو ناوسکی فێنك بێ!). هەروەها لەشیری دایکدا (ئەنتی بایەتیك)و کۆمەڵێك دژی تێدایە کەزۆر زۆر پێوستە بۆ ئەو منداڵەو بۆ دواڕۆژیشی کەبەرگری لەنەخۆشی بگرێت, لەساڵی (1991 ـ 1992)دا, مامۆستایەکی زانکۆ لەمیصر, نامەی دکتۆرای هێنایەوە لەسەر ئەوەی دەزگای بەرگری (المَناعَة) لەئینساندا لەدوو ساڵیدا تەواو دەبێت, منداڵ دەزگای بەرگرییەکەی گەشەدەکات تا تەمەنی دوو ساڵی, پاشان کۆتایی دێت, قورئانیش دەفەرموێت: ﴿ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ﴾" دایك دەبێت دوو ساڵ شیر بەکۆرپەکەی بدات, ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾ بۆ ئەوەی شیردانەکە تەواو ببێت لەگەڵ تەواوی دەزگای بەرگری لەشدا. سەبارەت بەدایکەکەش کەشیری خۆی دەدات بەمنداڵەکەی, ئەویش ئەم

سوودانەی پێدەگات: هۆرمۆناتی تایبەت دروست دەبێت بۆ ئەوەی منداڵدانی بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی, چونکە ئەو منداڵدانە" نۆ مانگ کشاوەو نۆ مانگە ئەو ماسولکانەی هیلاکن, جا بەهۆی شیردانەوە یارمەتی دەدات کەڕەحمی (منداڵدانی) بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی, جگە لەوەی کەئافرەت ئەگەر بەڕێکوپێکی شیری دا بەکۆرپەکەی ئەوا (حَیْض) خوێنی بێنوێژیی دەوەستێت و ڕێکخستنی وەچەو نەوەکانیش فەراهەم دێت (واتە: ئەو ئافرەتەی کەشیری مەمکی خۆی دەدات بەمنداڵەکەی" سووڕی خوێنی مانگانەی ڕێکوپێك دەبێ و ئافرەت, تا شیر بدات جارێکی تر حامیلە نابێتەوە, بەمەش ماوەی باش لەنێوان بوونی دوو منالدا دەبێت) هەروەها بەهۆی شیردانەوە" جۆرە هۆگری و خۆشەویستی و سۆزێکی تایبەت دروست دەبێت لەنێوان دایك و منداڵەکەدا, هەروەها بۆ پزیشکەکان دەرکەوتووە, کەوانی دەمو کاکیلەی ئەو منداڵەی شیری دایکی دەخوات, ددانەکانی زۆر زۆر ڕێکوپێك و ئاساییە, بەلام ئەو منداڵەی فێری مەمکەمژە بووە, کەوانی دەمی و ددانەکانی ناشیرین و باریك دەردەچێت.

هەر لەسوودەکانی شیردانی دایك بەمنداڵ سەبارەت بەدایکەکە, کەناڵی (CNN) سەرژمێرییەکی نیشاندا کە بەشێوەیەکی گشتی" ڕۆژانە لەجیهاندا (500) ئافرەت بەهۆی شێرپەنجەی مەمکەوە دەمرێت, هەرچەندە هەندێ لەپزیشکەکان هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ (بۆماوەیی - ویراثي) بەلام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کەئافرەت شیری خۆی بۆ ماوی ساڵ و نیو کەمتر بەمنداڵ نەدات, ئەوە ئەگەری شێرپەنجەی مەمك زۆر زۆر کەمە, چونکە زۆربەی ئافرەتانی یابانی لە (18) مانگەوە بۆ (24) مانگ" شیری مەمکی خۆیان بەمنداڵەکانیان دەدەن..

فوقەهاو شەرع زانەکانی ئیسلام, ماوەی نێوان ساڵ و نیو تا دوو ساڵ دادەنێن بەباشترین ماوەی شیردان بەمنداڵ, بەڵێ ئەمڕۆ زانست گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کەمنداڵ" نابێت پێش تەمەنی ساڵ و نیو لەشیر ببڕدرێتەوە, بەلام ئەمەش مانای ئەوە نییە هەر تەنها شیری بداتێ و بەس, بەڵکو کەتەمەنی منداڵ چووە پێنج مانگەوە ئیتر دایك دەتوانێ شتی تری بداتێ, بەلام لەشیری خۆی نەبڕێتەوە.

دکتۆرەیەکی فەرەنسی" دوای ئەوەی دیراسەیەکی قووڵی قورئانی کرد" بەتایبەت ئەو ئایەتانەی کەباسی خوێنی حەیزو ماوەی شیردانی دایك بەمنداڵ دەکەن و, بەزمانی خۆی تێیان گەیشت" گوتی: (ئینسانێك طب نسائی نەخوێندووەو زانستی تەشریحی نەخوێندووەو, هەزارو چوارسەد ساڵیش لەمەوبەر" قسەی لەمجۆرە بکات ئەمە قسەی ئەو ئینسانە نیە, ئەمە ووتەی خالیقی ئینسانە. کەواتە, ئەو ئینسانە کەمحمدە" نوێنەری ئەو خالیقەیە, بۆیە بەقەناعەتەوە دەڵێم: أَشْهَدُ أن لا إِلهَ إِلاّ الله, وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله)و ئیمانی هێناو موسڵمان بوو!

بەرێزان: بەداخەوە دەردی چاولێکەری و شوێنکەوتنی کوێرانەی ئەملاولا" زەرەرێکی کوشندەی لەهەموو بوارێکدا لەموسڵمانان داوە. ئەوەتا لەبواری شیردان بەمنداڵ" زۆربەی دایکان" زۆر کات بێ هیچ هۆیەك شیری خۆی لەمنداڵەکەی قەدەغە دەکات و وەکو چاولێکەری یان بۆ ئەوەی پێی بڵێن پێشکەوتووەو لادێیی نیە (!!) شیری قوتوو بەمنداڵەکەی دەدات!

بەڵام بابزانین ئایا لەڕوانگەی زانستەوە" جیاوازیی نێوان شیری قوتوو و شیری مەمکی دایك چی یە بۆ ژیان و تەندروستیی کۆرپە؟!

سەرچاوەیەکی بزیشکی منداڵان (طبِّ الأطفال) هەیە کەدانراوی دکتۆری بەناوبانگ" پرۆفیسۆر بۆچ نیلسنە, ئەم پرۆفیسۆرە لەو کتێبەیدا باسی پەیوەندیی نێوان شیری قوتوو لەلایەك و تووشبوون بەنەخۆشیی شەکرە دەکات لەلایەکی ترەوەو دەڵێ: شیری قوتوو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەدوارۆژدا بەنەخۆشیی شەکرەوە! لەدیراسەیەکی تردا کە لەسەر منداڵانی سویدو دانیمارك و نەرویج کراوە" دەڵێن: شیری دایك" خانەکانی بێتا دەپارێزێ, ئەو خانانە ئەوانەن کەئەنسۆلین لەناو پەنکریاسدا دروست دەکەن! بەڵام لەدیراسەیەکیتردا دەرکەوتووە کەئەو پرۆتینەی لەشیری قوتوودایە" زیان بەخانەکانی بێتا دەگەیەنێ و ئەنسۆلین زۆر کەم دروست دەبێ و ڕێژەی شەکر لەناو خوێنی ئەو منداڵەدا زۆر کۆدەبێتەوەو لەگەورەییدا تووشی نەخۆشیی شەکرە دەبێت!

لەدیراسەیەکی تردا" دکتۆر مُجاهد محمد أبو المَجد کەپسپۆڕی نەخۆشییەکانی شەکرەیەو, سەرۆکی تیمێکی زانستیی بوو لەزانکۆی المنصورة لەمیصر, ساڵی (1995) بۆی دەرکەوت کەئەو منداڵانەی کەشیری دایکیان ناخۆن بەڵکو شیری قوتوو دەخۆن, لەسیرەمی خوێنیاندا (ئەنتی بۆدی) هەیە بەرامبەر ئەو پرۆتینە حەیوانی یە. بەڵام ئەو منداڵانەی کەشیری دایکیان دەخۆن ئەو (ئەنتی بۆدی)یەیان نیە. لەهەمان کاتیشدا, کەدوو ساڵ تەواو دەکەن بەردەوام دەبن لەسەر ئەو شیری قوتووە, ئەو (ئەنتی بۆدی)یە نامێنێ.. ئێستا با پرسیارێ بکەین: بۆچی ئەو (ئەنتی بۆدی)یە نامێنێت؟ بۆچی شیری قوتوو زەرەر لەمنداڵ دەدات پێش ئەوەی دوو ساڵ تەواو بکات" بەڵام دوای دوو ساڵەکە سوودی لێوەردەگرێت؟! ئەمە پرسیارێکی زۆر گرنگە, چەندین لێکۆڵینەوە هەیە کە لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە لەسەر ئەم بابەتە بڵاوکراوەتەوە, بۆ نموونە: گۆڤاری (تۆتۆ ئینپۆمیتی) کەدیراسەتێکی ئێرلەندییە, لەژمارە (3)ی ساڵی (1994)دا ئەوەی سەلماندووە کەدیواری ناوەوەی ڕیخۆڵە" ناتوانێت ئەو پرۆتینە حەیوانییە بشکێنێت, واتە ئەو پرۆتینە حەیوانییە" لەناو ڕیخۆڵەکاندا بێ ئەوەی بشکێنرێت" بێ ئەوەی (ئەمینۆئەسید) لەناو ڕیخۆڵەکەدا هەڵدەمژرێ و دەڕواتە ناو خوێنەوە. بەڵام کەتەمەنی منداڵ دوو ساڵی تەواوکرد" ئەوا هەرجۆرە شیرێکی قوتوو بخوات لەڕیخۆڵەکانیدا دەشکێنرێت و لەش سوودی لێدەبینێ.

کەواتە منداڵ هەتا شیری قوتوو نەخوات و شیری دایکی بخوات دوورترە لەنەخۆشیی شەکرە, وەلەم لێکۆڵینەوە زانستییانەدا ئیعجازی عیلمیی ئایەتی (حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ) دەردەکەوێ! کەواتە ئەو دایکەی بەبێ هۆ شیری خۆی ناداتە منداڵەکەی, ئەوا بابزانێ مافێکی گەورەی جگەرگۆشەکەی خۆی پێشێلکردووەو زەرەرێکی گەورەی لەدوارۆژی منداڵەکەی داوە, بۆیە خوای دادگەر تۆڵە لەو دایکانە دەکاتەوەو بەئاگری دۆزەخ دەیانسووتێنێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فەرموویەتی: لەمیعراجدا بینیم" کۆمەڵە ئافرەتێك مار مەمکی دەمژێن و مارەکە بەمەمکیەوە دەدان, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم دەفەرموێ: پرسیم ئەوە بۆچی وا سزا دەدرێن؟! گوتیان: ئەوە ئەو ئافرەتانەن کە لەدنیادا شیری مەمکی خۆیان بەمنداڵەکانیان نەدەدا!

موسلمانانی بەڕێز: ئاینی ئیسلام بەپێویستی داناوە کەدایك لەماوەی دوو ساڵی شیر پێدان و دواتریشدا بەردەوام بەلای منداڵەکەیەوە بێ، وەهەموو پێویستی یەکانی خۆیو منداڵەکەی لەلایەن هاوسەرەکەیەوە بەپێی توانا بۆ دابین بکرێ، بۆ ئەوەی سۆزو خۆشەویستیی نێوان دایكو ئەولاد" کەبەهێزترین سۆزو خۆشەویستییە" هەر زیادو بەردەوام بێ.

بەڕێزان: لەگەڵ ئەو هەموو سۆزو خۆشەویستیەی نێوان دایكو منداڵەکەی، بەڵام ئەگەر ترسی خوا لەدڵدا نەما، ئەوا ڕەحموبەزەیی و ویژدانی بەرامبەر جگەرگۆشەکتەی خۆشی نامێنێ.

ئیمامی ئەحمدو بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: جارێکیان دوو ئافرەت، کەهەر یەکەیان کوڕێکی کۆرپەی تازە لەدایکبووی لەباوەشدا بوو" منداڵەکانیان داناو بۆ دارو چیلکە کۆکردنەوە دوورکەوتنەوە، گورگ هاتو منداڵێکیانی برد، کاتێ ئافرەتەکان هاتنەوە تەماشایان کرد منداڵێکیان نەماوە، هەردووکیان پەلاماری منداڵە ماوەکەیان داو بوو بەمشتومڕیانو هەریەکەیان دەیویست بیکا بەمنداڵی خۆی. بۆ چارەسەری کێشەکەیان چوون بۆ لای حەزرەتی داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)و باسەکەیان بۆ گێڕایەوەو ئەویش فەرمووی: کامتان تەمەنتان گەورەترە؟ یەکێکیان کە لەتەمەندا گەورەتر بوو گوتی: قوربان من تەمەنم لەو زیاترە. حەزرەتی داود فەرمووی: کوڕەکە هی تۆیەو بیبە لەگەڵ خۆت. دوای ئەوەی چوونە دەرەوە، حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) کەکوڕی حەزرەتی داودە، تووشی ئافرەتەکان بوو، ئەوانیش باسی خۆیانو حوکمەکەی حەزرەتی داودیان بۆ گێڕایەوە، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: بەڵام من ڕەئیەکی ترم هەیە، وەرن منداڵەکە دابنێن چەقۆیەکی گەورەو تیژم بۆ بێنن لەنێوانتاندا لەتی دەکەم باهیچ کامتان مەغدور نەبن، لەو کاتەدا ژنە تەمەن بچووکەکە هاواری کردو گوتی: ئەی سولەیمان، ڕەحمەتی خوات لێبێت، خوا ڕەحمەت پێ بکا، ئەو منداڵە کوڕی ئەو ژنە تەمەن گەورەیەیەو هی من نیە، تکادەکەم لەتی مەکە با بۆ ئەو بێ! ئەمجا حەزرەتی سولەیمان بەژنە گەورەکەی گوت: ئەی تۆ دەڵێی چی؟ گوتی: قوربان لەتی بکەو هەریەکەمان لەتی خۆی

ـ میه! حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: دە ئێستا بۆم دەرکەوت کەئەم منداڵە" منداڵی
ـستەقینەی ژنە تەمەن بچووکەکەیە کە لەتاوی منداڵەکەی کەنەکوژرێ ئامادەبوو دەستی
ێ هەڵگرێ! بۆیە منداڵەکەی دایەوە بەژنە تەمەن بچووکەکە!

جا لەم چیرۆکەدا کەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بۆی باسکردین ئەوەمان بۆ
ـمردەکەوێ کەئافرەتە تەمەن گەورەکەیان چەند دڵرەق بوو، کەگورگ منداڵەکەی بردبوو،
بەڵام هیچ غەمباریی پێوە دیار نەبوو، بەڵکو دڵرەقی یەکی وای نواند کەئینسان سەرسام
ـدەکات، ئەوەبوو پەنای بردە بەر دزینی کوڕی ئافرەتەکەی هاوەڵی، چونکە ڕێی
تێناچێت کەهەردووکیان بەتەواوەتی هاوشێوەی یەکدی بووبن، هەروەها ماقووڵ نیە
کەدایك کوڕی خۆی لەنێوان دوو منداڵدا بۆ جیا نەکرێتەوە. ئەو فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر
دڵرەقیی دایکە گەورەکەو بەزەیی دڵی ئافرەتە تەمەن بچووکەکەیان.

ئیمانداران: ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەربارەی دڵرەقیی دایکی
خوانەناس بۆی گێڕاینەوە، لەزەمانی حەزرەتی داودو سولەیماندا (سەلامی خوایان لێبێت)
رووی داوە، بەڵام مێژوو دەیان ڕووداوی تری لەو شێوەیەی بۆ تۆمارکردووین، بۆ نمونە:
ڕۆژنامەی فارسی (زن روز) لەژمارە: (1848)یدا دەڵێ: ژنێکی تەمەن (21) ساڵە
لەلەندەن بەهۆی کوشتنی منداڵەکەیەوە سزادرا، ئەوەبوو ئەم ژنە تەنها یەك منداڵی کچی
تەمەن (14) مانگی هەبوو، ئەم منداڵە زۆر گریا، تا دایکەکە لێی بێزاربوو، بۆیە
منداڵەکەی هەڵگرتو بردی خستیە ناو قەفەزی (مشكو جرجە گەورەکانەوە) کەوەك
ئاژەڵی ماڵی ڕادەگیران! جرجو مشکەکانیش کەکاتێکی زۆربوو هیچیان نەخواردبوو، لەم
خۆراکە زیندوە هیچ چاوپۆشی یەکیان نەکرد، دەستیان کرد بەگاز لێگرتنی منداڵەکەو
سەرەنجام منداڵەکە مرد، پاشان ژنەکە (دایکی منداڵەکە) بۆ خۆ ڕزگارکردن" لەمەحکەمە
کەلێیان پرسی چۆن دڵت هات ئەو منداڵە بێتاوانە ئاوا بەزەلیلی بکوژی، گوتی: چی
بکەم، منداڵەکەمم خۆش نەدەویست!

بەڵێ خۆشەویستان: دەتوانین بڵێین هەروەکو لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ
کردووە، یەکێ لەمافە زۆر گەورەکانی منداڵ لەسەر باوكو دایك ئەوەیە کەباوك
ژنێکی دیندارو خواناس بێنێ، چونکە ئەگەر ترسی خوای لەدڵدا نەبوو، سەرەنجام ئەگەر

بەشێکە دایک ئەوا دایکێکی بێڕەحمو بێ ئارام دەبێو صەبر لەسەر نارەحەتیەکانی منداڵ بەخێوکردن ناگرێو سەرەنجام منداڵەکەشو خێزانەکەش بەدبەخت دەکات!
هەروەها پێویستە کچیش" کوڕێکی خواناسو هێمنو لەسەرخۆ هەڵبژێرێ بۆئەوەی ژیانی هاوسەری لەگەڵ دروست بکات, بۆئەوەی لەدواڕۆژدا باوکی منداڵەکانی پیاوێکی دڵنەرمو هێمنو سالار بێ.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم کەوەصفی ئافرەتی مەدینەی کرد بۆ باشییان" فەرمووی: یەکێ لەڕەوشتە چاکەکانی ژنانی مەدینەیی ئەوەیە کەکاتێ منداڵی بەرمەمکانەیان هەیە زۆریان خۆشدەوێتو زۆر ئاگایان لەخۆیانە!

کەواتە با دایکانی موسڵمان بزانن, ئەگەر دەیانەوێ چاکترین ئافرەت بن لای خواو پێغەمبەری خوا, با بۆ منداڵی ساوای خۆیان بەخزمەت بنو چەندی لەتوانایاندایە خزمەتی منداڵو مێردی خۆیان بکەن, نەك وەکو هەندێ دایك کەئەگەر منداڵەکەی تۆزێك زیاد بگری تەحەمولی ناکاو دوعای شەڕی لێدەکاو ناشکوری پێ دەکاو وازی لێدێنێو ناچێ بەلایدا!

بەڕێزان: لایەنێکی تەندروستی هەیە کەدەبێ باوکانو دایکان فەرامۆشی نەکەن بەتایبەت بۆ ئەو منداڵانەی کە لەدوو ساڵ گەورەترن, ئەویش گرنگیدانە بە(ئاوخواردنەوەی منالّ), کەوەکو پزیشکەکان دەڵێن لەوەرزی گەرمادا" پێویستە رۆژی (8) پەرداخ ئاو بدرێت بەمنداڵ. وەئێستا لەزۆر ووڵاتی دنیادا (بۆ نموونە بەریطانیا), پرۆسەی تایبەت هەیە لەخوێندگاکاندا کەهانی خوێندکارانی سەرەتاییو باخچەکانی ساوایان دەدات کەزۆر ئاو بخۆنەوە, لەبەر ئەوەی زۆر خواردنەوەی ئاو" ئەم سوودانەی هەیە:

1 ـ خواردنەوەی ئاوی پاك, بیرکردنەوەی منداڵ بەهێز دەکات. دکتۆرەکان دەڵێن: کردەوەکانی مێشك وەکو بیرکردنەوەو سەرنجدانو ئاگادارکردنەوە, چەند پیشەیەکی دەماریو کیمیایی یە کە بەبێ ئاو ناتوانن کاربکەن, هەر بۆیە ئەو منداڵانەی کەبڕێکی پێویست ئاو ناخۆنەوە تووشی نەخۆشی (وشکبوونەوە) دەبنو مێشکیان لەڕووی وەرگرتنی زانیاری" لاواز دەبێتو توانای فێربوونیان باش نابێت.

2 ـ ئەو منداڵانەی کە لەتەمەنی دوای شیربڕانەوەوە" بڕی پێویستی لەش ئاو ناخۆنەوە، ئەوا ئـەو کـەم خواردنـەوەی ئـاوە دەبێتـە هـۆی لاوازبـوونی یاسـای ئەنزیمـە گرنگـەکانو لەدواڕۆژدا ئەو منداڵە کەگەورەبوو" تووشی نەخۆشیی گورچیلەو فشاری خوێن دەبێت.

کۆتایی ئەم ووتارەش بەباسکردنی مافێکی تری منداڵ دێنم کەئەویش ئەوەیە: کەهەر لەڕۆژی لەدایکبوونیەوە حوکمەت مووچەی بۆ دابین بکات، وەهەموو سەری مانگێ لەکاتی خۆیدا، ئەو مووچەیە بدرێ بەدایکو باوکی منداڵەکـە، ئـەم قانوونـە بەنرخـەش خەلیفـەی موسـڵمانان عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕەزای خـوای لێبێـت) بڕیـاری لەسـەردا، ئـەوەبو: شەوێکیان کۆمەڵێك بازرگان دەگەنە مەدینەو شەو لە (مُصَلّی) شـوێنی نوێـژی جەژنـەکان باردەخـەنو دەمێننـەوە، کەخەلیفـەی موسـڵمانان (حـەزرەتی عومـەر) ئەمـەی زانـی، بەعەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوفی فـەرموو: ئایـا ئامادەیـت ئەمـشەو مـنو تـۆ پێکـەوە پاسەوانیی ئەو بازرگانانە بکەین؟ چونکە ئەوان ماندوونو کەلوپەلی زۆریان پێیەو ئێمەش لێپرسراوی موسڵمانانین، دەبێ ماڵو سەریان بپارێزین، جا حەز دەکەم مـنو تـۆ ئەمـشەو حەرەسـیاتیان لێ بگـرین. عەبـدولڕەحمانیش (ڕەزای خـوای لێبێـت) ڕەزامەنـدی نوانـدو بەیەکـەوە بوونـە پاسـەوانو چـەندێ خـوا ویـستی لەسـەر بـوو "شـەونوێژیان کـرد. لـەو نیوەشەوەدا، خەلیفە گریانی منداڵێکی ساوای بەرگوێ کەوت، بەرەو گریانەکە کەوتـەڕێ، لەدوورەوە بانگی لەدایکی منداڵەکە کردو پێـی گـوت: لـەخوا بترسـەو لەگـەڵ منداڵەکەتـدا چاکبە. ئەمەی گوتو گەڕایەوە شوێنی خۆی، لەکۆتایی شەودا دیسان گریانی منداڵەکـەی بیستەوەو بەدایکەکەی گوت: داوەشـێی چ دایکێکـی خراپـی، بۆچـی ئەمـشەو منداڵەکـەت ئۆقرەی نەگرت؟ دە خەمێکی لێ بخۆ، بزانە ئازاری هەیە" جێگاکەی ناخۆشە" چی یەتی وا ناخەوێ ! سُبْحانَ اللە لەگەورەیی ئەم ئیـسلامە کەسـەرکردەی ئـاوا دروسـت دەکـات، کـە لـەباوکی ڕاسـتەقینە دڵـسۆزترە بـۆ منـداڵانی ڕەعیـەتو میللەتکـەی، چـونکە زۆر بـاوك بەدەنگی منداڵی خۆیشی قەڵسەو بەخێزانەکەی دەڵێ: خۆتو منداڵەکە بڕۆنـە دەرەوە بـا گوێم لەدەنگی نەبێو خەوەکـەم لێ تێـك نەچـێ. بـەڵام خەلیفـەی موسـڵمانان خـەمی منداڵەکەیـەتی کـەدەبێ بـەهۆی چی یەوە بگرێو خەوی لێ نەکەوێ!

بەڵێ خۆشەویستان: دایکی منداڵەکە (نەیدەزانی ئەوە ئیمامی عومەرە قسەی لەگەڵدا دەکات), گوتی: ئەی بەندەی خوا, ئەمشەو ئێمەت هەراسان کرد, ئەم منداڵە بۆیە ژێر نابێو هەر دەگری چونکە من لەشیرم بڕیوەتەوەو ئەویش داوای شیر دەکاتو شیر نەبێ بۆی ناخورێ! ئیمامی عومەر فەرمووی جا بۆچی لەشیری دەبڕیتەوە؟ ئافرەتەکە گوتی: چونکە هەتا لەشیر نەبڕێتەوە" عومەر کەخەلیفەی موسڵمانانە" مووچەو معاشی ناداتێ. ئیمامی عومەر فەرمووی: تەمەنی چەندە؟ ژنەکە گوتی: ئەوەندە مانگەیە. ئیمامی عومەر یەکسەر هەستی بەناتەواوییەك لەبڕیارەکانی خۆیدا کرد. گەڕایەوە بۆ مزگەوتو دەستی بەنوێژی بەیانی کرد, بەڵام بەشیوەنو گریانێکەوە کەکەس لەقورئانەکەی تێنەدەگەیشت. کەسەلامی دایەوە, بەخۆی گوت: ئای عومەر ڕەنجەڕۆ خۆت, دەبێ لەڕۆڵەی مسڵمانان کەپێش وەخت بەهۆی بڕیارە هەڵەکەی تۆوە لەشیر براونەتەوە, لەتاوی شیر چەند منداڵت کوشتبێ. ئەمجا هەرکە ڕۆژ بۆوە خێرا یاسای مووچە پێدانی گۆڕیو فەرمانی دا جارچی لەناو شاردا جاڕبدات کەوا منداڵەکانتان بەپەلە لەشیر مەبڕنەوەو دەوڵەت لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونی منداڵەوە مووچە بۆ منداڵ دەبڕێتەوە! ئەوەشی بەشێوەی فەرمانێك بۆ هەموو وڵاتو ناوچەکانی ئیسلام نووسی.

ئەمە نەخشەی منداڵپارێزی پیاوێکی بیابان نشینی پێش هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەرە, کە لەهیچ زانکۆیەکدا خوێندنی تەواو نەکردوە, بەگریانو هەنسك دانەوە نوێژی بەیانی بەجێدەهێنێ, بۆ ئەو حاڵەی عومەری تێکەوتوەو قوڕیەسەر بووە وا دەستی ناوەتە قوڕگی ڕۆڵەی موسڵمانانەوە.. لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین: کوان بەناو پارێزەرەکانی مافی مرۆڤو ژیانی منداڵان؟ سوپاس بۆ تۆ خوای پەروەردگار وا قورئانی پیرۆزت بەمرۆڤایەتی خەڵات کرد تا عومەری خواناس پەروەردە بکات.

بەڕێزان: لەم سەردەمەدا, بەم مووچەی منداڵانە دەڵێن: (عەلاوە), واتە زیادکردنی مووچەی فەرمانبەری میری کاتێك منداڵێکی لەدایك دەبێت, بەڵام ئیمامی عومەر مووچەی بۆ باوکی منداڵەکەو منداڵەکانی دەبڕییەوە ئەگەر چی فەرمانبەری میری بوایە یان نا, ئەوەش دەسپێشخەرییەکی شارستانیی ئیمامی عومەرە.

کەواتە خۆشەویستان: با بەئاگابین, هەموو ئەوەی ئەمڕۆ بەمافی منداڵ ناو دەبرێو ئێمە وەکو موسڵمان بەشتێکی پیرۆزی دەزانین" لەلایەن هەرکەس و وڵاتو ڕێکخراوێکەوە خزمەت بەمنداڵان بکرێ" دەستخۆشیی لێدەکەین, دەبێ ئەوە بزانین هەموو ئەو مافانەی منداڵ" لەدینە پاکو بێگەردەکەی خۆماندایەو هەزارو چوارسەد ساڵ زیاترە کەئیسلام بنەماکانی مافی منداڵی داڕشتوەو بەکردەوەش ئەوەی گوتوویەتی جێبەجێی کردووە, بەختەوەریی هەموو مرۆڤایەتیو لەپێش هەمووانیشەوە منداڵان" بەپەیڕەویکردنی ئەو ئیسلامە ئازیزەیە لەناو کۆمەڵی بەشەریدا.

داوادەکەم خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەکمان بدات بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لەسەر پەروەردەیەکی موسڵمانانە پەروەردە بکەینو پێ بگەیەنینو تێبگەیەنین..

اَللّهُمَّ آمین

# ووتـاری ژماره چوارده

## مافی منداڵ

### بەشی پێنجەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾

(التحريم 6)

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم

( إذا كانَ جَنْح اللَّيْلِ فكُفُّوا صِبْيانَكُمْ, فَإنَّ الشَّياطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئذٍ, فَإذا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ )

( رَواهُ البُخاري وَمُسْلِمْ )

**الحمدُ لله رَبْ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيماندارانى بەڕێزو خۆشەويست, سەلامو ڕەحمەتى خوا لەهەمووەمان بێ..

بەڕێزان: زاناى پايەبەرزى ئيسلام ئبن قەيم ئەلجۆزييە لەكتێبى (أحكام المَوْلُود)دا دەفەرموێ: هەندێ لەزانايان فەرموويانە" خواى گەورە لەڕۆژى دواييدا, پرسيار لەباوك دەكات دەربارەى منداڵەكەى بەرلەوەى كەپرسيار لەمنداڵ بكات دەربارەى باوكى. چونكە هەروەكوچۆن باوك" مافى لەسەر منداڵەكەيەتى, بەهەمان شێوە" منداڵيش مافى لەسەر باوكى هەيە, هەروەك خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا الْأنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً﴾(العنكبوت 8), واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردووە كەچاك بن لەگەڵ دايكو باوكياندا لەشوێنێكىتردا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾(التحريم 6), واتە: خۆتانو خاوخێزانتان بپارێزن لەئاگرێك كەسووتەمەنييەكەى مرۆڤ و بەردە..

بەڕێزان: لەوتارى ڕابردوودا باسى مافەكانى منداڵمان كرد كە لەڕۆژى لەدايك بوونيەوە تا ڕۆژى حەوتەمى" پێويستە بۆى جێبەجى بكرێ. ئەم وتارەش بۆ تەواوكردنى وتارەكانى پێشوو" باسى مافەكانى منداڵ دەكەين لەڕۆژى حەوتەمى تەمەنيەوە بەدواوە إنشاءَ الله, بەتايبەت لەتەمەنێكەوە كەمنداڵ هەست بەوە دەكات كەدايكو باوك سۆزو خۆشەويستيى بەرامبەر دەنوێنن يان نا. فەرموون ئێوەو ئەو باسە پێويستو شيرينە:

**يەكەم:** مافى ماچ كردنى منداڵ, كەماچ كردنى منداڵ بنچينەى يەكەمى سۆزدارىو سۆزو بەزەيى يە بەرامبەر منداڵ.

بەڵێ خۆشەويستان, ماچ كردن ڕۆڵێكى كاراى هەيە لەجووڵاندنى هەستو سۆزى منداڵدا, هەروەها ڕۆڵێكى گەورەى هەيە لەدامركاندنەوەى هەڵچوونو تووڕەييدا, سەرەڕاى هەستكردن بەپەيوەنديى پتەو لەقايمكردنى پەيوەنديى خۆشەويستيى نێوان گەورەو بچووكو هەر ئەويش بەڵگەى بەزەيى دڵودەروونە بەرامبەر ئەو منداڵە تازە پێگەيشتووەو بەڵگەشە لەسەر خۆ بەكەم زانينى گەورەو ئاوێتەبوونى لەگەڵ دەوروبەريدا زياتر دەكات. پاشان هەر ماچ كردنى منداڵە كە لەسەرەتاو كۆتاييەوە

لەسوننەتی پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمو چەسپاوە کەمنالانی ماچ کردووە. بوخاریو موسلیم لەعائیشەوە هێناویانە کەدەفەرموێت: چەند کەسێك لەخەڵکی دەشتەکی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمو وتیان: ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟! پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: بەڵێ، ئێمە منداڵمان زۆر خۆشدەوێو ماچیان دەکەینو لەباوەشیان دەگرین، باشە بۆچی دەپرسن؟! خەڵکە دەشتەکییەکان وتیان: دەی ئێمە قەت منداڵی خۆمان ماچ ناکەین! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أَوَ أَمْلِكُ إِنْ كانَ اللهُ نَزَعَ مِنْ قُلُوبِكُمُ الرَّحْمَةَ!)، فەرمووی: جا من دەسەڵاتم چی یە کەخوای گەورە سۆزو خۆشەویستیی لەدڵتاندا هەڵکێشاوە!

هەروەها بوخاریو موسلیم لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هێناویانە کەفەرموویەتی: جارێکیان پێغەمبەری خوا" حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی لەباوەش دەگرتو ماچی دەکردو هەڵیدەپەڕاندو منداڵەکەش دەچووە سەر شانوملی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم، لەو کاتەدا کابرایەك لەخزمەت پێغەمبەردا دانیشتبوو ناوی ئەقرەعی کوڕی حابس بوو، ئەمەی بەلاوە سەیر بوو کەپێغەمبەری خوا ئەوەندە ڕوودەداتە ئەو منداڵەی کەتەنانەت منداڵی خۆیشی نیە، بەڵکو کچەزایەتی. بۆیە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە بۆ واز لەو منداڵە ناهێنیو وا عەزیەتت دەدات، بەخوا من دە منداڵم هەیە تا ئێستا دەمم بەڕوومەتی هیچیان نەکەوتووەو هەرگیز هیچ منداڵێکی خۆمم ماچ نەکردووە!! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (مَنْ لا يَرْحَمْ لا يُرْحَمْ)، واتە: ئەوەی ڕەحمو بەزەیی نەبێت، ڕەحمو بەزەیشی پێ ناکرێت!

کەواتە هەموو ئەو کەسانەی کەخۆیان بەئوممەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەزانن" بەڵام وەکو ئەو کابرایە دەڵێن: تا ئێستا منداڵی خۆمم ماچ نەکردووە، با تا زووە تەوبە بکەنو بزانن هەرکەسێ بەزەیی نەبێ، بەتایبەت بەرامبەر منداڵو جگەرگۆشەی خۆی، ئەوە خوای گەورەش بەزەیی بەو کەسەدا نایەتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: بەزەیی هاتنەوە بەمنداڵانداو دڵنەوایی کردنیان، ڕێگای چوونە بەهەشتو بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەیە. ئیمامی بوخاری لەئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ئافرەتێك هاتە ماڵی دایکی ئیمانداران حەزرەتی

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت)، ئافرەتەکە دوو منداڵی بچووکی لەگەڵدا بوو، دەستی گرتبوون، داوای یارمەتیی لەحەزرەتی عائیشە کرد، ئەویش تەنها سێ دەنکە خورمای شك دەبرد! هەرسێ دەنکە خورمایەکەی دا بەژنەکە، ئەویش هەریەکە لەدوو منداڵەکەی" یەکی دەنکە خورمایەکی دانێ، دانەیەکیشی بۆ خۆی هەڵگرت. دوو منداڵەکە لەبرسان هەر خێرا دەنکە خورماکەی خۆیان قووتدا، دایکیشیان دەنکە خورماکەی خۆی برد بۆ دەمی بەڵام هەردوو منداڵەکە" زۆر بەتامەزرۆییەوە سەیری دەنکە خورماکەی ناو دەستی دایکیان دەکرد. بۆیە ژنەکە" دەنکە خورماکەی لەدەمی خۆی گێڕایەوەو کردی بەدوو کەرتەوەو هەر لەتەی دا بەیەکێ لەمنداڵەکانی، لەکاتێکدا بۆ خۆی زۆری حەز لەدەنکە خورماکە بوو، زۆریش برسیی بوو. ئێوارە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتەوە بۆماڵەوە، حەزرەتی عائیشە" ئەوەی لەو ژنو دوو منداڵەی بینیبوو بەسەرسوڕمانەوە بۆ پێغەمبەری خوای صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم گێڕایەوە، حەزرەتیش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: (وَما يُعْجِبُك مِنْ ذلكَ، لَقَدْ رحمَها اللهُ بِرَحْمَتِها صَبْيَيْها)، واتە: بۆچی سەرت لەوە سوڕ دەمێنێ، ئەوە بەهۆی بەزەیی هاتنەوەی بەدوو منداڵەکەیدا" خوای گەورەش ڕەحمی پێکردووە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم موژدەی دا کەئەو ئافرەتە" خوای گەورە ڕەحمی پێکردووەو هەر کەسێکیش خوا ڕەحمی پێبکات جێگای بەهەشتە!

**دووەم:** بەڵێ موسڵمانان، مافی دووەمی منداڵ ئەوەیە کەدایكو باوك یاریو گاڵتەوگەپ لەگەڵ منداڵەکانیان بکەنو خۆشەویستیی خۆیان بۆیان دەربڕن. فەرموون با بەیەکەوە بچینە خزمەت کۆمەڵێك لەگوڵزاری فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم کەپەندو وانەی کرداری لەو فەرموودانەوە لەپێغەمبەری خواوە وەردەگرین لەیاریکردن لەگەڵ منداڵدا: جارێك بەڕاکردن، جارێکی تر بەهەڵگرتن، جاری تریش بچووك کردنەوەی ناوی منداڵەکەو جارانی تریش بەپێکەنینو شتی ترەوە. جا با دایکانو باوکان زۆر ئاگایان لەم مافەی منداڵەکانیان بێ، چونکە ئەمە سوننەتی پێغەمبەرەکەمانە صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم، طەبەرانی لەجابیرەوە دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین، بانگ کرابووین بۆ نان خواردن. لەڕێگادا" حوسەین کەمنداڵ بوو" لەگەڵ منداڵاندا

یاریی دەکرد, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم بەبەرچاوی خەڵکەوە خێرا بەرەو لای ڕۆیشتو باوەشی بۆ کردەوەو ئەویش بەملاو بەولادا رایدەکردو پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم لەگەڵیدا پێدەکەنیو ئەملاو ئەولای لەگەڵدا دەکرد, هەتا گرتی, دەستێکی خستە لاملیو ئەوی تریشی خستە نێوان سەرو گوێیو دەستی کردە ملیو ماچی کرد, پاشان فەرمووی: (حُسَيْن مِنِّي, وَأنا مِنْهُ, أحَبَّ اللهُ مَنْ أحَبَّهُ, الحَسَنُ وَالحُسَيْن سَبْطانِ مِنْ الأسْباطِ), (رَواهُ البُخاري), واتە: حوسەین لەمنەو منیش لەوم, خوا ئەو کەسەی خۆشبوێ کەحوسەینی خۆشدەوێ, حەسەنو حوسەین دوو کچەزان لەکچەزاکان.

هەروەها بوخاری لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کەفەرموویەتی: بەم دوو گوێیەم بیستم, بەم دوو چاوەشم بینیم کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم" بەهەردوو دەستی" هەردوو لەپی دەستی حەسەن یان حوسەینی گرتبوو, ئەویش هەردوو پێی لەسەر پێی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم دانابوو, دەیفەرموو (أرقه), واتە: سەرکەوە, ئەویش بەقاچەکانی پێغەمبەردا سەرکەوت هەتا هەردوو پێی خستە سەر سنگی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلّم, پاشان پێی فەرموو: دەمت بکەرەوە, ئینجا ماچیکردو فەرمووی: (اللّهُمَّ أحِبهُ فَإنّي أُحِبُّهُ), واتە: خوایە خۆشت بوێ چونکە من خۆشم دەوێ.

هەروەها لە (الإصابَة)و (زاد المعاد)دا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم بەحوسەینی دەفەرموو: هەی کورتەبالای ورگ زلەی چاو بچوکە" وەرە سەرکەوە سەر باوەشم. بێگومان پێغەمبەری خوا وەکو یاریو گاڵتەوگەپ ئەوەی بەو کچەزایەی گوتووە.

عەبدوڵلای کوڕی شەداد دەفەرموێ: لەکاتێکدا کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم ئیمامەتی بۆ صەحابەکان دەکرد, حوسەین هات بۆ لایو لەسوجدەدا چووە سەر ملی, ئەویش سوجدەکەی درێژکردەوە هەتا ئەوانەی لەپشتیەوە بەجەماعەت نوێژیان دەکرد" وایا گومان دەبرد کەشتێك قەوماوە بۆیە پێغەمبەری خوا ئەوەندە لەسوجدەدا مایەوە! ئەوەبوو کاتێ حەزرەت سەلامی نوێژەکەی دایەوە, وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا, ئەوەندە سوجدەکەت درێژکردەوە هەتا وامان گومان برد کەشتێك ڕوویداوە, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرمووی: (إنَّ إبْني قَدْ إرْتَحَلَني, فَكَرِهْتُ أنْ أعْجِلَهُ

حَتَّى يَقْضِي حاجَتَهُ)، فەرمووی: ئەوە بۆیە ئەوەندە زۆر لەسوجدەدا مامەوە چونکە کوڕەکەم (مەبەستی لەحوسەینە) هاتە سەر ملم، منیش حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەمو سەر بەرز بکەمەوەو لای بەم هەتا بۆ خۆی وەڕز دەبێو لادەچێ لەسەر ملمو ئارەزووەکەی دەشکێ (حدیث صحیح رَواهُ الحاکم).

هەروەها صەحابیی بەڕێز عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا نوێژی دەکرد، هەر کاتێ بگەیشتایە سەر سوجدە" حەسەنو حوسەین کەهەردووکیان منداڵ بوون، فێر بووبوون ڕایان دەکردە سەر ملیو پشتی، جا ئەگەر صەحابەکان بیانویستایە ڕێگایان لێبگرنو نەهێڵن بەرەو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم برۆن، لەو کاتەدا حەزرەت" بەدەستی پیرۆزی، لەنوێژەکەدا ئیشارەتی دەکرد کەوازیان لێبهێننو با بێن بۆ لام، ئەوانیش وازیان لێدێنان، جا حەسەنو حوسەین دەچوونە سەر پشتیو ماوەیەکی زۆر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەسوجدەدا دەمایەوە تا ئەوان لەسەر پشتی لادەچوون، پاشان کەسەلامی نوێژەکەی دەدایەوە دەیخستنە باوەشیەوەو دەستی بەسەردا دێنانو ماچی دەکردنو دەیفەرموو: (مَنْ أحَبَّني فَلْيُحِبَّ هذَيْنِ)، واتە: ئەو کەسەی ڕاست دەکا کەمنی خۆشدەوێ، با ئەم دوانەش (حەسەنو حوسەین)ی خۆش بوێت!

ئەبو قەتادە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم نوێژی بەئیمامەت بۆ صەحابەکان دەکرد، لەو کاتەدا ئومامەی کچی زەینەب" کەکچەزای پێغەمبەری خوایەو کچێکی بچکۆلەبوو، لەباوەشی پێغەمبەردا بوو، کاتێ دەچووە سەر سوجدە دایدەناو کاتێ هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرتەوە! (رَواهُ إبنُ خُزَيْمَةَ).

لەم فەرموودەیەدا ئەو دەردەکەوێ کەزەینەبەی کچی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" کچێکی ساوای هەبووە ناوی ئومامە بووە، دیارە ئیشوکاری زۆری هەبووەو کەس نەبووە چاودێریی کچەکەی بۆ بکات، بۆیە بردوویەتی بۆ لای باوکی بەسۆزی کەپێغەمبەری دڵسۆزو بەسۆزە (هەزاران ڕەحمەتو سەلامی خوای لێبێت) تا چاوی لەکچەکەی بێ کاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کاتی ئەوەی بووە کەبچێ بۆ مزگەوت ئیمامەتیی نوێژ بۆ صەحابەکان بکا، لەبەر ئەوەی کەسی لەماڵەوە نەبووە ئاگای

لەو منداڵە ساوایە بێ، پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی بۆ مزگەوتو نوێژی کردووەو منداڵەکەیشی لەکاتی نوێژدا هەر بەباوەشەوە بووە (دیارە منداڵەکە لەش‌و جلوبەرگی پاک‌و خاوێن بووەو میزو پیسایی پێوە نەبووە)، جا کاتێ حەزرەت دەچووە سەر سوجدە" منداڵەکەی لەبەردەمی خۆی دادەناو کەهەڵدەستایەوە بۆ ڕکاتی دووەم" هەڵیدەگرتەوەو دەیخستەوە باوەشی!!

بەڕاستی جێگای داخە، کەسانێك هەن خۆیان بەئومەتی ئەو سەروەرو سالارە دەزانن" کەچی نەك هەر منداڵی کچەزایان بەڵکو منداڵی خۆیشیان لەباوەش ناگرن‌و ئەگەر جارێك خێزانی ئیشێکی زۆری هەبێ، ئامادە نیە چەند دەقیقەیەك چاودێریی منداڵە ساواکەی بۆ بکات، چونکە وا دەزانێ منداڵ هەر هی دایکەو ئیشی باوك نیە لەباوەشی بگرێ‌و چاودێریی بکاو سۆزو خۆشەویستیی بەرامبەر بنوێنێ. خۆ لەوانەیە باوکانێك هەبن کەمنداڵی ساوا چۆتە سەر بەرماڵی نوێژەکەی (نەك سەر پشت‌و ملی) تووڕە بووبێ‌و منداڵەکەی خستبێتە ئەولاوەو لەژن‌و منداڵەکەشی تووڕە بووبێ کەچۆن ڕێگایان داوە ئەو منداڵە بێتە بەردەمی نوێژەکەی!! کەئەمەش هەمووی بەرهەمی نەشارەزاییە لەدین‌و بێئاگاییە لەسوننەتی پڕ بەرەکەتی حەزرەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم.

خۆشەویستان: وا نەزانن کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هەر لەگەڵ منداڵانی کچەزای خۆیدا وابووە، بەڵکو گاڵتەوگەپی لەگەڵ منداڵی بچکۆلەی هەموو کەسدا کردووە، بۆ نموونە: ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: منداڵ بووم، هەموو جارێ کەپێغەمبەری خوا دەیبینیم بانگی دەکردم (يا ذا الأُذُنَيْنِ) ئەی دوو گوێ، واتە گاڵتەی لەگەڵدا دەکرد، بێگومان هەموو کەس دوو گوێی هەیە، بەڵام منداڵەکە (ئەنەس) پێی سەیربوو کەپێغەمبەر پێی دەڵێ دوو گوێ!

هەروەها پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" گاڵتەی لەگەڵ زەینەبەی کچی ئوم سەلەمە دەکردو چەندین جار بانگی دەکردو دەیفەرموو: (يا زُوَيْنِبْ.. يا زُوَيْنِبْ)، زێنەبۆکە زێنەبۆکە (حَديث صَحيح ــ صحيح الجامع، رَقَم / 5025)، واتە: ناوی ئەم کچە بچکۆلەی بچووك دەکردەوە تا سەرنجی منداڵەکە ڕابکێشێ‌و دڵخۆشی بکات.

بەڵێ ئیمانداران، ئەم هەموو فەرموودانەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەباسی یاریکردنی پێغەمبەری خوا دەکەن لەگەڵ منداڵاندا" ئەوەمان نیشان دەدەن کەپێغەمبەری نێردراوو سەرکردەی ئومەت" یاریی لەگەڵ منداڵاندا کردووەو دڵخۆشیکردوون، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە تا باوکانو دایکان شوێنی سوننەتی پێغەمبەرەکەیان بکەونو یاریی لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەنو دڵخۆشیان بکەن.

طەبەرانی لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کەفەرموویەتی: ڕۆژێکیان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا، سەیرم کرد وا بەگاگۆڵکە دەڕواو حەسەنو حوسەینیش چوونەتە سەر پشتی، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەدەمیانەوە پێدەکەنیو دەیفەرموو: (نِعْمَ الْجَمَلُ جَمَلُكُما, وَنِعْمَ الْعَدْلانِ أَنْتُما)، واتە: بەڕاستی ئەی حەسەنو حوسەین" باشترین ووشتر ووشترەکەی ئێوەیەو، ئێوەش باشترین دوو تای بارن! ! اللهُ أَكْبَرْ لەگەورەیی ئەو پێغەمبەرە، لەگەڵ ئەو هەموو ئەرکە قورسەی کە لەسەر شانی بوو بۆ گەیاندنی ئیسلام بەخەڵکی خوا" کەچی مافی ئەو دوو منداڵە جوانکیلەی ناو ماڵەکەی خۆیانی لەبیر ناچێ کەمنداڵەکانی فاطمە ی کچنیو زۆربەی کات لەماڵی پێغەمبەری خوا دەمانەوە، سەرەڕای شەونخوونیو ماندووبوونی ڕۆژانەی" کەچی کەهەست دەکا وا ئەو دوو منداڵە کچەزایەی حەزیان لەسواری ووشترە" حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" پشتی خۆی وەکو ووشتر لێدەکاتو لەسەر لەپی دەستی دەڕواتو دەفەرموێ: ووشترەکەیان ووشتری چاکەو بارەکانیشی باری چاکن! !

بەڕێزان: ئایا بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی" سەرکردەیەکی ئاوا بووەو جارێکی تر دروست دەبێتەوە کە بەکردەوە" بەخودی خۆی ئاوا گرنگیی بەمافی منداڵ بدات؟! بێگومان نەخێر.

صەحابیی بەڕێز حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: بینیم پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم زمانی دەردەهێنا بۆ حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی، کاتێك حەسەن سورایی زمانی حەزرەتی دەبینی پەلاماری زمانی پێغەمبەری خوای دەداو پێدەکەنیو دەیویست زمانی بگرێ (رَواهُ إِبن حَبَّان في صَحيحِهِ).

هەروەها ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا دەچێتە ماڵی ئوم سولەیم، ئەویش کوڕێکی لەئەبو طەلحە هەبوو، تازە لەشیر بڕابۆوە بەئەبو عومەیر ناسرابوو، پێغەمبەر گاڵتەی لەگەڵدا دەکرد، ڕۆژێکیان فەرمووی: (ما لي أرى أبا عُمَيْـر حَزيناً؟)، ئەوە چی یە ئەبو عومەیر بەغەمباری دەبینم؟! کێ عاجزی کردووە؟ عەرزیان کرد: قوربان ئەوە بۆیە عاجزە چونکە ئەو چۆلەکەیەی یاریی پێدەکرد مردار بۆتەوە، ئەویش زۆر بۆی بێتاقەتە. ئیتر لەوەودوا" پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم هەموو جارێ بەزەردەخەنەوە دەیفەرموو: (يا أبا عُمَيْر ما فَعَلَ نُغـير؟! )، ئەی ئەبو عومەیر، چۆلەکەکە چی کرد؟! بۆ ئەوەی منداڵەکە باسی چۆلەکەکە بکاو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هەندێ گاڵتەوگەپی لەگەڵدا بکات!

بەڵێ موسڵمانان، خۆ بچووك کردنەوەو یاری کردن لەگەڵ منداڵ" دەروونی ئەو منداڵە گەشەی پێدەکاتو یارمەتی دەدات لەسەر دەرخستنی ئەوەی لەناخیدا شاراوەتەوە. هەر لەبەر زۆر گرنگی پێدانی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم بەمنداڵان کەداوا لەدایکانو باوکان دەکات کەخۆیان بچووك بکەنەوەو خۆیان وەك منداڵ لێبکەن بۆ منداڵەکانیانو، بانگەوازێکی گشتی لەو بارەیەوە ئاڕاستەی هەموو باوکانو دایکان دەکات، دەفەرموێت: (مَنْ كانَ لَهُ صَبِيٌّ فَلْيَتَصَابَ لَهُ)، واتە: هەرکەسێك منداڵی بچووکی لەماڵدا بوو، منداڵی بچووکی هەبوو، بۆ ئەوەی منداڵەکەی دڵخۆش بکات با خۆی وەك منداڵەکە لێبکاتو یاریی لەگەڵدا بکات.

دەگێڕنەوە جارێکیان لەسەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابدا (ڕەزای خوای لێبێت) کاربەدەستێك دێت بۆ ماڵی ئیمامی عومەر، سەیردەکات ئەمیری موسڵمانان خەریکی یارییکردنە لەگەڵ منداڵەکانیدا. کابرا زۆری بەلاوە سەیر دەبێتو دەپرسێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەوە تۆ چۆن ڕوو دەدەیە منداڵو یاریی لەگەڵدا دەکەی؟! حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی بۆچی تۆ یاریی لەگەڵ منداڵەکەتدا ناکەی؟! کابرا گوتی: نەخێر، هەر ناهێڵم بێن بەلامدا. حەزرەتی عومەر دەست بەجێ کابری لەسەر کار لابردو فەرمووی: ئەگەر سۆزو بەزەییت بۆ منداڵی خۆت نەبێت" ئیتر چۆن سۆزو ڕەحمەت بەرامبەر خەڵکانی تردەبێت؟!

**سـێیەم:** یـەکێکی تـر لەمافـەکانی منـداڵ ئەوەیـە" بـەناوێکی جـوان بـانگی بکـەی. پێغەمبەری خۆشەویستو پێشەوامان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" کاتـێ بـانگی منـداڵی خـەڵکی دەکرد, ئەگەر باوکو دایکی منداڵەکە موسـڵمان بوایـە دەیفـەرموو: (یـا ابْـنَ أخـي), ئـەی برازای خۆم. خۆ ئەگەر باوکو دایکی منداڵەکەش موسڵمان نەبوایە دەیفەرموو: (یـا بُنَـيَّ), واتە: کوڕەکەم.

ئیمامی نەوەوی لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: لەم فەرموودەیـەوە ئـەوە دەردەکەوێ کە: دروستە ئینسان جگە لەکوڕی خـۆی" بەمنـداڵی بـچکۆلەی خـەڵکی بڵـێ: کوڕی خۆم, یان پێی بڵێ: ڕۆڵە گیان, کەئەمەش واتای سۆزو نەرمی نواندنی بەرامبەر ئەو منداڵـە تێدایـەو, ئـەوەش دەگەیـەنێت کەمنداڵەکـە تێبگـات کـەتۆ لـەجێگای کـوڕو جگەرگۆشەی خۆمدایت لەبەزەییدا.

خـوای گـەورە کەباسـی پێغەمبـەرانمان بـۆ دەگێڕێتـەوە ( سـەلامی خوایـان لێبێـت), دەبینین کاتێ بانگی کوڕەکانی خۆیان کردووە هەموویان بـە (یـا بُنَـيَّ) واتـە ئـەی ڕۆڵـەی شیرینو زۆر خۆشەویستم بانگیـان کـردوون, وەکـو إبـراهیم ویَعْقـوب و لوقمـانی حـەکیم.. هتـد. بـەڵام بەداخـەوە, زۆر لـەباوکانو دایکـان, کاتـێ بـانگی منداڵـەکانیان دەکـەن" زۆر بەناوی ناشیرینو ناووناتۆرەوە بانگیـان دەکـەن, هەیـە بەمنـداڵی خـۆی دەڵـێ شـەیتان! زۆرجـار ئـەو نـاوە ناشـیرینەی کەمنـداڵ لەماڵـەوە پێـی بـانگ دەکـرێ, لـەدەرەوەی ماڵەوەشیان" منداڵان خەڵکی تریش هەر بەو نـاوە ناشـیرینە بـانگی دەکـەن و تـا دەمـرێ لەکۆڵی نابێتەوەو زۆرجار لێی دەبێت بەلەقەبێکی ناشیرینو بەدرێژایی ژیانی پێـی گرفتـار دەبێ. کەواتە جوان بانگ کردنی منـداڵو بەسـۆزو خۆشەویـستییەوە ناوهێنـانی" یەکێکـە لەڕەوشـتە جوانـەکانی موسـڵمانان, بـا لەدەسـتی نـەدەینو بـەناوی ناشـیرین بـانگی منداڵەکانمان نەکەین.

**چوارەم:** ئیماندارانی بەڕێز, مافێکی تری منداڵ ئەوەیە بەدەم ئارەزووەکانیـەوە بـچیو دڵــی ڕازی بکـــەی, چـــونکە ڕازیکردنی دڵی منداڵ لەشێوازە چاکەکانە. جا منداڵەکـە هەرچـەند بـچووکتر بـێ" دەبـێ دڵـی ڕازی بکـرێو بـەپێی توانـا دواکارییـەکانی بـۆ جێبەجێ بکرێ, چونکە منداڵ کـەداوای شـتێکی کـردو بـۆی جێبـەجێکرا ئـەوا دەروونـی

دەکرێتــەوەو دڵخــۆش دەبێــتو بەخۆشــیو چوستوچــالاکی یــەوە دەژی, بــەڵام ئەگــەر هەستیکرد هەرچی داوای دەکات هەر لێی مەنع دەکرێو بەلێدانو قسەی ناشـیرین وڵامـی دەدرێتەوە, ئەوا دڵخۆش نابێتو بەخۆشـیو چوستوچـالاکی یـەوە ژیان بەسـەر نابـات, بەڵکو منداڵێکی قین لـەدڵ دەردەچێتو بـوغزو کینـەو لاساری زیـاتر دەبێـتو بـەجۆرێك هەڵسوکەوت دەکات کەحەزت لێی نەبێتو پێی ڕازی نەبی.

جارێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چوو بۆ لای عوثمانی کوڕی مەظعـوون, لەو کاتەدا عوثمان منداڵێکی بـچکۆلەی خـۆی لابـوو, لەباوەشـی گرتبـوو, ماچـی دەکـردو بەدەمیەوە پێدەکەنیو یاریو گاڵتـەی لەگەڵدا دەکـرد. پێغەمبـەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيـه وسَلَّم فەرمووی: ئەی عوثمان ئەمە کوڕتە؟! فەرمووی: بـەڵێ. فـەرمووی: ئـەی عوثمـان" ئەم کوڕەی خۆتت زۆر خۆشدەوێ؟! عوثمان فەرمووی: ئەرێ وەڵڵاهـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا" بەقـەدەر هـەردوو چـاوم خۆشـم دەوێ. پێغەمبـەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيـه وَسـلَّم فەرمووی: دە گوێ بگرە با منیش شتێکت پـێ بڵێم کەخۆشەویستیی ئـەو منداڵـەت لـەلا زیاتر بکات. عوثمان فەرمووی: بەخۆمو دایکمو باوکمەوە بەقوربانیت بین ئەی پێغەمبەری خوا, بفەرموو وا گوێم لێتە. حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إِنَّهُ مَنْ تَرْضى صَبِيًّا مِنْ نَسْلِهِ حَتَّى يَرْضَى" تَرْضاهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةَ حَتَّى يَرْضَـى), واتـە: هەرکەسێك منـداڵێکی بـچکۆلانەی وەچـەی خـۆی ڕازیبکـات, تـا دڵـی ڕازی دەبێـت, خـوای گـەورەش لـەڕۆژی قیامەتدا دڵی ئەو کەسە ڕازیدەکات, هەتا دڵی ڕازی دەبێت!!

بـەڵێ ئـازیزان, ڕازیکردنـی منـداڵی بـچووك کەحـەزی لەشـتەو خۆیـشی هـیچ توانـاو دەسەڵاتێکی نیە بۆ پەیـداکردنی, بـەڵکو چـاوی لەدەسـتی تۆیـە کەپێویـستی یـەکانی بـۆ دابین بکەی, تۆش بـەپێی توانـا درێغـی نەکـەی ئـەوا ئینـشائەڵڵا خـوای گـەورە" لـەڕۆژی قیامەتدا دڵت ڕازی دەکات. بەڵام پێویستە ئاگامـان لـەوە بـێ کـەڕازیکردنی دڵـی منـداڵ" مەرج نیە لەهەموو کاتو ساتێکدا جێبەجێ بکرێت, چونکە ئەوە فێری نازونووزی دەکاتو سـەرەنجام بـاوكو دایکـی لێـی بێزار دەبن.

بـەڵێ موسـڵمانان, پێویـستە خۆشەویستی دروست بکرێ لەنێوان ئەندامانی خێزانداو,

ئەوەندە ئەرکو واجب نەخرێتەسەر شانی منداڵو, ئارەزووەکانی ئەوەندە کپ نەکرێن کەببێتە مایەی ئەوەی وا بزانێ باوکو دایکی دوژمنایەتیی دەکەن.

یەزیدی کوڕی معاویە دەڵێ: باوکم ناردی بەشوێن ئەحنەفی کوڕی قەیسدا, کاتێ گەیشتە لای پێی گوت: ئەی ئەبولبەحر, چی دەڵێیت دەربارەی منداڵ؟ گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران, بەرهەمی دڵەکانمانو کۆڵەکەی پشتمانن, ئێمە زەوییەکی ملکەچینو ئاسمانێکی پڕ سێبەرین بۆیانو بەهۆی ئەوانەوە دەگەینە هەموو پایەیەکی بەرزو, ئەگەر داوایان کرد بیاندەرێ, ئەگەر تووڕە بوون ڕازییان بکە, ئەوانیش خۆشەویستی خۆیانت دەدەنێو بەپێی توانای خۆیان خۆشیان دەوێیتو مەبە بەبارێکی گرانو قورس بەسەریانەوە کەبێزار بن لەژیانتو ئاواتی مردنت بخوازنو حەز بەنزیك بوونەوەت نەکەن.

**پێنجەم:** بەڕێزان, یەکێکیتر لەمافەکانی منداڵ لەسەر دایكو باوکی ئەوەیە: لەمنداڵەکانتان بپرسنەوە, بەتایبەت دوای خۆرئاوابوون, یان لەڕۆژدا کە لەماڵەوە چووە دەرەوەو ماوەیەك دیار نەما. طەبەرانی لەسەلمانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کەدەفەرموێ: لەدەوری پێغەمبەری خوادا بووین, ئوم ئەیمەن (ڕەزای خوای لێبێت) هاتو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" حەسەنو حوسەین بزر بوون, لەماڵ چوونە دەرەوەو نەهاتوونەتەوە. دەفەرموێ: کاتەکەی کاتی نیوەڕۆ بوو, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (قُوموا فَاطْلُبوا إِبْنَيَّ), واتە: هەستن بەدوای کوڕەکانمدا بگەڕێن. صەحابەکان" هەرکەسەی بەلایەکدا ڕۆیشتنو دەستیان کرد بەگەڕان. سەلمان دەفەرموێ: منیش بەدوای پێغەمبەری خوادا ڕۆیشتم, ئەوەندەی پێنەچوو گەیشتینە بناری شاخەکە, سەیردەکەین وا حەسەنو حوسەین لەترسان خۆیان لەیەك ئاڵاندووەو باوەشیان بەیەکدا کردووە. لەبەرامبەریاندا مارێك لەسەر کلك وەستاوەو زمانی دەردێنێو بڵێسەی ئاگرو ژەهر لەدەمیەوە دەردەچێ. پێغەمبەری خوا بەپەلە بەرەو مارەکە ڕۆیشت, مارەکەش سەرنجی پێغەمبەری خوای دەداو پاشان ڕۆیشتو خۆی کرد بەکونێکدا. ئینجا پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چوو بەلای حەسەنو حوسەینو لێکیکردنەوەو دەستی بەڕوویاندا هێناو فەرمووی: (بِأَبِي وَأُمِّي أَنْتُما, ما أَكْرَمَكُما عَلى الله), واتە: دایكو باوکم بەقوربانتان بێت چەند بەڕێزن لای خوا. پاشان

یەکێکیانی خستە سەر شانی ڕاستیو ئەوی تریشیانی خستە سەر شانی چەپیو هێنانیەوە بۆ ماڵەوە!!

ئیمامی حاکم لەجابیرەوە" بەمەرفووعی گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێ: (أَحْبِسُوا صُبْيانَكُمْ حَتَّى تَذْهَب فَوْعَةُ الْعِشاءِ, فَإِنَّها ساعَةَ تَخْتَرِقُ فيها الشَّياطِين)(رَواهُ البُخاري ومُسلِمْ), واتە: ڕێ لەمنداڵەکانتان بگرنو مەهێڵن بێنە دەرەوە, هەتا سەرەتای هاتنی شەو تێدەپەڕێت, چونکە شەیتانەکان بەپانایی ڕێگا دەڕۆن.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (إذا كانَ جُنح اللَّيْلِ فَكُفُّوا صُبْيانَكُمْ, فَإِنَّ الشَّياطِينَ تَنْتَشِرُ حينَئِذٍ, فَإذا ذَهَبَتْ ساعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ), واتە: کەشەو داهات مەهێڵن منداڵەکانتان بچنە دەرەوە, چونکە شەیتانەکان لەو کاتەدا بڵاودەبنەوە, بەڵام کاتێ کەماوەیەك لەشەو تێپەڕی, ئیتر وازیان لێ بێنن. لەڕیوایەتی ئیمامی بوخاریشدا دەفەرموێ: (فَإِذا ذَهَبَ ساعَةٌ مِنَ الْعَشاءِ فَخَلُّوهُمْ), واتە: ئەگەر ماوەیەك لەشەو بەسەر چوو وازیان لێ بێنن.

کەواتە لەکاتی خۆرئاوابوونەوە تا دوای نوێژی عیشا دەبێ چاودێریی منداڵ بکرێو نەهێڵرێ بەتەنها بچێتە دەرەوە, بۆ ئەوەی لەمەترسیی جنۆکە شەیاطینە کان پارێزراوبن.

خۆشەویستان:زۆرجارمنداڵ بەتایبەت تا دەگاتە تەمەنی دە ساڵیو دواتر, بەتایبەت ئەگەر چەند منداڵێك لەماڵەوە بەیەکەوە بن, ئەوا هاروهاجی دەکەنو باوكو دایك" یان زۆرتر دایك ئازاردەدەن. جا زۆر لەدایکان" کاتێ ڕقیان لەمنداڵەکانیان هەڵدەستێ, دوعای شەڕی لێدەکەن, هەرچەندە لەوانەیە دوو سێ دەقیقە دواتر" پەشیمان ببێتەوە. بەڵام با بزانین ئایا ئەم دوعا خراپانە لای خوا قبووڵ دەبێ یان نا؟ لەوڵامدا دەڵێین: بەڕاستی دوعای شەڕکردن لەمنداڵ کارێکی زۆر مەترسیدارە, کەهەرچەندە لەبارەی ترسناکیەوە بڵێین هێشتا هەر کەمە, چونکە دوعای خراپ کردن لەمنداڵ دەبێتە هۆی بەدبەختیوماڵوێرانی بۆ ئێستاو داهاتووی منداڵەکە. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردووە کەدایكو باوکان دوعا لەمنداڵەکانی خۆیان بکەن.

ئەبو داود گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لا تَدْعُوا عَلى أَنْفُسكُمْ, وَلا تَدْعُوا عَلى أَوْلادكُمْ, وَلا تَدْعُوا عَلى خَدَمكُمْ, وَلا تَدْعُوا عَلى أَمْوالكُمْ, لا تُوافقُوا منَ اللهِ ساعَةً فَيَنْزِل فيها إِعْطاءً, فَيَسْتَجاب لَكُمْ), واتە: دوعا لەخۆتان مەکەنو مەڵێن خوایە بمکوژی, هەروەها دوعا لەمنداڵەکانیشتان مەکەن کەخوا لێتان بستێنێو تەمەن درێژ نەبن, هەروەها دوعای شەڕ لەخزمەتکاری ماڵەکانتان مەکەنو, دوعا لەماڵوسامانتان مەکەنو ناشکوریی پێمەکەن نەوەکو ئەم دوعاکردنەتان هاوکاتی ئەو ساتە بێ کەخوای گەورە دوعای تێدا گیرا دەکاتو دوعاکەتان گیرا ببێت.

ئیمامی غەزالی لە(إحیاء عُلوم الدِّین) دا باسیکردووە کە: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی موبارەكو شکاتی لەمنداڵەکەی خۆی کرد, کەمنداڵێکی نەگبەتەو زۆر دڵی باوكو دایکی دەڕەنجێنێت, بەڵکو دوعایەکی خێرم بۆ بکەی خوا ئەو ئەولادەم بۆ صالّح بکا. عەبدوڵڵا فەرمووی: باشە من پرسیارێکت لێدەکەم ڕاست وڵامم بدەرەوە, ئایا دوعای شەڕو خراپەت لەمنداڵەکەت نەکردووە بڵێی: خوا لەناوت بەرێت.. خوا لەمنت بستێنێ, ئایا ئەم دوعا خراپانەت لێنەکردووە؟! کابرا گوتی: بەڵێ ڕاست دەفەرمووی, بەخوا هەر ئەو ئازاری دڵی داومو منیش دوعای شەڕم لێکردووە! عەبدوڵڵا فەرمووی: دەی تۆ بۆ خۆت بەو دوعا شەڕانەت ئەو کوڕەتت ئاوا خراپ کردووە!!

جا باوكو دایکی بەڕێز: با لەجیاتی ئەوەی بەدوعاکردن لەمنداڵەکەت" ببیتە هۆی خراپبوونی منداڵەکەت, لەجیاتی ئەوە ببە بەهۆی چاکبوونی منداڵەکەتو دوعای چاکی بۆ بکە, هەروەك پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەپاڕایەوە بۆ منداڵانو خوای گەورەش" بەکارو سامانی زۆرو منداڵ فەڕو بەرەکەتی دەخستە ئایندەی ژیانیانەوە. بوخاری لەئبن عەباسەوە هێناویەتی, کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم نووساندی بەسنگیەوەو فەرمووی: (اللّهُمَّ عَلِّمْهُ الحكْمَةَ), واتە: خوایە دانایی فێر بکە. لەڕیوایەتی بوخاریو موسلیمدا فەرموویەتی: (اللّهُمَّ فَقِّهْهُ في الدِّین) واتە: خوایە لەدین شارەزای بکە. لەڕیوایەتی ئیمام ئەحمەدیشدا" پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (وَعَلِّمْهُ التَّأْویلَ), واتە: خوایە فێری تەفسیری قورئانی بکە.

بەڵێ بەهۆی دوعای پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیە وَسَلَّم، ئبن عەباس کاتێ گەورە بوو" بوو بەزانای ئومەتو تەرجومانی قورئانو لەهەموو صەحابەکان زیاتر" بەتەفسیری قورئان شارەزا بوو.

هەروەها کاتێ ئوم سولەیم" ئەنەسی کوڕی بردە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم" کاتێ کەتازە پێی گرتبوو، پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیە وسَلَّم دوعای بۆ کردو فەرمووی: (اللَّهُمَّ أكْثِرْ مالَهُ وَوَلَدَهُ)، واتە: خوایە ئەم منداڵە پێبگەیەنەو ماڵی زۆری پێ ببەخشەو منداڵو نەوەی زۆر بکە.

ئەنەس دەفەرموێ: بەخوا بەهۆی بەرەکەتی ئەو دوعا خێرەی کەپێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بۆی کردم، ژمارەی منداڵو منداڵی منداڵەکانم لەسەد کەس تێپەڕ دەکەن کە لەژیانی خۆمدا بینیومن‌و، خوا سامان‌و دارایەکی زۆری پێبەخشیوم‌و بێستان‌و باخێکم هەیە ساڵی دوو جار بەر دەگرێ لەکاتێکدا باخو بێستانی خەڵکی" ساڵی هەر یەك جار بەر دەگرن‌و، لەناو ئەم باخو بێستانەمدا جۆرە ڕەیحانـــەیەکی تێدایە کەبۆنی میسکی لێ دێت!

ئیمانداران: بێگومان هیچ کات دایكو باوك دوعای شەڕ لەمنداڵەکانی خۆیان ناکەن مەگەر ئەو کاتەی بەهۆی لاسارىو ناڵەبارىی منداڵەکانیانەوە ئێش بگاتە جەرگیان. بەڵام خـۆ لاساریکردن‌و دڵڕەنجانـدن زۆر کـەمترو بـچووکترە لـەکافربوون، لەگـەڵ ئـەوەدا چارەسـازیی پێغەمبـەری خـوا صَـلّی اللهُ عَلَیـهِ وَسـلَّم بـۆ کـافربوونیش دوعـای خێـرو هیدایەتکردن بووە بۆی، نەك دوعا لێکردن لێی. ئەوەتا کاتێ موشریکەکانی طائیف ئەوپەڕی ئازاری دەروونیو جەستەیی پێغەمبەری خوایان دەدا، قاچی پیرۆزیان خوێناوی کرد بەهۆی بەردباران کردنی لەلایەن هەرزەو نەفامەکانی طائیفەوە، کەچی خۆشەویست دوعای شەڕی لێنەکردن، بەڵکو فەرمووی: (أرْجو مِنَ اللهِ تَعالى أنْ يَخْرُجَ مِنْ أصْلابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ)، واتە: ئومێدەوارم کەخوای گەورە" لەنەوەکانی ئەمانە کەسانێك بێنێتە کایەوە کـەخوا بپەرسـتن. ئـەوەبوو کـەخوای گـەورە ئـاواتو ئومێدەکـەی هێنایەدیو لـەو کـافرە دڵڕەقانـەی طـائیف باشـترین ئیمانـدارو خوانـاس هەڵکـەوتن‌و بەسـۆزو عەشقێکی زۆرەوە بەپێی خۆیان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواو ئیمانیان هێنا.

ئەی دایكو باوكی بەڕێز, ئەی ئەو كەسەی كەمنداڵەكانت خراپنو لەدەستیان بێزاری, هەرچەندە ئەولادەكانت خراپ بن" لەوانەیە بەقەدەر ئەولادەكانی حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) كەدڵی باوكیان ئازاردا" دڵیان ئازار نەدابی, كەچی حەزرەتی یەعقووب" لەجیاتی ئەوەی دوعای ئەوەیان لێبكات كەخوا لەكۆڵیانی بكاتەوەو لەناویان بەرێ, كاتێ هەموو پیلانو ناپاكییەكانیان ئاشكرابوو كەبەرامبەر یووسفی بێتاوان كردیانو بەو هۆیەوە جەرگی باوكیان سووتاندو چاوەكانی لەتاوی یووسف كوێر بوون, كەچی حەزرەتی یەعقووب لەوڵامی ئەو هەموو لاساریو نەگبەتیو دڵڕەنجاندنەی كوڕەكانیدا" فەرمووی: ﴿ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾(یوسف 98) واتە: لای پەروەردگارم بۆتان دەپاڕێمەوە كەلێتان خۆش بێت!

كەواتە, تۆش هەر كاتێ منداڵەكانت دڵیان ئازاردایو بێگوێیان كردی" دوعای خێریان بۆ بكەو بڵێ خوایە هیدایەتیان بدەیو ئەم منداڵە نەگبەتانەم بۆ صاڵح بكەی, ئینشائەڵڵا خوای گەورە ڕەفتاری خراپیان دەگۆڕێت بەچاكە.

**شەشەم:** بەڕێزان, خاڵێكی تر كەپێویستە هەموو دایكو باوكێك ڕەچاوی بكەن ئەوەیە: دەبێ ڕەچاوی ئەو جیاوازییە بكرێ كە لەنێوان ئەو كاتو سەردەمەی ئێمەی تێدا گەورە بووینو, ئەم كاتو سەردەمەش كەئێستا منداڵەكانمانی تێدا دەژین. ئەم ڕاستییەش زۆر كەس لێی بێئاگان, هەرچەندە حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پێش چواردە سەدە ئاماژەی بۆ ئەم حەقیقەتە گەورە كردووەو فەرموویەتی: (أَحْسِنوا تَرْبِيَةَ أَوْلادِكُمْ, فَقَدْ خُلِقوا لِجيلٍ غَيْرِ جيلِكُمْ), واتە: منداڵەكانتان بەچاكی پەروەردە بكەنو ڕەچاوی ئەوە بكەنو بزانن كە: زەمانی منداڵەكانتان جیاوازە لەو زەمانەی كەئێوەی تێدا گەورەبوون. بۆ نموونە: ئێستا گۆڕانێكی زۆر گەورە پەیدا بووە لەهۆیەكانی ڕاگەیاندنو بەرنامەی منداڵانو یاریی منداڵانو بیرو هۆشیان, كە لەزەمانی ئێمەدا وا نەبووە, نابێ بڵێین ژیانی منداڵیی ئێمە چۆن بووە" ژیانی منداڵەكانیشمان هەر وابێ, ئێمە چیمان خواردووەو چیمان پۆشیوەو خوێندنمان چۆن بووەو كارو پیشەمان چی بووە, دەبێ منداڵەكانیشمان وەكو ئێمە وا بنو وا بژین! دەبێ ئاگاداری ئەو گۆڕانكارییانە بین لەپەروەردەدا, كەئەمەش پێی دەوترێت (الصِّراع بَيْنَ الأجْيال), واتە: ململانێیەك هەیە لەنێوان نەوەی كۆنو نوێدا.

جا ئیتر زۆر بێ یان کەم.

موسڵمانانی خۆشەویست: دەبێ منداڵ وەکو منداڵ ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت, دەبێ وەکو نەمامێك چاودێری بکرێتو بەپێی پلەی فامو ژیریو تێگەیشتنی" قسەی لەگەڵدا بکرێت. چونکە جاری وا هەیە فوو لەمۆمێك دەکەی دەکوژێتەوەو هەر هەمان فوو لەئاگرێك دەکەیت کڵپە دەسێنێت, بۆیە نابێت لەهەردوو جارەکەدا هەر فوو بکرێت ئەگەر مەبەست کوژاندنەوەیان بێت, بەهەمان شێوەش ڕەنگە یەك جۆر قسەو ڕەفتار بەکەڵکی دوو کەس نەیەت.

دکتۆر ئیقبال دەفەرموێ: ئەم پلەو پایەی ئەمڕۆم" کە الحَمدُ لله توانیم پلەی دکتۆرا لەخوێندندا بێنمو بەرهەمو نووسینم هەبێت, هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ خوالێخۆشبووی باوکم کە بەچاکیی پەروەردەیکردم, بەمنداڵی هەموو بەیانی یەك دوای نوێژ قورئانم دەخوێندو باوکم دەیگوت: کوڕم ئەوە چیدەکەیت؟! منیش دەمگوت: بابە گیان قورئان دەخوێنم. بەمجۆرە, ئەم پرسیارو وەڵامەی نێوان منو باوکم" هەموو بەیانی یەك دووبارە دەبۆوە تا بەیانی یەکیان گوتم: باشە باوکە گیان" ئەوە بۆچی ماوەی سێ ساڵە هەموو بەیانییەك لەسەر قورئان خوێندن پرسیارێکم لێدەکەیت کەخۆت وەڵامەکەی دەزانیو هەموو بەیانی یەك دووبارەی دەکەیتەوە؟! باوکم فەرمووی: کوڕم دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم: وای بخوێنە هەروەك ئەو قورئانە لەلایەن خواوە ڕاستەوخۆ بۆ خۆت هاتبێتە خوارەوە! وا بزانە خوای گەورە بەهۆی قورئانەوە تەنها قسە لەگەڵ تۆ دەکاتو ئەم قورئانە بۆ کەسیتر نیە.. واتە هەرگیز سەیری ئەوە مەکە کەخەڵکی ڕفتار بەقورئان دەکەن یان نا, بەڵکو تۆ بەتەنها خۆت بە بەرپرسیار بزانە بەرامبەریو وا بزانە بەتەنها قورئان بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە!!

دکتۆر ئیقبال دەفەرموێ: بەبەرەکەتی ئەم ئامۆژگارییەی باوکم" زیاتر لەقورئان شارەزا بوومو پێی بەختەوەر بووم.

بەڕاستی باوکێکی ژیر بووە, هەروا قسەکەی بەسادەیی نەکردووە کە لەمێشکی کوڕەکەیدا جێگا نەگرێت, بەڵکو سێ ساڵ, کەزیاتر لەهەزار جار دەکات" قسەکەی دووبارە کردۆتەوە, تا ئامادەیی وەرگرتنی ئامۆژگارییەکەی لەکوڕەکەیدا بینیوە, ئینجا

قسەو ئامۆژگارییەکەی خۆی بەمنداڵەکەی گوتووە, سەرەنجامیش قسەو نەصیحەتەکەی ئاوا بەچاکی جێی خۆی گرت!

داوا دەکەم لەخوای گەورەو میهرەبان کە لەدینەکەی خۆی زیاتر شارەزامان بکاتو بتوانین بەپێی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم" منداڵەکانمان پەروەردە بکەین, خوای گەورەش منداڵەکانمان صالح بکاتو لەدونیاو قیامەتدا لێیان سوودمەند بین..

أللَّهُمَّ آمين

# ووتـاری ژماره پانزه

## مافی منداڵ

### بەشی شەشەم

قالَ اللّهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ, اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضاً يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْماً صَالِحِينَ ﴾

(يوسف8 ـ 9)

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم

( إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلى مَنابِرَ مِنَ النُّورِ, الّذينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَما وُلُّوا )

( رَواهُ مُسْلِمْ )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيماندارانی خۆشەویست, دایكو باوكانی بەڕێز, بەردەوامین لەسەر زنجیرە باسەكەمان دەربارەی مافی منداڵ.. بۆ درێژەی ئەو باسە گرنگو شیرینە دەڵێم وَبِالله التَّوْفيق:

یەكێكی تر لەمافەكانی منداڵ لەسەر دایكو باوك" ئەوەیە كە بەدادگەریو یەكسانی تەماشای منداڵەكانیان بكەن, هەركەسێك لەیەك منداڵ زیاتری هەبوو, پێویستە لەسەر دایكو باوكەكە كە بەیەك چاو تەماشایان بكەن, چونكە ئەمە شوێنەواری گەورەی هەیە لەسەر هاندانی منداڵان بەرەو گوێڕایەڵی دایكو باوكیان, وەدەبێ ئەوەش بزانین كەهەستكردنی منداڵ بەوەی كەدایكو باوكیان" یا یەكێكیان براكەی لەم زیاتر خۆشدەوێتو ڕێزی لێدەگرێتو نازی زیاتری پێدەدرێت, تەنها بەم هەستكردنە" خوانەخواستە ئەو منداڵە وا چەقاوەسوو دەبێت كەدایكو باوكی" خۆیان بۆ ڕاناگیرێت لەبەردەمیداو, ئەو منداڵە حەسوودیو ئێرەیی بردنێكی بۆ دروست دەبێ كەدایكو باوك نەتوانن سەركێشییەكەی بوەستێنن, بۆ نموونە: ئەگەر تەماشای قورئان بكەینو بچینە خزمەت سوورەتی (یووسف) ئەو حەقیقەتەمان بۆ ئاشكرا دەبێ كەبراكانی حەزرەتی یووسف"كاتێ هەستیان كرد كەیەعقووبی باوكیان زیاتر مەیلی دڵی بەلای یووسفەوەیە, باوكیان بەخەڵەتاوو بەهەڵەدا چوو دانا: ﴿ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ ﴾(یوسف 8), واتە: براكانی یووسف گوتیان: بەڕاستی یووسفو براكەی لەلای باوكمان لەئێمە نازدارترنو زیاتر لەئێمە گرنگییان پێدەدات, لەحاڵێكدا ئێمە كۆمەڵێكی بەهێزین, بەڕاستی باوكمان لەسەرلێشێواوییەكی ئاشكرادایە. دەرەنجامی ئەو بۆچوونەشیان ئەوەبوو كەهەستن بەكارێكی بەد دەرهەق براكەیانو مافی باوكایەتی. ئەوەبوو ئەم حەسوودییە وای لێكردن كەپیلان بۆ یووسف دابنێنو گوتیان: ﴿ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضاً يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْماً صَالِحِينَ, قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ ﴾(یوسف 9 ـ 10), واتە: گوتیان یووسف بكوژن, یان فڕێی بدەنە شوێنو زەوییەكی دوور, ئەو كاتە ڕووی باوكتان یەكلایی دەبێتەوە بۆ

ئێوەو هەموو خۆشەویستییەکەی بۆ ئێوە دەبێت, ئینجا دوای نەمانی یووسف دەبنە کوڕو کەسانێکی ڕێکوپێك. بەڵام یەکێك لەبراکان گوتی: ئەگەر بڕیار بێ هەر شتێکی لێ بکەن, ئەوا یووسف مەکوژن بەڵکو بیخەنە ناو بیرێکی قووڵەوە, دوایی کاروانچی دێن دەیدۆزنەوەو دەیبەن.

بەمجۆرە ئەو پیلانەیان بەرامبەر یووسفی برا بچووکیان دانا کەهێشتا منداڵ بوو و باڵغ نەبووبوو, وەهیچ گوناهێکیشی نەبوو ئەوە نەبێت کەباوکی ئەوی زیاتر لەبراکانی خۆشتر دەویست. بەڵێ, هەر ئەو حەسوودیو ئێرەیی بردنە بووە دانانی ئەو پیلانو فێڵە بۆ یووسفو سەرەنجام ئەنجامیانداو خستیانە بیرەوەو دڵی باوکیان بریندار کردو لەتاوی یووسف چاوەکانی لەدەستداو چەندان ساڵ ئاسەواری ئەم جیاوازیخستنەی نێوان ئەو کوڕانەوە لەناو ئەو خێزانە بەڕێزەدا شوێنەواری خراپی بەجێهێشت.

جا لەبەر ئەوە دەبێ دایكو باوکە بەڕێزەکان ئەو ڕاستییە باش بزانن ئەگەر هەرچی ئامۆژگاریو ڕێنموونیی چاكو بەکەڵك پێشکەش بەمنداڵەکانیان بکەنو هانیان بدەنو بیانترسێنن, هیچ ئاکامێکی نابێت, ئەگەر پابەند نەبن بەدادگەریو یەکسانیی مادیو مەعنەوی لەنێوان منداڵەکانیاندا, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم ڕێسایەکی مەزنی بۆ داناوین لەچۆنیەتیی چاکبوون بۆ منداڵانو ملکەچ بوونیان بۆ دایكو باوکیان, کەئەویش دادگەریو یەکسانییە, فەرموون لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەمەدا:

ئیمامی بوخاریو موسلیم لەنەعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویانەتەوە کەنەعمان دەفەرموێ: من منداڵ بووم باوکم دەستی گرتمو بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم وا بەئاگاداری تۆ من بەندەیەکم هەبوو, وا پێشکەشم کرد بەم کوڕە بچکۆلەم. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: (أكُلُّ ولدَكَ نَحلتهُ مِثل هذا ؟!), واتە: ئایا هەموو منداڵەکانت وەکو ئەمەت پێبەخشیون؟! باوکم فەرمووی: نەخێر. حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرمووی: (لا تشهدني عَلى جَور), فەرمووی: دە کەواتە من مەکە بەشاهید لەسەر جەورو ستەم. پاشان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیه وسَلّم فەرمووی: (أيَسُرُّكَ أنْ يَكُونُوا إلَيْكَ في البِرِّ سَواءً), واتە: ئایا حەز ناکەیت کەهەموویان وەك یەك بۆت

باش بن؟ فەرمووی: بەڵێ حەزدەکەم هەموو ئەولادەکانم وەکو یەك بۆم باش بن, جا چی لەوە خۆشتر هەیە! حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَلا إذَنْ) کەواتە نابێ وا بکەیت! ئەگەر منداڵەکانت بزانن تۆ شت بەیەکیان دەبەخشیتو بەوی تریان نابەخشیت, ئەوا ئەوانیش ئامادە نابن چاکەت لەگەڵدا بکەن.

لەگێڕانەوەی ئیمامی موسلیمدا, دەفەرمویٚ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسلّم فەرمووی: ئایا ئەوەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ گوتی: نەخێر. فەرمووی: (إتَّقُوا اللهَ وَأعْدلُوا في أوْلادكُمْ), واتە: دەی لەخوا بترسنو دادگەر بنو بەیەك چاو سەیری منداڵەکانتان بکەن. نەعمان دەفەرمویٚ: ئیتر باوکم لەو بەخشینەی پاشگەز بۆوە.

لەگێڕانەوەی ئەلدارقوطنیدا, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (لَيْس مِثْلِي يَشْهَدُ عَلى هذا. إنَّ اللهَ تَعالَى يُحِبُّ أنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ أوْلادكُمْ, كَما يُحِبُّ أنْ تَعْدلُوا بَيْنَ أنْفسِكُمْ), واتە: کەسێکی وەك من نابێتە شاهیدی شتی وا, چونکە خوای گەورە حەز دەکات کەدادگەر بن لەنێوان منداڵەکانتاندا, هەروەك چۆن حەز دەکات لەنێوان خۆتاندا دادگەر بن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرمویٚ: (أعْدلُوا بَيْنَ أوْلادكُمْ في النَّحْلِ, كَما يُحِبُّونَ أنْ يَعْدِلُوا بَيْنَكُمْ في البِرِّ وَاللُّطْفِ)(رَواهُ إبنُ أبي الدُّنيا), واتە: لەشت بەخشین بەمنداڵەکانتان دادگەر بن لەنێوانیاندا, هەروەك چۆن حەز دەکەن لەچاکەو لوتفدا ئەوان لەنێوانتاندا دادگەر بن. بەواتەیەکی تر: چۆن حەز دەکەن هەموو ئەولادەکانتان بۆتان باش بن, ئێوەش بەیەکسانی چاکەیان لەگەڵ بکەنو فەرقیان مەکەن لەبەخشیندا.

خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هۆشیاری دەدات لەبارەی دادگەری لەماچکردنی منداڵی کورو کچدا.

ئیمامی بەیهەقی گێڕاویەتیەوە لەئەنەسەوە, کەپیاوێك لەخزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دانیشتبوو, کوڕێکی هات ماچی کردو لەسەر باوەشی خۆی داینا, پاشان کچێکی هاتو ویستی لەسەر باوەشی باوکی دابنیشێ بەڵام باوکی دەستی گرتو لەسەر باوەشی لایبردو لەتەنیشت خۆیەوە داینیشاند. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەم دیمەنە زۆر نارەحەت بوو, فەرمووی: (فَما عَدَلْتَ بَيْنَهُما) ئایا بۆچی دادگەر

نەبوویت لەنێوانیاندا؟! ئایا ئەو منداڵە تاوانی چیە کەنەتهێشت لەباوەشتدا دابنیشێ؟! تەنها تاوانی ئەوەیە کەکچە؟! ئایا نازانی ئەو منداڵە کچە چەند دڵی شکا؟ چۆن بەزەیی بەخۆیدا هاتەوە؟! چۆن هەستیکرد براکەی لای باوکی خۆشەویستره؟! کەئەمەش وادەکات ئەو کچە لەکاتی گەورەییشدا ئەو هەڵوێستەی باوکی لەیاد نەچێو ڕقی لەباوكو براکەیشی بێ!!

بەداخەوە هێشتا ئەو باوکانە لەکۆمەڵگای کوردەواریی موسڵمانی خۆماندا کەم نین کەپێیان شەرمە منداڵی کچیان لەباوەشیاندا دابنیشێ, بەڵام پێیان فەخرە کەمنداڵی کوڕ لەباوەش بگرنو ماچی بکەن, دەبێ بزانن کەپێغەمبەری خوا لەقیامەتدا بەتۆش دەڵێ: (فَما عَدَلْتَ بَيْنَهُما) ئەوە بۆچی دادگەر نەبوویت لەنێوانو کوڕو کچەکەتداو بەیەکسانی هەڵسوکەوتت لەگەڵدا نەکردنو سۆزو ڕەحمی خۆتت پێنەبەخشین؟!

کەواتە: هەرکەسێ جیاوازی لەنێوان منداڵەکانیدا بکات, تەنانەت لەماچکردنو لەباوەشگرتنو دانیشتنی مەجلیسدا با بزانێ ئەوە پێغەمبەری خوا لێی عاجزەو پێویستە زوو تەوبە بکاو دادگەر بێ لەنێوان منداڵەکانیدا..

طاوس دەفەرموێ: جیاوازیکردن لەنێوان منداڵاندا دروست نیە, تەنانەت لەکولێرەیەکی سووتاویشدا!!

دایكو باوکی ئیماندار: گوێ بگرە بۆ ئەم موژدە خۆشەی کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ئاراستەی دایكو باوکانێکی دەکات کە بەدادگەریو یەکسانی تەماشای منداڵەکانیان دەکەن.

ئیمامی موسلیم لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ( ڕەزای خوای لێ بێ ) گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنَ النُّورِ, الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وُلُوا).

واتە: دادپەروەران لەڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورەن لەسەر مینبەرانێك لەڕووناکی,ئەو دادگەرانەش ئەو کەسانەن کەدادگەرن لەفەرمانڕەواییو بڕیاری ڕاست دەدەنو دادگەرن لەناو خێزانو کەسوکاری خۆیانو ژێردەستەکانیاندا..

کەواتە: هەر دایكو باوکێك لەگەڵ منداڵەکانیاندا عادلو دادپەروەر بنو بەیەکسانی

تەماشایان بکەن‌و شتیان پێ ببەخشن، ئەوا دوو دەسکەوتی گەورەیان دەست دەکەوێ:

**یەکەم:** لەدنیادا منداڵەکانیان یەکتریان خۆشدەوێ‌و بوغزو حەسوودی لەنێوانیاندا دروست نابێ‌و ماڵێکی هێمن‌و ئاسوودە دروست دەبێ‌و، هەموویان وەکو یەك بەڕێزو بەحورمەتەوە تەماشای باوك‌و دایکیان دەکەن، چونکە دەزانن ئەوان جیاوازییان نەکردووە لەنێوانیاندا.

**دووەم:** لەڕۆژی قیامەتیشدا، لەو مەئسات‌و مەوقیفە نارەحەتییانەی ڕۆژی قیامەتدا، ئەو دایك‌و باوکانەی کە بەیەکسانی ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن، خوای گەورە لەمەترسییەکانی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان دەکات‌و لەسەر مینبەری نووری ڕوناکی دادەنیشن!

بەڵێ ئیماندارانی خۆشەویست، مافێکی زۆر گرنگی تری منداڵ ئەوەیە: کەباوك‌و دایك پێشەنگێکی چاك بن بۆ ئەولادەکانیان، لەبەر ئەوەی منداڵ وەك کاغەزێکی سپی وایە، هەر شتێ لەدایك‌و باوکیەوە ببینێ‌و ببیستێ لەسەر ئەو کاغەزە سپییە تۆمار دەبێ، بۆیە ئاینی ئیسلام زۆر گرنگیداوە بەوەی کەباوك‌و دایك زۆر خۆیان بپارێزن لەهەر ڕەفتارو گوفتارو کردارێکی ناشیرین لەبەرچاوی منداڵەکانیاندا. بەتایبەت درۆکردن، لەبەر گەورەیی‌و گرنگیی ئەم بابەتەیە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (مَنْ قالَ لصبِيّ تَعالَ هاكَ, ثُمَّ لَمْ يُعْطِهِ, فَهيَ كِذْبَة).

واتە: هەرکەسێ بەمنداڵێك بڵێ وەرە شتێکت بدەمێ‌و پاشان هیچی نەداتێ، ئەوە بەدرۆ لەسەری دەنووسرێ! بۆچی؟ چونکە ئەو منداڵە کەزانیی هیچیان نەدایە، ئەویش فێری ئەوە دەبێ کەجارێکی تر سیقە بەکەس نەکاو ئەویش بیەوێ کەسانی تر بخەڵەتێنێ‌و لەمەوە منداڵ فێری درۆکردن دەبێ، هەر بۆیە ئەو کەسە بەدرۆزن دادەنرێ کەبانگی منداڵ دەکات کەشتی بداتێ، بەڵام هەر بۆ خەڵەتاندنەو هیچی ناداتێ!

ئەبو داود لەعەبدوڵڵای کوڕی عامرەوە هێناویەتی، کەفەرموویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا لەماڵمان دانیشتبوو، دایکم بانگی کردم‌و فەرمووی: ڕۆڵە گیان وەرە با شتێکت بدەمێ، پێغەمبەری خوا بەدایکمی فەرموو: دەتەوێ چی بدەیتێ؟ دایکم

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێ خورمای بدەمێ بۆ خۆی بیخوا. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: ( أَمَّا إِنَّك لَوْ لَمْ تُعْطه شَيْئاً كُتِبَتْ عَلَيْك كذْبَة ), واتە: خۆ ئەگەر کاتێ منداڵەکەت بانگ کردو ئەویش هات بۆ لات بۆ وەرگرتنی ئەو شتەی کەگوتت دەتدەمێ, بەڵام هیچت نەدایە, ئەوا ئەو بانگ کردنە بەدرۆ لەسەرت دەنووسرا !

بەڵێ ئازیزان: ئەوە شتێکی زۆر بەڵگەنەویستە, کەهەر دایکو باوکێك ڕاستگۆبن, ئەوا منداڵەکانیانیشیان ڕاستگۆ دەردەچن, چونکە لەماوەی منداڵییاندا درۆیان لەدایکو باوکیان نەبیستووە

بەڵێ خۆشەویستان: ماوەی منداڵی ماوەیەکی زۆر هەستیارە بەنیسبەت منداڵەوە, بۆیە دەبێ هەوڵبدرێ زۆر بەپاکی بهێڵرێتەوەو چاکەو جوانی نەبێ نیشانی منداڵ نەدرێ, وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: ( إِفْتَحُوا عَلَى صِبْيانكُمْ أَوَّل كَلِمَة لا إِلهَ إِلاَّ الله, وَلَقِّنُوهُم عِنْدَ الْمَوْتِ لا إِلهَ إِلاَّ الله ) .

واتە: یەکەم شت کەزمانی منداڵەکانتانی پێدەکەنەوە با ( لا إِلهَ إِلاَّ الله) بێت, لەکاتی مردنیشدا ( لا إِلهَ إِلاَّ الله ) بەگوێیاندا بدەن .

عەبدولڕەزاقیش فەرموویەتی: سەلەفی صالح حەزیان لەوە بوو, یەکەم شت کەزمانی منداڵەکانیانی پێ بکرێتەوە, فێری (لا إِلهَ إِلاَّ الله)یان بکەن, کەمنداڵ فێر بکرێ حەوت جار لەسەر یەك بڵێ (لا إِلهَ إِلاَّ الله) بۆ ئەوەی زوبانی بەو وشە پیرۆزە ڕابهێنرێ. بەڵام زۆر جێگای داخو خەفەت خواردنە کەدەبینین زۆرێك لەموسڵمانان لەجیاتی ئەوەی کەزمانی منداڵەکەی بە (لا إِلهَ إِلاَّ الله) بکاتەوە, هەر لەسەرەتاوە فێری جوێنو قسەی ناشیرین بەموبەوی دەکەنو فێری دەکەن تف لەخەڵکی بکات! ! خۆ بێگومان پێشینانیشمان فەرموویانە: (خووی شیری هەتا پیری)!

ئیمانداران: بەڕاستی هەرکەسێك بەدەم منداڵەکانیەوە بێتو یارمەتییان بدات بۆ چاکەکاریو دوورخستنەوەیان لەحەرامو خراپەکاری, ئەوە خوای گەورەش یارمەتیی ئەو دایکو باوکە دەدات, هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دوعای بۆ باوکان دەکرد, کەخوای گەورە سۆزو بەزەییو ڕەزامەندیی خۆی بەسەریاندا برژێنێت بەهۆی ئەوەی کەیارمەتیی منداڵەکانی خۆیان دەدەن.

ئبن حەبان گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (رَحِمَ اللهُ والِداً أعانَ وَلَدَه عَلى بِرِّه)، واتە: خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی بەباوکێك بکات کەیارمەتی منداڵەکەی دەدات لەسەر چاکەکاری.

طەبەرانیش گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم فەرموویەتی: (أعِينوا أوْلادَكُمْ عَلى الْبِرِّ، مَنْ شاءَ إسْتَخْرَجَ العُقُوقَ مِنْ وَلَدِه)، واتە: یارمەتی منداڵەکانتان بدەن بۆ چاکەکردن، کەسێك بیەوێ سپڵەیی‌و لاساری لەمنداڵەکەیدا لادەبات!

کەواتە: ئەمە موژدەیەکی خۆشە بۆ ئەو دایك‌و باوکانەی کەئەولادی خراپ‌و لاساریان هەیە، با قەت وا نەزانن کەئەم منداڵە خراپانەیان هەرگیز چاك نابن، بەڵکو پێغەمبەری خوا موژدەی داو فەرمووی: (مَنْ شاءَ إسْتَخْرَجَ العُقُوقَ مِنْ وَلَدِه) هەرکەسێ حەزی لێ بێ‌و هەوڵ بدات ئینشائەڵڵا خوای گەورە یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی لاساری‌و بێگوێیی لەمنداڵەکەی لابەرێ، ئەمەش بەدانایی‌و ئامۆژگاریی نەرم‌و چاك‌و چاکەکردن لەگەڵ منداڵ‌و کاتی درێژ فەراهەم دێت .

وەلەم خاڵەوە مافێکی‌تری منداڵ دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە: دوورکەوتنەوە لەزۆر سەرزەنشتکردن‌و ڕەخنەگرتن لەمنداڵ، هەروەکو لەسیرەت‌و ژیاننامەی پێغەمبەری خوادا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەیخوێنینەوە کەحەزرەت (عَلَيْه الصَّلاةُ والسَّلام) هەرگیز پەنای نەدەبردە بەر سەرزەنشت کردن‌و لۆمەکردنی منداڵ، ئەوەتا (ئەنەس) ماوەی دە ساڵی بەردەوام لەسەریەك خزمەتی پێغەمبەری خوا دەکات، ئەنەس دەفەرموێ: لەماوەی ئەو دە ساڵەدا، هەر کارێکم کردبێ نەیفەرمووە بۆ کردت؟ وەهەر کارێکیش نەمکردبێ نەیفەرمووە بۆ نەتکرد! خۆ ئەگەر یەکێکیش لەخاووخێزانەکەی سەرزەنشتیان بکردمایە، دەیفەرموو: (دَعُوهُ فَلَوْ قُدِرَ - أو قالَ - لَوْ قُضِيَ أنْ يَكُونَ كانَ)، واتە: وازی لێبێنن، ئەگەر قەدەری خوا وا بوایە کەببێ دەبوو.

هەروەها جارێکیان کابرایەك لەخزمەت پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم زۆر لەکوڕەکەی تووڕە دەبوو، زۆر لۆمەی دەکردو سەرکۆنەی دەکرد، حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بەباوکی منداڵەکەی فەرموو: (ئەوەندە سەرکۆنەی مەکە، کوڕەکەت تیرێکی کەوانەکەی خۆتە). کەواتە: کاتێك باوك یان دایك زۆر لۆمەو سەرکۆنەی منداڵەکەی

دەكاتو بۆ هەموو شتێ كەبیكات هەر پێی نارازییە, ئەوە لەڕاستیدا ڕەخنەو عەیبوعار لەخۆی دەگرێ, چونكە ئەو منداڵە لەو بووەو پەروەردەكراوی دەستی خۆیەتی, لەجیاتی ئەو لۆمەو سەرزەنشت كردنە, باشتر وایە كەپەلە بكات بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵەكانیو پەروەردەیەكی ڕاستودروستی بكات.

زانای بەناوبانگ شەمسوددینی ئەنبابی لەكتێبەكەیدا (رِياضَة الصبيان وتَأديبِهِم)دا فەرموویەتی: نابێ لەهەموو كاتێكدا, وەلەسەر هەموو قسەو هەڵسوكەوتێ, لەمنداڵ تووڕە ببیو سەركۆنەی بكەی, چونكە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی كەبێگوێبیو لاساریو ئەنجامدانی كاری ناشیرین لای ئەو منداڵە ببێ بەشتێكی ئاسایی.

یەعنی منداڵ هەر یەك دوو جار یان تا ماوەیەك بەلایتووڕەبوونو لێدانو سەرزەنشتكردن عاجز دەبێو بێدەنگ دەبێو دەست لەكاری درێو هەڵدەگرێ, ئیتر لەوەودوا چاوی دەكرێتەوەو شەرمی نامێنێو هەرچی پێ بگوترێو پێی بكرێ بەخەیاڵیدا نایەتو لەخراپە نایگێڕێتەوە.

بەڵێ بەڕێزان, بەكارهێنانی توندوتیژی بۆ ڕاستكردنەوەی ڕەوشتی منداڵ, كارێكی زۆر خراپە, چونكە دوو حاڵەت هەیە, یان ئەو منداڵە كەسیەتی بەهێزە یان كەسیەتی لاوازە, ئەگەر كەسیەتیی منداڵەكە لاواز بوو, ئەوا ئەگەر لێدانو زەبرو هێزی لەگەڵدا بەكارهێنرا, ئەوا ئەوەندەیتر كەسیەتی لاواز دەبێت, ئینسانێكی ترسنۆكی لێ دەردەچێت, بۆ جێبەجێكردنی ئیشوكارو پێداویستییەكانی خۆی درۆ دەكات, فێڵ دەكات, هەموو دونیا بەدوژمنی خۆی دەزانێ, هەموو كارێكی خۆی بەهەڵە دەزانێ, حەز ناكات كەس پێی بزانێ, چونكە لەمنداڵیدا لەسەر هەموو شتێك لۆمەیكراوە.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر كەسیەتی منداڵەكە بەهێز بوو, وەتوندیو لێدانو تووڕەبوونو لۆمەكردنی لەگەڵدا بەكارهێنرا, ئەوا ئەو منداڵە یاخیو چاوقایمو دڵڕەق دەردەچێت, دژی خۆیشی نەك هەر دژی دایكو باوكی, بەردەوام لەشەڕو فیتنەدا دەژیو دەبێ باوكو دایك باجەكەی بدەن.

ئیماندااران: خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً ﴾(الأحزاب 21),

جا با بزانین پێغەمبەری خوا وەکو بەخێوکەرێك چۆن بووە؟ تاوەکو ئێمـەش چـاوی لێ بکەین‌و شوێن سوننەتی ئەو بکەوین.

جارێکیان ئافرەتێـك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صَلّی اللهُ عَلَیـه وَسَلّم منـدالَێکی تەمەن دە سەلانەی لەگەڵدا بوو, فەرمووی: یا رَسولَ الله حەزدەکـەم ئـەم منداڵـە لـەماڵی تۆدا پەروەردە ببێت‌و لەڕەوشتی پاك‌و بەرزی تـۆوە ڕەوشـت وەرگـرێ‌و خزمـەتت بکـات‌و ئیشوکاری ماڵەوەو بازاڕتان بۆ جێبەجێ بکـات! ئـەو منداڵـە بەختـەوەرە نـاوی ئەنەسـی کوڕی مالیك بوو. پێغەمبەری خوا قبووڵی کردو لای خۆی هێشتیەوە, بەتەمەنی دە سـاڵی ئەنەس چووە ماڵی پێغەمبەری خوا, ماوەی دە ساڵ لەوێ مایەوە تا تەمەنی بو بـە (20) سـاڵ پێغەمبـەری خـوا لەخۆشەویـستیدا بـە (ئونـەیس) بـانگی دەکـرد, کەئـەوە لـەڕووی دەروونییەوە زۆر گرنگە بۆ بەرامبەر, بزانی حەز بە چ ناوێك دەکات, تۆ بەو ناوە یـان بـەو نازنـاوەوە بـانگی بکـەی, ئـــەوە ڕەحمـــــەت‌و خۆشەویـــستی‌و ســـۆز لـــەنێوان هـــەردوولادا دروست دەکات.

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم هەندێ پارەی دا بەئەنەس‌و فـەرمووی: بـڕۆ پـەنیرم بـۆ بکـڕە, ئەنـەس ڕۆیـشت‌و هـەر نەهاتـەوە, لەبـەر ئـەوەی ئـەم منداڵـە ئەمانەتێکیشە لای پێغەمبەری خوا چوو بۆ سۆراغی, کاتێ دەبینێ وا لەسەری کۆلانەکـەدا لەگەل منـدالان یاری‌دەکات پێغەمبـەری خـوا فـەرمووی: (أُنَیْسْ, أُنَیْسْ أیْنَ الإقْـط ؟!) فەرمووی: نەسەکە, نەسەکە, ڕۆڵە کوانێ پەنیرەکە, بۆت نـەکڕیم؟! منداڵەکـە لەشـەرمان وڵامی نەدایەوە رَسولُ الله تەماشـای دەم‌وچـاوی کـردو لێـی تێگەیـشت, بۆیـە فـەرمووی: (أضَیَّعْتَ الدَّراهِمَ؟!) فەرمووی: ڕۆڵە ئەوە پارەکانت بزر کـرد؟! منداڵکـە گـوتی: (نَعَمْ یـا رَسُولَ الله) بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بزرم کردن.

موسڵمانی بەڕێز: دە وەرە ئێستا ئـەم نموونەیـە بەسـەر خۆمانـدا جێبـەجێ بکـەین! پارە بدە بەکوڕەکەت‌و بزری بکات‌و وەختێ بچی بەدوویدا تەماشا بکەی یاری دەکـا, ئایـا هـەر بەشـەق‌و زللـەو قـسە پـێ گوتن نایهێنیتەوە ماڵەوە؟! بەلام با بـزانین پێغەمبـەری ســـەروەرو ســـالارمان چـــی فـەرموو:مامۆسـتای مرۆڤایـەتی فـەرمووی: ڕۆڵـە گیـان نەسەکە, خەفەت مەخۆ بەوەی کەپارەکانت بزرکردووە (یَأْتي اللهُ بِخَیْرٍ منها) خەمت نـەبێ

ئینشائەڵلا خوای گەورە لەوە باشترمان دەداتەوەو پارەی ترمان بۆ دەنێرێ (أَكْمِلْ لَعْبَكَ وَٱلْحقْني بِالْبَيْتِ) یارییەکەت تەواو بکە پاشان وەرەوە بۆ ماڵەوە!!

توخوا ئەمە بەکێ دەکرێ بەو سەرکردە بێوێنەیە نەبێ؟! بەو خَاتَمُ الأنْبِيَاء وَٱلْمُرْسَلِينَ نەبێ؟!

دەی برای موسڵمانم، ئەی دایکی بەڕێز: خۆ تۆش ئومەتی ئەو محمدەی صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم، دەی تۆش ئاوا پەروەردەی منداڵەکەت بکەو بەلۆمەکردنی ڕادەبەدەرو سەرزەنشتو شکاندنەوەی منداڵەکەت بەتایبەت لەبەرچاوی منداڵانی هاوڕێی شەخصیەتی منداڵەکەت لەناو مەبەو تووشی گرفتی دەروونیی مەکە

خۆشەویستان: یەکێکی تر لەمافەکانی منداڵ ئەوەیە بەدەم مافەکانیەوە بچین. کاتێك منداڵ قسەیەکی حەقی کردو پێشنیارێکی جوانی دەربڕی، دایكو باوكو ئەوانەی لەخۆی گەورەترن گوێیان بۆ گرتو بەقسەیان کرد ئەو کاتە لەدەروونی ئەو منداڵەدا هەستێکی جوانو ئیجابی بەرامبەر ژیان دروست دەبێتو، فێردەبێت کەژیان وەرگرتنو بەخشینە، هەروەها مەشق پێکردنو ڕاهێنانی منداڵیشە لەسەر ملکەچ بوون بۆ حەق، چونکە دەبینێ دایكو باوكو کەسانی گەورەی دەوروبەری حەق قبوول دەکەنو گوێی بۆ دەگرن، ئەو کاتە ئەو منداڵە توانای ئەوەی بۆ دروست دەبێ کە لەناخو دڵیدایەو بەحەقو ڕاستیو بەمافی خۆی دەزانێ بیڵێو هیچ دوودڵیو ترسێکی پێوە دیار نەبێ، چونکە دەزانێ گوێی لێدەگیرێو بەقسەیشی دەکرێ. بەڵام بەپێچەوانەوە منداڵ کەهەستیکرد هەرچییەك بڵێ، با ڕاستو حەقیش بێ، دایكو باوكو گەورەکان گوێی بۆ ناگرنو ڕێز بۆ قسەکەی دانانێن، ئەوا ئەو منداڵە خەفە دەبێو هەست بەلاوازیی خۆی دەکاتو لەگەورەییشدا ناتوانێ بیرو بۆچوونەکانی خۆی بەسەربەستی دەربڕێ.

باابزانین پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چۆن مافی ڕادەربڕینی منداڵی پاراستووە!

ئیمامی بوخاریو موسلیم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەسەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خـــوای لێبێـــــت) گێڕاویانەتـــەوە کـــەجارێکیان خواردنەوەیـــەکیان بـــۆ پێغەمبەری خوا هێنا، ئەویش لێی خواردەوە، لەو کاتەدا منداڵێك لەلای ڕاستیەوە

دانیشتبوو, لەلای چەپیشیەوە کۆمەڵێ پیاوی بەساڵداچوو دانیشتبوون, پێغەمبەری خوا دوای ئەوەی کە لەخواردنەوەکەی خواردەوە بەرماوەی پیرۆزی خۆی بەرەو لای منداڵەکە برد کە لەلای ڕاستیەوە بوو. فەرمووی: (أتَأْذَن لي أنْ أُعْطي هَؤلاء؟), ئەی منداڵی جوان ئایا مۆڵەتم و ئیجازەم دەدەیت جارێ خواردنەوەکە بدەم بەو پیاوانەی لای چەپم؟! منداڵەکە گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا بەشی خۆم لەبەرماوەی تۆ بەکەسی تر نادەم. ئەمجا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم جامەکەی دایە دەست منداڵەکەو بەرماوەی پێغەمبەری خواردەوە!!

بەڵێ بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا, ئەم مافەی ئەم منداڵەی نەفەوتاندو هەر لەبەر ئەوەی منداڵەو پیاوی بەتەمەن لەمەجلیسەکەدا ئامادەن بەڵکو مۆڵەتی لەمنداڵەکە خواست, بەڵام منداڵەکە دەستی لەو مافەی خۆی هەڵنەگرت, بەڵکو کەسی تری بەسەر خۆیدا هەڵنەبژارد بۆ خواردنەوەی بەرماوەکەی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستی, پێغەمبەری خواش جاماکەی دایە تا بیخواتەوەو شاد ببێت بەبەهرەمەندبوون بەمافی ڕەوای خۆی!

بەڵێ خۆشەویستان, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم فێری کردووین و ڕێنمایی کردووین کەحەق لەمنداڵی بچووك قبووڵ بکەین بەبێ هیچ خۆ بەگەورەگرتن و لووت بەرزییەك بەسەر منداڵدا.

ئبن عەساکرو دەیلەمی لەئبن مەسعوودەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویانەتەوە کەفەرموویەتی, عەرزی پێغەمبەری خوام کرد, کەچەند وشەیەکم فێربکە سوودی زۆری تێدا کۆببێتەوە, واتە وشەکان کەم بن بەڵام لەماناشدا زۆر سوودمەند بن. خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أُعْبُدُ اللهَ وَلا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئاً) خوا بەحەق بپەرستەو هیچ شتێك مەکە بەشەریك و هاوبەشی, (وَزِلْ مَعَ الْقُرآنِ أيْنَما زال) لەگەڵ قورئاندا بە لەهەر کوێیەکدا بوو, هەرچی قورئان فەرمووی هەر ئەو جێبەجێ بکە, (وَأقْبِلِ الْحَقَّ مِمَّنْ جاءَ بِهِ صَغيراً أوْ كَبيراً) وەهەق قبووڵ بکە, جا ئەو حەقە هەرکەس هێنابێتی و گوتبێتی, گەورە بێت یان بچووك (وَإنْ كانَ بَغيضاً بَعيداً) با ئەو کەسەی قسەی حەقەکەت پێ دەڵێ کەسێکی بێگانەش بێ و کەسێك بێ ڕقیشت لێی بێ (وَرُدِّ الْباطِلَ مِمَّنْ جاءَ بِهِ صَغيراً أوْ

كَبيراً وَإِنْ كانَ حَبيباً قَريباً) فەرمووی: شتی ناڕەواو نابەجێو باطلیش وەرمەگرەو وازی لێ بێنەو بیدەرە دواوە, جا هەرکەس گوتبێتیو هێنابێتی, بچووك بێت یان گەورە, با ئەو کەسەی ئەو قسەو کردەوە نابەجێو بەتاڵە دەکاو دەڵێ کەسێك بێ خزمت بێو نزیكو خۆشەویستیشت بێ! !

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم فەرموودانەدا بووە کەسەلەفی صالح, قسەی جوانو ڕاستو حەقیان لەمنداڵی بچووکیش قبوولکردووەو گوێیان بۆ گرتووە با هەرچەندە تەمەنی منداڵەکەش بچووك بێ.

بۆ نموونە ئیمام ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) جارێکیان بەڕێگایەکدا دەڕۆیشت, چاوی بەمنداڵێك کەوت یاریی بەقوڕ دەکرد, ئیمام ئەبو حەنیفە بەمنداڵەکەی فەرموو: ڕۆڵە گیان, وریابە نەکەویتە ناو قوڕەکەوە دوایی هەموو لەشو جلوبەرگەکەت پیس دەبێتو دایکت لێت دەدات. منداڵە بچکۆلەکە سەری هەڵبڕیو ئیمام ئەبو حەنیفەی ناسیو بەئیمامی گەورەی گوت: ئەی ئیمام من بشکەومە قوڕەکەوە گرنگ نیە چونکە دایکم جلوبەرگەکەم بۆ دەگۆڕێو ئەوپەڕی لێم توورە دەبێت, دوایی دڵی چاك دەبێتەوەو منیش خاوێن دەبمەوە, بەڵام ئەی پێشەوای موسڵمانان, تۆ وریای خۆت بە نەکەوی! چونکە تۆ پێشەواو چاوساغی خەڵکی, ئەگەر تۆ لەڕێگای ڕاست لابدەی, هەموو خەڵکی شوێنت دەکەونو کەوتنی زانایەك, کەوتنی جیهانە, عالمێك عالەمێکە! ! ئاگاداربە لەڕێگای دین لانەدەیو نەچیتە قوڕاوی بێدینەوە, چونکە ئەو کاتە خەڵکیش بەهۆی تۆوە گومڕا دەبنو سەرەنجام خوا لێت عاجز دەبێ!

ئیمام ئەبوحەنیفە کەئەو قسە بەجێو پڕ حیکمەتەی لەو منداڵە بیست, دڵی هەژا, لەشی لەرزی, پاش بیستنی گوتەی ئەو منداڵە بچووکە, هیچ فەتوایەکی دەرنەکرد تا یەك مانگی تەواو لەگەڵ قوتابییەکانیدا لێی نەکۆڵیایەوەو تاوو توێی نەکردایە!

جارێکی تریان, هەر ئیمام ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەشوێنێکدا دەڕۆیشت, ئاگای لێنەبوو پێی نا بەقاچی منداڵێکی بچووکدا. منداڵەکە گوتی: یاشێخ ئەوە لەتۆڵە سەندنەوەی ڕۆژی قیامەت ناترسیت وا پێت نا بەقاچمداو ئازارتدام, نازانی خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا حەقی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵێ. ئیمام ئەبو حەنیفە بەم قسە

بەهێزو حەقەی لەو منداڵەی بیست هەموو لەشی لەرزیو بووڕایەوە!

هەروەها زاناو دانای بەناوبانگی ئیسلام (شێخ سری سقطي) منداڵ بوو لەخزمەت مامۆستاکەیدا قورئانی پیرۆزی دەخوێند, کاتێ گەیشتە ئەم ئایەتە کەدەفەرموێ:﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْداً ﴾(مریم 86), گوتی: مامۆستا گیان (وِرْداً) مانای چیە؟ مامۆستاکەی گوتی: نازانم. پاشان گەیشتنە ئایەتی ﴿ لا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْداً ﴾(مریم87) گوتی: مامۆستا ئەی (عَهْداً) چیە؟ مامۆستاکە گوتی: نازانم. سری سقطي فەرمووی: مامۆستا گیان هەرچەندە قسەکەشم بێئەدەبییە بەڵام توخوا تۆ کەبۆ خۆت هیچ لەقورئان نازانیت بۆ بەمنداڵی خەڵکی دەڵێی؟ مامۆستاکە بەم قسەیە تووڕە بوو زللەیەکی لێدا. سری فەرمووی: مامۆستا گیان نەزانینەکەت بەس نەبوو, ستەمو زوڵمیشت خستە پاڵ؟! مامۆستا بیری لەم قسەیە کردەوەو داچڵەکاو داوای لێبوردنی لەمنداڵەکە کردو لای خوای گەورە تۆبەی کردو شەرتی کرد تاوەکو بۆ خۆی باش فێر نەبێ خەڵکی تر فێر نەکاو خۆی لەمنداڵی خەڵکی نەکات بەمامۆستا, ئەمجا وازی لەمامۆستایەتی هێناو دەستی کردەوە بەخوێندنو هەمیشە دەیفەرموو: ئەو منداڵە ژیرە حەق گۆیە کە (شیخ سری سقطي)یە, منی لەنەفامیو نەزانی ڕزگارکرد!

زانای ناوداری ئیسلام حوسەینی کوڕی فەزڵ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێ منداڵ بوو, چوو بۆ خزمەت هەندێ لەخەلیفەکان, لەو کاتەدا خەلیفە ژمارەیەکی زۆر زاناو داناو پیاوماقوڵی لەلابوو, ئەمیش منداڵێکی زیتەڵەو ژیرو بوێر بوو, حەزی کرد هەندێ قسە لەگەڵ خەلیفەدا بکاتو هەندێ کەموکوڕیو داواکاریی منداڵان هەبوو بیخاتە ڕوو, تاوەکو خەلیفە چارەسەریان بکات, بەڵام خەلیفە لێی تووڕە بوو, گوتی: تۆ منداڵی, چۆن شەرم ناکەی لەبەردەم ئەم هەموو زانایەدا قسە دەکەی؟!

حوسەینی تەمەن منداڵ گوتی: ئەی خەلیفە خۆ ئەگەر منداڵیش بم, ئەوا خۆ لەپەپوسلێمانە (هُدْهُدْ) کەی حەزرەتی سولەیمان بچووکتر نیمو, تۆش لەحەزرەتی سولەیمان گەورەتر نیت, کاتێ پەپوسلێمانە پێی گوت: ﴿ أَحَطْتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ ﴾ (النمل 22), واتە: ئەی سلێمان ئەوەی من پێم زانیوە تۆ پێت نەزانیوە.. حەزرەتی

سولەیمانیش گوێی بۆ قسەکانی ئەو باڵندە بچووکە گرتو بەقسەشی کرد. جا کەواتە ئەی تۆ بۆ ناهێڵی من قسەت لەگەڵدا بکەمو ئەوەی تۆ نایزانیو من دەیزانم پێت بڵێم؟!

تەبعەن دەلیلەکەی زۆر بەهێز بوو, بۆیە خەلیفە بێدەنگ بوو, پاشان گوتی: ئەی منداڵ فەرموو قسە بکەو گوێمان لێ گرتووی!

بەڵێ ئیمانداران, ئەم دینەی ئێمە ئاوا بڕوای بەئازادیی ڕادەربڕین هەیەو ئاوا هانی خەڵکی دەدا کەنەترسو بوێر بن بۆ گوتنی حەقو ڕاستییەکان, وەفەرموویەتی دەبێ منداڵ لەتەمەنی منداڵییەوە فێری ئەوە بکرێ کە لەئاستی حەقو ڕاستیو ڕاستکردنەوەی هەڵەی ناو کۆمەڵگا, جا هەرکەسێ ئەو هەڵەی کردبێ بێدەنگ نەبێ, وەژیریو بیرتیژیی منداڵ کپ نەکرێ, وەئیسلام ئاوا دەسەڵاتدارانو گەورەو زانایان فێردەکات کەخۆیان بەگەورە نەگرنو گوێ بۆ قسەی هەموو تاکێکی گەلەکەیان, تەنانەت ئەگەر منداڵێکی بچووکیش بێ, بگرن بۆ ئەوەی خەڵکی هەر لەمنداڵییەوە فێری ئازادیی ڕادەربڕینو حەق گوتنو ڕەخنەی بنیاتنەرانە گرتن بێنو دیکتاتۆریو بەڵێ قوربانی بێجێ لەناو کۆمەڵگای موسڵماندا دروست نەبێ!

بەڵام بەداخەوە ئێمە وەکو موسڵمان کەخاوەنی ئەم مەنهەجە جوانەین, بەقسەی ناکەینو غەیرە موسڵمانەکان لەئیسلامەکەی ئێمەوە وەریان گرتو پێی بەختەوەر بوونو دیکتاتۆریەتیان لەناودا کەم بۆوەو هەموو کەس فێری ڕادەربڕینی سەربەستانە بوو, بەتایبەت منداڵ, ئێستاش وا هەر دینەکەو بەرنامەکەی خۆمانە, ناوێکی تریان بۆ لێناوینو دەیانەوێ بەمنەتەوە بماندەنەوەو خۆیانمان لێبکەن بەمامۆستا, بەڵام هەتا ئەم دینە جێبەجێ دەکراو ئەو پیاوە تێگەیشتوانەی ئیسلامو ئەو منداڵە چاوگوشە گوێ ئاودراوانەی بەقورئان تێگەیەندرابوون لەناو کۆمەڵی موسڵماندا بوون, ئێمە مامۆستا بووینو خەڵکی لەئەوەروپاوە دەهاتن فێری دەرسی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو مافی منداڵ لای مامۆستایانی موسڵمانو کتێبە ئیسلامییەکان دەبوون.

بەڵێ خۆشەویستان: زانایانی دەروونناسی (عِلم النَّفس) دەڵێن: زورجار دیمەنێکی ناشیرین, یان دەنگێکی بەرز کاردەکاتە سەر ئەو منداڵە, چەندین ساڵ ئەو تووڕەبوونو دەنگ بەرزکردنەوە بەسەر ئەو منداڵەدا کاریگەریی خۆی دەبێت, منداڵ

مەخلووقێکی زۆر ناسکە, زۆر حەساسە, ئەمە بۆچوونی ئیسلامە بەرامبەر بەمنداڵ, دەبێ ئاوا ڕێزی لێ بگیرێ, بەڵام کەلەم سەردەمەی ئەمڕۆ کە بەحیساب پێی دەڵێن: سەردەمی مافی منداڵ, دەکۆڵیتەوەو لێی ورد دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێ کاتێ قانوونی خوا حاکم نەبوو, منداڵ پێش هەموو کەس زوڵمی لێدەکرێ. لەڕاپۆرتێکی (UNICEF)دا دەڵێت: کەئێستا دووسەد هەزار منداڵ چەکیان هەڵگرتووەو زۆربەیان لەئەمریکای لاتینن (ئەمریکای خواروو), لەشەڕدا بەکاریان دەهێنن کەتەمەنیان (12 و 13 و 14) ساڵە, لەسریلانکا (دوورگەی سیلانی ئەوسا) دەفرۆشرێن, لەزۆر وولات لەتەمەنی (12) ساڵییەوە ئیشیان پێدەکەن, وەك چۆن داوا لەکەسێکی تەمەن هەژدە ساڵ دەکەن هەشت سەعات ئیش بکات, ئاوا ئەو منداڵانەش هەشت سەعات کاردەکەن. لەبەڕازیل منداڵ بەپارە بەکرێ دەگرن‌و منداڵی‌تریان پێ دەکوژن! ! لەووڵاتی چین قانوونێك هەیە دەڵێ: دانیشتووی شارەکان نابێت لەیەك منداڵ زیاتریان هەبێت, ماڵی وا هەیە حەزدەکات منداڵی زۆر بێت, لەبەر ئەوە ئەم منداڵە کە لەدایك دەبێت کە بەپێی قانوون دەبوایە لەدایك نەبوایە, ناتوانرێ بەرێ بکوترێ, ناتوانرێ ناوی تۆمار بکرێ, ناتوانرێ بخرێتە باخچەی ساوایان‌و پاشان قوتابخانە, باوکەکەی بەهۆی ئەم منداڵەوە ناتوانێ کۆبوونی خواردنی زیاد وەرگێ! لەبەر ئەوە ئەم منداڵە بێبەش دەبێ لەهەندێك ماف, مافی تەداوی, مافی خوێندن, ئێستا لەجیهاندا (9) ملیۆن منداڵی وا هەیە! !

خۆشەویستان: لەکۆتایی ئەم ووتارەشدا, ئەم فەرمووده بەرزو بەڕێزەی پێغەمبەری خواتان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بیر دەهێنمەوە کەپێوانەیەك بۆ ناسینی ئینسانی چاك‌و چاکەخواز, بۆ ناسینی ئینسانی مەردو گەورە, جا با هەریەکەمان بەو پێوانەیە خۆمان بپێوین بزانین لە چ ئاستێکداین!

خۆشەویستمان, تاجی سەرو نووری چاومان, چاوساغی دونیاو قیامەتمان دەفەرموێ: (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِه, وَأَنا خَيْرُكُمْ لأَهْلي), واتە: چاکترین‌و بەڕێزترین کەستان, مەردترین‌و پیاوترین کەستان ئەو کەسەیە کەبۆ ماڵ‌و منداڵی خۆی باش بێ. وەفەرمووی: من کەپێغەمبەری خوام, چاکترین کەسم بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆم!بەڵام ئیماندارانی بەڕێز, لەگەڵ ئەم پێوانە جوان‌و بەرزەی کەخۆشەویستمان بۆ جیاکردنەوەی ئینسانی چاك

لەخراپو، ئینسانی بەڕێز لە بێ ڕێزو، ئینسانی مەرد لەنامەرد، داناوە، کەچی هێشتا پیاوانێك هەن، باوکانێك هەن، کەخاوەنی ژنو منداڵن، لەوانەیە زۆربەیان ئەهلی مزگەوتو جومعەو جەماعەتیش بن، هەیانبێ حاجیو شێخو مەلا بێ، کەوا بیردەکەنەوەو وا تێگەیشتوون کەپیاوی پیاوانەو بەجەزرەبەو سامدار ئەو کەسەیە کەهەر کاتێ هاتەوە ماڵەوە، ژن لەترسان نەزانێ چۆن بجوولێتەوە، منداڵ میز بەخۆیدا بکات کاتێ باوکی تەماشای کرد، هەرگیز منداڵی خۆی لەباوەش نەگرێو ماچی نەکات! قەت بەدەمیانەوە پێنەکەنێو دوو قسەی خۆشیان بۆ نەکات! هەروەکو ئەم کابرایەی کە لەزەمانی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابدا، بەم شێوەیە بیریدەکردەوە:

مـــێژووی ئیسلام بۆمــــــان دەگـــێڕێتەوە کە: جارێکیان یەکێك لەوالیی شارە گەورەکانی ئەو کاتەی جیهانی ئیسلامی، دێت بۆ شاری مەدینەی مونەوەرە بۆ خزمەتی خەلیفەی موسڵمانان حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت)، بۆ ئەوەی بارودۆخی ئەو شارەو پێویستیو داواکاریی خەڵکی شارەکەو کێشەو کەموکوڕییەکانی بخرێنە بەرچاوی خەلیفەی موسڵمانانو چارەسەری پێویستیان بۆ دابنرێ. لەو کاتەدا کەخەلیفە عومەر لەگەڵ کابرای والیدا قسەی دەکرد، منداڵەکانی کەتەمەنیان بچووك بوو، دەچوونە سەر شانو ملی حەزرەتی عومەرو مێزەرەکەیان لەسەری دەکردەوەو ڕیشیان ڕادەکێشاو بەبەردەمیدا ڕایان دەکرد! کابرای کاربەدەست ئەمەی بەلاوە سەیر بوو، بەسەرسووڕمانەوە بەحەزرەتی عومەری گوت: ئەوە چیە ئەی خەلیفەی موسڵمانان، ئەوە بۆچی زللەیەکیان لێنادەی، پێم سەیرە منداڵ دەتوانێ پڕ بەچاوی سەیرت بکات!! حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی برای بەڕێز، ئەی کاربەدەستی موسڵمانان! ئەی جەنابت لەماڵەوە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکانی خۆتدا دەکەیت؟! کاربەدەستەکە گوتی: قوربان، خەلیفە سەلامەت بێ، بەخوا سامو هەیبەتێکم هەیە، هەر کەدێمە ماڵەوە، هەرکە لەدوورەوە تەقەی پێڵاوەکانم دێ، چ ژن، چ منداڵم، ئەوەی بەپێوە بێ لەترسان دادەنیشێ، ئەوەی پێشتر قسەی کردبێ، کەچاوی بەمن کەوت لەقسەکردن دەوەستێو، تا لەماڵەوەم گوێم لەدەنگی منداڵێکم نییە، وەهەر قسەیان لەگەڵدا ناکەم، با سامو هەیبەتم لەلایان نەڕوات!! وەکاتێ لەماڵەوەم تا من نەخەوم کەس ناتوانێ قاچ

ڕاكێشیێو ئەوەشی پێشتر خەوتبێ كەمن لەماڵەوە نیم، كەزانی من هاتوومەوە لەجێگا دێتە دەرەوەو ناتوانێ بخەوێ! وەمن دە منداڵم هەیە تا ئێستا دەمم بەڕوومـــەتی هیچیان نەكەوتووە ! !

حەزرەتی عومەر كەئەم قسانەی لەو كاربەدەستە بیست، هەموو لەشی گەرم داهات، دڵی كوڵا، دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمانو فەرمووی: ئەی خوای پەروەردگار هەزاران شكورو سوپاس بۆ تۆ كەئەم كاربەدەستەت هێنایە بەردەستم كە بەدەمی خۆی ئاوا خۆیم پێ بناسێنێو شیاویو ناشیاویی خۆیم بۆ دەربخات كەبكرێ بەكاربەدەستی مـوسڵمـانان. پاشـــان ڕووی لەكابرای كاربەدەست كردو فەرمووی: لەم ساتەوە تۆ لەكاربەدەستی لادرای، هەر كەلەم دەرگایە چوویتە دەرەوە دەچیتەوە بۆ ماڵی خۆت لێی دادەنیشی، چونكە تۆ ئەوەندە دڵڕەقانەو نەفامانە لەگەڵ ماڵومنداڵی خۆتدا ڕەفتاربكەی كەجەرگو خوێنی خۆتن، ئەی قوڕ بەسەر ڕۆڵەی ئەو میللەتەی كەتۆ حاكمو فەرمانڕەوایان بیت، چۆن بتوانن بێنە لاتو دوو قسەت لەگەڵدا بكەنو سكاڵایەكی حاڵی خۆیان بكەن، ئەم ئیسلامە ئازیزە كەخوای گەورە پێی خەڵات كردینو بەسەرداروگەورەی هەموو پێغەمبەراندا بۆی ناردین، هەر بۆ ئەوەبوو كەباوك وەكو باوكو دڵسۆز لەگەڵ ماڵو منداڵیدا هەڵسوكەوت بكات، نەك وەكو دوژمنو خوێنخۆریان، تۆ ئێستا پێویستیت بەوە هەیە بڕۆیتەوە بۆ ماڵەوەو لەئەلف بای ئیسلامەوە دەست پێبكەیتەوەو خۆت تێبگەیەنیو پێبگەیەنی، وەكو ئینسان ڕەفتار لەگەڵ ماڵو منداڵی خۆتدا بكەیت، پاشان بتوانی ئیشوكاری موسڵمانان بگریتەدەست.

داوا دەكەم لەخوای بەرزو بێهاوتا، لەئیسلام زیاتر شارەزامان بكات، ژیانێكی خۆشو پڕ بەختەوەری لەسایەی ئیمانو ئیسلامدا لەگەڵ ماڵو منداڵی خۆمان بەسەر بەرین، خوای گەورە خۆشیو بەرەكەت بخاتە ناو هەموو خێزانو ماڵێكی موسڵمانەوە

اللّهُمَّ آمين

# ووتـاری ژماره شانزه

## مافی منداڵ

### بەشی حەوتەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ ولا تَمُدَّنَ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى, وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لا نَسْأَلُكَ رِزْقاً نَحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى ﴾

(طـه 131 ـ 132)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم

( ما مِنْ ناشِيءٍ يُنْشَأُ في الْعِبادَةِ حَتَّى يُدْرِكَهُ الْمَوْتُ, إِلاَّ أَعْطاهُ اللهُ أَجْرَ تِسْعَةٍ وَتِسْعِينَ صِدِّيقاً )

( رَواهُ الطَّبَراني )

**الحمدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلامو ڕەحمەتی خواتان لێ بێ.. ئەم وتارەشمان بۆ تەواوکردنی وتارەکانی ڕابردوومانە دەربارەی پاراستنی مافی منداڵ, درێژە بەو باسە دەدەینو دەڵێین:

منداڵ بوونەوەرێکی جوانو ناسکە, بۆیە هەریەك لەئێمە کەباسی منداڵ دەکەین, جیهانی پڕ بەرائەتیمان دێتە بەرچاو, کەواتە: ئەو دونیا پڕ بەرائەتەی منداڵ دەبێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ گەشەو پەرەی پێ بدەین کەهەر بەپاکی بمێنێتەوە. منداڵ نەوەی دوارۆژە بۆیە دەبێ زۆر بەگرنگییەوە تەماشای بکەین, پەروەردەیەکی چاکی بکەین, چونکە لەئایندەیەکی نزیکدا ئەرکی سەرپەرشتیکردنی گەلو نیشتمانی دەکەوێتە ئەستۆ, بۆە لەپەروەردەکردنیدا دەبێت ورد بینو وریا بین!

بەگوێرەی دەروونزانی سویسری ( جان پیاجە ) قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ, تاکو تەمەنی (14) ساڵییە. ئەگەرچی ناوبردنی قۆناغەکانی گەشەی منداڵ لەلایەن زاناو پسپۆڕانی دەروونزانییەوە لەیەکتری جیاوازە, بەڵام لەلای زانایانی شەرعەوە تاکو کاتی خۆناسین ـ لەش گرانبوون ـ هەر بەمنداڵ لەقەڵەم دەدرێت.

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان, ڕۆژی 1 / 6 ی هەموو ساڵێك بەڕۆژی منداڵانی جیهان ناوزەد کردووە, هەر بەم بۆنەیەشەوە کۆمەڵێك بەندی داناوە بۆ پاراستنو داکۆکیکردن لەمافەکانی منداڵ. ئێمە لاریمان لەم کۆمەڵە بەندانە نییە, بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە چەند لەم بەندانە جێبەجێ دەکرێن؟! ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەکو پەیڕەوو پرۆگرامێك کەبۆ مرۆڤایەتی هاتووە, بۆ ساکارترین شت ڕێوشوێنو یاساو دەستووری بۆ داناوە. منداڵیش لەڕوانگەی ئیسلامەوە گرنگیو تایبەتمەندیی خۆی هەیە, بۆیە سەیردەکەین پێش ئەوەی خێزانێك پێك بهێنرێت, ئیسلام فەرمانمان پێدەکات کەئافرەتێکی ئەوتۆ هەڵبژێرین کەنەخۆشیی بۆماوەیی (وراثي) نەبێت, چونکە لەڕێگەی ئەو دایکـــەوە دەگـوازرێتەوە بۆ نەوەکان. خـــۆشەویستمـــان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: (تَزَوَّجُوا في الْحِجْرِ الصَّالِحِ فَإِنَّ الْعِرْقَ دَسَّاس). گـــواستنـــەوەی ئـــەم

نەخۆشییە بۆماوەییە لەڕێگەی شیرپێدانەوە یاخود لەڕێگەی کرۆمۆسۆمەکانەوەیە, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم دەفەرموێ: (لا تَسْتَرْضِعُوا الْحُمْقاءَ, فَإِنَّ اللَّبِنَ يُورَثُ), واتە: مەهێڵن ئافرەتی نەزانو گێلو نەفام شیر بداتە منداڵەکانتان, چونکە شیر نەخۆشییە لاشەییو دەروونییەکان لەئافرەتەوە دەگوازێتەوە بۆ منداڵ! !

هەروەها بۆ ناونانی ئەو منداڵە دەبێت ناوێکی ئەوتۆی لێ بندرێت کەشایستەی گەورەیی منداڵ بێت, چونکە ناو بەشێکە لەکەسایەتیی مرۆڤ , جا کاتێك دایکو باوك ناوێکی ناشایستە لەمنداڵەکانیان دەنێن کە لەگەڵ کەسایەتیدا ناگونجێ, لەو کاتەدا منداڵ لەناو هاوتەمەنەکانیدا هەست بەخۆ بەکەم زانین دەکاتو, ناتوانێ لەگەڵ ژینگەو دەوروبەریدا خۆی بسازێنێتو ئەم خۆنەگونجانەش دەبێت ڕێگر لەبەردەم کارو چالاکیو بەرهەم هێنانیدا. بۆیە پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم جەخت لەسەر ناوی ڕێكو گونجاو دەکاتەوە کەدەفەرموێ: (خَيْرُ أسْماء, ما حَمّدا وَحَمَدا). هەروەها پێغەمبەری خوا بەمەندەش نەوەستاوە, ئەو ناوە نارێکانەی کە لەسەردەمی نەزانیندا (جاهلییەت) هەبووە گۆڕیویەتی بەناوی باش, تەنها بۆ ئەوەندە خاوەن ناوەکە هەست بەئارامیو دڵنەوایی خۆی بکات, وەکو ئەوەی کەسێك ناوی (ذو الْخَيْل) بوو, پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم ناوەکەی گۆڕی بە (ذو الْخَيْر).

خۆشەویستان: ئیمامی غەزالی لە (إحياء عُلُوم الدِّين)دا دەفەرموێ: منداڵ ئەمانەتێکی خواییە, لەبەردەستی باوكو دایکیدایە. زانای ناودار ئبن سینا, لەکتێبەکەیدا (السِّياسة) دەربارەی سەرەتای پەروەردەی منداڵ گوتوویەتی: کاتێك منداڵ لەشیر بڕایەوە ئینجا دەست بەئەدەب دادانیو وەرزش پێکردنی ئاکارو ڕەوشتی دەکرێت, پێش ئەوەی کەخووڕەوشتی نابەجێو بەد هێرشی بکەنە سەر.

بەڕێزان: بەشەکانی پەروەردەی منداڵ ئەمانەن :

## یەکەم: پەروەردەی ئیمانی (بیروباوەڕ) التربية الإيمانية (العقائدية)

بەڵێ, یەکـــــــەم شت کەپێویستە منداڵی لەسەر پەروەردە بکرێ, بریتییە لەوەی کەبیروباوەڕێکی ڕاستو خاوێن, دوور لەهەر شیركو پۆخڵەواتی ئەفسانەو خورافیات, بخرێتە مێشکی منداڵەوە, هەروەکو لوقمانی حەکیم بەکوڕەکەی فـــــــەرموو:

﴿ يَا بُنَيَّ لا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ ( لقمان 13), واته: لوقمان بەکوڕەکەی خۆی گوت لەکاتێکدا ئامۆژگاریی دەکرد: کوڕە شیرینەکەم, نەکەیت شتێك یان کەسێك بەهاوتاو هاوبەشی خوا بڕیار بدەیت, چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان بۆ خـــوا ستەمێکی زۆر گەورەو ناڕەوایە.

بەڵێ موسڵمانان: پێویستە بەزمانی منداڵو بەپێی تێگەیشتنی منداڵ لەبارەی بیروباوەڕی ئیسلامەتییەوە قسە بۆ منداڵ بکرێو بۆی روون بکرێتەوە کەخوای گەورە چەندین خەڵاتو بەخششی پێ بەخشیوین ئێمەش دەبێ سوپاسی خوا بکەین بۆ ئەو هەموو خەڵاتو بەخششانەی کەپێی داوین. بەم شێوەیە خۆشەویستیی خوا لەدڵی منداڵەکەماندا بچەسپێنین, لەبەر ئەوەی سروشتی منداڵ وایە, ئەو کەسەی زیاتر خۆش دەوێتو زیاتر ئالوودەی دەبێ کەزیاتر شتی پێشکەش دەکاتو خزمەتی دەکات. جا ئەگەر بەزمانی منداڵمان زانیو توانیمان بەپێی تێگەیشتنی ئەو باسی ئەو هەموو شتە بەنرخانە بکەین کەخوا پێشکەشیکردووین, ئەوا منداڵ خۆشەویستیی خوای گەورە لەدڵو دەروونیدا دەچەسپێو رەگ دادەکوتێ.

هەروەها پێویستە منداڵ فێربکرێ کەپێغەمبەرمان صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ناوی چییەو کورتەیەك لەژیانی شارەزابێتو, داوای لێبکرێ کەخۆشەویستیی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم لەهەموو کەس زیاتر بێ لەدڵی ئەو منداڵەدا با بزانین منداڵانی سەلەفی صاڵحی ئومەتی ئیسلام, چۆن پێغەمبەری خوایان خۆشویستووە؟!

(شهـــــاب الـــدِّين الأبشيهي) لەکتێبەکەیدا (الْمُسْتَطْرَف فِي كُلِّ فَنّ مُسْتَظْرَفْ) چیرۆکێکی خۆش دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: جارێکیان چەند منداڵێکی خەڵکی بەحرەین یارییان بەتۆپێك دەکرد, (أسْقُف) کە لەپلەی قەشە گەورەترەو نەگەیشتۆتە پلەی مەطران, کەپیاوی ئاینی مەسیحیی بەحرێن بوو لەوێ دانیشتبوو, تۆپێك بەر سنگی کەوت, ئەویش تۆپەکەی هەڵگرتەوەو منداڵەکان زۆر لێی پاڕانەوە کەتۆپەکەیان بداتەوە نەیدایەوە, یەکێك لەمنداڵەکان گوتی: داوات لێدەکەم لەبەر خاتری حەزرەتی محمد صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم تۆپەکەمان بدەوە, بەڵام ئەو هەر نەیدانەوەو (نەفرینی خوای لێبێت) جنێویشی بەپێغەمبەری خوا دا. منداڵەکان لەتاوی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم

بەنۆرەکانی دەستیان کەوتنە سەری‌و ئەوەندەیان لێدا هەتا مرد. ئەم هەواڵە گەیشتە ئیمامی عومەری کوڕی خەطّاب (ڕەزای خوای لێبێت), ئیمامی عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا, ڕزگارکردنی هیچ وولآتێك‌و دەستکەوتێکی گەورە, بەقەدەر کوشتنی ئەو (أسْقُف)ـە لەلایەن ئەو منداڵانەوە عومەری دڵخۆش نەکردووەو, فەرمووی: ئیسلام ئێستا سەربەرزو سەرفرازە کەمنداڵانێکی بچووك, قسە بەپێغەمبەرەکەیان گوترا لەسەری تووڕە بوون‌و سەرکەوتنیان بەدەست هێناو دوژمنی پێغەمبەری خوایان لەناوبرد!

بەڵێ, پێویستە منداڵ خۆشەویستیی خواو پێغەمبەری خوای لەدڵدا شیرین بکرێ, پاشان پەروەردەی دووەم دەست پێدەکات کەبریتیە لە:

## دووەم: پەروەردەی پەرستش (التربية التَّعَبُّدِيَّة)

گەورەترین عیبادەت‌و خواپەرستیش بۆ منداڵ کەزۆر گرنگەو زۆریش ئاسانە بریتییە لە (نوێژکردن), پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (إذا عَرَفَ الْغُلامُ يَمينَهُ مِنْ شِماله فَمُروهُ بِالصَّلاةِ)(رَواهُ الطَبَراني), واتە: ئەگەر منداڵ ڕاست‌و چەپی خۆی زانی‌و لێکی جیاکردنەوە, ئەوا .لەو کاتەوە فەرمانی پێبکەن کەنوێژبکات. لەفەرموودەیەکی تریشدا حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (مُرُّوا أوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أبْناءُ سَبْعِ سنينَ وَاضْرِبُوهُمْ وَهُمْ أبْناءُ عَشْرُ سِنينَ)(رَواهُ أبو داود), واتە: منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن کاتێ تەمەنیان حەوت ساڵانە, وەلەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن لەدە ساڵیدا.

خـۆشەویستان:ئـــەوەی جێگەی سەرنجـــە دەبینین پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم بۆ نوێژکردن کەپایەیەکی ئەم ئاینەیەو کۆڵەکەکەیەتی, پلەبەندی (التَدَرُّج)ی بەکارهێناوە, واتە: نەك ڕاستەوخۆ ئەمری پێبکەی بەنوێژکردن‌و ئەگەر نەیکرد لێی بدەی, بەڵکو هەموو دایك‌و باوکێك بۆ ئەوەی منداڵەکانیان فێری نوێژکردن بکەن, پێویستە ئەم سێ قۆناغە بەکار بێنن:

### قۆناغی یەکەم: سەیرکردن

ئەم قـــۆناغـــە لـەساتی ڕۆیشتن‌و هۆشیاریی منداڵەوە دەست پێدەکات, تا تەمەنی حەوت ساڵی, کەئەویش (سەیرکردنە). لەم قۆناغەدا منداڵ دەبینێت کەدایك‌و باوکی نوێژ دەکەن, بۆیە ئەویش چاو لەوان دەکات‌و لاساییان دەکاتەوەو نوێژدەکات.

جا ئەگەر باوكو دایك یارمەتییان داو دڵخۆشیان كرد بەو نوێژكردنەو هانیاندا ئەوە زۆر زۆر چاكترەو كاریگەریی زۆری دەبێ كەمنداڵ لەگەورەییشدا واز لەنوێژكردن نەهێنێو بەلایەوە خۆشەویست بێ.

## قۆناغی دووەم: فەرمان پێكردن

ئەم قۆناغەش لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە تا تەمەنی دە ساڵی درێژ دەبێتەوە. لەم قوناغەدا دایكو باوك داوا لەمنداڵەكەیان دەكەن كەنوێژ بكاتو سوودو قازانجی نوێژكردن بەزمانێكی سادەو ساكار بۆ منداڵەكەیان ڕوون دەكەنەوە بەلام لەسەر نەكردنی نوێژ لەمنداڵەكەیان نادەن.

بەڕێزان: ئەگەر سەرنج بدەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە كەئەم قۆناغی دووەمە" كەقۆناغی فەرمان پێكردنە ماوەكەی (سێ ساڵە)، چونكە لەحەوت ساڵی دەست پێدەكاتو لەدەساڵی كۆتایی دێت. ماوەی سێ ساڵ، هەموو ڕۆژێك پێنج جار باوكو دایك داوا لەمنداڵیان دەكەن كەنوێژ بكات، جا حیسابی بكە (5 × 365) × 3 دەكاتە 5475 جار، ئەم ژمارە زۆرەش بەڵگەیە لەسەر گرنگیو بایەخی دووبارەكردنەوە، دەروونی منداڵیش وایە كەیەكەم جارو دووەم جارو سێیەم جار بەدەم وەڵامدانەوەی فەرمانەكەوە نەیەتو گوێی پێنەدات، بۆیە دەبێ بەردەوام لێی دووبارە بكرێتەوەو بەبیری بهێنرێتەوە كەپێویستە نوێژ بكات. بەلام بەبێ بێزاربوونو نائومێدی كاتێ كەمنداڵەكە هەر نوێژی نەكرد، بەڵكو دەبێ وەڕس نەبێو بەردەوام فەرمانی پێبكەی، بەلام بەشێوەیەكی نەرمونیانو زمانێكی شیرین، وەكو قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾(طه 132)، وەئەم دووبارەكردنەوەیە زۆر سوودبەخشە، بەتایبەتی لەنێوان تەمەنی حەوتو هەشت ساڵیدا.

كەیەكەم جار منداڵ لەسەر نوێژ ڕادەهێنرێ، منداڵ سەرەتا وا دەزانێ تەنها لەئێوارانو بەیانیاندا واجبە نوێژ بكرێ، پاشان كەدەگاتە باڵغ بوون تێدەگات كەپێویستە لەشەوو ڕۆژێكدا پێنج جار نوێژ بۆ خوای تاكو تەنها ئەنجام بدرێتو بەم شێوەیە ئەو منداڵە لەو ماوە زۆرەدا لەسەر نوێژ كردن ڕادێت.

...حابیی پایەبەرز عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێبێت) چاك لەبنەمای دووپارەکردنەوە لەگەڵ منداڵاندا تێگەیشتبوو, بۆیە بەباوکانو دایکان دەڵێ: (منداڵەکانتان ڕابهێنن لەسەر چاکە, چونکە چاکە بەڕاهاتنە). بەم شێوەیە لەتەمەنی دە ساڵیی منداڵدا قۆناغی دووەم بۆ فێرکردنی نوێژ کۆتایی پێ دێتو قۆناغی سێیەم دەست پێدەکات.

## قۆناغی سێیەم: لێدان لەسەر نوێژ نەکردن

ئەمەش لەتەمەنی دە ساڵیی منداڵەوە دەست پێدەکات.. کاتێ منداڵ تەمەنی گەیشتە دەساڵیو نوێژی نەکرد, دوای ئەوەی سێ ساڵە لەلایەن باوکو دایکەوە فەرمانی نوێژکردنی پێدەکرێ, لەو کاتەدا ڕێگەدراوە دایکو باوك کەبۆ تەمبێکردن لەمنداڵەکانیان بدەن, لەسەر ئەو کەمتەرخەمییەی بەرامبەر خۆی کردوویەتیو لەسەر ئەو ستەمەی کە لەخۆی کردووە, بەهۆی شوێنکەوتنی ڕێگاکانی شەیطان. چونکە پێویستە منداڵ لەم تەمەنە بەدواوە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بێت لەکاتێکدا کەهێشتا لەقۆناغی فیطرەتدایەو شەیطانیش لەو کاتەدا کاریگەری لەسەری لاوازە, نوێژکردنیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەخەریکە شەیطان هێدی هێدی دەست بەسەر ئەو منداڵەدا بگرێ, لەبەر ئەوە پێویستی بەچارەسەر هەیە, ئەویش لێدانە (بەڵام لێدانێکی وا نا کەئێشی زۆر بەمنداڵ بگەیەنێو شوێنەوار لەسەرو لاشەی بەجێ بێڵێ), وەئەم لێدانە بۆ ئەوەیە تا منداڵ هەست بکات کەدایکو باوکی لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندەیان خۆشدەوێت, کەچی وا ئێستا لێی دەدەن, دیارە نوێژ نەکردن تاوانەو زەرەری تێدایە بۆیە لێی دەدەنو, چاك وایە دایکو باوك بۆ منداڵەکەیانی ڕوون بکەنەوە کەبۆچی لەسەر نوێژ نەکردن لێی دەدەن, بەڵام بەحەکیمانەو زمانی سادەو ئاسان کەبگونجێ لەگەڵ عەقڵو تەمەنی ئەو کاتەی منداڵەکە, نەك بەوەی بیترسێنی بەوەی کەدۆزەخ مارو دووپشکی واو وای تێدایەو وات دەسووتێننو خوا ڕقی لێتانەو ئەمجۆرە قسانە, بەڵکو ئەوەی بۆ باس بکە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم مژدەی زۆر گەورەی دەدایە ئەو منداڵانەی کە لەسەر خواپەرستی پەروەردەبوون, لـــەم بارەیەشەوە (طەبەرانی) لەئەبو ئومامەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمـــووی:

(ما مِنْ ناشِيءٍ يُنْشَأُ فِي الْعِبادَة حَتَّى يُدْرِكَهُ الْمَوْت, إلاَّ أعْطاهُ اللهُ أجْرَ تسْعَةٍ وَتِسْعِينَ صدِّيقاً) واته: هەر منداڵێك تا مردن لەخواپەرستیدا پەروەردە بێت, خوای گەورە پاداشتی نەوەدو نۆ چاكەكاری ڕاستگۆی دەداتەوە ! !

جا تۆش بەمنداڵەكەت بڵێ: ڕۆڵە گیان ئایا حەیف نیە ئەم هەموو پاداشتو پلە بەرزەت لەدەست بچێ بەهۆی ئەوەوە كەئێستا نوێژ ناكەی؟! حەزرەتی عومەری كوڕی خەطّاب فەرموویەتی: منداڵ چاكەكانی بۆ دەنووسرێتو خراپەكانی لەسەر نانووسرێت.

بەڵێ ئیمانداران: ئەم ئەنجامدانی نوێژو خواپەرستییە وا دەكات كەبیروباوەڕو عەقیدە لەدڵی منداڵدا جێگیر ببێ, هەروەكو زانای بەناوبانگی كورد (د. محمد سعید رَمَضان البوطي) لەكتێبەكەیدا (تَجربَة التَربية الإسلاميَّة) دەفەرموێ: (بۆ ئەوەی چاندنی بیروباوەڕ لەدەروونَدا بەهێز بێت دەبێت پەرستش {عیبادەت} بەهەموو جۆرو شێوەكانی ئاو درابێت, بەو جۆرە بیروباوەڕ لەدڵدا گەشەدەكاتو پەلوپۆ لێدەداتو خۆڕاگر دەبێت بەرامبەر گێژەڵووكەی ژیانو شڵەژانی). هەروەها شتێكی زەرووره كەمنداڵ ببرێ بۆ نوێژی جومعە, هەرچەندە نوێژی جومعەشی لەسەر واجب نەبێ, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِالله وَالْيَوْمِ الآخِرِ, فَعَلَيْهِ الْجُمُعَةَ إلاَّ مُسافِراً, أوْ مَملوكاً, أوْ صَبِيَّاً, أوْ إمْرَأةً, أوْ مَرِيضاً, فَمَنْ إسْتَغْنى عَنْها بِلَهْوٍ أوْ تِجارَةٍ إسْتَغْنى اللهُ عَنْهُ, وَاللهُ غَنِيٌّ حَميد)(رَواهُ أبو داود), واته: ئەو كەسەی باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە, ئەوا نوێژی جومعەی لەسەر پێویستە جگە لەكەسێك كە لەسەفەردا بێت, یاخود كۆیلە (عەبد) بێت, یان ئافرەت یان منداڵ بێت, یان نەخۆش بێت, ئەوەی بەهۆی شتێكی پڕوپووچ یاخود لەبەر معامەلەو بازرگانی وازی لەنوێژی جومعە هێناو نەچوو بۆ نوێژی جومعە, خوای گەورەش ـ سُبحانَهُ وَتَعالى ـ واز لەو دەهێنێو خوای گەورە بێپێویستو سوپاسگوزارە.

ئیمامی كاسانی لە (البَدائِع)دا دەربارەی ئەم فەرموودەیە, دەڵێ: نوێژی منداڵ وەك سونـــنـــەت وەردەگیرێ, وەڕاهێنانی منداڵیش لەسەر نوێژی جومعە كۆمەڵە سوودێكی زۆری لێ بەدەست دەهێنرێ لەوانە:

1 ـ کاتێ منداڵ گەورە دەبێت ڕاهاتووە لەسەر ئەنجامدانی نوێژی جومعەو بەلایەوە شتێکی ئاسایی دەبێت, بەڵام ئەگەر لەمنداڵیدا بەشداریی نوێژی جومعە نەکات‌و هاتوچۆی مزگەوت نەکات‌و ئەو فەرەباڵغییە نەبینێ, ئەوا لەوانەیە لەگەورەییدا بەلایەوە قورس‌وگران بێ لەناکاو بچێتە مزگەوت‌و ئەو هەموو خەڵکە بەکۆمەڵ ببینێ!

2 ـ منداڵ سروشتی پاکەو زۆر هەستیارە, بۆیە کاتێ گوێی لەوتاری جومعە دەبێت, زۆر باش لەمێشکیدا تۆمار دەبێت‌و بەگەورەییش لەبیری ناچێتەوە

3 ـ دەبێتە توێشوویەکی ئیمانیی‌و هاندانێك بۆی لەسەر کردنی هەر پێنج نوێژەکە

4 ـ لەڕێگەی هاتن بۆ نوێژی جومعەوە ئاشنایەتی پەیدا دەکات لەگەڵ منداڵی وەك خـــۆی کـــەرەفیقی باشن, وەچاوی دەکـــرێتەوەو ئاشنایەتی لەگـــەڵ ئاسیاوانی باوکیدا پەیدا دەکات.

هـــــــەروەها زۆر جێگای خۆیـەتی دایکـانیش ئـەو منداڵانـەیان کـەپاك‌و خـاوێن‌و توانای گوێگرتنیان لـەوتاری نوێـژی جومعـە هـــەیە لەگـەڵ خـــــۆیاندا بیـانهێنن بـۆ نوێژی جومعە بۆ مزگەوت.

## سێیەم: پەروەردەی زانستی (التربِيَة العَقلِيَّة ـ العلمِيَّة)

بەڵێ موسڵمانی بەڕێز: لایەنی سێیەمی پەروەردە بریتییە لەپەروەردەی زانستی, گەورەترینی هەموو زانستەکانیش قورئانی پیرۆزە, کەپێویستە منداڵ فێری خوێندنەوەو لەبرکردنی قورئان بکرێ.

ئبن کەثیر لە (فَضائل القُرآن)دا دەفەرموێ: ئبن عەباس فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خـــوا صَلَّی اللهُ عَلَیـه وَسـلَّم وەفـاتی کـرد, مـن تـــەمەنم دەسـاڵان بـوو وەهـــــەموو قــورئـــانم بەتەواوی لەبەربوو.

بەڵێ, قورئان خوێندنی منداڵانیش هۆیەکی زۆر گەورەو کاریگەرە بۆ لابردنی بەلاو سزا لەسـەر خێـزان‌و کۆمـەڵگا. لەحوزەیفـەی کـوڕی یـەمان (خـوای لێ ڕازی بـێ) دەگێڕنـەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیه وسلَّم فەرموویـەتی: (إنَّ القَـوْمَ لَیَبْعَـثُ اللهُ عَلَـیْهِمُ العَـذابَ حُكمـاً مَقْـضِیّاً, فَیَقْـرأُ الـصَبِيُّ مِـنْ صِـبْیانِهِمْ في المَكْتَـبِ ـ الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمین ـ فَیَسْمَعَهُ اللهُ تَعالَى فَیَرْفَعُ عَنْهُمْ بِسَبَبِهِ العَذابَ أرْبَعینَ سَنَةً) (تَفسیر الكَبیر للفَخر

الـرَّازي, ج1, ص 178), واتـه: خـواى گـهوره بـهبڕيارێكى جێبـهجێكراو سـزا بـۆ گـهلێك دهنێرێت بهڵام منداڵێك لهمنداڵهكانيان لهفێرگهدا ـ الْحَمْدُ لله رَبِّ الْعالَمِين ـ دهخوێنێتـهوهو خـواى گـهوره ئـهوه دهبيـستێتو, بـهو هۆيـهوه بـۆ مـاوهى چـل سـاڵ سـزايان لهسـهر لادهبات!!

خۆشهويستان: ئێستا با بزانين گهورهيى ئهو باوكو دايكهى كهمنداڵى قورئان خوێنيان ههيه چهنده: پێغهمبـهرى خۆشهويـستمان صـلَّى الله عَلَيـه وَسَـلَّم فهرموويـهتى: (مَـنْ قَـرَأَ الْقُرْآنَ وَعَمِلَ بِهِ أُلْبِسَ اللهُ والِدَيْهِ تاجاً يَوْمَ الْقِيامَةِ, ضَوْؤُهُ أَحْسَنَ مِـنْ ضَـوءِ الـشَّمْسِ)(رَواهُ أبو داود), واته: ههركهسێ قورئان بخوێنێو كارى پێبكات, خواى گهوره لهڕۆژى قيامهتدا تاجێك دهكـــاته ســــهر دايكو باوكـــى, كـــهتيشكى درهوشاوهيان لــهتيشكى خــۆر پرشنگدارتره.

بهڵێ, خواناسانو زانايان باش لهوه گهيشتبوون كهمنداڵى قورئان خوێن بۆ دايكو باوك چـهند بهرهكهتـه, ئـهوهتا كاتێـك حـهمادى كـوڕى ئـهبو حهنيفـه سـووڕهتى ئهلفاتيحـهى بهچاكى ڕهوان كرد, ئيمام ئـهبو حهنيفـه پێـنج سـهد ديرهـهمى بهمامۆسـتاكهى حـهمادى كـوڕى بهخـشى, كهلـهو سـهردهمهدا بـهرانێك بهيـهك ديرهـهم دهكـڕدرا. مامۆسـتاكه ئـهم بهخششهى بهلاوه زۆر زۆر بوو, چونكه تهنها سووڕهتى فاتيحهى فێر كردبوو, ئهبوحهنيفه پێى فهرموو: مامۆستاى بهڕێز ئهوهى فێرى كوڕهكهمت كـردووه بهكـهمى مهزانـه, ئهگـهر پارهى لهوه زياترمـان لهدهسـتدا بوايـه دهمانـدايتێ لهبـهر ئـهوهى مـن دهزانم گـهورهيىو بهرهكهتى فێربوونى قورئان چـهندهو چـهند بهختـهوهرن ئـهو دايكو باوكانـهى كهمنـداڵى قورئان خوێنيان ههيه.

هـهروهها پێويـسته حكومـهت خـولى فێربـوونى قورئـانى پـيرۆز بـۆ منـداڵان بكاتـهوهو خـهڵاتو دهستخۆشـانه بهمنـداڵى زيـرهك بـدات كـهزياتر قورئـانى لهبـهرهو ڕهوانتريـهتى. مێژووى زێڕينى ئسلام بۆمان دهگێڕێتـهوه كهسـهركردهى پاڵـهوانى كـورد ـ صـهلاحهدينى ئـــهيوبى (ڕهحمـــهتى خـــواى لێبێت) جارێكيـان لهگـهرمـهى شـهڕدا بـهناو سـهربازگهى موسڵمانانـدا هاتوچۆى دهكـردو لهشــكرهكهى بهســهردهكردهوه, لــهو كاتــهدا بــهلاى خێمهيهكدا ڕهت بوو گوێى لهدهنگى قورئان خوێندن بـوو, لهووڵاخهكـهى هاتـه خـوارهوهو

تەماشای کرد وا منداڵێکی جوانکیلەی تازە زمان پژاو، لەسەر ئەژنۆ لەخزمەت باوکی دانیشتووەو قورئان دەخوێنێ، دەرسەکەی دوێنێی بۆ باوکی دەڵێتەوەو زۆر بەجوانیو بەدەنگێکی زۆر خۆش قورئانەکە دەخوێنێ. صەلاحەدینی ئەیووبی زۆر بەمە خۆشحاڵبوو، زانی خوای گەورە بەبەرکەتی ئەم منداڵە پاکو ئەم باوکە پیرە دڵسۆزانەی قورئانە لەشکری موسڵمانان سەردەخات بەسەر کوفردا، کە لەڕووی ژمارەو جۆری چەکەوە زۆر لێك جیاواز بوون. بۆیە سەلامی لێکردنو لەلایان دانیشتو فەرمووی: لەپاداشتی ئەم قورئان خوێندنە ڕێکوپێکو جوانەدا، وا بڕیارمدا دەبێ هەموو نیوەڕوانێك ئەم منداڵە لەگەڵ خۆمدا نان بخواو فلان باخو بێستانم کەزۆر بەقیمەتە وەقف بێ لەسەر ئەم باوکو کوڕە قورئان خوێنە ! !

جا خۆزگایە سەرکردەکانی ئەمڕۆش چاویان لەو کەڵەپیاوەی ئیسلام بکردایەو ئاوا قورئانو قورئان خوێنیان لا گەورە بوایە، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ خولی فێربوونی هەموو شتێك هەیەو خولی تایبەتی بۆ دەکرێتەوەو بودجەو بەخششو خەڵاتی بۆ ئامادە دەکرێ، بەڵام زۆر بەدەگمەن ئەگەر خولێکی فێربوونو لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بکرێتەوە ! !

بەڕێزان: هەروەها پێویستە منداڵ هان بدرێ لەسەر ئەوەی کەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم لەبەر بکات، لەهەر بوارێکی ژیاندا یەك دوو فەرموودەی کورت لەبەر بکات، پاشان پاداشت بدرێ بەمنداڵەکە لەسەر ئەوەی کەفەرموودەی رَسولُ اللهی صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەبەرکردووە.

ئیبراهیمی ئەدهەم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: باوکم پێی گوتم ڕۆڵە گیان فەرموودەی پێغەمبەری خوا لەبەر بکە، منیش لەپاداشتی لەبەرکردنی هەر فەرموودەیەکدا دیرهەمێکت دەدەمێ. دەفەرموێ: منیش منداڵ بووم، لەخۆشیی پارەکە خێرا خێرا فەرموودەی حەزرەتم لەبەر دەکرد.

ئیمانداران: هەروەها پێویستە منداڵی موسڵمان هان بدرێ کەفێری زمانی بێگانە ببێ، بەتایبەت زمانێك کە لەهەموو جیهاندا بڵاوەو قسەپێکەری زۆرەو زمانی

زانسته، بۆ نموونـه ئـەمڕۆ وەکـو زمـانی ئنگلیـزی، بـۆ ئـەوەی زانسـته مادییـه ڕووتـەکان لەناموسڵمانانەوە بگەیەنرێ بەموسڵمانان.

ئـەبو یـەعلی‌و ئـبن عەسـاکر لەزەیـد بـن ثابـت (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕنـەوە کەفەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا هاتە مەدینە، منیان بردە خزمەتی‌و عەرزیان کـرد: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم، ئەم منداڵە ناوی زەیدەو لەهۆزی بەنی نەجارە، زۆر زیرەکـەو توانـای لەبـەرکردنی زۆر باشـەو حەڤـدە سـوورەتی لـەو قورئانـەی بـۆ تـۆ بەخەڵات هاتوو لەبەر کردووە. پێغەمبەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّم فـەرمووی: ئـادەی هەندێکم بۆ بخوێنەوە، منیش دەستم کرد بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لەبەر، حـەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم زۆری پێخۆش بوو، ئافەریمی کردم‌و پاشان فەرمووی: (يا زَيْد، تَعَلَّـمْ لي كِتابَ الْيَهودِ، فَإِنِّي واللهِ ما آمَنَ يَهودُ عَلى كِتابي)، فەرمووی: ئەی زەید مـادام ئەوەنـدە زیرەکیت، بڕۆ خۆتم بۆ فێری زمانی جوولەکە بکە، چونکە بەخوا بۆ ئەو نامانـەی لەلایـەن جوولەکـەوە بـۆم دێـن، دڵنیـا نـیم، چـونکە کەسـێکی وامـان نیـە زمـانی جوولەکـەو خوێندنەوەیان بەباشی بزانێ! زەید دەفەرموێ: لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ڕۆیشتم‌و دەستم کـرد بـەفێربوونی خوێندنـەوەو نووسـینی زمـانی جوولەکـە، لـەماوەی پـانزە ڕۆژدا بەتـەواوی شـارەزا بـووم‌و دەمتـوانی بـەزمانی جولەکـە بنووسـم‌و بخوێنمەوە، جا لەدوای ئەوەوە هەرکاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَـلَّم نامـەی بۆ جوولەکـەکان بنووسـیایە مـن بـۆم دەنووسـی، وەئەگـەر جوولـــەکـــەکان نامـەیان بـۆ بناردایە من بۆم دەخوێندەوە!

هەر زەید بن ثابت (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبـەری خـوا صَلَّى اللهُ عَلَيـه وَسَلَّم پێـی فـەرمووم: أَتُحْسِنُ السُريانيَّة؟ ئایـا نووسـین‌و خوێندنـەوەی سـوورەیانی بـاش دەزانـی، چـونکە گـەلێ جـار نامـەم بـەو زمانـە بـۆ دێـت؟! منـیش گـوتم: نـەخێر نـایزانم. فـەرمووی: فَتَعَلَّمْهـا، دەی بـڕۆ هـەوڵ بـدە فێـری ببـە، بـۆ ئـەوەی ئەگـەر پێویـستمان بەنووســـین‌و خوێندنـــەوەی سوورەیانی بـوو ئـەوا تـۆ بۆمـان جێبـەجێ بکـە! زەیـد دەفـــەرموێ: منـــیش لـــەماوەی حەڤدە ڕۆژدا فێری بووم.

بەڵێ خۆشەویستان: پێویستە ئەو منداڵانەی کەمێشکیان باشەو توانای فێربوونی زمانی بێگانەیان هەیە, خولی تایبەتیان بۆ بکرێتەوەو هان بدرێنو خەڵات بکرێن .

ئیمانداران: یەکێکی تر لەمافە پەروەردەییەکانی منداڵ ئەوەیە کە لەتەمەنی منداڵیدا فێری زانستو خوێندەواری بکرێتو نەهێڵرێ لەخوێندن دابڕێ, چونکە لەئەثەر رێکدا هاتووە (مَثَلُ الَّذي يَتَعَلَّمُ الْعِلْمَ في صغرِهِ, كَالنَقْشِ عَلى الْحَجَرِ, وَمَثَلُ الَّذي يَتَعَلَّمُ الْعِلْمَ في كِبَرِهِ كَالَّذي يَكْتُبُ عَلى الْماءِ), واتە: نموونەی ئەو کەسەی کە بەمنداڵی فێری زانستو زانیاری دەبێت, وەك نەقشی سەر بەرد وایەو قەت نافەوتێ, ئەو کەسەشی کە بەگەورەیی فێری زانست دەبێت وەك کەسێك وایە کە لەڕووی ئاودا بنووسێت.

ئبن عابدین ( بەڕەحمەت بێ ) دەفەرموێ :

أراني نَسيتُ ما تَعَلَّمْتُ في الكِبَرِ وَلَسْتُ بِناسٍ ما تَعَلَّمْتُ في الصِّغَرِ

واتە: من کەئێستا لەتەمەنی پیریدام, بۆم دەرکەوتووەو چاك تێگەیشتووم کەهەرچی زانستو زانیارییەك بەگەورەیی فێری بووم, هەر هەموویم بیرچۆتەوە. بەڵام ئەوەی لەتەمەنی منداڵیمدا فێری بوویمو لەبەرم کردبێ هەر لەبیرمەو بیرم نەچۆتەوە.

## چوارەم: پەروەردەی کۆمەڵایەتی ( التربية الإجتماعية )

پەروەردەی چوارەم پەروەردەی کۆمەڵایەتییە کەئەم مافەی منداڵیش بریتییە لەوەی فێر بکرێ چۆن ڕێزی کەسی لەخۆی گەورەتر بگرێ, وەکو کەسوکارو مامۆستاو دراوسێ, وەفێر بکرێ چۆن بەڕێگادا دەڕواو چۆن لەڕێگا دەپەڕێتەوەو چۆن قسە دەکاو چۆن گوێ دەگرێو بە چ شێوەیەك نان دەخواو ئاو دەخواتەوەو چۆن لەدەرگا دەدا پێش چوونە ژوورەوە, بەڵام بەشێوەی لێتووڕەبوون نا, بەڵکو بەئامۆژگاریی جوانو قسەی نەرمو, بەدووبارەکردنەوەی دەیان جارە, تاوەکو فێری ڕەوشتە جوانەکان دەبێت.

جارێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەگەڵ منداڵێك کەناوی عەمری کوڕی سەلەمەبوو نانی دەخوارد, ئەم منداڵە بچووکە دەستی دەخستە ناو خواردنەکەوەو دەستی تێوەردەداو لەهەموو لایەکەوە دەیخوارد, پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم زۆر بەنەرمیو بەهێواشی فێری دەستووری نان خواردنی کردو فەرمووی: (يا غُلام سَمِّ الله وَكُلْ بِيَمينِكَ, وَكُل ممَّا يَليكَ)(رَواهُ البُخاري ومُسلِم), فەرمووی: (ڕۆڵە گیان,

هەركاتێ نانت خوارد, ناوی خوا بێنەو بڵێ بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم, وەڕۆڵە گیان لەبەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست مەخەرە ئەملاولای خواردنەکەوە)! بەم شێوەیە, بەم زمانە شیرینە, ئادابی نان خواردنی فێری ئەو منداڵە کرد.

موسڵمانان: هەر لەپەروەردەی کۆمەڵایەتییە کەدەبێ منداڵ رابهێنرێ لەسەر دەروون پاکی, لەسەر زمان پاکی, کەجوێن نەداتو قسە نەگێڕێتەوەو دووزمانی نەکاتو, هان بدرێ لەسەر ڕەوشتە جوانەکانیتر. بەڵام بەقسەی خۆشو بەڕێگایەك کەقەناعەت بەمنداڵەکە بکرێ, کەئەمە ڕەوشتی جوانو چاکەو پێچەوانەکەیشی خراپەو تاوانە. جا ئەگەر دوای ئامۆژگاریکردنێکی زۆر منداڵ هەر لەسەر ڕەوشتی ناشیرینو گوفتاری ناڕەوا بەردەوام بوو ئەو کاتە پێویستە تەمبێ بکرێو ئاگادار بکرێتەوە. ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: منداڵ ئەگەر لەسەرەتای گەشەکردنیەوە, ئەو کاتەی زمانی بەتەواوی فێری قسە دەبێو چاكو خراپ لێك دەکاتەوە, ئەگەر لەو کاتەدا پشتگوێ خرا ئەوا لەئەنجامدا منداڵێکی ڕەوشت خراپو درۆزنو حەسوودو قسەهێنەرو قسەبەرو خۆهەڵقورتێنەرو پێکەنینی نابەجێو فێڵبازو بێشەرم دەردەچێت! جا بەهۆی تەمبێکردنەوە (دوای ئەوەی ئامۆژگاری سوودی نەبوو) لەهەموو ئەو ڕەوشتە ناشیرینانە دەپارێزێت.

بەڵام خۆشەویستان, دایکانو باوکانی بەڕێز: ئێمە کەدەڵێین پێویستە منداڵ تەمبێ بکرێ, دەبێ ئەوەش بڵێین کەمەبەست ئەوە نیە منداڵ فەلاقە بکرێو داخ بکرێو وای لێبدرێ کەئازارێکی زۆری پێبگات یان ئەندامێکی لاشەی زەرەر بێنێ, بەڵکو دەبێ تەمبێکردنی منداڵ بەڕێگەیەکی زانستیانە بێتو پلەبەندی لەتەمبێکردنی منداڵدا ڕەچاو بکرێ, بەم شێوەیە:

قۆناغی یەکەم: هەرکاتێ منداڵ هەڵەیەکی کرد و تاوانێکی کرد, قسەیەکی ناشیرینی کرد, تۆ یەکسەر پەلاماری مەدەو دەست مەکە بەلێدانی, بەڵکو بەعەمەلی ڕاستەکەی نیشان بدەو بۆی ڕوون بکەوە, کەئەو کردەوەیە هەڵەیەو ئەو قسەیە خراپەو ڕاستەکەی ئاوایە. پێی بڵێ جارێکیتر ئاوا قسە مەکەو ئاوا قسە بکە, ئاوا مەڕۆو ئاوا بڕۆ, ئەگەر چەند جارێ ئەمەت لەگەڵدا بەکارهێناو سوودی نەبوو, منداڵەکە هەر سوور بوو لەسەر

هەڵوێستی نالەباری خۆی، ئەوا ڕێگای دووەم بگرەبەر.

قۆناغی دووەم: نیشاندانی قەمچی‌و دارو ترساندنی منداڵ، چونکە زۆر منداڵ هەیە هەرکەچاوی کەوت بەئامێری لێدان، هەڵەکانی خۆی ڕاست دەکاتەوەو پێویستی بەلێدان نیە. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (عَلِّقُوا السَّوْطَ حَیْثُ یَرَاهُ أَهْلَ الْبَیْت، فَإِنَّهُ أَدَبٌ لَهُمْ)(حَدیث حَسَن صحیح الجامع)، واتە: قامچی‌و داری لێدان لەماڵەکانتاندا هەڵواسن بەجۆرێك ئەندامانی ماڵەوە ببینن، چونکە بەڕاستی ئەوە تەمبێیە بۆیان.

کەواتە هەرکاتێ منداڵەکەت لاسارییەکی کردو قەمچیت نیشانداو وازی لەلاسارییەکە هێنا، ئیتر تۆش وازی لێ بێنەو لێی مەدە، ئەگەر ئەم ڕێگایەش سوودی نەبوو، ئەوا بچۆ بۆ قۆناغی سێیەم.

قۆناغی سێیەم: گوێ ڕاکێشان، بەڵام بەشێوەیەکی وا نا کەزەرەر لەگوێچکەی بدەی، بەڵکو تەنها وەکو ئاگادارکردنەوەو بەئاگاهێنانەوەی کەهەڵەی کردووە. عەبدوڵڵای کوڕی بیشیری مازنی (ڕەزای خوای لێبێت) کەصەحابیی پێغەمبەرە صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: من منداڵبووم، دایکم بانگی کردم‌و هێشووە ترێیەکی دامێ کەبیبەم بۆ پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم، منیش بەرلەوەی بیگەیەنم، لەڕێگا لێم خوارد. کاتێ گەیشتمە خزمەت.حەزرەت‌و ترێیەکەم دایە دەستی، پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم سەیری هێشووە ترێیەکەی‌کرد، بینی بۆڵکێشم کردووەو لێم خواردووە، بۆیە گوێی ڕاکێشام‌و فەرمووی: ئەی فێڵباز! ئەوە بۆچی ئەو ترێیەت وا لێکردووە؟! واتە: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بەم گوێڕاکێشانە ئەو منداڵەی ئاگادارکردەوە کەکارێکی نابەجێی کردووە. بێگومان ئەو ئاگادارکردنەوەیە بەگوێڕاکێشان تەئسیرو کاریگەریی خۆی هەبووەو منداڵەکە دەرسی لێوەرگرتووەو ئەوەتا گەورەبووەو بۆتە پیاو ئەم باسەی هەر لەبیرەو بۆمان دەگێڕێتەوە.

دایکو باوکی بەڕێز: ئەگەر گوێڕاکێشانیش سوودی نەبوو، ئەوا بچۆ بۆ قۆناغی چوارەم.

قۆناغی چوارەم: لەلاشەی بدەی, بەڵام لەسەرو لەدەموچاوو سكو سنگی نەدەی, بەڵكو لەدەستو قاچی بدەی, بەڵام دەبێ بەشتێكی وا لێی نەدەی كەزۆر بەئێش بێ, یان شوێنێكی بشكێنێ, هەروەها نابێ لەسێ دار زیاتری لێبدەی. عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ شارەكانی دەنووسی: مامۆستا نابێ لەسێ دار زیاتر لەقوتابی بدات, چونكە ئەوە تەمبێكردن نیە, بەڵكو ترساندنە!

دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین كەنابێ لێدان هەموو ڕۆژێ بێو بەردەوام بێ, چونكە زۆر بەكارهێنانی لێدان, هەیبەتی دایكو باوك كەم دەكاتەوەو كاریگەرییەكەی لەدەست دەدات, وێڕای ئەو شوێنەوارە خراپانەی كە لەگەشەی دەروونیو فیكریی منداڵدا دروست دەكات.

ئینجا دەبێ ئەو ڕاستیەش فەرامۆش نەكرێ كەلێدانی منداڵ بۆ تەمبێكردنە وەك خوێ بۆ چێشت, هەروەك چۆن خوێ بەشێوەیەكی كەم دەكرێتە خواردنەوەو تامی خواردنەكە دەگۆڕێتو خۆشی دەكات, لێدانی بەسوودی بەرهەمداریش ئاوایە, لەبەر ئەوە دەبێ لێدان وەكو پێویستییەكی پەروەردەیی بەكاربێ, نەك وەكو تۆڵەكردنەوە لەمنداڵ, یان دایكو باوك تووڕەیی خۆیان لەمنداڵەكانیاندا خاڵی بكەنەوە, بەڵكو دەبێ دایكو باوك زۆر خۆ بپارێزن لەوەی كە لەكاتی تووڕەییدا لەمنداڵ بدەن, بەتایبەت لەو كاتانەدا كەدایكو باوك لەڕادەبەدەر لەمنداڵەكانیان تووڕەن ئەوە هەر نابێ لەو كاتەدا لەمنداڵەكەیان بدەن, نەوەك ئازاری زۆری پێبگەیەنن, چونكە مرۆڤ لەكاتی ڕقو تووڕەبوونی زۆردا سۆزو ڕەحمی تەنانەت بەرامبەر جگەرگۆشەی خۆیشی نامێنێ, جا لەوانەیە لەو تووڕەییەدا وا لەمنداڵەكەی بدات كە لەپاشان زۆر پەشیمان بێ. وەبشزانن ئەو منداڵانەی كەزۆریان لێدەدرێ لەكاتی گەورەبوونیشدا منداڵی ترسنۆكو لاواز دەردەچنو متمانەیان بەخۆیان نابێتو هەموو كات كزۆڵەو ترسنۆك دەردەچن.

وەئاگادارین كەمنداڵ وزەو جووڵەیەكی تێدایە كەپێویستی بەوە هەیە بجووڵێتو یاری بكات, تا ئەو وزەیە صەرف بكات. كەواتە: منداڵ نابێ سەركوت بكرێ بەتەواوی, وەئەم جووڵەو وزەیەی ناو لاشەی منداڵ كە بەهاروهاجی پێویستە لەناو ببرێ لەمنداڵێكەوە بۆ منداڵێكیتر جیاوازی هەیە, منداڵی وا هەیە ئەو وزەو جووڵەیە لەلاشەیدا

کەمە، هەموو کاتێ بێدەنگو لەسەرخۆیەو بەئەدەبەوە دادەنیشێ بەبێ ئەوەی لێی تووڕەبی یان لێی بدەی، لەهەمان کاتدا منداڵی واش هەیە ئەو وزەو جووڵەیە لەلاشەیدا زۆرەو پێویستی بەوە هەیە هاروهاجی بکاتو زۆر قسەبکات بۆ ئەوەی ئەو وزە زۆرە صەرف بکات. جا ئەو منداڵە هەرچەند لێی بدەیو ئازاری بدەی لەهاروهاجی خۆی ناکەوێ و بۆیە دەبێ زیاتر ئارامی لەسەر بگرىو لێدان تەنها وەکو ئاگادارکردنەوە بۆی بەکار بهێنرێ.

دایکو باوکی بەڕێز: هەرکاتێ وەکو دوا ڕێگەچارە ناچاربوویت کە لەمنداڵەکەت بدەیت، ئەویش لەئەنجامی ئەو لێدانەدا ئازاری پێگەیشت، جا ئەگەر ناوی خوای هێناو لێت پاڕایەوە کە لەبەر خاتری خوا لێی نەدەیت، ئەوا پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّی اللهُ عَلَیە وَسَلَّم داوات لێدەکات کەواز لەلێدانی بهێنیتو دەست لەلێدانی هەلگریت. لەمەشدا لا لێکردنەوەیەکی جوان هەیە، چونکە ئەو منداڵە گەیشتۆتە قەناعەت کەهەڵەیکردووەو دواتر ڕاستی دەکاتەوە، یان گەیشتۆتە قۆناغی ئێشو ئازارێك کەتوانای بەرگەگرتنی نەبێت، یان گەیشتۆتە قۆناغی دارمانی دەروونی یان ترسێکی زۆر.

ترمذي لەئەبو سەعیدی خودرییەوە گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیە وَسَلَّم فەرموویەتی: (إذا ضَرَبَ أحَدَکُمْ خادمَهُ، فَذَکَرَ اللهَ، فَارْفَعُوا أیْدیَکُمْ)، واتە: ئەگەر یەکێکتان لەخزمەتکارەکەی خۆی داو ئەویش ناوی خوای هێناو گوتی لەبەر خاتری خوا لێم مەدە، ئەوا دەست لەلێدان هەڵگرن.

لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئاخر ئەگەر منداڵ بەوەی زانی، ئەوا ئەو ناوی خوا هێنانە وەکو هۆکارێك بەکاردێنێ بۆ هەڵهاتن لەسزادانو ڕاهاتن لەسەر هەڵەو تاوان، هەموو جارێ هەر هەڵە دەکاتو کەزانیی لێی دەدرێت ناوی خوا دێنێ تاوازی لێ بهێنرێتو، بەم شێوەیە ئەمە دەکاتە فێڵێك بۆ دەربازبوون لەلێدان.

لەولامدا دەڵێین: تۆ وەکو ئیماندار هەر ئەوەت لەسەرە کە بەگوێی پێغەمبەری خوا بکەی صَلَّی اللهُ عَلَیە وَسَلَّمو، هەروەها ئەمە مانای ئەوەشە کەئەو منداڵە ناوی خوای لەدڵو دەروونداگەورەیە، بۆیە هانا بۆ ناوی خوا دەبات کاتێك دەزانێ باوکی یان دایکی

ـەوپـەڕی تووڕەبوونـدا لێـی دەدەن. جـا کەواتـە بـا نـاوی خـوا هـەر بەگـەورەیی لـەدڵو ـەروونیدا بمێنێتەوەو کەناوی خوای هێنا وازی لێ بێنە.

داوا دەکەم لەخوای گەورە، کە بەلوطـفو ڕەحمـی خـۆی لەپـەروەردەو پێگەیانـدنی ڕۆڵەکانماندا بەو شێوەیە سەرکەوتوومان بکا کەخۆی پێی ڕازییە..

خوای گەورە هیدایەتی گەنجو لاوەکانمان بدات..

پیرەکانو دایکو باوکەکان عاقیبەت خێر کا..

أللَّهُمَّ آمين ..

# وتـارى ژماره حه‌ڤده

## مافى مندالْ

### به‌شى هه‌شته‌م

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـوا قُـوا أَنْفُـسَكُمْ وَأَهْلِـيكُمْ نَـاراً وَقُودُهَـا النَّـاسُ وَالْحِجَـارَةُ عَلَيْهَـا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾

( التحريم 6)

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

(حَقُّ الْوَلَـدِ عَلى الْوالِـدِ أَنْ يُعَلِّمَـهُ الْكِتابَـةَ والسِّباحَةَ وَالرِّمَايَةَ وَألاّ يَرزُقَهُ إلاّ طَيِّباً)

(رَواهُ البَيهَقي)

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانو خواناسانی بەڕێز: سەلامو ڕەحمەتی خوا لەهەموو لایەکمان بێ.. خوای گەورە بەچاوی لوطفو بەزەیی تەماشامان بکاو لەگوناهی ئێمەو دایکو باوکمان خۆش بێو ڕۆڵەو نەوەکانمان صاڵحو سالار بکا.. آمین.

خۆشەویستان: لەوتاری ڕابردوودا باسی هەندێك لەبوارەکانی پەروەردەی منداڵمان کرد, کە لەڕاستیدا ئێمە ئەمە هەشت وتارە باسی پەروەردەکردنو پێگەیاندنو تێگەیاندنی منداڵ دەکەین, مانای وایە بەڕاستی منداڵ هەر ئەوە نیە فەترەو ماوەی تەمەنی منداڵیی لەماڵی باوكو دایکیدا بەسەربەرێتو پاشان کەچووە قۆناغی هەرزەکارییو گەنجیەتیەوە ئیتر پەیوەندیی بەدایكو باوکەوە نامێنێو ڕێڕەوی ژیانی خۆی دەگرێتەبەر, بەڵکو هەر منداڵێك هەر بەو چاوەوە تەماشای بکرێ کەدەبێ چەند ساڵێك کەماوەی تەمەنی منداڵییە, دایكو باوك ئەرکی بەخێوکردنو نانو جلوبەرگی منداڵەکەیان بگرنە ئەستۆ تا گەورە دەبێ, ئیتر ڕۆژێك لەڕۆژان ئیشیان بەپەروەردەو پێگەیاندنی ڕاستو دروستو موسڵمانانەی منداڵەکەیان نەبێ, ئەوە بەڕاستی ئەو منداڵە لەلایەن ئەو دایكو باوکەوە زیندەبەچاڵکراوەو بەدەستی خۆیان کوشتوویانە, هەروەکو ئێمە لەم وەصیەتی سێیەمەدا لەخزمەت ئامۆژگارییو ڕاسپاردەی خوای پەروەردگاردا بووین کەفەرمووی: ﴿وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ (الأنعام 151), فەرمووی: ئەی دایكو باوکەکان: نەکەن منداڵە بچووکەکانی خۆتان بکوژن لەترسی ئەوەی هەژار ببنو نان نەبێ بیاندەنێ, چونکە خوا ڕزقی ئێوەشو ئەو منداڵانەش دەدات .

جا ئازیزانم: کاتی خۆی پێش هاتنی نووری ئیسلام بۆ ڕووناککردنەوەی تاریکییەکانی سەر زەوییو ژیانی مرۆڤایەتی, باوكو دایکەکان لەترسی ئەوەی نانو پێخۆرو جلوبەرگی منداڵەکانیان بۆ دابین نەکرێ دەیانکوشتنو بەزیندوویی زیندەبەچاڵیان دەکردن. خوای گەورەش بەم ڕاسپاردەو وەصیەتە ئاگاداری کردنەوە کەنەکەن کاری وا هەڵە بکەن, بەلام ئەمڕۆ لەخوا بەزیاد بێ لەزۆربەی وڵاتانو وڵاتی ئێمەو شارو لادێی ئێمەدا مەسەلەی بژێوی ژیانو نانو خۆراك, ئاسان بووەو کەسێك نییە منداڵی خۆی بکوژێ

لەترسی ئەوەی کە لەبرسان بمرێو نانی منداڵەکەی پێنەدرێو بەهۆی ئەوەوە برسیی ببێ.

کەواتە: دەتوانین ئەمڕۆ تەفسیری ئەم وەصیەتە وا بکەین کەخوای پەروەردگار وەکو لەئایەتێکیتردا فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾, واتە: ئەی ئیمانداران خۆتانو ماڵو منداڵتان لەئاگری بلێسەداری دۆزەخ بپارێزن, خوای گەورە لێرەشدا بفەرموێ: ئەی ئیماندارانی ئومەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسلَّم ئاگاتان لەمنداڵەکانتان بێ, بەهۆی پشت گوێخستنو لێنەپرسینەوەو پەروەردەنەکردنیانو کوڵ پێوەهەڵنەگرتنیانەوە منداڵەکانتان لەناو مەبەن. بەڵکو وەرن بزانن خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چییان فەرمووە ئاوا پەروەردەیان بکەنو لەسەر ئەو ڕێبازە منداڵەکانتان گەورە بکەن, لەبەر ئەوەی هەر منداڵێك لەسەرەتای منداڵییەوە پەروەردەیەکی شەرعییانە نەکرێو گوێی پێنەدرێو بەرەڵای کوڵان بکرێ, ئەوە بەڕاستی لەگەورەبوونیدا دەبێتە مایەی نەگبەتیو نەهامەتی بۆ ژیانی خۆیو هەموو ژیانی بەدبەختیوماڵوێرانی لەتاریکیی ژیاندا کۆتایی دێتو هەروەها دەبێتە ئاگرو ژیانی دایكو باوكو خوشكو براو کۆمەڵگای دەوروبەریشی, وەخاكو میللەتەکەیشی دەسوتێنێ!

دەی ئیماندارانی خۆشەویست, ئەی دایكو باوکە بەڕێزەکان, فەرموون با لەم وتارەشدا باسێکی تر لەپەروەردەی منداڵ بکەینو درێژە بەوتاری ڕابردوو بدەین کەگوتمان بەشەکانی پەروەردە بریتین لەپەروەردەی ئیمانیو لایەنی بیروباوەڕ, وەدووەم" پەروەردەی پەرستنو عیبادەتەکان ,سێیەمیش پەروەردەی زانستیو فێرکردن, چوارەمیش" پەروەردەی کۆمەڵایەتیی منداڵ.

لەم وتارەشدا بەشەکانی پەروەردە تەواو دەکەینو دەڵێم وَبِاللهِ التَّوْفِيق:

## پێنجەم: پەروەردەی دەروونی ( التَّرْبِيَةُ النَّفْسِيَّةُ )

پەروەردەی پێنجەم کەپێویستە زۆر ئاگامان لێی بێو منداڵی لێ بێبەش نەکەین بریتییە لەپەروەردەی دەرونی, ئەمەش بەوەی کەدەروونی منداڵ ئازار نەدرێ بەشتێك کەتوانای تێگەیشتنی نیە لێی, واتە: دەبێ: بەزمانی منداڵو بەگوێرەی تێگەیشتنو حاڵیبوونی مێشکی منداڵ قسەی لەگەڵدا بکرێو پرسیاری لێبکرێ. با بزانین

خۆشەویستمان تاجی سەرمان محمد المُصطفى صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەو بارەیەوە چۆن ڕەفتاری لەگەڵ منداڵدا کردووە؟!

لەغەزای بەدردا، لەکاتێکدا صەحابەکان بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەسوپای قوڕەیش‌و جۆری چەك‌و کەلوپەلی سەربازییان چوون بۆ کەمین‌و منداڵە شوانێکی قوڕەیشیان بەدیل گرت، هێنایانە سەربازگەی موسڵمانان‌و دەربارەی ژمارەی سوپای قوڕەیشی موشریك‌و دژ بەخوا، پرسیاریان لەمنداڵەکە کرد کەژمارەیان چەند کەسە، منداڵەکە نەیدەزانی ژمارەکەیان بڵێ‌و بەچاکی وەڵامی بۆ نەدرایەوە. صەحابەکان وایان زانی ڕاستییەکەیان پێ ناڵێت بۆیە هەندێ ترساندیان‌و ئازاریان دا، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هات بۆ لایان کە بەڕاستی هەر ئەو تاجی سەرو خۆشەویستە زانای ڕاستەقینەی دەروون ناسییە، لێیان نزیك بۆوەو فەرمووی: ئەوە چی لەو منداڵە دەپرسن‌و بۆچی لێی تووڕە دەبن؟ عەرزیان کرد: قوربان لێی دەپرسین ژمارەی سەربازەکانی قوڕەیش کەبۆ دژایەتیی موسڵمانان لەمەککە هاتوونە دەرەوە چەندن؟ چەند کەسن؟ چەند هەزارن، پێمان بڵێ.. بەڵام ئەم منداڵە ڕاستییەکەمان پێ ناڵێت.

پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئێوە وازی لێ بێنن. پاشان بانگی منداڵەکەی کردە لای خۆی‌و دەستی بەسەردا هێناو دڵنەوایی کردو فەرمووی: ئەی منداڵی عاقڵ من پرسیارێکت لێدەکەم، باشە ئەو سوپایەی قوڕەیش ڕۆژانە چەند حوشتر سەردەبڕن؟! چەند حوشتر دەکەن بەخۆراکی ئەو ڕۆژەیان؟ منداڵەکە یەکسەر وەڵامیدایەوەو گوتی: ڕۆژی وا هەیە دە حوشتر سەردەبڕن، ڕۆژی واشە نۆ حوشتر سەردەبڕن. پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: تەواو تێگەیشتم! کەواتە سوپاکەی قوڕەیش لەنێوان نۆسەد تا هەزار کەسە!

ئیمانداران: تەماشاکەن، پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم زانی ئەو منداڵە شوانە لەو تەمەنە کەمەدا، لەژمارەی هەزاران نازانێت، بەڵام تواناو تێگەیشتنی عەقڵی دەرك بەژمارەی دەیان دەکات، دەیانی چ شتێکیش؟! دە حوشتر کەژماردنی لای هەمو منداڵێك ئاسانە، ئەوەش بەهۆی گەورەیی لاشەی حوشترەوە.

نموونەیەکی ترتان بۆ باس بکەم لەسەر چاودێریکردنی دەروونو نەفسی منداڵو سەرکۆنە نەکردنی لەلایەن پێغەمبەری ئیسلامەوە صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم.صەحابەیەکی زۆر خۆشەویستو بەڕێز، کەهەموو تەمەنی منداڵی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بەسەر بردووە، ناوی ئەنەس کوڕی مالیکە (خوا لێی ڕازی بێ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: من منداڵ بووم، لەماڵی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللّهُ عَلَيه وَسَلَّم دەژیامو ئیشم بۆ دەکردنو پێویستیی دەرەوەی ماڵو شت کڕینی بازاڕو ئەملاولام بۆ جێبەجی دەکردن. جا لەبەر ئەوەی تەمەنم منداڵ بوو، گەلێك جار ماڵی پێغەمبەری خوا دەیانناردم بۆ شتێكو دەیانگوت بڕۆ فلان ئیش بکە، یان فلان شتمان بۆ بکڕە، منیش کە لەماڵ دەچوومە دەرەوەو چاوم بەمنداڵان دەکەوت، لەگەڵیاندا دادەنیشتمو دەستم دەکرد بەیاریکردنو ئیشەکەم لەبیردەچۆوە، یان لەبیرم دەچۆوە کەبۆ چییان ناردووم دەچووم شتێکم بۆ دەکڕین کەئەوان داوایان نەکردبوو. جا کاتێ درەنگانێك دەچوومەوە ماڵەوە، خاووخێزانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لێم تووڕە دەبوونو دەیانگوت: باشە بۆ ئەوەت کڕیوە لەجیاتی ئەوەی ئێمە پێمان گوتی بیکڕە؟! یان بۆ نەچووی بۆ ئەو شوێنەی ئێمە ناردمانی بۆی؟! بەم شێوەیە لێم تورە دەبوونو لۆمەیان دەکردم. بەڵام یەکسەر پێغەمبەری خوا (بەدایكو باوکمەوە بەقوربانی بم) فریام دەکەوت (چونکە رَسُولُ اللّه لەسنووری توانای تێگەیشتنی منداڵ چاك تێگەیشتبوو)، بۆیە دەیفەرموو: وازی لێبێنن، لێی تووڕە مەبن، ئەگەر لەتوانایدا بوایە دەیکرد. واتە: منـــداڵە بۆیە لەبیری چۆتەوە، یان لێی تێك چووە، ئەوەش پەیوەندیی بەکەمی تەمـــەنەوە هەیەو جێگای ئەوە نیە سەرزەنشت بکرێ.

بەڵێ خۆشەویستان: لەمەوە تێدەگەین کەمنداڵ خاوەنی توانایەکی فیکریو جەستەیی دیاریکراوە، داواکردنی بۆ ئەنجامدانی کاروباری وەها کە لەسەرووی توانای فکرو مێشكو لاشەو جەستەیەوە بێت، وەك چاندنی تۆوە لەهەوادا! هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کەمنداڵ بیری تیژەو دەبێ سەرکوت نەکرێو ڕێگای دەربڕینی بیروباوەڕی خۆی هەبێ، تاوەکو خۆی لا بێهێز نەبێو متمانەی بەخۆی هەبێ.

صەحابیی گەنجو شارەزا, عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: جارێکیان کەمن تەمەنم منداڵ بوو, لەخزمەت باوکمدا چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم, کەچووینە خزمەتی تەماشامان کرد وا چەند صەحابی لەپیرو لەگەنج لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتوونو دەوری حەزرەتیان داوەو بەڕاستی نوورو بەرەکەت لەمەجلیسەکە بەرز دەبۆوە, دەفەرموێ: منو باوکیشم سەلامامان کردو چووین لەشوێنێکدا کەچۆڵ بوو لێی دانیشتینو گوێمان بۆ فەرمایشتەکانی حەزرەتی رسُولُ الله گرت.

جا یەکێك لەئوسلوبە پڕ حیکمەتەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم بۆ ڕازاندنەوەی مەجلیسو کردنەوەی مێشكو دڵودەروونی گوێگر بۆ فەرموودەکانی ئەوەبوو, گەلێ جار پرسیاری لەو کەسانە دەکرد کەگوێیان بۆ گرتووە, بۆ ئەوەی ئەوانیش قسەی خۆیان هەبێو ئازادیی ڕادەربڕینی بۆچوونەکانیان لێ زەوت نەکرێت. عەبدوڵڵا دەفەرموێ: جا هەر لەو مەجلیسەدا پێغەمبەری خوا بەچاوە جوانو پڕ میهرەبانییەکانی, سەیرێکی یەکە بەیەکەی ناو مەجلیسەکەی کردو فەرمووی: خۆشەویستانم, ئەی هاوەڵە بەڕێزەکانم, پرسیارێکتان لێدەکەم کێتان زانیی وەڵامم بداتەوە, پرسیارەکەشم ئەمەیە: (إِنَّ مِنَ الشَّجَرَةِ شَجَرَةً لا يَسْقُطُ وَرَقُها وإنَّها مَثَلُ المُؤْمِنِ, فَحَدِّثُوني ما هِيَ؟!) فەرمووی: بەڕاستی درەختێك هەیە لەناو درەختەکاندا هیچ کاتێ گەڵاکانی هەڵناوەرێو, زۆر خۆڕاگرو ڕەگ داکوتراوەو هێزی ڕەشەبا نایجووڵێنێت, ئەم درەختە وەکو ئینسانی ئیماندار وایە, ئیمانداریش ئاوا خۆڕاگرو بەعەزیمەتو ورەبەرزو چاونەترسو هەمیشە گەشو دڵکراوەیە. فەرمووی: دەی پێم بڵێن ئەو درەختە چیە؟! عەبدوڵڵا دەفەرموێ: دانیشتوانی مەجلیسەکە دەستیان کرد بەناوبردنی درەختەکانی بیابانو شیوو دۆڵەکان بەڵام هیچیان وەڵامەکەیان ڕاست نەبوو, منیش کەمنداڵبووم لەمەجلیسەکەدا دانیشتبووم, یەکسەر بەمێشکمدا هات کەئەو درەختە ـ داری خورمایە, ویستم قسە بکەمو بڵێم: ئەی پێغەمبەری خوا, من دەزانم ئەو درەختە چیە, ئەوە داری خورمایە, بەڵام کەسەرم هەڵبڕی تەماشام کرد ئیمامی ئەبوبەکرو عومەری باوکم دانیشتون, بۆیە شەرمم کرد قسە لەمەجلیسێکدا بکەم کەئیمامی ئەبوبەکرو باوکمی تیا

دانیشتبێ, ئەوەبوو قسەم نەکرد, پاشان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: دەی مادام کەستان نەتانزانی ئەو درەختە کامەیە, وا من پێتان دەڵێم: ئەوە درەختی دار خورمایە. عەبدوللا دەفەرموێ: جا کاتێ چووینەوە بۆماڵەوە بەباوکمم گوت: بابە گیان بەخوا دەمزانی کەئەو دارەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم دەربارەی پرسیاری کرد چیە, دەمزانی داری خورمایە, بەڵام بەخوا شەرمم کرد تۆو ئیمامی ئەبوبەکر دانیشتبێ‌و من قسە بکەم. حەزرەتی عومەر فەرمووی: بەڵام رۆڵە گیان بزانە: (لَوْ قُلْتَها کانَتْ أفْضَلُ عِندي مِنْ حُمُرِ النَّعَمِ)(رَواهُ البُخاري), فەرمووی: بەخوا ئەگەر بتگوتایەو قسەت بکردایە لەلای من خۆشتر بوو لەوەی کەرانە حوشتری سوور کە بەنرخترین سامانە لای عەرەب, هی من بوایە. لەم فەرموودەیەوە تێدەگەین کەدەبێ منداڵ هان بدرێ بۆ ئەوەی لەشوێنی خۆیو لەکاتی پێویستدا با کەسی لەخۆیشی گەورەتر ئامادەبێ, شەرم نەکاو بڕوای بەخۆی بێ‌و قسەی خۆی بکات.

خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم بەردەوام هانی منداڵانی داوەکەبڕوایان بەخۆیان بێ‌و پشت سارد نەبنەوەو خۆیان بەکەم نەزانن, ئەوەتا جارێکیان خۆشەویست صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم بەبازاڕی شاری مەدینەدا دەڕۆیشت, تەماشایکرد وا منداڵێکی بچکۆلانە شت دەفرۆشێت‌و هەندێ کەلوپەل‌و شتومەکی منداڵانەی لەبەردەمدایەو بەدیاریانەوە دانیشتووە, پێغەمبەری خوا, کەتەواو لێی ورد بۆوە ناسیەوە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرە کەباوکی شەهید بووەو هەتیوە. پێغەمبەری خوا زۆری پێخۆشبوو کەئەم منداڵە هەرچەند تەمەنی کەمەو هەتیوەو دەست کورتە, بەڵام سواڵ ناکات‌و دەست پان ناکاتەوەو لەجیاتی ئەوە دانیشتووە شت دەفرۆشێت‌و کاروکاسپی دەکات, بۆیە سەلامی لێکردو لەلایەوە دانیشت‌و دەستی بەسەردا هێناو فەرمووی: یاڕەبی رۆڵە تەمەن درێژبیت‌و خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کاروکاسپیەکەتەوە. بەم شێوەیە هانی ئەو منداڵەیدا لەسەر کاسپی‌حەڵاڵ‌و متمانەی بەخۆی زیاد کرد.

دەبا ئێمەش چاو لەپێغەمبەرەکەمان بکەین‌و هانی ئەو منداڵانە بدەین کەکاسپی حەڵاڵ‌و شەرەفمەندانە دەکەن‌و دوعای خێریان بۆ بکەین‌و متمانەیان بەخۆیان زیاد بکەین‌و بەچاوی ڕێزەوە تەماشایان بکەین.

بەڕێزان: هەر لەپەروەردەی دەروونیی منداڵە کەئەگەر قسەیەکی جوان‌و ڕێکوپێکی کرد دەبێ لێی وەرگری: زانای بەناوبانگ مەجاشیع کوڕی یووسف گێڕاویەتیەوە کەگوتوویەتی: لەشاری مەدینە بووم لای ئیمام مالیك لەکاتێکدا فتوای بۆ خەڵك دەدا, لەو کاتەدا محمدی کوڕی حەسەن, کەمنداڵێکی تازە پێگەیشتوو بوو, لەئیمامی مالیکی پرسی: چی دەڵێی دەربارەی کەسێك لەشی پیسەو ئاوی دەست ناکەوێ خۆی پێ بشوات, ئاو تەنها لەناو حەرەمی مزگەوتدا هەیە؟ ئیمامی مالیك فەرمووی: ئینسانی لەش پیس بۆی نییە بچێتە مزگەوتەوە. منداڵەکە گوتی: ئەی باشە چی بکات, وا کاتی نوێژ هاتووەو چاویشی لەئاوە لەناو مزگەوتدا هەیە؟! ئیمامی مالیك فەرمووی: من دەڵێم نابێ لەش پیس بچێتە مزگەوتەوە. بەڵام منداڵەکە چەند جارێك پرسیارەکەی دووبارەکردەوە, ناچار ئیمامی مالیك فەرمووی: ئەی منداڵ ئەی بەڕەئی تۆ چی بکات باشە؟! منداڵەکە گوتی: قوربان ئەو کەسە پێویستە لەدەرەوەی مزگەوتەکە تەیەموم بکات‌و پاشان بچێتە ناو مزگەوتەکەوەو ئاو لەحەوزی ناو حەرەمی مزگەوتەکە بێنێتە دەرەوەو پاشان لەدەرەوەی مزگەوتەکە خۆی بشوات‌و لەش پیسی لەسەر خۆی لاببات‌و ئەمجا نوێژەکەی بکات! ئیمامی مالیك بەسەرسوڕمانەوە فەرمووی: ئەی منداڵی چاوگەشی جوان‌و زیرەك ئەوە تۆ خەڵکی کوێی؟ منداڵەکە گوتی: قوربان خەڵکی ئێرەم (بەپەنجەی دەستیشی ئاماژەی بۆ زەویەکە کرد), ئیمامی مالیك فەرمووی: باشە تۆ کەئەوەندە زیرەکیت چۆن درۆ دەکەیت دەڵێی خەڵکی مەدینەم, بەڵام من باش دەزانم کەتۆ خەڵکی ئەم شارە نیت‌و تا ئێستا نەمبینیویت؟ منداڵەکە گوتی: قوربان من گوتم خەڵکی ئێرەم‌و دەستم بۆ زەویەکە درێژ کرد, واتە لەم خاکە دروست بووم, ئیتر درۆم نەکردووە! ئیمامی مالیك فەرمووی: ئەم قسەیانت لەوەی پێشتر عاقڵانەتر بوو, وەزیاتر سەرنجی ڕاکێشام, بەڕاستی تۆ ئەگەر لەسەر خوێندن بەردەوام بیت ئەوە دەبی بەزانایەکی بەناوبانگی ئیسلام. پاشان ئەم منداڵە لای ئیمامی مالیك مایەوەو کتێبی (المُوَطّأ)ی لەخزمەت ئیمام مالیکدا خوێندو لەکۆتاییدا بوو بەیەکێك لەو دوو کەسە بەناوبانگەی کەمەزهەبی ئەبوحەنیفەیان زیندوو کردۆتەوە کە (محمد و أبو یوسف)ن, محمد ئەم منداڵەیە!

خۆشەویستان: خاڵێکی تری زۆر گرنگ کەپەیوەندیی بەپەروەردەکردنی لایەنی دەروونییو نەفسیی منداڵەوە هەیەو دەبێ ئاگامان لێی بێ ئەوەیە: نابێ منداڵ بترسێندرێ بەشتی سامناک، وەکو لەکۆندا منداڵ دەترسێندرا بەشەلەبانو دێوو خێوو جنۆکەو چەند شتیتر، تا ئەوەبوو منداڵەکە لەترسان دەخەوت، کە بەڕاستی ئەمە زۆر کاریگەرییو شوێنەواری خراپ لەسەر دەروونی منداڵ بەجێدێڵێ، تا وای لێدێ لەتەمەنی گەورەییشدا لەو شتانە دەترسێتو تارماییو سامناکیەکەیانی هەر لەبەرچاوە. بەداخەوە لەسەردەمی ئەمڕۆشماندا دەزگاکانی ڕاگەیاندن زۆر شتی سامناک لەکەناڵەکانیانەوە بڵاودەکەنەوە، کەتەئسیرو کاریگەریی زۆر خراپی لەسەر دەرونی منداڵان دەبێت، وەکو ئەو سیدیانەی کەشەڕو کوشتنو لەیەکتردانی تێدایەو بەبەرچاوی منداڵەوە لەماڵەوە لێدەدرێت، کە لەدوو ڕووەوە زەرەر لەمنداڵ دەدات:

یەکەم: ترس لەناخی منداڵەکەدا دروست دەکاتو لەوانەیە شەوانە لەخەودا بێتەوە بەرچاوییو تووشی ترسان بێت، وەکو ئەوەی کەمنداڵێك لەشاری سلێمانی، دوای ئەوەی تەماشای فلیمێکی شەڕو کوشتنی کردبوو، شێت بوو.

دووەم: ئەوروپاو ئەمریکا، کەزۆربەی فلیمە سامناکەکان لەوێ دەردەچن، لای خۆیان قەدەغەیە منداڵ تەماشای بکاتو ناهێڵن لەسینەما گشتییەکاندا کەژنو منداڵ تەماشای دەکەن، نمایش بکرێت.

هونەرمەندی شانۆکاری ناسراو (حاجی مەکی عەبدوڵڵا) دەڵێ: کاتێ فیلمی کوردی (نێرگز بووکی کوردستان)م برد بۆ دەرەوەی وڵات، لەهیچ وڵاتێکی ئەوروپی مۆڵەتیان پێنەدام کە لەسینەمای گشتی کەژنو منداڵ سەیری دەکەن لێبدرێ. گوتم: هۆی چیە ڕێگەم نادەن؟! گوتیان: چونکە دیمەنێکی ترسناکی تێدایە، کەئەوەیە مەڕێك سەردەبڕدرێتو خوێنی لەبەر دەڕواتو پەلەقاژەی مەرگیەتی، ئەوە دیمەنێکی ترسناکە بۆ منداڵو تووشی نەخۆشیی دەروونیی دەکات!!

بەڵام بەداخەوە لای ئێمە نەك فیلمەکان هەر مەڕیان تێدا سەردەبڕدرێت، بەڵکو نەك هەر ئینسانێك دەیان ئینسانی تێدا دەکوژرێو سەردەبڕدرێو تۆپو فڕۆکە لێی دەداو خوێن دەڕژێو خانوو کاول دەبێو دۆزەخ بەرپا دەبێ! منداڵی بەستەزمانیش

بەدیاریەوە دادەنیشێ‌و چاوی بەرامبەری زەق دەبێ‌و مێشکی تەحەمولی ناکات‌و لەوانەیە شەوانە لەخەودا لەزریکە بدات‌و تووشی ترسان ببێ, ئەمەش کاریگەریی خراپی یەکەمی تەماشاکردنی فیلمی شەڕو کوشتن لەلایەن منداڵەوە.

کاریگەریی سلبیی دووەم ئەوەیە: منداڵ کاتێك ئەو فیلمی شەڕو کوشتنە دەبینێت, هەوڵی لاسایی کردنەوەیان دەدات, ئەویش هەوڵدەدات لاسایی بکاتەوە چۆن لەمنداڵێکی‌تر بدات, چۆن ئەویش لەبەرزییەکەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە, ئەمانەش هەمووی بەواقیعی ڕوویانداوە, بۆ نموونە: (د. صالح ألونیان) کەوتاربێژێکی سعودییە, لەکتێبی (صَوتُ المِنبَر, ج 3, ص159)دا چەند نموونەیەك باس دەکات کە لەوڵاتی سعوودیە لەئەنجامی تەماشاکردنی فیلمی شەڕو عەصابە ڕوویان داوەو پاشان چەند منداڵێك تووشی ئەم کارەساتانە بوون.

1 ـ منداڵێکی تەمەن شەش ساڵان لەسەربانی ماڵەکەیانەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوەو دەست بەجێ دەمرێ. ئەم منداڵە پێشتریش چەند جارێك لەشوێنی بەرزی وەکو سەرقاڵدرمەو کورسی‌و ئەوانەوە خۆی فڕێ داوەتە خوارەوە, لێیان پرسیوە بۆچی وا دەکەی؟ گوتوویەتی: دەمەوێ وەك ئەو پیاوەی ناو فیلمە ڤیدیۆییەکە کە لەسەربانەکەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوەو دەفڕێ, منیش دەمەوێ وا بکەم. سەرەنجام وای‌کردو گیانی لەدەست دا!

2 ـ منداڵێکی تەمەن هەشت ساڵ, پەتێك بەبنمیچی خانووەکەیانەوە هەڵدەواسێ‌و لەقوڕگی خۆی توندی دەکات‌و کورسیەکەی ژێر قاچی خۆی لادەبات‌و پەتەکە لەقوڕگی توند دەبێت‌و چەند هەناسەیەك پێش مردنی, دایکی فریای دەکەوێت‌و دەیهێنێتە خوارەوە, ئەم منداڵەش چاوی لەفیلمێك بووە کەپیاوێك چۆن ئیعدام دەکرێ‌و لەسێدارە دەدرێ, ئەمیش لاسایی ئەوی کردۆتەوە!

3 ـ منداڵێك کە لەسەرەتای یەکەمی تەمەنیدایە, واتە (3 ـ 5) ساڵانە لەیەکێك لەنەخۆشخانەکاندا دەخەوێنرێت, لەبەر ئەوەی تووشی نەخۆشیی عەموودی فەقەری بووەو مەترسیی شەلەلی لێدەکرێت بەهۆی ئەوەی برایەکی لەسەر

کورسیەکی بەرزەوە خۆی فڕێ دەداتو بەلەقە لەپشتی براکەی دەدات, گوایە لاسایی فیلمێکی کاراتیو لێدان دەکەنەوە!! کەواتە با ئاگادار بین ئەمجۆرە فیلمانە لەماڵدا لەبەرچاوی منداڵ لێنەدەین بۆ ئەوەی تووشی مەترسیی لەو جۆرە نەبین.

بەڵێ ئەمە پەروەردەی دەروونیی منداڵ بوو کەباسمان کردو دەبێ زۆر گرنگیی پێبدرێو منداڵ وەکو ئەمانێك چاودێری بکرێو بەپێی پلەی فامو ژیریو تێگەیشتنی قسەو ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ.

## شەشەم: پەروەردەی لاشەیی منداڵ (التَّربِيَةُ الجَسَدِيَّةُ)

بەڵێ پێویستە لەسەر دایکانو باوکانو پەروەردەکارانی منداڵان, کەزۆر گرنگی بدەن بەپاراستنی تەندروستیو لاشەدروستیی منداڵەکانیانو بیانپارێزن لەهەمو نەخۆشییەكو هەوڵی بەهێزبونی لاشەیان بدەن, ئەمەش لەڕێگای وەرزشی ڕەواو بەسوودەوە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (حَقُّ الْوَلَدِ عَلَى الْوالِدِ أنْ يُعَلِّمَهُ الْكِتابَةَ والسِّباحَةَ وَالرِّمَايَةَ وَألاَّ يَرْزُقَهُ إلاَّ طَيِّباً)(رَواهُ البَيهَقي), واتە لەمافی منداڵە بەسەر دایكو باوکیەوە کەفێری نووسینو خوێندنەوەو مەلەوانیو تیرەندازیی بکەنو هەروەها نانو ئاوی حەڵاڵ نەبێ دەرخواردی منداڵەکەیانی نەدەن.

کەواتە پێویستە باوکی موسڵمان هەوڵ بدات منداڵەکەی فێری ئەم شتانە بکاتو حکومەتیش کارئاسانی بۆ بکاتو خولی (خۆشنووسی, مەلەوانی, ئەسپ سواری, شۆفێری, جۆرەکانی تری وەرزش) بۆ منداڵان بکاتەوە, وەکردنەوەی ئەم خولانەو دابین کردنی شوێنی پێویست بۆی لەدوو لاوە سوودی دەبێت:

یەکەم: منداڵ فێری ئەم وەرزشە بەسوودانە دەبێتو لەداوڕۆژدا سوودی لێوەردەگرێت.

دووەم: منداڵ بەم شتانەوە مەشغوڵ دەبێتو دووردەکەوێتەوە لەگەڕانی کۆڵانو فێربوونی قسەی ناشیرینو بەخۆڕایی بەفیڕۆدانی تەمەنی سپییەتیو سروشتی پاکی منداڵی!

هەروەها بۆ ئەوەی منداڵ ڕابهێنرێت لەسەر وەرزشی بەسوود پێویستە پێشبڕکێیان بۆ ساز بکرێو خەڵات بەسەرکەوتووەکان بدرێ, ئەوەتا پێغەمبەری خوا

صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم پێشبڕکێی ڕاکردنی لەنێوان منداڵاندا ئەنجام دەدا, هەتا ماسولکەکانیان گەشە بکات و جەستەو لاشەیان بەهێز بێت. بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم عەبدوڵڵاو عوبەیدوڵڵاو کەثیری کوڕانی عەباسی ڕیز دەکردو پاشان بۆ خۆی دوورەدەکەوتەوە بۆ ماوەی چەند مەترێك و پێی دەفەرموون: (مَنْ سَبَقَ إِلَيَّ فَلَهُ كَذا وَكَذا), واتە: هەرکەسێك زووتر بگاتە لام ئەوەو ئەوەی دەدەمێ! جا منداڵەکانیش بەپەلە ڕایان دەکرد بۆ لای پێغەمبەری خواو هەریەکەیان هەوڵی دەدا زووتر بگاتە لای, جا کەدەگەیشتە لای پێغەمبەری خـــــــوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم, باوەشی بۆ دەکـــردنەوەو ماچی دەکـــردن و لەئامێزی دەگرتن!

بەڵێ خۆشەویستان: ئەمەشیان واجبی حکومەتە کەئەو جۆرە .یاریگایانە دروست بکات و شوێن و کات و جۆری ڕاکردن دیاری بکات و خەڵات بۆ منداڵی سەرکەوتوو ئامادە بکات, کەئەمجۆرە پێشبڕکێ و خەڵات وەرگرتنە چەند سوودێکی تێدایە:

یەکەم: منداڵ هەست بەچێژو شادیی و بەختەوەری دەکات, هەموو منداڵێك خۆی ئامادە دەکات و هەموو توانای بەکاردێنێت تا بگاتە سەرکەوتن.

دووەم: بەسەرکەوتن یان نەبردنەوەی پێشبڕکێکەو, وەرگرتنی خەڵات یان وەرنەگرتنی, منداڵ لەوە تێدەگات و دەبێ تێبگەیەنرێت کەژیان لەڕاستیدا ئاوایە, ژیان وەکو ئەو ڕاکردنە ململانێ و پێشبڕکێیە, هەندێ جار ئینسان دەیباتەوە, هەندێ جار دەیدۆڕێنێ. بەڵام لەهەر بارێکدا ئینسان دەبێ دووربکەوێتەوە لەئەنانیەت و خۆپەرستیی و تاکڕەویی و بیرو بڕوای بەکۆمەڵ ژیان گەشە پێبدات.لێرەدا دوو سەرنجم هەیە

یەکەمیان: گەلێك جار دەبیستین کەدەگوترێ: منداڵانی ئەم وڵاتە ژیانیان بەفیڕۆ ڕۆیشتووەو منداڵانی ئەورووپاو ئەمریکاو جیهانی یەکەم, ژیانیان بەهەشتی سەر زەوییە (بەتایبەت هەندێ لەوانەی لەدەرەوەی وڵاتەوە دێنەوە ئەم قسەیە دەکەن و زۆر جار دەیکەن بەڕەخنە لەسەر ئیسلام و ژیانی موسڵمانانە), لەوەڵامی ئەو جۆرە قسەو باسانەدا دەڵێم: هەرچەندە بەو شێوەیەش نییە کەباس دەکرێ و وا لەخەڵکی ئێرە دەگەیەندرێ کەمنداڵانی ئەورووپی و ڕۆژئاوایی لەبەهەشتدان, نەخێر, بەڵکو زۆربەیان زۆر مەحروومن لەباوەش و سۆزی گەرمی دایك و باوکیان, بەتایبەتی دایك, چونکە

لەوێ (بەتایبەت بۆ دانیشتوانەکانی هاووڵاتی خۆیان) چۆن پێویستە پیاو ئیش بکات, ئاواش پێویستە ئافرەتیش کار بکات, ئەگینا ناژین. جا منداڵ چونکە ڕۆژانە دایکی لەئیشکردنە, لەسۆزی دایکی بێبەشەو دایەنگا بەخێوی دەکات, شەویش کەهاتەوە دایکی ماندووەو حەوصەڵەی لەباوەش گرتنی نیە. کەواتە منداڵ لەوێ هەرچەندە لەلایەنی جەستەیی‌و مادییەوە خۆشگوزەرانە, بەڵام لەلایەنی سۆزو عاطیفە ی نێوان دایك‌و منداڵ وێرانە. بەڵام لەدینی ئێمەدا, لەشەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا, ئافرەت لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیدا, جا کچ بێ, یان ژن بێ, خاوەن منداڵ بێ, یان بێ منداڵ, دەبێ بژێوی ژیانی لەلایەن پیاوانەوە (جا باوك بێ یان برا بێ, یان ئەگەر شووی کردبوو, لەلایەن هاوسەرەکەیەوە) بۆ دابین بکرێ‌و ژیانی مسۆگەر بکرێ, خۆ بەتایبەت ئەگەر دایکی منداڵ بوو ئەوە زێدە مافو حقووقی دەبێ‌و پێویستە هەموو وەسائیلێکی خۆشگوزەرانیی بۆ دەستەبەر بکرێ, بۆ ئەوەی هەموو هۆش‌و هەست‌و سۆزی تەنها لای منداڵەکەی بێ‌و لێی دانەبڕێ.

جا خۆتان بەویژدانەوە بەراورد بکەن, ئایا ئیسلام مافی ژن‌و مافی منداڵی داوە یان ئەورووپاو جیهانی ڕۆژئاوا؟! وەڵامەکەی بۆ خۆتان.

سەرنجی دووەمم ئەوەیە: بەڕاستی ئەم دینەی ئێمە واتە ژین, چونکە سەرتاسەری ژینی ئینسان هەر لەدایك بوونەوە تا مردن لەم دینی ئیسلامەدا لەلایەن خوای ئەو دینەوەو ئەو پێغەمبەرە سەروەرو سالارەی ئەم ئیسلامەوە باسکراوەو, ژینی ئێمەی موسڵمان هەمووی بەدین حیسابە. دین‌و ژین لای ئێمەی ئەهلی ئیسلام‌و ئیمان دوو شتی لەیەکتر جیاواز نین, بۆ نموونە: هەر لەم فەرموودەی پێغەمبەرەوە صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم تەماشاکە: چۆن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمانی بەباوك دا کەمنداڵەکەی فێری نوێژکردن بکات (کەئەمە پەرستش‌و عیبادەت‌و دینە) بەهەمان شێوە فەرمانی بەباوك کردووە کەمنداڵەکەی فێری خوێندن‌و نووسین‌و مەلەوانی‌و خۆشنووسی‌و ئەسپ سواری‌و شۆفێری‌و تیرەندازی بکات‌و نانی حەڵاڵ نەبێ دەرخواردیان نەدات. واتە: ئەمەش هەر دینەو بەجێبەجێ نەکردن‌و ئیهمال کردنی, باوك تاوانبار دەبێت, وەکو ئەوەی‌کەتاوانبارە کاتێ منداڵەکەی فێری نوێژ ناکات. جا کەمنداڵەکانمان لەم شتانەو لەم

وەرزشانە بێبەشن ئەوە خەتای ئیسلام نیە, بەڵکو خەتای دوو چینە:

یەکەم: باوکان‌و دایکان, کەئێستاش زۆر باوک‌و دایك نازانن کەئەمانە (مەلەکردن‌و شۆفێری.. هتد) بەشێکن لەدین‌و, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ئەمری پێکردوون.

دووەم: حکومەت" کەشوێنی یاریکردن‌و ئاسوودەیی منداڵان تەنها بۆ کوڕو کچی لێپرسراوان‌و دەوڵەمەندان دابین دەکات‌و رۆڵەی هەژاریش کەسووتەمەنیی شۆڕشە لێی بێبەشە!

## حەوتەم: پەروەردەی ڕەوشتی ( التربية الخُلُقيَّة )

پەروەردەی ڕەوشتی, بەشی حەوتەمی پەروەردەی منداڵە, ئەمەش بەوەی کەدایك‌و باوك‌و سەرپەرشتیارانی منداڵ, هەوڵبدەن بۆ چاندنی هەموو کارو کردەوەیەکی جوان‌و پەسەند لەناو دڵ‌و دەروونی منداڵدا, ئەمەش لەو ڕێگایەوە کەوەصفی کرداری چاکەی بۆ بکەن‌و بەکردەوە لەبەرچاویدا ئەنجامی بدەن‌و, دووربن لەهەموو کردەوەیەکی نەشیاوو لای منداڵەکانیان باسی نەکەن, وەکو هەندێ کەس کاتی خۆی دزیی‌کردووە کەچی بەفەخرەوە لەبەرچاوی منداڵەکانیدا دەیگێڕێتەوە.

جا بەڕاستی دەبێ منداڵ, لەتەمەنی منداڵیدا دووربخرێتەوە لەهەموو کارو کردەوەیەکی ناپەسەند, وەکو جارێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چاوی لێبوو ژنێك بانگی کوڕە بچکۆلەکەی دەکات‌و دەڵێ: وەرە شتێکت دەدەمێ, پێغەمبەری خوا بەژنەکەی فەرموو: ئایا نیازت وایە هیچی بدەیتێ؟ گوتی: بەڵێ, خورمای دەدەمێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (لَوْ لَمْ تُعْطِهِ لَكُتِبَتْ عَلَيْكِ كَذْبَةٌ)(رَوَاهُ أبو داود), فەرمووی: ئەگەر هیچت نەدایە ئەوە درۆیەکت لەسەر دەنووسرا! بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئەم منداڵەش فێری درۆکردن دەبێ لەگەڵ خەڵکیدا.

جا لەو خووڕەوشتە بەرزو پڕ بەهایانەی کەدەبێ لەمنداڵییەوە منداڵی لەسەر ڕابهێنرێ ئەوەیە:منداڵ فێری حەڵاڵخۆری‌و دوورکەوتنەوە لەحەرام بکرێ, وا تێبگەیەنرێ هەرچی ماڵی خەڵکە دەستی بۆ نەبات‌و نەیخوات‌و هەڵی نەگرێ, چونکە هەرکەسێك لەمنداڵیدا لەسەر دەست پاکی‌و حەڵاڵخۆری ڕاهات بەگەورەیی فێری حەرام خواردن نابێت.

برایەك بۆی گێڕامەوەو گوتی: کەمنداڵ بووم، جارێکیان هێلکە مراوییەکم لەناو بێشەڵانی دێیەکەماندا هەڵگرتەوەو بردمەوە بۆ ماڵەوەو نیشانی دایکمم دا، دایکم یەکسەر بەخۆیدا کێشاو گوتی: ئای کوێر بم، تازە کوڕەکەم کوێر دەبێت! بەترسەوە گوتم: دایە بۆچی کوێر دەبم؟! گوتی: ڕۆڵە هەرکەسێك هێلکەی مراوی‌و قازو قەلی خەڵك دەست لێبدا، خوای گەورە کوێری‌دەکا، تاوەکو کوێر نەبووی خێراکە بڕۆ ئەو هێلکەیە لەشوێنی خۆی دابنێوە! دەڵێ: منیش بەپەلە چووم لەشوێنی خۆیدا دامنایەوەو ئیتر جارێکی تر دەستم بۆ هیچ شتێکی خەڵك نەبردو فیعلەن وام دەزانی کوێر دەبم!

هەی ئافەرین دایکی دڵسۆزو لێزان چۆن کوڕەکەی فێری دەست پاکی کرد. ئەی خۆ زۆربەشتان ئەو بەسەرهاتە مەشهورەتان بیستووە کەجارێکیان دزێك دوای چەندین جار لەگیرانی لەسەر دزی، لەلایەن حکومەتەوە فەرمانی ئیعدام‌و لەسێدارەدانی دەردەچێ، پێش ئەوەی بچێتە ژێر پەتی سێدارە پێی دەڵێن: دوا وەصیەت‌و داواکاریت چیە؟ دەڵێ: دەمەوێ دایکمم بۆ بێنن چاوم پێی بکەوێ. بەڵێ دایکی پیرو بەتەمەنی بۆ بانگ دەکەن‌و دەڵێ: دایە گیان وا چاوت لێمە پاش چەند دەقیقەیەکی تر لەسێدارە دەدرێم‌و بۆ دواجار چاوت پێم ناکەوێتەوە، تو خوا با بۆ ئاخر جار زمانت ماچ بکەم، زمانت بێنە دەرەوە. دایکیشی کەفرمێسك لەچاوی دەبارێ ،زمان دەردێنێ کە بەحیساب کوڕەکەی ماچی بکات، بەڵام کوڕە زۆر بەتوندی گاز لەزمانی دایکی دەگرێ‌و پیا دەنووسێ، هەرچی دایکی هاوار دەکاو پۆلیس هەوڵدەدەن واز لەدایکی بێنێ، هەر بەری نادات هەتا سەری زمانی دایك دەقرتێنێ!! حاکم دەڵێ: ئەی دزی نامەرد، ئەوە تۆ ئەو دایکە بەستەزمانەت بۆ وا لێکرد؟ سەرەڕای جەرگ سووتانی بۆ ڕۆڵەی بێوەفای وەك تۆ، کەچی زمانیشیت قرتاند؟! دزەکە گوتی: جەنابی حاکم لۆمەم مەکەو گوێم لێبگرە! من منداڵبووم، ڕۆژێکیان هێلکەیەکم لەکولانە مریشکەکەی ماڵی دراوسێکەمان دزی‌و هێنامەوە بۆ لای دایکم، دایکم زۆری پێخۆشبوو، لێی وەرگرتم‌و بۆی کردم بەهێلکەوڕۆن، بەم شێوەیە هەموو ڕۆژێ یەك دوو هێلکەم دەدزی‌و لەگەڵ دایکم دەمانخواردو دایکم دەستخۆشیی لێدەکردم، سەرەنجام چالاکیم لەهێلکەدزینەوە گواستەوە بۆ مریشك دزین‌و پاشانیش گیسك‌و مەڕو بزن‌و مانگاو زین‌و ئاخری وا ئێستا لەسەر دزی لەسێدرە دەدرێم، جا زمانی

ئەیکم منی گەیاندە ئەم ڕۆژە ڕەشە کەبەدبەختی دونیاو قیامەتی کردم, ئەگەر یەکەمجار کەمێلکەکەم لەماڵی دراوسێکەمان دزی, دایکم بیترساندمایەو قسەی پێ بگوتمایەو بەو زمانەی هانی نەدامایە, ئەوا منیش تووشی دزیکردن نەدەبووم, بۆیە پێویستە ئەو زمانەی ئەویش ئاوا بەسزا بگات! !

بەڵێ خۆشەویستان: ئەمە نموونەی پەروەردەی نادروست, پەروەردەیەك کە لەسەر ئەساسی دینی پاکی ئیسلام نەکرێ .بەڵام با بزانین ئەو کەسانەی کە لەمنداڵییەوە لەسەر دەست پاکیو حەڵاڵخۆری ڕاهێنراون, چۆن مرۆڤێك بوون, لەبەر ئەوەی زۆر باش بزانن, هەرکەسێك لەمنداڵیدا چۆن پەروەردە بکرێ, لەگەورەییشدا ئاوا دەردەچێو زۆر زەحمەت گۆڕانی بەسەردا دێ, شاعیر زۆر جوانی فەرمووە کەدەڵێ:

قَدْ يَنْفَعُ الأَدَبُ الأَطْفالَ فِي صِغَرٍ    وَلَيْسَ يَنفَعُ عِنْدَ الشَّيْبَةِ الأَدَبُ

إِنَّ الغُصُونَ إِذا قَوَّمْتَها اعْتَدَلَتْ    وَلَنْ تَلِينَ إِذا قَوَّمْتَهـــا الْخَشَـبُ

شاعیر دەفەرموێ: بەڕاستی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ, لەکاتێکدا هێشتا لەسەرەتای تەمەنی منداڵیدایە زۆر بەسوودەو جێگای خۆی بۆ دواڕۆژی ئەو منداڵە دەگرێ, بەڵام لەکاتی پیریدا هەرچی ئامۆژگاریو پەروەردەو ئەدەب بەئینسانی بەتەمەنی بڵێی سوودی پێناگەیەنێو خوویەك گرتوویەتی بەشیری تەرکی ناکات بەپیری. هەروەکو چۆن شۆڕەبی ناسك چۆنت بوێ ئاوای لێدەکەی, بەڵام کەبوو بەتەختەو کۆلکەدارو ووشك بوو ئیتر چۆن باری گرتووە دەستکاری ناکرێو بتەوێ ئاڵوگۆڕ بەسەر شێوەکەیدا بێنی دەبێ بیشکێنی! !

فیعلەن منداڵیش لەمنداڵیدا فریای نەکەویو پەروەردەی جوانی نەکەی تازە لەگەورەییدا ناتوانی ڕاستی بکەیتەوە.

با بزانین منداڵانی سەلەفی صالح چەند دەست پاكو حەڵاڵخۆر بوون

(حارثي محاسبی) منداڵ دەبێ, بەلای هەندێ منداڵدا تێپەڕی کە لەبەردەم ماڵی خورمافرۆشێکدا یارییان دەکرد, ئەویش ڕاوەستاو سەیری منداڵەکانی دەکرد, خاوەن ماڵەکە هاتە دەرەوەو هەندێ خورمای پێبوو, بەحارثي گوت: ڕۆڵە بۆ خۆت ئەم خورمایە بخۆ, حارث گوتی: بۆچی ئەو خورمایانە چین؟ کابرا گوتی: من خورمام لەپیاوێك

کڕی هەندێك لەخورماکەی کەوتە خوارەوەو منیش هەڵمگرتەوە, تۆ بۆ خۆت بیخۆ. حارث گوتی: ئایا ئەو کابرایە دەناسیتەوە؟ گوتی: بەڵێ, حارث کەگوێی لەوە بوو سەیری منداڵەکانی کرد کەیارییان دەکردو گوتی: ئەرێ منداڵینە بەڕەنی ئێوە, ئەم پیاو پیرە موسڵمانە؟! منداڵەکان گوتیان: بەڵێ. حارث ڕۆیشتو ئەو ناوەی بەجێهێشت. کابرای خورمافرۆش کەوتە شوێنی هەتا گرتیو پێی گوت: بەخوا لەدەستم دەرناچیت هەتا ئەوەی کە لەناختدایە بەرامبەرم پێم نەڵێیت. حارث گوتی: مامە پیرە, ئەگەر تۆ موسڵمانیت داوا لەخاوەنی ئەو خورمایانە بکە بیانباتەوە بۆ خۆی, تا ڕزگارت بێ لەزیانو خراپەکاری, هەروەك چۆن کاتێ زۆر تینووتە داوای ئاو دەکەیو بەشوێن ئاودا دەگەڕێی, ئاواش داوا لەو کابرایە بکە کەبێت خورماکانی بەرێتەوە! ئەی مامە پیرە, خۆت بەموسڵمان دەزانیتو حەرامیش دەرخواردی منداڵانی موسڵمانان دەدەیت؟! پیاوە پیرەکە دەرسێکی گەورەی لەقسەی ئەم منداڵە حەڵاڵخۆرە دەست پاکە وەرگرت.

ئیمانداران: یەکێکیتر لەڕەوشتە گرنگو پڕ بایەخەکان کەپێویستە لەمنداڵییەوە منداڵی لەسەر ڕابهێنرێ بریتییە لەسینەپاکیو زمان پاکیو قسە نەگێڕانەوە, دەبێ دایكو باوكو دەورووبەر منداڵ وا ڕابهێنن حەز بەقسە گێڕانەوەو جاسووسی کردن لەسەر خوشكو براو هاوڕێکانی نەکات.

مامی ئیمام ئەحمەد" نامەی دەنارد بۆ هەندێك لەوالییەکان دەربارەی بارودۆخی بەغدا, تا خەلیفە لێی ئاگادار بێت, جارێکیان بەئیمام ئەحمەد کەئەو کاتە منداڵبوو, وەبرازای خۆیبوو, نامەکە دەنێرێ, ئیمام ئەحمەد بەو منداڵییە بیری لەوە کردەوە کەئەم نامەیە بۆ کاربەدەستان نووسراوە نەوەکا قسەی پاشملەی تێدابێو جاسووسی بێ بەسەر خەڵکییەوەو زیانی موسڵمانانی تێدابێ, بۆیە لەڕێگادا فڕێی دایە ناو ئاوی دیجلەوەو نامەکەی لەناوبرد! ئەم هەڵوێستە بەرزەی ئەم منداڵە جێگای سەرنجی زۆر لەزانایانو کەسانی خاوەن فیراسەت بوو, تەنانەت هەیثە م کوڕی حەنبەل فەرمووی: ئەگەر ئەم کوڕە بمێنێت دەبێتە بەڵگە بەسەر خەڵکی سەردەمەکەیەوە. فیعلەن واش دەرچـــو, بـــوو بەیەکێك لـــەموجتەهیدینی ئەم دینە.

کۆتایی وتارەکەمان بەپاڕانەوەیەکی هەرەمی کوڕی حەییان دێنین کەفەرموویەتی:

(خوایە پەنات پێدەگرم لەخراپەکاریی ڕۆژگارێك کەمنداڵیان تێدا یاخی دەبێت، گەورەکانیان تێیدا پلانو تەڵەکەیی دادەنێنو ئەجەلیان تێدا نزیك دەبێتەوە)..

یاڕەبی خوایە ڕەحممان پێبکەیتو هیدایەتمان بدەیتو گەنجو لاوەکانمان صاڵح بکەیتو سەرفرازی دونیاو دواڕۆژیان بکەیت..

اللّهُمَّ آمین

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمد أمین, چاپی چوارەم, 2002.

3 ـ ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر, محمود مهدی إسلامبولی, وەرگێڕانی: ئەوا محمد سعید, چاپی دووەم, 1997

4 ـ تاج الأصول, وەرگێڕانی: نوری فارس, چاپی یەکەم, 1989

5 ـ بەرنامەی پێغەمبەر بۆ پەروەردەی منداڵان, محمد نور سوید, وەرگێڕانی: سهام بەرزنجی ـ ڕێدار ئەحمەد, چاپی یەکەم, 2001

6 ـ چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکی, دیل کارنجی, وەرگێڕانی: عُمر توفیق الخطاط, چاپی یەکەم .

7 ـ ڕووناکی رَبّ العالَمین ـ ڕوونکردنەوەی مِنهاج الطالبین, عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی, چاپی یەکەم, 2002 .

8 ـ عومەری کوڕی خەطّاب, حبیب محمد سعید, چاپی یەکەم, 1996

9 ـ ڕۆژنامەی یەکگرتوو ـ یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان دەریدەکات, ژمارەکانی: 439 ـ 442 ـ 444

10 ـ کۆباسەکانی میحراب, شەماڵ موفتی, بەرگەکانی: 1 ـ 6, 2002 .

11 ـ بەرەو پەروەردەی ئیسلامی, ئەندازیار عُثمان محمد رَشید, چاپی سێیەم, 2002

12 ـ فقه السُّنة, سَیّد سابق, ط 1, 1971

13 ـ الفقه المَنهَجي عَلى مَذهَب الإمام الشّافِعي, الدکتور مصطفى الخِنْ ـ الدکتور مصطفى البُغا ـ عَلي الشَّربَجي, دار الإحسان, ط 1, 1998

14 ـ معَ الأنبِیاء في القُرآن الکَریم, عَفیف عَبدالفَتّاح طَبّارَة, ط 6, 1978

15 ـ مِئَة قِصَّة وَقِصَّة, محمد أمین الجندي, مَکتَبَة النَجاح .

16 ـ إحیاء عُلُوم الدِّین, أبي حامد محمد الغَزالي, دار التَقوى للتُراث, ط 1, 2000.

17 ـ رَوضَـة الخُطَباء, الدکتور مصطفى مراد, دار الفَجر, القاهرة, ط 1, 2002.

18 ـ صَوت المِنبَر, الدکتور صالح محمد الونیان, دار الصمیعي, الریاض, ط2, 1997.

# وەصیەتی چوارەم

## داوێن پاکی

﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾

# ووتـاری ژماره هەژده

# داوێن پـاكی

## بەشی یەكەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً ﴾

(الاسراء 32)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( لا يَخْلُوَنَّ أحَدُكُمْ بِإِمْرَأَةٍ إِلاَّ مَعَ ذي مَحْرَمٍ )

(بُخاري وَمُسلِم)

الحمدُ لله رَبْ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين الى يَومِ الدِّين..

ئيمانداران‌و خواناسانی بەرێز, پشتیوان بەخوای گەورە لەم وتارەدا دەچینە خزمەت وەصیەت‌و ڕاسپاردەی چوارەم لەو (دە) وەصیەت‌و ڕاسپاردانەی خوای پەروەردگار بۆ ئومەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, کەئەم وەصیەتی چوارەمەش, کەوەک ئایەتی ﴿ وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً ﴾(الاسراء 32), واتە نزیکی گوناهو تاوان مەکەون چ ئەوەی ئاشکراو دیارە" چ ئەوەی کەشاراوەو پەنهانە. فاحیشە بەتاوانێك دەگوترێ, گوناهەکەی گەورە بێ, جا کردار بێ, یان گوفتار بێ, وەکو زیناو بوختانکردن بەئافرەتی داوێن پاکی بێ‌ئاگا, جا زیناکردنەکە بەئاشکرا بێ یان بەنهێنی.

عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانییاندا, زیناکردنی نهێنییان بەلاوە ئاسایی بوو, بەلام زیناکردنی بەئاشکرایان بەلاوە کارێکی خراپ بوو, ئیتر خوای پەروەردگار هەردوو جۆرەکەی یاساغ کردن, وەکو لەسوورەتی ئەعراف (ئایەتی 33 )دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّي الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً ﴾.

خۆشەویستان: لەم وەصیەتەدا خوای گەورە فەرمووی: ئەی عەبدو بەندەکانم, نزیکی فاحیشەو داوێن پیسی مەبنەوە, واتە: نەك هەر داوێن پیسی نەکەن‌و زینا مەکەن, بەڵکو هەر نزیکیشی مەبنەوە, چونکە کەنزیکی بوویتەوە سەرەنجام دەکەویتە ناویەوە. کەواتە: جوانترین ناونیشان کەبۆ ئەم وەصیەتەی خوای گەورەی هەڵبژێرین بریتییە لە (داوێن پاکی), لەبەر ئەوەی ئایەتەکە نافەرموێ: زینا مەکەن‌و زینا تاوانی وایەو سزای وایە, بەڵکو دەفەرموێ: نزیکی بەدڕەوشتیو داوێن پیسی مەکەونەوە. کەواتە: ئینسان چۆن بێ بۆ ئەوەی تووشی موقەدیمات‌و پێشەکییەکانی داوێن پیسی نەبێت؟! ئەوەیە داوێن پاك بێ.

بەڕێزان: شتێکی حاشاهەڵنەگرو بەڵگەنەویستە کەئینسان بەسەرهات‌و ڕووداوی کەسانی پێش خۆی‌و زەمانی خۆی, چاکترین وەسیلەو هۆکارە بۆ ئەوەی ئینسان بەخوێندنەوەو گوێ لێگرتنیان بەرەو چاکەو مەردایەتی‌و جوامێری هەنگاو هەڵگرێ‌و

لەهەڵەو خراپەی خراپەکارانیش دەرس‌و عیبرەت وەربگرێ, بۆیە لەم وتارەدا زۆرتر پشت بەرووداوە ڕاست‌و دروستەکان دەبەستین کە لەبارەی داوێن پاکییەوە بۆمان دەدوێن, دە فەرموون بەدڵ لەگەڵماندا بن.

ئیمانداران: ووتارەکەمان لەم بەشانە پێکدێت إنشاءَ اللە:

1 ـ کاریگەریی ئیمان‌و ترسی خوا لەسەر داوێن پاکیی ئینسان.

2 ـ بەرویبوومی داوێن پاکی.

3 ـ سەرەنجامی بەدڕەوشتان.

خاڵی یەکەم: ئیمان چۆن دەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان لەبەدڕەوشتی بەدور بێت‌و ئینسانێکی داوێن پاك بێ! وەچۆن بەهێزیی‌و پۆڵاینی ئیمان وا دەکات کەئینسانی بەدڕەوشتیش فێری داوێن پاکی ببێ لەکەسانی داوێن پاکەوە.

ئیمانداران: با هەمومان بەدڵ گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرین کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بۆمان دەگێڕێتەوە, کە لەسەردەمی ئومەتەکانی پێشوودا ڕوویداوە.

خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: عابیدێکی گۆشەگیرو پارێزگارو خواناس هەبوو لەئەشکەوتی شاخێکدا دەژیا کەنزیك گوندێك بوو. ئەم عابیدە لەگەل خواپەرستییەکەیدا ئینسانێکی دیندارو عالم‌و شارەزابوو, بەتەواوی مانای کەلیمە خواپەرست بوو, بۆیە لەو کەسانەبوو کەڕازی نەدەبوو لەڕۆژی قیامەتدا لغاوی ئاگرین بکرێتە دەمی وەحەزی دەکرد خزم‌و هاوولاتیانی نەبنە سووتەمەنیی جەهەنەم.

بۆ ئەم مەبەستە هەفتەی یەك دوو ڕۆژ دەهاتە ئاوایی‌و خەڵکەکەی کۆدەکردەوەو ئامۆژگاریی دەکردن‌و باسی هەمیشەیی قیامەت‌و کەموکوڕیی‌و کورتیی ژیانی دونیای بۆ دەکردن, باسی ئەخلاقی جوان‌و خۆپاراستن لەداوێن پیسی بۆ دەکردن.

بەڵێ, ئەم کارەی عابید ببووە مایەی خۆشحاڵیی خواپەرستان‌و ئیمانداران, بەلام ببوە مێردەزمەیەکیش بۆ گیانی شەیطان سیفەتەکانی ئاوایی. زۆریان پێ‌ناخۆش بوو کەخەڵکی لەداوێن پیسی دوور دەخستنەوەو بۆ ئەخلاقی جوان‌و داوێن پاکی بانگی دەکردن, لەناو خۆیاندا دەیانگوت: باشە بۆ واز لەو خەڵکە ناهێنێ, خۆ هەرکەسەو دەچێتە قەبری خۆی. تا سەرەنجام هەموو عەرەق خۆرو هەوەسبازو هەموو ئەوانەی کەئاواتیان ڕابواردنی

ئارەواو داوێن پیسی بوو، کۆبوونەوەو کۆنگرەیەکیان سازکرد، بۆ ئەوەی بتوانن دەمی عابید ببەستن‌و لەووڵات شاربەدەری بکەن، هەرکەسەو ڕای خۆی دەربڕی، یەکێ دەیگوت: پەت بخەینە ملی‌و سەمعەی بشکێنین، گوتیان: ئەم ڕایە پەسەند نیە، چونکە ئەوانەی خۆشیان دەوێ لەسەری هەڵدەدەنێ‌و زیاتر لایان خۆشەویست دەبێ‌و ئێمەشی لەئاواییدا پێ ناشیرین دەبین، ئەم ڕایە پەسەند نیە.

یەکێکی تر گوتی: بابەنهێنییەوە شەو بچین بیکوژین‌و تیرۆری بکەین، گوتیان: ئەم ڕەئیەش پەسەند نیە، چونکە ئێمە دەمانەوێ ڕیسوای بکەین‌و شوێن کەوتوانیشی ڕوویان نەیەت لەدوای ئەمەوە باسی حەیاو پاکی‌و چاکی بکەنەوە، بەم جۆرە کوشتنە پلەی بەرز دەبێ‌و خەڵکی گۆڕەکەی دەکەن بەنەزرگە.

یەکێکی تر گوتی: من شتێك هاتووە بەخەیاڵمدا، من وا دەزانم دەبێ ئەم کارە بەژن بکەین، ئەوەی ئێمە دەمانەوێ تەنیا ژن دەتوانێ ئەنجامی بدات. گوتیان: چۆن؟! گوتی: دەبێ ئافرەتێکی بێڕەوشتی داوێن پیس‌و بەڕواڵەت جوان‌و کارامە پەیدا بکەین، پارەیەکی زۆری بدەینێ‌و بینێرین بۆ ئەشکەوتی عابید، تاوەکو بیخەڵەتێنێ‌و تووشی زینای بکات، ئەوسا لەکاتی زیناکردنەکەدا دەچین بەسەریانداو پەت دەخەینە ملی‌و کێشی دەکەین بۆ ناو ئاوایی‌و بەخەڵکی دەڵێین: ئەمە ئەو پیاوەیە کە بەخەڵکی دەگوت لەخوا بترسن، ئەمەش لەخواترسانەکەی خۆیەتی کە لەگەڵ ئەو ئافرەتە داوێن پیسەدا دەستی تێکەڵ کردووە. هەموو بەجارێك گوتیان: بەڕاستی بەچکە جوولەکەی ڕاستەقینە تۆی. فیعلەن نەخشەکەیان کرد بەکردەوە، ئافرەتێکی زۆر بێڕەوشتی هەتا بڵێی جوانی مەکربازیان دۆزییەوەو پارەیان دایەو کارەکەیان پێ ڕاگەیاند، ئەویش ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەو لەخشتەبردنی عابید. هەموو زۆر دڵخۆش بوون گوتیان: ئەم ژنە بەم جوانی‌و فێڵبازییەیەوە، ئەگەر هەر پەلێکی عابید بەدەست فریشتەیەکەوە بێ لەخشتەی دەبات! هەموو بەکۆمەڵ لەگەڵ ژنەکەدا بەرەو ئەشکەوتی عابید بەڕێکەوتن، خۆیان لەنزیك مزگەوتی عابیدەکە لەپاڵ شاخەکەدا شاردەوەو بەژنەکەشیان گوت: تۆش لەدەرگای ژوورەکە بدەو بڵێ غەریبم‌و ڕێگەم لێ تێکچووە، لەڕێی خوادا جێگەم بکەرەوە با ڕەق نەبمەوە، ئەویش لەخواترسەو بەزەیی پێتدا دێتەوەو دەرگات لێدەکاتەوەو کــەچووشیتە

ژوورەوە خۆت دەزانی چی دەکەیت.

بەڵێ، دونیا شەوە، ساردە، بەفر بەباوە دەبارێ، ئافرەت لەدەرگا دەدات، عابید بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ: کێیە بەم شەو ساردە لەدەرگا دەدات؟! ژنەش تەقەتەقی ددانی دێتو دەڵێ: غەریبەمو ڕێم لێ تێکچووە، خەریکە لەناودەچم بۆ خاتری خوا دەرگاکەم بۆ بکەرەوە. عابیدەکە لەدەنگەکە دەسڵەمێتەوەو لەدڵی خۆیدا دەڵێ: ئەم دەنگە دەنگی ئافرەتەو من کەسم لا نیە، چۆن ڕێگا بدەم ئافرەتێکی نامەحرەم بێتە ژوورەوە بۆ لام. ژنەکەش هەر هاواری دەکرد: بەقوربانە ڕەحمی خوات لەدڵدا بێ ئاخر وا خەریکە من دەمرم. عابید لەدڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر دەرگای لێنەکەمەوە سەرما دەیکوژێو منیش دەبمە هاوبەشی ئەو قەتڵە، خوایە فریام بکەوەو لەبەڵاو فیتنە بمپارێزە. عابید دەرگای کردەوەو ژنە بەرەو ئاگرەکە ڕایکردو خۆی گەرم کردەوە، پاشان وەکو مار کەسپەتیەکەی نامێنێ بەرگی زیادەی لەبەر خۆی داماڵی، بەلەنجەولار بەرەوڕووی عابید ڕۆیشتو گوتی: بەقوربانت بم چەند عیبادەتی جوان دەکەی، ئەو هەموو عیبادەتەت چۆن بۆ دەکرێ؟! عابید سەری بەرزکردەوەو چاوی بەچاوی ئافرەتەکە کەوت. عاشقی بوو! دڵی پێکرا، گیرۆدەی ئەوین بوو! عابید عیبادەتێکی زۆری هەیە، بەڕاستی چەند ساڵە بەدڵ لەخوا ترساوە، خوای گەورەش زوڵم لەکەس ناکات، چونکە لەیەکەم ڕۆژی سعیبادەت کردنیەوە خوای مەبەست بووە، خوای گەورەش لەو کاتی تەنگانەیەدا فریای دەکەوێتو دەرووی لێدەکاتەوە.. بۆیە عابیدی خواناس یەکسەر ئاگری بڵێسەداری دۆزەخی بیرکەوتەوە، ئەو ئاگرەی سووتەمەنیەکەی ئینسانو بەردە، تاوانبار تێیدا سزا دەچێژێو نامرێ، هەرچەند هاواری مالیکی پاسەوانی دۆزەخ بکاتو بڵێ: پیاوی چاکبە تکام بۆ بکە بەڵکو نەمرمو ڕزگارم ببێ، بەڵام بێسوودەو وەڵامی بەوە دەدرێتەوە کەئەوە جێگەی هەمیشەییتە. مردن نیە! ئەو جەهەنەمەی کەدۆزەخییەکان هاواردەکەنو دەڵێن: ئەی دەرگاوانەکانی دۆزەخ هاوارمان بۆ بکەن، دەنگمان بەخوا بگەیەنن، تا تەنیا ڕۆژێ سزامان لەسەر سووک بکات! بەڵام بێسوودەو پێیان دەگوترێ: بێدەنگ بن، جێگەتان دۆزەخەو ئەویش خراپترین جێگەیە.بەڵێ، عابید بەمجۆرە دیمەنی جەهەننەمو بڵێسەو سزاو ئازارەکانی دەهێنایەوە پێش چاوی خۆی، ئینجا بەخۆی دەگوت: هەی

ئارەزووی دەروون تۆ حەزت لێیە لەم ئافرەتە نزیك بیتەوە, منیش حەزم لێیە, بەڵام من خۆمم بۆ لەبەر ئاگری جەهەننەمدا ناگیرێ, ئەگەر تۆ دەڵێی خۆمم بۆ دەگیرێ, من تاقیت دەکەمەوە, تەنها ئەو پەنجەیەم دەخەمە سەر گڕی چراکەو ئەگەر لەبەر ئەم ئاگرەدا خۆتت بۆ گیرا, مانای وایە لەبەر ئاگری جەهەننەمیشدا خۆتت بۆ دەگیرێ. ئا لەم کاتەدا پەنجەیەکی خستە سەر گڕی ئاگرەکەو قرچەقرچ دووکەڵ بەرزبۆوە, گۆشتو پەنجەی پێستی سوتا لای نەبرد, تا بێهۆش بوو, بەپشتدا کەوت, ئافرەتیش هەر چاوی بڕیوەتە عابیدو بەهیوای ئەوەیە ئەوەی پێی سپێردراوە ئەنجامی بدات. عابید دێتەوە هۆشو دەبینێت ئارەزووی دەروونی هەر داوای ئەو بێشەرعیە دەکات. ئینجا پەنجەکەی تری دەبات بۆ سەر ئاگرەکەو لای نابات تا جوان دەسووتێو لەتاو ئازار دەبووریتەوە, دووبارە دەکەوێتەوە بەپشتدا, بەڵام هەر لەگەڵ دێتەوە هۆش خۆی, ئارەزووی دەروون داوای لێبوردنی لێدەکات! بۆ ئەوەی دەستی لەبنی هەمانەوە دەرنەچێو ڕووزەردی لای خوا نەبێ, پەنجەیەکی تری دەباتەوە بۆ سەر ئاگرەکەو لای نابات تا دەبووریتەوە. بەمجۆرە هەتا هەر دە پەنجەی هەردوو دەستی دەسووتێنێو دەبووریتەوە! ئافرەتیش کەچاوی بەعابید دەکەوێت ئاوا پەنجەکانی خۆی دەسووتێنێو سەرنجێکی ئافرەت نادات‌و تەنها جارێکیش دوای یەکەمجار ئیتر بۆی نەڕوانیوەو بۆ ناڕوانێ, لەملایشەوە بۆنی گۆشتو پێستی سووتاوو چرەدووکەڵی ئەمانە ژوورەکەی پڕکردووە, ئافرەت زەندەقی دەچێو خەریکە زیرە دەکاتو لەپەنایەکەوە دەکەوێ! لەملاشەوە ئارەزوو پەرستەکان هەر بەتەمای ئەوەبوون گڕی چراکە کز ببێ, یان بکوژێتەوەو بەزمێکی ڕۆمانسییانە دروست ببێ.. بەڵام خۆ گڕی چراکە هەر بەشەوقتر دەبێ. چاوەڕوانی زۆری بۆ هێنانو پەتی صەبریان پچڕیو خۆیان بەدەرگای ژووری عابیددا داو شکاندیانو چوونە ژوورێ, بەو هیوایەی عابیدی خواناس ئافرەتی داوێن پیسی لەئامێز گرتبێو ئەمانیش پەت بخەنە ملی عابیدو ڕایکێشن بۆ ناو ئاواییو ئابڕووی بەرن! بەڵام کەچوونە ژوورەوە چییان بینی؟! شتێکیان بینی کەهەرگیز چاوەڕێی نەبوون, تەماشایان کرد وا ژوورەکە پڕ بووە لەدووکەڵو بۆنی گۆشتی سووتاو, ئافرەتی بەدبەختی چارەڕەشی لەخوا دووریش لەولاوە کەوتووەو بەحاڵ نووزەی دێو ڕەنگی بزڕکاوە, لێوی باری گرتووە, عابیدی بەحەق

خواناسیش لەولاوە کەوتووەو لەتاو پەنجەکانی دەناڵێنێ. چوونە لای ئافرەت گوتیان: ها چیت بەچی کرد؟! ئافرەتەکەش دەستیکرد بەجنێوپێدان‌و قسە پێگوتنیان گوتی: ئێمەی بەدبەخت لەبەرامبەر ئیمانی بەهێزی ئەم خواناسەوە سەر لەبەرد دان نەبێ هیچمان بۆ نەماوەتەوە, ویستتان بەهۆی منەوە ئابڕوی ئەم پیاوە ببەن, بەڵام ئیمانی عابید بەهێزتر بوو, منیشتان بەم دەردە برد, هەزار گوناهو یەك تۆبە, هیوادارم خوای گەورە بەڕەحمی خۆی لەگوناهی ڕابردووم خۆش بێ‌و بۆ لەمەودوا هیدایەتم بداتو ڕاگیراوم بکات لەسەر خواپەرستی!

بەڵێ ئیمانداران: لەبەرەکەتی داوێن پاکیی عابیدەوە, ئەو ئافرەتە داوێن پیسەش تۆبەیکردو ڕێگای داوێن پاکانی گرتەبەر, ولله الحَمد.

خۆشەویستان: ئەمەی عەرزم کردن دووهەزار ساڵ زیاتر لەمەوبەر ڕوویداوە, بەڵام ئایا تۆ بڵێی لەم سەردەمەدا, لەم ڕۆژگارەدا کەسەردەمی تێکەڵبوونی بێسنووری کوڕو کچە گەنجو لاوەکانە, لەم سەردەمەدا لەلای خوانەناسان باسکردنی داوێن پاکی‌و خۆپاراستن لەزیناو بێڕەوشتی بەدواکەوتوویی‌و کۆنەپەرستی لەقەڵەم دەدرێت, ئایا هێشتا خەڵکانێك هەن کەوەکو عابیدەکە نەك هەر بەرەو بەدڕەوشتی‌و زینا ناڕۆن‌و هەوڵی بۆ نادەن, بەڵکو ئەگەر هاتە ژێر نوێنی خەوتنەکەشیانەوە لەبەری ڕادەکەن‌و نەفرەتی لێدەکەن؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە فەرموون با بەیەکەوە گوێ لەبەسەرهاتی دووەم بگرین کەپێشکەشتانی دەکەم, هەرچەندە ئەم ڕوداوەیان لەگەڵ ڕووداوەکەی پێشووی عابیدەکە دوو هەزار ساڵیان بەینە, بەڵام ئەمەیان لەساڵەکانی (1980) بەدواوە ڕوویداوە کەبۆ ئەم سەردەمە لەڕوداوی عابیدەکە گرنگترو سەرسوڕهێنەرترە.

مامۆستای بەڕێز, حەسەن پێنجوێنی, بەم شێوەیە ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە, فەرموون با ئێمەش گوێی بۆ بگرین:

لەزانکۆی بەغدا, لەکۆلێجی کشتوکاڵ, کوڕێکی موسڵمانی زۆر لەخواترس‌و زاناو زیرەك, لەگەڵ کچێکی مەسیحیی زۆر شۆخ‌و جوان‌و پێشکەوتوو دەبنە هاوپۆل. لەساڵی یەکەمەوە بەردەوام کچە مەسیحییەکە هەوڵی ئەوە دەدات کە لەکوڕە موسڵمانەکە نزیك بێتەوەو سەرەنجام ببێتە هاوسەری, بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەم کوڕە موسڵمانە بۆی

ناروانیّو زۆر دوورەپەرێزی لێدەکات. بەم شێوەیە دەڕۆن تا دەچنە سالّی سێیەمی خوێندنی زانکۆوە، کچەکە دەزانیّ کوڕەکە هیچ بۆی ناروانیّو ئامادە نیە رووی تێبکات، زۆری پیّ عاجز دەبیّ، ئەمجا هەوڵدەدات بزانیّ شەوانە ئەم کوڕە موسڵمانە لەکویّ دەمێنێتەوە (تەبعەن کوڕو کچەکە هەردووکیان ماڵی باوکیان لەدەرەوەی شاری بەغدا بووە)، دوای ماوەیەك چاودێریکردن بۆی روون دەبێتەوە کە لەگەڕەکی فەزڵی شاری بەغدا لەگەڵ برادەرێکی تریدا ژوورێکی بچووکی بەکریّ گرتووەو تیایدا دەژی. رۆژێك کەدەزانیّ برادەری کوڕەکە رۆیشتۆتەوەو ئەم کوڕە موسڵمانە بەتەنهایە، خۆی بۆ ناگیریّو لەدوانیوەرۆیەکدا خۆی دەکات بەژووری کوڕە موسڵمانەکەدا، دەست بۆ دەرگا دەبا، دەرگا دانەخراوە، چونکە پارەو پوولێکیان نەبووەو خوێندکاران لەکەس نەترساون تا دەرگا داخەن. دەرگا ئاواڵە دەبیّ، کچە تەماشا دەکا وا کوڕە لەسەر قەرەوێڵەکەی خەوتووەو سۆپاکەشی لەتەنیشتیەوە داگیرساوە! کچە شەرمی لا نامێنیّو بەئەسپایی خۆی دەکات بەژێر بەتانی کوڕەکەدا، کاتیّ کوڕی ئیماندار گەرمایی بەلەشی دەکات خەبەری دەبێتەوە، دەبینیّ کچەکە لەتەنیشتیەوە ڕاکشاوە، چاوی دەگلۆفیّو لەقەرەوێڵەکەی دێتە خوارەوە أعوذُ باللهِ منَ الشَّیطانِ الرَّجیمِ دەکات، لەسەرەتاوە وا دەزانیّ خەوە، دوایی کەدەزانیّ خەو نیەو ڕاستەقینەیە، رووی تێدەکاتو دەڵیّ: بۆچی هاتوویت؟! هەستە برۆ دەرەوە با عەزیەتت نەدەم! کچەش زۆر لێی دەپاڕێتەوە کەدڵی نەشکێنیّو دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکات، بەڵام کوڕە بەگوێی ناکاتو لێی توورە دەبیّو دەیەویّ بەزۆر بیکاتە دەرەوە! کچەکە دەزانیّ بەقسەی خۆشو پاڕانەوە ئاواتی نایەتەدی، دەست دەداتە چەکی هەڕەشەوگوڕەشەو دەڵیّ: من دەمێك بوو لەهەلێکی ئاوا گونجاو دەگەڕام، ئێستا دوای سیّ ساڵ کەهاتۆتە بەردەستم هەروا بەئاسانی لەدەستی نادەم، ئەگەر بەگوێم نەکەی ئەوا هاوار دەکەمو دەقیژێنمو دەڵێم: ئەم گورگەی کە لەپێستی مەڕدا خۆی نیشان دەدات منی بەفێڵ بانگ کردووە بۆ ئێرە، کەچی دەیەویّ دەستی تاوانم بۆ درێژ بکاتو هەواو هەوەسی خۆی بەمن تێر بکات، ئەو کاتە ئابرووت دەچیّو کەس بڕوا بەڕاستیی تۆ ناکات، جا ئێتر کەیفی خۆتە، تا کار لەکار نەترازاوە بەگوێم بکە. کوڕەکەش دەستێکی دەکەوێتە ئەملاو دەستێکی تری دەکەوێتە ئەولا،

نازانێ چی بکات, ئەم کارە کارێکە ئینسان ئیمانەکەی دەدۆڕێنێ ئەگەر ئەنجامی بدات, گوناهێکی ئاسان نیە, بۆیە کوڕە گەنجە خواناسەکە تیادەمێنێ, لەپڕا خوا دەیخاتە دڵیەوە کەقسە لەگەڵ دڵۆدەرورونی کچەکەدا بکات بەڵکو لەو سەرگەردانییە ڕزگاری ببێت‌و ڕێگای ڕاست بدۆزێتەوە. بۆیە دەست دەبات‌و پەنجەی شایەتمانی دەخاتە سەر سۆپاکەو قرچەقرچ پێست‌و گۆشتی پەنجەی کوڕە دەسووتێ. کاتێ کچە چاوی بەو حاڵە دەکەوێ دەزریکێنێ‌و هەڵدێت‌و بەگریانەوە دەردەچێ بۆ ماڵەوەو لەناو جێگادا دەکەوێ. کوڕی خواناسیش دەکەوێت‌و دەبوورێتەوە, پاش ئەوەی کە بەهۆش خۆی دێتەوە تەماشا دەکات کچ لەو ناوەدا نەماوە, سوپاسی خوا دەکات کەلەو فیتنەیە ڕزگاری بووە, هەرچەندە ئازاری سووتاندنی پەنجەکەی ناسۆری کرد بەدڵۆدەروونیدا, بەڵام ئەوەی زۆر پێخۆشتر بوو لەوەی کەهەموو گیانی بەئاگری دۆزەخ بسووتێ.

بەڕێزان: ئێستا دەچینە لای برای کچەکەو بزانین چۆن باسی موسڵمان بوونی خۆی‌و خێزانەکەی دەگێڕێتەوە بەهۆی ڕووداوی ئەم خوشکەیانەوە. ئەم برای کچە ناوی (شمێزە), دەڵێ: ئێمە سێ براو خوشکێکین, باوک‌و دایکیشمان ماون‌و لەژیاندان. ئەم خوشکە تاقانەیەمان لەزانکۆی بەغدا لەکۆلێجی کشتوکاڵ, قۆناغی سێیەم دەیخوێند, ڕۆژێکیان کەچوومەوە ماڵەوە, دایکم گوتی: خوشکەکەت لەبەغداوە هاتۆتەوەو نەخۆشە, گوتم: چییەتی؟ گوتی: نازانم, بەڵام زۆر تێکچووە! منیش چووم بۆ لای‌و گوتم: خوشکە گیان ئەوە چۆنە وا لەم کاتی دەوامەدا لەبەغداوە هاتوویتەوە, دیارە زۆر نەخۆشیت, هەستە با بتبەم بۆ لای دکتۆر. گوتی: کاکە گیان سوپاست دەکەم, من نەخۆش نیم! گوتم: چۆن تۆ نەخۆش نیت, خۆ ڕەنگ بەڕووتەوە نەماوە! گوتی: بڕوا بکە نەخۆش نیم, تکایە وازم لێ بێنە.

بەڵێ, سێ ڕۆژ لەناو جێگادا کەوت, نان‌و ئاوی بۆ نەدەخورا, ڕازیش نەبوو بیبەین بۆ لای دکتۆر, هەر دەیگوت: نەخۆش نیم. دەمانگوت: ئەی باشە کەنەخۆش نیت بۆچی وات لێ هاتووە؟! وەڵامی نەبوو" جگە لەنازانم! هەموومان داوامان لەدایکمان کرد بەڵکو ئەو بزانێ چییەتی‌و خوشکەکەمان لەدەست نەچێ, دایکیشم بەتەنیا لەگەڵیدا دادەنیشێ‌و زۆری بۆ دێنێ‌و سەر دەنێتە سەری, ئاخری خوشکەکەم دەڵێ: چی بێ لەئێوە شاراوە

بێ, من سێ ساڵە عاشقی کوڕێکی موسڵمان بووم لەپۆلەکەمانداو تەواوی بەسەرهاتەکە بۆ دایکی دەگێڕێتەوە.. ئەم برا گەورەیە دەڵێ: کاتێ دایکم ئەمەی بۆ گێڕاینەوە, زۆرمان پێ سەیر بوو, چۆن لەم سەردەمەدا, لەناو زانکۆدا, موسڵمانی وا هەیە, کچێکی ڕۆشنبیری تازەپێگەیشتووی گاور حەزی لێ بکاتو گوێی پێ نەدا! ئەمە دەبێ چ موسڵمانێك بێ؟! ئەو موسڵمانانەی من بینیومن ئەگەر لەئێمەی گاور خراپتر نەبن, هیچ لەئێمە چاکتر نین! برای کچە دەڵێ: ئەندامانی خێزانەکەمان هەموویان دانیشتبوون, منیش پێشنیارم کردو گوتم: خۆشەویستیی ئەو کوڕە داوێن پاکە چووە بەدڵمدا هەرچەندە بەرەوڕوو نەمدیوەو نازانم ناویشی چییە, چونکە تا ئێستا ئینسانی وا پاك داوێنم نەبینیوە, ئەمەی ئەو لەبەری ڕایکردووەو بۆ ڕزگاربوون لێی پەنجەی خۆی سووتاندووە, خەڵکی بۆ دەست کەوتنی خۆیان دەسووتێنن, پارەی بۆ خەرج دەکەن, ئەم وڵاتو ئەو وڵاتی بۆ دەکەن! لەبەر ئەوە ئەگەر ئێوە ڕازیبن, من دەمەوێ ئەم خوشکەی خۆمانی لێ مارە بکەین. هەموویان پێیان باش بوو, گوتیان: هەرچەندە دینەکەشمان جیاوازە, بەڵام بۆ ئەوەی کچەکەمان لەدەست نەچێ پێمان خۆشە. ئینجا ناونیشانی کوڕەکەم لەخوشکەکەم وەرگرتو ڕۆیشتم بۆ کۆلێجەکەیان, لەناو قوتابییەکاندا چاوم دەگێڕا, بەو ناونیشانەی خوشکم دابوومێ دۆزیمەوە, هەتا بڵێی کوڕێکی جوانی ڕێکوپێك بوو, دەستی ڕاستی بەلەفاف پێچرابوو, چووم بۆ لای‌و گوتم: زەحمەت نەبێ هەندێ ئیشم پێتە. خۆمم پێ ناساندو باسی خوشکەمم بۆ گێڕایەوەو گوتم: لەبەر ئەوەی تۆ ئەوەندە جوامێرو داوێن پاکی, هیچ پێم کەمی نیە کە بەدەمی خۆم خوشکمت پێشکەش بکەم. ئەویش گوتی: زۆر مەمنوونی ئەو هەستە پاکەتم, بەڵام دەبێ لێم ببووری چونکە ناتوانم مارەی بکەم. گوتم: بۆچی؟! گوتی: ئاخر ئەو خوشکەی ئێوە مەسیحییەو من موسڵمانم, گوتم: دەی خۆ من وام بیستووە کەدینی ئیسلام ڕێگای ئەوە دەدات کەکوڕێکی موسڵمان ببێتە هاوسەری کچێکی مەسیحی. گوتی: بەڵێ ئەوە ڕاستە, بەڵام من دەمەوێ منداڵەکانی داهاتوومان بەو جۆرە پەروەردە بکرێن کەخۆم دەمەوێ, بەڵام خوشکی تۆ مادەم هاوبیرو باوەڕم نەبێ, بەو جۆرەی کەدەمەوێ منداڵەکانم بۆ پێناگەیەنێت, لەبەر ئەوە ناتوانم لەگەڵیدا ببمە هاوسەر,ماڵتان ئاوابێ‌و زۆر مەمنوونم! گوتم: تۆ دەتوانی قەناعەت بەو خوشکەمان

بکەیت‌و موسڵمانی بکەیت؟! گوتی: لەوانەیە. گوتم: دەی بڕیاربێ ئێمەش ڕێگای موسڵمان بوونی لێنەگرین. گوتی: منیش دوو جار مەمنوونم. بەم شێوەیە لەگەڵ کوڕەدا هاتینەوە بۆ ماڵی خۆمان. باوکم‌و دایکم‌و خوشکم‌و هەرسێ براکە دانیشتین. کوڕە دەستیکرد بەقسەو قسەکانی لەدڵو دەروونیەوە دەهاتنە دەر, لەبەر ئەوە بەدڵمانەوە دەنیشت‌و دەبووە نەخش.. سەرەتا باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوای بۆ کردین, بەدەلیل‌و بەڵگەوە, ئینجا باسی تاک‌و تەنهایی خواو پاش ئەوە باسی جوانیی ئیسلام‌و گەورەیی پێغەمبەری ئیسلامی بۆ کردین‌و ئەو بەختەوەرییەی کەموسڵمانی ڕاستەقینە لەدونیادا تووشی دەبێت پێش قیامەت‌و زیندووبوونەوەو وەستان لەبارەگای خواداو خۆشی بەهەشت‌و ناخۆشیی دۆزەخی بۆ کردین, وامان لێهات لەم جیهانەوە پەروازمان کردو وامان دەزانی کە لەڕۆژی قیامەتداین‌و نامەی کردەوەمان دراوەتە دەستمان‌و چاوەڕوانین بەرەو دادگای خوا ببرێین, پێش هەمومان دایکم‌و باوکم موسڵمان بوون, ئینجا خوشکم شایەتمانی هێنا, پاشان ئێمەش هەرسێ براکە موسوڵمان بووین, خوای گەورە بەهۆی ئەو گەنجە داوێن پاکەوە هیدایەتی داین‌و خستینیە سەر شاڕێگەی بەختەوەری, هەر لەو مەجلیسە پیرۆزەدا مامۆستایەکی ئاینی ئیسلاممان بانگ کردو خوشکەکەمان لێ مارەکرد. ئێستا هاوسەری یەکترین‌و منداڵێکیشیان بووە ناویان ناوە (محمد), بەناوی ئەو پێغەمبەرە سەروەرو سالارەی کەئالای یەکتاپەرستی گرت بەدەستەوەو مرۆڤایەتی لەچاڵی قووڵی نەگبەتی‌و داوێن پیسی هێنایە دەرەوەو بەرەو لووتکەی کامەرانی‌و بەختەوەری برد.

ئیماندارانی بەڕێز: ئایا ئینسان لەبەرامبەر ئاوا هەڵوێستێکەوە چی بڵێ, ئایا دروستە بڵێین: جگە لەپێغەمبەران (عَلَيهِمُ السَّلام), کەسی تر لەبەرامبەر فیتنەی ژنەوە خۆی بۆ ناگیرێ؟! ئایا دروستە بڵێین ئەوەی لاوو گەنج بوو خۆی بۆ ناگیرێ؟! مەگەر ئەوانەی کەوتوونەتە ساڵەوەو پیر بوون؟ ئایا دروستە بڵێین بەس خەڵکی زەمانی زوو ئەوەیان لەدەست هاتووە, چونکە کۆمەڵگا خراپ نەبووەو ئافرەت بەئاشکرا ڕووت‌وقووت نەبووە, بەڵام ئەمڕۆ هەرگیز شتی وا نابێ‌و کەس نیە خۆی بۆ بگیرێ؟! چونکە ئەمڕۆ کۆمەڵگا خراپ بووەو ئافرەتان لەهەموو شوێنێك لەبەرچاوی پیاواندان؟!.. ئەمانە هەمووی قسەی

ئەو کەسانەن کە لەبەرامبەر لەشکری هەواو هەوەسەوە رووخاون.. بەڵام ئیمان‌و بڕوا لەهەر دڵێکدا جێگیربوو، موعجیزە بەدی دێنێ، جا ئەو خاوەن باوەڕە ڕاستەقینە پێغەمبەرێك بێت یان گەنجێکی ئاسایی بێ، یان پیرێك بێ، سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر وەکو (یووسف) پێغەمبەر، یان دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر وەك عابیدەکە، یان لەسەدەی بیستەمدا وەك ئەو لاوە موسڵمانەی ناو زانکۆ کەباسمان کرد.

بەڵێ، ئینسان لەهەر سەردەم‌و جێگاو ژینگەیەکدا بێ مادەم ئیمان‌و باوەڕ لەدڵیدا جێگیربوو، بەرهەمەکەی ئاوادەبێ کەبینیمان. زیاد لەوەی کچەکەی بەحەلاڵی دەستکەوت بووە هۆی باوەڕهێنان‌و ڕزگارکردنی شەش کەسی تریش لەئاگری دۆزەخ.

بەڵێ موسڵمانان، ئیمان پلەوپایەیەك دەدات بەخاوەنەکەی، نرخی بۆ دادەنێ، نەیارەکانیشی بەچاوی ڕێزەوە بۆی دەڕوانن، ئەو باوەڕە ناهێڵێ خاوەنەکەی بچێتە ڕیزی ئاژەڵەوە، نایەڵێ تووشی شەرواڵ پیسی ببێ‌و ناهێڵێ خاوەن باوەڕ ڕۆڵ پێشکەشی کۆمەڵگا بکات. باوەڕ ناهێڵێ کۆمەڵگا پیس ببێ‌و نەخۆشیی سامناکی تێدا بڵاوبێتەوە.. بەڵێ ئیمانداری ڕاستەقینە فەرمانی خوا ناشکێنێ‌و توخنی زینا ناکەوێتەوە، چونکە خوای گەورە لێی قەدەغەکردووەو فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾(الاسراء 32).

ئیماندارانی بەڕێز: ئێستا با بزانین بەروبوومی داوێن پاکی چیە؟ ئایا کەسێك لەترسی خوای گەورە، خۆی لەگوناهو بێشەرعی بپارێزێ، بەگوێی هەواو ئارەزووی نەفسی (أمَّارة بِالسُّوء)ی خۆی نەکات، ئایا خوای گەورە چ بەهرەو خەلاتێکی پێشکەش دەکات؟! گوێ لەم بەسەرهاتە واقعیە بگرن:

لاوێکی جوانخاس لەسووریا شتی دەستی دەفرۆشت، بەکۆڵانەکاندا دەگەڕاو شتی دەفرۆشت، ئافرەتێك بەناوی شت لێکڕینەوە بانگی دەکاتە ماڵەوەو دەرگای لەسەر دادەخات‌و دەیەوێت خراپەی لەگەڵدا بکات، لاوەکەش دەزانێ هیچ چارێکی نەماوەو ئەم ژنە سوورە لەسەر ئەوەی کەدەبێ هەر زینای لەگەڵدا بکات" بەژنەکە دەڵێ: پێش ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەین ڕێگام بدە بچم بۆ سەر ئاو. ئەویش سەرئاوەکەی نیشان دەدات‌و ڕێگای دەدات. کوڕە دەچێتە سەرئاوەکەوەو دەست دەکات بەشوێنی پیساییداو بەمست

پیسایی‌و میزاو دەردێنێ‌و لەهەموو لەشی خۆی هەڵدەسوێ‌و بۆ خۆی چەند جار لەبۆگەن دەڕشێتەوە, ئەمەش بۆیە دەکات بۆ ئەوەی کەژنەکە بەم حاڵەوە ببینێ‌و لەبەرچاوی بکەوێ‌و وازی لێ بێنێ‌و لەو گوناهە گەورە ڕزگاری ببێ. بەڵێ, کەدێتە دەرەوە ئافرەتەکە بەو حاڵەوە دەیبینێ, لووتی خۆی دەگرێ‌و دەڵێ: هەرئێستا بڕۆرە دەرەوە ماڵوحاڵت پیس کردم. هەر کە لەماڵەکە دێتەدەرەوە منداڵانی ئەو کۆڵانە کەبەو شێوەیە دەیبینن دوای دەکەون‌و گاڵتەی پێدەکەن وا دەزانن شێت بووە, تا دەگاتە ماڵەوەو لەوێ خۆی دەشواتو جلەکانی دەگۆڕێت‌و زۆر سوپاسی خوا دەکات کەلەو گوناهە گەورەیە ڕزگاری کرد. ئیتر لەو ڕۆژەوە, هەمیشە وەك کەراماتێك لەخواوە بۆنی میسکی لێهاتووە, هەر عەرەقەیەك لەلاشەی دەهاتە دەرەوە بۆنی میسکی لێدەهات, بەهەر لایەکدا بڕۆیشتایە بۆنی میسك لەو ناوەدا بڵاودەبۆوە. کاتێکیش کەدەمرێ گۆڕەکەی بۆنی میسکی لێدێ‌و تا ئێستاش گۆڕەکەی بەناوبانگە بەگۆڕی میسکی.

بەڵێ, ئەو لەترسی خوا, بۆ پاراستنی داوێن پاکیی خۆی پیسایی‌و بۆگەناوی لەلەش‌و جلوبەرگی خۆی داو خۆی کرد بەگاڵتەجاڕی منداڵان, خوای گەورەش ئەو بۆنە ناخۆشەی بۆ گۆڕی بەمیسك‌و گۆڕەکەی پڕکرد لەمیسك‌و سەرەنجام إنشاءَ الله لەبەهەشتی بەریندا بۆنی میسکی بەهەشت دەکات.

ئەمە بەرهەمی دونیایی, ئەمە ڕێزگرتنی خوا بۆ داوێن پاکان لەدونیادا, ئەی بەرهەمی قیامەتی چیە؟

پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: حەوت تاقم هەن خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا, لەژێر سێبەری عەرشی خوادا دایاندەنێ, لەو ڕۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێکی تر نیە بێجگە لەسایەو سێبەری خۆی:

یەکەم: پێشەوای دادپەروەر.

دووەم: لاوێك کە لەسەر خواپەرستی گەورە بووبێ.

سێیەم: پیاوێك کەدڵی ئالوودەی مزگەوت بێ.

چوارەم: دوو کەس کە لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆش بوێ.

پێنجەم: پیاوێك کەئافرەتێکی جوانی خان‌ومان, داوای خراپەی لێبکات‌و ئەم لەبەر خوا

توخنی نەکەوێو بڵێ من لەخوا دەترسم.

شەشەم: کەسێك خێرێك بکات بەدەستی ڕاستی, دەستی چەپی پێی نەزانێ.

حەوتەم: کەسێك کە بەتەنها یادی خوا بکاتو, لەخۆشەویستیی خواو لەترسی خوا" فرمێسك هۆن هۆن بەچاوەکانیدا بێتە خوارەوە.

خۆشەویستان: ئایا ئەم حەوت تاقمە کە لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوادا دەبن, چی لەدنیادا وای لێکردن ببنە خاوەنی ئەم صیفەتانە, کاربەدەست بێو زوڵم نەکا, بەرتیل نەخوا, خیانەت بەگەلەکەی نەك.. گەنج بێو قۆناغی گەنجیەتی نەیخەڵەتێنی.. ئینسانێك زۆربەی ژیانی لەمزگەوتدا بەسەربەرێو دڵی هەر لای ماڵی خوا بێ.. کەسێکی خۆش بوێو هیچ تەماحی ماددیش لەنێوانیاندا نەبێ.. کەسێك هەموو هۆکارێکی داوێن پیسی بۆ برەخسێو نزیکی نەبێتەوە.. ئینسانێك کەخێردەکات حەزنەکات کەس چاوی لێی بێو پێی بزانێ.. موسڵمانێك لەچۆڵەوانیدا هیچ مەصیبەتێکی لێنەقەوماوەو هیچ خەمو مەراقێکی نیە, کەچی فرمێسك بەچاوەکانیدا دێتە خوارەوە..

ئەمانە هەمووی بەرهەمی ترسان لەخوان, هەمووی ئیمانە بەوەی کەخوایەك ئاگای لێتە لەهەر شوێنو جێگایەکدا بی.. ڕەحمەت لەو شاعیرە کـــــەفـــەرمــوویەتی:

وَإذا خَلَـوْتَ بِـرِيبَـةٍ فـي ظُـلْـمَـةٍ وَالنَّفْسُ داعِيَةٌ إلى الطُّغْيـانِ
فَاسْتَحي مِنْ نَظَرِ الإله وَقُـلْ لَها إنَّ الَّذي خَلَقَ الظَّلامَ يَراني

واتە: هەرکاتێ لەتاریکایی شەودا, لەچۆڵەوانیدا, هەلت بۆ هەڵکەوتو توانیت کاری ناشەرعی بکەیت, نەفسیش داواکاری ئەوەبوو کە لەسنوور دەرچێو ئەو بێشەرعییە ئەنجام بدات, ئا لەو کاتەدا تۆ شەرم لەوە بکە کەخوا چاوی لێتەو, بەنەفسی خۆت بڵێ: ئەی نەفسی پیس تۆ وا مەزانە شەوەو تاریکەو چۆڵەوانییەو کەس چاوی لێم نیەو ئاگای لێم نییە, چونکە ئەو خوایەی کەتاریکیی دروست کردووە, ئەو خوایە چاوی لێمەو تەماشام دەکاتو دەمبینێ.

شاعیرێکی تر دەفـــــەرموێ:

إذا ما خَلَـوْتَ الدَّهْرَ يَوْماً فَلا تَقُلْ خَلَـوْتُ ولكِنْ قُلْ عَلَيَّ رَقِيبُ
وَلا تَحْسَبَـنَّ اللهَ يَـغْـفَـلُ سَـاعَـةً وَلا أنَّ ما تُخْفى عَلَيْهِ يَغِيـبُ

بەڕێزان: ئێمە ئەمـــــڕۆ پێویستمان بەو عـــەقیدەو بیروباوەڕە هەیە, پێویستە گەنجەکانمان هەڵگری ئەم بیروباوەڕە بن, بۆ ئەوەی لەئاشکراو نهێنیدا خۆیان لەهەموو خراپەو بێڕەوشتییەك بپارێزن.

وەڵڵاهی, وەڵڵاهی هیچ بیروباوەڕێك, هیچ فەلسەفەو ئایدیۆلۆجیایەك, هیچ قانونو دەسەڵاتێك ناتوانێ ئینسان, بەتایبەت گەنج لەخراپەو تاوان بپارێزێو ئیصلاحی کۆمەڵگا بکات, ئیللا ئیمان نەبێ, ئیللا ئیسلام نەبێ, ئیللا پەروەردەی مزگەوت نەبێ, ئیللا مەدرەسەی ڕۆژوو نەبێ.

کەواتە: ئیصلاحی کۆمەڵگا, چەسپاندنی داوێن پاکی بەوە دەبێ کەگەنجەکانمان ئەهلی مزگەوت بن, ترسی خوا لەدڵودەروونیاندا ڕەگ دابکوتێ.لەبەر ئەوە, هەر کەسێك دژی ئەوە بێ خەڵکی ڕوو لەمزگەوت بکەن, حەزی لەوە بێ خەڵکی ئەهلی نادیو قومارخانە بن, بەڵام هاتوچۆی مزگەوتی بەلاوە ناڕەوا بێ, گەنجێك گوێ لەقورئان یان فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەگرێ, کەمامۆستایەکی بەڕێزی شارەزا لەسەر کاسێتێك یان (CD)ێك شیدەکاتەوە, کەسێك بەمە دڵگران بێو حەز نەکات ئەم گەنجە گوێ لەم بەرهەمە بەپێزو بەڕێزە بگرێ, خۆی بەگوڵاوی ناو ئەو کاسێتە بۆنخۆش بکا, بەڵام ڕەواج بداتو حەزبکات کەفیلمی ناشەرعیو نەگونجاو لەگەڵ دینو ئەخلاقی گەنجەکانمان بەتایبەتیو میللەتی موسڵمان بەگشتی, لەناو خەڵکیدا بڵاوبێتەوە! ئەوە ئەو هەڵوێستە" ئەو ڕاستییە ئاشکرادەکات کەئەو جۆرە کەسانە, دژی ئیسلامن, دژی قورئانن, دژی داوێن پاکین, حەزیان لەبۆگەنیو ڕەشیو چڵکاوو چاولێکەریی کوێرانەی نەفامانەیە..

جا تۆی خوشكو برای وسڵمان, ئەگەر حەزدەکەیت کوڕەکەتو کچەکەت, خێزانەکەت, خاوەنی ئەخلاقی بەرزبن, داوێن پاك بن, دووربن لەهەموو بەدڕەوشتییەکەوە کەمایەی سەرشۆڕیی مرۆڤن لەدونیاو قیامەتدا, ئەوا هاتوچۆی مزگەوتیان پێبکە. با چۆن کوڕەکەت دێت بۆ گوێگرتن لەووتاری جومعە, با کچەکەشت بەشداریی جومعە بکات, چونکە مزگەوتو جومعەو جەماعەت لەم ڕۆژگارەداو لەهەموو ساتو سەردەمێکدا, تاقە ضەمانەتی ڕزگاربوونە لەفیتنەو بەڵا, لەدەردیسەریو گومرایی, لەبەدناوبونو

بەدبەختی, وەمزگەوت کەشتیی ڕزگاربوونەو هەرکەسێ بچێتە ناویەوە داینابەزێنێ هەتا نەیکات بەبەهەشتی بەریندا إنشاءَ اللە..

داوا دەکەم لەخوای گەورەو میهرەبان بەڕەحمی خۆی ڕەحم بەهەموومان بکات.. هیدایەتی گەنجو لاوەکانمان بدات.. هەموومان لەسەر داوێن پاکیو ئەخلاقی بەرزو پەسەند بژینو بمرینو لەقیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوادا پشوو بدەین..

اللّهُمَّ آمین

# ووتاری ژماره نۆزده

## داوێن پاکی

### بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالی :

﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَنْ يُكْرِههُنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾

(النور33)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( يا مَعْشَرَ الشَّبابِ مَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمُ الباءةَ فَلْيَتَزَوَّج, فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْسَنُ لِلْفَرْجِ, فَمَنْ لَم يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّومِ, فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ)

(رواهُ البُخاري)

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيمانداران‌و خواناسان, سه‌لام‌و ره‌حمه‌تی خوا له‌ئێمه‌و هه‌موو ئیماندارانی ئوممه‌تی محمد المصطفى بێ صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم, له‌م ووتاره‌شدا بۆ ته‌واوكردنی باسی داوێنپاكی, كه‌وه‌صیه‌ت‌و ڕاسپارده‌ی چواره‌می خوای په‌روه‌ردگاره بۆ عه‌بدو به‌نده‌كانی كه‌فه‌رمووی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾(الأنعام151), درێژه به‌و باسه گرنگه ده‌ده‌ین‌و ده‌ڵێم وبِالله التَّوْفيق: له‌ڕاستیدا داوێن پاكی بابه‌تێكی زۆر گرنگه بۆ گه‌نج‌و هه‌رزه‌كاره‌كان, هه‌روه‌ها بۆ ئه‌وانه‌ش كه‌هاوسه‌ریان هه‌یه, بۆیه پێویسته زۆر به‌وردی‌و به‌گرنگی‌پێدانه‌وه گوێی بۆ بگرین.

خۆشه‌ویستان: باسی داوێن پاكی هه‌ر له‌ناوه‌كه‌یه‌وه پیرۆزی‌و پاكیی لێده‌رده‌كه‌وێ, ئینسان له‌كاتی باسكردنیدا له‌زۆر شوێنیدا شه‌رم ده‌كا, به‌ڵام ئه‌م باسه زه‌رووره‌تی ئه‌م ڕۆژگاره‌یه, له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ندێ كه‌س ژنی هه‌یه, یان ئافره‌ته‌و شووی كردووه, كه‌چی 100٪ داوێن پاك نیه. گه‌نج هه‌یه ده‌ڵێ: تا ته‌نیابووم داوێن پاك بووم, كه‌چی دوای ژن هێنانم تووشی خراپه بووم! ئه‌مه هۆیه‌كه‌ی چیه؟! هۆیه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه كه‌كۆمه‌ڵگا گۆڕاوه, داوێن پاكی خۆی له‌ده‌ستداوه.

ده‌توانین بڵێین: له‌م سه‌رده‌مه‌دا داوێن پاكی زۆر سه‌رپێچی‌و گوناه تێیدا ڕوویداوه, به‌جۆرێك له‌سه‌رده‌م‌و نه‌وه‌كانی پێشتردا ڕووی نه‌داوه, كه به‌ڕاستی بۆ موسڵمانان زۆر ناشروستییه, چونكه داوێن پاكی له‌سه‌ره‌تایی ترین ڕه‌وشتی ئینسانه.. ئینسانی مه‌رد ئه‌و كه‌سه‌یه بتوانێ داوێن پاكیی خۆی بپارێزێ, چه‌ند سه‌ربه‌رزن ئه‌وانه‌ی له‌گه‌نج‌و پیری ئوممه‌تی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, كه‌سه‌رتاسه‌ری ژیانیان به‌داوێن پاكی بردۆته‌سه‌ر.

ئیمانداران: فه‌رموون با بچینه خزمه‌ت قورئانی پیرۆز كه‌باسی جوانترین نموونه‌ی داوێن پاكیمان بۆ ده‌گێڕێته‌وه, باسی گه‌وره‌مان یووسف پێغه‌مبه‌ر (سه‌لامی خوای لێبێت), حه‌زره‌تی یووسف پێشه‌وای گه‌نجانی داوێن پاك.. وه‌رن باسی ئه‌و ئیغرائاتانه بكه‌ین كه‌خرانه به‌رده‌می یووسفی داوێن پاك, تا هیچ گه‌نجێك بیانووی نه‌مێنێ, به‌ڕاستی ئه‌و ئیغرائاتانه‌ی كه‌خرایه به‌رده‌م گه‌وره‌مان یووسف بیانووی بۆ كه‌س نه‌هێشته‌وه, لـه‌ڕۆژی

قیامەتدا کەس ناتوانێ دەمی بکاتەوەو بیانوو بدۆزێتەوەو بڵێ: خوایە گیان بەخوا تاوانەکە هاتە بەردەممو خوایە گیان ئارەزووەکە زۆر بوو, ناچاریکردم ئەو داوێن پیسییە بکەم! بەوردی گوێ بگرن بزانن حەزرەتی یووسف چی خرایە بەردەمی بۆ ئەوەی تووشی داوێن پیسی بکەن.

**یەکەم:** حەزرەتی یووسف گەنجێکە تازە پێگەیشتووە, ئارەزووی جنسیی لەوپەڕیدایە, قۆناغی هێزو گوڕ, ژنیشی نیە ئارەزووی خۆی پێ دامرکێنێ! ناشزانێ کەی ژن دێنێ, چونکە ئەو کۆیلەیە, لەوانەیە هەندێ گەنج خۆی بگرێ چونکە بەتەمایە ساڵێك دوو ساڵیتر ژن بێنێ, بەڵام حەزرەتی یووسف ئەو ئومێدەشی نەبوو, لەوانەیە سەڵتییەکەی درێژە بکێشێ.

**دووەم:** حەزرەتی یووسف غەریبە, ئینسانیش لەغەریبیدا باشتر سەرپێچیو تاوانی بۆ دەکرێ وەك لەووڵاتو شارەکەی خۆیدا, چونکە لەشارەکەی خۆیدا کەسوکارو خزمو ناسیاوی خۆی دەبینێو شەرم دەکا. خەڵکانێك هەن لەووڵاتی خۆیانەوە دەچن بۆ ووڵاتێکی تر بۆ ئەوەی لەوێ بەدڕەوشتیی بکەن, چونکە کەسی ناسیاوی لێ نیەیە شەرمی لێبکەن. بەڵام گەورەمان یووسف ئەم حاڵەتەی بۆ ڕەخسابوو, غەریب بوو لەووڵاتی میصردا, کەس نەیدەناسیو کەس نەیدەزانی کوڕی کێیە تا شەرم بکات.

**سێیەم:** حەزرەتی یووسف لەو کاتەدا عەبدو کۆیلە بوو, عەبدو کۆیلەش وەکو ئینسانی ئازاد نیە.. کەواتە مەجالی زینای بۆ ئاسانتر بوو!

**چوارەم:** حەزرەتی یووسف داوای ئیشی بێشەرعیی لەئافرەتەکە نەکرد, بەڵکو ئافرەتەکە داوای لەیووسف کرد! گەنجانێك هەن لەوانەیە بیانەوێو حەزبکەن هەلیان بۆ بڕەخسێو داوێن پیسی ئەنجام بدەن, بەڵام ناتوانێو ناوێرێ قسە لەگەڵ ئافرەتێکدا بکاتو بڵێ من دەمەوێ ئەوەت لەگەڵدا بکەم, لەبەر ئەوەی دەترسێ ئافرەتەکە قسەی پێ بڵێت, ڕەدی بداتەوە. بەڵام گەورەما یووسف ئافرەتەکە داوای سەرپێچیی لێدەکات, لەبەری دەپاڕێتەوە, هەموو هۆکارێکی ئاسانکاریی بۆ ئەو بێشەرعییە دابین دەکات, بەڵام یووسف جوابی ناداتەوە!

**پێنجەم:** ئافرەتەکە (زولەیخا)یە, زۆر جوان بوو, لەئەوپەڕی جوانیدابوو, خاوەنی پلەوپایەیەکی زۆر گەورەبوو, ژنی حاکمی میصربوو. لەوانەیە گەنجێك" ئافرەتێك بیەوێ سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشێ بەڵام ئافرەتەکە جوان نەبێ, بۆیە گەنجەکە ڕووی تێناکات, چونکە بەدڵی نیە, بەڵام زولەیخا جوانترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بوو.

**شەشەم:** خەلوەت ڕەخسابوو, مێردەکەی زولەیخا لەماڵ نەبوو, کەسی‌تریش لەماڵەکەدا نەبوو ﴿ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ ﴾(یوسف 23), زولەیخا هەموو دەرگاکانی داخستبوو, هیچ مەترسی ئەوەیان نەبوو کەس بەسەریاندا بێ ﴿وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾ (یوسف 23), ئافرەتەکە بەردەوام داوا لەیووسف دەکات بۆ ئەوەی ئەو کارە ناشەرعییەی لەگەڵدا بکات, تەواو ئەمین بوو لەحەیای خۆی کەکەشف نابێت, واتە حەزرەتی یووسف هیچ مەترسی ئابڕووچونی نەبوو, لەوە ئەمین‌و دڵنیابوو. بەڵام لەوانەیە کەسانێك هەبن حەز بەداوێن پیسی بکەن, بەڵام لەترسی ئاشکرابوون‌و نـــاوزڕان‌و حـەیاچوون نەتوانن ئەنجامی بدەن.

**حەوتەم:** حەزرەتی یووسف یەك دەقیقە لەم ئافرەتە دوور نەبوو, شەوو ڕۆژ لەماڵەکەی لەگەڵیدا دەژیا, ئەمینداریماڵیان بوو, واتە: لەهەموو لایەکەوە ئارەزوو دەوری‌دابوو, ئەوە نەبوو بڵێت: یەك دوو سەعاتی دەوامی قوتابخانە یاخود فەرمانگە لەگەڵیدایەو تەواو, ئیتر خۆی دەگرێ‌و ڕووی تێناکات تا لەیەك جیادەبنەوە.. نەخێر, یوسف شەوو ڕۆژ لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بەیەکەوە دەژیان‌و بەو هەموو جوانییەیەوە بەبەر چاویدا دەهات‌و دەچوو! هەندێ کەس دەڵێ: من لەماڵەوە کەناڵێکی ئاسمانیی یا سیدی یەکم لایە, ناچار دەبم سەیری بکەم, بەڵام حەزرەتی یووسف نەك بەوێنە بەڵکو بەفیعلیی لەبەردەمیدا بوو ﴿ وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾(یوسف23), واتە: ئەو ئافرەتەی کەیووسف لەماڵیدا بوو, هەوڵیدا لەخشتەی بیات‌و تووشی گوناهی بکات, هەموو قاپییەکانی داخست‌و گوتی: من خۆم بۆ تۆ ئامادەکردووەو شێت‌و شەیدای تۆم!!

تەماشاکە برام! دەبینی هەموو هۆکارەکانی ئارەزوو و ئیغرا ئامادەیە, بەڵام بزانە یووسف وەڵامی چ دەبێ؟!

﴿ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴾(یوسف23),

یووسف فەرمووی: پەنا دەگرم بەخوا (کاری وا ناکەم), چونکە پەروەردگارم دەرووی خێری لێ کردوومەتەوە, هەروەها مێردەکەت زۆر ڕەفتاری لەگەڵمدا چاك بوو, (ئیتر چۆن خیانەت بەناموسی بکەم؟!) من دڵنیام ستەمکاران سەرفراز نابن.

﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ ﴾(یوسف24), واتە: بێگومان شاژن ویستی پەلاماری بداتو مەستو حەیرانی یووسف بوو, یووسفیش گیری خواردبو بەدەستیەوەو هەر ئامۆژگاریی دەکرد, واتە: یوسف نەك هەر خراپەی نەکرد" بەڵکو هەر بیریشی لێنەکردەوە! لەبەرچی؟! چونکە یووسف بیری خوای دەکردەوە, هەستی بەبەڵگەی ئیمانی لەدڵودەروونی خۆیدا کرد, سزای دۆزەخ هاتە بەرچاوی.

بەڵێ ئیمانداران: ئەوەی لەکاتی گوناهدا گرنگە ئەوەیە: بیر لەدەسەڵاتی پەروەردگار بکەیتەوە, بیر لەڕۆژی قیامەتو سزای خواو دۆزەخو بەهەشت بکەیتەوە ﴿ كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴾(یوسف24), واتە: بەو شێوەیە بەهۆی ئیمانی دامەزراویەوە لەهەرچی خراپەو گوناهو تاوان بوو بەدوورمان گرت, بەڕاستی ئەو لەبەندە هەڵبژێردراوو پاکەکانی ئێمەیە.

بەڵێ خۆشەویستان: یووسف ڕایکرد لەبەردەستیو ئەمجارەیان ڕزگاری بوو, باسەکە بەدرێژی لەسوورەتی یووسفدا باسکراوەو ناچینەسەری, بەڵام ئایا زولەیخا واز لەیووسف دێنێ؟ نەخێر, بەتایبەت کەئەم بەسەرهاتە دەگاتە دەمی ژنانی میصریو لۆمەی زولەیخایان کرد کەتەماحی کردۆتە خزمەتکارەکەی خۆی. زولەیخا هەموویانی دەعوت کردو هەریەکەی چەقۆیەکی دایە دەستیان بۆ میوە پاککردن, ئینجا یووسفی ناردە لایان, ژنەکان کەچاویان بەجوانیی یووسف کەوت, هەموویان لەجیاتی میوە" بەچەقۆکە دەستی خۆیان بڕیو گوتیان: پاکی بۆ خوا ئەم لاوە بەشەر نیە, ئەمە ئەوەندە جوانە فریشتەیە. ئینجا زولەیخا گوتی: ئا ئەم لاوەیە کەئێوە لۆمەی من دەکەن لەسەری. ئینجا زولەیخا بەناچاری ددانی بەپاکیی یووسفدا ناو گوتی: ﴿ وَلَقَدْ رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾(یوسف32), واتە: بێگومان من هەوڵمدا لەخشتەی بەرم, بەڵام ئەو خۆی گرتو خۆی پاراستو دوورەپەرێزبوو. سەیرکە (اسْتَعْصَمَ), واتە: زۆر بەتوندی خۆیگرت.. بەڵێ تۆی گەنجی موسڵمان وەکـــو یووسف دەبێ خۆگـــر بی بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی دەیانەوێ

داوێن پاکیت لەکەدار بکەن.

بەڕێزان: کاتێك زولەیخا زانی یووسف هیچ بۆی بەردەست نابێ, هەڕەشەیەکی گەورەی لێکردو گوتی: ﴿ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُوناً مِّنَ الصَّاغِرِينَ ﴾ (یوسف32), واتە زولەیخا گوتی: بەڵام ئەگەر ئەوەی من دەمەوێ نەیکات, ئەوە بەڕاستی دەبێ بەند بکرێو دەبێ زەلیل ببێ.

ئایا یووسف لەبەردەم ئەم هەڕەشە گەورەدا کەسجن کردنیەتی, کەڕۆیشتنە بۆ ناو چوار دیوارێکی تاریك, بەتۆمەتی ئەوەی داوێن پیسو بێڕەوشتە, دەبێ هـــەڵوێستی چی بێ؟

﴿ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ ﴾(یوسف33), یوسف کەگوێی لەم هەڕەشە گەورەی زولەیخا بوو, لەبەرخۆیەوە فەرمووی: پەروەردگارا, من زیندانیم لا خۆشترە لەوەی ئەمانە لەمنیان دەوێ! بەڵێ, گەورەمان یووسف زیندانی قبووڵکرد, سجنێك کە ﴿ بِضْعَ سِنِينَ ﴾ تێیدا مایەوە, واتە ماوەی (3 ـ 9) ساڵ لەسجندا مایەوە!  ئەوەی بەلاوە ئاسانتر بوو نەك داوێن پیس بێ! لەوانەیە ئەگەر یەکێکی تر بوایە بیگوتایە: ناچاربووم ئەم کارەم کرد تا سجن نەکرێم .. بەڵام یووسف دەفەرموێ: حەزدەکەم بەبێتاوان چەند ساڵ لەسجندا ژیان بەسەر بەرم, بەڵام زینا نەکەم!

بەڵێ ئیمانداران: داوێن پاکیەکەی یووسف لەوەدا گەورەیی‌و گرنگییەکەی دەردەکەوێ کەهەموو هۆکارێکی زیناکردنی لەبەردەمدا ئاسان کرابوو, بەڵام تەنها لەترسی خوا وازی لەهەموویان هێنا.

پێشەوا (إبن قَيِّم الجَوْزِيَّة) دەفەرموێ: لە (شَيخُ الإسلام  إبنُ تَيمِيَّة)م بیست کەدەیفەرموو: خۆڕاگرتن‌و صەبری یووسف بەرامبەر تەسلیم نەبوون بەداواکارییەکانی زولەیخای ژنی حاکمی میصر, زۆر گەورەترو گرنگترو تەواوترە لەئارامگرتن‌و خۆگرتنی لەچاڵەکەدا کەبراکانی خستیانە ناویەوە, دواتریش کەفرۆشراو ماوەی چەند ساڵ لەباوکی دوورخرایەوە, هەرچەندە یووسف لەم قۆناغانەدا ئەوپەڕی ئارامگری‌و خۆڕاگری نواند, بەڵام ئەم ئارامگرتنە ئیختیاری نیەو زۆر هونەری خۆڕاگریی ئینسانیی تێدا دەرناکەوێ,

چونکە ئینسانی کۆیلە, هیچ ڕێگاچارەیەکی تری نیە جگەلەوەی ئارام بگرێ! بەڵام خۆڕاگرتن بەرامبەر ئەنجام نەدانی تاوانێك, ئەوە ئارام گرتنێکی ئیختیارییەو ئینسان مەجالی تری لەبەردەمدایە کەئارام نەگرێو تاوانو سەرپێچییەکە ئەنجام بدات, بەڵام ئارام بگرێو دژایەتیی نەفسی خۆی بکات, لەگەڵ ئەوەشدا کەهەموو هۆکارێکی ئەنجامدانی ئەو تاوانە زۆر بەئاسانی لەبەردەستیدا بێت.. بەڕاستی ئەم ئارام گرتنە زۆر گەورەو بەنرخە!

خۆشەویستان: دەبێ چەند گەنج وەك یووسف سجنی لەزینا پێ خۆشتر بێ؟! دەبێ چەند لاوو گەنج ئەم شەرەفە بەدەست بێنێو تا نەگات بەحەڵاڵی خۆی نزیکی حەرام نابێتەوە؟ بەدڵنیاییەوە ئەم گەنجانەمان زۆر زۆرن کەڕۆژانە دەیان ئافرەتی دانەپۆشراو بەبەردەمیاندا تێدەپەڕێو لەخوێندنگاو فەرمانگەو بازاڕدا هاوکاریەتی کەچی بۆ جارێکیش بۆی ناڕوانێ! ئەمەش تەنها بەپەروەردەی ئیسلام دەبێ کەبڕوای بەچاودێریی خوای گەورە هەیە بەسەریەوە.

ئیمانداران: جارێکیان صەحابەکان (ڕەزای خوا لەهەموویان بێ) پرسیاریان لەپێغەمبەری خوا کرد ئایا بەڕێزترین کەس کێیە؟ فەرمووی: یووسف.. بۆ؟! چونکە بەڕێزترین کەس داوێن پاکترینیانە. چاك ئەوەیە داوێن پاکە, خۆی دەپارێزێ, بەڕێزە, دەروونی بەرزە, ئیهانەی نەکردووە بەدەروونی خۆی.. بەڕێزترین کەس یووسفە, چونکە ڕێزی لەخۆی گرت.

جا ئایا تۆی گەنجی موسڵمان حەزدەکەی ڕەفیقی یووسف بی؟ یان حەزدەکەی لەگەڵ حەزرەتی یووسفدا حەشر بکرێی؟ ئایا حەزدەکەی ڕۆژێك لەبەردەم خوادا وەستابیتو حەزرەتی یووسف لەپاڵتدا بێ؟! بێگومانبە ئەوەی داوێن پاك بێ, خراپەی بۆ ڕێبکەوێو لەترسی خوا وازی لێبێنێ, ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ گەورەمان یووسفدا دەوەستێنرێ!

---

ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: سولەیمانی کوڕی یەسار, کوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو بوو, جوانترین دەموچاوی هەبوو,ساڵێکیان لەگەڵ هاوڕێیەکی چوون بۆ حەج لەناوچەی (أبواء) لایاندا بۆ ئەوەی پشوویەك بدەن, نانوئاوێك بخۆنو سەرخەوێك بشکێنن. هاوڕێیەکەی, ڕەفیقی ڕێگاکەی, توێشوودانەکەی, ئەو توورەکەیەی کەکەلوپەلی

خواردەمەنی تێدابوو, هەڵیگرتو چوو بۆ بازاڕ شت بکڕێ, سولەیمان لەخەیمەکەدا دانیشت, ئافرەتێکی لادێنشین لەسەر لووتکەی چیاکەوە چاوی لێبوو وا ئەو کوڕە گەنجە جوانە بەتەنیا لەو شوێنە چۆڵە ڕاکشاوەو کەسی لا نیە, خۆی بۆ نەگیراو هاتە خوارەوە بۆ لای سولەیمان لەبەردەمیدا وەستاو پەچەکەی لابرد, ڕوومەتی وەك پارچەیەك لەمانگەشەو وابوو, بەسولەیمانی گوت: دڵخۆشم کەو نائومێدم مەکە! ئەم گەنجە جوانەش وا حاڵی بوو برسیەتی‌و خواردنی دەوێ, بۆیە ئەوەندە خۆراکەی لەلایبوو بردیە بەردەمی‌و گوتی: فەرموو خوشکی خۆم ئەوە خواردن‌و خۆتی پێ تێربکە. بەڵام ئافرەتەکە زیاتر خۆی بۆ دەرخست‌و بەبزەیەکەوە گوتی: من نان‌و خواردنم ناوێ بمدەیتێ, من ئەوەم لەتۆ دەوێ کەپیاو لەگەڵ خێزانی خۆیدا دەیکات! سولەیمانی گەنجی پەروەردەکراوی مزگەوت, شوێنکەوتووی قورئان, شارەزا بەبەسەرهاتی یووسفی داوێن پاك, ڕووی لەئافرەتەکە وەرگێڕاو فەرمووی: ئەی داماو, ئەی بەدبەخت, تۆ ئبلیس بۆ منی ڕازاندوویتەوە بۆ ئەوەی وەکو خۆی ڕووڕەشمان بکات! بەڵام من لەو کەسانە نیم کەتۆ بەشوێنیدا دەگەڕێی. ئەمجا سەری خستە ناو هەردوو ڕانی خۆیەوەو دەستی کرد بەگریان. زۆر گریا, هەتا ئافرەتەکە پەچەکەی دایەوە بەسەریداو ڕۆیشت‌و خەجاڵەتیی بۆ مایەوە.

کاتێك هاوڕێیەکەی لەبازاڕ گەڕایەوە بینی ئەوەندە گریاوە چاوی ئاوساوە, گوتی: ئەی سولەیمان بۆچی گریاوی؟! گوتی: بیری ماڵومنداڵەکەم کردەوە, پەرۆشم بوون‌و دەستم کرد بەگریان. برادەرەکەی گوتی: بەخوا دەزانم ئەم گریانە بەکوڵو زۆرە بۆ ماڵومنداڵەکەت نیە, شتێکی تر ڕوویداوە. زۆری لەگەڵدا گوت هەتا ڕاستیی پێ گوت, ئەمجا هاوڕێیەکەی دەستیکرد بەگریان, گوتی: تۆ بۆچی دەگری؟! گوتی: ئەی سولەیمان من بۆ ئەوە دەگریم ئەگەر من لەشوێنی تۆدا بوومایە, ئەو ئافرەتە بەرەوڕووی من ببوایەتەوە, خۆم نەدەگرت‌و توشی فیتنە دەبووم‌و ئیمانەکەم لەدەست دەدا. هەی هەزاران جار ئافەرین بۆ تۆ!

بەڵێ ئەو شوێنەیان بەجێهێشت‌و گەیشتنە مەککەو دەستیان کرد بەبەجێهێنانی فەریزەی حەج. سولەیمانی لاوو خواناس, بەدڵی پڕو چاوی پڕ لەفرمێسکەوە هاتوچۆی

نێوان (صەفا)و (مەروە)ی دەکرد, خۆی پێچا بەجلەکانیەوەو لەحیجری ئیسماعیلدا خەوی لێکەوت, لەخەویدا پیاوێکی جوانی بالآبەرزی بینی, نیشانەیەکی جوانو بۆنێکی خۆشی هەبوو. سولەیمان پێی گوت: خوا ڕەحمەت پێبکات تۆ کێیت؟! هەرگیز پیاوی وەکو تۆ دەموچاو جوانم نەبینیوە! فەرمووی: من یووسفم! فەرموی: تۆ یووسفی صدیقیت؟! فەرمووی: بەڵێ. سولەیمان دەفەرموێ: گوتم ئەی حەزرەتی یووسف, بەڕاستی ڕووداوی نێوان تۆو ژنەکەی حاکمی میصر جێگای سەرسوڕمانە! حەزرەتی یووسف فەرمووی: بەخوا ئەی سولەیمان, ڕووداوی نێوان تۆو ژنەکەی (أبواء) زیاتر جێگای سەرسوڕمانە لەڕووداوەکەی نێوان منو زولەیخا!

سُبْحانَ الله, داوێن پاکانی ئوممەتی محمد المصطفی صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم ئەوەندە بەرێزن لەهەر سەردەمو کاتێکدا, گەنجێك ئاوا داوێن پیسی یەخەی پێبگرێت بەڵام ئەو لەبەر خاتری خوا خۆی لێ پاراستو داوێن پاکیی خۆی لەکەدار نەکرد, ئەوە لەدونیادا خوای گەورە حەزرەتی یووسفی سەرداری داوێن پاکان ئاگادار دەکات کەفڵان کەسیش, لەفڵان شوێن ڕووداوەکەی تۆی لێ دووبارەبۆوەو ڕێگاو هەڵوێستی تۆی گرتۆتەبەر. إنشاءَ الله لەقیامەتیشدا هەموو داوێن پاکان لەگەڵ حەزرەتی یووسفدا کۆدەبنەوەو هەموان لەژێر ئاڵای خاتەمی پێغەمبەراندا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم بەرەو بەهەشت دەڕۆن.

بەڵێ, ئینسانی ئیماندار دەبێ ڕەفیقی حەزرەتی یووسف بێ, نەك وا بزانێ پیاوەتی ئەوەیە پەیوەندیی لەگەڵ ژنانی نامەحرەمدا ببەستێ, دوای ئەوەی خوای گەورە بەئافرەتێکی داوێن پاکی گەیاندیت, کەچی دوای ئەوەش هەر چاوت لەئافرەتی نامەحرەم بێ, ئایا وەڵامت چی دەبێ, کاتێ کەخوای گەورە لەقیامەتدا پرسیارت لێدەکات: ئایا من ژنێکی حەڵاڵم نەکردە نسیبت؟! ئەی بۆچی بەشوێن حەرامدا گەڕایت؟! ئایا چی وەڵام دەدەیتەوە؟!

برای ئیماندارم: چیرۆکی حەزرەتی یووسف بۆ تۆ گوتراوە, باسی ئەوە دەکات کەدەبێ پیاوی موسڵمان, گەنجی خواناس شوێنکەوتووی یووسف بێ, هەرچەند ئیغرائاتەکان زۆر بەهێزبن, هیچیان ناگەنە ئەوانەی بەرامبەر گەورەمان یووسف کران. کەواتە تۆش وەکو ئەو خۆڕاگربە..

تۆش خوشکی ئیماندارم: گوێ لەقورئان بگرە, خوای گەورە باسی ئافرەتی داوێن پاکیش دەکات, بەڵێ, ئافرەتان بەشێوەیەکی گشتی داوێن پاکترن لەپیاوان, پاکی بەشێکە لەفیطرەتی شاراوەی ئافرەت, داپۆشراوی‌و داوێن پاکی‌و بەشەرەفی‌و خۆپاراستن بەشێکن لەسروشتی پاکی ئافرەت, خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالى باسی مەریەمەی پاك داوێنمان بۆ دەکات ﴿ وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴾ (التحريم12), واتە: خوای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بەمەریەمی کچی عیمران, کەداوێنی خۆی بەپاکی ڕاگرت! ئایا مەریەمە بەهۆی چییەوە گەیشتە ئەو پلەوپایەیەی کەخوای گەورە لەقورئاندا نموونەی پێ بێنێتەوە بۆ ژنانی گەورەو بەڕێز؟ ئایا چ شتێك بووە هۆی ئەوەی کەمەریەمە ببێتە یەکێك لەو ئافرەتانەی کەگەورەی هەموو ژنانی بەهەشتن؟! مەریەم بەهۆی داوێن پاکییەوە گەیشتە ئەو پلەوپایە بەرزە ﴿أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴾, خوای گەورە بۆمان باس دەکات کەکاتێ حەزرەتی جوبریل بەفەرمانی خوا چوو بۆ لای مەریەمە لەکاتێکدا لەشوێنێکی چۆڵەوانیدا لەڕۆژهەڵاتی بَيْتُ الْمُقَدَّس خواپەرستیی دەکرد, جوبریل (عَلَيْهِ السَّلام) لەسەر شێوەی پیاوێکی تەواو خۆی خستە بەرچاوی, مەریەمەی داوێن پاك کەچاوی پێکەوت یەکسەر فەرمووی: ﴿ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيّاً ﴾(مريم18) من پەنا دەگرم بەخوای میهرەبان ئەگەر تۆ کەسێکی بەتەقواو لەخواترس نەبیت!

دەبێ ئەمە شیعاری هەموو کچێکی موسڵمان بێت بەرامبەر هەر چاوێکی ناحەز کەسەیری بکات. ئینجا حەزرەتی جوبریل فەرمووی: ﴿ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلاماً زَكِيّاً ﴾(مريم19) مەترسە من بەشەر نیم, من فریشتەم, نێردراوی پەروەردگاری تۆم تا منداڵێکی خاوێنت پێ ببەخشم, مەریەمە فەرمووی: ﴿ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيّاً ﴾(مريم20) من چۆن منداڵم دەبێت لەکاتێکدا هیچ بەشەرێك توخنم نەکەوتووەو داوێن پیسیش نیم؟!

تەماشای ئایەتەکە بکە, نەیفەرموو (أَكُن بَغِيّاً) بەڵکو فەرمووی ﴿ أَكُ بَغِيّاً ﴾, واتە مەریەمە فورمووی: من 100٪ لەخۆم دڵنیان کەداوێن پاکم, چونکە (أكُن), لەوانەیە کەم شتێك هەبێ وەکو جارێك نەزەرێکی کردبێ, یان جارێك تـــەوقـــەیەکـی حـــەرامی کـردبێ,

بەلام (أكُ) واتە: لەهەموو ژیانیدا لەکەیەك بەداوێن پاکیەوە نیە.

بەلام خوشکانی بەڕێز: مەریەمە بەهۆی ئەم داوێن پاکیەیەوە بوو" لەگەڵ ئەوەشدا کەدڵنیابوو ئەمە لەلایەن خواوەیەو بۆ خۆی لەهەموو خراپەیەك بەرییە، هەرچیش خوا ویستی لەسەر بێ هەر ئەوە چاکە، کەچی ئەوەندە خاوەن حەیاو حورمەت بوو، ئەوەندە لەکەداربوونی داوێن پاکیی بەلاوە قورس بوو، کەکەسانێك ئاگایان لەم حەقیقەتە نیەو کاتێ منداڵەکەی بوو بڕوای پێناکەن، فەرمووی: ﴿ يَا لَيْتَنِي متُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنْتُ نَسْياً مَنْسِياً ﴾(مريم23) واتە: خۆزگە پێش ئەم بەسەرهاتە بمردمایەو وەك شتێکی بێنرخ فەرامۆش بکرامایە.

هەر ئەم داوێن پاکیو ئەخلاقە بەرزەش بوو کەخوای گەورە لەسەر زوبانی فریشتەکان پێی فەرموو: ﴿ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاك وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴾(آل عمران 42)، واتە: ئەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووەو خاوێنو پاکیزەیکردوویتو لەناو هەموو ئافرەتانی جیهاندا هەڵی بژاردوویت.

جا خوشکی موسڵمانم: ئایا حەزدەکەی تۆش لەقیامەتدا ڕەفیقو هاوڕێی مەریەمە بی؟! حەزدەکەی لەگەڵ ئەودا حەشر بکرێیت؟! ئەگەر دەڵێی بەڵێ، دەی تۆش وەکو ئەو بە، ئاوا خاوەنی حەیاو حورمەتو پلەی هەرەبەرزی داوێن پاکیی بە، هەر لەم دنیایەشدا چەند سەربەرزن ئەو خوشکانەی کەتا دەگەن بەماڵومێردی حەلالی خۆیان" هیچ کەس نەیتوانیوە پاکییان لەکەدار بکات!!

بەڵێ خۆشەویستان: ئێستا ئێمە لەمانگی ڕەمەزاندایینو باسی ڕۆژوو و داوێن پاکی بەیەکەوە باسکراوە (يا مَعْشَرَ الشَّبابِ مَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمُ الباءَةَ فَلْيَتَزَوَّج، فَإِنَّهُ أغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْسَنُ لِلْفَرْجِ، فَمَنْ لَم يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّومِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ)(رواهُ البُخاري)، بەڵێ، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ڕوودەکاتە لاوان، چونکە لاوان خاوەنی وزەو توانایەکی زۆرن لەهەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی هەژموونی سێکس کەپاڵنەرێکی بەهێزە لەناخی لاواندا، ئاینی ئیسلام هیچ غەریزەیەکی ئینسان سەرکوت ناکات، بەڵکو ڕێگاو شوێنی بۆ دادەنێ (تَوظیف)ی دەکات، هەتا هەریەکێك لەو غەریزە مرۆییانە ئامانجی خۆی بەجێبهێنێ، بەتایبەتی غەریزەی سێکس کەجێگەی گرنگی پێدانە لای ئیسلام،

چونکە درێژەپێدەری ژیانی مرۆڤایەتی بەردەوامیی کاروانی ژیارو ژینە. ئەگەر کەسێك توانای پێکەوەنانی خێزانی نەبوو" بەهۆی کێشەی ئابووری بێ یان هەر کێشەیەکی تر, وەك سەرقاڵبوون بەپرۆسەی خوێندنەوە, وەك لەکاتی ئێستاماندا باوە, ئەوە قورئان ڕوویان تێدەکاتو دەفەرموێت: ﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ ﴾(النور33), با ئەوانەی ناتوانن خێزان پێکەوەبنێن" داوێن پاکیی خۆیان ڕاگرن هەتا خوای گەورە دەرگای میهرەبانیو بەخشندەیی خۆی لێیان دەکاتەوە, پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ڕێگایەکیتر بۆ لاوان دیاریدەکات کەببێتە فاکتەری پاراستنی داوێن پاکی, ئەویش ڕۆژووە: (فَعَلَيْهِ بِالصَّومِ, فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ), لەبەرئەوەی خۆگرتنەوە لەخواردنو خواردنەوە وزەو توانای مرۆڤ کەم دەکاتەوە, بەتایبەتی توانای سێکسی مرۆڤ, ئەگەر ئینسان بەڕۆژوو بوو زیاتر دڵی هۆشیارەو بۆ حەرام ناڕوانێو هەژموونە سێکسییەکەیشی بەهۆی نەخواردنو نەخواردنەوەی بەردەوامەوە بەرەو کپی چووە.

بەڵێ ڕۆژوو پەردەو دیوارێکی بەهێزە لەبەردەم ئارەزووە سێکسییەکانی مرۆڤداو دایاندەپۆشێو لاوازیان دەکاتو ئەمەش دەبێتە یارمەتیدەری لاوان بۆ زیاتر دوورکەوتنەوە لەشوێنکەوتنو تێرکردنی ئەو ئارەزوانە.

دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان, هەر لەخزمەت مەریەمەی داوێن پاکداین. کاتێ منداڵەکەیبوو دەستبەجێ ﴿ فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيّاً ﴾(مريم 24) منداڵەکە کەوتە قسەو پێی گوت ﴿ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً, فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْناً ﴾(مريم 25 ـ 26) دایە گیان دڵگران مەبە, خەفەت مەخۆ, چونکە پەروەردگارت لەژێر قاچتەوە ئاوو جۆگەی سازگارو بێگەردی بۆ فەراهەم هێناویت, پاشان لقی ئەو دارخورما وشکەش ڕاوەشێنە تاوەکو خورمای جوانو تازەت بۆ بکەوێتە خوارەوە, کەواتە ئەی دایکی بەڕێزم بخۆو بخۆرەوەو دڵخۆشبەو دڵگران مەبە! سُبْحانَ الله.

پاشان عیسا ئامۆژگاریی دایکی کرد کەئەگەر خەڵك لێیان پرسی ئەی مەریەم تۆ کەهێشتا شووت نەکردووە ئەم منداڵەت لەکوێبوو؟! ئەوا لەوڵامیاندا بڵێ: من بەڕۆژووم: ﴿ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَداً فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ

إِنْسِيًّا﴾(مريم26) واته: ئەی دایکی خۆشەویستم، ئەگەر هەرکەسێکت بینی، ئەوا پێی بڵێ کەوا من فەرزم کردووە لەسەر خۆم کەئەمڕۆ بەڕۆژوو بمو قسە لەگەڵ کەسدا نەکەم.

خۆشەویستان: ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین، دوو وشەو دوو زاراوە بەدیدەکەین ئەوانیش بریتین لەبەڕۆژووبوونو قسەنەکردن (الصَّوم، فَلَنْ أُكَلِّمَ)، جا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا قسەنەکردن پەیوەندیی بەڕۆژوو گرتنەوە هەیە؟! شێخی ئبن کەثیر لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: (والمُراد: أنَّهُم كانوا إذا صاموا في شَريعَتِهِمْ يُحرَّم عَلَيهِمُ الطَّعامَ والكَلامَ)، واتە: مەبەست لەم باسەدا ئەوەیە کە لەشەرعی ئەو کاتەدا، ئەگەر بەڕۆژوو بوونایە ئەوا خواردنو قسەکردنیان لێ قەدەغەو حەرام بوو، وەکو زانایانی پایەبەرز (ئبن عەباس وضحّاك) هەمان بیروڕایان هەیە واللهُ أعلَم.

کەواتە: یەکێك لەفەضلەکانی خوای گەورە لەگەڵ ئومەتی محەممەددا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەئاسانکردنی ڕۆژوودا ئەوەیە قسەکردنی بۆ حەڵاڵ کردوون.. الحَمدُ لله.

خۆشەویستان: ئێمە کەباسی داوێن پاکی دەکەین، خۆ داوێن پاکی هەر ئەوە نیە ئینسان زینا نەکا، خەڵکی وا دەزانێ داوێن پاکی هەر ئەوەیە ئینسان زینا نەکات، نەخێر، داوێن پاکی پێشەکیی زۆری هەیە، هەروەکو بەدڕەوشتیش پێشەکیو موقەدیماتی زۆری هەیە. یەکێ لەپێشەکییەکانی داوێن پاکی (شەرمو حەیاکردنە)، بوونی ئەدەبو ڕێزە بەرامبەر خواو عەبدەکانی خوا. با تەماشای شەرمو حەیای تاجی سەرو نووری چاومان محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بکەین. لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە کەئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: (كانَ النَبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم أشَدَّ حَياءً مِنَ الْعَذْراء في خِدْرِها).

دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: جارێکیان ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو پرسیاری لەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێ باسی پاکبوونەوەی دوای نەمانی خوێنی حەیزم بۆ بکەیت، ئایا چی بکەم؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی (خُذي فِرْصَةً مِنْ مِسْكٍ فَتَطَهَّري بِها)، فەرمووی: دوای پاکبوونەوەت لەخوێنی حەیز، جوان هەموو سەرو لاشەت بشۆ، پاشان گوڵە لۆکەیەکی میسکاوی یان گوڵە خورییەکی میسکاوی بێنە،

یان پەڕۆیەکی بۆنخۆش بێنەو خۆتی پێ پاك بکەوەو تارەتی پێ بگرە. ئافرەتەکە گوتی: (كَيْفَ أَتَطَهَّرُ؟) ئەی پێغەمبەری خوا باش تێنەگەیشتم, چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بکەمەوەو تارەتی پێ بگرم؟! پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (تَطَهَّري بِها), پێم گوتی خۆتی پێ پاك بکەوە. ئافرەتەکە دووبارە گوتی: ئاخر چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بکەمەوە! پێغەمبەری خوا فەرمووی: (سُبْحانَ الله تَطَهَّري), فەرمووی: سُبْحانَ الله, سەیرە بۆ تێناگەیت, خۆت بەو پارچە پەڕۆیە بۆنخۆشە پاك بکەوەو تاراتی پێ بگرەو تەواو! حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: (فَاجْتَذَبْتُها إِلَيَّ فَقُلْتُ: تَتَبَّعي بِها أَثَرَ الدَّمِ), دەفەرموێ: منیش ئافرەتەکەم ڕاکێشا بەلای خۆمەوەو پێم گوت: وەرە من تێت بگەیەنم, هەر کاتێ خوێنەکە تەواو بوو خۆت شت, ئەو پەڕۆ بۆنخۆشە بێنە بەشوێنی خوێنەکەداو لەناو شەرمتدا داینێ, تا ناو لەشت بۆن ساردی لێ نەیەتو بۆنی خۆش بێ بۆ مێردەکەت.. حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: کەئافرەتەکە سێیەم جار پرسیارەکەی دووبارەکردەوەو تێنەدەگەیشت, پێغەمبەری خوا شەرم گرتیو ڕوویکرد بەولاوە, ئەمجا من ژنەکەم هێنا بەملاوەو تێم گەیاند. (ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتیکردووە).

بەڵێ برای گەنج, ئەوە پێغەمبەرەکەتە, ئەوەندە بەحەیاو بەشەرمە, لەکاتی ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەکی شەرعیی تایبەت بەئافرەتانی ئومەتی" کەبۆ ئەوە خوای گەورە کردوویەتی بەپێغەمبەر تا ئەم مەسەلانە بەڕوونو ئاشکرایی بۆ ئافرەتانی ئومەتەکەی باس بکات, بەڵام ئەوەندە بەشەرمە, دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێو ڕوودەکات بەولاوەو عائیشە فریای دەکەوێتو لەجیاتی پێغەمبەری خوا ئافرەتەکە تێدەگەیەنێت. دەی تۆش شوێنی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە بکەوە.. وەکو ئەو بەشەرمو حەیابە, سەرەنجام داوێن پاك دەردەچی.

ئەی خوشکان: ئێوەش تەماشای دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە بکەن, عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم و باوکم کەئەبوبەکرە" وەفاتیان کردو لەژوورەکە مندا نێژران, کاتێ دەچوومە ژوورەوە جلوبەرگەکانو سەرپۆشەکەمم لادەبردو موشکیلە نەبوو, چونکە مێردەکەمو باوکم بوون, بەڵام کاتێك عومەری کوڕی خەطّاب شەهیدکراو لەژوورەکەمدا نێژرا (ما اسْتَطَعْتُ أَنْ أَدْخُلَ

بَيْتي إلاَّ وَقَدْ شَدَدْتُ مَلابِسي عَلى جَسَدي حَياءً مِنْ عُمَر, وَإنَّهُ لَمَدْفُونٌ تَحْتَ التُّراب)!
دەفەرموێ: بەڵام لەو کاتەی کەئیمامی عومەر لەژوورەکەمدا نێژرا, وەڵڵاهی نەچوومە ژوورەکەمەوە هەتا جوان خۆم نەپێچابێتەوەو خۆم دانەپۆشیبێ لەبەر حەیاو شەرم لەعومەر, لەکاتێکدا لەژێر گڵی ناو گۆڕەکەیشیدا بوو!

اللهُ أكبَر.. شەرم لەحەزرەتی عومەر دەکات لەکاتێکدا لەژێر گڵدایە. جا ئەی خوشکی موسڵمان, تۆ دەبێ چاو لەخاتوو عائیشە بکەیت, وەکو ئەو بەشەرم بی, بۆ ئەوەی وەکو ئەو داوێن پاك بیت.

هەزار جار بەداخەوە! ئافرەتانی گەنجی ئەمڕۆ, زۆربەیان نەشارەزان بەمێژووی عائیشەو ئەمثالی ئەو شێرەژنە ئەخلاق بەرزانە, بەڵام ناوو ژیاننامەی دەیان بەرەڵڵاو بێڕەوشتی ناو موسەلسەلە دەیان ئەڵقەیەکانیان لەبەرە, کەهەموو ئەو زنجیرانە کەدەردەکرێن‌و لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە نیشانی جەماوەر دەدرێن, تەنهاو تەنها مەبەستیان بەدڕەوشت کردنی کچ‌و ژنی خەڵکە, ئەویش بەوەی کە لەیەکەم جارەوە شەرمی لا نەهێڵن. ئایا بەچاوی خۆتان چەندان فلیمتان نەبینیوە کەپیاو ڕووی لێ لادەدا چونکە شەرم دەکات سەیری بکات. بەڵام ئەگەر دەیان شەوو چەند مانگ لێدرایەوە, ئەوا کچی گەنج کە لەفەترەی موراهیقیدایە بەتایبەت ئەگەر پەروەردەی ئیسلامی وەرنەگرتبێ لاسایی دەکاتەوەو شەرمی لا نامێنێ‌و حیساب بۆ باوك‌و براو کەس ناکات!!

لاوانی ئازیز: سەیری داوێن پاکیی یەکێکی وەکو عوبەیدوڵڵای کوڕی عامیر" ئیمامی حەڕەمەینی مەککە بکە, یەکێك بوو لەتابیعین. لەو سەردەمەدا لەشاری مەککەدا ئافرەتێکی زۆر جوان دەبێ, زۆر بەجوانی‌و شۆخ‌وشەنگیی خۆیەوە دەنازێ, ڕۆژێکیان لەبەردەم ئاوێنەکەیدا دائەنیشێ‌و سەیری خۆی دەکات, ڕوو لەمێردەکەی دەکات‌و دەڵێ: (أتَظُنُّ أنَّ هُناكَ رَجُلاً يَمْتَنِعُ مِنْ جَمالِي هذا؟!), ئایا ئەم جوانییەی من نیشانی هەرپیاوێك بدری ڕەتی دەکاتەوە؟! ئایا هیچ کەس هەیە من خۆمی بۆ دەربخەم‌و بتوانێ خۆی بگرێ؟ مێردەکەی گوتی: نەخێر هیچ پیاوێك نییە ئەو هەموو جوانییەی تۆ ببینێ‌و خۆی بۆ بگیرێ, تەنها یەك پیاو دەناسم کەدەیانی وەکو تۆ خۆی نیشان بدات کاری تێناکات. ژنەکە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئەو پیاوە کێیە؟! پیاوەکە گوتی: ئەو پیاوە

عوبەیدوڵلای کوڕی عامیرە! ئافرەکەتە گوتی: ئیزنم دەدەی بیسەلمێنم کەئەویش لەبەرامبەر جوانیی مندا خۆی بۆ ناگیرێ؟! مێردەکەی گوتی: بەڵێ ئیزن بە بڕۆ خۆت تاقیبکەوە بزانە قسەی کاممانە! (بێگومان ئەم پیاوە مەرد نەبووەو شەهامەتو پیاوەتی زۆر کز بووە!).

بەڵێ, ئافرەتەکە هەتا توانی خۆی جوانتر کردو جوانترین جلوبەرگی لەبەر کردو لەسەرەوە عەبایەکی بەخۆی داداو بەرەو شوێنی عوبەیدوڵلای کوڕی عامیر بەڕێکەوت. لەدەرگای داو گوتی: ئافرەتێکمو هاتوومە خزمەتت تاوەکو وەڵامی پرسیارە شەرعییەکانم دەربارەی ئافرەتان بدەیتەوە! ئەویش فەرمووی: وەرە ژوورەوە. چونکە ڕۆژانە دەیان کەس لەژنو پیاوو پیرو گەنج دەچونە لای بۆ حەلکردنی گیروگرفتەکانیانو وەڵامی پرسیارەکانیان. بەڵێ ئافرەتەکە چوە ژوورەوەو سەیری کرد ئەم مامۆستایە, هەتا بڵێی جوانو ڕێکوپێکەو تازە پێدەگات. ریشێکی ڕەشی جوانی هەیە, چۆن ئەم لەناو ئافرەتاندا تاکە لەجوانیدا ئەم پیاوەش لەناو پیاواندا تاکە لەگەنجیو جوانیدا. عەبدوڵلای مامۆستا فەرمووی: خوشکەکەم پرسیارەکەت چیە؟! ئافرەتەکە عەباکەی لەسەر خۆی لابردو هەموو جوانیی خۆی بۆ ئەم لاوە گەنجە دەرخستو زۆر بەنازەوە گوتی: من دەمەوێ لەیەکتر نزیك بینەوە, هەردووکمان لەجوانیدا هاوتاین, حەیف نیە لەیەکتر دوور بین, تکایە دڵم مەشکێنەو ئەوەی دەمەوێ بێدڵیم مەکە! پەنا بەخوا شەیطانیش وا لەنێواندا دێو دەچێو زۆر بەپەلەیە تووشی غەزەبی خوایان بکات. بەڵام دەزانن ئەم لاوە عالمە خواناسە چ ئیستیقامەو خۆڕاگرییەکی هەبوو؟! فەرمووی: بەڵام تۆش گوێ لەداواکاریی من بگرە, من چەند پرسیارێکت لێدەکەم, بەڕاستیو بەقەناعەتی دڵ وەڵامم بدەرەوە, منیش ئەوەی تۆ بتەوێ بۆتی دەکەم! ژنەکە گوتی: فەرموو پرسیارەکانت بکە. عەبدوڵلا فەرمووی: پرسیاری یەکەمم: باشە ئەوەی تۆ داوای دەکەی من ڕازیبووم پێیو لەو کاتەدا کەبەیەکەوەین, فریشتەی گیان کێشان هاتو تەمەنمان کۆتایی پێهاتبوو, ڕۆحی کێشاین, ئێمە لەو کاتەدا خەریکی زینا بووین, لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: ( مَنْ زَنى أوْ شَرِبَ الْخَمْرَ, نَزَعَ اللهُ مِنْهُ الإيمانَ كَما يَخْلَعُ الإنْسانُ الْقَميص مِنْ رَأْسِهِ), واتە: هەرکەسێ زینا بکات, یان عەرەق بخواتەوە, ئەوا

ئیمان لەلاشەی دادەکەنرێ هەروەکو چۆن ئینسان کراس لەسەریەوە دادەکەنێ. جا ئایا حەزدەکەی بەبێ‌ئیمانی ڕۆحمان بکێشرێ؟! ژنەکە گوتی: نەخێر قەت حەزناکەم لەو حاڵەتەدا کتوپڕ بمرم. عەبدوڵڵا فەرمووی: ڕاست دەکەی.

پاشان فەرمووی: گوێ بۆ پرسیاری دووەمم بگرە کەئەمەیە: ئایا ئەگەر لەڕۆژی قیامەتدا, لەو کاتەدا کە لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستێنرێین, خوای گەورە لەمنیش‌و لەتۆش تووڕە ببێ‌و بفەرموێ: ئەی فریشتەکانم ئەو ژن‌و پیاوە بگرن‌و بەرەو جەهەننەم بیانبەن, چونکە ئەوانە داوێن پیس بوون, ئایا حەزدەکەی ئێستا شتی وا بکەین کەتۆ داوای لەمن دەکەی, بەڵام لەقیامەتدا لەحزووری خوای گەورەدا ئاوا شەرمەزار بین؟! ئافرەتەکە گوتی: نەخێر, هەرگیز حەزناکەم خەجاڵەتی بەردەمی مەحکەمەی خوا بم. عەبدوڵڵا فەرمووی: راست دەکەی. پرسیاری سێیەم: فەرمووی: ئایا ئەگەر بەم تاوانەوە بڕۆین بۆ دۆزەخ‌و ئەوەندە تێیدا سووتاین تا گۆشت‌و ئێسقانمان لەیەکتر جیابوونەوە, ئایا حەزدەکەی ئەوەی کەلێم داوادەکەی ئەنجامی بدەین‌و سەرەنجامی تاوانەکەمان ئەو جەهەننەمە بلێسەدارە بێ؟! ئافرەتەکە گوتی: نەخێر, نەخێر, من خۆم بۆ ئاگری دونیا ناگرم چ جای ئاگری دۆزەخ! فەرمووی: ڕاست دەکەی.

ئەمجا ئافرەتەکە خۆی داپۆشییەوەو گوتی: ئێستا هیچم لێت ناوێ, شایەتیی دەدەم لای خوا کەتۆ بەڕاستی داوێن پاکیت, پاکیی داوێن‌و ئەخلاقی تۆ زۆر جوانترە لەجوانیی ڕوخساری من, بەڵێن بێ منیش تۆبە بکەم‌و جوانییەکەم نەکەمە مایەی فیتنە بۆ لاوان!

ئیمانداران: لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئەوەی کەگەورەمان یووسف ئەنجامی‌داو ئەوەی زاناو خواناسی ئومەتی محەمەد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم" عوبەیدوڵڵای کوڕی عامر ئەنجامیدا, لەداوێن پاکی‌و خۆڕاگری بەرامبەر ئافرەت‌و ئارەزوی گەنجیەتی ئەوە ڕووداوی هەزار ساڵ زیاتر لەمەوبەرە, بەڵام کوا ئێستا لەم جەوی فەسادو تێکەڵاویی ژن‌و پیاوو ئەو هەموو وەسائیلی ڕاگەیاندنە کەهەمووی هانی ئینسان دەدا کەبەرەو داوێن پیسی ببەن, کوا ئێستا ئینسانی وا دروست دەبێتەوە؟! لەوولامدا دەڵێین: ئەوەی کەیووسف‌و کەعوبەیدوڵڵای پاراست لەداوێن پیسی‌و ئاوڕدانەوە بەلای ئافرەتی نامەحرەمدا, تەنها بریتی بوو لەترس لەخوای پەروەردگار, ترسان لەشەرمەزاریی مەحکەمەی خوا,

لەدەستچوونی حۆریو خۆشییەکانی بەهەشت, چونە ناو ئاگری دۆزەخ. جا ئەم بیروباوەڕو عەقیدەیە لەهەر دڵێکدا جێگیربوو, با لەهەر سەردەمو بارودۆخو جلوبەرگو پیشەیەکدا بێ, ئەوا هەر بەشێوەی حەزرەتی یووسفو عوبەیدوڵڵای تابیعی داوێن پاکیی خۆی دەپارێزێو نمونەی واقیعیشمان لەم سەردەمەدا زۆرە, یەکێ لەوانە: مامۆستای بانگخوازو بەناوبانگ (عەمرو خالید) لەیەکێ لەکتێبەکانیدا ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ خۆم لەنزیکەوە ئاگام لێیبووەو گەنجەکە دەناسم. دەفەرموێ:

کوڕێکی گەنجی زۆر جوانو ڕێکوپێك کەهێشتا ژنی نەهێناوە, ئیشوکاری دارتاشی (نەجاڕی) دەکات, لەبەر ئەوەی ئیشەکەی جوانەو ئینسانێکی ئەمینو دەست پاكو چاوپاکە, خەڵکی حەزدەکەن بیبەن لەماڵەوە ئیشی تایبەتی پێداویستییەکانی ناو ماڵ, کە لەتەختەو دار دروست دەکرێن پێی دروست بکەن. کابرایەکی دەوڵەمەند, کەکوڕێکی گەنجەو تازە ژنی هێناوە ئەم دارتاشە گەنجە بانگ دەکاتو دەیباتە ماڵەوەو شوێنی ئیش کردنی نیشان دەداتو دەڵێ: من خۆم دوکانم هەیە, تۆ بۆ خۆت لەماڵەو ئیشی خۆت بکەو ئەگەر پێویستییەکت بوو ئەوە خێزانەکەم بۆت دابین دەکات. بەڵێ پاش چەند ڕۆژێك کەئەم کوڕە گەنجە لەم ماڵەدا خەریکی ئیشوکاری خۆیەتی, کەسی تریش لەماڵەوە نىيە ژنی کابرا نەبێ کەژنێکی زۆر شۆخوشەنگو جوان دەبێ, بەردەوام کەئەم کوڕە گەنجە خەریکی ئیشوکاری خۆیەتیو بەدەم ئیشەکەوە قورئان دەخوێنێو یادی خوای گەورە دەکات, بەڵام ئەم ژنە کە بەهیچ ئیشوکارێکەوە خەریك نیە بەردەوام سەرنجی کوڕەکە دەداو زۆر بەقۆزو گەنجێکی زۆر جوانتر لەمێردەکەی دێتە بەرچاوی, شەیطانیش هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕو ئەوەندەی تر ئەم کوڕە دارتاشەی لەبەرچاو شیرین دەکاتو بەتەواوەتی مێردەکەی خۆی لەبەرچاو دەکەوێ, ڕۆژانە بەناوی ئاوو چا بردنەوە زەردەخەنەو تێڕوانینی ئەوینیانە ئاڕاستەی کوڕەکە دەکات. بەڵام ئەو کوڕە گەنجە هیچ ڕووی تێناکاتو هەر بیریشی لێناکاتەوە. بەڵام پاش هەفتەیەك ژنەکە پەتی سەبر دەپچڕێنێو ڕاستەوخۆو بەئاشکرا داوا لەکوڕەکە دەکات کەدەستی ناپاکیی لەگەڵدا تێکەڵاو بکات. گەنجەکەش کەئەمە دەبیستێ دەشڵەژێو دەڵێ: سوێند بەخوای گەورە من هەرگیز خراپەم نەکردووەو إنشاءَ الله هەرگیز نامووسی کەسیش پیس ناکەم, من

ئەمینداری ئەم ماڵەم, مێردەکەت سیقەی بەمن هەبوو بۆیە منی هێنایە ئەم ماڵەوەو بەتەنها بەجێی هێشتم, ئەی بۆ نەچوو بەدوای وەستایەکی تردا لەم شارە گەورەدا؟! لەبەر ئەوە قەت چاوەڕێی ئەوە مەکە کەمن ئەو ئیشە بکەم! ژنەکە هیچ ناڵێ هەر خێرا ڕادەکات دەمانچەی مێردەکەی دێنێو فیشەکی دەباتەبەرو دەڵێ: من خۆم بۆ ناگیرێ, هەر ئێستا چیم دەوێ ئەنجامی نەدەی بەیەك گوللە دەتکوژم!

بەڵام ئایا گەنجی خواناسی کاسب, گەنجی دەست پاکو ئەمین ئەمجارەیان کەژیانی لەمەترسیدایە دەبێ هەڵوێستی چی بێ؟ لەجێگای خۆی دەوەستێو بەدەنگی بەرز دەفەرموێ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ الله وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله, پێشوازیی مەرگ دەکەم, بەڵام ئامادە نیم زینا بکەم. فەرموو دەستی لێ بکێشەو بمکوژە!! ژنەی کلۆڵو بەدبەخت دوور لەدینو خواناسی, مەست بەژیانی ماددیی دونیا, هەرگیز ئەمەی نەهاتووە بەخەیاڵدا گەنجی ئاوا هەبێ ڕۆحی خۆی بەلاوە گرنگ نەبێ بۆ پاراستنی داوێن پاکییەکەی, بۆیە دەرگاکە بەردەداو دەڵی هەر ئێستا ئەم ماڵە بەجێبێڵەو لاچۆ لەبەر چاوم! کوڕە گەنجەکەش ڕادەکاتە دەرەوەو لەخۆشییان دەگریاو دەڵێ: خوایە هەزاران سوپاس بۆ تۆ کە بەفەزڵو کەرەمی تۆ" من لەو ئافرەتە بێڕەوشتە ڕزگارم بوو, خوایە شوکورو سوپاس بۆ تۆ کەیارمەتیت دام ئیقتیدا بەحـــەزرەتی یووسف بکەمو ڕووداوەکـەی ئەوم لێ دووبارە بێتەوە!

خۆشەویستان: باسی داوێن پاکی هەڵدەگرین بۆ وتارەکانی داهاتوو, داوا دەکەم لەخوایگەورە, هەموو لایەکمان بەتایبەت گەنجو لاوانمان وەکو ئەم گەنجو لاوانە داوێن پاکو ڕەوشت بەرزکا, وڵاتو میللەتمان لەبێڕەوشتیو زیناو خراپەکاری بپارێ..

اللَّهُمَّ آمين

# ووتاری ژماره بیست

# داوێن پاکی

### بەشی سێیەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً , يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً , إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً ﴾

(الفرقان 68 ـ 70)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( يا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ, واللهِ ما مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ أَنْ يَزْنِي عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ. يا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ, واللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ ما أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَليلاً ولَبَكَيْتُمْ كَثيراً )

(رواهُ البُخاري)

**الحمدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِهِ أجمعينَ إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلامو ڕەحمەتی خوا لەهەمووماں بێت.. لەدوو ووتاری ڕابردوودا لەخزمەت دە وەصیەتو ڕاسپاردەکەی خوای گەورەدا بووین سُبْحانَهُ وتَعالى, گەیشتینە وەصیەتی چوارەم کەخوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحش مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾, لەدوو ووتاری ڕابردوودا باسی داوێن پاکیمان کرد ئەمڕۆش بەپشتیوانیی خوای گەورە, بەچەند ووشەو دێڕێکی پاك ئەو باسە پاکە تەواودەکەمودەڵێم:

خۆشەویستان: خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمویَ: ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّه إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْس الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً﴾(الفرقان68), ئایا مانای ئەمە چیە؟! ئایا تاوانی زینا پەیوەندیی بەهاوبەش بۆ خوا دانانو بەکوشتنەوە چیە؟ بۆچی خوای گەورە ئەم سێ تاوانە گەورەی لەپاڵ یەکتردا داناون؟ پێش وولامی پرسیارەکە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویست باس دەکەین کەدەفەرمویَ لەوولامی پرسیارێکی صەحابیی خۆشەویستو بەڕێز" عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) کەعەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, ئایا چ گوناهێ لای خوا زۆر گەورەیە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ), گەورەترین تاوان لای خوای گەورە ئەوەیە کەهاوەڵ بۆ خوا پەیدابکەیت لەکاتێکدا ئەو خوایە تۆی لەنەبوون دروست کردووە, ئایەتەکەیشی فەرموو: ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً ﴾.

پاشان ئبن مەسعوود فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا, پاشان چ گوناهێکیتر زۆر گورەیە لای خوا؟ فەرمووی: (وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ), فەرمووی: منداڵەکەت لەترسی برسیەتی بکوژیت, لەوە بترسیت گەورە ببێتو نانت لەگەڵدا بخوات! خوای گەورەش لەئایەتەکەدا کەباسی گوناهی دووەمی کرد" باسی تاوانی کوشتنی کردو فەرمووی: ﴿ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾, فەرمووی: ئەی خۆشەویستی

خوا, پاشان چ گوناهێك زۆر گەورەیە لای خوا؟ فەرمووی: (أَنْ تُزانِي حَلِيلَةَ جارِكَ), ئەوەیە زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەتدا بکەیت. خوای پەروەردگاریش لەئایەتەکەدا سێیەم گوناهی بەزینا باسکرد: ﴿ وَلا يَزْنُونَ ﴾. کەواتە ئایەتە قورئانییەکەو فەرمودەکەی رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, سێ تاوانیان لەپاڵ یەکتردا باس کرد, ئەوانیش: شەریك بۆ خوا قەراردان, کوشتنی نەفسێك بەناحەق, زیناکردن.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ, ئەویش ئەوەیە: ئایا بۆچی خوای گەورە هەرسێك گوناهەکەی بەیەکەوە باس کردن؟ ئایا پەیوەندیی نێوان شەریك بۆ خوا دانان‌و زیناکردن بەیەکەوە چیە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: مرۆڤی زیناکەر کە لەسەر زیناکردن ڕاهات ئەوا سام‌و هەیبەتی خوای گەورەی بەتەواوی لەدڵدا هەڵدەکەندرێت. زیناکەر بۆیە زینا دەکات چونکە ئافرەتەکەی بەلاوە لەئەمرو نەهی خوا گەورەترە. ئافرەتی زیناکەریش پیاوی بەلاوە لەفەرمان‌و قەدەغەکراوی خوای گەورە گەورەترەو هەیبەتی خوای گەورەی لەدڵدا نامێنێت. یان زۆر جار زیناکەر, زیناکە لەبەرچاوی خەڵکدا ناکات, چونکە شەرم لەخەڵك دەکات, یان لەخەڵك دەترسێت, بەڵام شەرم لەخوا ناکات‌و ترسی خوای لەدڵدا نیە. ئەمەش گەورەترین هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوای گەورە. کەواتە: زیناو شەریك بۆ خوا بڕیاردان پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بەیەکترەوە هەیە, ئەی باشە پەیوەندیی نێوان قەتڵ‌و زینا بەیەکەوە چیە؟

بەڕێزان: لەڕاستیدا زۆربەی تاوانەکانی کوشتن هۆکارەکەی زینایە, چەند جار بیستوومانە کچێك دەکوژرێت, چونکە کەسوکارەکەی گومانی ئەوەی لێدەکەن کەدەستی لەگەڵ کوڕێکدا تێکەڵاو کردبێت. یان کوڕێك دەکوژرێت لەبەر ئەوەی بەدڕەوشتیی کردووە. هەروەها لەدەیان وڵاتی دونیادا, ڕۆژانە بەسەدان منداڵ لەبار دەبرێن یان لەدوای لەدایك بوونیانەوە دەکوژرێن‌و لەناو دەبرێن چونکە بەزۆڵیی لەدایکبوون! کەواتە فیعلەن زیناو کوشتنیش پەیوەندییان بەتوندی بەیەکەوە هەیە.

ئیمانداران: یەکێك لەصیفەتەکانی خوای پەروەردگار سُبْحانَهُ وَتَعالى (السَتَّار )ە, واتە گوناهی بەندەکانی دادەپۆشێ. بەڵام کاتێك نێرو مێیەکی باڵغ‌و عاقڵ زینایان کرد, ئەگەر کوڕو کچ بن دەبێ سەد داری حەدیان لێ بدرێ ئەمجا لە تاوانە پاك دەبنەوە. بەڵام ئەگەر

ژن‌و پیاو بوون دەبێ ڕەجم بکرێن. واتە بەردباران بکرێن هەتا دەمرن. بەڵام ئەم سزایە دەبێ لەبەرچاوی خەڵکدا بێ نەك بەنهێنی ئەنجام بدرێ, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(النور 2).

بەڕێزان: زینا مایەی تووڕەبوونی خوایە. جارێکیان لەسەردەمی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم ڕۆژ گیرا. ڕۆژگیران دیاردەیەکی ترسناکە, سزای خوات بیر دەخاتەوە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم هاتە دەرەوەو نوێژی ڕۆژگیرانی بۆ خەڵکەکە کرد, پاشان ووتارێکی گرنگی خوێندەوە. دەبێ لەوتاری ڕۆژگیراندا چی فەرمووبێت؟ فەرمووی: (يا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ واللهِ ما مِنْ أحَدٍ أغْيَرُ مِنَ اللهِ أنْ يَزْنِي عَبْدُهُ أوْ تَزْنِيَ أمَتُهُ, يا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ واللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ ما أعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً)(رَواهُ البُخاري), فەرمووی: ئەی ئومەتی محمد, سوێند بەخوا , هیچ کەس بەغیرەتتر نیە لەخوا, بەڕاستی خوای پەروەردگار غیرەت دەیگرێ ئەگەر عەبدەکانی زینا بکەن, فەرمووی: ئەی ئومەتی محمد, سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە ئەوا کەم پێدەکەنین‌و زۆر دەگریان.

موسڵمانان: ئایا چی وای لەپێغەمبەری خوا کرد کە لەووتاری ڕۆژگیراندا شتی وا بڵێ؟! ڕۆژگیران چ پەیوەندییەکی بەم باسەوە هەیە؟ پێغەمبەری خوا ئینذارمان دەکاو ئاگادارمان دەکاتەوە کەلەنیشانەکانی تێکچوونی زەوی‌و بوومەلەرزەو بورکان‌و گۆڕانی حاڵەتی زەوی" دەرکەوتن‌و بڵاوبوونەوەی زینایە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێت: (إذا ظَهَرَ الزِّنا والرِّبا في قَرْيَةٍ فَقَدْ أحَلُّوا بِأنْفُسِهِمْ عَذابَ اللهِ)(رَواهُ الطَبَراني والحَاكِم), واتە: هەرکاتێ زیناو ڕیبا بەئاشکرا لەناو گوندێك ـ یان شارو وولاتێکدا ئەنجامدراو, کەس دەستی تاوانبارانی نەگرت" ئەوە بەدەستی خۆیان عەزابی خوایان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردووە.

بەڵێ, بڵاوبوونەوەی زیناو بەدڕەوشتی یەکێکە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەت, وەزینا هۆیەکە بۆ ئەوەی غەزەبی خوا لەسەر ئەهلی ئەو شوێنە, یان ئەو کەسە زیناکەرە دەربکەوێ. جا ئاگاداربە موسڵمانی بەڕێز, هەرکاتێ پێشەکی‌و موقەدیماتی زینا لەژیانتدا دەرکەوتن, ئەوە بزانە موصیبەتێکی گەورە چاوەڕێت دەکات. واتە: ئەگەر چاوت لەنەزەرو تەماشاکردنی ئافرەت نەپاراست, دەستت لەتەوقەی حەرام نەگێڕایەوە, بیرت

لەزینا کردەوە، ئەوە بەقەدەر زۆری ئەو پیشەکییانەی زینایەت تووشی موصیبەتو ناڕەحەتی دەبیت، هەندێك جاریش مەرج نیە موصیبەتەکە هەر ڕوو لەنەفسی خۆت بکات، بەڵکو لەوانەیە لەئەولادێکت بدات، بەوەی تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن ببێت، یان خێزانەکەت تووشی نەخۆشیی دەروونیی ببێتو هەموو ژیانت لێ تاڵ ببێت. جا لەبەر ئەوە، ئەو بەڕێزانەی کەلەو شوێنانە کاردەکەن کەتێکەڵاویی ژنو پیاو تێیدا زۆرە، دەبێ زۆر ئاگایان لەخۆیان بێ، زۆر خۆیان بپارێزن لەپێشەکییەکانی زیناو تەماشاکردنو تەوقەکردنو دانیشتنی دوو بەدوو بەبێ کەسی سێیەم کە لەشەرعدا پێی دەگوترێ (الخَلْوَة). لەئەثەرێکدا هاتووە کەخۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: خۆتان لەزینا بپارێزن چونکە شەش بەڵای پێوەیە، سیانیان لەدونیادا تووشی ئینسانی داوێن پیس دەبێ:

1 ـ نەمانی هەیبەتی دەموچاو، وای لێدێ کەدەیبینی دەڵێی دەموچاوی ڕەش بووە.

2 ـ کەئابەی زینای بەسەرەوەیەو لەهەموو خێرێك بێبەش دەبێ.

3 ـ ئینسانی داوێن پیس هەمیشە هەژارەو دەست کورتە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: (الزِّنا يُورِثُ الْفَقْرَ) (رَوَاهُ البَيْهَقِي)، واتە: زیناکردن هەژاری بەشوێن خۆیدا دێنێ لەقیامەتیشدا زیناکار تووشی سێ بەڵادەبێ، یەکەم: تووڕەبوونی خوای پەروەردگار، دووەم: سزای ئاگری دۆزەخ، سێیەم: زۆر بەتوندی موحاسەبە دەکرێ.

خۆشەویستان: با بزانین لەڕۆژی قیامەتدا سەرەنجامی ئەو کەسانەی لەڕەوشتی بەرزی داوێن پاکی لایانداوەو کەوتوونەتە گۆماوی بەدڕەوشتییەوە چیە؟

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دوای نوێژکردنی بەیانی" ڕووی لەصەحابەکان کردو فەرمووی: ئایا کەستان ئەمشەو خەونێکتان بینیوە، تا ماناکەیتان بۆ لێك بدەمەوە؟ گوتیان: نەخێر. فەرموی: بەڵام من ئەمشەو لەخەونمدا دوو پیاو هاتن بۆ لامو پێیان گوتم: هەستە وەرە لەگەڵماندا با بڕۆین. منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، تا ئەوەبوو گەیشتینە لای شتێك وەکو تەنوور وابوو، لەسەرەوە تەسكو لەبنەوە پانو دەڵب بوو. تەماشام کرد پیاوو ژنی ڕووتی زۆری تێدابوو، ئاگر لەژێریدا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەکە

نێلەنێلی دەهات. جا کەتاوی دەسەند ئاوەکە دەکوڵاو قوڵپەی دەکردو زەلامەکانی ناوی وەك دەنكی دانوولەی سەر ئاگر لەکاتی قوڵتەقوڵتەکەدا ئاوا بەرز دەبوونەوەو خەریك بون هەڵبچن, بەڵام کڵپەی ئاگرەکە گورج کپ دەبوو, ئیتر ئەوانیش دەکەوتنەوە بنکەکەی, ئیتر بەردەوام ئەمە حاڵیان بوو. پرسیم ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوانە ژنانو پیاوانی داوێن پیس بوون. (بوخاری گێراویەتیەوە)

خۆشەویستان: ئەمە سەرەنجامی داوێن پیسانە لەقیامەتدا, ئەی لەدونیادا؟! ئایا ئەوانەی داوێن پاك نین, ئایا ئەوانەی حەزیان لەبەدڕەوشتییە هەروا بەئاسانی بۆی دەردەچن؟! ئایا سەرەنجامی ئەو کەسانەی خیانەت بەناموسی موسڵمانان دەکەن چیە؟! پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرموێ: ئێوە داوێن پاك بن, بەچاوی خیانەت تەماشای ناموسی خەڵکی مەکەن, خوای گەورەش شەرەفو ناموستان دەپارێزێو کەس ناتوانێ بەچاوی خیانەت تەماشای عائیلەو خێزانتان بکات.

بەڵام هەرکەسێك خیانەت بەناموسی خەڵکی بکات, سەرەنجام ڕۆژێك دێت کەسانێکیش دەستدرێژی بکەنە سەر شەرەفو ناموسی ئەو. هەزار ڕەحمەت لەئیمامی شافیعی بێ کەفەرموویەتی:

عِـفُّـوا تَـعِـفُّ نِسـاؤُكُمْ   وَتَـجَـنَّبُـوا مـا لا يَلِيقُ بِمُسْـلِـمِ
إِنَّ الزِّنا دَيْنٌ فَإِنْ أَقْـرَضْتَهُ   كانَ الْوَفاءُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِكَ فَاعْلَمُ
مَنْ يَزْنِ يُزْنَ بِهِ وَلَوْ بِجِدارِهِ   إِنْ كُنْـتَ يـا هـذا لَبِيبـاً فـافْهَمِ

دەفەرموێ: ئێوە داوێن پاك بن, سەرەنجام خێزانەکانیشتان داوێن پاك دەبنو کەس بەچاوی خیانەت تەماشایان ناکات, وەتۆی موسڵمان خۆت بپارێزە لەهەر هەنگاوو هەڵوێستێك کەشایەنی ئینسانی موسڵمان نیە, بەڕاستی زیناکردن قەرزەو ئەگەر وەرتگرت, ئەوا دەبێ ڕۆژێك ئەو قەرزە بەماڵو خێزانەکەی خۆت بدەیتەوە, هەرکەسێك زینا لەگەل ئافرەتی خەڵکی بکات, خەڵکیش ڕۆژێك زینای لەگەڵدا دەکەنەوە, ئەگەر بەدیواری ماڵەکەیشی بووبێ.

بەڕێزان: بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست, سەرنجتان بۆ ئەم ڕووداوە واقعیە ڕادەکێشم کەمامۆستا حەبیب محەمەد سەعید لەکتێبی (دەستی پەروەردگار, ل 7)دا

بۆمان دەگێڕێتەوە کەبەڕێزیشیان لەکتێبی (عَدالَةُ السَّماء)ی لیوا ڕوکن محمود شیت ئەلخەطّاب وەریگرتووەو دەفەرموێ:

پێش جەنگی یەکەمی جیهانی" کەهێشتا شەمەندەفەرو ئوتومبێل لەووڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا نەکەوتبوونەکار, پیاوێکی گەورەبازرگان لەنێوان عێراقو سووریەدا بازرگانیی دەکرد, لەعێراقەوە دانەوێڵەی بۆ سووریا دەبردو دەیفرۆشت, لەوێشەوە صابوونو قوماشی بۆ عێراق دەهێنا. ئەم دەوڵەمەندە پیاوێکی ڕەوشت بەرزی موسڵمانی خواناس بوو, سامانی ئەم جیهانەی کردبووە پرد بۆ ڕۆژی قیامەتو بەهۆی ڕەفتاری موسڵمانانەیەوە ببووە خۆشەویستی خەڵکی گەڕەكو شارەکەی. ئەم پیاوە بازرگانە کوڕو کچێکی هەبوو کەهەردووکیان گەیشتبوونە تەمەنی لاوی, ڕۆژێکیان باوکەکە بانگی کوڕە تاقانەکەی کردو گوتی: ڕۆڵە گیان من بەساڵدا چووم‌و توانای سەفەرکردنم نەماوە, سوپاس بۆ خوا تۆش پیاوێکیت, ئەمجارە تۆ لەگەڵ کاروانە بازرگانییەکەدا بڕۆ بۆ حەلەبو هەرچی دەبەیت لەوێ بیفرۆشەو بەنرخەکەی" صابوونو قوماش بکڕەو بگەڕێوە. بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم: ترسی خوای گەورەت لەدڵدا بێتو داواشت لێدەکەم شەرەفو ئابڕووی خوشکەکەت بپارێزیت.

بەڵێ کوڕە بازرگانییەکەی گەیاندە شاری حەڵەب لەسووریاو شتومەکی خۆی فرۆشتو صابوونو قوماشی حەڵەبی کڕیو خۆی ئامادەکرد لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەرەو مووصڵ بگەڕێتەوە. ڕۆژێکیان هێشتا حەڵەبی بەجێنەهێشتبوو, لەڕێگایەکی چۆڵدا دوای خۆرئاوابوون, چاوی کەوت بەکچێکی گەنجی جوان. لەبەر چاویدا زۆر شۆخ‌وشەنگ بوو, شەیطان دڵی بەرەو لای کچەکە ڕاکێشاو دەروونی بەدخوازیش مێشكو ژیریی لەخشتەبردو هاتە سەر ئەو ڕایەی لەم چۆڵیو نادیارییەدا کچەکە ماچ بکات. چاودێریی خوای گەورەی لەبیر چۆوەو ئامۆژگارییەکەی باوکی پشت گوێ خست, هەوای گەنجیەتی کەوتە کەللەیو بەبێ ورتەو پرس‌وڕا هەڵمەتی دایە کچەکەو ماچیکرد, هەرئەوەندە.. کوڕەکە لەگەڵ ئەمجۆرە ڕەفتارانەدا ڕانەهاتبوو, بۆیە خێرا شەرم گرتیو ڕایکردو کچەش کە بەتەمای ئەم دەستدرێژییە نەبوو" ئەویش ڕایکرد. کوڕە پەشیمان بۆوەو لەدڵی خۆیدا گوتی: ئۆخەی کەس چاوی لێم نەبوو, خۆ ئابڕووم دەچوو. ئینجا گەڕایەوە شوێنی مانەوەو حەسانەوەی

لەحەڵەب، کەوتە لۆمەی دەروونی لارو ویّر. بەڵام لۆمەو پەشیمانیی چ دادێك دەدەن؟ تازە لەدەستی دەرچوو.

هاوەڵانی سەفەری بەم ڕازونیازەیان نەزانی، خۆیشی لای کەس نەیدرکاند، ئیتر ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێك بەرەو شارەکەی خۆیان گەڕایەوە. لەکاتێکدا کوڕە لەگەشتی بازرگانیدا بوو ئەو پەندەی بەسەردا هات، باوکی لەماڵەوەبوو، ڕۆژێکیان باوکەکە لەژوورەکەی خۆیدا دانیشتبوو، پەنجەرەی ژوورەکەیشی دەینواڕییە حەوشەی ماڵەکەیان، ئاوکێشەکەیان هاتە ژوورەوەو کچەکەش دەرگای گرت تاوەکو ئاوەکەی خاڵی کرد وەکو ڕۆژانی تر دەرگاکە دابخاتەوە، ئاوکێش کوندە خاڵییەکەی دا بەشانیداو کاتێك گەیشتە لای کچەکە هەڵمەتی داو ماچێکی کردو خێرا بەپەلە سەری خۆی هەڵگرت‌و بەبێ ئاوڕدانەوە ماڵەکەی بەجێهێشت. کچە زۆر بەلایەوە سەیربوو، باوکەکەش لەپەنجەرەکەوە بەچاوەوەبوو، ئەوەندەی پێکرا بەوپەڕی داخ‌و خەفەتەوە هەناسەیەك هەڵکێشێت‌و خۆی بداتە دەست پەروەردگارو بڵێت: لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِالله الْعَلِيُّ الْعَظيم. هیچ دەنگی نەکرد. کچەکەش لەبەر شەرمەزاریی خۆی کەهیچ کات شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، ئەویش دەنگی نەکرد. بۆ ڕۆژی دووەم، ئاوکێش هاتەوە بۆ ماڵی پیاوەکە، بەڵام وەك جاران نەبوو، سەری خەجاڵەتیی شۆڕ کردبوو، شەرمەزاربوو، تەریقی حاڵی دوێنێی دەبۆوە، کچەکەش وەکو ڕۆژان نەچوو بەلایەوە. ئەو پیاوە ئاوکێشە کاری ڕۆژو دوو ڕۆژی نەبوو، چەندەها ساڵبوو ئاوکێشی هەموو گەڕەکەکەبوو، هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان هەڵوێستێکی نەشیاوی لێ نەبینرابوو، بەحەرامیی تەماشای ناموسی خەڵکی نەدەکرد، تەمەنی لەسەرووی چل ساڵەوەبوو، بەهیچ شێوەیەك پیاوی ئەو ڕەفتارانە نەبوو، بەڵام وا لەدەستی دەرچوو.

لەملاشەوە کوڕ سەروکاری کاروان بەلەشی ساغ‌و دەستهاتێکی چاکەوە هاتەوە لای باوکی، بەتەمایە باوکی بیخاتە سەر چاوانی بەڵام باوکی هیچ پرسیاری لەبارەی بازرگانی‌و قازانج‌و سەفەرو دۆست‌و براو خۆشەویستانی حەڵبەوە نەکرد، یەکسەر لەکوڕەکەی پرسی: کوڕی خۆم، لەو کاتەوە مووصڵت بەجێهێشتووە هەتا گەڕاویتەوە چیت کردووە؟ کوڕەکەی باسی دەنگوباسی بازرگانی‌یەکەی کرد، بەڵام باوکەکە ئەمەی نەدەویست بۆیە

قسەکەی پێ بڕی‌و گوتی: ئایا کچت ماچ کردووە؟ کەی‌و لەکوێ؟ کوڕە سەرسام ما، دەم‌وچاوی سوور هەڵگەڕا، تف لەقورگیدا ووشك بوو، سەری داخست. باوکەکە دڵنیابوو، بۆیە گوتی: من ئامۆژگاریم کردیت کەوا لەم سەفەرەتدا شەرەف‌و ئابڕووی خوشکەکەت بپارێزیت، کەچی بەقسەمت نەکرد. پاشان باسی خوشکەکەی بۆ گێڕایەوە کەچۆن ئاوکێشی متمانە پێکراوی چەند ساڵەیان ماچی‌کردووە. دیارە ئەم ماچ کردنە لەجیاتی ئەو ماچە حەرامە بووەو قەرزەکەی پێ دراوەتەوە.

کوڕە چاری نەما، ددانی بەهەموو ڕاستی‌یەکدا نا، گوتی: بەڵام باوکە تۆ بەچیدا زانیت کەمن ئەم کارەم کردووە؟ گوتی: ڕۆڵە گیان، من لەژیانی خۆمدا شك نابەم‌و بەبیریشمدا نایەت ناپاکیەکم لەناموسی کەس کردبێت، یان شەرواڵپیسیەکم کردبێت، بۆیە هیوادارم لەو بارەیەوە هیچ قەرزێکم بەسەرەوە نەبێت، کاتێك ئاوکێشەکەش خوشکەکەتی ماچ کرد بەلامەوە ڕوون‌و ئاشکرابوو تۆش ئافرەتێکت ماچ کردووە، وا خوشکەکەت قەرزەکەی دایەوە، هەق بەهەق، ئەگەر زیاترت بکردایە ئاوکێشەکەش زیاتری دەکرد.

بەڵێ (إِنَّ الزِّنا دَيْنٌ فَإِنْ أَقْرَضْتَهُ كانَ الْوَفاءُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِكَ فَاعْلَمُ)

بەڵێ خۆشەویستان: ئەمە ڕووداوێکی واقعییەو ئەو دەرسەمان فێردەکات کە: هەرکەسێك حەزی لەپاراستنی ناموسی خۆیەتی" با پێش هەموو شتێك پارێزگاریی لەناموسی خەڵکی بکات، هەرکەسێکیش حەزدەکات ناموسی بشکێت با ناموسی خەڵکی بشکێنێت. لەزەت‌و خۆشی سەعاتێك خەم‌وخەفەتە تا بەرپابوونی قیامەت، هەموو قەرزێکیش هەر دەبێ بدرێتەوە.. ئەوانەی کەناپاکیی لەگەڵ شەرەف‌و ئابڕووی خەڵکدا دەکەن، ئەوانە پێش هەموو شتێك ناپاکیی لەگەڵ شەرەف‌و ئابڕووی خۆیاندا دەکەن، قەرزی ناموسیش هەر دەبێ بەناموس بدرێتەوە.

بەدڵنیاییشەوە ئەوەی کەئینسان فێری ئەوە دەکات کەچۆن حەیاو ئابڕووی خۆی خۆش دەوێ، حەیاو شەرەفی خەڵکیشی لەلا بەقەدرو حورمەت بێ، تەنها ئیسلامە. بەڵێ تەنها ئیسلام مایەی بەختیاری‌و سەربەرزیی ئادەمیزادە، تەنها ئیسلام ئابڕوو و ناموسی خەڵکی دەپارێزێ، هەر کۆمەڵێکیش پشتی لەئیسلام کرد" بێ ئابڕوو دەبن، بێ ئابڕوو!! ئەگەرچی بەدەم لافی پاکی لێبدەن، هەر شارستانیەتێکیش لەسەر ڕەوشت‌و ئابڕوو بەرپا

نەبێت, مایەی ئاژاوەو پشێوی‌و نەحەسانەوەیە بۆ ئینسانەکان.. نموونەی ئەم بەسەرهاتەی باسمان کرد زۆرن‌و ئومێدەوارم گەنج‌و لاوەکانمان سوودی لێ وەربگرن.

ئیمانداران: لەبواری زانستیشەوە, زانایانی پزیشکی دەڵێن: جیهازی بەرگریی لەشی ئادەمیزاد, نیشانەی دەسەڵاتی خوایە, ئەو خانانەی بەرگری دەکەن دێنە لای ملەوەو لەلای غودەی - ثیموس - شفرەی سی هەزار خانەیان دەدرێتێ کە لەلاشەی ئەو کەسەدا هەیە تا بیان ناسێتەوەو هەر کاتێك میکرۆبێ یان ڤایرۆسێکی بێگانە بێتە ناوەوە پەلاماری دەدەن‌و لەناوی دەبەن, کەچی کەئەو میکرۆبانە لەئەنجامی نەخۆشیی جنسییەوە بن, ئەوا خانەکانی بەرگری, بەرگریی لێ ناکەن. هەروەك خوای گەورە ئاگاداری کردین, کەدەیەوێ سزای بدات لەئەنجامی سەرپێچی کردنیەوە!! ئەمە لەجیهانی ئادەمیزاددا. کەچی لەجیهانی ئاژەڵدا لەبەر بەرژەوەندی مرۆڤ تاوەکو زاوزێ زۆر بێت‌و مرۆڤ سوودیان لێوەربگرێ, بەقەدەری خوا لەگەڵ ئەوەدا کەنێرێك دەچێتە لای سەدان مێ‌و هەموو شتێك لەبارە کەئایدزو نەخۆشیی تر بڵاو بێتەوە, کەچی بڵاو نابێتەوە. ئەمەش حیکمەتێکی گەورەیەو هەقە ئینسان سەرنجی بدات, دیارە ئاژەڵان لەسەر ئەو بەرنامەیەن کەبۆیان دیاریکراوەو هەڵبژاردنیان نیەو لادانیان نیە..

بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین, کە لەناو ئاژەڵانیشدا زۆر گیانلەبەر هەن کەدژی بێڕەوشتین‌و رازی نابن کەغەیری خۆیان ئاژەڵێکی تر نزیکی مێینەیان بکەوێ. بۆ نموونە (مەیموون) یەکێکە لەو ئاژەڵانەی کەقبووڵی نیە غەیری خۆی مەیموونێکی تری نێر" نزیکی مێیەکەی بکەوێ. لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە کە (عەمری کوڕی مەیمون) فەرموویەتی: (رَأَيْتُ فِي الجَاهِلِيَّةِ قِرْداً زَنَى بِقِرْدَةٍ, فَاجْتَمَعَ القُرُودُ عَلَيهِما فَرَجَمُوهُما حَتَّى ماتا).. واتە: لەزەمانی جاهیلیدا, پێش موسڵمان بوونم, جارێکیان بینیم کەمەیموونێکی نێر هاتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی بینی وا مەیموونێکی نێرەی تر لای مێیەکەیەتی‌و جووت بووە لەگەڵیدا, ئەویش بەپەلە رایکردو هەموو مەیموونەکانی تری ئەو دەورووبەرەی کۆکردەوەو لەمەسەلەکە ئاگاداری کردن پاشان بەهەموو مەیموونەکان بەردبارانی هەردوو مەیموونەکەیان کردو هەردووکیان کوشتن, چونکە داوێن پیسییان کردبوو!هەروەها حوشتر, هەرکاتێ وەختی جووت بوونی نێرو مێیەکەیان دێ, دەبێ بخرێنە شوێنێکی

جۆڵەوە, یان خێمەیەکیان بەسەردا بدرێو هیچ ئینسانێك یان گیاندارێکی تر چاوی لێیان نەبێ, ئەمجا نێرەکە دەچێتە لای مێیەکە, خۆ ئەگەر بزانن کەسێك بەدزییەوە تەماشای کردوون ئەوە تا خۆیان نەکوژن واز ناهێنن! !

هەروەها لەناو باڵندەکانیشدا, مێینەی کۆتر" هەرکاتێ نێرینەیەکی غەیری خۆی کەهاوجووتیەتی وویستی لێی نزیك بێتەوە ئەوا وەکو شێر پەلاماری دەداتو تا دووری نەخاتەوە وازی لێ ناهێنێت! !

بەڵام بەداخەوە کەم نین لەناو ئینسانەکاندا نەك هەر لەدڵی خۆیاندا حەز بەداوێن پیسی دەکەن, بەڵکو بانگەشەی بۆ دەکەنو داوێن پاکیو دیفاع کردن لەناموسو شەرەف بەدواکەوتوویی دەزاننو هەوڵی نەهێشتنی دەدەن. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە دیارە تەبیعەتی (بەران)یان هەیە, کەهەرگیز تووڕە نابێ بەوەی کەنێرینەیەکی تر لەسەر مێیەکەی خۆی ببینێ, جا هەموو ئەو کەسانەش بەرازخۆرنو خۆیان بەموسڵمان نازانن!

موسڵمانانی بەڕێز, ئەی گەنجو لاوەکان, کۆتایی ووتارەکە بەم بەسەرهاتە دێنم کەصەحابی بەڕێز (ئەبی شەهم) ڕەزای خوای لێبێت, بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

من کەسێك بووم بێ ئیشو کار دەسووڕامەوەو زۆر حەزم بەنزیکی لەئافرەتان دەکرد! تا ئەوەبوو لەگەڵ کۆمەڵێکدا هاتم بۆ شاری مەدینەی پیرۆز بۆ ئەوەی پەیمان بدەین بەپێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و وەعدی بدەینێ کەدیفاع لەئیسلام بکەینو جیهاد لەپێناوی خوادا بکەین. بەڵام کەگەیشتینە مەدینە کات زۆر درەنگ بوو, شەو بوو, پێغەمبەری خواش چەند ئیشێکی زەرووری هەبوو, نەیدەتوانی چاوی بەم کۆمەڵە خەڵکە بکەوێ, لەبەر ئەوە دەبوایە تا بەیانی چاوەڕێمان بکردایە. ئەوەبوو بڵاوبووینەوە, من لەیەکێك لەکۆڵانەکانی شاری مەدینەدا, لەو شەوەدا تووشی ئافرەتێك بووم, نزیك بوومەوە لەئافرەتەکەو جلوبەرگەکەیم ڕاکێشا, ئافرەتەکە وەڵامی نەدایەوەو ڕۆیشت. بۆ بەیانی هەموومان کۆبووینەوەو چووین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, پێغەمبەری خوا زۆر دڵخۆش بوو, سڵاوی لەخەڵکەکە کردو بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازیی لێ کردنو یەکە یەکە دەستی خستە دەستی پیاوەکانەوەو عەهدو پەیمانی لێ وەرگرتن, تا سەرە گەیشتە سەر من, منیش وەکو ئەو خەڵکە دەستم درێژ کرد بۆ ئەوەی دەست

بخەمە دەستی (رَسولُ اللهِ)وەو پەیمانی بدەمێ, بەڵام پێغەمبەری خوا دەستی نەهێنایە پێشەوەو فەرمووی: (أحْسِبُكَ صاحِبُ الجُبْذَةِ؟!) فەرمووی: ئایا تۆ نەبووی دوێنێ شەو جلی ئافرەتەکەت ڕاکێشا؟!!

دەفەرموێ: زانیم خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە, ئەگینا خۆ کەس ئاگای لەمن نەبوو, بۆیە دانم نا بەهەڵەی خۆمداو گوتم: بەڵێ, فەرمووی: برۆ دەست ناخەمە دەستتەوەو پەیمانت لێ وەرناگرم, چونکــــە ئنسانێك داوێن پاك نەبێ لــەئیسلامدا جێگای نابێتەوە.

بەڵێ, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم پشتی تێکردمو ڕۆیشت!! منیش زۆر بەلامەوە سەیر بوو, ئایا پێغەمبەری خوا هەر لەسەر ئەوەی دەستم بۆ بەرگی ئافرەتێك بردووە پەیمانم لێ وەرناگرێو دەست ناخاتە دەستمەوە, ئایا ئەمەش بەداوێن پیسی حیسابە؟!! بۆیە یەکسەر لەدڵی خۆمدا بڕیارم داو هاوارم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا پەیمانم لێ وەرگرەو مەحروومم مەکە لەو دەستە پیرۆزەت بەڵێن بێ جارێکیتر شتی وا ناکەم, وەعد بێ داوێن پاك دەبم.

ئەمجا پێغەمبەری خوا ئاوڕی بۆ دامەوەو زەردەخەنەیەکی بۆ کردمو فەرمووی: ئایا وەعدو بەڵێن دەدەی لەمەودوا ڕەفتاری وا نابەجێ نەکەیتەوە؟! گوتم: بەڵێنت دەدەمێ, فەرمووی: دەی کەواتە دەستت بێنە, ئەمجا دەستی خستە ناو دەستمەوەو پەیمانی لێ وەرگرتم.. (ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە).

ئەمە لەسەر جل ڕاکێشانێك, ئەی ئەگەر زۆر لەوە زیاتر ڕوویدا ؟! دەبێ خواو پێغەمبەری خوا چەند لەو بەندەیە عاجز بن.. باشە ئەو خەڵکانەی دەستو چاوو داوێنیان پاك نیە, لەڕۆژی قیامەتدا چی دەڵێن کاتێك دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم؟! ئەو گەنجە لەدنیادا پێغەمبەری خوا لێی توورە بوو, بەڵام ئەو کەسانەی کەئێستا دەستو چاویان ناپارێزن لەئاستی نامەحرەم, ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم لێیان عاجز دەبێ, لەو ڕۆژەدا کەوا پۆل پۆل موسڵمانان دەچنە خزمەتیو داوای شەفاعەتی لێدەکەن ئەویش بەو ڕووە گەشو پڕ نوورەیەوە, بەو دەمە پڕ لەزەردەخەنە موبارەکەیەوە پێشوازییان لێ دەکاو شەفاعەتیان بۆ دەکات, بەڵام

بەرامبەر ئەو کەسەی داوێن پاك نەبووبێ عاجز دەبێو دەفەرموێ: برۆ شەفاعەتت بۆ ناکەم چونکە تۆ بەرامبەر شەرەفو ئابڕووی موسڵمانان پاك نەبووی، برۆ دەست ناخەمە ناو دەستتو شەفاعەتت بۆ ناکەم! !

جا ئیتر پەشیمانی و پەنجە گەستن سوودی نیە. جا کەواتە: ئێستا فرسەتە تا دونیایەو قیامەت نەهاتوو با هەموومان تەوبە بکەینو بڵێین:

ئەی خۆشەویستمان، ئەی تاجی سەرمان، ئەی نووری چاومان، ئەی پێشەوای‌دونیاو قیامەتمان، بەڵێنت دەدەینێ کە لەمەودوا هەرگیز بەچاوی خیانەتو خراپە سەیری ناموسو ئابڕووی هیچ موسڵمانێك نەکەین.

خۆشبەختیش بۆ ئەو کەسەی ئەم پەیمانە دەباتە سەر

داوا دەکەم لەخوای گەورەو بەبەزەیی‌و کاربەجێ، هیدایەتی هەموو لایەکمان بدات، عاقیبەتمان خێرکا، گەنجو لاوەکانمان لەهەموو خراپەو بێشەرعیەك پارێزراوکا، رووسوورو سەربەرزی دونیاو قیامەتمان کا، شەرمەزاری مەحکەمەی خۆی‌و بەردەمی رَسُولُ اللہ مان نەکات..

اللّٰهُمَّ آمين

# ووتاری ژماره بیستو یەك

## داوێن پاكی

### بەشی چوارەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً ﴾

(الاسراء 32)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم :

( لأنْ يُطْعَنَ في رأْسِ أحَـدِكُمْ بِمِخْيَطٍ مِـــنْ حَديدٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أنْ يَمَسَّ إمْرَأَةً لا تَحِلُّ لَهُ )

( صَحيح الجامِع: حَديث رقَم 5045 )

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آله وَصَحْبِه أَجْمَعينَ..

ئیماندارانی بەڕێز: سەلامو ڕەحمەتی خوای پەروەردگار لەهەموومان بێ.. هەر لەخزمەت وەصیەتی چوارەمی خوای گەورەداین کەفەرمووی: ﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾(الأنعام 151).. لەسێ ووتاری ڕابردوودا باسی داوێن پاکیمان کرد, لەم ووتارەشدا کەبەشی چوارەمی ئەو بابەتە پاکو شیرینەیە دەڵێم وَبِالله التَّوْفيق:

تۆی ئیماندار, چ پیاو چ ژن, چ کوڕ چ کچ, چ گەنج چ پیر.. لەگەڵ نەفسی خۆتدا بدوێو ئەم پرسیارانە لەخۆت بکە, ئەگەر لەووڵامەکاندا سەرکەوتوو بووی ئەوە سوپاسی خوا بکە کەداوێن پاکی. ئەم پرسیارانە ئامانجیان ئەوەیە ئایا داوێن پاکی لەتۆدا بەهێزە؟ یان لەئەگەری ئەوەدای کە بەئاسانی بکەویتە ناو سەرپێچیی خوای گەورەوە؟! ڕاستو هەڵەی لێ بدە, ئەگەر (70٪)ت هێنا بڵێ الحَمدُ لله من داوێن پاکم, ئەگەر (50٪)ت هێنا, یان کەمترت هێنا ئەوا لەخۆت بترسەو بڵێ من لەسەر قەراغی فەوتانمو دەکەومە داوێن پیسیەوە ئەگەر تا زووە بەخۆمدا نەچمەوە.. دە فەرموون با هەریەکەمان زۆر بەجوانی گوێ لەپرسیارەکان بگرینو ووڵامی ڕاستو دروست لەدڵی خۆماندا دیاری بکەین, تا سەرەنجام خۆمان بناسین ئایا لە چ پلەیەکی داوێن پاکیداین..

**پرسیاری یەکەم:** ئایا چاوت دەپارێزی لەتەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم, یان چاوت کراوەیە بەرامبەر هەموو ئافرەتێك؟! ئەگەر ووڵامەکەت بەڵێ بوو کەچاوت دادەخەیو نەزەری حەرام ناکەی, ئەوە سوپاسی خوا بکە لەسەر ئەوەی کەڕزگاری کردووی لەشتێك کەبەرەو زینا ڕات دەکێشێ. بەڵام ئەگەر ووڵامی بەشی دووەمت بەبەڵێ دایەوە, واتە سەیری هەموو ئافرەتێکت دەکرد ئەوە لەخۆت بترسەو هەر ئێستا تەوبە بکەو داوای لێخۆشبوون لەخــوا بکەو بڕیاری کۆتایی بدەو عــەزمت جەزم کــە کەجارێکی تر نەزەرناکەیتەوە.

خۆشەویستان: بەڕاستی ئەمە خاڵێکی بنەڕەتییەو یەکەم هەنگاوە, ئەگەر دەرنەچووی ئەمە یەکەم کەوتنە, لەبەر ئەوەی نەزەر کردن یەکەم هەنگاوی بەرەو داوێن پیسی چوونە, وەکو لەمێژەوە گوتراوە:

كُلُّ الحَوادثِ مَبْداها مِنَ النَّظَرِ           وَمُعْظَمُ النَّارِ مِنْ مُسْتَصْغِرِ الشَّرَرِ

واتە: هەموو ئەو كارەساتانەی كەدەبنە هۆی ئابڕووچوونو بەدناو بوون" سەرەتاكەی لەتەماشاكردنی یەكترەوە دەست پێدەكات, هەروەكو چۆن گەورەترین ئاگر لەبزیسكە ئاگرێكی زۆر بچووكەوە دروست دەبێ.

شاعیرێكی تر زۆر جوانی فەرمووەو واقیعی پێكاوە كەفەرموویەتی:

نَظْرَةٌ, فابْتِسامَةٌ, فَسَلامٌ          فَكَلامٌ فَمَوْعدٌ فَلقاءٌ

واتە: ئینسان كەتووشی داوێن پیسیو زینا دەبێ" یەكەم جار لەوەوە دەست پێدەكات كەكوڕو كچەكە تەماشای یەكتری دەكەنو بۆ یەكتری دەڕوانن, پاشان شەرمیان لەیەكتری نامێنێو ئەمجا زەردەخەنە بەدەم یەكترییەوە دەكەن, پاشان هەركات تووشی یەكتر بوون سەلام لەیەكتر دەكەنو ئەحواڵ پرسیو چاكو چۆنی لەگەڵ یەكتریدا دەكەن, پاشان مەوعیدو چاوپێكەوتن لەنێوانیاندا ڕوودەدات, سەرەنجام دوای ماوەیەك پەنا بەخوا بەیەك گەیشتنی ناشەرعی ڕوودەدات لەنێوانیاندا! !كەواتە:ئەگەریەكەم جار لەتەماشاكردنەكەوە خۆیان بپاراستایە هەنگاوەكانی تری بەشوێندا نەدەهات.

ئیمانداران: پرسیار لەپێغەمبەری خوا كرا دەربارەی چاوپێكەوتنی یەكەم جار كەپیاوێك چاوی بەئافرەتێك دەكەوێ, یان ئافرەتێك چاوی بەپیاوێك دەكەوێ, ئایا چی بكەن؟! كەئەمە پێی دەگوترێ: (النَظَرُ الفُجْأة) تەماشاكردنی كتوپڕی, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم فەرمووی: (أصْرِفْ بَصَرَكَ)(رَواهُ مُسلِم), واتە: جاری یەكەم ئەوە بەدەست خۆت نەبوو, هاتە بەرچاوت, بەڵام لەجاری دووەمدا چاوت دابخەو بەردەوام مەبە لەتەماشاكردن.

كەواتە: ئەگەر نەتدەتوانی تەركی نەزەر بكەی ئەوە لەخۆت بترسە!

**پرسیاری دووەم:** ئایا تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم دەكەی؟! یان بەنیسبەت ئافرەتانەوە, ئایا تەوقە لەگەڵ پیاوانێكدا دەكەی كەنامەحرەمە بەتۆ؟! ئەگەر وەڵامەكەت بەڵێیە لەخۆت بترسەو بڕیار بدە وازی لێ بێنە.

گوێ بۆ پێغەمبەری خۆشەویست بگرە, هەزار صەڵاتو سەلامی خوای گەورەی لێ بێ, كەفەرموویەتی: (لأنْ یُطْعَنَ في رَأْسِ أحَدِكُمْ بِمِخْیَطٍ مِنْ حَدیدٍ خَیْرٌ لَهُ مِنْ أنْ یَمَسَّ إمْرَأةً لا تَحِلُّ لَهُ)(صَحیح الجامِع), واتە: ئەگەر یەكێك لەئێوە شیشێكی ئاسن بچێتە سەریەوەو

ئەلایەکی تری سەریەوە دەربچێ، هێشتا ئەو حاڵەی بۆی باشترە لەوەی کەدەستی بەر دەستی ئافرەتێك بکەوێو ـ تەوقەی لەگەڵدا بکات ـ کەئافرەتەکە نامەحرەمە پێی!

ئەمە ئەگەر تەوقەکردن وا بێ ئەی دەبێ ماچ کردنی ئەملاولای یەکتری چۆن بێ؟!

لێرەدا ڕوونکردنەوەیەکی زۆر پێویست هەیە کەدەبێ باسی بکەین، ئەویش ئەوەیە: زۆر کەس هەیە دەڵێ: خۆ فلان کەس کەتەوقەی لەگەڵ دەکەم بێگانە نیە، ئامۆزامە، پوورزامە، خاڵۆزامە، خاڵۆژنمە، ئامۆژنمە، براژنمە، ژن خوشکمە، پووری خێزانەکەمە، خوشکی خەسوومە، خوشکی خەزوورمە، ژنی ژن برامە، ژنی برازامە، ژنی خوشکەزامە، ئەمانە وەکو دایكو خوشكو کچم وان، ئایا چی تێدایە ئەگەر تەوقەیان لەگەڵدا بکەم، یان ماچیان بکەم؟! لەوڵامی ئەو جۆرە کەسانەدا دەڵێین: جارێ بەقسەی تۆ کەس نابێ بەدایكو خوشکت، هەرچەندە دڵو دەروونو ڕەوشتی تۆ پاکیش بێ، ئەوا یاسا گشتییەکە بۆ تۆ هەڵناوەشێتەوە. بزانە پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم چی دەفەرموێ لەم بارەیەوە؟! دەفەرموێ: (إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ على النِّساءِ, فَقالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصارِ, أَفَرَأَيْتَ الحَمُو؟! قالَ: الحَمُوا المَوْتُ) (رَواهُ البُخاري وَمُسلِم)، واتە: ئەی خەڵکینە، ئەی ئیماندارینە، زۆر خۆتان بپارێزن لەوەی کە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا لەماڵێکدا بەیەکەوە کۆببنەوە کەئەو ئافرەتە نامەحرەمە بەئێوە، لەو کاتەدا کابرایەکی یاریدەدەری مەدینەیی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەگەر ئەو ئافرەتە براژنم بوو یان خاڵۆژنو ئامۆژنو ژن خوشكو ئەوانەشم بوو، ئایا هەر حەرامە بەتەنیا لەگەڵیدا لەماڵێکدا بمێنمەوە؟! خۆشەویست فەرمووی: ئەوە تۆ دەڵێی چی، ئەوە هەر مردنە، مردن باشترە بۆ ئینسان نەك لەگەڵ ئەو جۆرە ئافرەتە نزیکانەی خۆیدا بەتەنها لەشوێنو ماڵێکدا دانیشێ، لەبەر ئەوەی ئینسان زۆر جار شەرم دەکاو غیرەتی ئەوە ناکا کەبتوانێ بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا کەخزمی نیەو وەکو کەسایەتی نیە، ناتوانێ لەگەڵیدا دانیشێو خەڵکی ئەگەر بەمە بزانن گومانی خراپی پێ دەبەن، لەبەر ئەوە خۆی لەوە دەپارێزێ، بەڵام ئەو ئافرەتانەی باسمان کردن وەکو براژنو ژن خوشكو ئامۆژنو ئامۆزاو پوورزا، ئەگەر بەیەکیشەوە ببینرێن کەمتر خەڵکی گومانی خراپیان بۆ دروست دەبێ سەبارەت بەو دوو کەسە، چونکە دەڵێن کەسوکاری یەکترین، بۆیە ڕێگای خراپەکاری لەنێوانیاندا ئاسانترە.

هەروەها بەڕێزان: ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی باسی گیروگرفتەکان دەکاتو چارەسەریان بۆ دادەنێتو ڕێگای خۆپاراستنیان بۆ دەست نیشان دەکات. بۆ نموونە: لەوانەیە لەسەد کەس لەژنو پیاو" ئەوەدو نۆیان قەت بیر لەوە نەکەنەوە کەزینا لەگەڵ خزمو کەسوکاری خۆیاندا بکەن, بەڵام ئەگەر (1٪) کەس هەبوو, کەدەروونی نەخۆشو چڵێس بوو, ئەوا لەبەر ئەو تاکە کەسە, بۆ ئەوەی ڕێگای لێ بگیری کەبتوانێ بەناوی خزمایەتی یەوە نزیکی کەسوکاری خۆی بکەوێو خیانەتی ناموسیان لەگەڵدا بکات, یاسایەکی گشتی داناوە کەدەفەرموێ: نابێ هیچ کەس لەگەڵ ئافرەتێکدا لەماڵو شوێنێکدا کۆبێتەوە کەکەسی تریان لەگەڵدا نەبێت, با ئەو ئافرەتە خزمیش بێت مادام ئەو ئافرەتە خزمە بەو پیاوە دەشێت کەڕۆژێ لەڕۆژان مارەی بکات, ئەوا حەرامە تەوقەی لەگەڵدا بکات یان بەتەنها لەماڵێکدا لەگەڵیدا بخەوێتو دانیشێت. پێغەمبەری خۆشەویستمان ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرموێت: (لا يَخْلونَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاّ كانَ ثالثُهُما الشَّيْطانُ), واتە: هەرکاتێ ژنو پیاوێکی نامەحرەم بەیەکەوە لەشوێنێکی چۆڵدا بەیەکەوە کۆبوونەوە کەئەمە پێی دەوترێ (الخَلْوَة) ئەوە سێیەم کەس لەنێوانیاندا شەیطانە, کەبەردەوام هانیان دەدا کەتەماشای یەکتری بکەنو سەرەنجام تووشی خراپەیان بکات! صَدَقَ رَسُولُ الله, هەرچی ئەو حەزرەتە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ والسَّلام) فەرموویەتی" هەمووی ڕاستەو مێژوو سەدان ڕووداوی لەسەر ئەو ڕاستییە تۆمارکردووە, فەرموون گوێ بۆ یەکێ لەو بەسەرهاتانە بگرن کە لەکوردستانی خۆماندا ڕوویداوەو لەکتێبی (دۆسیەی دادگا) کەکتێبێکە باس لەو ڕووداوانە دەکات کە لەکوردستاندا ڕوویان داوەو لەدادگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کێشەکان خراونە ڕوو, باسی ژنێك دەکات, کە لەگەڵ برازای مێردەکەیدا کەلاوێکی تازە پێگەیشتوو بووەو ئەو کاتانەی کەمامەکەی لەئیش‌وکار بووەو شەوانە نەهاتۆتەوە, ئەم برازایەی لای ئامۆژنەکەی خەوتووە, وەکو ئەمینداری ماڵو منداڵی, ئەم ژنە خاوەنی چوار منداڵە, دوای ماوەیەك لەمانەوەی ئەم برازای مێردەی لەماڵەکەیاندا وەکو ئەمیندارێك" شەیطان دەبێتە سێیەم کەسیانو سەرنجی ژنە بەلای کوڕەداو سەرنجی کوڕە بەلای ئامۆژنیدا ڕادەکێشێو سەرەنجام دەست تێکەڵاو دەکەنو بەوەشەوە ناوەستن, وەکو پێشتر باسمان کرد, زیناکردن تاوانی کوشتنیش بەدوای

خۆیدا دێنێ، کوڕەو ئامۆژنی بۆ ئەوەی بەیەکجاری بۆ یەکتری بن پیلانی کوشتنی مامی کوڕەکە دادەنێن. شەوێکیان کەکابرا درەنگ دێتەوەو برازاکەی لەماڵەوەیە، بەبرازاکەی دەڵێ مەڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان، ئەمشەو هەر لێرە بخەوە. لەژووری میوان جێگای بۆ ڕادەخەن و خۆیشی لەگەڵ خێزان و چوار منداڵەکەی لەژووری نوستنی خۆیان دەخەون. لەنیوەشەودا کاتێ کابرای کاسبکار ماندووەو لەقووڵایی خەودایە، ژنەکەی دەچێ برازای مێردەکەی لەخەو هەڵدەستێنێ و دەڵێ وەرە با بیکوژین. بەڵێ شەیطان زیاتر هانیان دەداو بەهەردووکیان دێنە سەری و بەچەکوژ بەسەریدا دەکێشن و دەست دەخەنە قوڕگی هەتا دەیخنکێنن، پاشان دەیهێننە حەمامەکەیانەوەو بەپەرەمێزی ئاو گەرم کردن دەیسووتێنن. لەنزیکی سەعات حەوتدا ژنەکە دەچێ بۆ نانەواخانەی گەڕەکەکەیان و نان دەکڕێ و کەدێتەوە دووبارە دەچێتە حەوشەوەو دەست دەکا بەقژ ڕنینەوەو لەخۆدان و دەرو دراوسێ لێی کۆدەبنەوە، دەڵێن ئەوە چی بووەو چی قەوماوە؟ دەڵێ: مێردەکەم لەحەمامدا خۆی شتووەو پەرەمێز ئیشی کردووە، تا چووم نانم کڕیوە" گڕی گرتووەو سووتاوە!

بەڵێ لاشەی پیاوەکە دەبەن بۆ (طُب عَدلي)و دکتۆر دەڵێ: ئەم لاشەیە پێش سووتان، لەسەری دراوەو خنکێندراوە. دەزگای پۆلیس لەتاوانەکەو جۆری کوشتنەکە دەکۆڵێتەوەو دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێ کەئەو شەوە لەو ماڵەدا ئەو کوڕە گەنجەو ژنی پیاوەکە لەو ماڵەدا بوون، فەرمان دەکات بەگرتنیان و پاش چەند ڕۆژێك ئیعترافیان پێدەکەن، کەئەوان کابرای مێردی ژنەکەو مامی کوڕەکەیان کوشتووە! (ئەم ڕووداوە لەساڵی 1994دا ڕوویداوە).

بەڕێزان: ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب دەفەرموێ: سوێند بەخوا ئەگەر لەسەر خەزێنەی هەموو دونیام دابنێن، دەتوانم سیقەم بەخۆم هەبێت کەخیانەتی لێ ناکەم، بەلاَم ناتوانم سیقە بەنەفسی خۆم بکەم بۆ ئەوەی شەوێك لەگەڵ پیرەژنێکدا بەتەنها لەژوورێکدابم!!

کەواتە: ئەی ئەو کەسانەی تا ئێستا تەوقەتان لەگەڵ نامەحرەمدا کردووە، هەر ئێستا تەوبەی لێبکەن و بڕیاری کۆتایی بدەن کەجارێکی تر دووبارەی ناکەنەوە!

**پرسیاری سێیەم:** ئایا دەست بەتاڵو بێئیشی یان خۆت بەئیشێکەوە خەریك کردووە؟! لەبەر ئەوەی دەست بەتاڵی گەورەترین کاریگەری هەیە بۆ جووڵانی ئارەزواتی جنسی، بۆ نموونە: خێزانی عەزیزی میصر بەهۆی بێکاریو دەست بەتاڵییەوە تووشی ئەو کارەساتەبوو، هیچ ئیش‌وکاری نەبوو پێیەوە سەرقاڵ بێ، ئیتر بیری لەیووسف کردەوە، هەروەها لەهەموو سەردەمو شوێنێکدا تەماشاکەن، هەر ئەو کەسانەی بێکارو کاسپین، هەر ئەوانەی کەبێکارن، ڕۆژانە لەسەر ڕێگای ئافرەتان ڕادەوەستن، بەڵام ئەو لاوانەی کەخەریکی کارو کاسپی حەڵاڵنو بەئیشێکەوە مەشغووڵن زۆر کەمتر تووشی هەڵەی ڕەوشت دەبن، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فەرمانی بەباوكو دایکان داوە کەمنداڵەکانیان فێری پیشەیەك بکەن، لەهەرەتی لاویەتیو گەنجیەتیەوە بەپیشەیەکەوە خەریکیان بکەن، وەکو ئەسپ سواری، لێخوڕینی ئوتومبێل، تیرەندازی، مەلەوانی، خۆشنووسی.. کەواتە: لەم سەردەمو ڕۆژگارەدا واجبی سەر شانی حکومەتە کەکاری پێویست بۆ هەموو کوڕو کچێکی بێکار بدۆزێتەوە، هەروەها لاوان بەوەرزشی بەسوود وەکو مەلەوانیو تۆپی پێو باڵەو جومناستیكو جۆرەکانی تری وەرزشی بەسوودەوە خەریك بکات، کە بەڕاستی وەرزش کردنی سنووردارو بەبەرنامە باشترین هۆکارە بۆ پاراستنی گەنجو لاوەکان لەبیرکردنەوە لەبەدڕەوشتی، هەروەها بەنیسبەت کچانەوە خۆ خەریك کردن بەهونەری چێشت لێنانو شت دروستکردنو کاری بەرگدوورییەوە سوودی یەکجار زۆرە، هەم بۆ کاتی کچیەتییان کە لەبیرو خەیاڵی خراپو نابەجێ دووریان دەخاتەوە، هەم بۆ دوای شووکردنو ژیانی هاوسەرییان، وەبۆ هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ لەتەمەنی نەوجەوانیدا خوێندنەوەو دابین کردنی کتێبخانەی گشتی شتێکی زۆر زەروورو پێویستە.

کەواتە: هەرگیز مەهێڵە بێکار بیتو بەردەوام خۆت بەشتێکەوە سەرقاڵ بکە!

**پرسیاری چوارەم:** ئایا هاوڕێیەتی کێ دەکەی؟ هاوڕێکانت کێن؟ ئایا هاوڕێکانت ئینسانی دیندارو ڕەوشت بەرزو پاکن؟ یان ئینسانی دوور لەدینو گومڕاو ڕەوشت نزمن؟! ئاگات لەخۆت بێ، خراپترین شت بتفەوتێنێو بتخاتە ناو بێڕەوشتییەوە هاوڕێی خراپە، چەند لاوو گەنجمان بینیوە، زۆر دیندارو ڕەوشت بەرز بوو، بەڵام بەهۆی هاوڕێیەتی

خراپەکارانەوە تووشی خراپەو داوێن پیسی بوو! لەبەر ئەوە زۆر ئاگاتان لەهاوڕێی خراپ بێ. ئەو برادەرەت کە (سی دیەکی) بێڕەوشتیت دەداتێ سەیری بکەی لێی وەرمەگرەو وازی لێ بێنە. ئەوەی باسی ناموس‌و خوشکی خەڵکی بۆ تۆ دەکات، مەرحەبایی مەکە، چونکە ڕۆژێك باسی خوشك‌و ناموسی تۆش بۆ کەسانی تر دەکات..

تۆش ئەی خوشکی بەڕێز: ئەو کچە هاوڕێیەت کەهانت دەدا بۆ لابردنی سەرپۆش‌و حیجابەکەت‌و لەبەرکردنی جلوبەرگی ناشەرعی بەقسەی مەکەو واز لەڕەفاقەتی بێنە. چەند کچ هەبووە زۆر داپۆشراوو بەحورمەت بووە، بەڵام بەهۆی ڕەفیق‌و مەجلیسی خراپەوە، بەرگی حەیاو حورمەتی فڕێداوە!

با بەگوێی ئامۆژگاری‌یەکەی سەردارو سەروەرمان حەزرەتی محمد المصطفی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بکەین کەفەرموویەتی: (لا تُصاحِبْ إلاَّ مُؤْمِناً, وَلا يَأْكُل طَعامَكَ إلاَّ تَقِيٌّ) (رَواهُ أبو داود والترمذي بِسَنَدٍ لا بَأس بهِ)، واتە: هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کەترسی خوای لەدڵدا نیە، وەمەهێڵە کەسێك نانت بخوا کە لەخوا ناترسێ‌و ڕەوشتی جوان نیە.. چونکە نانیشت دەخواو نان دێنیشت دەدرێ. کەواتە با ئاگامان لەهاوڕێ بێ

**پرسیاری پێنجەم:** ئایا داوا لەخوا دەکەی کەداوێن پاکت بکاو لەهۆکارەکانی داوێن پیسی بتپارێزێ؟ ئەگەر دوعا ناکەی لەخۆت بترسە چونکە دوعا گیرا دەبێ. تەماشای پێغەمبەری خوا بکە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ هەموو ڕۆژێ لەخوای گەورە دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (اللّهُمَّ إنِّي أسْأَلُكَ الهُدى وَالتُّقى وَالعَفافَ وَالغِنى)(رَواهُ مُسلِم).

پێغەمبەری خوا ئەم دوعایەمان فێردەکات، بۆ ئەوەی ئێمەش دوعای پێبکەین‌و بڵێین: خوایە گیان داوێن پاکیمان پێببەخشە.

ئەی گەنجانی بەڕێز: ئێوە ئەمڕۆ زۆر پێویستیتان بەدوعاکردن هەیە، بەردەوام دەبێ لەخوا بپاڕێنەوە کەبتانپارێزێ لەفیتنەی بەدڕەوشتان، ئێوە بەدوعاکەی حەزرەتی محمد المصطفی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەخوا بپاڕێنەوە. چاو لەگەورەمان حەزرەتی یووسف بکەن، لەکاتێکدا ژنانی میصر زۆریان بۆ هێناو هەڕەشەی سجنیان لێکرد ئەگەر بەقسەی زولەیخا نەکات، لەو کاتەدا حەزرەتی یووسف پەنای بۆ خوا بردو فەرمووی: ﴿رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُنْ مِنَ

الْجَاهِلِينَ ﴾(يوسف 33)، واتە: حەزرەتی یووسف کەگوێی لەداواکاریی ژنەکان بوو، فەرمووی: ئەی پەروەردگارا من زیندانم لەلا خۆشەویستترە لەوەی کەئەوان بانگم دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر لەفێڵو تەڵەکەی ئەوانە ڕزگارم نەکەیتو لەپیلانو نەخشەکانیان دەربازم نەکەیتو لام نەدەیت، لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێتو ئارەزوویان بکەمو پاشان بچمە ڕیزی نەفامو گوناهبارانەوە.

واتە: حەزرەتی یووسف داوای لەخوا کرد کەبیپارێزێ، چونکە ئەگەر خوا بەلوطفی خۆی نەیپارێزێ دەکەوێتە داویانەوە.. خوای گەورەش بەهانایەوە چوو و وەڵامی پاڕانەوەکەی دایەوە وەکو دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾(یوسف 34)، واتە: جا پەروەردگاری بەهانایەوە چوو، نزاکەی گیرا کردو لەتەڵەکەو فێڵی ژنان پاراستیو لایدا، چونکە بەڕاستی هەر ئەو زاتە بیسەری نزاکانەو زانایە بەدڵو دەروونەکان.

لەم بەسەرهاتەی حەزرەتی یووسفەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەهەرکاتێ ئینسانی موسڵمان" لەترسی خوا وازی لەسەرپێچیو تاوان هێنا، ئەوا خوای گەورەش دەیپارێزێ لەداوو فێڵی فێڵبازانو مەکریان. بەڵێ هەرکەسێك جارێك لەتەمەنیدا خۆی لەگوناهو بێشەرعی بپارێزێ، خوای گەورە لەتەواوی ژیانیدا دەیپارێزێ، هەروەکو حەزرەتی یووسفی پاراست لەتەواوی تەمەنیدا تووشی گوناه نەبۆوەو ناوی بوو بەدروشمی داوێن پاکانو چاکانو پاکان.

بەڵێ ئەمڕۆ گەنجەکانمان هەموو هۆکارێکی بەدڕەوشتییان خراوەتە بەردەستو بەرچاو! بۆیە دەبێ تەنها بەپەنابردن بۆ خوا، بەدوعاکردن خۆیان بپارێزن. ئێمەش دەڵێین: یا ڕەبی خوایە هەموو لایەکمان، بەتایبەت کچو کوڕە لاوەکانمان لەهەموو پیلانو نەخشەیەکی ژەهراوی کەبۆ لادانیان لەداوێن پاکی داڕێژراوە، بپارێزە.. آمین.

**پرسیاری شەشەم:** ئایا لەسەتەلایتەکەتدا، کەناڵە خراپەکانت سڕیوەتەوە یان نا؟ ئامان ئەی ئومەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، ئاگاتان لەخۆتانو ماڵو منداڵتان بێ، سەتەلایت بەکاربهێنە، بەڵام پێش ئەوەی بیهێنیتە ماڵەوە کەناڵە بێڕەوشتەکان، کەئەخلاقو شەرم بەتایبەت لەکوڕو کچی تازە پێگەیشتوودا ناهێڵن"

بسرەوەو ئەمجا ئیشی پێبکەن. هەرماڵێك سەتەلایتەکەی لەکەناڵە بەدرەوشتەکان پاك نەبوویێتەوە با لەکوڕو کچو خێزانی خۆی بترسێ لەبەدرەوشتیو لاچوونی داوێن پاکی!

مامۆستایەکی ووتاربێژ لەسووریا، لەووتارێکی ڕۆژی هەینیدا، ئەم بەسەرهاتە بۆ موسڵمانان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: حەزم نەدەکرد ئەم جۆرە ڕووداوانە ئاشکرا بکرێنو لەمینبەرەوە باس بکرێن، بەڵام ئەو کابرایە زۆر تەکلیفی لێکردمو گوتی: دەبێ هەموو موسڵمانان بیزانن، بۆ ئەوەی لەمنەوە دەرس وەربگرنو ئەوەی بەسەر کوڕو کچی مندا هاتووە، بەسەر کوڕو کچی موسڵماناندا نەیەت. ڕووداوەکەش ئەمەیە: ئەم کابرایە سەتەلایت دەکڕێو هیچ کەناڵێکی خراپی تێدا ناسڕێتەوەو چی بیانەوێ لەبەردەستیاندا دەبێ. لەماڵی ئەم کابرایەدا ژنەکەیو کوڕێكو کچێکی تازە پێگەیشتووی تێدا دەژیا، ڕۆژانە ئەم پیاوە لەگەڵ ژنەکەی بۆ کاروباری فەرمانگەکەیان لەماڵ دەچنە دەرەوەو کوڕو کچەکەشیان بۆ خوێندن لەماڵ دەچنە دەرەوە، بەڵام زۆربەی کات کچو کوڕەکە زووتر دێنە ماڵەوەو بەفرسەتی دەزانن کە بەشوێن ئەو کەناڵە ئاسمانییانەدا بگەڕێن کەئینسان ئەگەر سەرەتای بێ، بەتەنهاش شەرم دەکات سەیری بکات، بەڵام حەیاو شەرم دڵۆپێکەو تا دەڕژێ خاوەنەکەی لەخراپە دەگێڕێتەوە، هەر کەڕژا تازە هیچ شتێك شەرمی ناوێ ..

بەڵێ ڕۆژێکیان باوکەکە زووتر لەڕۆژان فەرمانگەکەی بەجێ دێڵێو دێتەوە بۆ ماڵەوەو لەبەر ئەوەی کلیلی دەرگای لایە، بێ چرپە دەرگا دەکاتەوەو دێتە ژوورەوە، بەڵام چی ببینێ؟! ئەوەی کەهەرگیز بەعەقڵی مرۆڤی ئاساییدا نایەت، وا سەتەلایتەکە فیلمێکی بەدرەوشتیی نیشان دەداتو کوڕو کچەکەی ئەمیش بەڕووتی بەیەکەوەنو خوشكو برا سەیری تەلەفزیۆنەکە دەکەنو بەپێکەنینەوە، بەیەکەوە زینا دەکەن!

باوکەکەیان کەئەوە دەبینێ، بەهەردوو دەستی بەسەری خۆیدا دەداو پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ کە بەدەستو پارەی خۆی چی بۆ کوڕو کچەکەی هێنایە ماڵەوەو ئێستا بەرهەمەکەی بەچاوی خۆی دەبینێ!

چەند دەقیقەیەك باوەڕ بەچاوی ناکات کەئەوەی بینیویەتی ڕاستییە، بەڵام نەخێر ڕاستەو کار لەکار ترازاوە، بۆیە دەچێ تەورێك کە لەحەوشەکەیاندایە هەڵیدەگرێو بۆیان دەچێتە ژوورەوەو بەتەور کوڕو کچەکەی خۆی بەدەستی خۆی دەکوژێ. پاشانیش دێت

بۆ لای مامۆستای مزگەوتەکەو تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو تکایشی لێدەکات کە لەووتاری ڕۆژی هەینیدا باسی بکات بەئومێدی ئەوەی کەئەو بەدبەختییەی بەهۆی کەناڵی خراپی سەتەلایتەوە بەسەر کوڕو کچی ئەمدا هاتو ماڵوحاڵی لێك هەڵوەشاندن, بەسەر موسڵمانانی تر نەیەتو خەڵکی عیبرەتی لێ وەربگرن! !

منیش دەڵێم: کێ ئەم بەسەرهاتەی بیستو تا ئەم کاتە سەتەلایتەکەی لەکەناڵە خراپەکان پاك نەکردۆتەوە, با هەر ئەمڕۆ بڕیاری پاك کردنەوەی بداتو بەختەوەریش ئەو کەسەیە کەدەرسو عیبرەت لەکەسانیتر وەردەگرێ!

**پرسیاری حەوتەم:** ئەم پرسیارە تایبەتە بەخوشکان, ئایا تۆ حیجابی؟! ئەی خوشکم کۆمەڵگا موحتاجی باڵاپۆشیی تۆیە, کەواتە: حیجاب تەنها بۆ خۆت نیەو بەس, بەڵکو بۆ کۆمەڵگایە تا داوێن پاکی بڵاوبێتەوە. کەحیجاب زۆر بێ داوێن پاکی زیاد دەکا! مێشومەگەز لەشیرینیو چەورییەك دەدا کەداپۆشراو نیە, میکرۆب حەزی لەشوێنێکە کەبەربەستی پاکی تێوە نەپێچراوە!

ئەی خوشکی بەڕێزم: شانازی بەحیجابەکەتەوە بکە چونکە هەموو شتێکی گەورەو خاوەن قەدەر لەم کەونەدا باڵاپۆشە, ئەوەتا زەوی کەبێشکەی ژیانەو لانەی هێمنیی ئینسانەکانو گیاندارو بێگیانەکانە بەبەرگە هەوا دەورەدراوە, ئەگەر یەك درزی بچووك بکەوێتە ئەو بەرگە هەواییەوە" ژیان لەسەر زەویدا نامێنێ! یان ئەو میوانەی کەڕۆژانە بۆ خواردن بەکاریان دێنین, تەماشاکە ئەوانەی کەباڵاپۆشن پاکترو خۆشترن, ئەوەتا مۆزو پرتەقاڵو هەنار چەند جوانو پاکن, چونکە بەبەرگێکی شایستە باڵاپۆش کراون.

بەڕاستی خوشکانی داپۆشراوو باڵاپۆش قەڵایەکی بەهێزنو هەرگیز چاوبرسیانو تەبیعەت گورگان ناتوانن پڕ بەچاو سەیریان بکەن, بەڵام کەئافرەت خۆی ڕووت کردەوەو سفوور بوو, هەرگیز ناتوانێ بەکەس بڵێ سەیرم مەکە, چونکە خۆ ڕووتکردنەوە تەنها بۆ تەماشاکردنە! !

خوشکانی بەڕێز: پاکی کۆمەڵگا بەستراوە بەئێوەوە, چونکە شەرمو حەیا بەفیطرەت لەئافرەتدا زیاترە لەپیاو. تەماشای قورئانی پیرۆز بکەن کاتێ باسی زینا دەکات دەفەرمووێ: ﴿ الزَّانِيَةُ والزَّاني ﴾, ژنی زیناکارو پیاوی زیناکار, ژنەکەی پێش پیاوەکە

باسکرد, لەبەر ئەوەی ئەگەر ئافرەت ڕوونەداتە پیاو" هەرگیز پیاو زاتی ئەوە ناکات بەچاوی خیانەت تەماشای ئافرەت بکات. بەڵام کەباسی دزی دەکات, دەفەرموێ: ﴿السَّارِقُ والسَّارِقَةُ﴾ دزی پیاوو دزی ژن دەبێ دەستیان ببڕدرێ. لێرەدا پیاوی پێشخست چونکە زۆربەی دزی پیاو دەیکات نەك ئافرەت ..

کەواتە خوشکان: ئاگاداری حیجابو خۆداپۆشینی خۆتان بن. خوشکان, ئێوەی موسڵمان تەماشای ئافرەتە موسڵمانەکانی سەلەفی صالحی ئەم ئوممەتی ئیسلامە بکەن, (عەطاء کوڕی ئەبی ڕەباح) دەفەرموێ:

ڕۆژێکیان عَبدُالله ی کوڕی عَبَّاس (ڕەزای خوای لێبێت) بانگی کردمو فەرمووی: (ألا أُرِيكَ إِمْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ؟!) وەرە با ئافرەتێکی بەهەشتیت نیشان بدەم, منیش گوتم: ئادەی بفەرموو, فەرمووی: (هذِهِ المَرْأَةُ السَّوْداءُ أَتَتِ النَّبِيَّ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ـ فَقالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللهَ لي), فەرمووی: ئەم ئافرەتە ڕەشە کاتی خۆی هاتە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمو عەرزی کرد: قوربان, من فێم لێ دێو لەو کاتەدا کەفێیەکەم لێ دێ, بەدەست خۆم نیەو ئاگام لەخۆم نامێنێ, جلوبەرگ بەبەر خۆمەوە ناهێڵم, جا هاتوومەتە خزمەتت بەڵکو بۆم لەخوا بپاڕێیتەوە کەچاکم بکاتەوەو لەم نەخۆشییە ڕزگارم ببێ.

پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللهَ أَنْ يُعافِيَكِ), فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی ئارام بگرە لەسەر ئەو فێ لێهاتنەتو خوای گەورە بەبەهەشت پاداشتت دەداتەوە, لەقیامەتدا دەچیتە بەهەشت, ئەگەر حەزیش دەکەی لەخوای گەورە بۆت دەپاڕێمەوە کەچاکت بکاتەوەو شیفات بۆ بنێرێو جارێکی تر تووشی فێ لێهاتن نەبی! ئافرەتەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا, هەرچەندە بەهۆی ئەو فێ لێهاتنەمەوە زۆر ناڕەحەت دەبمو ئازاری زۆرم دەبێو جاری وا هەیە خەڵکی گاڵتەم پێدەکەنو بەشێتم دەزانن, بەڵام بەهەشت ئەوەندە خۆشو بەنرخو نەبڕاوەیە, لەبەر خاتری ئەو بەهەشتە ئارام دەگرمو قەیناکا با چاك نەبمەوە. بەڵام ئەی پێغەمبەری خوا, ئەوەندە هەیە (إِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللهَ لي أَنْ لا أَتَكَشَّفَ), من کاتێ فێم لێ دێ ئاگام لەخۆم نامێنێو جلوبەرگ لەبەر خۆم دادەکەنمو لاشەم دەردەکەوێ, بەڵکو بۆ

ئەمەیان بۆم لەخوا بپارێیتەوە کــە لــەکاتی فێیەکەمدا خۆم ڕووت نەکــەمــەوەو لـــەشم دەرنەکەوێ!!

پێغەمبەری خواش دوعای بۆ کرد کە لەکاتی لێهاتنی فێیەکەیدا جلوبەرگ لەبەر خۆی دانەکەنێو جەستەی دەرنەکەوێ. ( ئەم فـەرموودەیە ئیمامی بوخاریو موسلم ڕیوایەتیان کردووە)

جا تەماشاکەن، ئەو ئافرەتە داوا لەپێغەمبەری خوا دەکات کەدوعای ئەوەی بۆ بکات کە لەکاتی فێ لێهاتندا" کە لەدەرەوەی بازنەی ئیرادەو وویستی خۆیەتی، خۆی ڕووت نەکاتەوەو لاشەی دەرنەکەوێ، کەچی بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرن ئەو کچو ژنانەی بەشوێن فرسەتێکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بچنە ناو ئاهەنگو بۆنەو حەفلەیەکەوەو لەوێدا خۆیان ڕووت بکەنەوەو سەماو ڕەقص بکەنو ئەو هەموو گورگە چاوبرسییەش تەماشایان بکەن!! ئایا داوێن پاکی چی لێهات؟!

**پرسیاری هەشتەم:** ئەم پرسیارەیان زیاتر پەیوەندی بەکوڕانەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە: ئایا تەماشای ئەو بەناو گۆڤارانە دەکەیت کە بەناو گۆڤارو لەناوەرۆکدا ئەلبوومی جەستەی ئافرەتن؟!

بەڕاستی بەڕێزان: ماوەیەکە لەکوردستاندا کۆمەڵێك گۆڤار دەردەچێت کەبەڕاستی سروشتی گۆڤاریان لەدەستداوەو بوون بە(ئەلبووم)! ئەویش چ ئەلبوومێك؟! ئەلبوومێکی بازرگانییانەی جەستەی ئافرەتو بەکاڵاکردنی ئافرەت کەدوورە لەهەموو بەها بەرزەکانو مافەکانی ئافرەتو دوورە لەهەموو نەریتو ئاکارێکی کوردەواری. گرنگترین تەوەرەی کارکردنی ئەو بەناو گۆڤارانە ووروژاندنی لایەنی سێکسی لاوانە لەڕێگەی ئەو بابەتە لاوەکییانەوە کەزەق دەکرێنەوە، دابەزاندنی وێنەی ئافرەت بەتایبەت لەسەر ڕووپەڕی گۆڤارەکە، بۆ ڕاکێشانی زۆرترین خوێنەر بەلای گۆڤارەکەدا. جا ئامۆژگاریم بۆ لاوانو خوێندکاران ئەوەیە، خۆتان بپارێزن لەکڕینو خوێندنەوەی ئەو جۆرە بەناو گۆڤارانە!

بەڵێ خۆشەویستان: ئەمە کۆمەڵێك پرسیاربوو خستمانە بەرچاوی گەنجو لاوەکانمان لەکوڕانو لەکچان، کەهەر کەسێك لەڕێگەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانەوە دەتوانێ خۆی هەڵبسەنگێنێ، ئایا پلەی داوێن پاکیەکەی لە چ ئاستێکدایە، جا ئەگەر لەوەڵامەکاندا

سەرکەوتوو بووی، ئەوا سوپاسی خوای گەورە بکەو داوای لێبکە دامەزراویت لەسەر داوێن پاکی پێ ببەخشێت، خۆ ئەگەر خوانەخواستە داوێن پاکیت بەتەواوی لەدەست دابوو، یان بەشێکی داوێن پاکیت لەکەدار بووبوو، ئەوا هەر ئێستا تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەو خۆت بگەیەنەوە بەکاروانی داوێن پاکان، بۆ ئەوەی بەپاکی لەدونیادا بژینو بەپاکییەوە بچینەوە دیوانی خوا، نەك بەکۆڵێکی قورسەوە لەتاوانی نەزەری حەرامو خۆ دانەپۆشینو کات بەفیڕۆدانو لەکەدارکردنی نامووسو ئابڕووی خەڵکی" بەم هەموو تاوانەوە چۆن ئینسان ڕووی دێ بچێتە مەحکەمەی خواوە؟ دەی با تاوەکو فرسەتمان لەبەردەستدایە تەوبەبکەینو هەڵەو کەموکوڕییەکانمان چارەسەربکەین، بەتایبەت گەنجان، چونکە ئەوەی لەگەنییەوە خۆی ڕانەهێنێت لەسەر ڕەوشتی بەرزو ئەخلاقی پەسەند، لەپیریدا فێر نابێو ئەوەی لەگەنجیدا داوێن پاکی لەکەداربوو، لەپیریدا بۆی واز لێ ناهێنرێ، وەکو پێشینان فەرموویانە: (خوویەك گرتت بەشیری، تەرکی ناکەی بەپیری)، پێغەمبەری بەڕێزی ئیسلامیش دەفەرموێ: (ثَلاثَةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوم القِيامَة وَلا يُزَكِّيهِمْ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِم وَلَهُمْ عَذابٌ أليمٌ)(رَواهُ مُسلِم)، دەفەرموێ: سێ کەس هەن لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکاتو پاکیان ناکاتەوەو بەچاوی ڕەحمەت تەماشایان ناکاتو عەزابێکی زۆر بەشیدەتیان بۆ هەیە!! دەپرسن: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئەو کەسانە کێن؟! دەفەرموێ: یەکەمیان (شَيْخٌ زانٍ)، پیرێکی زیناکەر! بەڵام ئایا ئینسان بەپیری فێری زینا دەبێ؟! نەخێر، بەڵکو ئەوە هەر لەگەنجیەوە ڕاهاتووەو ژنی هێناوەو منداڵی بووەو کوڕو کچی هەیە، کەچی وازی نەهێناوەو تەوبەی نەکردووە، لەبەر ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ڕەحمی پێ ناکاتو سەیری ناکاتو پاکی ناکاتەوە!

ئیمامی قورطوبی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەتەفسیری ئایەتی ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِكُلِّ بَابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ ﴾(الحجر 44)دا دەفەرموێ: بەئێشترین بەشو دەرگای جەهەنەم ئەو دەرگایەیە کەزیناکارانی لێ دەچنە ژوورەوە، پیسترین بۆنی لێ دێ، ناشیرینترین شێوەی هەیە، بەتوندترین شێوە زیناکارانی تێدا سزا دەدرێنو زۆر زەلیلو سەرشۆڕن تێیدا، هەروەکو لەدونیادا ناپاکان سەرنزمو بەدناوو خەڵەتاوو میکرۆبو ئافەتن بۆ خۆیانو خەڵکانی دەوروبەریان.

داواکارم لەخوای بەڕەحمو کاربەجێ، هەموو لایەکمان بپارێزێ لەهەموو کردارو ڕەفتارو گوفتارو هەنگاوو هەڵوێستێك کەدەبێتە مایەی غەزەبی خوا، وەهیدایەتمان بداو موەفەقمان بکا بۆ هەموو کردارێکی جوانو ڕەفتارێکی شیرینو ڕەوشتو ئەخلاقێکی پەسەندو لەسەر داوێن پاکی ڕاوەستاوو دامەزراومان بکات

(اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ الهُدى وَالتُّقى وَالعَفافَ وَالغِنَى)

اللَّهُمَّ آمين ..

# ووتـارى ژماره بيست و دوو

## داوێن پـاكى

### بەشى پێنجەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ﴾

(النور 19)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم :

( لَمْ تَظْهَرِ الفاحِشَةُ في قَوْمٍ قَطٌّ حَتَّى يَعْلِنُوا بِها عَلانِيَةً إلاّ فَشا فيهُمُ الطّاعُونُ وَالأَوْجاعُ الَّتي لَمْ تَكُنْ في أسْلافِهِمُ الَّذينَ مَضَوا )

( رَواهُ الحاكِم وَابنُ ماجَةَ والبَزار )

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِه وَصَحْبِه أَجْمَعينَ..

ئیماندارانو خواناسان, سەلامو ڕەحمەتو لێخۆشبوونی خوای پەروەردگار لەسەر ئێمەو هەموو ئیماندارانی ئومەتی محمد المصطفی بێ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم..

لەبەشی پێنجەمی زنجیرە باسەکەمان دەربارەی داوێن پاکی, کە لەخزمەت وەصیەتی چوارەمی خوای پەروەردگارداین کەفەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾, درێژە بەو باسە پربایەخو گرنگە دەدەینو دەڵێم وبالله التَّوْفيق:

ئاینی ئیسلام کە بەهۆی قورئانەوە ڕێنماییو ئامۆژگارییەکانی پێشکەش بەشوێنکەوتووەکانی دەکات, تەوجیھ و ئامۆژگارییەکانی پارسەنگن لەنێوان ڕۆحو مادەدا, لەنێوانی دونیاو قیامەتدا. ئیسلام تەرازوویەك دادەنێ بۆ ئینسان لەنێوانی خۆگرتنەوەو وازهێنانی هەموو خۆشیەکو لەخۆ حەرامکردنی ئارەزووی جنسی, لەگەڵ جڵەو شلکردن بۆ هەستو سۆزو ئارەزووی بێسنووری جنسی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کەدینی فیطرەتی ئینسانەو هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ ئارەزوو و بەرژەوەندی ڕەوای ئینساندا نیە, نەهاتووە بەشێوەیەکی کتوپڕ بفەرموێ زینا مەکەن, بەڵکو لەهەموو ئایەتەکانی قورئاندا نەهاتووە کەخوای گەورە بفەرموێ: زینا مەکەن, بەڵکو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا ﴾ نزیکی زینا مەکەون, نزیکی پێشەکیەکانی زینا مەبنەوە, لەم وەصیەتەشدا ڕایسپاردینو فەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾(الأنعام 151), واتە: نزیکی گوناھ و تاوانەکان مەکەون چ ئەوەی کەئاشکرا بووەو چ ئەوەی کەشاراوەو پەنهان بووە.

ئیمانداران: ئیسلام هەروەکو زیناکردنی حەرام کردووە, بۆ ئەوەی ئابڕوو و نامووسی خەڵکی بپارێزێ, لەهەمانکاتدا کۆمەڵێ شتی تریشی حەرام کردووەو سزای توندی بۆ داناوە, هەر بۆ ئەوەی کەئابڕوو و کەرامەتی ئینسان پارێزراوبێ.. بۆ نموونە: ئیسلام ڕێگای لەوە گرتووە کەیەکێك لەخۆڕایی یەکێکی تر تاوانبار بکات لەڕووی جنسیەوەو لەڕووی ئەخلاقیەوە, چونکە ئەو کاتەی ئەو کەسەی کەقسەکەی کردووەو بەکەسی بەرامبەری وتووە بێڕەوشت یان داوێن پیس, یان دەبێ چوار شاهیدی پیاو بێنێو ڕاستیی قسەکەی خۆی بسەلمێنێ, یان ئەگەر شاهیدی نەبوو, دەبێ هەشتا جەڵدەی لەپشت بدرێ, بۆ ئەوەی یەکێکی تر نەتوانێ هەروا بەئاسانی دەم بنێتە ئابڕووی

خەڵكییەوەو بەكەیفی خۆی وەكو بنێشت شەرەف‌و نامووسی خەڵكی بجوێ‌و مەجلیسی پێ گەرم بكات.

هەروەها ئیسلام نەیهێشتووە سێ كەس شاهیدی بدەن لەداوێن پیسی ئافرەتێك، شاهیدیەكەیان قبووڵ بكرێ، بەڵكو دەبێ ببن بەچوار شاهید.

خۆشەویستان: هەر لەمەسەلەی داوێن پاكیدا ئیسلام شوێن كەوتووەكانی بەرەو داوێن پاكی دەبا، پێش هەموو شتێك بەتەربیەیەكی ئیمانی، هەر یەكێك لەئێمە ترسی خوا لەدڵیایەتی، خۆشەویستیی خواش لەدڵیایەتی، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستی‌و ترسدا هاوسەنگیەك لەو بەینەدا دروست ببن، شەرم بكەی لەخواو خۆشت بوێ، بشزانی كەهەموو وەختێك ئەو چاودێری تۆیەو ئاگای لەتۆیەو مەلائیكەتی لەسەر شانت داناوە كردەوەكانت دەنووسن، لەهەمانكاتدا بشترسی كاتێ موستەحەقی سزا بووی، خوای پەروەردگار سزات دەدا، لەبەر ئەوە تەماشا دەكەین ئیسلام ئەو ڕەقابە ئیمانیەی لەدڵی هەموو ئینسانێكدا وا چەسپاندووە، بۆیە كاتێ تەماشای قورئان دەكەین، دەبینین كاتێ باسی چیرۆكێك "ڕووداوێك" غەزایەك دەگێڕێتەوە كۆتایی ئایەتەكانی ئەو باسە بەباسكردنی ڕۆژی قیامەت كۆتایی دێت، خۆشەویستیی خوای لەگەڵ دەچەسپێنێ بۆ ئەوەی دائیمەن ئەو هۆرمۆنانەی لەشی تۆ بەتەوازون ڕاگرێ، هۆرمۆنەكانی حەزو ئارەزووەكانی خۆت وردە وردە پارسەنگ دەكا.

ئەم چاودێریە دینییەیە كە لەدڵو دەروونی هەموو ئنسانێكی ئیمانداردایە. لەحەدیثی صەحیحدا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ)، دەفەرموێ: حەوت تاقم هەن، حەوت دەستە هەن خوای پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتدا كەهیچ سێبەرێك نابێ‌و ڕۆژ ئەوەندە نزیكە بەمیقداری میلێك لەئینسانەوە نزیكە، لەو ڕۆژەدا كەهەموو كەسێك هاوار دەكات (نَفسي، نَفسي)، واتە: هەر خۆم، هەر خۆم.. لەو ڕۆژەدا كەهەموو كەسێك موحتاجی ئەوەیە خێرێكی بدرێتێ، خێرێكی بۆ زیندووبكرێتەوە، پەشیمانە لەهەموو كردەوەیەكی نابەجێ كەكردوویەتی، لەو ڕۆژەدا حەوت تاقم هەن كەخوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی، یەكێ لەو حەوت تاقمەش: پیاوێكە تووشی بووبێ بەتووشی ئافرەتێكی جوانی خاوەن پایەو مەنصەبەوە،

ئافـــرەتەکـە داوای زینای لێ بکـاو ئـەم ڕەفزی بکا دەستی لـەگـەڵدا تێکەڵ بکات, لەبەر خاتری خوا!

بەیەك ڕووداوی وا لەژیانتداو کۆنترۆڵکردنی هەستو شعووری خۆت موستەحەقی ئەوەی کەخوای گەورە بتخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لەو ڕۆژەدا کەهەموو کەس موحتاجی بەر سێبەری خوای گەورەیە. جا وەختێك ئەم ڕەقابەو چاودێریە دینییە لەدڵو دەرووندا دەچەسپێ, ئینسان تەوازونێکی بۆ دروست دەبێ لەنێوان ئەوەی ئەم ئارەزووە سەرشێتە جنسیەی خۆی تێرکا لەگەڵ ئافرەتێکدا کەدوای بیست دەقیقەو نیو سەعات وەك ئەوە وایە هیچ لەزەتێکی وەرنەگرتبێ, مەگەر بەیادگار بیگێڕێتەوە. لەنێوانی ئەو ڕۆژەشدا کەخوای پەروەردگار تۆی خۆش دەوێو دەتخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە. ئەم دوو لایەنە, چ ئاقڵێك فەزڵی ئەم ڕەغبەتە جنسیە سەعاتیە, ئەگەر سەعاتێکیش بێ, بیدا بەسەر ئەو ڕۆژەدا کە لەقیامەتدا ئەو ڕێزەی لێدەنێ.. ئیسلام بەو شێوەیە شوێن کەوتووەکانی پەروەردە کردووە لەگەڵ بوونی چاودێرێکی ناو ناخی خۆت, ڕەوشتی ئێمەشی لەدەرەوە پەروەردە کردووە, هەڵسوکەوتمان, چاومـان, قسـەمان, ڕەفتارمـان لەگەڵ خەڵکی, بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾(النور 27), واتە: ئەی ئیمانداران, کاتێك کەنزیکی ماڵێك دەکەونەوە مەچنە ژوورەوە, مەچنە ماڵەکەوە هەتاوەکو داوای ئیزن لەخەڵکەکەی دەکەنو ڕێگاتان پێدەدرێ بۆ چوونە ژوورەوە. چەند شتێکی ناشیرینو ناخۆشە کاتێ کەسێك سەربەخۆ خۆی دەکات بەماڵێکدا, هەموو ماڵێك حورمەتی هەیە, خەڵکی وا دەزانن حورمەتەکە تەنها ئەخلاقیە, وەکو (سَید قُطب) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: بەڵام حورمەتی ماڵ, ئەمنیەتی ماڵ, جاری وا هەیە لەنەوعیەتی خواردنەکەدایە, خەڵکێك دانیشتووە لەماڵی خۆیدا, ماڵی خۆیەتیو جۆرێك خواردنی بۆ خۆی ئامادە کردووە, حەز ناکات تۆ بزانیت چی دەخوا, یان جلوبەرگێکی تایبەتی لەبەرکردووە, لەناو ژوورو ماڵی خۆیدا, حەزناکات تۆ ڕاستەوخۆ بچیتە ژوورەوەو بیبینی بەبێ لەدەرگادان, بەبێ خۆ ئامادەکردن, بێ ئەوەی بڵێی فەرموو وەرە ژوورەوە تۆ بچیتە ژوورەوەو بەو حاڵەوە بیبینیت. بۆیە ئازیزانم: ئیسلام شوێن کەوتووەکانی

ئەوەندە جوان پەروەردە کردووە ئەگەر کەسێك لەدەرگای ماڵێکی داو داوای چوونە ژوورەوەی کرد, ئەگەر بێتو خاوەن ماڵ بڵێ بگەڕێوە, ئەوا دڵگران نابێتو دەگەڕێتەوە ﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾(النور 28), ئەگەر پێتان گوترا بگەڕێنەوە" بگەڕێنەوە, بەشتێکی تەبیعی وەرگرن, ئەمە شتێکی عەشایەری نیە, ئەگەر لەدەرگای خەڵکت داو گوتی ببورە, ئێستا وەختم نیە بتبینم بگەڕێیتەوە باشترە, کاتێکی تر سەرم لێبدەرەوە, نابێ تۆ دڵگران ببی, دڵگرانیی ناوێ, چونکە ئەو خاوەن ماڵە خۆی شارەزاترە بەو کاتو حاڵەی ناو ماڵی خۆی, دیارە وا پێویست دەکات کەرێگە نەدا تۆ بچیتە ژوورەوە.. جا ئەمە هەمووی موقەدیماتو پێشەکیەکە بۆ ئەوەی ئینسان شەرەفو نامووسی پارێزراو بێ.

هەروەها ئیسلام چاوی موسڵمانانی بەتایبەت گەنجەکانی چۆن پاراستووە لەوەی تەماشای نامووسی خەڵکی بکەن, دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾ (النور 30), واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بەموسڵمانان بڵێ: با چاویان بگرنەوە, ﴿ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ﴾ وەداوێنی خۆیان بپارێزن, جا تەماشای ئایەتەکە بکەن, نافەرموێ: ﴿وَيَحْفَظُوا مِنْ فُرُوجَهُمْ ﴾ با لەدامێنی خۆیان بپارێزن, بەڵکو دەفەرموێ: با ئیمانداران عەورەتی خۆیان, لەحاڵەتی تەعەدا کردنیداو لەسنوور دەرچوونیدا بگرنەوە, بەموتڵەقی توخنی زینا نەکەون, پێشەکیەکانی زینا رایان نەکێشێ بەرەو زیناکردن ﴿ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ ئەمە باشترە, ئەمە پاککەرەوەترە بۆ موسڵمانان, چونکە خوا ئاگای لەهەموو کردەوەیەك هەیە کەدەیکەن ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ ﴾ هەروەها بەئافرەتانی موسڵمان بڵێ: ﴿ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾(النور 31), حوکمەکە برگەیەکی زیاترە لەهی پیاوان, واتە: بەئافرەتە موسڵمانەکانیش بڵێ: کە با چاوی خۆیان بگرنەوەو عەورەتی خۆیان بپارێزن, نامووسی خۆیان بپارێزن, جوانیی خۆشیان دەرنەخەن, چونکە جوانیی ئافرەتەکەیە دەبێ بەیەکەم هەنگاو وردە وردە بەرەو ئەو زینا چوونە, یەکەمین تەماشاکردنە کەڕایدەکێشێ بۆ چاوداگرتنێك, بۆ مەوعیدێكو بۆ زینایەكو بۆ خراپەکاریو دەست تێکەڵکردنێك, هەروەکو شاعیر دەفەرموێ:

كُلُّ الحَـوادِثِ مَبْدَأُها مِنَ النَّظَرِ وَمُعَظَّمُ النَّارِ مِنْ مُسْتَصْغَرِ الشَّرَرِ
كَمْ نَظْرَةٍ بَلَغَتْ فِي قَلْبِ صاحِبِها كَمَبْلَغِ السَّهْمِ بَيْنَ القَـوْسِ وَالـوَتَرِ

بۆیە پێغەمبەری ئەکرەم (عَلَيْهِ الصَّلاةُ والسَّلام) دەفەرموێ: (النَّظْرَةُ سَهْمٌ مِنْ سِهامِ إِبْلِيس, فَمَنْ غَضَّ بَصَرَهُ عَنْ مَحاسِنِ امْرَأَةٍ أَوْرَثَ اللهُ قَلْبَهُ حَلاوَةَ العِبادَةِ إِلى يَوْمِ القِيامَةِ)(رَواهُ أَحمَد), واتە: ڕوانینی حەرام - پیاو بۆ ژن یان ژن بۆ پیاوی نامەحرەم - تیرێکە لەتیرە ژەهراویەکانی ئیبلیس, هەرکەسێ چاوی دابخات لەئاستی جوانیی ئافرەتی نامەحرەمو تەماشای نەکات" خوای گەورە شیرنایەتی عیبادەتو خواپەرستی دەخاتە دڵیەوەو تا ڕۆژی قیامەت ئەو شیرنایەتی خواپەرستیەی بەردەوام دەبێت.. بۆیە پێغەمبەری خوا ئاگادارمان دەکاتەوە کەهەر کاتێ پیاو چاوی بەئافرەتێك کەوتو ئافرەتەکە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشا ئەوا با خێرا بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆیو لەگەڵ خێزانی حەڵاڵی خۆیدا دروست ببێ, چونکە ئەو کاتە ئارەزووی دەشکێو چاوی تێر دەبێو دەروونی دەحەسێتەوەو بۆی دەردەکەوێ ئەوەی کەلەو ئافرەتە نامەحرەمەدا سەرنجی ئەمی ڕاکێشاوە" لەژنەکەی خـۆیشیدا هـەیەو خوای گـەورە بەحەڵاڵی پێی بەخشیوە.

حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إِنَّ المَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صورَةِ شَيْطانٍ, وَتُدْبِرُ فِي صورَةِ شَيْطانٍ, فَإِذا أَبْصَرَ أَحَدُكُمْ إِمْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ, فَإِنَّ ذلِكَ يُرَدُّ ما فِي نَفْسِهِ)(رَواهُ مُسلِم), واتە: شەیطان لەڕێگای ئافرەتەوە بەرەوڕووی پیاوان دەبێتەوەو هەر لەڕێگای ئافرەتیشەوە لەپشتەوە بەرەوڕووی پیاوان دەبێتەوە.. هەرکاتێ ئافرەت ڕووی لەپیاو بوو" شەیطان دەموچاوو سنگو مەمکی ئافرەتەکەی لا جوان دەکاتو هەوڵ دەدات زۆرتر سەیری بکات, وەهەر کاتێ ئافرەت پشتی لەپیاو بوو, ئەوا شەیطان سمتی ئافرەتی لا جوان دەکاتو سەرنجی پیاو بەلای ئەوێدا ڕادەکێشێ. جا پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: هەرکاتێ یەکێ لەئێوە چاوی بەئافرەتێکی نامەحرەم کەوتو ئافرەتەکە سەرنجی ڕاکێشا, ئەوا با خێرا بڕوات بۆ لای خێزانی حەڵاڵی خۆی, چونکە ئەوە" ئەوەی لەنەفسیدا دروست بووە لای دەبات!

جا ئیمانداران: سەرنج بدەن پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: کەچاوت بەئافرەتی نامەحرەم کەوت خێرا برۆ بۆ لای خێزانی خۆت, لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی تەماشاکردن بێشەرعی تری بەدوادا دێ, وەکو لەکۆنەوە گوتراوە: (النَّظْرُ بَرِيدُ الزِّنا) تەماشاکردن پۆستەچی زیناکردنە, لەبەر ئەوە خوای گەورە" هەموو ڕێگاکانی بەرەو زینا چوونی لەئینسان گرتووە, بۆیە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾(النور 21), واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاوو نەخشەوپیلانەکانی شەیطان مەکەون, دەفەرموێ: (خُطُوَاتِ): هەنگاوەکان, چونکە یەکەم هەنگاو ڕات دەکێشێ بۆ دووەم هەنگاو, لەدووەمیشەوە بۆ سێیەم هەنگاو هەتا سەرەنجام ئینسان دەکەوێتە ناو خراپەکارییەکەوە. سەرەتا هەنگاوی یەکەم: تەماشاکردنی یەکتریە پاشان چاکوچۆنیو زەردەخەنەو قسەکردنو تەوقەکردنو یەکتر بینینو سەرەنجام زیناکردن.. خوا پەنامان بدات.. آمین.

هەروەها خاڵێکی تر کەئیسلام کردوویەتی بەپێشەکییەك بۆ دروست بوونی داوێن پاکیو ڕێگرتن لەداوێن پیسی, بریتییە لەڕێگەگرتن لەکۆبوونەوەی ژنو پیاوی نامەحرەم بەتەنها لەشوێنێکدا, لەناو ماڵێکدا, لەسەفەرێکدا, لەناو تەکسییەکدا, لەژووری دائیرەیەکدا بن, جا با ئەو ئافرەتە برازنی بێ, خاڵۆژنی بێ, ئامۆژنی بێ, ژن خوشکی بێ, بەنیسبەت پیاوەوە یان شووبرای بێ, یان مامی مێردەکەی بێ, یان خاڵی مێردەکەی بێ, بەنیسبەت ئافرەتەوە, لەگەڵ هەرکەسێکدا کەبەو پیاوە یان ژنە مەحرەم نیە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەو فەرموودەیەدا کە (ترمذي و أحمدو حاكم) گێڕاویانەتەوە دەفەرموێ: (ما خَلا رَجُلٌ بِامْرَأةٍ إلاَّ كانَ الشَّيْطانُ ثالِثُهُما), دەفەرموێ: هەرپیاوێك لەگەڵ هەر ژنێکی نامەحرەمدا بەیەکەوە لەشوێنێکدا بەبێ کەسی سێیەم کۆببنەوە, ئەوە حەتمەن شەیطان سێیەمیانە, زەفەر بەیەکێکیان دەبا, یەکێکیان هان دەدا بەرەو ئەوی تر بڕوا.. لەبەرئەوە لەسەرەتاوە ئیسلام مەنعی کردووە.

مامۆستایەکی ئیماندار دەڵێ: لەنەوەدەکاندا, کابرایەك دوای ئەوەی تەوبەی کردبوو, بۆ ئەوەی خەڵکی دەرسی لێ وەرگرن, بۆی باسکردم گوتی: من پەنجا جار زیاتر زینام لەگەڵ برازنەکەی خۆمدا کردووە!! ئێستا من تەوبەم کردووە, بەڵام دەترسم ئەو تەوبە

نەكات, چونكە تازە براژنەكەم ترسی شكاوە لەزیناكردن‌و دوور نیە لەگەڵ كەسێكی تردا بەردەوام بێ لەزیناكردن‌و منیش ناتوانم قسە بكەم, چونكە من سەرەتا فێری زیناكردنم كرد!! ئەمە بەسەبەبی چی؟ ئەمە بەهۆی ئەوەی كەهەموو ڕۆژێ بەیەكەوە سەفەریان كردووەو چوون بۆ ئەو دەشتە لەئەمینی ئەوەی كەقەیچیەكا شووبرای خۆیەتی! هەروەها كەسی وا بووە جەریمەی زینای لەگەڵ ژنی خوشكی خۆیدا كردووە!! كەشەرعەن ئەگەر لێشی مارەبكرێ مارەیی نایەت, چونكە نابێ دوو خوشك لەلای پیاوێك بن لەحاڵەتی تەعەدودیشدا.. ئەمە هەمووی بەهۆی چیەوە ڕوو دەدا؟! بەهۆی تێكەڵاویی بێ‌سنووری ژن‌و پیاو, بەحوجەی ئەوەی خزمن‌و كەسی یەكترین‌و قابیلە تەماعی لەشووبرای خۆیدا هەبێ؟ قابیلە تەماعی لەبراژنی خۆیدا هەبێ؟! ئەو قابیلانە, ئیسلام نایخوێنێتەوە, چونكە بەڵێ قابیلە, لەبەر ئەوەی ئەگەر ئافرەتێكی ژنی پاشای میصر بیەوێ پەلاماری گەنجێكی موراهیقی تەمەن (17 ـ 18) ساڵ بدا, ئەگەر جەریمەی زینا لەكۆمەڵگای پێغەمبەردا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ڕووی دابێ, بۆچی بەشتێكی دووری بزانین كە لەكۆمەڵگای ئەمڕۆدا ڕوویدات!

لەبەر ئەوە, ڕێگاگرتن لێی پێویستە, بۆیە كاتێ كەحەزرەت صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إِيَّاكُمْ والدُّخُول عَلى النِّساء), فەرمووی: حەزەرتان دەدەمێ, بەئاگابن لەوەی بچن تێكەڵاوی لەگەڵ ئافرەت بكەن, (فَقالَ رَجُلٌ مِنَ الأنْصارِ: يا رَسُولَ اللهِ: أفَرَأيْتَ الحَمُوا؟! قالَ: الحَمُو المَوْتُ)(رَواهُ البُخاري), لەو كاتەدا پیاوێكی ئەنصاری فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, ئەی ئەگەر ئەو تێكەڵاوبوونە, پیاو لەگەڵ براژنی خۆیدابوو, یەعنی: ژنەكەو شووبراكەی خۆی بەیەكەوە بوون, ئایا ئەوەش خراپەو حەرامە؟! فەرمووی ئەوە پێی دەگوترێ ـ حَمُوا ـ لەزمانی عەرەبیدا (حَمُوا), واتە: مردن.. چونكە ڕایاندەكێشێ بەرەو زیناكردن‌و دوایی عاقیبەتەكەش ڕەجم كردنیانەو بەرەو مردنیان دەبات. لەبەر ئەوە ئیسلام هەر لەسەرەتاوە ڕێگای لێ گرتووە. ئیسلام نەیهێشتووە خەڵكانێك بەلەنجەولارەوە لەگەڵ یەكتریدا بدوێن‌و قسەبكەن‌و ڕەفتار بكەن, نەیهێشتووە ژنان تەصەڕوف‌و هەڵسوكەوتی پیاوانە بكەن‌و پیاوان هەڵسوكەوتی ژنانە بكەن, یان ژن‌و پیاو جلوبەرگی یەكتری لەبەربكەن‌و خۆیان بەیەك بچوێنن.

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کە: (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ، المُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجالِ بِالنِّساءِ، والمُتَشَبِّهاتِ مِنَ النِّساءِ بِالرِّجالِ).. واتە: پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەعنەتی کردووە لەو پیاوانەی کەخۆیان وەکو ژن دەشوبهێنن، هەروەها لەو ژنانەش کەخۆیان وەکو پیاو دەدەنە قەڵەمو مەجلیس گەرم دەکەنو بەمەکرونازەوە قسەدەکەن..

هەروەها ئیسلام لەعنەتی لەو پیاوانەش کردووە کەرەفتار ژنانین، لەبەر ئەوەی ئەوەش تەشجیع کردنە بۆ تاوانی زینا، هەر شتێکیش پێشەکی بێ بۆ زینا" ئیسلام قەدەغەی کردووەو رێگای لێ گرتووە.

ئیمانداران: هەروەها ئیسلامی پیرۆز رێگری کردووە لەو باروودۆخو کەش‌وهەوا فاسیدو موفسیدەی کەدەیەوێ کاریگەری هەبێ بۆ سەر رەوشتی جوانو بەرزی داوێن پاکیی کورو کچەکانمان، بۆیە پێویستە ئینسانی موسڵمان لێی دووربکەوێتەوە، چونکە ئەو کەشە فاسیدەیە غەریزەی ئینسان دەجوولێنێت. تۆ ئەگەر مەقالەیەکت خوێندەوە دەربارەی جنس، پاشان کتێبێك یان رۆمانێکی فاسیدت خوێندەوە دەربارەی غەریزەی جنسی، فلیمێکیشت بەدوایدا بینی، لەمەجلیسێکیشدا دانیشتی کەکۆمەڵێك قسەیان دەگێڕایەوە لەو بابەتانە، تۆش بریتی لەکۆمەڵێك هۆرمۆنات، هەروەکو چۆن ئەگەر لیمۆیەك لەبەر چاوت بگوشن لیکت دەرژێ، بەهەمان شێوە لەناو لەشتدا کۆمەڵێك هۆرمۆنی تر هەن پێیان دەووترێ: ئەندرۆجین، ئەم کۆمەڵە هۆرمۆنانەش مەسئولن لەکاروباری جنسی، لەبەر ئەوە ئەوانیش دەووروژێن، رەشتێك دەرووژێنو ئەوێش بەدەمیانەوە لەیەکەم هەنگاوەوە بەردەوام راتدەکێشن بۆ هەنگاوەکانی تر، هەنگاوی یەکەم کەتەماشاکردنو نەزەرەکەیە" راتدەکێشێ بۆ هەنگاوی دووەم کەزەردەخەنەو شەرەچاوێکە، پاشانیش قسەو گفتوگۆو یەکتر بینینە، تا سەرەنجام کەوتنە ناو کارەساتی زیناوە.

لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان دەبێ زۆر ئاگای لەوە بێ هەروەکو خوای گەورە کەباسی زینا دەکا نافەرموێ: زینا مەکەن، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا ﴾، دەفەرموێ: نزیکی مەکەونەوە، چونکە ئینسان راستەوخۆ ناکەوێتە ناو زیناکەوە، لەم وڵاتانە پێشەکی زۆری هەیە، کەواتە پێویستە لەهەنگاوەکانی یەکەمەوە تەوبەی لێبکەی، ئێستا کەحەزکردن بەزینا لەناختدا هەیەو دەتەوێ دەتەوێ پەیوەندیی لەگەڵ

ئافرەتێکدا, یان ئافرەتێك لەگەڵ پیاوێکدا پەیدا بکات, یان شەڕەچاوێکی گۆڕیوەتەوە لەگەڵ یەکێکی تردا, لەگەڵ هاوپۆلێك, هاوپیشەیەك, ئێستا تۆبەی لێبکەو بیپچڕێنە, یەکسەر وازی لێبێنە, نەك بڵێی وردەوردە تەرکی دەکەم, لەبەر موجامەلە, بۆیە تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم دەکەم, با خەڵکی نەزانن توندڕەوم, نەخێر.. با وابزانن کەتۆ ئینسانێکی توندڕەوی, کۆنەپەرستی, لەبەر ئەوەی ئەوەی لای تۆی موسڵمان گرنگە ئەوەیە کەدینەکەت پارێزراوبێ, باشە دینەکەت سەلامەت بێ باشترە یان پێت بڵێن دواکەوتوو و توندڕەو؟! نەخێر, با پێت بڵێن ئینسانێکی ووشکو نەزانو کەللەپووتی دنیا نەدیوە بەڵام ئیمانەکەتو ڕەوشتو داوێن پاکیت سەلامەت بێ, چونکە ئێمەی موسڵمان لەقورئانەکەمانەوە چاکەو خراپە لەیەکتری جیادەکەینەوە, ئیسلامو قورئانەکەمان پێمان دەڵێ کامە پێشکەوتنەو کامە دواکەوتنە. ئەگینا خەڵکانێك لەسەر تەلەفزیۆن یان لەگۆڤارو ڕۆژنامەدا بۆمان دەنووسن ئێمە بۆیە دواکەوتووین چونکە شوێن کەوتەی ئیسلامین, ئەوروپا بۆیە پێشکەوتوون چونکە ئافرەتیان خۆیان ڕووت کردۆتەوەو وازیان لەدین هێناوە, ئەوروپا (جَنَّةُ المَأوى)یەکە خەڵکی شوێنی ئیسراحەتو حەوانەوەیان دەکەون, موجتەمەعێکی ئاسوودەو بەختەوەرن, لەئەوروپا ئافرەت ئازادە, بەڵام بێئاگا لەوەی کەتاوەکو (200) ساڵ لەمەوبەر لەئەوروپا ئافرەتان دەرپێی ئاسنینیان لەپێ دەکرا * لەلایەن مێردەکانیانەوە کاتێ دەیانویست سەفەرێکی دە مانگی بکەن, قفڵیان لەدەرپێ ئاسنەکە دەداو کلیلەکەیان لەگەڵ خۆیان دەبرد, لەترسی ئەوەی ژنەکانیان خیانەتی هاوسەریان لەگەڵ بکەن!! کە لەهەموو مێژووی ئیسلامدا کام پیاوەی دڵی زۆر پیسە شتی وای بەرامبەر ژنەکەی نەکردووە!

بەڵام ئەوانەی کەوا دەزانن ئەوروپا پێشکەوتنە تەکنۆلۆجیو زانستیەکەی هی ئەوەیە کەبێ ڕەوشتی تێیدا ئازادە, ئەوانە خەڵکانێکی لاساییکەرن, ئەوانەی کەدەچنە ئەورووپاو ئەمریکا, پاشان کەدێنەوە بۆ ووڵاتی خۆمان هەموو دیاریەکیان بۆ ئەم گەلو ووڵاتە وێرانو مەزڵوومە بریتیەیە لەناردنی شریتێکی ڤیدیۆیی کە لەگەڵ گۆرانیەکەدا ئافرەت ڕەقص بکاو ناوکی بەدەرەوە بێ!! بۆ بەیانیش خەڵکانێکی بێدین, دین زەعیف, تەقلیدی دەکاو دەیکات بەمۆدێل لەبازاڕدا, بەبێ ئەوەی بزانێ سەرچاوەی ئەم مۆدێل

بازیەی ئەو لەکوێوە هاتووە، هەروەکو دکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبی (مێژوو)دا دەڵێ:
دەگێڕنەوە لەسەردەمی لویسی چوارەمدا، شەوێکیان لەکۆشکی پاشا ئاهەنگ دەبێ، لەو کاتەدا هۆڵ جمەی دێتو هەموو چاوەڕوانی هاتنی پاشا دەکەنو دەیانەوێت بزانن چی لەبەردایە، پێش هاتنی لویس بۆ ناو کۆشک دەبێتە باران، ئیدی مەراییکەران دەکەونە هەڵەکەسەما نەوەك خاوەن شکۆ نمەیەك بارانی بەرکەوێ، یەکێك پەلاماری چەتر دەدات، یەکێکی تر خاولیو ئەوی تر گولاو، ژمارەیەکیشیان پانتۆڵەکەی بەرێکی بۆ هەڵدەکەن بۆئەوەی پریشکی قوڕ بەر پانتۆڵەکەی خاوەن شکۆ نەکەوێت! کەدەگەنە جێ، ئەوانەی پانتۆڵەکەیان بۆ هەڵکرد بیریان دەچێت یان شەرم دەیانگرێت لەبەرچاوی ئەو خەڵکە دیسان دانەوێنەوەو وەك خۆی لێبکەنەوە، دانیشتوان دەکەونە مقۆمقۆ، بەدڵ (دوا مۆدەی) پانتۆڵی پاشا پەسەنددەکەن، بۆ ڕۆژی دوایی، هەریەکەیان ڕوودەکاتە بەرگدروو تا دەستوبرد پانتۆڵێکی قەراغداری وەك پانتۆڵەکەی دوێ شەوی لویسی بۆ بدوورێت.. ئەمە بوو بەمۆدو هەر ئەو مۆدەیەی کەس نەیزانی چۆن پەیدابوو، هیتلەر بەهەموو زەبرو زەنگی خۆیەوە بۆی لەناو نەبرا!

بەڵێ خۆشەویستان: ئەوانەی کەدەڵێن ئەورووپا بەهەشتی سەر زەویە، بێئاگان لەوەی کەهەر ئەو ئەورووپایە بوو کە لەساڵی (1347)ی زاینی تا ساڵی (1350)ی زاینی، طاعوونێك لەئەورووپادا کەوتەوە (80) ملیۆن ئینسانی کوشت! ڕۆژی (800) کەس تەنها لەپاریسی پایتەختی فەڕەنسا دەمرد، مەشهوورە بەوەی کە (3/1)ی ئەورووپا فەوتا!!

ئێستاش نەخۆشیی ئایدز لەو طاعوونەی ئەو کاتە مەترسی زیاترە بۆ سەر ئەورووپا، دەزانن ئایدز چیە؟ ئایدز میکرۆبێکە بریتییە لەدوو پێکهاتەی سادە، دەچێتە ناو خڕۆکەی سپی خوێنەوە. خڕۆکەی سپی دوو جۆرن لەناو خوێندا، وەختێ ئینسانێك شوێنێکی بریندار دەبێ، یەکسەر کۆمەڵێك میکرۆب ڕوودەکەنە ئەو شوێنی برینە، لەو کاتەدا کۆمەڵێك خڕۆکەی سپی دێن وەکو پێشمەرگەی فیداکار بۆ ئەوەی ئەو میکرۆبە لەناویەرن، ئەو کۆمەڵە خڕۆکە سپییە ئەوە پێشمەرگەکانی ئەوەڵن، دەستەی یەکەمن، دێنە پێشەوەو قەراغەکانی برینەکە دەگرنو ناهێڵن میکرۆبەکە زۆرتر بێتە پێشەوە. ئەو خڕۆکە سپییانە چییان لەسەرە؟! بەرگری ئەو میکرۆبەیان لەسەرە کەدەیەوێ لەڕێگای ئەو

برینەوە بێتە ناو لەشەوە. پاشان خڕۆکەی تر دێن بەدوای ئەماندا، خەپلەیەکی گەورەتر، ئەوان دێن میکرۆبەکان دەکوژن، لەم کاتەدا میکرۆبی ئایدز خۆی دەدزێتەوەو دەڕوا بۆ جەبهەی خەلفی، بۆ بەرەی شەڕی دواوە، ئەو خڕۆکە سپییانەی کەچەکە ڕێزەکانیان پێیە، کە لەپێشترن، دێن بۆ کوشتنیان، لەناو ئەودا گەراکە دادەنێن، کەگەراکە دادەنێن، تەصەورکە ئەم کابرای نەخۆشە هەتا ماوەی حەوت بۆ دە ساڵ هەست بەوە ناکات نەخۆشیی ئایدز لەلەشیایەتی، هەتا وای لێدێ هەموو خانەکانی لەشی ئەم ئینسانە وردەوردە پڕدەبن لەمیکرۆبی ئایدز، هەریەك خانەی لەشی ئەم ئینسانە تووش بوو، ئەگەر بەقەدەر شوێنی یەك نووکە قەڵەم، یەك نووکە قەڵەم بدەی لەشوێنێك، قەبارەی شوێنی نووکە قەڵەمەکە چەندە، ئا ئەم حەجمە بچووکە یەك ملیۆن ڤایرۆسی ئایدزی تێدایە، ئەم ئینسانەی ڤایرۆسەکەشی هەڵگرتووە نازانێ کەهەڵیگرتووە، چونکە هیچ شوێنەوارێکی لەسەر لاشەی بەجێنەهێشتووە، بەڵام کاتێ لێی دەرکەوت هەیە، لەماوەی (16) مانگدا، هەیشە لەماوەی (2 ـ 3) ساڵدا، یان لەماوەی پێنج ساڵدا زۆر بەزەلیلی دەیکوژێ .

بەڵێ خۆشەویستان: ئەم نەخۆشیی ئایدزە لەڕێگای داوێن پیسییەوە تووشی ئینسان دەبێ، یان لەڕێگای چوونە لای ئافرەت لەپشتەوە، یان بەهۆی نێربازییەوە دروست دەبێ. یەکەم جار ئەم نەخۆشیە لەساڵی (1979)دا یەکەم حاڵەتی لەئەمریکا دۆزرایەوە. لەهەموو جیهاندا یەك کەس تووش بووبوو، دوای ساڵێك لە (1980)دا بوو بە (60) کەس. لەساڵی (1981)دا ژمارەی ئەو کەسانەی کەتووشی ئایدز بوون بوو بە (81433) کەس. لەو ساڵەدا ئەمریکا ڕایگەیاند کە لەووڵاتەکەیدا (53069) کەس تووش بووە، وە لەووڵاتی بەرازیل (23250) کەس تووش بووە، لەفەرەنساش (3073) حاڵەتی ئایدز دەرکەوت، لەئەڵمانیاش (1760) حاڵەتو لەئیطالیا (1411) کەس تووش بوون، لەبەریطانیا (1227) کەسو لەئیسپانیا (718) کەس تووش بوون بەنەخۆشیی سامناکی ئایدز! تەماشاکە چەند بەخێرایی بڵاودەبێتەوە، لەماوەی یەك ساڵدا لە (60) کەسەوە بوو بە (81433) کەس!!

ئیمانداران: ئایا ئەم نەخۆشیە بەهۆی چییەوە دەگوازرێتەوە لەیەکێکی تووش بووەوە بۆ یەکێکی تر؟! لەم ڕێگایانەوە بڵاودەبێتەوە:

1 ـ جووت بوونی ژن‌و پیاو که‌یه‌کێکیان هه‌ڵگری ڤایرۆسی ئایدز بێت. ئێستا ئیسرائیل (جووله‌که) ئه‌و ئافره‌تانه‌ی که‌تووشی ئایدز بوون" به‌کاریان دێنێ بۆ ئه‌منی قه‌ومیی خۆی, وه‌کو چه‌کێکی کوشنده ده‌ینێرێ بۆ سه‌ر وولآتانی تر, له‌جیاتی تۆپ‌و ته‌یاره ئافره‌تێکی داوێن پیسی تووش بوو به‌ئایدز ده‌نێرێته ئه‌و وولآته‌ی رقی لێیه‌تی, بۆئه‌وه‌ی له‌رێگای زیناوه به‌سه‌دان خه‌ڵك له‌ناوبه‌رێ. چونکه هه‌ر به‌یه‌ك جار زیناکردن له‌گه‌ڵ که‌سێکی تووش بوودا, ئینسانه ساغه‌که‌ش تووش ده‌بێ. ئافره‌تێکی گه‌رۆکی ئیسرائیلی, ئه‌ئه‌سکه‌نده‌ریه‌ی میصر, چاو له‌گه‌نجێکی میصری داده‌گرێ‌و ده‌یباته‌وه بۆ ئوتێله‌که, شه‌و له‌گه‌ڵیدا جووت ده‌بێ, به‌یانی زوو ئافره‌ته‌که ده‌رواو کارتێکی بۆ به‌جێ‌دێڵێ‌و لای پشتیه‌که‌ی ژێر سه‌ریه‌وه بۆی داده‌نێ, که‌لێی نووسراوه: (أهلاً وَسَهلاً في نادي الآيدز العالَمي), ئه‌وه جه‌نابیشت بووی به‌ئه‌ندامی یانه‌ی ئایدزی جیهانی! ئیتر کوره تازه له‌ناوچوو, ژیانی کۆتایی هات, ده‌بێ بۆ خۆی هه‌ر قوڕ بپێوێ, چونکه ووشه‌ی (ئایدز AIDS) ووشه‌یه‌کی کورت کراوه‌یه له‌چوار ووشه که‌ماناکه‌ی به‌کوردی واته: (تێکشکانی هۆکاره‌کانی به‌رگری سروشتی له‌لاشه‌دا), به‌واتایه‌کی تر: لاشه‌ی ئه‌و ئینسانه به‌ته‌واوی ده‌سته‌وستان ده‌بێ له‌به‌رده‌م ڤایرۆسی هه‌موو نه‌خۆشیه‌کداو توانای به‌رگری‌و چاکبوونه‌وه‌ی نامێنێ, ته‌نانه‌ت به‌رامبه‌ر به‌هه‌ڵامه‌تێکی سووك, له‌کاتێکدا لاشه‌ی ئینسان سه‌دان هۆکاری به‌رگری تێدایه!! (71 ـ 74٪)ی تووش بوون به‌هۆی زیناوه‌یه.

2 ـ بۆ گواستنه‌وه‌ی ئایدز, له‌رێگای ماچ کردن‌و لیکی ده‌می نه‌خۆشه‌که‌وه‌یه! ته‌نها به‌یه‌ك ماچ کردن, یان تێکه‌ڵاوبوونی لیکی ناو ده‌می نه‌خۆشه‌که, ئینسانه ساغه‌که‌ش تووش ده‌بێ, با زیناشی له‌گه‌ڵدا نه‌کردبێ.

3 به‌هۆی به‌کارهێنانی ده‌رزییه‌وه, ئه‌ویش به‌هۆی ئه‌و که‌سانه‌ی که‌مادده بێهۆشکه‌ره‌کان (المُخَدِّرات) به‌کاردێنن تووشی حاڵه‌تێکی نه‌فسیی وا ده‌بن که‌ده‌رزییه‌ك ده‌کرێ له‌وانه‌یه چه‌ند که‌س پێشتر هه‌ر به‌و ده‌رزیه له‌خۆیان دابێ, جا ئه‌گه‌ر یه‌کێك له‌و که‌سانه نه‌خۆشیی ئایدزی له‌گه‌ڵ بووبێ, که‌ده‌رزیه‌که چووه له‌شیه‌وه یه‌ك سه‌ره ده‌رزی" یه‌ك ملیۆن ڤایرۆس ده‌گوازێته‌وه!! کاتێ له‌که‌سێکی‌تری ساغ درا ئه‌وا به‌یه‌ك جار یك ملیۆن ڤایرۆسی ئایدز ده‌چێته له‌شیه‌وه‌و تووش ده‌بێ, (12 ـ 20٪)ی تووش بوون به‌ئایدز

بەهۆی بەکارهێنانی دەرزی مادە بێهۆشکەرەکانەوەیە.

4 - بۆ گواستنەوەی ڤایرۆسی ئایدز، لەڕێگەی تێکردنی خوێنەوەیە، کەیەك میلم خوێن دەتوانێ (100) هەزار ڤایرۆسی ئایدز بگوازێتەوە بۆ یەکێکی تر. لەساڵی (1986)دا، لەسعودیە، منداڵێکی شەش ساڵان کەپێویستی بەخوێن بوو، خوێنیان تێکرد، کەخوێنەکە لەشاری (سان فرانسیسکۆ)ی ئەمریکاوە هاتبوو، منداڵەکە لەو خوێنەوە تووشی ئایدز بوو، چونکە ئەو کەسەی خوێنەکەی لێ گیرابوو نەخۆشیی ئایدزی هەبوو.. پاشان لەساڵی (1989)دا دوو کەسی تر هەر لەڕێگەی تێکردنی خوێنەوە تووشبوون، کەیەکێکیان نەشتەرگەری گورچیلەی بۆ کرابوو، ئەوی تریشیان نەشتەرگەری سییەکانی، وەختێ خوێنیان تێکردن تووشی ئایدزەکە بوون، چونکە خاوەنی هەردوو خوێنەکە هەلگری ڤایرۆسی ئایدز بوون، (2 - 4٪)ی تووش بوون بەهۆی خوێنەوەیە.

خۆشەویستان: لەمانگی (10)ی ساڵی (1997)دا، کۆنگرەی چوارەمی نێودەوڵەتی بۆ بەرگریکردن لەبڵاوبوونەوەی ئایدز لەشاری (مانێلا)ی پایتەختی (فیلیپین) بەسترا، کەلەو کۆنگرەیەدا سێهەزار پسپۆڕو شارەزا لە (65) وڵاتی جیهانەوە بەشدارییان تێداکرد، کە لەکۆتایی کۆنگرەکەدا بەڕێوەبەری کۆنگرەکە کەناوی (بیکەر بیوت)* بوو، کەنوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان بوو لەکۆنگرەکەدا ڕایگەیاند کە: ژمارەی تووش بوان بەنەخۆشیی ئایدز لەساڵی (1996)دا گەیشتۆتە (23) ملیۆن حاڵەت!! کە (14) ملیۆنی لەباشووری بیابانی ئەفریقیادا بووەو (7) ملیۆنشی لەئاسیادا بووە، کە (5) ملیۆنی تەنها لە (هیند)دا دەرکەوتووە. وەسەرۆکی کۆنگرەکە داوایکرد کەڕێوشوێنی توندوتۆڵ بگیرێتەبەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئایدز لەئاسیادا، کەگوتی: تووش بوون بەئایدز لەئاسیادا دەتوانرێ ناو ببرێ بە (الكارِثَة التأريخية للآسيَويين) کارەساتی مێژوویی بۆ ئاسیاییەکان.. هەروەها لەکۆنگرەکەدا ڕاگەیەندرا کەهەڵگرانی میکرۆبی ئایدز لەناو منداڵاندا لەکۆتایی ساڵی (1997)دا گەیشتە یەك ملیۆن منداڵ!! یەك ملیۆن منداڵی بێتاوان لەسەرەتای بەهاری ژیانیاندا، گوڵی ژیانیان هەڵدەوەرێ، بەهۆی چیەوە؟ (90٪)ی ئەو منداڵانەی کەتووشی ئایدز دەبن بەهۆی دایکەکانیانەوەیە، ئەو ڤایۆسی ئایدزە لەڕێگەی دایکەوە دەگواسترێتەوە بۆ منداڵەکانیان لەکاتێکدا لەناو سکی دایکیدایە،

یان لەکاتی لەدایکبووندا لەڕێگەی خوێنەوە, یان لەڕێگەی شیرپێدانەوە منداڵەکە لەدایکیەوە ئایدزەکەی تووش دەبێت.

ئیمانداران: ئەوەی کەزیاتر مەترسی نەخۆشیی ئایدز دەردەخات ئەوەیە کەئەوەندە زوو دەگواسترێتەوە کەس ناتوانێ لەکەسی تووشبوو نزیك ببێتەوە, تەنانەت دوای مردنیش ئەو کەسانەی بەرپرسن لەشاردنەوەی مردوو دەستی لێنادەن, پزیشکەکان دەستکێش لەدەس دەکەن لەکاتی چارەسەرداو دوای لێبوونەوە دەستکێشەکان دەسووتێنن! هەروەها ئایدز دەردێکە کەچارەسەرکردنی یەك نەخۆش (پەنجا - سەد) هـــەزار دۆلاری دەوێت, درێژترین تـــەمـــەنی ئەو نـــەخـــۆشەش دوای تـــووش بوونی (2 - 3)ساڵە!

کەواتە: هەروەکو ژیانی ئەو کەسە لەناودەبات, سەروەتو سامانی نەك خۆی بەڵکو بنەماڵەو حکومەتەکەشی لەناودەبات! هەر بۆیە ئینسانی دڵسۆز بەخۆیو کۆمەڵگاکەیو حکومەتەکەیو گەلو وڵاتەکەی, ئەو کەسەیە کەداوێن پاکە, نەك هەر ئەوەندەش, بەڵکو وەکو خۆی پاك داوێنە, هەوڵی ئەوەش دەدات کەخەڵکانی تریش هەموویان داوێن پاك بن, وەهەموو ئینسانەکان لەبەدڕەوشتیو زیناوە دووربن, لەبەر ئەوەی ئەگەر هەندێ خەڵکی حاڵی نەبوو لەدینو ژین, دەڵێ: خۆ کەس ناچێتە قەبری کەسەوە, بزن بەپێی خۆی هەڵدەواسرێو مەڕ بەپێی خۆی! واتە: خۆت چاكو پاك بەو حەقی کەست نەبێ ,بەڵام ئەی ئەوە چی لێدەکەن کەوەکو باسمانکرد بەملیۆن خەڵکی بێئاگا, یان بێتاوان وەکو منداڵ, بەهۆی چەند کەسێکی داوێن پیسو بێدینەوە تووشی ئایدز دەبن! ئاخر ئەمانە هەر لەدونیادا خەڵکی دەخەنە ئەو قەبرەی کەخۆیان تێی چوون!

هەروەها دەبێ هەموو موسڵمانێکی هۆشیارو بێدار لەو ڕاستیە ئاگادار بێ کەهەموو ئەو کەسو لایەنانەی, هەموو ئەو گرووپو ڕێکخراوانەی کەدەیانەوێو بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کەبەرگی شەرمو ئابڕوو لەبەری ئافرەت دابڕنو برەو بەڕووتی ئافرەتو تێکەڵاوی نێرو مێ بدەنو زیناکردن بەئازادیی شەخصی ناودەبەن, ئەوانە شاگردو گوێڕایەڵی جوولەکەی عالەمینو دەیانەوێ کوردستان بەرەو ئەو پاشەڕۆژە سامناکە بەرن کەئەمڕۆ ئەورووپاو ئەمریکا پێوەی گیرۆدە بوونو پێوەی دەناڵێنن!

جێگای داخە کە لە (21/ 12/ 2003)دا, دکتۆر (خضر عبّاس) وەزیری تەندروستی عیراق ڕایگەیاند کەئێستا (واتە تا ئەو بەروارە) (72) کەسی عیراقی تووشی نەخۆشیی ئایدز بوون! کەئەگەر بەزوویی دەستی بەسەردا نەگیرێ, لەوانەیە لەماوەیەکی کورتدا ژمارەکە ببێتە هەزاران کەس! لەبەر ئەوەی بزانن ئەگەر یەك ڤایرۆسی ئایدز (7) سەعات لەخرۆکە سپییەکەدا بمێنێتەوە, ئەوا (10) ملیۆن ڤایرۆس دروست دەکات! جا کێ دەتوانێ بەرەنگاری ئەمە ببێتەوە؟! ئەمە غەزەبی خوایە هاتۆتە سەر خەڵکی, بۆیە ئێستا پێی دەڵێن: طاعون العَصر, واتە: تاعوونی سەردەم! هەمووشی سەبەبەکەی فەسادو خراپەکاریە. ئەوەتا لەووڵاتێکی وەکو (تایلەند) مانگی (500) منداڵ دەفرێندرێ بۆ ئەوەی ئیشی خراپەی لەگەڵ بکرێ! پاشان تەصویری بکەنو ئەمجا فیلمەکەی لەجیهاندا دەفرۆشنەوە! کێش ئەمە دەکا؟ گەورەترین سەرمایەدارەکانی ئەورووپا دەیکەن! ئەم هەموو زیناو خراپەکارییو فاحیشەیە ئەگەر خوانەخواستە ڕووبکاتە موجتەمەعی ئێمە, ئەوا هەڵیدەوەشێنێ! هەروەها زیناو داوێن پیسی جگە لەئایدز, نەخۆشیە کۆنەکانی تریشی پێوەیە, وەکو:

1 نەخۆشیی زەهری (السفلس): کەنەخۆشیەکی سارییەو دەبێتە هۆی کون بوونی ئەندامەکانی نەخۆشەکەو لەکۆتاییدا شێوەی ئینسانی لێهەڵدەگرێو لەئینسان ناچێ! (50) ملیۆن کەس لەجیهاندا گیرۆدەی ئەم دەردەیە.

2 ـ نەخۆشیی (سەیەلان): ئەمیش نەخۆشیەکی سارییەو زۆر زوو لەکەسێکی نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی ساغ, ئەم نەخۆشیەش زۆر بڵاوە لەجیهاندا, ساڵانە (80 ـ 200) بلیۆن دۆلاری دەوێ بۆ چارەسەر, تا ئێستا (250) ملیۆن کــــــــەس ساڵانە تووش دەبێت!

3 ـ هَربس الجنسي: ئەم نەخۆشیەش لەڕێگای زیناو نێربازییەوە بڵاودەبێتەوەو بەشێوەی خوراندنو دوومەڵو کێم لەسەر ئەندامەکانی ئەو نەخۆشە, بەتایبەت لەسەر ئەندامەکانی زاوزێ دەردەکەوێ, تا لەلایەکەوە چاك دەبێتەوە, لەلایەکیترەوە سەرهەڵدەدات! (20) ملیۆن کەس تووش بووە بەم دەردە لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا, ساڵانەش نیو ملیۆن زیاد دەکات! جا خۆشەویستانم: ئەوەی کەبەرگەی ئەو

لافاوی فەسادە دەگرێو دەمانپارێزێ تەنها ئیسلامە, ئیمانی خۆتان بەقوەت بکەن, ڕووتان لەخوا بێ, خواتان خۆش بوێ, ئیسلامەکەتان صادقانە وەربگرن, ترسی خوای گەورەمان ئەوەندە لەدڵدا بێ, لەترسی ئەو چاودێریەی ئەو" لەهەموو خراپەیەك دووربکەوینەوە.

برایانو خوشکانی خۆم, حەلێکی تر لەئیسلامدا نیە غەیری خۆپاراستن, پێشتر گوتوویانە: (دِرْهَمٌ في الوِقايَة, خَيْرٌ مِنْ قنطارٍ في العلاج), ئینسان ئەگەر بتوانێ بە (100) دینار خۆی بپارێزێ, چاکترە لەوەی کەدوایی (10) هەزار دینار بداتەوە بەچارەسەرکردنی. لەبەر ئەوە با پەیوەندیو تێکەڵاوی نێوان کوڕو کچ, عیلاقەیەکی سنووردار بێو تەجاوز نەکا.

ئـــــەوەش بزانن تاکـــــــە چارەســەر بۆ ســەرفرازیمـان, تەنـها گـەڕانـەوەیە بۆ ئیسلام ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَاراً﴾ (الاسراء 82).

خوایە لەبەر ناوە جوانەکانی خۆت, کۆمەڵگای کورد خاوێن بکەیتەوە لەهەموو ڕەوشتێکی پیسو چەپەڵو بمانگێڕیتەوە بۆ سەر شاڕێگەی ئیسلام..

اللّهُمَّ آمين

# ووتـارى ژماره بیستوسێ

# داوێن پـاكی

## بەشی شەشەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّه وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾

(النور 2)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم:

( لأنْ يَزْنيَ الرَّجُلُ بِعَشْرِ نِسْوَةٍ أيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أنْ يَزْنِي بِإمْرَأةِ جارِهِ )

( رَواهُ أحمَد )

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين, والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعلى آله وَصَحْبِهِ أجْمَعِينَ..**

ئیمانداران‌و خواناسان: سه‌لام‌و ره‌حمه‌تی خوا له‌ئێمه‌و له‌هه‌موو ئیمانداران بێت إنشاءَ الله, به‌رده‌وامین له‌زنجیره باسه‌که‌مان له‌ژێر ناونیشانی (داوێن پاکی) له‌ژێر رووناکیی وه‌صیه‌تی چواره‌می خوای په‌روه‌ردگاردا که‌فه‌رمووی: ﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحش مَا ظَهَرَ منْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾(الأنعام 151) ئه‌مرۆ به‌شی شه‌شه‌م‌و کۆتایی ئه‌و باسه شیرینه‌تان پێشکه‌ش ده‌که‌م إنشاءَ الله..

به‌رێزان: پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم ده‌فه‌رموێ: (ما مِنْ ذَنْبٍ بَعْدَ الشِّرْك أعْظَمُ عِنْدَ الله مِنْ نُطْفَةٍ وَضَعَهَا رَجُلٌ فِي رحِمٍ لا يَحِلُّ لَهُ), واته: له‌دوای هاوبه‌ش دانان بۆ خوای تاك‌و ته‌نها, هیچ گوناهێ به‌قه‌د ئه‌وه گه‌وره نیه که‌ئینسانێك نوتفه‌و مه‌نی خۆی بخاته ناو ره‌حمی ئافره‌تێکه‌وه که‌حه‌ڵاڵی خۆی نیه!

واته: زیناکردن گه‌وره‌ترین تاوانه‌و گوناهه لای خوای گه‌وره دوای شه‌ریك بۆ خوا بریاردان, ئه‌مه‌ش بۆ ئه‌وه‌ی که‌کۆمه‌ڵگا پاك بێ‌و دوور بێ له‌داوێن پیسی, وه‌هه‌موو که‌سێك له‌ناموس‌و ئابرووی خۆی دڵنیابێت. بۆیه له‌فه‌رمووده‌یه‌کی تردا که‌ئیمامی ئه‌حمه‌د (ره‌حمه‌تی خوای لێبێت) ریوایه‌تی کردووه, پێغه‌مبه‌ری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فه‌رموویه‌تی به‌صه‌حابه‌کان: (ما تَقُولونَ فِي الزِّنا؟!) ئێوه له‌باره‌ی زیناوه ده‌ڵێن چی؟! (قالُوا: حَرَّمَهُ اللهُ وَرَسُولُهُ فَهُوَ حَرامٌ إلى يَومِ القِيامَةِ), عه‌رزیان کرد: زینا گوناهێکی گه‌وره‌یه‌و خواو پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی حه‌رامیان کردووه‌و, هه‌تا رۆژی قیامه‌تیش هه‌ر حه‌رامه, پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فه‌رمووی: (لأنْ يَزْني الرَّجُلُ بِعَشْرِ نِسْوَةٍ أيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أنْ يَزْني بِإمْرَأةِ جارِهِ)(رَواهُ أحمَد), واته: ئه‌گه‌ر که‌سێك زینا له‌گه‌ڵ (10) ئافره‌تدا بکات, ئه‌وا هێشتا گوناه و تاوانه‌که‌ی له‌سه‌ر سووکتره له‌وه‌ی که له‌گه‌ڵ ژنی دراوسێ‌یه‌که‌ی خۆیدا زینا بکات! بۆچی؟! چونکه ده‌بوایه ئه‌م ئابرووی دراوسێ‌یه‌که‌ی خۆی بپاراستایه, نه‌ك پیسی بکات.

به‌ڵام خۆشه‌ویستان: ئایا ئه‌گه‌ر که‌سێك شه‌یطان خه‌ڵه‌تاندی‌و تووشی گوناهی داوێن پیسی بوو, تووشی زینابوو, ئایا حوکمی شه‌ریعه‌تی ئیسلام له‌و باره‌یه‌وه چیه؟ ئیمانداران: پێش وه‌ڵامی پرسیاره‌که, پێویسته ئه‌وه بڵێین که: خوای گه‌وره له‌سووره‌تی

(النور)دا لەقورئانی پیرۆزدا, لەدوای ئەوەی فەرمان بەپیاوان‌و ژنانی ئیماندار دەکات کەچاوی خۆیان‌و داوێنی خۆیان لەحەرام بپارێزن, هەروەها ئافرەتانی موسڵمان پۆشاکی شەرعییانە لەبەربکەن‌و سەرو سنگ‌و لاشەی خۆیان بۆ نامەحرەم دەرنەخەن, وەکو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ﴾ (النور 30) هەتا کۆتایی ئایەتەکان کە لەکۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾(النور 31). واتە: ئەی ئیمانداران, هەمووتان بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن. کەواتە: خوای گەورە کە لەهەموو کەس باشتر دروستکراوەکانی خۆی دەناسێ, دەزانێ ئینسان تووشی ڕوانینی (نەزەر)ی حەرام دەبێ, تووشی زینا دەبێ‌و لەڕێگە لادەدا, بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای گەورە ئەوەندەبەڕەحمە کە لەهەموو کاتێکدا دەرگای تەوبەی بۆ بەندەکانی لەسەر پشتەو دەفەرموێ ئەگەر کەوتنە زۆنگاوی داوێن پیسی‌یەوە, جارێکی تر وەرنە دەرەوەو تەوبە بکەن‌و بێهیوا مەبن لەڕەحم‌و لێخۆشبوونی خوا.

خۆشەویستان: با بچینە خزمەت فەرموودەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم, با بپرسین‌و بزانین ئایا لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامدا" کەهێشتا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, لەناو ئومەتەکەیدابەی‌وپەیتا پەیتا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دێنە خوارەوە, ئایا لەم کۆمەڵگایەدا ڕووی داوە زینا کرابێ‌و ئایا کەتەوبەیان کردووە خوا لێیان خۆشبووە؟! فەرموون با بەیەکەوە گوێبیستی چەند فەرموودەیەك بین.

ئیمانداران: ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەصەحابی خۆشەویست‌و ئازیز عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ژنێك لەهۆزی (جوهەینە) زینای کردبوو, منداڵێکی زۆڵیش لەسکیدابوو, ئەم ئافرەتە هاتە خزمەتی حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (أَصَبْتُ حَداً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ), شایانی حەددم, حەددم لێ بدە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کەزانی لەزیناکە حەملیشی هەیە, بانگی حەقداری ژنەکەی کردو فەرمووی: ئەم ژنە بەدان پێدانانی خۆی زینای کردووەو منداڵیش لەسکیدایە, لەبەر ئەوە بیبەرەوە بۆ ماڵەوەو (أَحْسِنْ إِلَيْهَا, فَإِذَا وَضَعَتْ فَأْتِنِي) زۆر باش بە لەگەڵیداو سووکایەتی پێ مەکەو قسەی

ناشیرینی پێ مەڵێو خزمەتی بکە، هەتا کاتێ سکەکەی لێدەبێتەوە، ئەو کاتە بیهێنەوە بۆ لام. بەڵێ لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم، کابرای حەقداری ژنەکە، ژنەکەی بردەوە ماڵەوەو زۆربۆی باش بوو، تاوەکو سکەکەی دانا، ئەمجا هێنایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم، حەزرەت فەرمانی دا ژنەکەیان بەجلەکانی خۆی بەستەوە، هەتا لەکاتی بەردباران کردندا لەشی دەرنەکەوێ، ئینجا فەرمانی دا بەردەبارانیان کرد تاوەکو مرد، پاشان کفنیان کردو پێغەمبەری خوا نوێژی مردووی لەسەر کرد، لەو کاتەدا ئیمامی عومەر فەرمووی: (تُصَلّي عَلَيْها يا رَسُولَ الله وَقَدْ زَنَتْ؟)، ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو ژنە زینای کردووە کەچی تۆ نوێژی مردووی لەسەر دەکەی! پێغەمبەری خوا فەرمووی: (لَقَدْ تابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ المَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جادَتْ بِنَفْسِها لله عَزَّ وَجَلَّ؟!) فەرمووی: بەڕاستی ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی وەهای کردووە، ئەگەر بێتو دابەش بکرێ بەسەر حەفتا کەس لەخەڵکی مەدینەدا بەشی هەموویان دەکا، ئایا تەوبە لەوە باشتر دەبێ چی بێ کەگیانی خۆی بەخشی لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورەدا؟!

خۆشەویستان: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسی زیناکار (نێر بێ یان مێ)، پێشتر ژنی هێنابوو، یان شووی کردبوو، حەڵاڵی خۆی بینیبوو، کە لەشەرعدا پێی دەووترێ (مُحْصَنْ) ئەوە ئەگەر زینای لەسەر جێگیر بوو، پێویستە لەشوێنێکی فراوانو دەشتدا بوەستێنرێو خەڵکێکی زۆر کۆبکرێتەوەو لەلایەن ئەو خەڵکەوە بەردباران بکرێ هەتا لەژێر بەردبارانداندا دەمرێ.

کەواتە: شەرع فەرمانی نەکردووە بەشمشێر لەسەری بدرێو ملی بپەڕێندرێو بەماوەیەکی کەم ڕۆحی دەرچێ، یان بەگوللە بکوژرێ، بەڵکو پێویستە ئاوا بەردباران بکرێ، بۆ ئەوەی تامی ئازار بچێژێ هەروەکو هەموو لاشەی لەزەتو خۆشیی زیناکەی پێگەیشتووە بەحەرامی. کەواتە پێویستە ئەو ئازاری ڕۆح دەرچوونە هەموو لەشی بگرێتەوە، هەر بۆیە زانایانی شەرع دەفەرموون: دروست نیە بەبەردو تاوێری گەورە ڕەجم بکرێ، چونکە زوو دەمرێو نەجاتی دەبێ، هەروەکو دروست نیە کە بەبەردی بچکۆلەی زۆر بچووکیش ڕەجم بکرێ، چونکە ئەمە مردنەکەی دوادەخاتو درەنگ پێی دەمرێو

ئازارەکەی زۆرتر دەبێ، بەڵکو دەبێ بەردەکان مام ناوەندی بن بۆ ئەوەی ئازاری تەواو بچێژێ، پاشان بمرێ.

هەروەها ئەگەر کەسێك زینای لەسەر ئاشکرابوو، ئەو کەسە کوڕبوو هێشتا ژنی نەهێنابوو، یان کچ بوو هێشتا شووی نەکردبوو، ئەوە بەفەرموودەی قورئان کەدەفەرموێ: ﴿ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور 2)، واتە: سەد قامچی لەهەریەك لەئافرەتو پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لەبەجێهێنانی فەرمانی خوا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوە، با دەستەیەکیش لەئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن.

بەڵێ دوای ئەوەی سەد دارەکە لەو کچە یان کوڕە دراو پێی نەمرد، ئەوە لەو تاوانە پاك دەبێتەوە، بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەپێویستە بۆ ماوەی ساڵێکیش ئەو کەسە لەشوێنی ژیانی دووربخرێتەوەو لەبەرچاوی کەسوکارەکەی نەهێڵرێ، پاش ساڵەکە ڕووداوەکە لەبیردەچێتەوە ئەمجا دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی ژیانی پێشووی. بەڵام ئیمام ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەلایەوە وایە کەئەو دوورخستنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونی پێشەوای موسڵمانان، ئەگەر بەپێویستی زانی دووری دەخاتەوەو ئەگەر بەپێویستی نەزانی کەدووربخرێتەوە ئەوە وازی لێدێنێ!

هەروەها دروست نییە خوێن (پارە)، یان ئافرەت لەجیاتی نەکوشتنی زیناکەر (ئەگەر پیاو بێ یان ژن بێ) وەربگیرێو سوڵحی لەسەر بکرێ، بەڵکو ئەگەر ئاشکرابوون بەچوار شاهیدی پیاو، یان ژنەکە سکی هەبوو (کچ بێ یان ژن بێو مێردی نەمابێ) یان خۆیان ئیعترافیان کرد کەزینایان کردووە، ئەگەر کوڕو کچ بن وەکو گوتمان دەبێ (100) داریان لێبدرێو ئەگەر ژن دارو مێرددداریش بن (مُحْصَنْ) بن دەبێ ڕەجم بکرێنو بکوژرێن. کەواتە نابێ سوڵح بکرێو پارە یان کچ لەجیاتی وەربگیرێ، ئەگەر شتی وا کرا حەرامە، هەروەکو لەهەردوو صەحیحی (بوخاریو موسلیم)دا (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) هاتووە کەپیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو کابرایەکی تری لەگەڵدابوو، عەرزی پێغەمبەری خوای کردو گوتی: کوڕێکی من لەلای ئەم پیاوە ڕەنجبەربوو (لەئەنجامی زۆر مانەوەی لەماڵەکەیداو

تێکەڵاوی لەگەڵ ژنەکەیدا) ژنی ئەم پیاوەی خراپ کردووەو زینای لەگەڵدا کردووە، بەمنیان گوت: کەدەبێ کوڕەکەی من ڕەجم بکرێ، جا منیش بۆ ئەوەی کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ سەد سەر مەڕو کەنیزەکێکم دا بەم پیاوە. بەڵام لەپاشان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە لەزانایانم پرسی، گوتیان: کەکوڕەکەی من سەد داری حەددی لێ دەدرێو ساڵێك دوور دەخرێتەوە، وەژنەکەی ئەم پیاوەش بەردباران (ڕەجم) دەکرێ. پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: بەڵێ، کەنیزەكو سەد سەر مەڕەکە دەدرێتەوە بەتۆ، کوڕەکەت سەد داری حەددی لێدەدرێو ساڵێکیش دووردەخرێتەوە. پاشان حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم بانگی ئەنەسی کردو فەرمووی: ئەی ئونەیس تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆ لای ژنەکەی ئەم کابرایەو ئەگەر هاتو دانی نا بەئیشەکەدا (زیناکەدا) ئەوا بەردبارانی بکەن. جا کەئونەیس چوو بۆ لای، ژنەکە ئیعترافی کرد کەبەڵێ زینای لەگەڵ ئەو کوڕە ڕەنجبەرەی خۆیاندا کردووە، ئەویش لەسەر فەرمانی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم بەردبارانیکرد تا مرد..

ئیمانداران: هەروەکو لەسەرەتاوە گوتمان، ئەگەر کەسێك شەیطان فریویداو کەوتە زەلکاوی داوێن پیسیەوە، ئەوا ئەگەر بەدڵ تەوبە بکاتو بڕیار بدات کەجارێکی تر ئیشی وا نەکاتەوەو لای کەس نەیگێڕێتەوەو هەرکات بەبیری هاتەوە، خۆی بەخەجاڵەت بزانێ بەرامبەر بەخوای گەورە، ئەوا إِنْشاءَ الله خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، هەروەکو لەم فەرموودانەدا دەردەکەوێ:

جارێکیان کابرایەکی پیر، کە لەبەر پیری" بڕۆکانی هاتبوونە سەر چاوی، هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: کابرایەك هەرچی خراپەو تاوانە کردوویەتی، هەرچی بێشەرعیو کاری ناڕەوا بۆی ڕێکەوتبێ درێغی لێنەکردووە، ئەم کابرایە ئەوەندە گوناهبارە، ئەگەر گوناهەکانی بەسەر هەموو ئەهلی سەر زەویدا دابەش بکرێن، لێیان زیاد دەبێ! ئایا ئەگەر بەم هەموو گوناهەوە تەوبە بکات، خوا لێی خۆش دەبێ؟! (پیاوەکە مەبەستی خۆی بوو)، پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئایا موسڵمان بوویت؟ پیاوەکە گوتی: من بەڕاستیو لەدڵەوە بڕوام هەیەو بەزمانیش دەڵێم: أَشْهَدُ أن لا إِلهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.. شایەتی

دەدەم کەهیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێ جگە لەزاتی الله، ئەو خوایە هیچ هاوبەش‌و شەریکی نیە، وەمن شایەتی دەدەم کەحەزرەتی محمد بەندەو عەبدی خوایەو پێغەمبەری خوایە.. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (فَإِنَّ اللهَ غافِرُ لَكَ ما كُنْتَ كَذلِكَ، وَمُبَدِل سَيِّئاتكَ حَسَنات)، فەرمووی: ئەی مامە پیرە بزانە کەمادام تۆ ئاوا ئیمانت بەخواو بەپێغەمبەرەکەی هێناوەو خۆت بەتاوانبار دەزانی‌و لەقاپی خوا تەوبە دەکەی، ئەوا موژدەت لێبێت خوای گەورە لەهەموو گوناهەکانی ڕابردووت خۆش دەبێت‌و هەرچی خراپەشتە بۆت دەکات بەچاکە! کابرا بەسەرسوورمانەوەو لەخۆشییان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا خوا هەموو تاوان‌و خراپەکارییەکانم بەم ئیمان هێنان‌و تەوبەکردنە بۆ دەگۆڕێت بەچاکە؟ فەرمووی: بەڵێ دڵنیابە. صەحابەکان دەفەرموون: کابرا پیرە لەخۆشیی ئەم موژدەیە ڕۆیشت‌و لەڕێگادا هەر دەیگوت: اللهُ أكْبَرْ.. اللهُ أكْبَرْ، هەتا لەچاوان ون بوو. ( ئەم بەسەرهاتە لەتەفسیری إبن كثير، ج6، ص117 دا هاتووە)

صەحابی ئازیزو خۆشەویستی هەموو ئیمانداران، حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

شەوێکیان ئافرەتێك هات بۆ لام‌و گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە، من هاتوومە خزمەتت پرسیارێکت لێبکەم، چونکە تۆ زۆر لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ماویتەوەو شارەزاییەکی باشیشت لەقورئان هەیە، منیش گوتم: فەرموو پرسیارەکەت بکە، ئافرەتەکە گوتی: (إِنِّي زَنَيْتُ، وَوَلَدْتُ وَقَتَلْتُهُ، فَهَلْ لي مِنْ تَوْبَةٍ؟!) من زینام کردووە، لەئەنجامی ئەو زینایەدا منداڵم بوو، منداڵەکەشم کوشت! ئایا ئەگەر ئێستا تەوبە بکەم‌و بگەڕێمەوە بۆ لای خواو جارێکی تر لەژیانمدا گوناهی وا نەکەمەوە، ئایا تۆبەم بۆ هەیەو خوا لێم خۆش دەبێت؟! منیش زۆر ڕقم لێی هەستاو گوتم: یاخوا خوا لەناوت بەرێ بۆ ئیشێك کردووتە، جا تازە دوای چی تەوبە دەکەی؟ نەخێر خوا تەوبەت لێ قبووڵ ناکات! ئافرەتەکە دڵی پڕ بوو، دەستیکرد بەگریان‌و بەنووکەنووك دوورکەوتەوەو ڕۆیشت، منیش بۆ نوێژی بەیانی چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، تەواوی بەسەرهاتەکەی ئافرەتەکەو وەڵامەکەی خۆمم بۆ گێڕایەوە، خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (بِئْسما قُلْتَ، أما كُنْتَ تَقْرَأُ هذِهِ الآيَةَ: وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ

إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً, يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً, إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە بەڕاستی خراپترین وولامت داوەتەوە, خۆ تۆ قورئان خوێنی, ئەی ئەم ئایەتە قورئانیەت نەخوێندۆتەوە کەخوای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کەشەریكو هاوبەش بۆ خوا بڕیار نادەنو لەگەڵ خوای تاكو تەنهادا کە(الله)یە هیچ خوایەکی تر ناپەرستنو هیچ کەس ناکوژن بەناحەقو زینا ناکەن, ئەمانە بەندە چاکەکانی خوای گەورەن, وەهەر کەسێك ئەم گوناهانە بکات ئەوە تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دونیاو قیامەت دەبێ, مەگەر ئەو کەسەی کەتەوبە لەم گوناهە گەورانە بکاتو ئیمان بێنێو کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات, ئا ئەو تۆبەکارانە خوای گەورە کارو کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە, چونکە هەمیشە خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە ﴿ الفرقان 68 ـ 70 ﴾.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە, ئەم ئایەتانە موژدەی لێخۆشبوونیان پێیە بۆ ئەو ئافرەتەو هەموو ئەو کەسانەش کەوەکو ئەو ئافرەتەن, بریا ئەو موژدە خۆشەت پێ بدایەو ئاوا مەئیووسو بێئومێدت نەکردایە.

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: زۆر خەمبار بووم کەچۆن بەنەزانیو هەر لەخۆوە دڵی ئەو ئافرەتە تۆبەکارەم ڕەنجاند, بۆیە لەخزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هەڵسامو هەموو چواردەوری شاری مەدینە گەڕام تا دۆزیمەوە, ئەمجا بانگم کردو قسەم بۆ کردو موژدەکەی خواو پێغەمبەری خوام پێڕاگەیاند. ئافرەتەکە کەهەموو چاوی سوور بووبوو ئەوەندە فرمێسکی ڕشتبوو ڕەنگ بەڕوویەوە نەمابوو, کەئەم موژدە خۆشەی بیست کەخوا لێی خۆش دەبێ, دەموچاوی گەشیو خۆشی کەوتە ناوو یەکسەر بەسوجدەدا کەوت بۆ خواو فەرمووی: (الحَمْدُ لله الَّذي جَعَلَ لي مَخْرَجاً), هەزاران جار سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کەدەرگای ڕەحمەتو لێخۆشبوونی لەمنو ئەمسالی من کردۆتەوەو لەقاپی ڕەحمەتو لێخۆشبونی خۆی نائومێدی نەکردم.

ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: دوای ئەوەش ئەو ئافرەتەم دەبینیەوە ئافرەتێکی هەتا بڵێی خواپەرستو ڕێکوپێکی لێ دەرچوو, الحَمْدُ لله..

ئیمانداران: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ, ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو کەسەی کەتووشی گوناه و تاوانی زینا بووەو داوێن پاکیەکەی پەڵەدار بووە, بەڵام غەیری خوا کەس پێی نەزانیوەو کارە خراپەکەی ئاشکرا نەبووە, ئایا ئەم کەسە وا باشە بۆی کەبچێ خۆی تەسلیمی حوکمی شەرع بکات بۆ ئەوەی حەددی لێ بدا یان ڕەجمی بکا, یان لەنێوان خۆیو خوادا تەوبە بکاو باسی نەکاو بیشارێتەوە, کامیان باشە؟

لەووڵامدا دەڵێین: خوای گەورە پێی خۆشە بیشارێتەوەو لەنێوانی خۆیو خوادا تەوبە بکاو باسی نەکاو لای کەس نەیگێڕێتەوەو خۆی تەسلیمی مەحکەمەی شەرعی نەکات, مادام خوا پەردەی بۆ بەسەر داداوەو حەیای نەبردووە با بۆ خۆی پەردە لەسەر خۆی لانەبات *, بەتایبەتی لەزەمانی ئێستادا کەمەحکەمەی شەرعی نیە تا جەڵدە یان ڕەجم جێبەجێ بکات, بەڵکو ئەگەر ئاشکرا ببێ, یان کوشتنەو سوڵح کردنە وەکو عادەتی عەشایەری کەحەرامەو ناشەرعیە, یان حکومەت زیندانی دەکات, کەئەمەشیان هەر پێچەوانەی حوکمی خوایە دەربارەی ئینسانی زیناکار. کەواتە: لەم ڕۆژگارەدا واجبە باسی نەکاو لەنێوان خۆیو خوادا تەوبەبکاو هەرکات بەبیری هاتەوە, سەری خەجاڵەتیو پەشیمانی بەرامبەر خوای گەورەو باڵادەست نەوی بکاو سوپاسی خوا بکا کە بەلوتفی خۆی کارەکەی بۆ پەردەپۆش کردووەو کەس پێی نەزانیوە. دوو نموونەتان بۆ باس دەکەم کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ڕوویان داوە, کەیەکێکیان پیاوێکەو ئەوی تریان ژنێکە, دوای ئەوەی تووشی زینا دەبن دێنە خزمەت پێغەمبەری خواو داوا دەکەن ڕەجم بکرێن, بەڵام تەماشا دەکەین پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم حەز بەوە ناکات, بەڵکو هەوڵدەدات لەبیریان بەرێتەوەو باسی نەکەن.

ڕووداوی یەکەمیان ئەوەیە کەماعیزی ئەسلەمی (ڕەزای خوای لێبێت) تووشی زینا بوو, کەس پێی نەزانیو ئاگای لێی نەبوو, بەڵام لەترسی خوا بەپێی خۆی هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا زینام کردووەو هاتووم خاوێنم بکەیتەوە. پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم وەڵامی نەدایەوە بەڵکو ڕووی کرد بەولاوە بۆ ئەوەی واز لەو قسەیە بێنێ, بەڵام ماعیز لەولاوە چووە بەردەمیو عەرزی کردەوە کەداوێن پیسی کردووەو دەبێ پاك بێتەوە, دیسان حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم وەڵامی نەدایەوەو ڕووی

لێوەرگێڕایەوە, بەڵام دیسانەوە ماعیز ڕۆیشتەوە بەردەمیو عەرزیکردەوە کەداوێن پیسی کردووە. پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەوە شێت بوویت؟ گوتی: قوربان هۆشم لای خۆمەو زینام کردووە. پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: دەبڕۆ کەس پێی نەزانیوی, خۆ شاهیدت لەسەر نیە (لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ) فەرمووی: ڕەنگە هەر ماچت کردبێ, یان نقورچت لێ گرتبێ, یان تەماشات کردبێ, زینات نەکردبێ! پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم بەدەمی موبارەكو ڕەئفەتو ڕەحمەتی دەیویست ئەو گەنجە حوکمی شەرعی بەسەردا نەچەسپێ, چونکە کەس پێی نەزانیوە, لەنێوانی خۆیو خوادا تەوبە بکا باشترە, بەڵام ماعیز هەر سوور بوو لەسەر وەرگرتنی سزای گوناهەکەیو گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا, بەخوا ئەوانە هیچی نەبووە, بەڵکو من زینام کردووەو دەزانم زینا چۆنە. ئەوجا پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئایا ژنت هێناوە؟ گوتی: بەڵێ, ئەوجا پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمانی کرد بردیان بۆ لای خرە بەرداوییەکە, کەپێی دەڵێن (ئەلحەڕە)و لەوێ بەبەرد بەردەبارانیان کرد. جا کاتێ بەردەکان ئێشیان پێگەیاند ماعیز هەڵهاتو بەتوندی ڕایکرد. جا پیاوێك کەوتە شوێنیو شەویلاگەیەکی حوشتری پێبوو, بەوە لێی داو خەڵکەکە لێیان دا هەتا مرد.

جا کەئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم گێڕایەوە فەرمووی: بریا وازتان لێ بهێنایەو ڕاییکردایەو نەتانکوشتایە! پاشان لەبارەی ماعیزەوە صەحابەکان بوون بەدوو دەستەوە, دەستەیەکیان دەیانگوت ڕەنگە خوا تەوبەی لێ قبووڵ نەکا, چونکە پەردەی خوای لەسەر خۆی هەڵداوەتەوەو نهێنی خۆی بپۆشیایە باشتر بوو, دەستەیەکی تریشیان دەیانگوت: خوای گەورە تەوبەی لێ قبووڵ دەکاو پاك بۆتەوە. کاتێ ئەم دەنگوباسە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (لَقَدْ تابَ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَیْنَ أُمَّةٍ لَوَسِعَتْهُمْ), واتە: بەڕاستی ماعیز تەوبەیەکی وەهای کرد ئەگەر بێتو دابەش بکرێ بەسەر نەتەوەیەکی گەورەدا بەشی هەموویان دەکات, پیرۆزی بێ تەوبەی بەڕاستی (رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم وَالترمذي).

ڕووداوی دووەمیشیان ئەوەبوو, ئافرەتێك لەهۆزی (غامدیە) کەپێی دەگوترێ (المَرْأَةُ الغامِدِیَّة) هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد من زینام کردووەو هاتووم پاکم

بکەیتەوە، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ڕووی لێ وەرگێڕاو فەرمووی: بڕۆ لەنێوانی خۆتو خوادا تەوبەبکە، مادام کەس پێی نەزانیوی هەر باسی مەکەو پەردەی لەسەر لامەدە. ئافرەتەکە ڕۆیشتو دوای چەند ڕۆژێك هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من نەك هەر زینام کردووە، بەڵکو سکیشم پڕ بووە لەزیناکەو کۆرپەکە لەسکمدا دەجووڵێتەوە. پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: دەی مادام سکت هەیە هەر نابێ ڕەجم بکرێیو بکوژرێی، بڕۆرەوە هەتا منداڵەکەت لێ نەبێتەوە نەیەیتەوەو باسی نەکەی. بەڵێ دوای ئەوەی ئافرەتەکە منداڵەکەی بوو، مەلۆتکەکەی بەباوەشەوە گرتو هاتەوە، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: جارێ حەقی ئەم منداڵە لەپێش حەقی خواوەیە، بڕۆ دوو ساڵی تەواو شیری بدەیەو هیچ قسە مەکە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، لەهەموو ئەم ناردنەوانەدا مەبەستی ئەوەبوو ئەم ئافرەتە ڕەجم نەکرێو لەنێوان خۆیو خوادا تەوبە بکاو بیشارێتەوە، بەڵام ئەم ژنە لەم هەموو ماوەیەدا قەت لەبیری نەچوو کەحەقێکی خوایی بەسەرەوەیە، چونکە شەوو ڕۆژ ئەم دڵە بێدارەو ویژدانە ووشیارەی ئازاری دەداو پێی دەگوت: تۆ گوناهێکی زۆر گەورەت کردووەو پیس بووی، دەبێ خاوێن ببیتەوە. هەربۆیە دوای دوو ساڵ هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە منداڵەکەم لەشیر براوەتەوەو نان دەخوا، دەی ئێستا پاکم بکەوە. پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: دەی کەهەر سووری لەسەر داواکەت با چاڵێکت بۆ هەڵکەنن‌و بتخەنە ناویەوە تەنها سەرت بەدەرەوە بێ، ئەمجا بەردبارانت بکەن تا گیانت دەردەچێ. ئافرەتەکە گوتی: بەکوشتن‌و لەناوچوونی خۆم ڕازیم، بەمەرجێ خوا لێم خۆش ببێو لەو تاوان‌و گوناهە گەورە پاکم بکاتەوە.

بەڵێ ئافرەتەکە بەردباران کراو یەکێ لەوانەی بەشداری بەردبارانەکەی کرد، حەزرەتی خالیدی کوڕی وەلید بوو، بەردێکی بەسەری ئافرەتەکەدا دا، خوێنی لەسەری هێناو خوێنەکە بەجلوبەرگی خالیددا هەڵپڕژا، خالید فەرمووی:ئەی لەعنەتی خوات لێبێت! پێغەمبەری خوا کەگوێی لەم قسەیەبوو زۆر تووڕەبوو، فەرمووی: ئەی خالید چۆن قسەی وا دەکەی، سوێند بەخوا ئەو ژنە تەوبەیەکی وای کردووە ئەگەر دابەش بکرێ بەسەر (90) لەبنەماڵەکانی شاری مەدینەدا، بەشی هەموویانی دەکرد، ئایا تۆبە دەبێ لەوە

گەورەتر چی بێ کەگیانی ببەخشێ لەپێناوی ئەوەدا کەخوا لێی ڕازی بێو ڕووڕەشی قیامەت نەبێ!!

بەڵێ ئیمانداران: ئەم ئیسلامە پیرۆزە تاکە دینێکە کەفیطرەتی ئینسان دەناسێت, ئیسلام دینێکە دەزانێ ئینسان ئینسانە نەك مەلائیکەی بێتاوان, بەڵکو گەلێ جار تووشی هەڵە دەبێو پێی دەخزێ, بەڵام گرنگ ئەوەیە لەسەری بەردەوام نەبێو نەبێ بەشەیطانی ڕەجیم, بەڵکو ئەگەر گوناه و بێشەرعی کرد زوو تەوبە بکاو نەهێڵێ دڵی ڕەش ببێو لایەنی شەیطانی زاڵ ببێ بەسەر لایەنی فریشتەیی دا.

هەروەختێکیش ئینسان وەکو ئەو نموونانەی باسمان کردن ئاوا تەوبەیەکی بەدڵو بەگیانی کرد, ئەوا خوای گەورە نەك هەر مژدەی لێخۆشبوونی دەداتێ, بەڵکو لەوەش خۆشتر ئەوەیە کەدەفەرموێ: ﴿ فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ﴾ (الفرقان 70), لەتەفسیری (ئبن کەثیر)دا, لەسەر ئەم ئایەتە دوو بۆچوون لەلای زانایان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: خوای گەورە لەجیاتی ئەو کارو کردەوە ناشیرینو ناشەرعیانەی کەلەوەو پێش کردوویانە, بەو تەوبە ڕاستەقینەیە خوای گەورە بۆیان دەگۆڕێت بەکارو کردەوەی جوانو هیدایەتیان دەدا کەحەز بەکردەوەی چاکەبکەنو بێزاربن لەکردەوە خراپەکانی ڕابردوویان. واتە: لەوەوپێش چەندە حەزو ئاواتیان لەخراپەو تاوان بوو, وە هەوڵیان بۆ دەدا, لەدوای ئەم تەوبە نەصوحەوە خوای گەورە کردەوەی جوانیان لا شیرین دەکاتو هەوڵ بۆ چاکەو پاکی دەدەن.

بۆچوونی دووەم: زانایان دەفەرموون, مانای ئایەتی ﴿ فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ﴾ ئەوەیە وَاللهُ أعْلَمْ: کەهەرچی خراپەیەك لەنامەی کردەوەکاندا لەسەریان تۆمارکراوە, بەو تەوبە ڕاستەقینەیە, خوای گەورە هەموویان بۆ دەگۆڕێ بەچاکەو هەمووی بەچاکە بۆیان دەنووسرێ! ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەتەوبەکاری ڕاستەقینە هەروەختێ ئەو گوناه و بێشەرعیانەی کە لەپێش تەوبەکەیدا کردوونی بەبیری هاتنەوە, ئەوا پەشیمانیو تەریق بوونەوەو داوای لێخۆشبوون لەخوا دووبارە دەکاتەوە. ئەمەش کەئینسان تەوبە بکاو خۆی بەخەجاڵەتی قاپی خوا بزانێ بۆ خۆی عیبادەتێکی گەورەیە. کەواتە ئەو تەوبەکارە لەڕۆژی قیامەتدا هەرچەندە دەبینێ لەنامەی کردەوەکانیدا ئەو

گوناهە تۆمارکراوە, بەلاّم هیچ زیانی لێناداو تەماشا دەکات خوا لەجیاتی هەموو خراپەیەك کەپێش تەوبەکەی کردوویەتی, بەو تەوبەیە خوای گەورەو بەڕەحم بۆی کردووە بەچاکە.

صەحابی خۆشەویست, حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ بِأُناسٍ يَوْمَ القِيامَةِ, رَأَوْ أَنَّهُمْ قَدْ إسْتَكْثَرُوا مِنَ السَّيِّئاتِ, قيلَ مَنْ هُمْ يا أَبا هُرَيْرَةَ؟! قالَ: الَّذينَ يُبَدِّلُ اللّهُ سَيِّئاتِهِمْ حَسَنَاتٍ), واتە: لەڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێك لەخەڵکی دەبرێنە بەردەم خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالى, ئەمانە خۆزگە دەخوازن کە لەدونیادا پێش گەڕانەوەیان بۆ لای خواو تەوبەکردنیان, گوناهیان زۆرتر بوایە! گوتیان ئەوە ئەو کەسانە کێن ئەی ئەبی هورەیرە؟! فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن کەگوناه و تاوانی زۆریان کردووە, بەلاّم دوایی پەشیمان بوونەوەو تەوبەیەکی ڕاستەقینەیان بەدڵ کردووەو دەستیان کردووە بەکارو کردەوەی چاکەو وازیان لەڕەفتارە خراپەکانی ڕابردوویان هێناوەو بوون بەئینسانێکی نوێ چاكو پاك لەدینو ژیندا, خوای گەورەش هەرچی خراپەیەك پێشتر کردوویانە هەموویان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە! جا کەسەیر دەکەن ئەم هەموو چاکەیەی کەبۆیان نووسراوە, هەمووی خراپەکانی ڕابردوویانە, خوا بەلوطفی خۆی بۆی گۆڕیون بەچاکە, دەڵێن خۆزگە خراپەکانمان زۆرتر بوایە, ئێستا چاکەکانمان زۆرتر دەبوون.

یەکێ لەتابعین کەناوی (أبو الضَّيف) بوو کەیەکێکە لەقوتابیانی صەحابی بەڕێز مەعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێت), دەفەرموێ: ئەهلی بەهەشت سێ کۆمەڵو دەستەن, یەکەم: المُتَّقين, کەپێغەمبەرانو ئەولیاو صالحەکانن, دووەم: الشّاكِرين, ئەوانەن کەچاکەیان هەیە, بەلاّم خراپەشیان هەیە, خوای گەورە لەتاوانەکانیان خۆش دەبێو بەلوطفی خۆی دەیانباتە بەهەشتو ئەوانیش بەردەوام شوکرانەی خوا دەکەن لەسەر ئەوەی کە لەگوناهەکانیان خۆش بووەو بەهەشتی پێ خەلاّت کردوون, سێیەم: أصْحابُ اليَمين, ئەمانەش ئەو کەسانەن کە لەدونیادا خراپەو گوناهی زۆریان کردووە, بەلاّم پاشان تەوبەیەکی ڕاستەقینەیان کردووەو نەچوونەتەوە سەر خراپەکانی پێشوویانو لەشوێنی خراپەکردن, چاکەیان کردووە, لەڕۆژی قیامەتدا کاتێ دەفتەرەکەیان بەدەستی

ڕاستیان وەردەگرن، دەست دەکەن بەخوێندنەوەی نامەی کردەوەکانی ژیانی دونیایان سەیردەکەن ئەو هەموو خراپەیان بۆ تۆمارکراوەو لەسەریان نووسراوە، دەڵێن خوایە خۆ ئەو خراپانەی کردوومانن، تەوبەکەمان ڕەشیکردوونەوە ئەی کوا چاکەکانمان؟! ئا لەو کاتەدا خوای گەورە هەرچی خراپەیەکیانە بۆیان دەگۆڕێت بەچاکە، ئا لەو کاتەدا ئەو بەندەیە هاوار دەکات لەخۆشییانو دەڵێ: ﴿ هَاؤُمُ اقْرَأُوا كِتَابِيَهْ ﴾ خەڵکینە، کەسوکارو منداڵەکەم وەرن دەفتەرەکەم بخوێننەوە، من دەمزانی کەخوا بەهۆی تەوبەکەمەوە لێم خۆش دەبێو خراپەکانیشم بۆ دەکات بەچاکە. ئەمجا بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێت، وەزۆربەی ئەهلی بەهەشت لەم جۆرەی سێیەمن کەپێیان دەگوترێ (أَصْحابُ اليَمين).

خۆشەویستان: ئەوەی کەماوە بیلێین لەم ووتارەدا ئەوەیە: ئایا ئەو جۆرە کەسانە جارێکی تر دروست دەبنەوە کەئاوا وەکو ئەو ڕووداوانەی زەمانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کەتووشی گوناهی داوێن پیسی بوون ئاوا بەدڵو بەگیان پەشیمان ببنەوەو تەوبەبکەن؟!

لەووڵامدا دەڵێین: ئەگەر لەسەردەمی زێڕینی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، لەو کاتەدا کەقورئان دەهاتە خوارەوە، لەکۆمەڵگای صەحابەدا زینا ڕووی دابێ، حەتمەن لەهەموو سەردەمێکدا ڕوودەداتو ئەو بیرو باوەڕەش کە (ماعِز وَالمَرْأة الغامِدِيَّة)ی وا لێکرد کەئارام نەگرن، هەتا پاك نەبوونەوە لەو گوناهە گەورەیە، بەبێ گومان ئەو بیرو بڕوایە، کەبڕوابوونە بەئاگاداریەتی خوا، بەحیسابو لێپرسینەوەی قیامەت، حەتمەن لەهەموو سەردەمێکدا ئینسانی ئاوا دروست دەکاتەوە، کە إنْشاءَ الله لەووتاری داهاتوودا باسی یەکێك لەو تەوبەکارانە دەکەین، کەلەم چەندساڵەی پێشوودا تووشی داوێن پیسی بووەو پاشان چۆن تەوبەیەکی نەصووحی کردووە.

داوادەکەم لەخوای گەورە لەگوناهەکانمان خۆش بێ، بمانگێڕێ لەتەوبەکارانی ڕاستەقینە، گەنجو لاوەکانمان لەداوێن پیسی بپارێزێ، عاقیبەتی هەموو لایەکمان خێرکا..

اللَّهُمَّ آمين.

# ووتاری ژماره بیست وچوار

## داوێن پاکی

### بەشی حەوتەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللَّه جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾

(النور 31 )

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم:

( إِنَّ اللهَ تَعالَى يَبْسُطُ يَدَهُ بِالَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسيءَ النَّهارِ, وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهارِ لِيَتُوب مُسيءَ الَّيْلِ حَتَّى تَطْلَعُ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها )

( رَواهُ مُسْلِم )

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِه وَصَحْبِهِ أَجْمَعين..

ئیماندارانیو خواناسانی بەڕێز: سەلامو ڕەحمەتی خواتان لێ بێ, لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە کەبمانگێڕێ لەو کەسانەی کەهیدایەتی داون بۆ ڕێگا ڕاستەکەی خۆی, خوای گەورە ئیستیقامەو بەردەوامیمان پێ ببەخشێ لەسەر ڕێگای دینداریو عاقیبەت خێرمانکا, وەهەر کاتێ تووشی لاساریو سەرپێچیو تاوان بووین خوای گەورە موەفەقمان بکات تەوبەیەکی ڕاستەقینەی لێ بکەینو بگەڕێینەوە.. آمین.

موسڵمانان: زانایانی ئیسلام دەفەرموون: تەوبەکردن لەگوناھ و تاوان, فەرزو واجبە لەسەر هەرکەسێك کەتووشی گوناھ و تاوانێك بوویێت, لەبەر ئەوەی بەئەمر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾.

هەروەها زانایان دەفەرموون: ئەگەر ئینسان گوناهی کردو تەوبەکردنی دواخست, ئەویش دەبێتە گەناهێکیتر بەسەریەوە. واتە: دواخستنی تەوبەو پەشیمان بوونەوە لەگوناھ و سەرپێچی دەبێتە گوناهێکی تر. بۆیە هەرکەسێ دوای ئەوە تەوبەی کرد, دەبێ دوو جار تەوبە بکات, تەوبەیەك لەدواخستنی تەوبەکەی, تەوبەیەکیش لەو گوناھ و تاوانەی کردوویەتی.

بەڕێزان: لەووتاری ڕابردوودا باسی ئەو کەسانەمان کرد کەتووشی گوناهی گەورەی (داوێن پیسی) بوون, چۆن خوای گەورە دەرگای تەوبەی بۆ ئەوانیشو هەموو گوناهکارانیش کردۆتەوەو دوای گەڕانەوەیان موژدەی لێخۆشبوونی خوایان لەسەر زوبانی پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم پێ ڕاگەیەنراوە. لەووتاری ڕابردوودا باسی هەندێ لەو تۆبەکارانەمان کرد, هەروەکو گوتمان إِنشاءَ الله لەم ووتارەدا باسی تەوبەکارێکتان بۆ دەکەین, کەتووشی گوناهی (زینا) بوو, بەڵام پاشان بەئاگاهاتەوەو تەوبەیەکی نەصووحی کرد, ئەم ڕووداوەش کەعەرزتانی دەکەم, ڕووداوێکی واقیعییەو لەساڵانی هەشتاکاندا ڕوویداوە, مامۆستایەکی ئیماندار ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە, ئەویش لەگەنجێکی دەگێڕێتەوە کەناوی (ئەحمەد) بووە, گەنجێکی موسڵمانی ڕەوشت بەرز بووە, ئەم کوڕە گەنجە دەڵێ:من خەڵکی ووڵاتی سعوودیەم, بۆ سەفەرێك چووم بۆ ووڵاتێکی دراوسێمان کەلەو ووڵاتەدا ئیشم هەبوو, ئیشێکی ( 24 ) سەعاتی, دوایی گەڕامەوە بێمەوە بۆ ووڵاتی

سعوودیه. زۆر ماندوو بووم، ئەو شەوە نەمتوانی بوو بخەوم، بەیانیەکەی زوو هاتم لەفڕۆکەخانەوە سواری فڕۆکە بم و بگەڕێمەوە، چەند سەعاتێکی مابوو بۆ ئەوەی ئەو فڕۆکەی کەمن شوێنم تێدا گرتبوو نۆرەی ڕۆیشتنی بێ. منیش زۆر هیلاك و ماندوو بووم، گەڕام بۆ شوێنێك کەماوەیەك تێیدا ڕاکشێم، لەسووچێکی فڕۆکەخانەکە ژوورێکی بچووك هەبوو لەسەری نووسرابوو (ژووری نوێژکردن)، منیش چووم لەو ژوورەدا ڕاکشام، بەڵکو سەرخەوێك بشکێنم. پاش ماوەیەك بەدەنگی گریانی گەنجێك خەبەرم بۆوە، کەسەیرم کرد وا گەنجێك لەژوورەکەدا دانیشتووەو زۆر بەکوڵ دەگریا، وەکو گریانی دایکێك کەجگەرگۆشەکەی تازە لەبەردەمیدا هەڵگیرابێ، وەکو گریانی بەکوڵی هاوسەرێك کەهاوسەرێکی زۆر خۆشەویستی بووبێ و جەنازەکەی لەبەردەستیدا بێ، زۆر بەکوڵ دەگریا، بەڵام چونکە من زۆرم خەو دەهات، دووبارە خەوم لێکەوتەوەو دیسان بەگریانی ئەو گەنجە خەبەرم بۆوە. ئەمجارەیان کەسەرم هەڵبڕی، هەر هەمان کوڕە گەنجەکەیە وا لەناو نوێژدا دەگری. کەنوێژەکەی تەواوکرد سەیرێکی منی کردو گوتی: ئەوە براکەم تۆ دەتوانی بخەوی؟! گوتم: بەڵێ، زۆرم خەو دێ، چونکە زۆر ماندووم. گوتی: دە بەخوا تازە من ناتوانم بخەوم چونکە تووشی کێشەیەکی زۆر گەورە بووم. چوومە لایەوەو گوتم: چی بووە، چیت لێ قەوماوە؟ قسەبکە بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم. ئەویش زۆر بەمەحزوونیەوە دەستیکرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و گوتی:

کاکە گیان من کوڕی پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندم، تەمەنم نزیکەی سی ساڵە، خەڵکی شاری ریاضی پایتەختی سعوودیەم، بۆ سەیران و گەشت ویستم جەوێك بگۆڕم، لەژیانی ئیعتیادی بێزار بووبووم، ویستم لەسعوودیە دەرچم و گەشتێك بکەم و دونیا ببینم، هاتم بۆ ئەم وڵاتە، بەڵام خوا دەزانێ نیەتم ئەوە نەبوو کەتووشی فەسادو خراپەیەك بێم، چونکە من هەر لەسەرەتای تەمەنمەوە گەنجێکی نوێژو طاعەت پاك بووم، بەڵام شەیطان لەوێوە جاری وا هەیە بۆ ئینسان دەچێ، لەدەرگای خێرەوە بۆ ئینسان دەچێ، دەعوەتت دەکەن بۆ شاییەك، وەکو زۆربەی شاییە ناشەرعیەکانی ئێستا، شەیطان دێ دەڵێ عەیبە ئەگەر نەچی، فلان کەس خزمتەو کەسێکی تر نیە جگە لەتۆ، ئەگەر تۆ بەشداری شاییەکەی نەکەی ئەی کێ بچێ؟! بەم شێوەیە وردە وردە نزیکی ڕەشبەڵەکەت

دەكاتەوەو لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا تێكەڵ دەبیو ڕەنگە دوای ئەوە تووشی گوناهی گەورەتریش ببی..

بەڵێ ئەم گەنجە دەڵێ: هاتم بوومە هاوڕێی چەند كەسێك, هاوڕێكانم خراپ بوون, بەم شارەدا منیان گەڕاند, زۆر شوێن گەڕاین, تا ئەوەبوو لەكۆتاییدا ئەو ڕەفیقە خراپانەم بردیانمە ماڵێك كۆمەڵە ئافرەتێكی تێدابوو لەگەڵ ئافرەتەكاندا دەستمان كردە قسەكردنو حیكایەت كردنو ئەو باسە خراپانە. دەڵێ: وردەوردە بێئەوەی بەخۆم بزانم, هاوڕێ خراپەكانم دەوریان چۆڵكردمو بەتەنیا منیان لەگەڵ ئافرەتێكی گەنجدا بەجێهێشت, بەتەنیا كەوتمە ئەو فیتنە خەتەرەوە كەرسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەبارەیەوە دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێكو ئافرەتێكی نامەحرەم, بەتەنها لەشوێنێكدا بوون, سێیەمینیان شەیطانەو بەرەو تاوان دەیانبات. بەڵێ گەنجەكە دەڵێ: وردەوردە ئافرەتەكە لێم نزیك بۆوە, منیش نزیك بوومەوە لێیو تووشی گەورەترین تاوان بووم كەزینا بوو (پەنا بەخوا), بەڵام هەر ئەوەندەی كە لەزیناكە بوومەوە ئاگرێك بەربووە جەستەم, هاوارم كردو گوتم: ئەی هاوار بەماڵم, قوڕ بەسەرم چیم بەخۆم كرد, من چەند ساڵە نوێژ دەكەم, ڕۆژوو دەگرم, قورئان دەخوێنم, بۆ وام بەسەرهات, بۆچی خۆم تووشی ئەم تاوانە گەورە كرد! هەروەكو لوقمانی حەكیم ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكاتو دەفەرموێ: (يا بُنَيَّ, إِيَّاكَ والزِّنا فَإِنَّ أَوَّلَهُ مَخافَةٌ, وَآخِرُهُ نَدامَةٌ) ڕۆڵە گیان, ئامان هەرگیز نزیكی زینا نەكەویتەوە چونكە سەرەتا كەنزیكی ئافرەتەكە دەبیتەوە, هەموو گیانت ترسی لێدەبارێو كۆتاییەكەیشی پەشیمانیو نەدامەتیە.

خۆشەویستان: گەنجەكە بەردەوامە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەكەیو دەڵێ: بەدەم گریانەوە لەو ژوورە ڕام كردە دەرەوە, یەكێ لەو خراپەكارو بەرەڵڵایانەی ڕەفیقم لەدەرەوە وەستابوو, گوتی: ئەوە چیتە؟! گوتم: زینام كرد زینا! گوتی: ئەوە ڕەنگە یەكەم جارت بێ, گوێ مەدەرێ, بگرە ئەو پێكە عەرەقە بخۆرەوە با سەرخۆش بی لەبیرت دەچێ. گوتم: لاچۆ لەبەرچاوم هەی خراپەكار, لەگەڵمدابوون تا تووشی زیناتان كردمو حۆریەكانی بەهەشتتان لێ حەرام كردم, ئەمجا دەتەوێ شەرابی بەهەشتیشم بەهۆی عەرەق خواردنەوەوە لێ حەرام بكەی؟! وازم لێبێنەو لێم دووربكەوە. گوتی:

خەفەت مەخۆ, خوا غەفوورو ڕەحیمە لێت خۆش دەبێ. گوتم: ئاخر لەبیرت چووە کەخوا (شَدیدُ العقاب)یشەو جەهەنەمی بۆ تاوانباران ئامادەکردووە! بەڵێ هاتمە دەرەوەو لەو کاتەوە ئیسراحەتم نەماوە, ئاگرێك بەربۆتە دڵودەروونو جەستەم نازانم چی بکەم, خۆزگە هەرچی پارەو سەروەتم هەبوو, هەموویم بدۆڕاندایە بەڵام تووشی ئەم گوناهە گەورەیە نەبوومایە.

بەڵێ ئیمانداران: ئەم کوڕە گەنجە کەناوی ئەحمەدەو باسی گەنجەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە, دەڵێ: پێم گوت: برای خۆشەویستم, گوێ بگرە با ئایەتێکی قورئانت بەسەردا بخوێنمەوە, تۆ الحَمدُ لله مادام پەشیمانی لەو تاوانەی کەکردووتە, إنْشاءَ الله ئەم ئایەتە قورئانیە تۆ دەگرێتەوە کەدەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّه إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ (الزمر 53), خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئەو بەندانەی کەڕۆچوون لەگوناه و تاواندا, بێهیوا مەبن لەڕەحمی خوا, خوا لەهەموو تاوانێك خۆش دەبێ, خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.. گوتم: ئەمە فراوانترین ئایەتی قورئانە کەگەورەترین دەرگای لەتاوانباران کردبێتەوە. ئەویش گوتی: بەخوا مامۆستا گیان ڕەنگە خوا لەهەموو کەسێك خۆش ببێ, بەڵام من بەپێی خۆم چووم بۆ تاوان, لەسەر تێری, لەسەر دەوڵەمەندی, لەسەر ژن داری, قەت باوەڕ ناکەم خوا لەمن خۆش ببێ. دەڵێ لەم قسانەدا بووین گوێم لێبوو بڵندگۆی فڕۆکەخانەکە بانگی کرد کەفلان فڕۆکە دەڕواتو سەرنشینەکانی ئامادەبن, ئەو فڕۆکەیەبوو کەمن جێگام تێدا گرتبوو, هەر بۆیە بەکوڕە گەنجەکەم گوت: داوای لێبوردنت لێدەکەم, من دەبێ بڕۆم, بەڵام منیش هەر خەڵکی شاری ریاضی سعوودیەم, ئەگەر هاتیتەوە پەیوەندیم پێوە بکە, ئەوە ناونیشانی ماڵو ئەوەش ژمارەی تەلەفۆنم.

بەڵێ لەیەکتر جیابووینەوەو گەڕامەوە بۆ ماڵ, دوای دوو - سێ ڕۆژێك کوڕە گەنجەکە تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی: دەمەوێ بتبینم. کاتێکمان دانا بۆ چاوپێکەوتن, بەڵام کەهاتو منی بینی وەکو یەکەم ڕۆژ چۆن بەکوڵ دەگریا, ئاوا دەستیکردەوە بەگریانو باوەشی پێداکردم. دانیشتینو هەندێکی تر ئامۆژگاریم کرد, گوتی: مامۆستا گیان بۆ ئەوە نەهاتووم زۆر دانیشم لەگەڵتدا, بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم خواحافیزیت لێ بکەم. گوتم: بۆ

کوێ دەڕۆی؟ گوتی: دەچم خۆم تەسلیمی مەحکەمەی شەرعی دەکەم بۆ ئەوەی حەددە شەرعیەکەم بەسەردا جێبەجێ بکەن (چونکە لەووڵاتی سعوودیە مەحکەمەی شەرعی هەیە بۆ جێبەجێ کردنی حەددە شەرعیەکان). گوتم: ئاخر برای بەڕێزم، تۆ ژنت هەیە، ئەگەر خۆت تەسلیم بکەی دەکوژرێی، چونکە حەددی شەرعی بۆ زیناکەری ژندار ئەوەیە کەڕەجم بکرێ بەبەرد تا دەمرێ. گوتی: بەخوا مامۆستا ئەحمەد ئەوەم بەلاوە خۆشترە لەوەی کەبەم ویژدانە نائارامەوە بژیم، ئومێد دەکەم بەو بەرد باران کردنە خوای گەورە لەو تاوانە گەورەیە پاکم بکاتەوەو لەبەهەشتدا بەیەك بگەینەوە. منیش گوتم: براکەم ئەحمەد گیان (چونکە ئەو کوڕە گەنجەش هەرناوی ئەحمەدبوو)، بەزەییت بەخێزانتدا بێتەوە، بەزەییت بەمنداڵەکانتدا بێتەوە، بەزەییت بەدایكو باوکتدا بێتەوە، ئاخر بۆ سومعەی ئەوانیش خۆش نیە خەڵکی پێ بزانن کوڕەکەیان لەدەرەوەی ووڵات داوێن پیسی کردووە، لەبەر ئەوە لەنێوانی خۆتو خوادا تەوبەت کردووە إنشاءَ الله خوا لێت خۆش دەبێ، بۆیە تکات لێدەکەم خۆت تەسلیمی مەحکەمەی شەرعی مەکە. گوتی: داوای هەرچیەکم لێدەکەی بەقسەت دەکەم، بەڵام تکای ئەوەم لێمەکە کەخۆم تەسلیم نەکەم، چونکە بەم حاڵەوە ناتوانم بژیم! گوتم: باشە با بچین دەربارەی خۆ تەسلیم کرنت یان تەسلیم نەبوونت بەمەحکەمەی شەرعی، پرسیار لەفلان زانای بەناوبانگ، موفتی ئەم شارە دەکەین، ئەو زانایە هەرچی فەرموو هەردووکمان بەقسەی دەکەین. گوتی: زۆر باشە با بڕۆین بۆ خزمەتی. چووینە خزمەت زاناکەو باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: کوڕی خۆم، خۆت تەسلیم مەکەو لەنێوانی خۆتو خوادا تەوبە بکەو لای کەس باسی مەکە. ئەحمەد گوتی: ئاخر مامۆستا من لەقیامەتدا یەخەی تۆ دەگرمو دەڵێم: یا ڕەبی خوایە من تووشی زینا بوومو کەس پێی نەزانیم، بەڵام لەترسی تۆ، بۆ ئەوەی لەو گوناهە گەورە پاك ببمەوە، ویستم خۆم تەسلیمی مەحکەمەی شەرعی بکەم، بەڵام ئەم مامۆستایە نەیهێشت خۆم تەسلیم بکەمو ڕەجم بکرێم، ئەی مامۆستا تۆ ئەم مەسئولیەتەی قیامەت هەڵدەگری؟! زاناکە فەرمووی: ڕۆڵە گیان من بەرپرسیارم لەم فتوایەی خۆمو لەڕووی شەرعەوە پێت دەڵێم کەخۆت ئاشکرا نەکەی.بەم شێوەیە ئەحمەدی تەوبەکار قەناعەتی کردو دەستیکرد بەخواپەرستیەکی ڕاستەقینە. مامۆستا ئەحمەد دەڵێ: دوای ئەوە

ئەحمەد ناو بەناو دەهات بۆ لامو منیش ئامۆژگاریم دەکرد, ڕۆژێکیان هاتو گوتی: ماموستا ئەحمەد دەمەوێ بچم بۆ حەج, گوتم: زۆر باشە, منیش نیازی حەجم هەیە وەرە با بەیەکەوە بچین. گوتی: ماموستا گیان حەز دەکەم بەتەنیا بم. بەڵێ کاتی حەج هاتو چووین بۆ حەج لەطەوافی کەعبەدا بینیم, بانگم کرد ئەحمەد گیان وەرە بۆ لای من, بەڵام وەڵامی نەدامەوەو ڕۆیشت. گوتم تۆ بڵێی لێم عاجز بووبێ؟! بۆ نەهات بۆ لام, لەکاتێکدا ئێمە یەکتریمان لەبەر خاتری خوا زۆر خۆش دەوێ! بەڵێ حەج تەواو بوو, گەڕاینەوە بۆ شاری ریاض, ڕۆژێك ئەحمەد هات بۆ لامو ئەوەم بیر هێنایەوە کەبۆچی لەکاتی حەجدا بانگم کرد نەهات بۆ لام, گوتی: ماموستا ئەحمەد, تو خوا دڵت گەرد نەگرێ, بەخوا خەریکی تەوبەو داوای لێخۆشبوونی گوناهەکەم بووم لەخوای گەورە, بڕوا بکە بۆ ڕیا وا ناڵێم, بەس لای تۆ باسی دەکەم, هەموو دەوری ماڵی بەیتو نێوانی مەککەو عەرەفەو موزدەلیفەو, موزدەلیفەو مینا" هەموو ئەو بەینانە بەپێی پەتی گەڕاوم, بەڵکو خوا بەچاوی ڕەحمەت تەماشام بکات, کاتێ دەمبینێ کەئاوا بەزەلیلی, بەڕووشکاوی, بەمەحزوونی, داوای لێخۆشبوونی لێدەکەم, بەڵکو خوا بەزەیی پێمدا بێتەوەو ڕەحمم پێبکاو تەوبەم لێ قبووڵ بکات.

بەڵێ ماموستا ئەحمەد دەڵێ: منیش زۆر جار سەرم لێ دەداو لەگەڵیدا دادەنیشتمو باسی تەوبەکارانو خواناسانم بۆ دەگێڕایەوە, بەڵکو دڵی پێی خۆشتر بێو سوودی لێ وەرگرێ. ڕۆژێکیان باسی خواناسێکم بۆ کرد کە لە (کووفە)دا دەژیا ناوی (ڕەبیعی کوڕی خوزەیم) بوو, ئەوەبوو لەناو شاری کووفە کۆمەڵە مونافیقێك هەبوون زۆر ڕقیان لەم پیاوە خواناسەبوو, گەنجێکی جوانی باڵابەرزی, خواناسی تێگەیشتوو بوو, تەمەنی نزیکەی سی ساڵێك دەبوو, یەکێك بوو لەزانا پایەبەرزەکانی کووفە, کۆمەڵە مونافیقێك کۆبوونەوەو گوتیان: چۆن کارێك بکەین ئابڕووی ڕەبیعی خواناس بەرین, بۆ ئەوەی خەڵکی قسەی لێ وەرنەگرن. گوتیان با بچین بۆ لای فلان ئافرەت کە لەڕەنگو ڕوخساردا زۆر جوانەو ئەخلاقیشی باش نیە, پارەیەکی باشی بدەینێ بەڵکو خۆی لەڕەبیعی زاناو پیاوچاك نزیك بکاتەوە, ئێمەش بەپەنهانی چاودێرییان دەکەین, خۆ ئەگەر ڕەبیع تەنها یەك ماچی بکا ئیتر ئەو کاتە ئێمە دەیکەین بەهەراو خەڵکی لێ کۆدەکەینەوەو حەیای دەبەین!

بەڵێ چوون بۆ لای ئافرەتێکی زۆر جوان کەپێیان دەگوت (غانیة)، واتە (التي إسْتَغْنَتْ بِجمالِها عَن إسْتعمالِ المُجَمِّلات)، واتە ئەوەندە جوان بوو پێویستی بەبەکارهێنانی دەرمانی ئارایشت نەبوو بۆ خۆجوانکردن. ئەم کۆمەڵە مونافیقە چوون بۆ لای ئەم ئافرەتەو گوتیان: فلان کەس، رەبیع دەناسی چەند کوڕێکی جوانە؟! گوتی: بەڵێ بینیومە، گوتیان: ئایا حەز دەکەی بچی بۆ لایو خۆی لێ نزیك بکەیتەوە، ڕازی بکەی تەنها یەك ماچت بکات؟ ئێمە پەیمان بێ هەزار دینارت دەدەینێ، کەهەزار دیناری زێڕی ئەو کاتە واتە هەزار مسقاڵ ئاڵتوونی ئێستا! ئافرەتەکە گوتی: زۆر باشە، بەڵام وەعد بێ ئەگەر بێتو لەماچێك زیاترم بکاو شتێکی زیاترم لەگەڵدا ئەنجام بدا، بەڵێن بێ من هەزار دیناری ئاڵتوون بەئێوە دەدەم!!

بەڵێ نەخشەیەکیان دانا، ئەم ئافرەتە جوانە لەخوا بێخەبەرە جلوبەرگی هەمووی لەبەرخۆی داناو عەبایەکی لەخۆیەوە پێچاو ڕۆیشت بۆ شوێنێکی چۆڵەوانی کەڕەبیعی زاناو خواناسی گەنج ڕۆژانە بەوێدا هاتوچۆی دەکرد، چووە پەنایەکەوەو هەر کەڕەبیع گەیشتە لای، چووە بەردەمیو عەباکەی لەسەر خۆی لاداو بەڕووتی خۆی نیشان دا، گوتی: ڕەبیع هاتووم بۆ لای تۆو چی بڵێیو داوام لێبکەی من ئامادەم!!

بەڵام ڕەبیعی دینداری خواناسی عالم، نەك هەر وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو دەستیکرد بەئامۆژگاریکردنیو فەرمووی: ئەی قوڕ بەسەر، بەم جوانیەی خۆت دەنازی؟! چی دەکەی ئەگەر ئێستا خوای گەورەو باڵادەست کەئەو جوانیەی پێ بەخشیوی" تووشی گەڕیوگولیت بکاو ئەو جوانیەت لەدەست بدەی؟! هەڵوێستت چی دەبێ ئەگەر لەو کاتەدا کەخەریکی تاوانی گەورەی زینا بی، مەلائیکەی گیان کێشان بێتو گیانت بکێشێ؟! یان بەم وەزعەوە بتخەنە ناو قەبر، ئیتر وەڵامت چی دەبێ لای خوای گەورە؟! بەقسەم بکە تەوبە بکەو بگەڕێوە بۆ لای خواو واز لەم ڕەفتارە ناشیرینانەت بێنە!!

ئافرەتەکە هاوارێکی لێ بەرز بۆوەو عەباکەی لەخۆیەوە پێچاو ڕایکرد، گوتی: بەسمە، بەسمە ،تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کردو ناونرا (عابِدَة الكوفيَّة) خواپەرستەکەی کووفە. ئەو ئافرەتە تەوبەیەکی وای کرد هەتا مونافیقەکان کەئەم هەڵوێستە چاوەڕوان نەکراوەیان بینی گوتیان: (لَقَدْ أفْسَدَها عَلَيْنا الرَّبيع)، گوتیان: بەڕاستی ڕەبیع ئەویشی خراپ کـــرد، لەجیاتی بڵێن:

باشی کرد, گوتیان: ڕەبیع ئەویشی تێکدا!

بەڵێ ئیمانداران, مامۆستا ئەحمەد دەڵێ ئەم باسەم بۆ ئەحمەدی تەوبەکار گێڕایەوە, بەڵکو ئەمیش دەرسی لێ وەرگرێ, بەڵام کەبۆم گێڕایەوە, ئەحمەد بەهەردوو دەستی کێشای بەسەری خۆیداو گوتی: ئەی هاوار بەماڵم, ئافرەتێك بەڕووتی بەپێی خۆی دەڕوا بۆ لای ڕەبیع, کەچی ئەو وەڵامی ناداتەوە, بەڵام من بەپێی خۆم چووم بۆ زینا!!

بەڵێ بەم شێوەیە ئەحمەدی تەوبەکار ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەرەو خوا دەچوو, دەستیکرد بەلەبەرکردنی قورئان, تا قورئانی هەمووی لەبەرکرد, لەو ڕۆژەوە کەتەویەیکردو مامۆستا پێی گوت خۆت تەسلیمی مەحکەمەی شەرعی مەکە, وەعدیداو فەرمووی: وەعد بێ هەتا توانام هەیە دەبێ بەردەوام بەڕۆژوو بم.

ئەحمەدی مامۆستا دەفەرموێ: پێم گوت ئەوە زۆر گرانە, ڕۆژووەکەی داود پێغەمبەر بگرە, گوتی: چۆن؟ گوتم: ڕۆژێك بەڕۆژووبەو ڕۆژێك مەیگرە, گوتی: زۆر باشە, مادام وا سوننەتە لەمەودوا ئاوا بەڕۆژوو دەبم. ئیتر بەردەوامی ساڵ ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو, ڕۆژێك بەڕۆژوو نەدەبوو. ئەحمەدی مامۆستا دەفەرموێ: ڕۆژێکیان لەخزمەت مامۆستایەك دانیشتبووم, باسی تەفسیرو مانای چەند ئایەتێکی قورئانی دەکرد, ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی (الفُرْقان) کەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّه إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً, يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَة وَيَخْلُدْ فيه مُهَاناً, إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾(الفرقان 68 ـ 70), خوای گەورە لەوەصفی ئینسانە ئیماندارە باشەکاندا دەفەرموێ: ئەوانەن کەشەریك بۆ خوا بڕیار نادەن, بەناحەق هیچ نەفسێك ناکوژن, زینا ناکەن, هەرکەسێ ئەمانە بکا لەڕۆژی قیامەتدا بەزەلیلی دەچێتە جەهەنەم, بەهەتاهەتایی تێیدا دەمێنێتەوە, مەگەر کەسێك تەوبە بکاو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا, ئەگەر ئەو ئینسانە گوناهبارە تەویەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خوا, ئەوا خوا ئەوەندە بەڕەحمە, تاوانی ئەو تۆبەکارانە دەگۆڕێ بۆ چاکە.

ئەحمەدی مامۆستا دەفەرموێ: کەئەو ئایەتە دڵخۆشکەرانەم لەدەمی ئەو مامۆستا بەرێزە بیست, لەدڵی خۆمدا گوتم: سُبْحانَ الله, باشە بۆچی من تا ئێستا ئەم ئایەتە پڕ

مژده خۆشانەم بۆ ئەحمەدی تەوبەکار نەخوێندۆتەوە! بەپەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو تەلەفۆنم بۆ ئەحمەد کردو گوتم: مژدەیەکی قورئانیم پێیە بۆت، وەرە بۆ مزگەوت دەمەوێ لەوێ پێت ڕابگەیەنم. بەڵێ هەردووکمان چووین بۆ مزگەوتو کەمێکی مابوو بۆ مەغریب، بەیەکەوە دانیشتین‌و گوتم: گوێ بگرە. ئەمجا بەدەنگێکی خۆش ئەم ئایەتانەم بەسەردا خوێندەوە ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکان. کاتێ ئایەتەکانم تەواوکرد، ئەحمەدی تەوبەکار بەدەم پێکەنین‌و گریانەوە باوەشی پێداکردم‌و گوتی: باشە خۆ من ئەم ئایەتانەم هەمووی لەبەرە، چەندین جار پێیدا چوومەتەوە، بۆ هەستم نەکردووە ئەم مژدە گەورەی بۆ من تێدایە کەخوای گەورە مژدە بەمن‌و ئەوانەی وەکو منن دەداو دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك زینای کرد، بەڵام دوایی گەڕایەوە، تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کرد، عەمەلی صالحی کرد، بۆ ئەوەی ئەو تاوانە بسڕێتەوە ﴿ فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً ﴾، دەفەرموێ: یەکەم جاربوو پێکەنین بەدەم‌وچاوی ئەحمەدەوە ببینم، کەئەوە چەند ساڵێکە دەیناسم، پاشان بانگی مەغریبی فەرموو، هەڵساین بۆ نوێژی جەماعەت، مامۆستای مزگەوتەکە ئەو مەغریبە لەوێ نەبوو، بانگدەرەکە ئەحمەدی دەناسی کەقورئانی زۆر لەبەرە، گوتی: کاك ئەحمەد فەرموو تۆ ئەم مەغریبە پێش نوێژیەکەمان بۆ بکە. ئەحمەد چووە پێشەوە دوای ئەوەی سوورەتی فاتیحەی خوێند لەڕکاتی یەکەمدا دەستیکرد بەخوێندنەوەی ئەم ئایەتانە: ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً، إِلَّا مَنْ تَابَ ﴾ کەگەیشتە ئێرە ﴿ إِلَّا مَنْ تَابَ ﴾ گریان زۆری بۆ هێناو نەیتوانی تەواوی بکات، هەرچی کرد ئەو ڕکاتەی تەواو نەکرد. لەڕکاتی دووەمیشدا دووبارە دەستیکردەوە بەخوێندنەوەی ئەو ئایەتانە، بەڵام لەبەر کوڵی گریان ئەمجارەش ئایەتەکانی بۆ تەواو نەکرا، بەو شێوەیە نوێژی ئەو مەغریبەی بەئیمامەت بۆ کردین.

بەڵێ ئیمانداران: ئەحمەدی مامۆستا، بەردەوام لەگەڵ ئەحمەدی گەنجی تەوبەکاردایە، تا دەفەرموێ: ساڵی (1989)بوو، شەوی جومعەبوو، ئێوارەی پێنجشەممە، باوکی ئەحمەد تەلەفۆنی بۆ کردم‌و گوتی: مامۆستا ئەحمەد بەپەلە وەرە بۆ ماڵی ئێمە،

ئەحمەدی کوڕم کەهاوڕێی نزیکی تۆیە ئێشێکی زەرووری پێتە، دەڵێ چووم بۆ ماڵیان سەیردەکەم باوکی لەبەردەرگای حەوشە وەستاوە، هەر کەمنی بینی بانگی گریانی لێ بەرز بۆوەو باوەشی پێداکردم، گوتم: خێرە؟ گوتی: ئەم ئێوارەیە ئەحمەدی هاوڕێتو خۆشەویستت سەلامی لێکردیو کۆچی دوایی کردو بەرەو قیامەت بەڕێ کەوت! منیش دەستم کرد بەگریان گوتم: چۆن؟! گوتی: وەرە با بچینە ژوورەوە. بردمیە ئەو ژوورەوە کەئەحمەدی تێدا ڕاکشابوو، دەموچاویم لادا، سەیردەکەم نووری لێ بەرز دەبێتەوە، دەموچاوی لەکاتی زیندوویەتی جوانترو گەشاوەتر بوو، گوتم: تو خوا باوکی ئەحمەد باسی مردنەکەیم بۆ بگێڕەوە، چۆن وەفاتی کرد؟! گوتی: مامۆستا گیان وەکو خۆت دەزانی عادەتی ئەحمەدی کوڕم وابوو، ڕۆژێك ڕۆژووی دەگرتو ڕۆژێك نەیدەگرت، ئەمڕۆ کەپێنجشەممەبوو نۆرەی ڕۆژووگرتنەکەی بوو، دوای عەسر گوتم: ڕۆڵە گیان با بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە، لەماڵەوە ڕۆژووەکەت بشکێنە، گوتی: باوکە گیان هەست بەخۆشیەکی زۆر دەکەم، داوات لێدەکەم وازم لێ بێنە با لەمزگەوتدا بم، گوتم: قەیچیەکا لەمزگەوتدا بە. چووم لەماڵەوە هەندێ خورماو شتم بۆ هێناو لەمزگەوت بەربانگیکردەوەو نوێژی مەغریبمان کرد، گوتم: ئەحمەد گیان دە ئەوە ڕۆژووەکەشت شکاند، نوێژیشمان کرد، فەرموو ئێستا با بڕۆینەوە بۆ ماڵ، گوتی: باوکە گیان زۆر دڵم کراوەو خۆشە، داوات لێدەکەم مۆڵەتم بدە با هەر لەمزگەوت بم دوای نوێژی عیشا دێمەوە بۆ ماڵەوە، گوتم: ڕۆڵە گیان چۆن دڵت پێی خۆشە وا بکە. گەڕامەوە بۆ ماڵ لەگەڵ ماڵومنداڵ لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتین نان بخۆین، بەڵام سُبْحانَ الله ،وەکو دڵم لێبدا، هەست بەشتێك بکەم، دڵم هەر لای ئەحمەد بوو، برا بچووکەکەیم نارد بۆ مزگەوتو گوتم: بڕۆ بزانە کاکت لەمزگەوت چی دەکا. ڕۆیشتو پاش کەمێك بەڕاکردن هاتەوە بۆ ماڵەوەو گوتی: باوکە گیان ئەحمەدی برام پاڵ کەوتووەو هەرچی بانگی دەکەم وڵام ناداتەوە. بەپەلە ڕامکرد بۆ مزگەوت، سەیردەکەم لەسەرەمەرگدایەو خەریکە ڕۆحی دەردەچێ، سەرم بەرزکردەوەو خستمە سەر باوەشم، چاوەکانی بەرزکردەوەو سەیری منی کرد، دوو سێ جار گوتی: مامۆستا ئەحمەد، مامۆستا ئەحمەد، وەکو ئەوەی خواحافیزیت لێبکا، پاشان ڕووی گەش بۆوە، بزە کەوتە سەر لێوانیو دەستیکردە خوێندنەوەی ئەم

ئایەتانە, بەدەنگێکی زۆر خۆش و نەرم دەیگوت ﴿ وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْس الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً, يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَة وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً, إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً ﴾.. هەرکە ئایەتەکانی تەواوکرد بەدەم قورئان خوێندنەوە ڕۆحی دەرچوو!

ئەمجا باوکی گوتی: وەڵڵاهی نازانم لەخۆشییاندا بگریم, کەکوڕەکەم بەو عاقیبەت خێریە گیانی دەرچوو, یان لەخەم و ماراقا بگریم کەئەو کوڕە چاکەم لەدەست چوو, بەڵام سوپاس بۆ خوا کە لەمزگەوتدا, لەکاتی قورئان خوێندندا, دوای بەربانگ لەشەوی پیرۆزی جومعەدا, دونیای بەجێهێشت و سەفەری قیامەتی دەست پێکرد.. بەڵام توخوا مامۆستا ئەحمەد, ئەی برادەرو دڵسۆزو بەوەفای ئەحمەدی کوڕم, ئەوە ئەحمەدی کوڕم چی لێ قەوما لەو سەفەرەدا, کەئەو ساڵە ئەو سەفەرەی کرد بۆ ئەو وڵاتەی دەرەوە لەوێ تۆی ناسی هەر کەگەڕایەوە, لەو کاتەوە پێکەنینمان بەڕوویەوە نەبینی, تەنانەت خێزانەکەی دەڵێ: هەر لەو کاتەوە کە لەو سەفەرە گەڕاوەتەوە بەردەوام ڕادەچڵەکێ, تۆزێ دەخەوێ ئیتر هەڵدەستێ خەریکی شەونوێژو قورئان خوێندنە, خەویشی نەمابوو توخوا تۆ کەڕەفیقێکی زۆر نزیکی بووی نازانی لەو سەفەرەدا چی بینی‌و تووشی چیببوو وا حاڵی گۆڕا؟!

ئەحمەدی مامۆستاش دەڵێ: (منیش وەعدم دابوویە کەئەو نهێنییەی بپارێزم) گوتم: مامە گیان, لەو سەفەرەی ئەو وڵاتەدا ئەحمەدی کوڕت خۆشەویستێکی لەدەست دا, دڵسۆزێکی مرد, لەتاوی ئەوە وای لێهات, مەبەستیشم ئەوەبوو کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ)(رواهُ البُخاري).. لەو کاتەدا کەئینسان زینا دەکا ئیمانەکەی لا نامێنێ, مەبەستیشم ئەوەبوو کەلەو سەفەرەدا ئەحمەد بەهۆی زیناکردنەوە ئیمانەکەی کەخۆشەویسترین شتە" دۆڕاندی‌و لەدەستی دابوو, بەڵام دوایی بەتەوبەکەی گێڕایەوە.. بەم شێوەیە ئەحمەدی تەوبەکار گەڕایەوە بۆ لای خوا.

بەڵێ موسڵمانان، ئەی گەنجانی بەڕێز: ئەمە بەسەرهاتی گەنجێکی ئەم سەردەمە، کەهەرچەندە بەهۆی ڕەفیقی خراپەوە تووشی زینا بوو، بەڵام دوایی ئیمانەکەی هاتە جۆش‌و ویژدانی بەئاگا هاتەوەو ئیسراحەتی لێ هەڵگرت‌و تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کردو هەروەکو ئەو کەسانەی لەزەمانی پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تووشی گوناهی زینا بوون تاوەکو ڕۆحی خۆیان نەبەخشی گیانیان ئاسوودە نەبوو.

کەواتە ئیسلام بەو بیرو باوەڕەیە کە بەڕاستی ئینسانی ناسیوە، دەزانێ ئینسان فریشتەی بێ تاوان نیە، مادام ڕۆڵەی ئادەم‌و حەوایە حەتمەن تووشی گوناه دەبێ، تووشی لەبیرچوونەوە دەبێ ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً ﴾ (طه 115)، شەیطان‌و نەفس لەڕێگای ڕاست لایدەدەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەهۆی ئەو تاوان‌و گوناهەوە بەیەکجاری لەپاکی‌و چاکی دوورنەکەوێتەوەو خۆی نەکات بەشەیطانی ڕەجیم، بەڵکو تەوبە بکاو بگەڕێتەوەو بەهۆی ئەو گوناهەوە تەوبەیەکی وا بکا کەخوای گەورە .لەهەموو گوناهەکانی ڕابردوویشی خۆش ببێ‌و خراپەکانیشی بۆ بگۆڕێت بەچاکە. بەواتایەکی تر، ئەم گوناهکردنەو تووش بوون بەتاوانە دەبێتە هۆی عاقیبەت خێری بۆی.. هەروەکو عولەما فەرموویانە، هەر ئەو دڵشکاوی‌و زەلیلی‌و بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەیە وا لەو ئینسانە گوناهبارە دەکات کەتاوانی گەورەی وەکو زینای ئەنجام داوە" کەتەوبە بکات، وەئەو تەوبەکارە زۆر خۆشەویستترە لای خوا لەخواپەرستێك کەعوجب‌و کەیفی بەخۆی‌و خواپەرستیەکەی بێت‌و تەکەبوری پێوە لێبدات.

خۆشەویستان: بەڕاستی ئێمە ئەمڕۆ لەسەردەمێکی فیتنەی ترسناکدا دەژین، دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەر لەتەلەفزیۆنەوە تا گۆڤارو ڕۆژنامەکان زۆربەیان شتی بێڕەوشتی‌و ناشیرین‌و نەشیاو نیشانی کوڕان‌و کچانمان دەدەن، کەواتە پێویستە هەموومان بەتایبەت گەنجەکانمان خۆیان بەهێزیکەن بەئیمان، بەهاوڕێیەتی ئینسانی باش، بەدوورکەوتنەوە لەو شوێنانەی کەئینسان بەرەو گوناه و تاوان دەبەن، لەبەر ئەوەی خوای گەورە کەباسی زینامان بۆ دەکا دەفەرموێ: نزیکی مەکەونەوە، چونکە تاوانی زیناکردن، کوشتن، عەرەق خواردنەوە، ڕەنگە ئینسان بچێتە قەراغی گوناهەکەیش، بەڵام بیر لەسەرەنجامی دونیاو دواڕۆژی خۆی بکاتەوەو بگەڕێتەوەو

گوناهەکە نەکات, بەڵام ئافرەتی نامەحرەم‌و دوور لەڕەوشت کەنزیکی بکەوێتەوە موستەحیلە بتوانێ بگەڕێتەوە, لەملیۆنێکدا یەك کەس نیە بتوانێ خۆی بگرێ‌و تووشی زیناکە نەبێ, هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (ما تَرَكْتُ بَعدي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلى الرِّجالِ مِنَ النِّساءِ, وَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَة بَني إِسْرائيل كانَتْ في النِّساءِ), واتە: لەدوای خۆم هیچ فیتنەیەکم بەجێنەهێشتووە زەرەری زیاتربێ بۆ پیاوان لەژنان, وەیەکەم فیتنە کە لەناو بەنی ئیسرائیلییەکان رووی دا بەهۆی ئافرەتەوە بوو. لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (ما رَأَيْتُ مِنْ ناقصات عَقْلٍ وَدينٍ أَذْهَبُ للُبِّ الرَّجُلِ الْحازِمِ مِنْ إِحْداكُنَّ), واتە: ئەی ژنان نەمبینیوە کەهیچ کەسێکی کەم عەقڵ‌و دین بتوانێ زەرەر لەژیری‌و عەقڵی پیاوی خۆگرو دانا بدات وەکو یەکێك لەئێوە.

جا ئەگەر پیاوی ژیرو عاقڵ‌و خۆڕاگر, نەتوانێ بەرامبەر بەژنی بەدڕەوشتی کەم عەقڵی کەم دین خۆی بۆ بگیرێ, ئەی دەبێ ئەو پیاوەی کەخۆشی ژیری‌و ڕەوشتی تەواو نیەو تووشی ببێ بەتووشی ئافرەتێکی داوێن پیسەوە چۆن لەداوی ڕزگاری ببێ! لەبەر ئەوە پێویستە گەنجەکانمان, هەموومان, خۆمان لەزیناو پێشەکیەکانی زینا بپارێزین, ئەگەر کەسێکیش خوانەخواستە تووشی ئەم تاوانە گەورە بوو, یان تووشی موقەدیمات‌و پێشەکیەکانی زینا بوو وەکو ڕوانین بۆ ئافرەتی نامەحرەم یان تەوقە لەگەڵدا کردن‌و دانیشتن بەتەنها لەگەڵیدا, ئەوە هەرزوو تەوبەیەکی ڕاستەقینەی لێ بکاو لای کەس باسی نەکاو وەکو (ئەحمەدی تەوبەکار) بەڕاستی بگەڕێتەوە بۆ لای خوایەکی بەدەسەڵاتی لێخۆشبووی بەبەزەیی, چونکە ڕزگاربوون‌و سەرفرازی لەچڵکاوو زۆنگاوی گوناه و تاوان تەنها تەوبەکردنی ڕاستەقینەیە هەروەکو خوای گەورە بۆ خۆی بانگمان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللَّه جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾(النور 31) دڵنیاش بن خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و میهرەبانە..

یا ڕەبی خوایە گەنج‌و لاوەکانمان داوێن پاك بکەی ..لەزیناو پێشەکیەکانی بیانپارێزی ..ئەوەی پاك‌و چاکە چاکتری بکەی ..ئەوەی خراپ‌و لارە هیدایەتی بدەی ..

ئەوەی تەوبەکارە تەوبەی قبووڵ بکەی‌و لەگوناهی هەموو لایەکمان خۆش بی .

اَللَّهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان


1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ شرح رياض الصَّالحين للإمام النووي, إبن عُثَيمين, مكتبة الإيمان .

3 ـ تفسير القرآن العَظيم, للإمام الحافظ عِمادالدين أبي الفداء إسماعيل بن عُمَر إبن كَثير الدِّمَشقِي, دار الكُتب العلمية, بيروت ـ لبنان, ط 1, 1998

4 ـ مَنْهَلُ المُؤْمِنين وَمَوْرِدُ الخُطَباء, الدكتور, محمود أحمد البرشة, دار الشيخ أمين كفتارو, دمشق, ط 1, 1998

5 ـ مَوسوعَة أخلاقُ القُرآن, الدكتور أحمد الشرباصي, دار الرائد العربي, بيروت ـ لبنان, ط 1, 1981

6 ـ المسْك والعَنْبَر في خُطَبِ المِنبَر, د.عائض القَرَني, مكتبة العبيكان, الرياض, ط 1, 2002.

7 ـ تَهذيب مَدارج السَّالِكين, إبن قَيِّم الجوزية, هذَّبَهُ: عبدالمنعم صالح العلى العزِّي .

8 ـ وصايا الرَّسُول, الدكتور محمد بكر إسماعيل, دار المَنار, ط 1, 1999

9 ـ سلسلة الهِدايَة ـ العِفَّة ـ الأُستاذ عمرو خالد, مطبعة أنوار دجلة .

10 ـ يوسف ـ عليه السَّلام ـ الأُستاذ عمرو خالد, أريج للنشر والتوزيع, الأردن, ط 1, 2003 .

11 ـ دەستی پەروەردگار, مامۆستا حبيب محمد سعيد, چاپی دووەم .

12 ـ ژيانەوە, ئەندازيار عثمان محمد رشيد, بەرگی يەکەم, چاپی يەکەم .

13 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمد أمين, چاپی چوارەم, 2002 .

14 ـ هەفتەنامەی يەکگرتوو, يەکگرتووی ئيسلامی کوردستان دەری دەکات, ژ: 469

15 ـ هەفتەنامەی ( کۆمەڵ ), کۆمەڵی ئيسلامی کوردستان دەری دەکات, ژ 101 ـ 103

16 ـ ئيمانو ئارەزووی جينسی, مامۆستا حَسَن پێنجوێنی, 1997

17 ـ التاج الجامع للأصول في أحاديث الرَّسول, منصور علي ناصف, وەرگێڕانی: مامۆستا نوری فارس حمەخان, چاپی يەکەم, 1989

18 ـ لەخزمەت قورئاندا, ئەندازيار عثمان محمد رشيد, چاپی يەکەم, 2001 .

19 ـ ووتارو ووتاربێژ, مامۆستا عمر أحمد نظامي, چاپی يەکەم, 2002.

# وەصیەتی پێنجەم

﴿ وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾

# ووتاری ژماره بیست و پێنج

# تاوانی کوشتن

## بەشی یەکەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾

(البقرة 178 ـ 179)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( لَزَوالُ الدُّنيا أَهْوَنُ عِنْدَ اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ )

(رَواهُ مُسلِم)

الحمدُ لله رَبّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيّدنا مُحَمَّد وعلى آلهِ وصَحبِهِ أجمعين إلى يَومِ الدِّين..

ئیماندارانو خواناسانی بەڕێز: بەردەوامین لەخزمەت قورئاندا ژیان بەسەر دەبەینو ـە (دە) وەصیەتەکە" گەیشتینە وەصیەتو ڕاسپاردەی پێنجەم کەخوای پەروەردگار ـەفەرمویێ: ﴿ وَلا تَقْتُلُوا النَّفس الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ واتە: هیچ کەسیش مەکوژن کەخوا حەرامیکردووە, مەگەر بەحەق نەبێت.

بەڵێ خۆشەویستان: لەژێر تیشکی ئەم ڕاسپاردەو وەصیەتی پەروەردگارماندا" لەم ووتارەدا باسی تاوانی کوشتنی ناڕەوا دەکەینو دەڵێین:

خوای گەورە ڕێزو حورمەتێکی وای لەئینسان گرتووە کە لەهیچ مەخلووقو زیندەوەرێکی تری نەگرتووە, وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنا بَنِي آدَم ﴾, خوای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی ئینسانی دروست کردووە, فەرمانی بەفریشتەکان کردووە کەسوژدەی ڕێزی بۆ بەرن, وەهەرچی لەزەویو ئاسمانەکاندایە لەخزمەتی مرۆڤدایەو بۆ خۆشبەختیی ئینسان دروست کراوە, وەهەروەها بۆ خۆشبەختیی ئینسانەکانە کەخوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی پەیامی خوا بگەیەنن بەمرۆڤەکانو دەستیان بگرن بۆ خۆشبەختی دونیاو دوارۆژ, هەروەها ئەمڕۆ زانست سەلماندوویەتی کەهیچ ئینسانێك لەحەزرەتی ئادەمەوە هەتا ئاخر ئینسان کەدێتە سەر ئەم زەویە,لەم شتانەدا لەئینسانێکی تر ناچێت:

1 ـ شێوەی لەپی دەست.

2 ـ شێوەی تۆڕی چاو.

3 ـ شێوەی سەری پەنجە.

4 ـ لەرینەوەی دەنگە ژێکان.

دکتۆر (ڕۆبەرت میکری) کەڕاوێژکاری ئاسایشی سەرنووسەری گۆڤاری (سیکیوورەتی لێتەر)ی ئەمریکییە لەنیویۆرك, دەڵێ:

(هەر مرۆڤێك چەند تایبەتمەندیەکی خۆی هەیە لەکەسیتردا نیەو دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی لەکەسانی تر, لەوانە: پەنجەی دەستو شێوەی لەپی دەستو لەرینەوەی

دەنگە ژێکانیو هەروەها شێوەی تۆڕی چاوی، کەتۆڕی چاوی هەموو کەسێك جۆرێك لەوردیلەی خوێنی تێدایە جیاواز لەهی خەڵکی تر).

هەروەها زانستی پزیشکی سەلماندوویەتی کە: دەنگی هیچ ئینسانێك (100٪) لەدەنگی ئینسانێکی تر ناچێت، وەخوێنی هیچ کەسێك لەخوێنی کەسێکی تر ناچێت. ئەو (DNA)یە کە لەخوێنی مرۆڤێکدا هەیە، لەهی کەسێکی تر ناچێت! هەروەها بۆنی لاشەی کەسێك لەبۆنی لاشەی کەسێکی تر ناچێت!

بەڕاستی ئەمە گەورەییو دەسەڵاتی خوامان بۆ دەردەخات کە بەملیارەها ئینسانی دروست کردووە، کەچی هیچ کەسێك لەو شتانەی کەباسمانکرد لەکەسێکی تر ناچێت. پاکیو گەورەیی بۆ خوای بالادەست. وەهەروەها ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کەئینسان چەند گەورەیە، کەئەگەر کەسێك فەوتاو لەناوچوو، ئیتر هیچ کەسێکیتر جێی ناگرێتەوە! هەر بۆیە لەدوا شەریك بۆ خوا دانان، کوشتنی ئینسانێك بەناحەق بەگەورەترین تاوان دادەنرێو کوشتنی بەناحەق یەکێکە لەو حەوت تاوانانەی کەئینسانماڵوێرانی دونیاو قیامەت دەکات، کەپێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إِجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقاتِ)، خۆتان بپارێزنو خۆتان دووربگرن لەحەوت تاوانی کوشندە کەخۆشیی ژیانی دونیاتان دەفەوتێنێو خەرمان سووتاوی قیامەتتان دەکات، صەحابەکان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو حەوت تاوانە چین؟ فەرمووی: یەکەم: شیرکو هاوبەش پەیداکردن بۆ خوای تاكو تەنیا، دووەم: سیحرو جادووگەری، سێیەم: ﴿ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾، کوشتنی کەسێك کەخوا ڕەوای لەسەری نەبێ، چوارەم: سوودو ڕیبا خواردن، پێنجەم: خواردنی ماڵی هەتیو، شەشەم: هەڵهاتنو پشت هەڵکردن لەدوژمنی دین لەڕۆژی هێرش هێنانی دوژمناندا، حەوتەم: بوختانی داوێن پیسی هەڵبەستن بۆ ئافرەتی داوێن پاکی بێئاگای موسڵمان (رَواهُ البُخاري وَمُسلِم).

هەر لەبارەی گەورەیی تاوانی کوشتنی ناڕەواوەیە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لَنْ يَزالَ المُؤْمِنُ في فُسْحَةٍ مِنْ دينِهِ ما لَمْ يُصِبْ دَماً حَراماً) (رَواهُ البُخاري)، واتە: موسڵمان هەتا خوێن ڕشتنی ناڕەوا بەتووشیەوە نەبێ، هێشتا ئاینی بەبەریەوە دەمێنێ.

هەروەها حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (أَوَّلُ ما يُقْضى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ القِيامَةَ في الدِّماءِ)(رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم)، واتە: لەرۆژى قيامەتدا يەكەم شت كەئينسان لەسەرى مەحكەمە دەكرێ مەسەلەى خوێن ڕشتن‌و پياوكوشتنە ! !

صەحابى بەڕێز (ئەبى ئەلدەرداء)(ڕەزاى خواى لێبێت) دەفەرموێ: بەگوێى خۆم لەپێغەمبەرى خوام بيست كەفەرمووى: (كُلُّ ذَنْبٍ عَسى اللهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إلاَّ الرَّجُلَ يَمُوتُ مُشْرِكاً أَوْ يَقْتُلُ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً)(رَواهُ أبو داود وابن حَبَّان في صحيحه)، واتە: لەوانەيە كەخواى گەورە لەگوناهى هەموو كەسێك خۆش بىێ، بەڵام لەگوناهى ئەو كەسە خۆش نابێ كە لەسەر بت پەرستى‌و خوانەناسى دەمرێ. هەروەها لەكوناهى ئەو موسڵمانەيش خۆش نابێ كە بەقەستى‌و بەبێ هيچ حەقێك خوێنى موسڵمانێك دەڕێژێ‌و دەيكوژێ!

ئيمانداران: با بچينە خزمەت ئايەتێكى قورئانى پيرۆزو بەوردى تەماشاى بكەين‌و بزانين تاوانى كوشتنى بەناحەق چەند گەورەيەو چ سزايەك بۆ ئەو كەسەى بەناڕەوا خوێنى خەڵكى دەڕێژێ دانراوە. خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً ﴾ (النساء 93)، خواى گەورە دەفەرموێ: (وَمَنْ) هەركەسێك، لێرەدا خواى گەورە بە (نەكيرە) هێناويەتى، دەفەرموێ: هەركەسێك، جا ئەو كەسە با عيبادەت‌و خواپەرستيشى زۆر بێ، با حەجى ماڵى خواشى كردبێ، با زۆر لەدين شارەزا بێ، ئەو كەسە (يَقْتُلْ مُؤْمِناً) ئيماندارێك بكوژێ، تەماشاكە نەيفەرموو: (يَقْتُلْ مُتَّقياً) ئيماندارێكى بەتەقوا، نەيفەرموو: (يَقْتُلْ عالِماً) نەيفەرموو هەركەسێك ئيماندارێكى زاناو عالم بكوژێ، بەڵكو فەرمووى: هەركەسێك ئيماندارێك بكوژێ، جا ئيمان قابيلى بەرزىيە، وەقابيلى نزميە، ئيماندارى وا هەيە ئيماندارى زۆر بەرزە، ئيماندارى واش هەيە ئيمانى زۆر لاوازە، تەنها ئيمانى هەيەو كردەوەى نيە. كەواتە: دروست نيە خوێنى هيچ ئيماندارێك بەناحەق بڕێژرێ، مادام پێى بگوترێ ئيماندار، ئيتر با ئيمانيشى زۆر كەم بێ. پاشان دەفەرموێ: (مُتَعَمِّداً) بەئەنقەست‌و بەعەمدى بيكوژێ، كوشتنى بەئەنقەست (عەمدى) ئەوەيە: كەسێك بەمەبەستى كوشتن، بەئامێرێك، بەشتێك كەئينسانى پێ دەكوژرێ، نيازى كوشتنى كەسێك بكاو لێى بدا، جا چ بەچەك تەقەى لێبكا يان بەشمشێر لێى بدا، يان بەتێزاب يان

بەئاگر بیسووتێنێ، یان زەهری دەرخوارد بدا، یان بەردێکی گەورەی پێدا بدا، یان بەدارێکی قورس لێی بدا، ئەو کەسەش بەو شتە مرد، ئەوە ئەو جۆرە کوشتنە کوشتنی عەمدیو بەئەنقەستە. جا خوای گەورە فەرمووی (مُتَعَمِّداً) بەئەنقەست بیکوژێ، چونکە کوشتنی بەهەڵەش هەیە، وەکو ئەوەی کەسێك شتێکی کردووە بەنیشانەی خۆی، جا گوللەیەك یان بەردێك لەو نیشانەیە دەگرێ، یان کەسێك لەپاڵ شاخو دۆڵێکدا خەریکی ڕاوو شکارە، گوللەیەك لەکەروێشکێك یان ئاژەڵێکی کێوی دەگرێ، بەڵام لەولاوە، لەپشت ئەو نیشانە یان ئەو ئاژەڵەوە، کەسێك هەیە، گوللەکە سەردەکاتو لەنیشانەکە نادات‌و بەڵکو سەردەکاتو کەسەکە دەکوژێت، ئەوە پێی دەگوترێ کوشتنی هەڵە، ئەوە ئەو کەسە بە (قاتل) حساب نیەو ناکوژرێتەوە، بەڵام دەبێ خوێنی کوژراوەکە بداتو کەفارەتیش بدات. هەروەها لەشەرعدا دەفەرموێ: جۆرێکی تری کوشتن هەیە کەپێی دەگوترێ (شِبْه العَمد) وەکو ئەوەی کەسێك بەبەردێکی بچووك، یان زللەیەك لەئینسانێك بدا، بەڵام بەمەبەستی کوشتن لێی نەدابوو، بەڵکو هەر بۆ تەمێکردن یان لەدەمەقاڵێدا لێی دابوو، بێگومان ئینسانیش بەم شتانە نامرێ، بەڵام ئەو کەسە پێی مرد، ئەوە ئەو کەسەش بە (قاتل) ناژمێردرێ بەڵام دەبێ خوێنی کوژراوەکە بداتو کەفارەتیش بدات.

دەچینەوە سەر باسەکەمان، ئایەتەکە دەفەرموێ: کەسێك ئیماندارێك بەئەنقەست بکوژێ ئەوە (فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) سزای ئەو بکوژە دۆزەخەو (خَالداً فِيهَا) حاڵی وایە هەتاهەتایە تێیدا دەمێنێتەوەو (وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ) وەخوا ڕقو خەشمی لێ دەگرێو (وَلَعَنَهُ) خوای گەورە نەفرینو لەعنەتی لێدەکاو دووری دەخاتەوە لەڕەحمەتو میهرەبانیی خۆیو (وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً) وەسزایەکی گەورەی بۆ ئامادە دەکا.

زانایان دەفەرموون: ئەم سزایە (کە بەئەبەدی لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە بۆ کەسێکە کەکوشتنی موسڵمانێك بەناحەق، بەڕەوا بزانێ، بەحەڵاڵی بزانێ، ئەوە پێی کافر دەبێو لەدین دەچێتە دەرەوەو هیچ پەیوەندی بەدینی محمدەوە نامێنێ.

خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لَزَوالُ الدُّنيا أَهْوَنُ عِنْدَ اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ)(رَواهُ مُسلِم)، واتە: تێکچوونو لەناوچوونی هەموو دونیا، لای خوای گەورە کەمترو ئاسانترە لەکوشتنی کەسێکی موسڵمان بەناحەق.

جارێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوە، فەرمووی: (ما أطْيَبَكِ، وَما أطْيَبَ رِيحَكِ) ئای چەند شیرینو جوانیو چەندە بۆنت خۆشە، (ما أعْظَمَكِ، وَما أعْظَمَ حُرْمَتَكِ!) ئەی کەعبەی خانەی خواو بیلبیلەی چاوی ئیمانداران چەند بەرزو گەورەیو خوای گەورە چەندە حورمەتی لێگرتووی، (وَالَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَحُرْمَةُ الْمُؤْمِنِ عِنْدَ اللهِ أعْظَمُ مِنْ حُرْمَتِكِ: مالِهِ وَدَمِهِ) ئەی کەعبەی خۆشەویست، ئەی ئەو جێگایەی ملیۆنەها ئیماندار شەوانەو ڕۆژانە ڕووت تێدەکەنو طەوافت دەکەن" لەگەڵ ئەوەدا کەتۆ ئەوەندە بەڕێزی، بەڵام سوێند بەو کەسەی کەگیانی محمدی بەدەستە، ڕێزو حورمەتی ئیماندار لای خوای گەورە، زۆر گەورەترە لەڕێزو حورمەتی تۆ لای خوا.ماڵی ئیمانداروو خوێنی ئیماندار! (رَواهُ إبن ماجَة)

بەڵێ ئیمانداران، هەرکەسێك بەعەمدی کەسێك بەبێ حەقێك بکوژێ ئەوە دەبێ بکوژرێتەوە بەدەستی نزیکترین کەسی کوژراوەکە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى.. ﴾ هەتا لەکۆتایی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾(البقرة 178 ـ 179)، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پێویست کراوە لەسەرتان تۆڵە سەندنەوە بۆ کوژراوەکان ئەی هۆشمەندەکان ژیانتان تەنها لەتۆڵە سەندنەوەدایە، لەو کەسانەی خەڵکی بەناحەق دەکوژن بۆ ئەوەی تەقواو لەخواترسان ببێتە پیشەتانو خۆ لەدەستدرێژیو تاوان بەدوور بگرن.

بەڵێ بەڕێزان: لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا سزای ئەو کەسەی کەکەسێك بەناحەق دەکوژێ، ئەوەیە لەبەرچاوی هەموو خەڵکی ئەو شوێنە، لەهەمان ئەو جێگایەی ئەو کەسی یەکەمی تێدا کوشتووە، بەدەستی خوێنگری کوژراوەکە بکوژرێتەوە، جا خوای گەورە دەفەرموێ لەم تۆڵەکردنەوانەداو کوشتنەوەی بکوژدا ژیان هەیە، واتە ئەگەر کەسێك کەسێکی بەناحەق کوشت، بەڵام تۆڵەی لێکرایەوەو کوژرایەوە، ئەو کاتە فیتنەیو خوێن ڕشتنەکە تەواو دەبێو کەسوکاری کوژراوەکە دڵیان قەناعەت دەکاو خەڵکیتریش دەرسی لێ وەردەگرێ کاتێ دەبینێ ئەوەی خەڵکی بەناحەق بکوژێ چۆن دەکوژرێتەوە، ئەوەش کەنیازی کوشتنی خەڵکی بووبێ دەرس وەردەگرێو تەوبە دەکات.

کەواتە لەقیصاصو تۆڵەسەندنەوەدا ژیان هەیە, بەڵام ئەگەر کەسێك بەناڕەوا کەسێکی کوشتو کەس پێی نەگوت: خراپت کرد, هەر خێرا صوڵحی بۆ کراو پارەی بۆ کۆکرایەوە, ئەوە خەڵکی تریش فێر دەبیؒو دەستی دەکرێتەوەو کوشتنی خەڵکی بەلاوە ئاسایی دەبێت, چونکە دەزانیؒ ناکوژرێتەوەو صوڵحی بۆ دەکریؒ. کەواتە ژیان پڕ دەبیؒ لەمەترسیو خوێن ڕشتن بەسووك سەیردەکریؒو مرۆڤ کوژەکان زیاتر دەستیان دەچێتە خوێنو ڕۆحی خەڵکەوە!

بەڵیؒ هەر کەسێك" کەسێك بکوژیؒ دەبیؒ بکوژرێتەوە, بەڵام ئەگەر باوك کوڕی خۆی بکوژیؒ ناکوژرێتەوە, بەڵام ئەگەر کوڕ باوکی خۆی بکوژیؒ دەبیؒ بکوژرێتەوە, وەهەر کەسێك کەسێك بکوژیؒ, ئەگەر بکوژو کوژراوەکە میراتگری یەکتری بوون وەکو باوكو کوڕ, یان لەهەندیؒ حاڵەتی میراتگریدا وەکو براو برا, ئەوە ئەو بکوژە بێبەش دەبیؒ لەمیراتی کوژراوەکەو میراتی ليؒ ناگریؒ, هەروەکو لەکۆنو نوێدا ڕوویداوە کەکوڕ باوکی خۆی کوشتووە, یان برا برای خۆی کوشتووە (بەنهێنی) بۆ ئەوەی زووتر میراتی کوژراوەکەی دەستکەویؒ, هەربۆیە بکوژ (قاتل) میرات ناگریؒ لەکوژراوەکە (مقتول).

خۆشەویستەکانم: جا مادام کوشتنی ناحەق ئەوەندە مەترسیدارە, با بزانین ئینسان چۆن دەبیؒ بەقاتیل, دەبێتە مرۆڤ کوژ, بۆ ئەوەی خوانەخواستە ڕۆژێك لەڕۆژان تووشی ئەو بەلا گەورەیە نەبین, بەڵکو دوعا بکەینو لەخوا بپاڕێینەوە کەخوا بمانپارێزیؒ لەو بەلایە, لەو موصیبەتە.. یاڕەبی خوایە بمانپارێزی لەهەموو ئەو بیرکردنەوە گەندەڵو خراپانە کەڕۆژێك لەڕۆژان شەیطان فێڵمان لێبکا بۆ کوشتنی موسڵمانێك بەناحەق.

بەڵیؒ, یەکەم شت کەئینسان پێی دەبیؒ بە (بکوژ) قاتیل, ئەوەیە کەسێك بەناحەق کەسێکی تر بکوژیؒ, جا بەچەك بیکوژیؒ, یان ژەهری بۆ لەخواردنو ئاو بکا, یان لەشاخێك فڕێی بداتە خوارەوە, مادام بەئەنقەستو عەمدی بیؒ ئەوە قاتیلە, تووشی ئەو هەڕەشەو سزا سەختە دەبیؒ کەخوا بۆی دیاری کردووە کەباسمان کرد.

بەڕێزان: لێرەدا پێویستە ڕوونکردنەوەیەك بڵێین, ئەویش ئەوەیە: ئێمە دەڵێین کوشتنی بەناحەق, وەکو ئایەتەکە فەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾(الأنعام 151), واتە: هیچ کەسیش مەکوژن کەخوا حەرامی کردووە مەگەر بەحەق

نەبێت.. جا لێرەدا کەخوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە کەکوشتنی ئینسان" جاری وا دەبێ ڕەواو دروستە، ئەو حاڵەتانەش کەڕێگەدراوە ئینسانێك" ژن بێ یان پیاو، کەبکوژرێو لەناو ببرێ، ئەم سێ حاڵەتەیە کە لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دیاریکردووەو فەرموویەتی: (لا يحلُّ دَمُ امْرِيءٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَن لا إِلهَ إِلاَّ الله، وَأَنّي رَسُولُ الله إِلاَّ بِإِحْدى ثَلاثٍ) واتە: کوشتنو ڕشتنی خوێنی موسڵمان کەشایەتمانی هێناوە بەوەی کەهیچ خوایەك نییە (الله) نەبێو، من پێغەمبەری خوام، هەرکەسێ ئەم شایەتمانە بێنێ کوشتنی دروست نیەو حەڵاڵ نیە مەگەر بەسێ شت نەبێ:

**یەکەم**: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ: کەسێك بەناحەق کەسێك بکوژێ دەبێ بکوژرێتەوە وەکـــو پێشتر ڕوونمان کردەوە.

**دووەم**: والثَّيْبُ الزَّاني: زیناکردنی پیاو کەژنی هێنابێ، یان ئافرەت کەشووی کردبێ، لەبەر ئەوەی ئەمانە تامی حەڵاڵیان کردووە، پاشان تاوانی زینایان ئەنجامداوە، ئەم ژنو پیاوانە، ئەگەر هاوسەریان هەبێ خیانەتیان لەهاوسەری ژیانی خۆیان کردووە، پاشانیش ئەو ئارەزووە بەهێزەیان تێدا نیە کە لەناو کوڕێك یان کچێکدا هەیە، بۆیە پێویستە لەناوببرێنو بەردەباران بکرێن تا مردن.

**سێیەم**: التاركُ لِدِينِهِ المُفارِقُ لِلْجَماعَةَ: کەسێك دوای ئەوەی موسڵمانەو لەحەقیقەتی ئیسلام تێگەیشتووە کەچی پاشگەز دەبێتەوە لەدینی ئیسلامو خۆی کافر دەکات، ئەوەش دەبێ بکوژرێ. بەڵام ئەو کەسانەی کەگاورو جوولەکەن، یان هەر دینێکی تریان هەیەو موسڵمان نەبوون لەسەر دینی خۆیان بەردەوامنو لەژێر سایەی حکومەتی ئیسلامیدانو پێیان دەگوترێ (ئەهلی ذیممە)، ئەوانەش خوێنیان پارێزراوەو نابێ بکوژرێن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەو بارەیەوە فەرموویەتی: (مَنْ قَتَلَ مُعاهَداً لَمْ يَرَحْ رائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ ريحَها يُوجَدُ مِنْ مَسيرَةِ أَرْبَعينَ عاماً).واتە: هەرکەسێك ئەهلی پەیمانێك بێ (کەدینێکی تری غەیری ئیسلامی هەیەو زەرەری بۆ موسڵمانان نیەو موسڵمانان پەیمانیان داوەتێ کەبیپارێزن) هەرکەسێك یەکێك لەو ئەهلی پەیمانانە بکوژێ، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات، لەگەڵ ئەوەدا کەبەهەشت چل ساڵ بۆنی دەڕوا!!

بەڵام کەسێك خوای گەورە لوطفی لەگەڵدا کردو ئیسلامی قبووڵ کردو لێی شارەزابوو پاشان پاشگەز بۆوە (مُرْتَد)بوو, وەدەستی کرد بەرەخنەگرتن لەئیسلام‌و موسڵمانان‌و هەوڵی ئەوەی دەدا کەئیسلام ناشیرین بکا, ئەوە ئەگەر تەوبەی نەکردو نەگەڕایەوە دەبێ لەسزای ئەو خیانەتە گەورەیە بکوژرێ, وەکو پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْه وسَلَّم لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (مَنْ بَدَّلَ دینَهُ فَاقتُلوهُ)(رواهُ البُخاري).

**چوارەم:** وەحاڵەتی چوارەمیش هەیە کە لەشەرعدا باسکراوەو ڕێگەدراوە بەکوشتنی کەسێك کەدێتە سەرت‌و دەیەوێ بەناحەق‌و ناڕەوا ماڵت لێ داگیربکا, یان دەستدرێژی بکاتە سەر شەرەف‌و ناموست, یان بەناحەق دەیەوێ بتکوژێ ئەوە تۆ پێویستە ئاگاداری بکەیەوە کەواز بێنێ‌و بڕوا, وەلەبەری بڕۆی‌و تۆزێ لێی دووربکەویەوەو هەڕەشەی لێبکەی, وەئەو شوێنانەی بریندار بکەی کەپێی نامرێ وەکو قاچ‌و دەستی, بەڵکو بگەڕێتەوەو وازت لێبێنێ, بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر دەستدرێژی‌و ناڕەوایی خۆی‌و ئەگەر تۆ ئەوت نەکوشتایە ئەو تۆی دەکوشت" ئەوە دروستە لەناوی بەری‌و بیکوژی, وەحەقی دیفاع لەخۆکردنت هەیە.

جگە لەم چوار حاڵەتە, بەهیچ شێوەیەکی تر دروست نیە هیچ کەسێك خوێنی کەسێکی تر بڕێژێ, وەهەر کەسێك جگە لەم حاڵەتانە کەسێکی تر بکوژێ ئەوا بەبکوژ (قاتل) حیساب دەکرێ.

خۆشەویستان: یەکێکی تر لەو کەسانەی کە بە (قاتل) بکوژ دەژمێردرێن‌و بەر هەڕەشەی توندی پێغەمبەری خوا دەکەون, ئەو کەسەیە کەدوای ئەوەی کەسێکی نزیکی لەلایەن کەسێکەوە دەکوژرێ" دوای ئەوەی دەسەڵاتی تەواوی هەیە بۆ کوشتنەوەی بەڵام نایکوژێتەوە, بەڵکو صوڵحی لەگەڵدا دەکات‌و پارەیەکی زۆری لێ وەردەگرێ, ئەم بکوژە لەخۆی ئەمین دەبێتەوە, پاشان خاوەنی کوژراوەکە فرسەتی لێ دێنێ‌و دەیکوژێ‌و صوڵحەکە هەڵدەوەشێتەوە, یان وەکو ئەوەی لایەنێك, عەشرەتێك, کەسێکی دەسەڵاتدار" کەسێك پەنای بۆ دەبات, ئەویش ئەمینی دەکاتەوەو بەڵێنی دەداتێ کەپارێزگاری لێبکات, بەڵام دوایی خۆی دەیکوژێ, ئەوە بەر ئەم هەڕەشە سەختە دەکەوێ کەپێغەمبەری خاوەن بەڵێن (هەزاران صەڵات‌و سەلامی خوای لێبێت)

فەرموویەتی: (مَنْ أَمَّنَ رَجُلاً عَلى دَمِه" فَقَتَلَهُ, فَأنا بَريءٌ مِنَ القاتِلِ, وَإنْ كانَ المَقتُولُ كافِراً)(رَواهُ البُخاري), واتە: هەرکەسێك کەسێکی تر ئەمین بکاتەوە کەخوێنی پارێزراوەو ـەلایەن ئەمەوە ناکوژرێو گیانی دەپارێزێ, پاشان فرسەتی لێ هێناو کوشتی, ئەوە من کەپێغەمبەری خوام لەو بکوژە بێبەریمو بەئومەتی خۆمی نازانم, هەرچەندە ئەوەی کەکوژراوە کافریش بێ! !

الله أكبَر لەپاکیی ئەم دینە, لەحورمەتی ئەم دینە بۆ ئینسان! ئەمەیە مافی مرۆڤ کەسێك موسڵمانەو ئەهلی ئیمانە, بەڵام بەفێڵو خیانەت کافرێك دەکوژێ, پێغەمبەری خوا دەفەرموێ من لەو بکوژە موسڵمانە بەریمو ئومەتی من نیە! !

ئیمانداران: یەکێکی تر لەو هۆیانەی کەئینسان پێی دەبێ بەبکوژ (قاتل) ئەوەیە کەسێك بۆ خۆی" خۆی بکوژێ. با هەمووماں گوێ لەم فەرموودانەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بگرین کەباسی سزای ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کە لەدونیادا بۆ خۆیان خۆیان کوشتووە.. ئیمامی بوخاریو موسلیم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەصەحابی خۆشەویست ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ في نارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فيها خالِداً مُخَلَّداً فيها أبَداً), واتە: هەرکەسێك لەشاخێکەوە یان لەسەر بەرزاییەکەوە خۆی بخاتە خوارەوەو خۆی بکوژێ, ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا هەمیشەو بەردەوام لەو شاخەوەو لەو بەرزاییەوە, خۆی هەڵدەداتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو هەتاهەتایە ئەوە کارو پیشەو سزایەتیو بەئێجگاری لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە! ! (وَمَنْ تَحَسَّى سُمّاً فَقَتَلَ نَفْسَهُ, فَسُمُّهُ في يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ في نارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فيها أبَداً), واتە: هەرکەسێك زەهر بخواتەوەو بەزەهر خۆی بکوژێ, ئەوە لەناو ئاگری دۆزەخدا زەهرەکەی هەروا لەناو دەستیدایەو بەردەوام دەیخواتەوەو هەتاهەتایە بەئێجگاری لەئاگری دۆزەخدا دەبێو هەمیشەش ئەمە حاڵو کارو پیشەو سزای دەبێ! ! (وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَديدَةٍ فَحَديدَتُهُ في يَدِهِ يَتَوَجَّأُ بِها في نارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فيها أبَداً), واتە: وەهەر کەسێك بەپارچە ئاسنێك خۆی بکوژێ (وەکو ئەوەی بەفیشەك یان بەهەر ئاسنێکی تر) ئەوە لەئاگری دۆزەخیشدا ئەو پارچە ئاسنە بەدەستیەوە دەگرێو خێرا خێرا دەیکا بەورگی خۆیدا, ئیتر هەتاهەتایە لەئاگـــری

دۆزەخدا دەمێنێتەوەو ئەوە حاڵیەتی!

لەفەرموودەیەکی تردا کەبوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم باسی کەسێکما بۆ دەگێڕێتەوە کە لەئومەتەکانی پێشوودا بووە لەشەڕێکدا بریندار دەبێ, ئازاری برینەکە زۆری بۆ دێنێ, بۆیە چەقۆیەك دێنێو دەمارێکی قوڵی خۆی دەبڕێ, تاوەکو ئەوەندەی خوێن لێدێت دەمرێ, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: خوای گەورە دەربارەی ئەو کەسە کەئاوا خۆی کوشت, فەرمووی: (بَدَرَني عَبْدي بِنَفْسه, فَحَرَّمْتُ عَلَيْه الجَنَّةَ), واتە: عەبدەکەم پەلەی کردو ئارامی نەگرت تا بەمردنی خۆی بمرێ بەڵکو خۆی کوشت, منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد!

لەفەرموودەیەکی تردا کەئبن حەبّان لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی, جابیری کوڕی سومرە ( ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کەجارێکیان کابرایەك بریندار دەبێ, لەتاوی ئازاری برینەکەی تیرێك لەتیردانەکەی خۆی دەردێنێو لەبرینەکەوەی وەردەدا هەتا تووشی خوێن بەربوون دەبێو دەمرێ. ئەم کابرایەیان هێنا بۆ ئەوەی حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم نوێژی مردووی لەسەر بکات, بەڵام پێغەمبەری خوا کەزانی بەدەستی خۆی خۆی کوشتووە, نوێژی مردووی لەسەر نەکرد.

بەڵێ خۆشەویستان: هەرکەسێك لەدونیادا بەهەر شتێك خۆی بکوژێ ئەوە لەقیامەتدا بەردەوام بەو شتە لەجەهەنەمدا سزا دەدرێ, جا ئەگەر ئەو خۆکوشتنەی بەحەڵاڵ بزانێ ئەوە پێی کافر دەبێو هەتاهەتایە لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە, بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی خۆی کوشتووە" خۆی بەتاوانبار بزانێ ئەوە مانای فەرموودەکان وایە کەماوەیەکی زۆر لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە پاشان بەڕەحمی خوا ڕزگاری دەبێ.

بەڵێ خۆکوشتن ئاوایەو ئەنجامو بەرهەمەکەی کە بەداخەوە ئەم دیاردەی خۆکوشتنە بەتایبەتی لەڕێگای خۆسووتاندنەوە لەووڵاتی ئێمەدا زۆرە, بەتایبەت لەناو ئافرەتاندا. لەووڵاتانی ئەورووپی دیاردەی خۆکوشتن لەناو پیاواندا هەیە, لەڕۆژئاوا کاتێك کەسێك لەژیانی خۆی بێزار دەبێ, دەچێ لەسەر پردێکی بەرزەوە یان لەسەر خانوویەکی چەند قاتەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوەو خۆی دەکوژێ لەبەر ئەوەی باوەڕی بەدوای مردن نیە. بەڵام خۆ ئینسانی موسڵمان باوەڕی بەدوای مردن هەیە, باوەڕی بەبەهەشتو

جەهەنەم هەیە، باوەڕی بەلێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت هەیە، کەچی خۆی دەکوژێ، بەڕاستی جێگای داخە، ئینسان بەدەستی خۆی ماڵی دونیاو قیامەتی خۆی وێران بکا!!
وەلێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم: هەموو ئەو کەسانەی کەسەبەبن لەخۆسووتاندنی ئافرەتێك، ئەو کەسانەش لەتاوانی ئەو خۆکوشتنەدا بەشدار دەبن، بۆ نموونە: کچێك بەمنداڵی لەسەر بێشکە مارەبڕاوە لەکوڕێك، پاشان کەگەورە دەبن، ئەم کچە بەهیچ شێوەیەك ڕازی نابێ ژیانی هاوسەری لەگەڵ ئەو کوڕەدا بەسەر بەرێ کەخۆی لەهەڵبژاردنیدا ڕەئی نەبووە، کاتێکیش دەزانێ هەر بەزۆر دەیدەن بەو کوڕە، پەنا دەبات بۆ لەناوبردنی خۆیو خۆی دەسووتێنێ، ئەوە هەموو ئەو کەسانە شەریکن لەتاوانی ئەو خۆسووتاندنەدا، وەکو ئەو مامۆستا ئاینییەی کەکاتی خۆی ئەو کچەی بەزۆر مارەکردووە لەکوڕێکی بچووك، کەکچو کوڕەکە لەسەر بێشکە بوون، کەدەبوایە ئەو مامۆستایە مارەی نەکردایەو ئامۆژگاریی باشی بکردنایەو پاشەڕۆژی خراپی مارەکردنی کچی بچووکی بۆ ڕوون بکردنایەوە، دەی مادام وای نەکردووەو مارەیکردووە، دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی کەسەبەبی خۆسووتاندنی ئەو کچەیەو بەمەش دەبێتە شەریکی تاوانەکەی.
هەروەها باوکی ئافرەتەکە یان برای ئافرەتەکە کە بەزۆر کچی خۆیان لەپێناوی ژن بەژنەدا دەدەن بەپیاوێك کەهاوتەمەنی ئەو کچەی ئەوان نیە، یان کچەکەیان ئامادە نیە شووی پێ بکات بەڵام بەزەبری لوولەی تفەنگو نووکی خەنجەر ناچاری دەکەنو پاشان ئافرەتەکە ناتوانێ لەگەڵ ئەم پیاوەدا ژیان بەرێتە سەرو پەنا دەبات بۆ خۆسووتاندن، یان زەهرخواردنو خۆی دەکوژێ، ئەوە ئەو باوکو برایەش دەبنە شەریکی تاوانەکە، هەروەها شاهیدەکانی مەجلیسی ژن مارەکردنو مامۆستای ئاینی دەبێ زۆر ئاگاداربن، کەبزانن ئەو کچو کوڕە هەردووکیان زۆر یەکتریان بەدڵەو هیچ ناڕەزاییەکیان نیە، ئەوجا ئامادەی مارەبڕینەکە بن. وەهەندێ جاریش ئەو ئافرەتە لاری لەمێردو ماڵی خۆی نیە بەڵام لەلایەن ئەو کەسانەی کەلەگەڵیاندا دەژی وەکو خەسوو و براژنو ئەمانەوە سووکایەتیی پێدەکرێو ژیانی لێ تاڵ دەکرێو ئافرەتەکە پەنا دەباتە بەر خۆکوشتن ئەوانەش لەو تاوانەدا بەشدار دەبن.جا ئیمانداران: با ووریا بین، هۆشیار بین نە خۆمان بکوژین، نە ببین بەسەبەبی خۆکوشتنی کەسانیتریش.

خۆشەویستان: گوێ بۆ ئەم فەرموودەیە بگرن کەئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەجابیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پیاوێکی بەناوبانگو ناودارو زمان ڕەوان کەناوی (طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی) بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لوطف بکەی‌و ڕەزامەندی بفەرمووی خۆت‌و یارانت لەزوڵم‌و ستەمی خزمە نادان‌و نەفامەکانت ڕزگار بکەیت‌و مەککە بەجێ بێڵی‌و کۆچ بکەی بۆ وولاتی ئێمە، ئەوا بۆت دەبین بەقەڵای پۆڵایین‌و شووورای ئاسنین‌و هەموومان خۆمان بەقوربانی خۆت‌و دینەکەت دەکەین. بەڵام پێغەمبەری خوا قبووڵی نەکرد کەکۆچ بکا بۆ ئەوێ، چونکە خوای گەورە ئەو سەربەرزی‌و شانازی‌و دەستی خێر لێنانەی هەڵگرتبوو بۆ یاریدەدەرەکانی مەدینەو کردی بەخەڵاتی ئەوان. جا کاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم کۆچی کرد بۆ مەدینەی مونەوەرە، طوفەیل‌و پیاوێك لەهۆزەکەی، هەردووکیان نیشتمان‌و وولاتی خۆیان بەجێهێشت‌و کۆچیان کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، وەلەوێ پیاوەکە نەخۆش کەوت‌و ئۆقرەی لێ براو لەتاوی ئازاری لەشی" بەدەمە تیرێکی پانکۆڵە جەمسەری پەنجەکانی دەستی خۆی بڕییەوە! ئیتر هەردوو دەستی بریندار بوون‌و خوێنیان بەربوو، وەخوێنەکەیان نەوەستایەوە هەتا مرد. پاش ماوەیەك طوفەیل ئەم خزمە مردووەی خۆی لەخەودا دەبینێ، تەماشا دەکا شێوەی دەم‌وچاوی زۆر جوانەو ڕووی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، بەڵام هەردوو دەستی خۆی داپۆشیوە وەکو ئەوەی کەناشیرین بن‌و نەیەوێ کەس چاوی پێیان بکەوێ. طوفەیل لەخەوەکەیدا بەخزمەکەی دەڵێ: فلان کەس خۆ دەزانم تۆ مردوویی‌و دونیات بەجێهێشتووە، باشە پێم بڵێ خوای گەورە چۆن بوو لەگەڵتدا؟! کابراش دەڵێ: بەبەرکەتی کۆچ کردنم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا، کە لەخۆشەویستیی ئەو زاتە، ماڵ‌وحاڵ‌و نیشتمان‌و قەومم بەجێهێشت، لەپاداشتی ئەوەدا خوای گەورە لێم خۆش بوو. طوفەیل دەڵێ: ئەی باشە دەبینم هەردوو دەستی خۆتت داپۆشیوە، ئەوە بۆچی دەریان ناخەی؟! ئەویش لەوولامدا دەڵێ: ئەی طوفەیل خۆت ئاگاداری کەوەختێ ئازار زۆری بۆ هێنام لەتاوی لەشم بەو دەمە تیرە سەری پەنجەکانی خۆمم بریندار کرد، هەرچەندە من

بۆیەم وا نەکرد کەپێی بمرم، بەڵام ئەوەبوو تووشی خوێن بەربوون بووم‌و مردم، جا ەلایەن خواوە پێم گوترا: بەهۆی خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەری خواو کۆچ کردنت بۆ خزمەتی" لەهەموو هەڵەو گوناهێکت خۆش بووم، بەڵام ئەوەی کە بەدەستی خۆت خراپت کردووە لەلەشی خۆت کەدەستەکانی خۆتن ئێمە چاکی ناکەینەوە بۆت!! بەڵێ بۆ بەیانی طوفەیل دێتە خزمەت پێغەمبەری خواو خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: ئەم خەوە ڕاستەو پاشان فەرمووی: (أللّهُمَّ وَلِيَدَيْهِ فَاغْفِرْ) ئەی خوای گەورەمان، لەدەستەکانیشی خۆش ببە، ئەوانیشی بۆ جوان بکە..

ئیمانداران: بەڕاستی خۆکوشتن ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە کەخوای گەورە زۆربەی گوناه و تاوان سزاکەی هەڵدەگرێ بۆ قیامەت، بەڵام تاوانی کوشتنی بەناحەق، خوای گەورە هەر لەدونیادا تۆڵە لەبکوژ دەکاتەوەو هەر کەسێك کەسێکی بەناحەق کوشتبێ، با دەستی کەسوکاری کوژراوەکەشی پێ نەگا بەهۆی دەسەڵاتداریەوە، یان بەهۆی بێکەسی کوژراوەکەوە، یان بەهۆی شاراوەیی تاوانەکەوە کەکەس پێی نەزانیوەو دادگای سەر زەوی لێی ئاگادار نابێ، ئەوا بێگومان ڕۆژێك هەر دێ کەبکوژ بەسزای خۆی بگات‌و کەسێکی تریش خوێنی ئەو بڕێژێ، چاوگێڕان بەژیانی خۆمان‌و خەڵکیدا لەکۆن‌و نوێدا ئەم ڕاستییانە دەسەلمێنن‌و هەندێکیان دەماودەم دەگێڕدرێنەوەو هەندێکیان لەدووتوێی پەڕاوێکدا تۆمارکراون‌و هەندێکیشی بیردەچنەوە. لیوا ڕوکن (محمد شيت خَطّاب) لەپەڕاوەکەیدا (عَدالَة السَّماء) چەند نموونەیەکی بۆ تۆمار کردووین‌و مامۆستا (راشد)یش لە (صناعَة الحَياة)دا چەند نموونەیەك باس دەکات‌و دەڵێت:

ڕووداوی یەکەم: پیاوێك یەکێك دەکوژێ‌و فڕێی دەداتە چاڵێکەوە، پاش ماوەیەکی زۆر یەکێك پەیدا دەبێت‌و لەکێشەیەکەوە دەیەوێ ئەم پیاوکوژە بکوژێ، ناچار پیاوکوژەکە ڕادەکات‌و نازانێ لەکوێدا خۆی بشارێتەوە، سەرەنجام دەچێتە ئەو شوێنەی کەخۆی پیاوەکەی تێدا کوشتبوو، دوژمنەکەی هات‌و لەوێدا دۆزیەوەو لەهەمان شوێندا کوشتیەوە (الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل).

ڕووداوی دووەم: کاتێك سوپای عوسمانی لەبەغدا کشانەوە، سەربازێکی تورك پەرتەوازە بووبوو، لەدەرگای مزگەوتی (ئەبی حەنیفە) وەستابوو، بێکەس‌و بێدەر،

نەگبەتێ هاتو شتەکانی برد, پاشان بۆی گەڕایەوەو بەناهەق‌و ناڕەوا لەبەردەرگای مزگەوتەکەدا کوشتی, پاش بیست ساڵ ئەو پیاوکوژە نەگبەتە شەڕی بوو لەگەڵ زەلامێکدا, کابرای تر چەقۆیەکی لێدا لەتاو برینەکەی شپرزە بوو, ڕایکرد سەدان مەتر تا گەیشتە ناو دەرگای مزگەوتی (ئەبی حەنیفە)و لەوێدا بەدەمدا کەوت‌و مرد, لەهەمان شوێندا کەپیاوە بێکەسەکەی تێدا کوشت..

بەڵێ دەستی پەروەردگار دەگاتە هەموو بکوژێک‌و هەموو کەسێک بەسزای خۆی دەگات, تاوانی کوشتنیش ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە بەووتارێک تەواو نابێ, إنشاء الله لەووتاری داهاتوودا زیاتر باسی تاوانی کوشتن‌وهەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بەکوشتن ڕوون دەکەینەوە..

لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە هەموو لایەکمان لەو تاوانە گەورەیە بپارێزێ, بەئیمانەوە دونیا بەجێ بهێڵین‌و هەرگیز دەستمان نەبێ لەڕشتنی خوێنی هیچ کەسێکدا..

اللّٰهُمَّ آمين

# ووتـارى ژماره بیستو شەش

# تـاوانی کوشتن

## بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً ﴾

(النساء 93)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( قَتْلُ المُؤْمِنِ أعْظَمُ عِنْدَ الله مِنْ زَوالِ الدُّنيا )

( رَواهُ النسائي، وصَحَّحَهُ الألْباني )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين، والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیمانداران‌و خواناسان: سەلام‌و ڕەحمەتی خوا لەئێمەو هەموو ئیمانداران بێ، لەووتاری ڕابردوودا" لەخزمەت قورئانی پیرۆزدا گەیشتینە وەصیەتی پێنجەمی خوای پەروەردگار بۆ عەبدو بەندەکانی کەدەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾، لەووتاری ڕابردوودا باسی تاوانی کوشتنی ناحەقمان کرد، بۆ تەواوکردنی ئەو باسە دەڵێم وَبِالله التَوْفيق:

یەکێك لەو گوناهە گەورانەی کەئینسانی موسڵمان پێی دەچێتە جەهەنەم، پێی سەرگەردانی دونیاو خەجاڵەتی مەحکەمەی خوا دەبێ، ئەگەر بەحەڵاڵی بزانێ هەتاهەتایە مەحرووم دەبێ لەبەهەشت، ئەگەر خۆیشی بەتاوانبارو گوناهبار بزانێ ئەوە هەتا ئەو کاتەی خوا بەلوطفی خۆی دەیبەخشێ لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە، بریتییە لەگوناه و تاوانی کوشتنی ناحەق.

خۆشەویستان: زۆرن ئەو کەسانەی کەسوود لەنوێژو ڕۆژوو و صەدەقەو زەکاتیان وەرناگرن، سوود لەعیبادەتەکانیان وەرناگرن، ئەو هەموو عیبادەتەی دونیا، ئەو هەموو ماندووبوونەی شەوو ڕۆژ، بەڵام لەئەنجامی کۆمەڵێك گوناهدا کە لەدونیادا کردوونی، لەڕۆژی قیامەتدا" لەکاتی کێشانی کردەوەکاندا دەست بەتاڵ دەبێ‌و موفلیس دەبێ، هــــەروەکــــــو لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە کەحەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت)دەفەرموێ:

ڕۆژێکیان هەموو صەحابەکان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا دانیشتبووین، هەموو بەئەوپەڕی ئەدەبەوە، بەئەوپەڕی خۆشەویستییەوە تەماشای پێغەمبەری خوامان دەکرد، بۆ ئەوەی گەوهەرێکی بەنرخ لەو دەمە موبارەك‌و پیرۆزەی، لەو زمانە شیرینەی بێتە دەرەوەو ئێمەش بەدڵ باوەشی بۆ بکەینەوەو لەبەر تیشك‌و ڕووناکیی ئەو گەوهەرەدا ڕێگای ژیانمان ڕووناك ببێتەوەو ئەم فەرموودە بەنرخەش بەئەمانەتەوە هەڵبگرین‌و بیگەیەنین بەنەوەکانی داهاتوومان. بەڵێ ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا بەصەحابەکانی فەرموو: (أتَدْرونَ مَنِ المُفْلِسُ؟!) ئایا دەزانن مایەپووچ‌و دەست بەتـــاڵ‌و

ڕەجاڵ کێیە؟! صەحابەکان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی ئێمە تێی گەیشتبین ئەوەیە، ئینسانی موفلیس‌و ڕووت‌وڕەجاڵ کەسێکە لەناو ئێمەدا کە نە دیرهەمی هەبێ، نە پارەی هەبێ، نە کەلوپەلێکی واشی هەبێ کەبیفرۆشێ‌و پێویستیەکانی خۆی پێ بکڕێ، واتە: هەم گیرفان‌و قاسەی بەتاڵ بێ، هەم ماڵ‌و متبەخیشی هیچی تێدا نەبێ، بەو کەسە دەگوترێ موفلیس‌و بێچارەو داماوو دەست بەتاڵ! پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەی صەحابە خۆشەویستەکان، ئەی هەموو ئومەتم بزانن کەموفلیس‌و دەست بەتاڵی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە لەئومەتی مندا کە: (يَأْتي يَوْمَ القيامَة بِصَلاةٍ وَصِيامٍ وَزَكاةٍ) موفلیسی ئومەتم ئەو کەسەیە کەڕۆژی قیامەت دێ، دڵی خۆشە بەوەی کە لەدونیادا نوێژی کردووەو ڕۆژووی گرتووەو زەکاتی داوەو خێروخێراتی زۆری‌کردووە، بەئومێدی ئەوەیە ئەم کردەوە چاکانەی، ئەم عیبادەت‌و خێروخێراتانەی تەرازووی چاکەی قورس بکەن‌و لەعەزابی جەهەنەم بیپارێزن، بەڵام کەتەماشا دەکات وا لەولاوە لەسەر تەرازووی خراپەکانیشی ئەم هەموو گوناه و تاوانەی ئەنجام داوە بەرامبەر بەعەبدەکانی خوا لەدونیادا، لەمزگەوت خواپەرستی کردووە، بەڵام لەدەرەوەی مزگەوت بەم شێوەیە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا کردووە: (قَدْ شَتَمَ هذا)، تووشی هەرکەس بووە، بەحەق‌و بەناحەق جوێنی پێداوە، لەجیاتی زەردەخەنە ببەخشێتەوە، زمانی بۆتە دڕک‌و ئازاری دڵی ژن‌و ماڵ‌و منداڵ‌و دراوسێ‌و هاوڕێ‌و هاوپیشەو شەریک‌و ناسیاوی خۆی پێداوە، لەجیاتی کەلیمە طەیبە ،کەلیمەی خەبیثە ی گوتووەو بڵاوکردۆتەوە..

(وَقَذَفَ هذا) بوختانی بۆ خەڵکی کردووە، بەکچ‌و بەکوڕ، بەژن‌و بەپیاو، بەبێ هیچ بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕەوای شەرعی، گوتوویەتی: فلان پیاو، یان فلان ژن داوێن پیسە، بێڕەوشتە! (وَأَكَلَ مالَ هذا) ماڵی ئەمی خواردووەو ماڵی ئەوی بەناحەق خواردووە، فەرقی حەڵاڵ‌و حەرامی نەکردووە! (وَسَفَكَ دَمَ هذا) خوێنی ئەمی ڕشتووەو، فلان کەسی کوشتووە لەدونیاداو لەکاتی دەسەڵاتدا بەناحەق خەڵکی کوشتووەو لەدونیادا تۆڵەی لێ نەکراوەتەوە، (وَضَرَبَ هذا) لەمی داوەو لەوی داوەو کوتەک بەدەست‌و قامچی بەدەست بووەو لەسەر لێدانی قامچی‌و شەق‌و زللە لێدان لەخەڵکی بێتاوان نانی ڕۆژانەی پەیداکردووە!!

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەم کەسە لەڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێتە خزمەت مەحکەمەی عەدلی خوای پەروەردگار, تا لەو کاتەدا کەمثقاڵە زەڕەیەك لەچاکەو خراپە بزر نابێو هەمووی نیشان دەدرێتەوە, لەجیاتی هەموو ئەو جوێنو قسە ناشیرینو بوختانو ماڵخواردنو داگیرکردنو خوێن ڕشتنو لێدانەی کەبەرامبەر خەڵکی کردوویەتی, چاکەکانی هەڵدەگیرێنو دەدرێن بەو کەسانەی کەئەم" ئەو زوڵمە گەورانەی لێکردوون, چونکە لەو ڕۆژەدا پارەو ماڵی دونیا نیە بدرێ بەخەڵکێك کەتۆ لەدونیادا زوڵمت لێکردوون, بۆیە چاکەکان بۆ ئەو کەسە دەڕوا: (فَإِنْ فنيَتْ حَسَناته قَبْلَ أنْ يُقْضى ما عَلَيْه, أُخذَ مِنْ خَطاياهُمْ ثُمَّ طُرِحَ في النَّارِ) جا ئەگەر چاکەکانی تەواو بوون پێش ئەوەی حەقی خەڵکی لەسەر لاچێ ئەوا خراپەکانی ئەو خەڵکانەی کەئەم خراپەی بەرامبەر کردوون, لەسەر ئەوان لادەچێو دێتە سەر خراپەکانی ئەم بکوژو زمان پیسەو حەرام خۆرە. بەم شێوەیە بەگــوناهی خۆیو ئەو خــەڵکــانەشەوە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە!

خوا بەڕەحمی خۆی لەو جۆرە کەسانەمان حیساب نەکات کەپێغەمبەرەکەی فەرمووی, موفلیسی ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانەن.

بەڵێ خۆشەویستان: لەفەرموودەیەکدا کەئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕیوایەتیکردووە لەئبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أَبْغَضُ النَّاسِ إلى اللهِ ثَلاثَةٌ) خوای گەورە لەهەموو کەسێ زیاتر ڕقی لەم سێ کەسەیە:

**یەکەم:** (مُلْحِدٌ في الحَرَمِ) زەندیقی ناو حەرەمی مەککە, کەسێ لەحەرەمی مەککەدا بژی, لەو شوێنە ئەمینەدا, لەو شوێنەدا کەپیرۆزترین خاکی خوایەو قیبلەی موسڵمانانی تێدایە, کەچی لەجیاتی چاکەو خواناسی, زەندیقیەتو کوفرو ئیلحاد بکاو بڵاوبکاتەوە, ئەو کەسە خوای گەورە زۆر ڕقی لێیەتی, چونکە خەڵکی ئەگەر لەشوێنێکی تری ئەم سەر زەویەوە گوناه و تاوان بکەن" کەچوونە حەرەمی مەککە دڵیان بەرەو چاکە دەگۆڕێ, کەچی ئەم کەسە بەپێچەوانەوە, لەوێشدا هەر خراپەو تاوان بکات ئەوە بەڕاستی خوا زۆر ڕقی لێیەتی.

**دووەم:** دووەم کەس لەو کەسانەی کەخوا زۆر ڕقی لێیانە: (وَمُبْتَغٍ فِي الإِسْلامِ سُنَّةَ الجاهِلِيَّة) ئەو کەسەی دوای ئەوەی موسڵمان بووەو ئاینی ئیسلامی وەرگرتووە کەچی بەپێی ڕەوشتو یاسای سەردەمی نــەزانیو نەفامیی پێش ئیسلام ڕەفتـار بکاو هەڵوێست بنوێنێ.

**سێیەم:** (وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِيءٍ بِغَيْرِ حَقٍ لِيُهْرِقَ دَمَهُ) ئەو کەسەی لەهەوڵدابێو لەبۆسەو کەمیندا بێ بۆ ئەوەی فرسەت بێنێو خوێنی کەسێك بەناحەق بڕێژێ.

جا ئازیزان: تەماشای فەرموودەکە بکەن، دەفەرموێ: (دَمِ امْرِيءٍ) خوێنی کەسێك، نەیفەرموو خوێنی ئیماندارێك، کەواتە هەرکەسێك با موسڵمانیش نەبێ، مادام حەقێکی شەرعیت لەسەری نیە، کەسی لێ نەکوشتووی، نەهاتووە ماڵت داگیر بکا، ئیتر بۆت نیە بیکوژیو خوێنی بڕێژی!

ئیمانداران: تاوانی کوشتن ئەوەندە گەورەیە، ئەگەر بەچەند کەسێك" کەسێکی بێتاوان بکوژن ئەوا دەبێ هەموویان بکوژرێنەوە، هەروەکو لەزەمانی خەلافەتی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابدا (ڕەزای خوای لێبێت) بڕیاری دا کەحەوت کەس یان پێنج کەس لەخەڵکی صەنعاء بکوژرێنەوە لەبەرئەوەی بەهەموویان یەك کەسیان بەناحەق کوشتبوو!

هەروەها ئبن عەباس" صەحابی فەقیهی سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەگەر کۆمەڵە کەسێك بەهەموویان یەك کەس بەناحەق بکوژن، دەبێ هەموویان بکوژرێنەوە، با سەد کەسیش بن!

کەواتە: ئەگەر بەسەد کەس پەلاماری کەسێکیان داو بەهەموویان لێیاندا تاوەکو مرد، بەناحەقیش کوشتیان، ئەوە دەبێ هەر سەد کەسەکە لەتۆڵەی ئەم ئینسانە بێتاوانەدا بکوژرێنەوە!

هەروەها لەقیامەتیشدا، هەموو ئەوانەی لەکوشتنی کەسێکدا بەشدار دەبن" ئەگەر لەدونیادا تۆڵەیان لێ نەسەنرێتەوە خوای گەورە هەموویان دەخاتە جەهەنەمەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لَوْ أنَّ أهْلَ السَّماءِ وَأهْلَ الأرْضِ إشْتَرَكوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأكَبَّهُمُ اللهُ فِي النَّارِ)(رَواهُ الترمذي)، واتە: ئەگەر خەڵکی ئاسمانو خەڵکی سەر زەوی بەهاوبەشی خوێنی ئیماندارێك بەناڕەوا بڕێژن، خوا هەموویان لەسەر ئەو کوشتنە ناڕەوایە

لەئاگری دۆزەخدا سەرەنگریّ دەکا.

بەڕێزان: خاڵێکی تر کەپێویستە ئیمانداران لێی ئاگاداربن ئەوەیە: کەئەگەر بێتو ئینسان بەشداربێ لەبڕیاردان بۆ کوشتنی کەسێك, ئەوە ئەو کەسەش بەبکوژ (قاتل) حیساب دەکرێ, هەروەکو ئەوەی کەزۆرجار لەناو بیری عەشایەریدا بڕیار دەدرێ کەدەبێ فڵان کەس بکوژرێ بەتۆمەتی ئەوەی لەگەڵ ئافرەتێکدا بینراوە کەئەمە لەشەرعدا ڕێگا نەدراوە بەکوشتنی ئەو کەسە, یان کەسێك بەناحەق کەسێکی کوشتووە بەڵام بکوژەکە هەڵاتووەو بەردەست ناکەوێ, ئەوە دروست نیە برایەکی یان ئامۆزایەکی یان باوکی لەجیاتی ئەو بکوژرێتەوە. جا ئەگەر کۆمەڵێك بڕیاریاندا با فڵان کەس لەجیاتی فڵان کەسی بکوژ بکوژرێتەوە ئەوا ئەگەرچی یەك کەس ئەو کەسە بەناڕەوا دەکوژێ, بەڵام هەموو ئەوانەی لەمەجلیسەکەدا بەشدارییان لەو بڕیارەدا کردووەو بەکوشتنی ئەو کەسە ڕازیبوون, هەموویان دەبنە شەریکی تاوانی بکوژەکە, هەروەها ئەو کەسەش دەبێت بەشەریکی تاوانی کوشتنی بەناحەق ئەو کەسەی کەکوشتنی موسڵمانێك بەڕەوا بزانێ, بەحەق بزانێ, وەختێ دەبیستێ فڵان کەس کوژراوە (کەهیچ تاوانێکی نەکردووە) ئەم لەماڵی خۆیەوە دەڵێ دەستیان خۆش بێ, پێی دڵخۆشە, تەئییدی دەکا, بەحەڵاڵی دەزانێ, ئەوە بەشێك لەو تاوانی کوشتنە, بەشێك لەو موحاسەبەیە وەردەگرێ کەبۆ قاتڵەکە دیاریکراوە لەڕۆژی قیامەتدا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ أعانَ عَلى قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِشَطْرِ كَلمَةٍ لَقِي اللهُ مَكْتوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ آيسٌ مِنْ رَحْمَةَ الله)(رَواهُ إبن ماجَة), واتە: هەرکەسێك هاوکاریی کەسێك, یان هاوکاریی کۆمەڵێك بکا بۆ کوشتنی موسڵمانێك با بەبەشی کەلیمەیەکیش بێ, نافەرموێ (بِكَلِمَةٍ) بەڵکو دەفەرموێ: با ئەو هاوکاریکردنە بەبەشە کەلیمەیەکیش بێ, بەشداری بکات لەکوشتنی موسڵمانێك بەناحەق, ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا دێتو (آيسٌ مِنْ رَحْمَةِ اللهِ) بێبەشە لەڕەحمەتی خوای گەورەو بەڕەحم, ئەم ڕستەیە لەنێوچاوانی نووسراوە!! خوای گەورە پەنامان بدات.

خۆشەویستان: هەرکەسێك خەڵکی فێری کوشتن بکا, خوێن ڕشتن لەلای خەڵکی ئاسانو سووك بکا, وەکو ئەو کەسەی کەخۆی دڵی ڕەشەو ڕەقە, بەزەیی‌و سۆزی

ئەماوە، بەخوێن ئەبێ تینوویەتی ناشکێ، ئەگەر کەسێك نەبینێ لەخوێنی خۆیدا دەتلێتەوە دڵی ئیسراحەت ناکات، جا هەروەکو خۆی دەست بەخوێنە، هەوڵدەدات خەڵکانیتریش بەتایبەتی گەنجان چاوی لێبکەن، ئەویش بەوەی کە لەمەجلیسدا، لەدەزگای ڕاگەیاندندا باسی پاڵەوانیەتیو ئازایەتی خۆی دەگێڕێتەوەو باسی دەکا کەچۆن فلان کەسی کوشت، چۆن فلان کەسی ڕەمی کردو چۆن پەلەقاژەی مەرگی بوو، جا گەنجانێکی خوێن گەرمی بێتەجرەبەی دوور لەمزگەوتو ڕەحمەتی ئیسلام، دەیەوێو هەوڵی ئەوە دەدات چۆن ئەویش بتوانێ کەسێك بکوژێو ئازایەتی خۆی بسەلمێنێ. بەڵێ زۆربەی پیاوکوژەکان ئاوا لەڕێگای چاولێکەریەوە دروست دەبن لەکۆمەڵدا.

جا ئیمانداران: بزانن هەرکەسێك پێشەوای خەڵکی بێ بۆ خوێن ڕێژی، بۆ کوشتنی ناحەق، ئەوە نەك هەر خۆی ماڵوێرانو چارەڕەشی دونیاو قیامەت دەبێ بەهۆی ئەو قەتڵە ناڕەوایانەی کە بەدەستی خۆی ئەنجامیان دەدات بەڵکو، تاوانی هەموو ئەو کەسانەشی دەچێتە مل کەچاویان لەو کردووەو ئەو پێشەوایان بووە (إمامُ النَّار) بووە بۆیان، لەوەوە فێری کوشتنی خەڵکی بوونو خوێن ڕشتنیان بەلاوە ئاسان بوو، ئەمەش بەفەرموودەی صادِقُ الأمین" پێغەمبەری ڕەئوفو ڕەحیم کەئاگاداری ئومەتەکەی کردۆتەوەو فەرموویەتی: (لا تُقْتَلُ نَفسٌ ظُلْماً إلاّ كانَ عَلى ابنِ آدَمَ الأوَّلُ كفلٌ مِنْ دَمِّها لأنَّهُ كانَ أوَّلَ مَنْ سَنَّ القَتْلِ)(رَواهُ البُخاري وَمُسلِم)، واتە: هەرکەسێ بەناڕەوا بکوژرێ بەشێك لەئۆباڵی خوێن ڕشتنەکەی بەئەستۆی کوڕە پێشووەکەی ئادەمە، واتە بەملی قابیلە چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کەپیاوکوشتنی داهێنا، وەکو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەسوورەتی (مائیدە ئایەتی 30)دا دەفەرموێ: نەفسی نەخۆشو گەندەڵی پڕ لەحەسوودی قابیل" کوشتنی هابیلی برای لەبەرچاوی جوان کرد، وەفیعْلاً کوشتی ئیتر بەم کردەوە ناپەسەندە، قابیل بوو پیاوکوژی زیانبارو ماڵوێران لەهەردوو جیهاندا، لەدونیاو قیامەتدا.

جا ئیمانداران: ئێمە سوپاس بۆ خوای گەورە موسڵمانین، قورئانمان هەیە، سوننەتی پێغەمبەرمان هەیە، با قەبری خۆمان بۆ کەس پڕ نەکەین لەئاگر، هەرکاتێك کێشەیەك، ململانێیەك، تەماعێك، کەوتە نێوانمانەوە، دەبێ بچینە خزمەت قورئان، بەقورئان

کێشەکانی نێوانمان حەل بکەین بەفەرموودەو ئامۆژگاریەکانی حەزرەتی رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کێشەکانی خۆمان چارەسەر بکەین: ﴿ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ ﴾(النساء 59)، بەڵام زۆر بەداخەوە، میللەتی موسڵمان، خەڵکی مزگەوت، ئەهلی جومعەو جەماعەت، زۆر جار بینیومانەو بیستوومانە لەسەر دەمەقاڵەیەك، لەسەر موشکیلەیەکی بچووك، پەنا براوەتە بەر چەك‌و کوشتن‌و خوێن ڕشتن، لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هاتووە کەفەرموویەتی: (إنَّ مِنْ أشْراط السَّاعَة.. وَيُكْثِرُ الهَــرَج، قـــــالوا: يا رَسُولَ الله، وما الهَــرج؟! قـالَ: القَتْل، القَتْل)، واتـــە: یەکێ لەنیشانەکانی هـــاتنی قیامەت بریتییە لـــەچەند نیشانەیەك، یەکێ لەوانە بریتی‌یە لەکوشتن، لەخوێن ڕشتن، لەوەی کەخەڵکی کوشت‌وبڕیان لا ئاسان دەبێ‌و ڕۆژانە ئینسان هەواڵی کوشتنی دەیان کەس دەبیستێ لەوڵاتەکەی خۆیدا.

لەوڵاتانی دونیادا، کەزۆربەی خەڵکی بێتاوان‌و دەست قڵیشاوو هەژارەکانن، کەدەبنە سووتەمەنی شەڕی نێوان سەرکردەکان‌و وڵاتەکان، کەچی کاتێ لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە هەواڵەکە بڵاودەبێتەوە کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر کەم نەبێ، کەخاوەنی ئیمانێکی پتەوو سۆزو ڕەحمی ناو دڵن، دڵیان بەبیستنی ئەو کوشتن‌و خوێن ڕشتنە تەنگ دەبێ‌و ویژدانیان دەهەژێ، بەڵام زۆربەی خەڵکی هەروا دەزانن چەند چۆلەکەیەك کوژراون! ئەوە نیشانەیەکە لەنیشانە بچووکەکانی هاتنی قیامەت،تەنانەت فەرموودەیەکی تری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هەیە کە لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە کەفەرموویەتی: (وَالَّذي نَفْسي بِيَدِهِ لا تَذْهَبِ الدُّنيا حَتَّى يَأْتي عَلى النَّاسِ يَوْمٌ لا يَدْري القاتِلُ فيمَ قَتَلَ، وَلا المَقْتُولُ فيمَ قُتِلْ! فَقيلَ: كَيْفَ يَكونُ ذلِكَ؟! قالَ: الهَرَج، القاتِلُ وَالمَقْتُولُ في النَّارِ..).

واتە: پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: بەو کەسەی کەگیانی من وا لەدەستی توانای ئەودا، کەخوای تاك‌و تەنهایە، دونیا ئاخر نابێ تا خەڵکی دەکەونە ڕۆژێکی ڕەشی واوە، پیاوکوژ بۆ خۆیشی نازانێ لەسەر چی‌و لەبەر چی پیاوی کوشتووەو بۆچی خوێنی خەڵکی ڕشتووە، هەروەها ئەوەی کەکوژراوە نازانێ بۆچی دەیکوژن، صەحابەکان

فەرموویان: قوربان ئەوە چۆن دونیا وای لێدێت؟! فەرمووی: ڕۆژێك دێ دونیا دەبێ بەتاڵانوبڕۆو بگرەوبەردەو تاخۆرانو بخۆران, لەو ڕۆژەدا بکوژو کوژراو هەردوولایان دۆزەخین.

هەروەکو لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە کەعەرزی پێغەمبەریان کرد: قوربان وا پیاوکوژەکە جەهەنەمییە, ئەی کوژراوەکە بۆچی جەهەنەمییە؟! فەرمووی: چونکە ئەویش بەتەمای کوشتنی بەرامبەرەکەیەتی, ئەگەر ئەو" ئەمی نەکوشتایە, ئەم ئەوی دەکوشت, هیچیشیان نازانن لەسەر چی یەکتری دەکوژن, نە یەکتری دەناسن, نە ماڵی یەکیان خواردووە, نە کەسیان لەیەکتر کوشتووە, کەچی سەنگەر لەیەکتر دەگرنو لەپێناوی شەڕی دوولایەن" دوو سەرکردە, بەخوێنی سەری یەکتر تینوون!!

( صَدَقْتَ يا رَسُولَ اللهِ, وَبِالحَقِّ نَطَقْتَ ) بەڕاستی هەموویمان بینی!

خۆشەویستان, موسڵمانانی بەڕێز: لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەکوشتنی کەسێکدا بەناحەق, سێ کەس, سێ تاقم دەبنە شەریکی تاوانەکەی پیاوکوژەکە:

**یەکەم**: حکومەت, چونکە پیاوکوژەکە ئەگەر دەسەڵاتدار بێ, حکومەت نایگرێ بەڵام ئەگەر هەژار بێو تووشی تاوانی کوشتن ببێ, ئەوا ئەگەر خاوەن کوژراوەکەش عەفووی بکات, حکومەت عەفووی ناکات! کەواتە پشتیوانیی کرد بۆئەوەی چاوی نەترسێو لەکوشتن سڵ نەکاتەوە.

**دووەم**: ئەوەی صوڵحی عەشایەری بۆ دەکات, وەکو سەرۆك عەشرەتو پیاوماقووڵو ڕیش سپیو مەلاو شێخو خاوەن دیوەخان, کاتێ کەسێك بەناحەق" بەناڕەوا" بەناشەرعی, لەسەر شتێکی زۆر بچووك کەسێك دەکوژێ, ئەمە لەشەریعەتی ئیسلامدا دەفەرموێ دەبێ ئەو کەسە بکوژرێتەوەو بدرێتەوە دەستی خاوەنی کوژراوەکە, میراتگرەکانی, بۆئەوەی لەهەمان شوێن, لەبەرچاوی خەڵك تۆڵەی لێبکەنەوەو بیکوژنەوە. بەڵام ئەم بکوژە دەچێتە ماڵو دیوەخانی سەرۆك عەشرەتێك, خاوەن دیوەخانێك, ئەویش پەنای دەداو هەوڵی زۆر دەداو تەکلیفی بۆ دەکات کەنەیکوژنەوەو صوڵحی عەشایەری بۆ بکەن. بەم شێوەیە لەکوشتنەوە ڕزگاری دەکات, ئەمیش فێر دەبێو جارێکی تریش خەڵکی دەکوژێ, وەخەڵکی تریش فێری کوشتن دەبن.

**سێیەم:** ئەو کەسانەی کەپارە کۆدەکەنەوە بۆ ئەو کەسەی کە بەناحەق کەسێکی کوشتووە, تا خوێنی بۆ بدەن‌و لەکوشتنەوە ڕزگاری بکەن! ئەوە بزانن‌و ئاگاداربن, هەرکەسێك بەیەك دینار بەشداری لەو خوێن دانەدا بکات, بایی ئەو دینارە لەو تاوانی کوشتنە ناحەقە بەشدار دەبێ. بۆچی؟ چونکە ئەو کەسە نانی شەوی نیە, کەچی دەستی دەچێتە خوێنی خەڵكو بەناحەق دەیکوژێ, جا خۆ ئەگەر بزانێ پارەی بۆ کۆدەکرێتەوەو خوێنی بۆ دەدرێ ئەوە زۆر سووڕتر دەبێ لەسەر خوێن ڕێژیو مرۆڤ کوشتن! لەبەرئەوەی لەئیسلامدا دەبێ پارەو کۆمەك بۆ کەسێك کۆبکرێتەوەو صوڵحی بۆ بکرێ کە بەهەڵە کەسێکی لەدەست کوژراوەو لەشەرعدا کوشتنەوەی لـــەسەر نیەو خوێنی لەسەرە.

بەڵێ ئیمانداران: کوشتن ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە تەنها بەبکوژەکە ناوەستێ بەڵکو ئاگرەکەیو غەزەبەکەی هەموو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەئاگاداری کوشتنەکەن‌و دەستی بکوژ ناگرن‌و دیفاع لەکوژراوی ستەم لێکراو ناکەن, پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لا يَقِفَنَّ أحَدُكُمْ مَوْقِفاً يُقْتَلُ فيهِ رَجُلٌ ظُلْماً, فَإِنَّ اللَّعْنَةَ تَنْزِلُ عَلى مَنْ حَضَرَهُ حِينَ لَمْ يَدْفَعوا عَنْهُ)(رَواهُ الطَبَراني والبَيهَقي بإسناد حَسَن), واتە: با هیچ کەسێك لەئێوە لەشوێنێکدا نەوەستێ کەکەسێکی بەزوڵم‌و ستەم تێدا دەکوژرێ, چونکە لەعنەت (بێبەش بوون‌و دووربوون لەڕەحمی خوا) دادەبەزێتە سەر هەرکەسێك کەلەو شوێنەدا وەستاوەو چاوی لەو کوشتنە ناحەق‌و زوڵمەیەو دەستی بکوژ ناگرێو دیفاع لەستەم لێکراو ناکات!

تەنانەت لەفەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هاتووە کەفەرموویەتی: (قُسِمَتْ النَّارُ سَبْعِينَ جُزءاً, فَلِلآمِرِ تِسْعَةٌ وَسِتُّونَ, وَلِلْقاتِلِ جُزءٌ وَحَسْبُهُ)(رَواهُ أحمد) واتە: ئاگری دۆزەخ بەسەر حەفتا بەشدا دابەشکراوە, بۆ ئەو کەسەی فەرمان دەکات بەکوشتنەکەو دەڵێ فلان کەس بکوژە, ڕەمی بکە, شەستونۆ بەش لەو حەفتا بەش ئاگرە بۆ ئەو کەسەیە کەفەرمانی کوشتنەکە دەردەکاتو تەنها یەك بەش لەحەفتا بەشە ئاگرەکە بۆ ئەو کەسەیە کەبکوژەو فەرمانەکە جێبەجێ دەکاتو کەسەکە دەکـــوژێ بەناحـــەق, ئـــەو بەشەش بەسیەتی بۆئـــەوەی بیسووتێنێو تـــۆڵـــــــەی

کوژراوەکەی لێبکاتەوە!

بەڕێزان: خۆشترین گوناه و تاوانو سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە، بەلای شەیطانەوە کەئینسانی ئیماندار ئەنجامی بدات بریتییە لەکوشتن، لەخوێن ڕشتن بەناحەقو ناڕەوا، هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: هەموو ڕۆژێك کەبەیانی دادێ، شەیطانی لەعین، گەورەترینو ئاشکراترین دوژمنی سەرسەختی ئینسان، بانگی سەربازو شاگردەکانی دەکاتو دەڵێ: (مَنْ أخْذَلَ اليَوْمَ مُسْلماً ألْبَسْتُهُ التَّاجَ!) کێ لەئێوە دەتوانێ ئەمڕۆ موسڵمانێك لەئومەتی محمد، لەئەهلی مزگەوتو دین تووشی خزانو لادانو گومڕایی‌و بێدینیەكو بێشەرعیەك بکات، تاوەکو من پاداشتی بدەمەوەو تاجی ڕێزو شەرەفی بخەمە سەر سەرو نیشانەی ئازایەتی بکەم بەیەخەیەوە؟!

پەنا دەگرین (بەخوا لەشەیطانو داروودەستەکەی‌و پیلانەکانیان) با ئاگاداربین ئێمە هەموو ڕۆژێ پیلانو کەمینمان بۆ دادەنرێ لەلایەن شەیطانو سەربازەکانیەوە، جا زۆر جار لەڕێگای وەسوەسەو خەیاڵاتی خراپەوە شەیطان زەفەر بەئینسان دەباو دەیخاتە داوی خۆیەوە، زۆر جاریش لەڕێگەی ئینسانەوە، ئەو ئینسانەی کەشەیطانەو لەبەرگو شکڵی ئینساندایە، کەئەم جۆرەیان زۆر خەتەرترە لەشەیطانی جینی، چونکە شەیطانی جینی هەر بەخەیاڵو وەسوەسەی خراپ زەفەر بەئینسان دەبات، بەڵام شەیطانی إنس (ئینسان) بەواقیعی، بەئاشکرا دێتە لای ئینسانو هانی دەداو قسەی بۆ دێنێ‌و دەباو نەخشەی بۆ دەکێشێ، هەتا سەرەنجام بەدبەختو ماڵوێرانی دەکات، چەند کەسمان بینی بەهۆی ڕەفیقی خراپەوە، بەهۆی ئینسانی دووزمانو فیتنەوە، بەهۆی ئینسانی حەسوودو بەخیلەوە، تووشی تەڵاق دانی ژنەکەی بوو، تووشی خوێن ڕێژی‌و کوشتن بوو، بۆیە دەبێ بەردەوام هەموو بەیانیەك، دوای هەموو نوێژێك بڵێین: خوایە پەنا دەگرم بەتۆ بمپارێزی لەوەی کەشەیطانی جنۆکە وەشەیطانی ئینسان زەفەرم پێ بێنێ‌و تووشی لاڕێ بوونو بێشەرعی‌و ماڵوێرانیم بکات.

بەڵێ ئیمانداران: با بچینەوە خزمەت فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا کەفەرموویەتی: دوای ئەوەی کەشەیطانی گەورە ئەو بانگەوازە بڵاودەکاتەوەو ئەو پاداشتە دیاریدەکات، شەیاطینەکان بەسەر زەویدا بڵاودەبنەوەو پاشان دوای گەڕانو ئەنجامدانی چالاکیەکانیان

دەگەڕێنەوە لای شەیطانی گەورەیان و یەکێکیان باسی کارەکەی خۆی دەکات و دەڵێ: (لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى طَلَّقَ إِمْرَأَتَهُ) دەڵێ گەورەم، من چوومەماڵێك ژن و مێردێکی ڕێکوپێکی بەختەوەری تێدا دەژیا، بەڵام چوومە نێوانیانەوە و بەهۆی ئەوەوە کەئەوان دووربوون لەیادو زیکری تۆ، توانیم زەفەریان پێ ببەم و قسەیەکی ناخۆش، کێشەیەك کەچەند ساڵ لەوەوپێش لەنێوانیاندا بووە، دەیهێنمەوە یادو بیریان و وایان لێدەکەم قسەی لەسەر بکەن و دەمەدەمێی لەسەر بکەن و پاشان پیاوەکەم وا تووڕەکرد، چاوی هیچی نەدەبینی و ئەو هەموو خۆشەویستی و بەیەکەوە ژیانەی چەند ساڵەی کە لەگەڵ ئەو ژنەیدا هەیبووە لەبیرم بردەوە و وام لێکرد دەست بکات بەتەڵاق خواردن و سەرەنجام ئەو ژن و مێردەم لەیەك کردو پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق دا، جا هیوادارم بەم کارەم توانیبێتم تووشی تاوان و خراپەیان بکەم و ئەم پیاوە کەژنی نەماوە تووشی ڕوانینی حەرام دەبێ و منداڵی سەرگەردان دەبێ و خزمایەتی دەپچڕێ، ئایا موستەحەقی ئەوە نیم کەخەڵاتەکە وەربگرم؟!

شەیطانی گەورە دەڵێ: نەخێر ئەم تاجە شایەنی سەری تۆ نیەو ئەم مەدالیایە بۆ یەخەی تۆ نابێ چونکە ( يُوشِكُ أَنْ يَتَزَوَّجَ ) من ئەم پیاوە دەناسم و دەزانم توانای هەیە ژن بێنێتەوە و تووشی بێشەرعی نەبێ و منداڵی سەرگەردان نەبێ و ژنەکەیشی جوان و گەنجە دەتوانێ شوویکاتەوە و لەخراپەی تەنیایی بەدووربێ. بەڵێ ئەمیان دەچێتە ئەولاوە و یەکێکی‌تر دێتە پێشەوە و دەڵێ: گەورەم منیش کەلێرە ڕۆیشتم چوومە ماڵێکەوە باوك و کوڕێکی لێبوو، زۆر بەیەکەوە ڕێکوپێك بوون، کوڕەکە زۆر ئیحتیرامی دایك و باوکی دەگرت و لەقسەیاندا بوو، بەڵام چونکە دووربوون لەیادی تۆو لەجیاتی قورئان و فەرموودە گوێبیستی گۆرانیی ناشەرعی بوون، منیش چوومە نێوانیانەوە و سەرەنجام لەبەرچاوی یەکتری ناشیرینم کردن و ئەوەبوو وام لەکوڕەکە کرد سەرپێچی فەرمانی دایك و باوکی بکاو دڵیان ئازار بداو بەتووڕەییەوە بەجێیان بێڵێ، ئەمەش کارێکی گەورەیەو یەکێکە لەو گوناهانەی کەئینسان پێی ماڵوێران دەبێ، کەواتە من شایەنی ئەوەم ئەو تاجی ڕێزەم بکرێتە سەر. شەیطان دەڵێ: ڕاستە بێئەمری دایك و باوك و دڵ ئازاردانیان یەکێکە لەگوناهە گەورەکان و هەرکەسێ دایك و باوکی لێی تووڕەبن خواش لێی تووڕەیە، بەڵام من

دەزانم (يُوشكُ أنْ يَبَرَّهُما) نزيكە ئەو كوڕە پاش ماوەیەك پەشیمان ببێتەوەو بێتەوە بۆ لای دایكو باوكیو دەستیان ماچ بكاتو ئاشتیان بكاتەوەو دایكو باوكیش بەرامبەر بەئەولاد هیچیان لەدڵدا نیەو گەردنی ئازاد دەكەن, كەواتە ڕیسەكەی تۆ دەبێتەوە بەخوریو وەكو هیچت نەكردبێ وایە!

پاش ئەو دوانە, ئەمجا شەیاطینی سێیەم دێتو دەڵێ: گەورەم منیش كەلێرە ڕۆیشتم, تووشی دوو كەس بووم كەدەمەقاڵەو مشتومڕیان بوو لەسەر شتێكی بچووك, لەسەر تەماعێكی كەم, لەسەر موشكیلەیەكی زۆر سادە كەچارەسەری ئاسان بوو, بەڵام من چوومە لای ئەوەیانەوە كەزۆر تووڕە بوو, چاوی بەرپێی خۆی نەدەبینی, زۆرم هانداو پێم گوت: تۆ چۆن قسە لەفلان كەس قبووڵ دەكەی؟! ئەها چۆن هاتۆتە مەیدانتو قسە لەقسەتدا دەكات! ئەگەر تۆ ئەو نەكوژیو ئەمڕۆ لەناوی نەبەی" بەیانی ئەو دەست پێشخەری دەكاتو تۆ دەكوژێ. بەم شێوەیە هانمداو عەقڵم لا نەهێشتو سەرەنجام بەرامبەرەكەی كوشت (لَمْ أزَلْ بِهِ حَتَّى قَتَلَ), جا كوشتنیش هەروا ئاسان نیەو دەیان فیتنەیو ماڵوێرانی دونیاو دوارۆژی بەدواوەیە, جا هیوادارم كارەكەی من پەسەندی تۆ بێو توانیبێتم ئەو موسڵمانە بەهۆی تاوانی كوشتنەوە ماڵوێرانی دونیاو قیامەت بكەم!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئا لێرەدا شەیطانی گەورە باوەش بەو شەیطانە بچووكەدا دەكات كەنوێنەری خۆی بووەو دەڵێ: (أنْتَ, أنْتَ), تۆ, تۆ, خۆشەویستی منی, بەڕاستی تۆ پاڵەوانی, تازە ئەو پیاوكوژە دونیاو قیامەتی فەوتا, ئیتر تاجەكە دەكاتە سەری ئەو! (رَواهُ إبنُ حَبَّان في صَحيحِهِ)

جا با ووشیار بین, ئاگاداری خۆمان بین, بەردەوام لەیادو ذیكری خوای گەورەدا بین بۆ ئەوەی إنشاءَ الله ڕۆژێك لەڕۆژان شەیطان زەفەرمان پێ نەباو تووشی لاڕێبوونو چارەڕەشی دونیاو دوارۆژمان نەكاو نە كەس بكوژینو نە كەش بمانكوژێ.

خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم باسی حالی ئەو كەسەمان بۆ دەكات كە لەدونیادا بەزوڵمو ستەم خوێنی ڕژاوەو بكوژەكەی بەهۆی دەسەڵاتەوە وەكو بەرزەكی بانان بۆی دەرچووەو ناوی ئەم كوژراوە مەزڵوومە لەبیری هەموو كەس چۆتەوەو مێژووش ناوی تۆمار نەكردووە, دەفەرموێ: (يَأتي المَقْتولُ مُتَعَلِّقاً رَأْسُهُ بإحْدى يَدَيْهِ,

مُتَلَبِّباً قاتِلَهُ بِالْيَدِ الأُخرى تَشْخُبُ أَوْداجُهُ دَماً حَتَّى يَأْتِي بِهِ الْعَرْش)، واته: لەڕۆژی قیامەتدا، ئەو کەسەی کە لەدونیادا بەناحەق‌و ناڕەوا کوژراوە،
بەدەستێکی سەری خۆی بەدەستیەوەیەو شاڕەگەکانی ملی کفارەی خوێنیان دێ وەك تازە ئەو دەمە کوژرابێ ئاوا لەسەر ئەو حاڵە، دەچێ دەستی بکوژەکەی دەگرێ (کەلەو ڕۆژەدا زۆر شەرمەزارو زەلیلە)، دەیهێنێ بۆ لای عەرشی خوای گەورە، لەو کاتەدا کوژراوەکە ڕوودەکاتە خوای رَبُّ العالَمینو دەڵێ: (هذا قَتَلَني)، ئەی پەروەردگارم، ئەی کەسی بێ‌کەسان، ئەم کابرایەبوو کە لەدونیادا بەهۆی دەسەڵاتی زۆرو ماڵی دونیاوە پشت ئەستوور بوو، منی کوشت‌و هیچ حەقیشی لەسەرم نەبوو، کەسیشم نەبوو تۆڵەی لێ بستێنێ، داوات لێدەکەم ئەمڕۆ کەڕۆژی حەق‌و عەدلە تۆڵەم بۆ لەو بکوژەم بکەیتەوە! خوای گەورەش بەکابرای بکوژ (قاتل) دەفەرموێ: (تَعسْتَ)، هەی عەمرت نەمێنێ، ئاخر بیرت لەوە نەکردەوە کەهەرچەندە دەسەڵاتدار بی، لەسەروو تۆوە خوایەکی باڵادەست هەیەو ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆ هەیە کەحەقی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵم، ( وَيُذْهَبُ بِهِ إلى النَّار) (رَواهُ الترمذي وحَسَّنَهُ).

ئەمجا لەلایەن خواوە فەرمان دەکرێ کەئەو پیاوکوژە بەرەو جەهەنەم ببرێ!

ئیمانداران: ئایا ئەگەر کەسێك تووشی تاوانی کوشتن بوو، دەستی بەخوێنی خەڵکی بەناحەق سوور بووبوو، ئایا ئەگەر تۆبەی کرد، خوای گەورە تۆبەی لێ قبووڵ دەکاو لێی خۆش دەبێ؟! لەوولامدا دەڵێین: فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کە لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە دەفەرموێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ڕووی لەصەحابەکان کردو فەرمووی: (تُبايِعُوني عَلى أَنْ لا تُشْرِكوا بِاللهِ شَيْئاً، وَلا تَزْنوا، وَلا تُسْرِقُوا، وَلا تَقْتُلوا النَّفْس الَّتي حَرَّمَ اللهُ إلاَّ بِالْحَقِّ)، فەرمووی: وەرن پەیمانم بدەنێ‌و دەست بخەنە ناو دەستم‌و بەڵێن بدەن کەشەریك‌و هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن، هەروەها زیناو داوێن پیسی نەکەن، وەدەست بۆ ماڵی خەڵکی نەبەن بەخیانەت‌و دزی لەخەڵك نەکەن، وەئەو نەفسەی کەخوای گەورە خوێن ڕشتنی حەرام کردووە، بەناحەق خوێنی نەڕێژن، (فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ على اللهِ، وَمَنْ أَصابَ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ فَعُوقِب بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصابَ مِنْ ذلكَ شَيْئاً فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ، فَأَمْرُهُ إلى اللهِ إنْ شاءَ عَفا عَنْهُ، وَإنْ شاءَ عَذَّبَهُ)..

حەزرەتی رَسولُ الله فەرمووی: ئەی صەحابەکان, ئەی ئومەتم هەرکەسێك لەسەر ئەو بەڵێنەی کە بەمنی داوە کەشەریك بۆ خوا بڕیار نەداو زیناو دزی نەکاو کەس بەناحەق نەکوژێ, ئەوە ئەجرو پاداشتی لەسەر خوایە, کەسەربەرزی دونیایان دەکاو بەبەهەشتی بەرینیان شاد دەکات إنشاءَ الله, بەلآم هەرکەسێك ئەو عەهدو پەیمانەی شکاندو تووشی زینا, دزی, خوێن ڕشتنی خەڵك بوو بەلآم تۆڵەی لێسەندرایەوە, زیناکەرەکە داری حەدی لێدرا, یان ئەگەر ژن بوو یان پیاوبوو ڕەجمو بەردەباران کرا, وەدزەکە دەستی بڕدراو ماڵەکەی لێ سەنرایەوە, وەپیاوکوژەکە کوژرایەوە, ئەوە لەدونیادا تۆڵەی خۆی وەرگرتۆتەوەو پاك بۆتەوە لەو گوناه و تاوانەی, وەفەرمووی: هەرکەسێك ئەم تاوانانەی ئەنجامدا, دزی کرد, یان زینای کرد, یان کەسێکی بەناحەق کوشت بەلآم خوا بۆی پەردەپۆش کردو لەگەڵ خۆی بردیە ژێر گڵ, بەلآم هەموو کاتێ خۆی بەتاوانبارو خەتابار دەزانیو داوای لێخۆشبوونی لەخوا دەکرد ئەوە دەکەوێتە بەر ئەمرو فەرمانی خوا, ئەگەر ئارەزوو بکا لێی خۆش دەبێو ئەگەر ئارەزووش بکا سزای دەدا..

کەواتە خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا نەیفەرموو خوا تەوبەی لێ قبووڵ ناکا, بەڵکو فەرمووی: خوای گەورە مەشیئەتو گەورەیی خۆیەتی ئەگەر حەز بکا عەفووی دەکاتو ئەگەر حەز بکا بەجەهەنەم سزای دەدا تا ئەو کاتەی لەو گوناهەی پاك دەبێتەوە. کەواتە با ئەو کەسانەی کەڕۆژێك لەڕۆژان شەیطان فێڵی لێکردوونو تووشی تاوانی قەتڵ بوون, وەتۆڵەیان لێ نەکراوەتەوەو کەسوکاری کوژراوەکەش ناناسن, یان لێك دابڕاون تا بچن خوێنیان بدەنێو گەردنی خۆیانیان پێ ئازاد بکەن, ئەوا با لەنێوان خۆیانو خوادا تەوبە بکەنو هەموو کاتێ خۆیان بەخەتابارو گوناهبار بزاننو ئومێدیشیان هەبێ کەخوا ئەوەندە (أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ)ـە إِنْشاءَ الله لێی خۆش دەبێو بەڕەحمی خۆی کوژراوەکە ڕازی دەکا لەقیامەتدا تا ئەویش بکوژەکەی خۆی عەفوو بکات.

خۆشەویستان: با هەموومان گوێ لەم ڕووداوە بگرین کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بۆمان دەگێڕێتەوەو صەحابی زۆر بەڕێزو خۆشەویست" ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: پیاوێك هەبوو لەئومەتانی ڕابردووی پێش ئێمە, ئەم پیاوە ئینسانێکی دڵڕەقو

بێڕەحم بوو، دەستی بەخوێنی خەڵکی سوور بووبوو، ئەوەبوو نەوەدونۆ کەسی کوشت!! بەڵام دوای ئەو هەموو قەتڵە بیریکردەوە کەئەگەر بگەڕێتەوە بۆ لای خوا تۆ بڵێی خوا لێی خۆش ببێ؟! بۆ ئەم مەبەستە لەخەڵکی پرسیو گوتی: پێم بڵێن کێ زاناترین کەسە لەم وڵاتەدا، کەشارەزابێ لەدینی خوا؟ گوتیان: فڵان سۆفیلکە، زۆر خواپەرستەو گۆشەگیرە. جا کابرا چوو بۆ لای سۆفیلکەکەو پێی دەڵێ: من نەوەدونۆ کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیەو ئەگەر تەوبە بکەم خوا لێم خۆش دەبێ؟! کابرای راهیبو گۆشەگیر گوتی: نەخێر، قەت خوا لەتۆ خۆش نابێ! جا کابرای بکوژ گوتی: دەی مادام خوا هەر لێم خۆش نەبێ با تۆش بکوژم. ئەوەبوو سۆفیلکەکەشی کوشتو کردی بەسەد کەسی تەواو، بەڵام ئەوەبوو دوای ماوەیەك جارێکی تریش ویژدانی هاتەوە جۆشو دەروونی ئازاری دەدا، بۆیە دەستیکردەوە بەپرسیارکردنو گوتی: پێم بڵێن کێ زاناترین کەسە لەم وڵاتەی ئێمەدا بەدینی خواو شەرعی خوا؟! ئەمجارەیان پیاوێکی زۆر عالمی نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆ لایو پێی دەڵێ: مامۆستا، من سەد کەسم کوشتووە، ئایا ئەگەر تەوبە بکەم خوا لێم خۆش دەبێ؟! عالمەکە دەڵێ: بەڵێ، بۆت هەیە تەوبە بکەیو کەس ناتوانێ ڕێگەی تەوبەت لێبگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لەهەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو برۆ بۆ فڵان وڵات لەوێ کۆمەڵێك خواناسو پیاوباشی لێیە، خەریکی خواپەرستیو عیبادەت کردنن، برۆ تۆش لەوێ لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو مەچۆرەوە بۆ وڵاتی خۆت، چونکە خاکێکی شوومو بەدە. جا کابرای پیاوکوژ لەسەر وەصیەتو ڕێنمایی عالمەکە تەوبەیەکی نەصوحی دەکاو وڵاتەکەی خۆی بەجێدێڵێو دەکەوێتە ڕێ بۆ ئەو وڵاتە، دەڕوا تا دەگاتە نیوەی ڕێ، لەوێ دەمرێ، جا فریشتەی ڕەحمەتو فریشتەی عەزاب لەسەر تەرمەکەی حازر دەبنو لەسەری دەبێ بەکێشمەکێشیان، فریشتەی ڕەحمەت دەڵێن: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەکوڵی دڵ ڕووی لەخوای گەورە بووە، کەواتە ئەمە دیاریی دەستی ئێمەیەو دەیبەین بۆ بەهەشت! فریشتەی عەزابیش دەڵێن: ئاخر ئەم پیاوە هەرگیز لەژیانیدا کردەوەی چاکەی نەکردووە کەواتە نێچیری خۆمانەو دەیبەین بۆ دۆزەخ. جا بەئەمرو فەرمانی خوا" مەلائیکەیەك لەشێوەی ئینساندا دەچێ بۆ لای فریشتەی ڕەحمەتو فریشتەی عەزاب، ئەوانیش ئەو

مەلائیکەتە دەکەن بەحەکەمو فەرمانڕەوا, حەکەمەکە دەفەرمویٚ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون, وولآتەکەی خۆیو وولآتەکەی کەبۆی دەچوو, جا لەکام لایانەوە نزیکتر بوو هی ئەوەیانە. کەنێوانەکە دەپێون دەڕوانن لەو جێگەیەوە نزیکتر دەبێ کەبۆی دەچێ, ئیتر فریشتەی ڕەحمەت وەری دەگرن!

لەگێڕانەوەیەکی صەحیحدا دەفەرمویٚ: بەیەك بست لەدێ باشەکەیانەوە نزیکتر بوو, ئیتر کرا بەخەڵکی ئەوێ, لەڕیوایەتێکی صەحیحی تردا دەفەرمویٚ: خوای گەورە نیگای بۆ هەردوولایان کرد, بەم گوندەیانی فەرموو: تۆ تۆزێ دووربکەوەوە, بەویانیشی فەرموو: تۆ تۆزێك نزیك ببەوە, وەفەرمووی: ئینجا نێوانی هەردوو گوندەکە بپێون, ڕوانییان بەلای گوندە باشەکەدا نزیکترە, ئیتر خوا لێی خۆش بوو.. سُبْحانَ الله..

لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرمویٚ: (فَنَأى بِصَدْرِهِ نَحْوَها), دەفەرمویٚ: کاتێ کابرای تۆبەکار ڕۆحی دەرچوو, هەردوو قاچی لەنێوان دێیەکەی خۆیو دێ باشەکەدا بوو کەبۆی دەچوو, بەلآم سنگی بەلای دێ باشەکەدا کەوتبوو, ئیتر خوا لێی خۆش بوو!

خۆشەویستان: ئاینی پیرۆزی ئیسلام دینی ئاشتیو ئارامییەو بۆ پاراستنی خوێنو ماڵی موسڵمانان هاتووە, بۆ ئەوە هاتوو تا ئینسانەکان لەبەندایەتیکردنی بەندەکان ڕزگاربکاتو هەموان بەندایەتیی خوای تاكوتەنها بکەن. هەموو ئەم جەنگانەش کە لەمێژووی ئیسلامدا ڕوویانداوە بۆ چەسپاندنی ئەم مەبەستە بووەو لەشکری ئازادی بەخشی ئیسلامی چووبێتە هەر جێگایەك تەنها داوایان لەخەڵکی ئەوەبووە کەبڵێن: (لا إلهَ إلاَّ الله ومُحَمَّدٌ رَسُولُ الله), هەرکەسێ ئەم شایەتومانەی هێنابێ, ئیتر هیچ کەسێ بۆی نەبووە خوێنی بڕێژێ. با هەموومان گوێ بۆ ئەم فەرموودەیە بگرین کەبوخارییو موسلیم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەصەحابی بەڕێزو پاڵەوانی ئیسلام میقدادی کوڕی ئەسوەد (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕنەوە کەمیقداد دەفەرمویٚ: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد, ئەی پێغەمبەری خوا, حاڵیم بکەو پێم بفەرموو, ئەگەر تووشی پیاوێکی ناموسڵمان بووم, وەبوو بەشەڕمانو ئەو دەستی خۆی وەشاندو دای لەدەستێکمو دەستی پەڕاندم, لەپاشان من زۆرم بۆ هێناو ئەو لەترسی من خـــــۆی دایە پاڵ درەختێكو گـــوتی:

(أَسْلَمْتُ لله)، بڕوام هێنا بەخواو موسڵمان بووم، ئایا لەم حاڵەدا بیکوژم یان نا؟! پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: مەیکوژە. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دەستێکی پەڕاندووم ئەوجا وا دەڵێ، لەوانەیە بەڕاستی نەبێو لەترسان بڵێ موسڵمان بووم، چۆن نەیکوژم؟! فەرمووی: مەیکوژەو تازە خوێن ڕشتنی حەرام دەبێ، خۆ ئەگەر لەدوای گوتنی ئەو دوو ووشەیە کەگوتی: من موسڵمان بووم" سوور زانیت کە بەڕاستیەتیو بۆ فێڵ وا ناڵێ تا فرسەتت لێ بێنێ بتکوژێ، ئەوە ئەگەر بیکوژی ئەوە ئەو لەجێگەو پایەی تۆدا دەبێ بەرلەوەی تۆ ئەو بکوژیت وەك لەوەپێشی تۆ خوێنی پارێزراوو خاوەن ڕێز دەبێ، بەڵام تۆ وەك پێش ئیسلام بوونی ئەو خوێنت بەهەقدارەکانی ئەو کوژراوە ڕەوایە!! (واتە: دەبێ بکوژرێیتەوە لەتۆڵەدا!).

هەروەها بەدرێژایی مێژوو لەسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، نە هیچ یەزیدیەكو نە هیچ گاورو جوولەکەیەك، وە نەهیچ زەردەشتیەك بەزۆر موسڵمان نەکراون، وەهەر کاتێ زوڵم لەزمییەك کرابێت زمی واتە: ئەوانەی کەموسڵمان نینو لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیان بەسەر دەبەن کەدەبێ دەوڵەتی ئیسلامی ئاگای لێیان بێو مافەکانیان بۆ دابین بکاتو ئازادیەکانیان بپارێزێ، بۆیەش ناونراون (ذمّي) چونکە مافەکانیان وەك ئەرکێکی شەرعی لەئەستۆی موسڵمانانو دەوڵەتی ئیسلامیدان، جا هەرکاتێ زوڵم لەیەك ذمّي کرابێت، موسڵمانان هەموویان" بەتایبەت زانایان لەسەریان بەدەنگ هاتوونو لەمردن ڕزگاریان کردوون. بۆ نموونە: پیاوێکی وەك ئبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێك چوو بۆ لای قازان (یان غازان) کەیەکێك بووە لەدەسەڵاتدارەکانی مەغۆل بۆئەوەی کەدیلە موسڵمانەکان ئازاد بکات، پاش گفتوگۆیەکی بوێرانە، قازان پێی دەڵێ: من تا ئێستا هیچ زانایەکم نەبینیوە ئەوەندە سامو ڕێزو هەیبەتی لەدڵمدا هەبێت، بۆیە تۆ هەر تەکلیفێك بکەی من ڕەتی ناکەمەوەو ئەوە هەموو دیلە موسڵمانەکان بەتۆ دەبەخشم، ئبن تەیمیەش دەفەرموێ: نەخێر، دەبێ دیلەکانی ئەهلی کیتابیشمان پێ ببەخشی، چونکە ئەوانیش وەکو ئێمەن (واتە: مادام هاووڵاتی ئێمەنو مادام هاوژینی ئێمەن، با هاودینیشمان نەبن)، هەتا ئەوانیش نەبەمەوە ناڕۆم. ئیتر (غازان) بەناچاری هەموو ئەوانەی ئەهلی کیتابن، واتە: جوولەکەو گاورنو گرتوونی، ئەوانیشی بۆ ئازاد دەکات!

هەروەها بەشاهیدی هەموو مێژوونووسان, هیچ کەسێك لەموسڵمانان دادگەرترو بەڕەحمترو خێرخوازترو چاکەکارتر نەبووە, تەنانەت لەگەرمەی جەنگەکانیشدا, بۆ نموونە: پیاوی وەکو صەلاحەدینی ئەیووبی, لەکاتێکدا ڕیچارد (قَلب الأسَد)ی فەڕەنسی بریندار دەبێتو تێدەشکێ, صەلاحەدین بۆ خۆی پزیشکی تایبەتی خۆی بۆ دەنێرێ, بۆ ئەوەی چارەسەری بکاتو ئاوی ساردی بۆ دەنێرێو میوەی بۆ دەنێرێ!

بەڵام با مێژوو بخوێنینەوەو بزانین.ئایا هەڵوێستی ناموسڵمانان لەکاتی دەسەڵاتدا بەرامبەر موسڵمانان چۆن بووە؟ مێژوو دەڵێ: کاتێك نەصرانیەکان قودس دەگرن, زیاتر لەحەفتا هەزار موسڵمانی ناو شارەکە قەتڵوعام دەکەنو ئەسپانیەکانیان لەناو مزگەوتی (بَیتُ المُقَدَس)دا هەتا ئەژنۆ دەکەونە ناو خوێنی موسڵمانەکانەوە!!

هەروەها موسڵمانەکان چییان پێ نەکرا لەئەندەلوسدا لەلایەن نەصرانیەکانەوە لەدادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕدا (مَحاكِمُ التَفتیش عَنِ العَقائد) کەمێژوونووسان دەڵێن: لەسەدەی سیانزەوە تا سەدەی حەڤدە, نۆ ملیۆن کەسی کوشت!! هەروەها ئەو هەموو موسڵمانەی لەئەندەلوسدا بوون, هیچیان نەمان, چونکە یان دەبوو بەزۆر ببن بەگاور کەبەزۆر گۆشتی بەرازیان دەرخوارد دەدانو خاچیان پێ لەمل دەکردن, یان دەیانکوشتن, یان لەووڵاتەکەی خۆیان دەریان دەکردن!

نموونەیەکی تر: هێرشی تەتەرو مەغۆل بۆ سەر موسڵمانان کەیەکێك لەڕەفتارەکانیان ئەوەبوو کەقەڵای کەللەسەریان دروست دەکرد لەکەللەسەری موسڵمانە سەربڕاوەکان! مێژوونووسان دەڵێن: جاری وا هەبووە یەکێك لەفەرماندەکانی مەغۆل فەرزی دەکرد لەسەر فەرماندەیەکی ژێر دەستیو دەیگوت: دەبێ بچی بۆ ئەو شارەو دەبێ ئەوەندە کەللەسەرەم بۆ بهێنی, ئەگەر کەللەسەری پیاوت دەست نەکەوت هی ئافرەت, ئەگەر هی ئافرەت تەواوی نەکرد, بەهی منداڵ تەواوی بکە!! ئەو کوشتوبڕەی موسڵمانان کە لەشاری بەغدا کرا, کەپایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو, لەساڵی (656)ی کۆچیدا, لەسەر دەستی هۆلاکۆ و سوپا دڕندە کافرەکەی بە (یەك ملیۆن) کەس مەزەندە دەکرێ, هەندێ مێژوونووسیش دەڵێن: دوو ملیۆن موسڵمان شەهید کرا!

نموونەیەکی تر لەمێژووی نزیکمان، کەبریتییە لەو هەموو کوشتارە بەکۆمەڵەی کە لەشۆڕشی کۆمۆنیستی ڕووسیاو چیندا، لەموسڵمانان کرا تەنها لەسەر ئەوەی کەئامادە نەبوون واز لەموسڵمانیەتەکەیان بهێنن، مێژوونووسان دەڵێن: لەسەرجەم ویلایەتە موسڵمان نشینەکانی یەکیەتی سۆڤێتی پێشوودا زیاتر (لەپانزە ملیۆن) موسڵمان شەهید کران!

وەمێژوو دیمەنی زۆر سەرسووڕهێنەرو عەجایبی لەدڕندایەتی کۆمۆنیستو مارکسیستو ماویستەکانی هەڵگری دروشمی (سۆشیالیزمی زانستی) گێڕاوەتەوە، بۆ نموونە: جاری وا هەبووە کەجەندرمەکانی ئەو کافرانە خەڵکی شارو گوندەکانی ویلایەتە ئیسلامیە زەوتکراوەکانیان کۆدەکردنەوەو داوایان لێدەکردن کەدەست لەدینی ئیسلام هەڵگرن، جا ئەگەر ملیان نەدابێ مامۆستای ئاینی مزگەوتەکەیان کوشتووەو پاشان بەخەڵکەکەیان گوتووە کەدەبێ هەموویان پیسایی خۆیان بێنن‌و بەسەر مەلا شەهیدەکەیدا بکەن، ئەگەر بیانەوێ نەکوژرێن!!

ئەمڕۆش ئەمریکاو بەریتانیا بۆ قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی ڕووداوەکەی(لۆکەربی) بڕی دوو ملیارو حەوتسەد ملیۆن دۆلار لەلیبیا وەردەگرن، واتە: بۆ هەر قوربانیەك بڕی (دە) ملیۆن دۆلار! کەچی بۆ قەرەبووکردنەوەی فرۆکە فەرەنسیەکە بڕی (سی‌و پێنج) ملیۆن دۆلار تەرخانکرا، واتە پەنجا هەزار دۆلار بۆ هەر قوربانیەك! بەڵام بۆ گشت قوربانیانی گوندێکی ئەفغانی کەفرۆکە ئەمریکیەکان بەهەڵە بۆردومانیان کرد تەنها (هەژدە هەزارو پێنجسەد) دۆلار دابین کرا، واتە بۆ هەر قوربانیەك تەنها (دە) هەزار دۆلار!!

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز، ئەوەی باسمان کرد، هەڵوێستی ئیسلام بوو بەرامبەر پاراستنی ژین‌و دینی خەڵکی لەکاتی دەسەڵاتو حوکمڕانیدا وەئەوەش هەڵوێستی ناموسڵمانان‌و کافرو خوانەناسان بوو لەکوشتنی موسڵمانان بەبێ هیچ تاوانێك ﴿ إِلَّا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ ﴾..

داواکارم لەخوای گەورەو میهرەبان‌و دادگەر کەبمانپارێزێ لەوەی ببین بەهۆی کوشتنی هیچ کەسێك، وەخوای گەورە خوێن‌و ماڵو بیروباوەڕمان پارێزراو بکات ..

## سەرچاوەکان

1 - قورئانی پیرۆز.

2 - الترغيب وَالتَّرهيب, للحافظ عبدالعظيم المنذري, دار إبن الهيثم, ط 1, 2001.

3 - التاج الجامع للأُصول, منصور علي ناصف, وەرگێرانی: نوری فارس حمەخان, چاپی یەکەم, 1989

4 - رياض الصالحين, الإمام النووي, وەرگێرانی: نوری فارس حمەخان, چاپی یەکەم, 1991

5 - خُطَبْ الشَيخ محمد حَسَّان, دار إبن رجب, ط 1, 1997

6 - منهاج الصالحين, عزالدين بليق, دار الفتح, ط 1, 1987

7 - صَحيح أشراط الساعة, مصطفى أبو النصر الشَلَبي, ط 2, 1998

8 - تەفسیری ئاسان, بورهان محمدأمین, چاپی چوارەم, 2002 .

9 - چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم, م. عەلی باپیر, چاپی یەکەم, 2003 .

# وەصیەتی شەشەم

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ﴾

# ووتـاری ژماره بیست‌وحه‌وت
# پاراستنی مافی هه‌تیو

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالی :

﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى, وَوَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى, وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى, فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلا تَقْهَرْ, وَأَمَّا السَّائِلَ فَلا تَنْهَرْ ﴾

( الضحی 6 ـ 10 )

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم :

( أنا وَكافِلُ اليَتيمِ في الجَنَّةِ هكذا, وَأشارَ بِالسَّبابَةِ وَالوُسْطى وَفَرَّجَ بَيْنَهُما)

( رَواهُ البُخاري )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی خۆشەویست: سەلام‌و ڕەحمەتی خوا لەهەموومان بێت.

بەڕێزان :ئەمڕۆ لەم کاتەو لەم شوێن‌و کاتە پیرۆزەدا, هەر لەخزمەت قورئانداین, گەیشتووینەتە سەر وەصیەتی شەشەمی خوای پەروەردگار کەدەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ﴾ (الأنعام 152), واتە: نزیك ماڵ‌و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی‌و لەقازانجی نەبێت, هەتا ئەو کاتەی گەورە دەبێت‌و بەتەواوی پێدەگات!

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: قورئانی پیرۆز لەپەروەردەکەیدا زۆر گرنگی دەدات بەدەستەبەرکردنی مافی هەموو خاوەن مافێك, گرنگی دەدات بەپاراستنی مافی لاوازو بێدەسەڵاتەکان, هەموو جۆرە زوڵم‌وستەم‌و زۆرێکی حەرام کردووە, بەتایبەت بەرامبەر منداڵە بێ باوکەکان. چونکە بەڕاستی منداڵی هەتیو نموونەی تەواوی کەساسی‌و زەبوونی‌و بێکەسییە.. جا هەر لەبەر گەورەیی‌و ئاگادارکردن‌و پاراستنی مافی هەتیوە کەقورئانی پیرۆز لە (23) شوێندا ناوی هەتیو دەبات, وە لەهەر شوێنەی بەڕەنگێك فەرمان دەدات بەخزمەتکردن‌و پێگەیاندنیان. جا ئەگەر هەموو کەسێك لێکی بداتەوە کەمردن لەڕەگی پەناگوێ نزیکترە‌و هەموو کەسێك گیای مردنە‌و, داخۆ چ ڕۆژێك کتوپڕ ئەمیش بەلادابێت‌و منداڵە نازدارەکانی بەبێ باوك بمێننەوە, سا یان بەدەوڵەمەندی, ئەو کاتە خەڵکی بێویژدان‌و زۆردار ماڵەکەیان بخۆن, یان بەهەژاری کەنامەردێك بیانچەوسێنێتەوە, ئەو کاتە هەست بەگرنگی‌و ئاوڕدانەوەی خێر دەکات لـــەمنداڵی هەتیوو بێ باوك.

بەڵێ, هەرکاتێ منداڵێکی هەتیوی بێنازت چاو پێکەوت, یەکسەر بیری ئەوە بکەوە کەزۆر نزیکە تۆش دونیا بەجێبهێڵیت‌و منداڵە نازدارەکەی تۆش ئاوا بێناز بکەوێت. جا ئەگەر بیرت لەوە کردەوە, ئـــەوە ئەو کاتە بەزەییت بەمنداڵی هـــەتیودا دێتەوەو یارمەتی دەدەیت.

بەڵێ خۆشەویستان: قورئانی پیرۆز دڵو دەروونی موسڵمانانی ڕووناك كردەوەو پاكیكردنەوە لەهەموو چڵكو چەپەڵیەكی سەردەمی نەفامیو بەچەندەها ڕێنموونی بەرزو شیرین پەروەردەی كردن, هەروەكو لەم چەند نموونەیەدا بەئاشكرا دەردەكەوێت:

**یەكەم:** قورئانی پیرۆز لەسوورەتی (الضُّحى)دا ڕوو لەپێغەمبەری پایەبەرزی ئیسلام دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى, وَوَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى, ووجَدَكَ عَائلاً فَأَغْنَى﴾(الضُّحى 6 ـ 8), واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, ئایا پەروەردگارت نەیبینیت بەهەتیویو خێرا دەرووی لێكردیتەوەو لانەی بۆ سازاندیتو حەواندیتیەوە؟! ئەی خۆشەویست ئایا سەرگەردان نەبوویتو نەتدەزانی چی بكەیت, هیدایەتی دایتو ڕێنموونی كردیت؟! ئەی نەیبینیت كەهەژارو نەداری, جا ماڵو سامانی پێ بەخشیتو دەوڵەمەندی كردیتو بێنیازی كردیت؟!

بەڵێ, بەسە بۆ ڕێزی هەتیو لەلای خوا, كەسەرداری پێغەمبەران, حەزرەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, خوای گەورە دوای ئەوەی كەپەیامی ئیسلامی كردە خەڵاتو قورئانی بۆ نارد, باسی ئەو قۆناغە بێنازیو پڕ چەرمەسەریەی پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی دەكاتو یادی دەخاتەوە كەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, هەر لەسكی دایكیدابوو كەباوكی وەفاتی كرد, دواتر كە بەهەتیوی لەدایك بوو, دایكی بەڕێزی جێگای باوكیشی بۆ گرتبۆوە, ئەوەبوو لەتەمەنی شەش ساڵیی حەزرەتدا, لەو تەمەنەدا كەمنداڵ بەگشتیو بەتایبەت منداڵی بێباوك زۆر ئالوودەی دایكیەتی, نا لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا, دایكیشی وەفاتی كردو بۆ جاری دووەم هەتیو كەوتەوە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هەرگیز ئەو كاتەی بیر نەدەچۆوە كەدایكی وەفاتی كردو لەسۆزی بێسنوورو باوەشی گەرمی دایكی مەحرووم بوو! پاشان باپیری كەناوی (عَبْدُالمُطَّلِبْ)بوو, بردیە لای خۆیو لەهەموو كوڕەكانی زیاتر ڕێزی دەگرتو لەتەنیشت خۆیەوە دایدەنیشاند, بەشێوەیەك كەپێغەمبەری خوا هەستی نەدەكرد كەهەتیوەو دایكو باوكی نیە, بەڵام وویستی خوا شتێكی ترەو ئەمجارەشیان نازكێشانی پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تەنها دوو ساڵ دەخایەنێتو لەتەمەنی هەشت ساڵیی پێغەمبەری خۆشەویستدا بۆ جاری سێیەم حەزرەتی محمد هەتیو دەكەوێتەوەو

باپیریشی وەفات دەكات, كەئەمجارەیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم زیاتر فامی كردبوەو زیاتر هەستی بەغەریبیو بێلانەیی خۆی دەكرد, بۆیە بەشوێن تەرمی باپیریدا تا گۆڕستان ڕۆیشتو چاوە پیرۆزەكانی فرمێسكی پێدا دەهاتە خوارەوە. ئەوەبوو لەسەر وەصیەتو ڕاسپاردەی (عَبْدُالمُطَّلِبْ)ی باپیری, ئەبو طالب كەمامی پێغەمبەرەو باوكی ئیمامی عەلی یە" حەزرەتی محمدی گرتە خۆیو زۆر بەدڵسۆزیەوە خزمەتی كرد. جا كاتێك كەرسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم گەورەبوو, ژنی هێناو دەوڵەمەندبوو بەسامانی خاتوو خەدیجەی خێزانی, وەخوای گەورە كردی بەپێغەمبەرو خاتَمُ الأنْبِياء وَالمُرسَلين, ئەم دیمەنانەی دێنێتەوە بەرچاوو پێشی دەفەرموێ:

﴿ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلا تَقْهَر ﴾ (الضُّحى 9), كەواتە: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا, ئەی ئیماندار, ئاگات لەهەتیو بێ, دڵی مەڕەنجێنە.

قەتادە دەفەرموێ (كُنْ لليَتِيم كَالأبِ الرَّحيم), واتە وەكو باوكێكی دڵسۆزو بەسۆز وابە لەگەڵ منداڵی هەتیودا.

ئیمانداران: هەر لەقورئانی پیرۆزدا, لەسوورەتی (الماعون)دا دەفەرموێت: ﴿ أرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴾ (الماعون 1), واتە: ئایا سەرنجت نەداوە لەو كەسەی ئاینی خوا بەدرۆ دەزانێت! ئەو كەسەی كەبڕوای بەقیامەتو پاداشتو سزای بەردەمی مەحكەمەی خوا نیە, ئەمە نیشانەیەتی: ﴿ فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ, وَلا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴾(الماعون 2 ـ 3), ئەوە كەسێكە كەهەتیو دەردەكاتو پێدا هەڵدەشاخێتو بەزەیی پێدا نایەتەوە. ئینجا هەروەكو خۆی دەستی هەتیوو هەژارو لێقەوماوان ناگرێتو یارمەتیان نادات, هانی خەڵكیش نادات لەسەر بەخێوكردنو خزمەتكردنیان.

بەڵێ, ئاینی ئیسلام دەیەوێت موسڵمان هەرچۆنێك بێت كاری خێر بكات, هەیبووباشە, نەیبوو هانی خەڵكی بدات, واتە: دەستەوئەژنۆ دانەنیشێت.

جا خۆشەویستان: دینداریو خواناسی, بڕوابوون بەقیامەتو بەهەشتو جەهەنەم هەر بەقسە نابێت, بەڵكو نیشانەی هەیە, هەركەسێك ئەم نیشانانەی لێ نەهاتەدی ئەوە با بەقسەش ئیدیعای ئیمانو موسڵمان بوون بۆ خۆی بكات" هەر قسەیەو ناوەڕۆكی نیە. جا ئەگەر بەزەییت بەهەتیوو هەژاردا هاتەوەو بەپێی توانای خۆت چاكەت لەگەڵدا كردنو

هانی خەڵکیشت دا لەسەر چاکەکردن لەگەڵیاندا, ئەوە دڵت خۆش بێ کە إنشاءَ الله ئیمانداری, بەڵام پەنا بەخوا ئەگەر دڵت ڕەق بوو بەرامبەر هەتیوو نەدارو بێنازەکان, وەهانی خەڵکیشت نەداو حەزت نەدەکرد خەڵکیش یارمەتیان بدات, ئەوە بەنەصی فەرموودەی قورئان ئیمانت بەقیامەتو پاداشتو سزای دوای مردن نیە.

دووەم: پێغەمبەری خۆشەویستیش صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم بەفەرمایشتە بەرزەکانی, جەختی دەکرد لەسەر گرنگیدان بەسەرپەرشتیکردنی منداڵی بێباوکو دەیفەرموو: (أنا وَكافِلُ اليَتيمِ فِي الجَنَّةِ هكذا, وَأشارَ بِالسَّبابَةِ وَالوُسْطى وَفَرَّجَ بَيْنَهُما) (رَواهُ البُخاري), واتە: منو سەرپەرشتیاری هەتیو لەبەهەشتدا وەکو ئەم دوو پەنجەیە ئاوا لەیەکەوە نزیکین, ئینجا بەپەنجەی دۆشاومژەو هەڵمەقووتەی ئاماژەی دەکرد.

لەفەرموودەیەکی تردا سەروەرو سەردارمان, دڵسۆزی ڕاستەقینەی هەتیوان, دەفەرموێ: (مَنْ مَسَحَ عَلى رَأْسِ يَتيمٍ لَمْ يَمْسَحْهُ إلاّ اللهِ كانَ لَهُ فِي كُلِّ شَعْرَةٍ مَرَّتْ عَلَيْها يَدُهُ حَسَناتٌ)(رَواهُ أحمَد), واتە: هەرکەسێك دەستی سۆزو میهرەبانی بهێنێت بەسەر هەتیوێکدا, تەنها لەبەر خاتری خوای گەورەش دەستی بەسەردا بهێنێت, بەبێ هیچ مەبەستو بەرژەوەندیەکی دونیایی, ئەوا لەکاتی ئەو دەست بەسەر هێنانەدا دەستی بەر چەند تاڵە موو بکەوێ لەسەری ئەو منداڵە هەتیوە, خوای گەورە لەجیاتی هەر تاڵە موویەك چاکەیەکی بۆ دەنووسێ!

هەروەها لەفەرموودەی پێغەمبەردا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم هاتووە کەهەر سفرەیەکی نان خواردن هەتیوێك نانی لەسەر بخواتو ڕێزی ئەو هەتیوە لەوماڵەدا بگیرێت ئەوا شەیطان لەو سفرەو ماڵە نزیك نابێتەوەو ئەو ماڵە خۆشەویسترین ماڵە لای خوا کەهەتیوی بەڕێزو حورمەتەوە تێدا خزمەت دەکرێ!

صەحابی بەڕێز ئەبی دەرداء (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: جارێکیان کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەر شکوای حاڵی خۆی کرد کەدڵی ڕەقەو هەرچەند قورئانی بۆ بخوێنرێتەوەو بیر لەمردنو قەبرو قیامەت بکاتەوە دڵی نەرم نابێو دڵی ڕەقە, عەرزی حەزرەتی کرد ئایا چی بکات؟! پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەیت دڵت نەرم بێتو بەپێویستیو ئاواتی دڵی خۆت بگەیت ئەوا: (إرْحَمِ اليَتيمَ,

وَامْسَحْ رَأْسَهُ، وَأَطْعِمْهُ مِنْ طَعامِكَ، يَلِنْ قَلْبُكَ وَتُدْرِكْ حاجَتَكَ)(رَواهُ الطَبَراني وَصَحَّحَهُ الألباني)، واته: بەزەییت بەهەتیودا بێتەوەو دەست بەسەریدا بهێنەو لەخواردنی خۆتی دەرخواردبدە، بەوە دڵت نەرم دەبێتو بەئاواتی دڵی خۆت دەگەیت..

صەحابی ئازیزو خۆشەویست" ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (وَالَّذي بَعَثَني بِالحَقِّ) سوێند بەو کەسەی کە بەحەقو ڕاستی منی کردووە بەپێغەمبەرو ڕەوانەیکردووم بۆ سەر ئێوە (لا يُعَذِّبُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ مَنْ رحم اليَتيم وَلانَ لَهُ في الكَلامِ ورحِمَ يُتْمَهُ وَضَعْفَهُ، وَلَمْ يَتَطاوَلْ عَلى جارِهِ بِفَضْلِ ما آتاهُ اللهُ)(رَواهُ الطَبَراني)، واتە: خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا سزای ئەو کەسە نادات‌و بەدۆزەخ سزای ئەو کەسە نادات کە لەدونیادا بەزەیی بەهەتیودا هاتۆتەوەو بەزمانی شیرین‌و نەرم قسەی لەگەڵدا کردووەو هەرکاتێ چاوی بەهەتیوێکی بێناز کەوتبێ، دڵی بۆی سووتاوەو سۆزی بۆی جووڵاوەو چاوی لەتاوی بۆی پڕ بووە لەئاو، بەزەیی بەزەعیفیو بێنازیەکەیدا هاتۆتەوە کە لەسۆزی بێباوکی بێبەش بووە، ئەوە ئەو کەسە خوای گەورە لەقیامەتدا سزای نادات، وەهەروەها خوای گەورە سزای ئەو کەسەش نادات کەخوای گەورە بەسەریکردۆتەوەو ماڵو سامانێکی زۆری پێبەخشیوە، دراوسێو هاوماڵەکانیشی نەدارو هەژارن، ئەم دەوڵەمەندە خۆی بەسەر دراوسێکانیدا بەرز ناکاتەوەو کارێکی وا ناکات کەهەست بەهەژاریو نەداری خۆیان بکەن، بەم شێوەیە ئەم دەوڵەمەندە خانوویان بەسەردا بەرز ناکاتەوە، ناهێڵێ بۆنی جگەری برژاویان بچێ بەناوجگەری سووتاوی هەژاریاندا، وەبەبەر چاوی ئەواندا میوەو خواردنی خۆش ناهێنێتەوە بۆ ماڵو منداڵی، یان بەشی ئەوانیش دەدات.

ئیمانداران: ئێستا با بزانین پاداشتی ئەو کەسە چیە، پاداشتی ئەو ئافرەتە چیە کەکاتێ هاوسەرەکەی دەمرێ، گەنج‌و جوانە، بەڵام چەند منداڵی بچووکی هەیە ئەگەر شوویکاتەوە ئەو منداڵانە سەرگەردان دەبن‌و لەسۆزی دایکیان بێبەش دەبن هەروەکو لەسۆزو باوەشی باوکیان بێبەش بوون، لەبەر خاتری ئەو منداڵە چاو گەشانەی شوو ناکاتەوەو لەسەر منداڵە هەتیوەکانی دادەنیشێ. لەبارەی گەورەیی ئەم ئافرەتانەوە گوێ لەم فەرموودانەی پێغەمبەری خوا بگرن کەحەزرەتی رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم

دەفەرموێ: (أنا وَإمْرَأةٌ سَفْعاءُ الخَدَّيْنِ كَهاتَيْنِ يَوْمَ القِيامَةِ, إمْرَأةٌ آمَتْ زَوْجَها ذاتُ مَنْصَبٍ وَجَمالٍ حَبَسَتْ نَفْسَها عَلى يَتاماها حَتَّى بانوا أو ماتُوا)(رَواهُ أبو داود), واتە: منو ئەو ئافرەتەی لەبەر زەحمەتو ناخۆشی" ڕوومەتەکانی ڕەش داگەڕاوەو بێوەژن کەوتووەو شوو ناکاتەوەو ئارام دەگرێت لەسەر منداڵە هەتیوەکانی, وەك ئەم دوو پەنجەیە واین لەبەهەشتدا (پەنجەی شایەتومانیو پەنجەکەی تەنیشتی), واتە: ئەو ژنەی خاوەن پایەو جوانیەو نەفسی خۆی دەگرێت لەسەر منداڵە هەتیوەکانی هەتا گەورە دەبن یان دەمرن.

حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أنا أوَّلُ مَنْ يَفْتَحُ بابَ الجَنَّةِ, إلاّ أنَّني أرى إمْرَأةً تُبادِرُني, فَأقولُ لَها: مالَكِ؟ وَمَنْ أنْتِ؟ فَتَقُولُ: أنا إمْرَأةٌ قَعَدْتُ عَلى أيْتامٍ لي)(رَواهُ أبو يَعلى وإسنادُهُ حَسَنٌ), واتە: پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: من یەکەم کەسم کەدەرگای بەهەشتم بۆ دەکرێتەوە, بەڵام کاتێ دەمەوێ بچمە بەهەشتەوە تەماشا دەکەم وا ئافرەتێك دەیەوێ شان بەشانی من بێتە بەهەشتەوە! منیش پێی دەڵێم: ئەوە تۆ خەریکی چی؟! ئەوە تۆ دەتەوێ پێشبڕکێ لەگەڵ مندا بکەی بۆ چوونە ناو بەهەشت, پێم بڵێ تۆ کێی؟! ئافرەتەکەش وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: من ئافرەتێکم لەتەمەنی لاویەتیمدا, هاوسەری خۆشەویستم کۆچی دوایی کردو چەند منداڵی بچووکی لەدوای خۆی بەجێهێشت, هەرچەندە من لەئەوپەڕی جوانیو شۆخوشەنگیدا بووم, چەند کەس هاتنە خوازبێنیم شوویان پێ بکەمەوە, بەڵام ئەگەر من شووم بکردایەوە ئەو منداڵانەم لەجیاتی جارێك" دوو جار هەتیو دەکەوتنو سەرگەردانو ماڵوێران دەبوون, هەر بۆیە بڕیارمدا شوو نەکەمەوەو لەسەر منداڵەکانم دانیشم, ئەوەبوو بەکوێرەوەریو نەداریو لەژێر تۆمەتو تیروتوانجی خەڵکیدا ئەو منداڵە هەتیوانەم پێگەیاندنو گەورەم کردن, جا بەخوا پاداشتی من هەر ئەوەیە لەخزمەت تۆدا بێمە بەهەشتەوە.

بەڵێ ئیمانداران, با ئەم فەرموودە پڕ لەمژدەیەی پێغەمبەری خوا, ببێتە مەدالیای خەڵاتی ملی ئەو ئافرەتە بەڕێزانەی کەتەمەنی جوانییان بەدیار منداڵی هەتیوی خۆیانەوە بەسەر بردو لەپێناو ژیانێکی خۆشو بەختەوەر بۆ منداڵە بێباوکەکانیان, گوڵی بەهاری ژیانی خۆیان هەڵوەراندو, هەم دایك بوون بۆ منداڵەکانیان, هەم باوك بوون بۆیان..

پیرۆزیان بێ بەهەشتی نەبڕاوەی خوا, لەخزمەت ئەو پێغەمبەرەدا کەخۆی بەهەتیوی لەدایك بوو و گەورە بوو!

بەڕێزان: با بچینە خزمەت دایکی ئیمانداران" حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) کەبۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕۆژێکیان لەژوورەکەی خۆمدا لەماڵی پێغەمبەری خوادا صَلَّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دانیشتبووم, لەو کاتەدا ژنێکی هەژار لەدەرگای ژوورەکەمی داو کەدەرگام لێکردەوە تەماشام کرد دوو کچۆڵەی لەگەڵدا بوو, نیشانەی برسیەتی بەدەموچویانەوە دەخوێنرایەوە, بۆیە دایکەکەیان داوای لێکردم کەشتێکیان پێبدەم بیخۆن, منیش هەموو ژوورو ماڵەکەم گەڕام تەنها سێ دەنکە خورمام دۆزیەوە, سێ دەنکە خورماکەم دایە دەست ژنەکەو ئەویش یەکی دەنکێ خورمای دایە کچەکانیو هەر خێرا خواردیانو قووتیاندا, ئەم دایکە کەئاگری برسیەتی تینی بۆ هێنابوو, دەنکە خورماکەی کەبەر خۆی کەوتبوو بردی بۆ دەمی بۆ ئەوەی کەمێك لەو برسیەتیەی بێتە خوارەوە, بەڵام هەردوو کچەکەی داوایان لێکرد کەدەنکە خورماکەی خۆی بدات بەوان, ئافرەتەکەش دەنکە خورماکەی خۆیشی کەخەریك بوو بیخوات" کردی بەدوو کەرتەوەو دای بەئەوانو بۆ خۆی هیچی نەخوارد! حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: ئەم کارەی ئەو ئافرەتە بێوەژنەم بۆ ئەو دوو کچۆڵە هەتیوانەی زۆر سەرنجی ڕاکێشامو کارەکەی زۆر لام پەسەندبوو, زۆر بەدڵم بوو, لەبەر ئەوە کاتێ پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هاتەوە بۆ ماڵەوە بۆم گێڕایەوە, پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إنَّ اللهَ قَدْ أوْجَبَ لَها بِهِما الجَنَّةَ, أوْ أعْتَقَها بِهِما مِنَ النَّارِ)(رَواهُ مُسلِم) واتە: خوای گەورە لەبەرخاتری ئەو دوو کچە بەهەشتی بۆ دایکەکەیان مسۆگەر کردووە, یان فەرمووی: خوای گەورە بەهۆی چاکەکردنو خزمەتکردنی ئەو دوو کچۆڵەیەوە" ئەو دایکەیان لەئاگری دۆزەخ ئازاد دەکات!خۆشەویستان: پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەربارەی ئەو کەسانەی کەیارمەتی بێوەژنی دانیشتوو لەسەر هەتیو دەدات, دەفەرموێ: (السَّاعي عَلى الأرْمَلَةِ وَالمِسْكينِ كَالمُجاهِدِ في سَبيلِ اللهِ وَأحْسِبُهُ قالَ: وَكَالقائِمِ لا يَفْتُرُ وَكَالصَّائِمِ الَّذي لا يُفْطِرُ)(رَواهُ البُخاري وَمُسلِم), واتە: هەرکەسێك بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە خزمەتی بێوەژنو ئینسانی هەژارو نەدار بکاو ئیشوکاریان بۆ جێبەجێ بکاو بەخێویان بکات,

ئەوە بەقەدەر ئەو کەسەی کە لەڕێگەی خوادا خەبات دەگێڕێو غەزا دەکاو ناو دەردەکا بەغەزاکەر, ئەوەندەی ئەوە خێرو پاداشتی بۆ هەیە. ئەبو هورەیرە کەفەرموودەکە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: وا دەزانم فەرمووشی: وەبەقەدەر ئەو کەسەش پاداشتی باشی بۆ هەیە کە بەشەو هەر شەونوێژ بکاو لێی سارد نەبێتەوەو بەڕۆژیش هەمیشە هەر بەڕۆژوو بێ‌و یەك ڕۆژووی لێ نەشکێنێ!

ئیمانداران: ئەگەر کەسێك سەرپەرشتیی هەتیوی کەوتە سەرشان, ئایا دەبێ هەڵوێستی چی بێ بەرامبەر بەو هەتیوانەی کەئەم لەژێن‌و دینیان بەرپرسیارە؟! لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: جارێکیان صەحابەیەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمو عەرزی کرد: ئایا لەکاتی پەروەردەو ئامۆژگاریدا دەتوانم لەو هەتیوانەی ژێر دەستم بدەم" ئەگەر هاتو لاساریان کرد؟ حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: هەروەك منداڵی خۆت مامەڵەیان لەگەڵدا بکەو لەچیدا لەمنداڵی خۆت دەدەیت لەوەشدا لەوان بدەو تەمبێیان بکە (رَوَاهُ أبو داود).

فوضەیلی کوڕی عەیاض (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: (رُبَّ لَطْمَةٍ أَنْفَعُ لِيَتِيمٍ مِنْ أَكْلَةِ خَبِيصٍ), واتە: زۆر جار لێدانی زللەیەك لەمنداڵێکی هەتیو" بەسوودترە بۆ ئەو منداڵە لەوەی کەکولێرەیەکی گەرمی لەکاتی برسیەتیدا بدەیتێ!

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەنابێ منداڵی بێباوك ئەوەندە نازی بدرێتێ کە لەسنوور دەربچێت, بەڵکو دەبێت وەك هەر منداڵێکی تر ڕێنمایی بکرێت‌و لێی بپرسرێتەوە, نەك وەك هەندێ منداڵی هەتیو کەفێری جوێن‌و قسەی ناشیرین دەکرێ, گوایە هەتیوەو نابێ لێی تووڕە ببی!

خۆشەویستان: ئێمە لەخزمەت وەصیەت‌و ڕاسپاردەی خوای پەروەردگارداین کەدەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ﴾ (الأنعام 152) واتە: نزیك ماڵ‌و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی‌و لەقازانجی نەبێت, هەتا ئەو کاتەی گەورە دەبێت‌و بەتەواوی پێدەگات!

لەسوورەتی (النِّساء, ئایەتی 10)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً ﴾ واتە: بەڕاستی ئەوانەی کەماڵی

هەتیوان بەناحەق‌و ستەم دەخۆن, بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن‌و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لەسکیاندا, لەقیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئامۆژگاری صەحابی بەڕێز" ئەبو ذەری غەفاری دەكرد (ڕەزای خوای لێبێت), فەرمووی: (يا أبا ذَرّ إِنَّني أراكَ ضَعيفاً, وَإِنَّني أُحِبُّ لَكَ ما أُحِبُّ لِنَفْسي, لا تَأْمُرَنَّ عَلى إِثْنَيْنِ, وَلا تَلِيَنَّ مالَ اليَتيمِ)(رَواهُ مُسلِم), واتە: ئەی ئەبو ذەر من تۆ بەلاواز دەبینم, وەچیم بۆ خۆم پێ خۆشە ئەوەشم بۆ تۆ پێ خۆشە, بۆیە ئامۆژگاریت دەكەم كەنەبیتە ئەمیری دوو كەس!! هەروەها نەبیت بەسەرپەرشتیارو چاودێری ماڵی هەتیو (شیاوی باسە ئەبو ذەر لەڕاستگۆییدا نموونە بووە) بەڵام لەبەر قورسی‌و گرانیی فەرمانڕەوایی خەڵك‌و هەڵسوكەوت كردن لەسەر ماڵی هەتیو وای فەرموو.

بەڵێ ئەم ئایەت‌و فەرموودەو هاووێنەكانیان بەجۆرێك كاری لەسەر دڵ‌و دەروونی موسڵمانان كرد, كەهەرگیز نزیكی ماڵی هەتیو نەكەون‌و دەستدرێژی نەكەن بۆی, تەنانەت ئەوانەی كەسەرپەرشتیاری منداڵی هەتیو بوون خۆراك‌و نان‌و ئاویان بۆ جیاكردنەوەو نەیاندەهێشت هیچیان تێكەڵ ببێت, واتە: لەهەر ماڵێك خواردن بەجیا لێدەنرا بۆ ماڵەكەو خواردنێكی تر بەجیا لەماڵی منداڵەكە لێدەنرا بۆ ماڵی منداڵە هەتیوەكە, ئەمەش ناڕەحەتی بۆ خاوەن ماڵ دروست دەكردو لەلایەكی دیكەشەوە زیان دەكەوت لەمنداڵە هەتیوەكە چونكە زۆر جار ئەو خواردنەی كەلێی دەمایەوە خەسار دەبوو, بۆیە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواو پرسیاریان كرد, وەكو قورئان لەسووڕەتی (البقرة: ئایەتی 220)دا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلاحٌ لَهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لاعْنَتَكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾, واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست: دێنە لات‌و پرسیارت لێدەكەن دەربارەی هەتیوان, كەچۆن بن بۆیان, پێیان بڵێ: چاكسازی‌و پەروەردەكردنیان لەهەموو شت چاكترو پەسەندترە, خۆ ئەگەر تێكەڵاوییان بكەن‌و بیانهێننە ماڵتان, ئەوانە براتانن, دەبێت بەچاكی چاودێریی خۆیان‌و ماڵیان بكەن, خواش كەسانی خراپەكار, ئەوانەی تۆوی خراپە دەچێنن‌و, چاكەكارانتان دەزانێ‌و جیای دەكاتەوە, ئەگەر خوا بیویستایە باری گران دەكردن‌و مەرجی سەختی

دادەنا دەربارەی چاودێریی هەتیوان، چونکە بەڕاستی خـــوای گـــەورە باڵادەستو دانـــاو کار بەجێیە.

ئیمانداران: زۆر جار لەکوردەواری خۆماندا باسی ئەوە دەکرێت کەنابێ بەهیچ شێوەیەك نزیکی ماڵی هەتیو بکەویەوەو وەکو دەڵێن: سێبەری خانووەکەیشی حەرامە، بەڵام ئایا لەئاینی پڕ سۆزو پڕ دادگەری ئیسلامدا تا چەندێ ئەم قسەیە ڕاستە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: هەروەکو ئایەتە قورئانیەکە ڕوونیکردەوە کەتێکەڵ نەبوون لەگەڵ هەتیو و هاتوچۆنەکردنی" خوای گەورە پێی ڕازی نیەو ئەوەی کەخوا نەهی لێکردووە ئەوەیە کەتۆ ماڵی هەتیو بخۆیو هیچ چاکەیەکیشت بۆیان نەبێ.

کەواتە با خەڵکی هاتوچۆی هەتیوان بکەنو بەڵکو کەچووی بۆ ماڵیان دڵیان مەشکێنەو ئاوو چاو نانیش بخۆو دابنیشەو قسەی خۆشیان بۆ بکەو دوایی کەڕۆیشتی حیسابی ئەوە بکە کەخواردووتەو بەزیادەوە پارە بەدایکی هەتیوەکان بدە، ئیتر بەمە هەم دڵت خۆش کردن هەم یارمەتیشت دان، ئەگینا تۆ چوویتە ماڵێك کەهەتیوی تێدایە ئاویشت نەخواردەوە، ئەوە نەك هەر خێرت ناگات بەڵکو گوناهیشت دەگا بەوەی کە بەبیریان دێنیتەوە کەئەوانە هەتیونو بێکەسو داماونو هەمووشتێکیان حەرامەو دەبێ لەکۆمەڵگادا دابڕێن! وەبەتایبەت ئەوانەی کەسەرپەرشتی هەتیو دەکەن، ئیشوکاریان بۆ بەڕێوە دەبەن، ماڵی هەتیوەکانیان لەلایە، نابێ بەبیانووی ئەوەی نەوەك تووشی حەرام ببن، لەماڵیان نەخۆنو کاسپییەك بەپارەکەیانەوە نەکەن، بەڵکو گوێ بگرن بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کەدەفەرموێ:

(مَنْ وَلِيَ لِيَتيمٍ مالاً فَلْيَتْجَرْ بِهِ وَلا يَدَعْهُ حَتَّى تَأْكُلَهُ الصَّدَقَةُ)(رَواهُ البَيهَقي)، واتە: هەرکەسێك بەخێوکردنی هەتیوێکی کەوتە لا کەسامانو پارەی هەبوو، با بازرگانی پێوە بکاتو نەیهێڵێتەوە زەکات بیخوات!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ماوەی هەتیوی دیاریدەکاتو دەفەرموێ: (لا يُتْمَ بَعْدَ إِحْتِلامٍ)(رَواهُ أبو داود بِإسنادٍ حَسَنٍ)، واتە: دوای باڵغ بوون هەتیوی نامێنێت.

بەڕێزان: با بزانین هەڵوێستی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەربارەی منداڵی هەتیو چۆن بوو؟ پێغەمبەری خوا ئەو منداڵانەی دەلاواندەوە کەباوکیان شەهید بووبوو و

هەتیو کەوتبوون. بۆ نموونە: ئەسمائەی کچی عومیس دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کاتێك کەجەعفەری کوڕی ئەبو تالب‌و هاوڕێکانی شەهیدبوون, چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا, منداڵەکانم شۆردبوون‌و بۆن خۆشم کردبوون, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: منداڵەکانی جەعفەرم بۆ بێنە, دەڵێ منیش بۆم برد, بۆنی کردن‌و پاشان فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە, منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دایك‌و باوکم بەقوربانت بێ, چی دەتگرێنێ؟! هیچت دەربارەی جەعفەرو هاوەڵەکانی بیستووە؟ فەرمووی: بەڵێ, ئەمڕۆ شەهید بوون! (رَوَاهُ أحمد).

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست بەردەوام سەردانی ماڵە هەتیوەکانی دەکردو دڵی دەدانەوەو ئەوەی لەدەستیدا بوایە یارمەتی پێشکەش دەکردن. هەروەها زویری‌و غەمباری پێوە دیاربوو, کاتێ چاوی بەمنداڵێکی ساوای بێباوك دەکەوت کەسەری بێنازی بەسنگی دایکیەوە نووساندووە.

ئیماندارانی بەرێز: گومانی تێدا نیە کەخۆشەویسترین شت بەلای باوکەوە خێزان‌و منداڵەکەیەتی, وەباوك هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە کەئەگەر بۆ خۆی بمرێ, ئایا دەبێ حاڵ‌و وەزعی خێزان‌و منداڵەکەی چۆن بێ لەدوای خۆی, بۆیە گەلێك کەس بەهەموو لایەکدا هەڵپە دەکەن‌و ماڵ‌و سامان کۆدەکەنەوە بەنیازی ئەوەی کەماڵ‌و منداڵیان دوای خۆیان موحتاج‌و داماو نەبن.

بەڵام با بزانین قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە چی دەفەرموێ؟ قورئان دەفەرموێ:

﴿ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافاً خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً ﴾(النساء 9), واتە: ئەگەر ئێوە خەمی منداڵەکانتانە دوای مردنی خۆتان, کەسەرگەردان نەبن‌و خەڵکی لایان لێبکاتەوە, ئەوا ئێستا ئێوە لەخوا بترسن‌و قسەی چاك بکەن‌و هەروەك منداڵی خۆتان مامەڵە‌و هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ منداڵە بێباوکەکانی ژێردەستاندا, ئەگەر ئێوە چاك بن خوای پەروەردگار لەدوای خۆتان فریای منداڵەکانتان دەکەوێت‌و کەسانێکیان بۆ دەنێرێت کە بەچاکی سەرپەرشتییان بکەن.

بەڵێ بەرێزان: لەخوا ترسان‌و پارێزگاری‌و حەڵاڵ خۆری باوك" فریای منداڵەکانی دەکەوێت لەدوای مردنی خۆی, هەروەك خوای گەورە لەسوورەتی (الكهف)دا باسی

حەزرەتی مووساو حەزرەتی خدرمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو کاتەی کەبوون بەڕەفیقو حەزرەتی خدر سێ کردەوە دەکات کە لەدیدو بۆچوونی حەزرەتی مووسا کاری نەشیاونو دەبوایە حەزرەتی خدر وای نەکردایە. ئەویوو سێیەم کار کەلەو سەفەرەدا حەزرەتی خدر ئەنجامیدا بریتی بوو لەوەی کە: حەزرەتی مووساو خدر چوونە دێیەك، هەرچی ماڵی ئەو دێیە بوو کردیان بەڵام کەس جێگای نەکردنەوەو نانو ئاوێکی نەدانێ، ئەوەبوو لەپەنا دیوارێکدا بۆ خۆیان دانیشتن، لەو کاتەدا حەزرەتی خدر هەستا چوو بەلای دیوارێکەوە، کەدیوارەکە کەڵکی نەمابوو خەریك بوو دەڕووخا، حەزرەتی خدر چوو دیوارەکەی پاڵ پێوەناو ڕووخاندیو پاشان جوان دروستیکردەوە. حەزرەتی مووسا خۆی پێ ڕانەگیراو فەرمووی: باشە خەڵکی ئەم دێیە ئەوەندە پیاوی باشن، ئەوەندە ئیحتیرامو ڕێزیان گرتین تا تۆ ئەو پیاوەتیەیان لەگەڵ بکەیو دیواری ڕووخاویان بۆ چاك بکەیتەوە؟! باشە ئەگەر کرێیەکت لێ وەربگرتنایەو بماندایە بەنانو ئاوێك باشتر نەبوو؟ حەزرەتی خدر بۆ حەزرەتی مووسای ڕوون کردەوە کەئەو لەخۆیەوە ئەو کارەی نەکردووە، بەڵکو خوای گەورە ئەمری پێکردم کەئەم کارە بکەم، چونکە ئەم دیوارە ڕووخاوە ماڵی دوو منداڵی هەتیوە کەکاتی خۆی باوکیان پیاوێکی لەخواترسو حەڵاڵ خۆر بووە، پێش مردنی هەندێك ئاڵتوونی لەژێر دیواری ماڵەکەیاندا بۆ منداڵەکانی حەشار دابوو، جا دیوارەکە کەڵکی نەمابوو، خەریك بوو بەتەواوی دەڕووخا، جا ئەگەر بەتەواوی بڕووخایەو ئاڵتوونەکە دەربکەوتایە خەڵکی گوندەکە کە بەچاوی خۆت بینیت چەند بێویژدانو چەند خوانەناسو بێبەزەیین، ئاڵتوونەکەیان بۆ خۆیان دەبردو منداڵە هەتیوە بێکەسەکانی لێ بێبەش دەبوون، کاتی خۆیشی باوکی ئەو دوو منداڵە خواناسو پیاوچاك بوو، جا پەروەردگارت ویستی کاتێك گەنجینەکەیان دەست بکەوێت کەگەورەو بەهێزبن، ئەوسا دەریبهێنن، ئەمەش وەکو ڕەحمەتێکی تایبەتی لەلایەن پەروەردگارتەوە، لەبەر خاتری باوکیان، دڵنیاشبە کەهەموو ئەو کارانەم لەخۆوە نەکردووە، ئیتر ئەوەبوو ڕازو نهێنی ئەو شتانەی کەخۆت بۆ نەدەگیرا کاتێك ئەنجامم دەدان.

جا با سەرنج بدەین ئایەتەکە دەفەرمویێ: ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً ﴾، باوکیان پیاوی چاك بووە. بەڵێ بەهۆی چاکیو پاکیو خواناسی باوکیانەوە، کەهەندێ لەموفەسیرینی

قورئان دەفەرموون: باپیری حەوتەمیان پیاوی چاك بووە! بۆیە خوای گەورە پایەبەرزێکی وەکو حەزرەتی خدر دەنێرێ بۆئەوەی ئەو ماڵە بۆ منداڵەکانی لەدوای خۆی بپارێزێ, تا گەورە دەبنو دەستیان دەکەوێتەوە!

بەڵام بەداخەوە زۆر کەسیش هەیە ڕێگەی چەوت دەگرێتە بەر, حەرام دەخوا, کاسپی ناڕەواو ناشەرعی دەکات, بەهەموو لایەکدا هەڵپە دەکاتو پارەی حەرام لەسەر یەك دادەنێت بەو نیازەی کەدوارۆژی منداڵەکانی مسۆگەر بکاتو دوای خۆی دەست کورتو هەژار نەبن, بەڵام بێئاگا لەوەی کەماڵی حەرام بێبەرەکەتەو فریای منداڵەکانی ناکەوێ, هەروەکو زاناو نووسەری بەناوبانگ" خوالێخۆشبوو (محمود شیت خطّاب) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: منداڵ بووم, لەقۆناغی سەرەتایی دەمخوێند, ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری خوێندنگاکەمان داوای لێکردین کەهەر قوتابیەی بەپێی توانای خۆی یارمەتیەك لەماڵەوە بهێنێت تاوەکو بیدەین بەقوتابیەکی زۆر هەژار کە لەپۆلەکەماندا بوو. منیش لەماڵەوە داوام لەباوکم کرد کەپارەم بداتێ بیبەم بۆ ئەو قوتابییە, باوکم تاس بردیەوەو مات بوو, منیش گوتم: باوکە بۆ ئەو قوتابیە دەناسیت؟ باوکم لەووڵامدا گوتی: بەڵێ, باوکی ئەو قوتابیە فەرمانبەر بوو, هەموو ڕێگایەکی چەوتی گرتبووە بەر بۆ ئەوەی منداڵەکانی لەدوارۆژدا هەژارو بێناز نەبن, کەچی سُبحانَ الله ئێستا وا منداڵەکەی خەڵك پارەی بۆ کۆدەکاتەوە.

بەڵێ, باوکی ئەو منداڵە هەژارە فەرمانبەری دائیرەیەك بوو, بەڵام بەرتیل خۆر بوو, بەبێ بەرتیل ئیمزایەکی نەدەکرد, بەنیازی ئەوەی دوای خۆی منداڵەکانی بێنازومحتاج نەبن, کەچی کۆمەكو یارمەتی بۆ منداڵە هەژارو هەتیوەکانی" دوای خۆی کۆدەکرایەوە!!

کەواتە باوەڕداران: هەرکەسێك دەیەوێت لەدوای مردنی خۆی" خەڵکی بەزەیی بەمنداڵە بێنازەکانیدا بێتەوە, با ئێستا کەخۆی لەژیاندایە بەزەیی بەمنداڵی بێباوكو هەژاردا بێتەوە, هەروەکو خوای گەورە وەحی کرد بۆ حەزرەتی داود پێغەمبەر (عَلی نَبیِّنا وَعَلَیْهِ الصَّلاةُ والسَّلام) فەرمووی: (کُنْ لِلیَتیمِ کَالأبِ الرَّحیمِ وَاعْلَمْ أنَّكَ کَما تَزْرَعْ تَحْصُدْ).. ئەی داود: بۆ منداڵی هەتیو وەکو باوکێکی بەسۆزو دڵسۆز بە لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا, وەبزانە تۆ چی بچێنی, ئەوە دەدوورێتەوە.

واته: هەرکەسێ بەرامبەر مندالّی هەتیوی خەلّك بەڕەحم بێو چاکەیان لەگەلّدا بکات, ئەوا لەدوای مردنی خۆی" خوای گەورە کەسێك دەنێرێو دلّنەرمی دەکات کەئاگای لەمندالّە هەتیوەکانی ئەویش بێتو بەزەیی پێیاندا بێتەوە.

ئیمانداران: ئێستا با بزانین پاداشتی ئەو کەسە چیە کەچاکە لەگەلّ هەتیودا دەکات, لەلای خواو بەرهەمی چیە لەدونیاو ڕۆژی قیامەتدا!

یەکێك لەپیاوچاکان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کابرایەك هەبوو لەشاری بەصرە, ئەم کابرایە لەناو خەلّکدا بەپیاوێکی دیندارو باش نەدەناسرا. ئەم کابرایە مرد, خێزانەکەی دۆش داما, چونکە کەس نەهات بۆ لای تا یارمەتی بداو جەنازەی مێردەکەی لەگەلّ بشارێتەوە, بۆیە چوو دوو کەسی بەکرێ گرتو بردی بۆ مزگەوت تا نوێژی مردووی لەسەر بکرێ, بەلاّم هیچ کەس ئامادە نەبوو نوێژی مردووی لەسەر بکات, بۆیە ئەم ژنە بەدلّێکی زۆر مەحزوونو چاوی پڕ لەگریانەوە بەدوو کرێکارەکەی گوت: ئەم جەنازەیەم بۆ ببەن بۆ سەرقەبرانو قەبرێکی بۆ هەلّبکەننو داپۆشن, منیش پارەتان دەدەمێ. بەلّی کاتێ ئەم دوو حەمالّە لەگەلّ ژنەکەدا چوونە سەرقەبران تەماشایان کرد یەکێ لەپیاوچاکەکان کەلەو دەوروبەرە خواپەرستیی دەکرد, هاتە سەر قەبرەکانو پرسی ئەمە لاشەی فلاّن کەسە؟ گوتیان: بەلّێ, گوتی: دەی من هاتووم نوێژی مردووی لەسەر بکەمو یارمەتیتان بدەم بۆ شاردنەوەی! گوتیان: سُبْحانَ اللهُ, تۆ چۆن بەمردنی ئەم کابرایەت زانیو چۆن ئامادەی نوێژی مردووی لەسەر بکەی لەکاتێکدا کەس ئامادە نەبوو نوێژی مردووی لەسەر بکاتو لەگەلّمان کفنو دفنی بکات؟! پیاوپاشەکە فەرمووی: ئەمشەو لەخەومدا پێیان گوتم کەفلاّن کەس مردووەو بەیانی بچۆ بۆ سەر فلاّن گۆڕستانو ئامادەی کفنو دفنو نوێژی مردووی فلاّن کەسبە, چونکە خوا لەگوناهی خۆش بوو!! ئەمجا پیاوچاکەکە لەژنەکەی پرسی: حەزدەکەم لەکارو کردەوەی مێردەکەت ئاگادارم بکەی. ژنەکە گوتی: ئەم هاوسەرەی من یەکێك بوو لەو کەسانەی کەشەوانە بەدزی خەلّکەوە عەرەقی دەخواردەوە, شەوانە بەسەرخۆشی دەخەوت! بەلاّم بەیانی کە لەخەو هەلّدەستا, خۆی دەشۆردو جلەکانی دەگۆڕیو دەستنوێژی دەگرتو نوێژی بەیانی دەکردو دەگریاو دەیگوت: (إلهي أيّ زاويةٍ مِنْ زَوايا جَهَنَّمَ تُريدُ أنْ تَمْلأها بِهذا الخَبيثِ),

دەیگوت: ئەی خوای من، دەبێ چ گۆشەیەکت لەجەهەنەمدا بۆ ئەم عەبدە پیس‌و خەتاباری گوناهبارەی خۆت دیاریکردبێ! خوایە ڕەحمم پێبکە! وەئەمە حاڵی بوو ساڵ دوانزەی مانگ. لەبەر ئەوە خەڵکی گەڕەك‌و دێیەکەمان بەکابرایەکی عەرەق خۆریان دەزانی‌و ڕقیان لێی بوو.

هەروەها ژنەکە گوتی: ڕەوشتێکی تری ئەم هاوسەرەی من ئەوەبوو کەزۆر بەزەیی بەمنداڵی هەتیودا دەهاتەوەو ڕۆژانە کە لەبازاڕو کارو کاسپی دەگەڕایەوە هەتیوێك، یان دوو هەتیوی بێکەس‌و برسی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە بۆ ماڵو لەگەڵ خۆی دایدەنیشاندن‌و لەخواردنی بەردەمی خۆی تێری‌دەکردن. کاتێ منداڵە هەتیوەکان دەهاتنە ماڵی ئێمەوە چاو بەفرمێسك‌و ڕەنگ زەردو کزۆڵ بوون، بەڵام کەدەچوونە دەرەوە، دەم بەپێکەنین‌و ڕەنگ کراوە بوون!

پیاوچاکەکە فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کەخەونەکەم ڕاست بوو، چونکە ئەم کابرایە خاوەنی دوو ڕەوشت بووە کە لەهەر کەسێکدا بن إنْشاءَ الله خوا لێی خۆش دەبێت:

**یەکەم:** هەرکەسێ گوناهی کرد بەڵام دوایی شانازیی بەگوناهەکەیەوە نەکردو بۆ خەڵکی نەگێڕایەوە، بەڵکو خۆی بەخەجاڵەت‌و شەرمەزاری بەردەم خوای ئاگادارو بینەرو بیسەر زانی، نەك وەکو ئەو کەسانەی کەعەرەق دەخۆنەوەو شانازی پێوە دەکەن‌و بۆ خەڵکی دەگێڕنەوە کەچۆن خواردوویانەتەوەو چۆن سەرخۆش بوون‌و چییان گوتووەو خۆیشیان بەتاوانبار نازانن.

**دووەم:** هەرکەسێك بەزەیی بەهەتیودا بێتەوە، خوای گەورەش بەزەیی بەو کەسەدا دێتەوەو لەگوناهەکانی خۆش دەبێت إنْشاءَ الله.

جا موسڵمانانی بەڕێز: ئەو ڕووداوەی بۆم گێڕانەوە، لەکتێبەکانی مێژوو و بەسەرهاتی پیاوچاکاندا نووسراوەتەوە، چەند سەدەیەك لەمەوبەر ڕوویداوە بەڵام حەزدەکەم هەر لەم سەردەمەی خۆماندا، لەم کوردستانەی خۆماندا، ڕووداوێك ڕوویداوەو پەیوەندی بەهەتیوو یارمەتیدانی هەتیوەوە هەیە، حەزدەکەم بۆتان بگێڕمەوە.. فەرموون سەرنجی بدەن‌و بەدڵ گوێی بۆ بگرن، ئەم ڕووداوەش لەکتێبی (ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم)دا نووسراوەتەوەو فەرموون با بەیەکەوە گوێ بۆ ئەو کەسە بگرین کەخۆی

ڕووداوەکەی بەسەر هاتووەو بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

چەند ساڵێك بەر لەئێستا ساڵەکانی گرانی بوو لەهەموو عێراقداو بەتایبەت لەکوردستاندا, کەچەند گەمارۆیەکی ئابووری نێودەوڵەتیو ناوخۆیی دەورەیان دابوو. ساڵی 1994 بوو, خەڵکی بێزار بووبوون لەژیان, ئەو پارەیەی دەستیدەکەوت لەکاسپیدا, بەشی بژێوی ژیانی خۆیو ماڵو منداڵی نەدەکرد, ناڕەحەتی بوو, خەڵکی بەدەست گرانی, بێکاری, هەژاری, بێنەوایيو چەندین شتی ترەوە دەیناڵاند, ئەو کەسەی پارەداریش بوو کەوتبوو.

بەڵێ, کابرا باسی خۆی دەکاتو دەڵێ: من بەش بەحاڵی خۆم ناڕەحەت دەژیام لەشارۆچکەی ( ەید صادق) کەسەر بەشاری سلێمانی بوو, پڕ بوو لەماڵی ئاوارەو کەم دەستو لانەواز, ڕۆژێ لەگەڵ خێزانەکەم کەوتمە گفتوگۆ دەربارەی نانی نیوەڕۆ, دایکی منداڵەکان گوتی: پیاوەکە چی بخۆین بۆ نیوەڕۆ, هیچ شك نابەم لەماڵدا, منداڵەکانیشمان زۆریان برسییەو وەکو خۆمان ناتوانن ئارام بگرن! گوتم: ئافرەت خەمت نەبێ, خوا گەورەیە, سێ دیناری ئاسن شك دەبەم, دەچمە بازاڕ بزانم چی دەکات بۆ پێخۆر, خەرجی دەکەم بۆتان, پاشان خوا دەرگای والآتری لایە بەڵکو کارێکیشم دەستگیر ببێت. دایکی منداڵەکان گوتی: جا سێ دینار بەشی چی دەکات, بەتەمای چی پێ بکڕیت سکمان تێربکات؟! ڕاستی دەکرد, بەڵام خۆ چارمان نەبوو. لەدەرگای ماڵ هاتمە دەرەوەو وردەوردە کەوتمە ڕێگەی بازاڕ, ئەو ساڵەش پەیکەرێکیان لەگەچ بۆ ئەو دوو خوشكو برا قوتابیە دروستکردبوو کە لەڕێگەی چوونیان بۆ قوتابخانە بەهۆی سەرماو سۆڵەوە ڕەق ببوونەوە. لەبەردەم ئەو پەیکەرە تێپەڕیم, موچڕکەیەکم پێدا هات, ئەو ساتە ناخۆشەم کەوتەوە کەئەم دوو منداڵە دڵ پڕ لەهیوایە چۆن گیانیان سپاردبوو! ڕووم لەبازاڕ کرد تا بەو هیوایەی کارێکم دەستگیر ببێت, بەڵام کەچوومە بازاڕ هیچی وەها نەبوو پارەی تێدا بێت, بۆیە ناچار سێ دینارەکەم دا بەدەسکێ سلّۆو بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

بەڕێزان: ئەم گرانیيە تاقیکردنەوەیەك بوو, زۆر لەخەڵکی ماڵوێران بوو بەپارەو سەروەتو سامانەکەی جەهەنەمی بۆ خۆی کڕی, زۆر لەخەڵکیش لەم بارە گرانەدا ئاسوودەيیو خۆشییان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد, چەندە لەم ساڵە گرانییانە بدوێین کەمەو

تەواو نابێت. لەڕێگەی گەڕانەوەمدا، بەقەراغ جادەکەدا گوزەرم دەکرد، ژنێكو منداڵێك لەدوامەوە دەنگیان دەهات، گوێم لێبوو منداڵەکە دەیگوت: دایە گیان دە پێی بڵێ، ئەگینا دەگریم.. دەگریم. دایکیشی دەیگوت: رۆڵە گیان نایناسم، چی پێ بڵێم، چۆن شتی وا دەبێت! منداڵەکە دەستیکرد بەگریان.. گریا، زۆر گریا، هەر دەهاتن بەدوامدا.. هەراسان بووم، بێتاقەت بووم، ئاوڕم دایەوە بەلای ژنەکەدا گوتم: خوشکی باش ئەو منداڵە بۆ دەگری؟! گوناهی چیە؟ بۆ لێی دەدەیت؟ ژنەکەش گوتی: من لێی دەدەم؟! من دەیگرێنم؟! گوناهی منە یان گوناهی تۆ، تۆ دەیگرێنی! دەنگی بەرزکردەوە! کەوای گوت وەستام جوان سەرنجم دا، لێی وردبوومەوە، نە دەیناسم نە دەمناسن، باشە خۆ لێم نەداوە، لەناخەوە منداڵم زۆر خۆش دەوێت. ڕووم کردە ژنەکەو گوتم: خوشکی باش بۆ گوناهی منە؟! ئایا هیچ ئازارێکم پێگەیاندووە تا بەهۆی منەوە دەگریو فرمێسکی چاوی دەبارێتە خوارێ؟! ژنەکە گوتی: بەڵێ، وا چەند ڕۆژێکە نە نانمان خواردووە، نە چایی، ئێستا هاتمە ناو بازاڕ هیچ شتێکم دەست نەکەوت بۆ منداڵەکانم، منداڵەکەشم برسیەتی، چاوی بەو سلقەی دەستی تۆ کەوتووە بۆی دەگری، حەزی لێیەتی، هەرچیش دەکەم نیمە بۆی بکڕم!! منیش گوتم: جا خوشکی باش ئەوە کێشەی خۆتانە، من تەنها سێ دینارم شك دەبرد لەماڵی دونیادا، کاریشم دەست نەکەوت، ناچار دام بەو دەسکە سلقە بۆ منداڵەکانم، ئێستا ئەوانیش چاوەڕوانی دەستی منن، ئەی بیدەم بەتۆ، چی بۆ ماڵو منداڵەکانم بەرمەوە! ئەوانیش برسییانە، منیش زۆر هەژارم، بڵێم چی لەگەڵت،خوا هاوکاریت بکات! تا ئەو کاتە منداڵەکە هەر دەگریا، ژنەکە گوتی: کاکە گیان، بەس نیە ماڵو منداڵ تۆیان هەیتو کارو کاسپییان بۆ دەکەیت، من کەسوکاریشم نیە سەرووەسیەتی منداڵەکانم بکات، لەهەموو لایەکەوە لانەوازم، گەر یارمەتیمان بدەیت خێرت دەگا! لەناخەوە حەزم دەکرد دەسکە سلقەکەیان بدەمێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە غەمی منداڵەکانی خۆشم بوو، بۆیە گوتم: خوشکی بەڕێز، ئەمە بۆ ماڵی تۆ بێت، ئەی ماڵی خۆمان! لێمدا ڕۆیشتم چەند هەنگاوێك بەجێم هێشتن.. منداڵەکە زۆر دەگریا، هاواریکرد! دایکی ئامۆژگاری دەکرد: ڕۆڵە گیان بڵێم چی، ئەویش بۆ ماڵی خۆی دەوێت، ئەوانیش برسییانە!

بەڵێ ئیمانداران: کابرای خاوەن دەسکە سڵق دەڵێ: لەناخەوە بیرم گۆڕا, لەدڵێکی پاکەوە بەزەییم بەو منداڵە برسیو هەژارو بێباوکەدا هاتەوە.. خوایە گیان لەبەرخاتری تۆ دەیاندەمێ.. هەر ئەوە نیە لەبرساندا دەمرین.. خوایە گیان ئەمەش لەڕێگەی تۆدا بەزایە ناچێت. وەستام, ژنو منداڵەکەش لەجێگەی خۆیان وەستان, بەژنەکەم گوت: خوشکی ئازیزم ئەم دەسکە سڵقە بۆ خۆتو منداڵەکانت لەڕاهی خوا, منیش منداڵەکانم خوا ڕەحمیان پێبکات. دەسکە سڵقەکەم دایە دەست منداڵەکە. منداڵەکە توند سڵقەکەی گوشی بەخۆیەوە, هەردوو ڕوومەتە تەڕەکانی سڕی, لەخۆشییان دەستیکرد بەپێکەنین, دایکیشی ڕووی گەشایەوە گوتی: کاکە گیان ئێمە ناتوانین پاداشتت بدەینەوە, خوای گەورە پاداشتت بداتەوە, بۆت بکاتە توێشووی قیامەت.. خوات لەگەڵ.

ژنەکە لەم دوعا خێرانە بەردەوام بوو, من دوورکەوتمەوە, ڕاستە قسەکان سادە بوون, بەڵام لەناخەوە هەستم بەخۆشییەك دەکرد, تا ئەو ساتە چێژی لەو جۆرە خۆشییەم نەکردبوو, زۆر ئاسوودە بووم, گەیشتمەوەماڵو دەستەکانم بەتاڵ بوو, هەر دوای سڵاو لێکردنیان کەوتمە قسەی خۆش, کارێکی وام کرد کەس بیری نەبوو بڵێ: ئەرێ چیت بۆ هێناوینەوە با بیخۆین!

دایکی منداڵەکان بەخێرهاتنەوەی کردم, بەڵام لەڕوخساریداو لەقسەکانیدا چەندین پرسیار دەخوێنرایەوە.. گوێم پێ نەدا, باش بوو شتێکی ئامادەکردبوو خواردمان.. سوپاس بۆ خوا. دوای نوێژو حەسانەوە خێزانەکەم گوتی: باشە ئێوارە چی بخۆین؟! گوتم: خوا گەورەیە, دەرگای ڕزقی خوا والآیە, خەمت نەبێت. گوتی: ڕاست دەکەیت بەڵام.. نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات, گوتم: نانو چایی بۆ خراپە, با ئازاری مەعیدەمان نەگات زۆر باشە خواردنی, گوتی: ئاخر نەگبەت, خۆ شەکرمان نیە, ئەی چایی بەچی دەخۆیتەوە؟ خۆ سووتەمەنیشمان وا لەکزیدایە.

بەڵێ هەر چۆن بوو ئێوارەشمان بەڕێکرد, بەسکی برسییەوە چووینە ناو نوێنی خەوتنەوە, بەدایکی منداڵەکانم گوت: ئافرەت, جوان گوێم بۆ شلکە ئەو سێ دینارەی بەیانی لەگیرفانمدا زرنگەی دەهات, دام بەدەسکێ سڵق, پاشان هەموو ڕووداوەکەم بەجوانی بۆ گێڕایەوە. خێزانەکەم گوتی: خۆزگەم بەخۆت کەتوانیوتە ئەو خێرە گەورەیە دەست خۆت

بخەیت، سوپاس بۆ خوا، هیوادارم خوای گەورە لێتی قبووڵ کردبێ.

بەڵێ سەرم کردە سەر سەرین بەهێمنی چاوم چووە خەو، لەقووڵایی خەودا بووم، خەوێکی زۆر سەرسووڕهێنەرم دی، لەخەومدا دەشتێکی چۆڵ بوو، کاتێکم زانی پڕبوو لەخەڵك، ڕۆژ بەرز بۆوەو هەڵات، خەڵکی هاواریان لێ بەرز بۆوە، دەگریان، هەریەکە بەلایەکدا ڕایان دەکرد، پرسیم ئەوە چیە؟ گوتیان: نەتزانیوە چی بووە؟ ئەی بۆ هاتووی؟ گوتم: بۆ؟ گوتیان: قیامەت هەستاوە، ئێستا تەرازوو دادەنرێتو حەقو حیسابی دونیامان لەگەڵدا دەکەن. سەیری هەرکەسێکم دەکرد دەموچاوی چرچولۆچ بوو، ڕەش داگەڕاو هەناسەبڕکێیان پێکەوتبوو، دیمەنێکی زۆر ترسناك بوو، بانگی هەموو کەسیان دەکرد، کاتێکم زانی گوێم لەناوی خۆم بوو، بانگ کرامە پێش. کاتێکم زانی تەرازوویەکی گەورە هاتە بەردەمم، گوتیان: سەیرکە، ئەم لایەیان چاکەو باشەی دونیای تێدایە، ئەو لایەی تریان کردەوەی خراپو دوور لەخوای تێدایە، چاوەڕوانکە بزانە چی دەبینی!

وردەوردە لای باشەو چاکەم بەرز بۆوە، خراپەکانم زۆر بوون، تەرازووەکە لاسەنگ بوو، گوتیان: تا ئێستا ئەنجامت خراپە، دوعای خێرکە. بەڵام لەو کاتەدا لەتاو ناڕەحەتی بیری هیچم نەمابوو تەنها خەفەتو گریان نەبێت.

بەڵام ئازیزان: بیری ئەو کاتە زێڕینانەم کەوتبۆوە کە بەفیڕۆم دابوون، کەدەمتوانی کاری چاکە بکەم بەڵام نەمکردبوون، نەمتوانیبوو خوا لەخۆم ڕازی بکەم، خێرو چاکەی زۆر بکەم. لەترسان ویستم هەنگاو بەرەو دۆزەخ بنێم، بانگیان کردم: جارێ ماوتە، وەرە سەیرکە.. کاتێکم زانی لەئاسمانەوە یەك یەك، نەرم، وردەوردە گەڵا سڵق داباریننە ناو تەرازووەکەم، لای خێرو چاکەم قورس بوو، تا دەهات زۆر دەبوو، وای لێهات یەکسان بوو، خەریك بوو بڵێم بەسە، بەسە، بەڵام هەر هاتە خوار، هەر هاتە خوار، سوپاس بۆ تۆ خوایە، ئەوەندە هاتە ناو تای تەرازووی چاکەمەوەو کێشەکەی قورس بوو، لەخۆشییاندا گوتم: ئەوە چیە؟! دەنگێك لەنزیکمەوە گوتی: ئەوە ئەو خێرەبوو کەئەنجامت دا، سەیری پاداشتی بکە، خوا چەند بەڕەحمە. بەدەنگی بەرز گوتم: سُبْحانَ الله، اللهُ أكْبَر .

ڕاچڵەکیم، لەخەو خەبەرم بۆوە، کەسەیرم کرد نیوەشەوە،ماڵو منداڵم هەموو خەوتوون، هەستم بەلەرزینی خۆم دەکرد، سەرسام بووم، هەرچی لاشەمە شەڵاڵی

ئارەق بوو, گوتم: سوپاس بۆ تۆ خوایە, خۆت خاوەنی بەزەییت, ڕاستیان گوتووە: مرۆڤی وەها هەیە, هەموو قورئانی بۆ بخوێنە, لەگەڵ ژیاننامەی پێغەمبەرو پیاوچاکەکاندا کاری لێناکات, بەڵام تەنها خەوێك دەیخاتە دونیای فراوانی ڕەحمەتی خواوەو بۆ خوا کاردەکات, کاری لێ دەکات.

بەڵێ, سەرم نایەوە سەر سەرینو نەمزانی کەی چاوم چووەوە خەو ﴿ إِنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (التوبة 120 )

لەکۆتاییدا, داواکارم لەخوای پەروەردگار

هیدایەتی هەموو لایەکمان بدا

دەوڵەمەندەکانمان دڵگوشادو دەستکراوە بکات بۆ یارمەتیدانی هەتیوانو بێوەژنان..

هەموو موسڵمانانو ئێمەش بەر شەفاعەتی سەرداری پێغەمبەران حەزرەتی محمدی مصطفی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بخات ..

اللَّهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمدأمین, چاپی چوارەم, 2002.

3 ـ تفسیر القُرآن الكريم, إبنُ كَثير, دار الكُتُب العِلميَّة, بيروت, ط 1, 1998.

4 ـ الترغيب وَالتَرهيب, للحافظ عبدالعظيم المنذري, دار إبن الهيثم, ط 1, 2001.

5 ـ رياض الصالحين, الإمام النووي, وەرگێڕانی: نوری فارس حمەخان, چاپی یەکەم, 1991.

6 ـ بەرچاو ڕوونی, ئەندازیار: عُثمان محمد رشید, چاپی سێیەم, 2002

7 ـ ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم, ئاوات ئەبوبەکر, چاپی یەکەم, 2003 .

# وەصیەتی حەوتەم

﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لا نُكَلِّفُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا ﴾

# ووتـــــــــاری ژماره بیست‌وهه‌شت

## دادگه‌ری له‌كێشانه‌و پێوانه‌دا

### به‌شی یه‌كه‌م

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ, الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ, وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ, أَلا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ, لِيَوْمٍ عَظِيمٍ, يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

(المطففين 1 ـ 6)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

( ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعاماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ, وَأَنَّ نَبِيَّ اللهِ داودَ كانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ )

( رَواهُ البُخاري )

**الحمدُ للهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِهِ أجمعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئیماندارانی خۆشەویست: هەزاران ڕەحمەتو بەزەیی خوا، برژێ بەسەر ئێمەو هەموو ئومەتی محمددا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تا ڕۆژی دوایی..

لەپاشان: ئیماندارانی بەڕێز، لەم ووتارەماندا گەیشتووینەتە وەصیەتو ڕاسپاردەی حەوتەم لەو (10) وەصیەتو ئامۆژگارییانەی کەخوای پەروەردگار بۆ ئێمەی عەبدویەندەی خۆی کردوونی بەیاساو بەرنامەی ژیان، بۆ بەختەوەریی دونیاو دوارۆژ.

ئازیزانم: گرنگترین شت بۆ مرۆڤ، پارێزراوبوونو سەلامەت بوونی عەقیدەو بیروباوەڕە کەئیمانێکی پاکو خاوێنو دوور لەپۆخڵەواتی شیرکو بیدعەو خورافاتو ئەفسانەگەری، لەدڵی ئینساندا جێگیر ببێ. دوای ئەم خاڵە گرنگە کەسەرچاوەی هەموو چاکیو پاکیو بەختەوەریەکە، ئەمجا باوکو دایك لەگەڵ ئەولادو جگەرگۆشەکانیان ژیانێکی پڕ ڕێزو حورمەتو بەختەوەر بەسەر بەرن، دواتر ئینسان ناموسو شەرەفی پارێزراو بێو داوێن پیسی لەکۆمەڵگا دوور بێ، دوای ئەوەش ئینسان خوێنی پارێزراوبێو خوێنی بەناڕەوا نەڕێژنو خوێنی کەس بەناحەق نەڕێژێ! وەهەروەها خەڵکی هەر بۆ خۆیان نەژینو هەر لەهەوڵی بەختەوەرکردنی ژیانی خۆیانو منداڵەکانی خۆیاندا نەبن، بەڵکو ئاگایان لەمنداڵە بێباوكو هەتیوو نەدارەکانیش بێ. جا هەر کۆمەڵگایەك، دانیشتوانی هەر وولاتو شارو دێو ئاواییەك خاوەنی ئەم ڕەوشتانە بوون، ئەوا بەڕاستی ژیانی بەختەوەریو پڕ خێروبەرەکەت بەباڵای تاکە تاکی ئەو کۆمەڵگایە دەبرێت، کەئەمانەی باسمان کردن وەصیەتەکانی خوای پەروەردگار بوون بۆ ئێمەی ئینسانو عەبدی ئەو پەروەردگارە، کە بەدرێژی" لەشەش وەصیەتدا لەخزمەتیاندا بووین. بەڵام ئایا ئینسان لەژیانی دونیادا دەتوانێ بەبێ کارو کاسپی بژیو بەبێ بوونی بازاڕو شوێنی کەسابەت" ژیان بەڕێوە دەچێت؟! بێگومان نەخێر. بەڵام ئایا کارو کاسپی هەر ئەوەیە ئینسان خەریکی پارە کۆکردنەوەو سەروەتو سامان لەسەر یەك دانان بێ، جا بەحەڵاڵ بێ یان بەحەرام؟! نەخێر. بەڵکو پێویستە بازاڕو کەسابەتو ئەهلی بازاڕ لەچوارچێوەو بەرنامەیەکدا ئیش بکەن کە نە مافی خۆیان بفەوتێ وە نە مافی خەڵکی تریش بفەوتێنن، خـــوای گەورەش

ئەمەی کردۆتە وەصیەتی حەوتەمی لە (10) وەصیەتەکەو دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لا نُكَلِّفُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا ﴾(الأنعام 152), واتە: کێشانەو پێوان بەرێکوپێکی بەکاربهێنن, بەدادگەری ئەنجامی بدەن‌و فێڵی تێدا مەکەن, جا ئێمە داخوازی لەکەس ناکەین مەگەر بەگوێرەی توانای خۆی نەبێت..

خۆشەویستان: حەزدەکەم کەإنشاءَ الله لەژێر تیشك‌و ڕۆشنایی زێڕین‌و گران قەدری ئەم وەصیەتەی خوای گەورەدا (سُبْحانَهُ وَتَعالى) ووتارەکەمان بەسەر چەند خاڵێکدا دابەش بکەین:

**خاڵی یەکەم:** وەکو گوتمان ژیانی دونیای ئینسانەکان بەبێ بوونی بازاڕو ئەهلی کەسابەت نابێ‌و هەر شوێنێك بازاڕی کاسپی‌و شوێنی دەسکەوتنی پێویستیەکانی لێ نەبێت, ئینسان ژیانی تێیدا ناڕێکوپێك‌و بێ‌ئیسراحەت‌و دەرامەت دەبێت, هەروەکو زانایان‌و دانایان فەرموویانە: دونیاو قیامەتی مرۆڤەکان بەهۆی چوار شتەوە ئاوەدان‌و بەختەوەر دەبێ:

1 ـ زانای شارەزاو خواناس کەڕێگای خواناسی‌و ژیانی دیندارانەت بۆ ڕوون بکاتەوە.

2 ـ کاربەدەستی دادگەر کە نەهێڵێ کەس زوڵمی لێ بکرێ‌و مافی بخورێ .

3ـ ئەو تێکۆشەرە گیان فیدایانەی کەپارێزگاری وولات‌و نیشتمان دەکەن لەخوانەناسان‌و داگیرکەران .

4 ـ بازاڕو شوێنی کاسپی‌و پەیداکردنی نانی حەلاڵ .

بەڵێ ئیمانداران: هەر وولات‌و شارو شوێنێك ئەم چوار شتەی نەبوو و لێی نەبوو, ژیان تێیدا قورس‌و گرانە. کەواتە: مادام ژیان بەبێ کارو کاسپی‌و کڕین‌و فرۆشتن نابێ. با بزانین لای خواو پێغەمبەری خــــوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم" ئەهــلی کــەسابەت‌و بازاڕ چۆن ڕێزیان لێگیراوە

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ دەربارەی شەونوێژو قورئان خوێندن‌و دەفەرموێ چەندی توانیتان‌و لەتوانای لاشەو مێشکتاندا بوو, ئەوەندە قورئان دەوریکەنەوەو ئەوەندە لەشەودا بەخەبەربن‌و شەونوێژ بکەن, وا مەکەن پەکتان بکەوێ‌و باری خۆتان زۆر قورس مەکەن, چونکە: ﴿ عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنكُمْ مَرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ

فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾(المزمل 20), واته: خوای پەروەردگار نایەوێت باری سەر شانتان قورس بکاتو ئەو خوایە ئەوەندە میهرەبانە دەزانێت لەوانەیە کەسانێکتان لێ نەخۆش بکەوێتو کەسانی تریش ببن لەزەویدا بگەڕێن بەشوێن بازرگانیو فەزڵی خواداو کەسانی تر لەداهاتوودا بجەنگن بۆ لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێی دینی خواو بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی ئەو.

جا ئیمانداران: بەوردی سەرنجی ئایەتەکە بدەن, لەگەڵ باسی موجاهیدینی (فِي سَبِيلِ اللَّهِ)دا, بەڵکو پێش ئەوان باسی ئەو کەسانە دەکات کە بەسەر زەویدا دەگەڕێن بەشوێن کارو کاسپیی حەڵاڵدا! کە بەڕاستی ئەمە فەزڵو گەورەیی کاسبکارانو بازرگانەکانو ئەهلی بازاڕ دەردەخات.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرموویەتی: (ما أكَلَ أحَدٌ طَعاماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ, وَأنَّ نَبِيَّ الله داودَ كانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ)(رَواهُ البُخاري), واتە: هیچ کەس هەرگیز پارووە نانێکی نەخواردووە کەچاکترو پاکتر بێ لەو پارووە نانەی کە بەرەنجی شانی خۆیو عەرەقەی ناوچەوانی خۆی بەدەستی هێناوە, وەپێغەمبەری پایەبەرزو بەڕێز حەزرەتی داود (سەلامی خوای لێبێت) هەر لەبەرهەمی کاسپی دەستی خۆیو ڕەنجی شانی خۆی دەخوارد.

صەحابی خۆشەویستو بەڕێز" عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرموێ: پرسیارکرا لەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: (أيُّ الكَسْبِ أفْضَلُ؟) ئایا چ کاسبیەکو کەسابەتێك زۆر پیرۆزەو گەورەترە لەهەموو کارو کاسپییەکانی تر؟! فەرمووی: (عَمَلُ الرَّجُلُ بِيَدِهِ وَكُلُّ بَيْعٍ مَبْرورٍ)(رَواهُ الطَبَراني), واتە: کاسپی دەستی ئینسان خۆیو هەموو کڕینو فرۆشتنێکی حەڵاڵو بێ فروفێڵ, ئەوە لەهەموو جۆرە کارو کەسابەتێك گەورەترو پڕ بەرەکەتترە!

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا, حەزرەتی رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ يُحِبُّ المُؤْمِنَ المُحْتَرِفِ), بەڕاستی خوای گەورە ئەو ئینسانە ئیماندارەی خۆشدەوێ کەدەست ڕەنگینەو پیشەو سنعەتێك دەزانێت.

ئیمانداران: گوێ بگرن بۆ ئەم فەرمموودە شیرینەی کەصەحابی خۆشەویست کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕۆژێکیان کەکۆمەڵێ ئەصحاب لەخزمەت پێغەمبەری خوادا دانیشتبوون, تا لەو کاتەدا گەنجێکی زۆر جوان‌و ڕێکوپێك بەبەردەمیاندا هات‌و سەلامی کرد, زۆر لەش سووکانە دەهات‌و دەچوو شتی دەکڕی‌و دەفرۆشت‌و کەلوپەلی بار دەکردو دادەگرت, صەحابەکان ڕوویان کردە پێغەمبەری خۆشەویست‌و فەرموویان: (لَوْ كانَ هذا فِي سَبِيلِ اللّٰهِ) خۆزگایە ماندووبوونی ئەو کوڕە گەنجە کەئاوا بۆ کارو کاسپی لەشی سووکەو بەهەڵمەتەو دانیشتن نازانێ, خۆزگە بۆ خوا بوایەو لەڕێگای خوادا ئاوا تێکۆشەر بوایە (چونەکە صەحابەکان وا حاڵی بووبوون کارو کاسپیکردن با بەحەلاڵیش بێ" هەر پەیوەندیی بەدونیاو ژیانی دونیاوە هەیەو هیچ پەیوەندیەکی بەپاداشتی قیامەتەوە نیەو خوای گەورە هیچ پاداشتێك بۆ کاسبکار لای خۆی دانانێ). جا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە هەڵەیە, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم وەلامی دانەوەو فەرمووی: ئەی صەحابەکان, ئەی هەموو موسڵمانان, دەی بزانن: ئا ئەم گەنجە ڕۆح سووکە لەش سووکە کاسبە (إِنْ كانَ خَرَجَ يَسْعى عَلى وَلَدِهِ صِغاراً فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ), ئا ئەم کوڕە کاسبە, ئەگەر بۆیە ئاوا هەڵپە دەکاو ئەملاو ئەولا دەکاو نازانێ دانیشێ, مەبەستی لەم کاسپیکردنەی ئەوەبێ کە (ئەگەر منداڵی بچووکی هەبێ) منداڵە بچووکەکانی کەچاوەڕێی دەستی ئەم باوکەیانن ئێوارە شتێکیان بۆ بەرێتەوەو تێریان بکاو پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکاو ماڵو منداڵی چاو لەدەست‌و دەمی دەرو دراوسێ‌و خەڵك نەبن, ئەگەر بەم نیەتەوە کاسپی بکا ئەوە هەموو هەنگاوێکی بەچاکەیەك بۆ دەنووسرێ‌و پاداشتی وەکو ئەو کەسانەیە کە لەپێناوی خوادا تێدەکۆشن.

(وَإِنْ كانَ خَرَجَ يَسْعى عَلى أَبَوَيْنِ شَيْخَيْنِ كَبِيرَيْنِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ) وەهەروەها ئەگەر ئەم کوڕە گەنجە لەم کاسپی‌و هاتوچۆیەیدا مەبەستی ئەوەبێ کەباوك‌و دایکی پیرو ئەنتیاری پەککەوتەی کەلای ئەمن‌و بەخێویان دەکاو ناهێڵێ موحتاج بن‌و ڕووت‌وڕەجاڵی‌و نەداری پیرییان پێوە دیاربێ, ئەگەر بەم نیەتەوە کاسپی بکا ئەوە ئەو کارو کەسابەتەی بەتێکۆشان لەڕێی خوادا بۆ حیساب دەکرێ.. دوای ئەوە حەزرەت فەرمووی: (وَإِنْ كانَ

خَرَجَ يَسْعى عَلى نَفْسِهِ يُعِفُّها فَهُوَ فِي سَبيلِ اللهِ)، ئەگەر ئەم کوڕە گەنجە" بەیانی کە لەماڵ دێتە دەرەوە بەو نیەتەوە بێتە ئەم بازاڕەوەو ئاوا خۆی هیلاك دەکا بۆ ئەوەی کەپێویستیەکانی ژیانی خۆی دابین بکاو تووشی دەست پانکردنەوە لەمو لەو نەبێو خەڵکی نەڵێن بەرەڵایەو بەخۆڕایی دەسووڕێتەوە، بۆ ئا ئەم مەبەستە کاسپی بکا، ئەوە هەر بەجیهاد بۆی حیسابەو خوا پاداشتی گەورەی دەداتەوە، بەڵام (وَإِنْ كانَ خَرَجَ يَسْعى رِياءً وَمُفاخَرَةً فَهُوَ فِي سَبيلِ الشَّيْطانِ) ( رَواهُ الطَبَراني ورجاله رجال الصحيح )

بەڵام ئەگەر ئەم کوڕە کاسپە، مەبەستی لەم کاسپیکردنو پارە پەیداکردنەیدا هەر ئەوەبێ کەخۆی دەوڵەمەند بکاو پاشان بەماڵو سامانەکەی فیزو دەعیە بکا بەسەر خەڵکیدا ئەوە بۆ ڕێگای شەیطانەو خوا لێی ڕازی نابێ.

کەواتە: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لەچوار نیەتی دڵ لەکارو کاسپیدا" بۆ سیانیان فەرمووی ئەو کاسپیە بەخواپەرستی حیسابە (بەمەرجێ حەڵاڵ بێو واجبە دینیەکانی لەسەر نەفەوتێنێ) ئەمجا بەشی چوارەمی بەبەشی شەیطان دانا !

هەروەها لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لأنْ يَأْخُذَ أحَدُكُمْ أحْبُلَهُ فَيَأْتي بِحُزْمَةٍ مِنْ حَطَبٍ عَلى ظَهْرِهِ فَيَبيعَها فَيَكُفَّ بِها وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أنْ يَسْأَلَ النَّاس أعْطَوْهُ أمْ مَنَعُوهُ)، واتە: بەڕاستی ئەگەر یەکێ لەئێوە گوریسەکەی هەڵبگرێو بچێ کوڵێ پووشوپەڵاشو چیلکەو دار کۆبکاتەوەو بەپشتی خۆی هەڵیبگرێو بچێ لەبازاڕ بیفرۆشێو بەپارەکەی ڕووی خۆی لەشەرمەزاربوونی نامەردانو دەست پانکردنەوە بپارێزێ، ئەوە ئەوەی زۆر باشترە لەوەی کەوا بێکارو بێئیشو دەست بەتاڵ لێی دانیشێو دەست لەمو لەو پان بکاتەوە، جا چاوەڕێ بێ ئایا یارمەتی دەدەن یان دەست بەڕوویەوە دەنێن.

ڕۆژێکیان ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) چوو ئیشی بۆ پیرەژنێك کرد، ئیشەکەش ئەوەبوو ئاوی بۆ لەبیر دەردێنا، بەڵام دۆڵچەکە زۆر گەورە بوو، زۆری ئاو دەگرتو قورس بوو، پەتەکەش زۆر زبرو ناخۆش بوو، بۆیە دەستی ئیمامی عەلی سوور ببۆوەو قڵش قڵش بوو، کاتێ لەئاو هەڵکێشانەکە بۆوە، پیرەژنەکە شانزە دەنکە خورمای دا بەئیمامی عەلی. لەڕێگای ماڵەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تووشی ئیمامی

عەلی بوو, کەتەوقەی لەگەڵدا کردو سەیری دەستی کرد وا سوور بۆتەوەو ئاوساوە, فەرمووی: ئەی عەلی, ئەوە بەچی وات لێهاتووە؟! ئیمامی عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا, ئاوم هەڵکێشاو شانزە دەنکە خورمام وەرگرت. پێغەمبەری خوا فەرمووی: دەبێنە با منیش لەو خورما پاکو حەلاڵەی بەدەستت هێناوە بخۆم. جا ئیمامی عەلی لەو بارەوە دەفـــــــــەرمـــویٚ :

لَحَمْلُ الصَّخْرِ عَلى قُمَمِ الجِبالِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مِنَنِ الرِّجالِ

يقُولُ النَّاسُ لي في الكَسْبِ عارٌ فَقُـلْتُ العارُ في ذلِّ السُّؤالِ

واتە: هەڵگرتنی بەردی گەورەو هێنانە خوارەوەی بەپشت لەسەر شاخی بەرزەوە, بەلامەوە خۆشترە لەوەی کەمنەتباری خەڵکی بموو چاو لەدەستیان بم, خەڵکی پێم دەڵێن کە لەهەندێ کارو کاسپیدا عەیبو عار هەیەو خەڵکی بەچاوی سووک سەیری دەکەن, بەڵام من دەڵێم: عەیبەو کەموکوڕی ئەوەیە کەئینسان دەست لەخەڵکی پان بکاتەوەو دوورکەوێتەوە لەکارو کاسپی حەلاڵو بەهۆی سواڵکردنو پاڕانەوە لەخەڵکییەوە تووشی زەلیلی ببێ

خۆشەویستان: لەناو هەموو کارو کاسپییەکاندا کڕینو فرۆشتنو بازرگانی زۆر پەسەند کراوە, لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم هاتووە کەفەرموویەتی: (تِسْعَةُ أعْشار الرِّزْقِ في التِّجارَةِ فَعَلَيْكُمْ بِها), واتە: نۆ لەدەی ڕزقوڕۆزی بەهۆی بازرگانییو حەلاڵەوە خوا بۆتان دەنێرێ, دەی ئەی بەندەکانی خوا, ئێوە بازرگانیو تیجارەت بکەن.

هەروەها خۆشەویستمان فەرموویەتی: (التَّاجِرُ الصَّدوقُ الأمينُ, مَعَ النَّبِيِّينَ والصِّدِّيقينَ والشُّهَداءِ)(رَواهُ الترمذي وقالَ حَديثٌ حَسَن), واتە: بازرگانی ڕاستگۆی دەستپاکو ئەمین" خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیداندا حیسابی بۆ دەکاتو حەشری دەکات.

کەواتە: برای کاسبکارو ئەهلی دوکانو بازاڕ: تۆ زۆر بەڕێزی لای خواو پێغەمبەری خوا, دەی ئاگات لەخۆت بێ, ئەم ڕێزو حورمەتە لەدەست خۆت نەدەی, بەچیش ئەم فەزڵو گەورەییو بەرەکەتەت لەدەست دەچێ باش سەرنج بدە وا إنشاءَ الله لەم چەند

خاڵەی دواییدا باسی ئەو شتانە دەکەین کەماڵوێرانت دەکا، ئیمانت لادەبا، بەرەکەت لەڕزق‌وڕۆزیت هەڵدەگرێ، سەلبی سەرەمەرگت دەکا، ڕووڕەشی مەیدانی مەحشەرت دەکا.. دەی باش گوێ بگرە:

کاسبکاری بەڕێز ئاگاداربە، واجبە لەکاتی کڕین‌و فرۆشتن‌و کێشانەو پێوانەدا دادگەریی ونەهێڵی خەڵك مافت بخواو خۆشت مافی خەڵك نەخۆی، پارەو ماڵی خەڵك بەناڕەوا نەخۆی، گیرفان‌و دەستی نەبڕی، بۆیە خوای گەورە لەم وەصیەتەدا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُوا الكَيْلَ وَالمِيزانَ بِالقِسْطِ ﴾، هەر لەبەر گەورەیی مەسەلەی کێشانەو پێوانەیە کەیەك سووڕەت لەقورئانی پیرۆزدا ناوی (المُطَفِّفين)ی لێنراوە، واتە: ئەو سووڕەتەی کەباسی تاوانی تەرازووبازەکان دەکات. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەتەرازووبازیو غەش‌و فێڵکردن لەتەرازوو و کێشانەو پێوانەدا ئەوەندە گەورەیە لای خوا کەیەك سووڕەتی لەقورئاندا بۆ تەرخانکراوە، خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالى دەفەرموێ: ﴿ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَاكَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ، أَلا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ، يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾(المطففين 1 ـ 6) واتە: هاوارو ئاهو ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان‌و پێواندا لەکڕین‌و فرۆشتندا، تەرازووبازیو فێڵ دەکەن، ئەوانەی کاتێك شت لەخەڵك دەکڕن، بەتەواویو بەزیادەوە لێیان وەردەگرن، بەڵام کاتێك شتیان بۆ دەپێون، یان دەکێشن، لێی دەدزنەوەو کەمیان دەدەنێ‌و فێڵیان لێ دەکەن، ئایا ئەوانە گومان نابەن کە بەڕاستی زیندوو دەکرێنەوە (تا سەرەنجامی خیانەت‌و فێڵیان وەربگرن) بۆ ڕۆژێکی زۆر سامناك‌و ترسناك‌و گەورە، ئەو ڕۆژەی کەهەموو خەڵکی بەپێوە دەوەستن لەبەردەم دەسەڵاتی پەروەردگاری جیهانیاندا..

زانایەك دەفەرموێ: ئەگەر خوای گەورە وەیل‌و هاوارو ناڵەی جەهەنەمی بۆ ئەو کەسە دیاری کردبێ کەحەقی تەرازووەکە ناداو کێشانەو پێوانەی تەواو نیە" ئەی دەبێ سزای ئەو کەسە چی بێ کەهەموو تای تەرازووەکە دەباتو هەموو ماڵی کڕیارەکە یان فرۆشیارەکە دەخوات، وەکو ئەو کەسەی شتێك لەکەسێك دەکڕێ، دەڵێ: دوایی پارەکەت بۆ دێنم، بەڵام هەر ئەمڕۆو سبەی پێ‌دەکاتو ئاخری پارەکەی دەخـــــــــوات؟ بێگومان سزای ئـــەو

کـــەسە زۆر قورس و گرانە!!

ئامان ئەی دوکاندارو بازرگان و هەموو ئەو کەسانەی کەتەرازووتان بەدەستەوەیە، ئاگاتان لەخۆتان بێ، بۆ شتێکی کەم ماڵەکەتان حەرام مەکەن و خۆتان نەخەنە بەر هەڕەشەی ئەو ئایەتە قورئانیانەوە کەتەرازووبازی و خیانەت لەکێشانەو پێوانەدا بەوە حیساب دەکات کەپەنا بەخوا ئەو ئینسانە ئیمانی بەوە نیە کەڕۆژێك دەگاتەوە بەخواو حیسابی ئەو ناپاکیەی لەگەڵدا دەکرێ!

پیاوباشێك فەرموویەتی: (ألوَيْلُ ثُمَّ الوَيْلُ لمَنْ يَبيع بِحَبَّةٍ جَنَّةً يَنْقُصُها عَرْضُها السَّماواتُ وَالأرْضُ، وَيَشْتَري بِحَبَّةٍ يَزيدُها وادياً في جَهَنَّمَ يُذيبُ جبال الدُّنيا وَما فيها) واتە: هاوارو ناڵە، نەك جارێ بەڵکو دەیان جار بۆ ئەو کەسەی کە بەهەشتی بەرینی خوای گەورە دەفرۆشێ بەدەنکێ، بەکەمێ شت، کە بەکەمی و بەنوقستانی دەیکێشێ بۆ کڕیارەکەی، وەبۆ ئەو کەسەش وەیل و شیوی جەهەنەم باشە، کەجەهەنەم دەکڕێ بەدەنکێ، بەشتێکی کەم کەزیاد وەردەگرێ لەفرۆشیارەکە.

ئیمانداران: لەبارەی ئاکام و سەرەنجامی ئەو کەسانەی کەخیانەت لەکێشانەو پێوانەدا دەکەن، کە لەکاتی سەرەمەرگ و ڕۆح دەرچووندا، چۆن حاڵیان پەشێو دەبێ، دوو بەسەرهاتتان بۆ دەگێڕمەوە:

**بەسەرهاتی یەکەم:** زانای بەناوبانگی ئیسلام، مالیکی کوڕی دینار دەفەرموێ: دراوسێیەکمان نەخۆش بوو، لەکاتی سەرەمەرگدا چووم بۆ لای، هێشتا حاڵی لەسەر خۆی بوو، ڕووی تێکردم و گوتی: ئەی مالیك چیم لێ دەکەی وا دوو کێوی ئاگرین دێنن لەپێشمی ڕادەگرن، دەڵێن دەبێ بەسەریاندا سەرکەوی، منیش چۆن دەتوانم بەسەر شاخی ئاگریندا سەربکەوم؟! دەفەرموێ: ئەو قسەیەی کردو زۆر بەنارەحەتی گیانی دەرچوو و مرد! دەفەرموێ: منیش پرسیارم لەژن و منداڵی ئەو پیاوە کرد دەربارەی چاکەو خراپەو ڕەفتارو گوفتارو کارو کەسابەتی ئەو پیاوەوە کەئاوا سەرەمەرگێکی شەڕانی و عاقیبەت خراپی تووش بوو، چونکە ئینسان لەسەرەمەرگدا، لەو کاتەدا کەبۆ دواجار دونیا بەجێ دێڵێ بەرهەمی ژیانی خۆی دێتەوە بەرچاوی، دیارە ئەو پیاوە هەر خراپەی چاندووە وا بۆی بۆتە ئاگرو نیشانی دەدرێ!

مالیکی کوڕی دینار دەفەرمویٚ: ژن‌و منداڵەکەی گوتیان: ئەو پیاوە بەقاڵ بووەو دوو تەرازووی هەبوو, شتی خۆی بۆ خەڵك بەیەکێکیان دەکێشاو ئەگەر لەخەڵکیشی بکڕیایە بەوی تر دەیکێشا. واتە: تەرازووبازی دەکرد. مالیکی کوڕی دینار فەرمووی: دەی بەخوا ئەوە ئەو دوو تەرازووەن کە لەدونیادا دەستی خەڵکی پێ دەبڕین" وا لەسەرەمەرگو ڕۆح دەرچووندا لێی بوون بەدوو کێوی ئاگرین‌و بەو حاڵەوە بەخوای خۆی گەیشت.. خوا پەنامان بدات!

**بەسەرهاتی دووەم:** یەکێ لەپیاوباشان دەفەرمویٚ: ئاسیاوێکم لەسەرەمەرگدا بوو, چوومە لای‌و دەمگوت: لا إلهَ إلاَّ اللهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله بەڵکو ئەویش بیانڵێ‌و بەشایەتمانەوە دونیا بەجێبێڵێ, بەڵام کابرا سەیریکردم‌و گوتی: بەخوا حەزدەکەم وەکو تۆ بیڵێم, بەڵام کەدەمەویٚ قسەبکەم زمانەی تەرازووی دوکانەکەم دێتە سەر زمانم‌و ناهێڵێ, چونکە بەو تەرازووە فێڵم لەخەڵکی دەکردو غەشم دەکرد!!

خاڵێکی تر کەدەبێ دوکاندارە بەڕێزەکان‌و ئەهلی تەرازوو و بازاڕ ئاگاداری بن ئەوەیە کە لەکاتی کڕین‌و فرۆشتندا, عەیب‌و کەموکوڕی شتەکانیان نەشارنەوەو فێڵ لەکڕیارەکان نەکەن. لەو بارەیەوە پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرمویٚ: (مَنْ باعاً عَيْباً لَمْ يُبَيِّنْهُ لَمْ يَزَلْ في مَقْتِ الله, ولَمْ تَزَلْ المَلائكَةُ تَلْعَنُهُ)(رَواهُ إبن ماجَة), واتە: کەسێك شتێك بەکەسێك بفرۆشێ‌و ماڵە فرۆشراوەکە عەیبی تێدابێ‌و خاوەنەکەی عەیبەکە بزانێ, بەڵام بەکڕیارەکەی نەڵێ کەئەم شتە ئەم عەیب‌و کەموکوڕیەی هەیە, ئەوە بەردەوام ئەم فرۆشیارە کەعەیبی شتەکەی خۆی لەموشتەریەکەی شاردەوە, لەژێر تووڕەیی‌و ڕقی خوادا شەوو ڕۆژ دەکاتەوەو, بەردەوام فریشتەکانی خوا لەعنەتی لێدەکەن‌و دەڵێن: یاخوا دووربی لەڕەحمەتی خوا وەکو عەیبی ئەو شتەت شاردەوەو فێڵت لەکڕیارەکە کرد!!

بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆر کەس وا دەزانێ ئازایەتی کردووە کەعەیب‌و کەموکوڕی کەلوپەلەکەی لەکڕیار شاردۆتەوەو پارەیەکی زیادی لێ سەندووە, بەڵام بەهۆی دین زەعیفیەکەیەوە نازانێ خۆی خستۆتە بەر غەزەبی خواو نەفرەتی فریشتەکانەوە!

صەحابی ئازیزو خۆشەویستمان" حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمویٚ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم چوو بۆ لای پیاوێك کەخۆراکی

دەفرۆشت, پرسیاری لێکرد: چۆنی دەفرۆشی؟ پیاوەکەش گوتی: ئاواو ئاوا دەیفرۆشم. جا خوای گەورە وەحی نارد بۆ پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم کەدەستی پێداکە, جا کەدەستی پێداکرد, خۆراکەکە لەناوەوە تەڕ ببوو, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم کەئەمەی بینی فەرمووی: (لَیْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ)(رَواهُ أبو داود وَمُسْلِم والترمذي), فەرمووی: هەرکەسێ ساختەو گزیمان لێ بکا لەئێمە نیە!

هەر ئەم بەسەرهاتە" ئیمامی موسلیم‌و ترمذي (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) ئاوا گێڕاویانەتەوە, حەزرەت فەرمووی: ئەی خاوەن خۆراك, ئەم تەڕیە چیە؟ کابرا گوتی: (أصابَتْهُ السَّماءُ یا رَسُولُ الله) ئەی پێغەمبەری خوا, ئەوە باران لێی داوە, فەرمووی: (أفَلا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعامِ حَتَّی یَراهُ النَّاس, مَنْ غَشَّنا فَلَیْس مِنَّا), فەرمووی: ئەی نەدەبوو ئەم تەڕبوونە بخەیتە سەرەوە تا خەڵك ببینن, خەڵك ئەم سەرەوە وشك‌و جوانەی دەبینێ بۆیە لێت دەکڕێ, بەڵام تۆ لەکاتی کێشاندا دەستی پێدا دەکەی‌و ئەو تەڕبووە خراپبووەی لەگەڵ چاکەکەی سەرەوەدا بۆ تێکەڵ دەکەی, نازانی ئەمە فێڵ‌و غەش کردنە؟! ئینجا حەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: هەرکەسێ غەش لەموسڵمانان بکاو شتی خراپیان بەچاك پێ بفرۆشێ ئەوە لەئێمە نیە.

بەڵێ, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم زۆر گرنگی دەدا بەوەی کە لەکاتی فرۆشتنی میوەو هەر کەلوپەلێکدا دیوی دەرەوەو ناوەوەی وەکو یەك بێت, وەکو جارێکیان پێغەمبەری خوا بەلای کابرایەکدا ڕۆیشت کەخواردەمەنی‌و میوەی دەفرۆشت, پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: (یا صاحِبَ الطَّعامِ أسْفَلُ هذا مِثْلُ أعْلاهُ ؟فَقالَ: نَعَمْ یا رَسُولَ الله) فەرمووی: ئەی خاوەنی ئەو خۆراکەو فرۆشیاری ئەو میوەیە, ئایا ژێرەوەی ئەو خۆراك‌و میوەیەش وەکو سەرەوەکەی وایە؟ کابرا گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا, پاشان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم فەرمووی: دەی بزانن‌و ئاگادارین: (مَنْ غَشَّ المُسْلِمینَ فَلَیْس مِنْهُمْ)(رَواهُ الطَبَراني في الكَبیر وَالأوسَط),

واتە: هەرکەسێك فێڵ‌و غەش لەموسڵمانان بکات‌و لەکاتی کڕین‌و فرۆشتندا دەستیان بیڕێ‌و خراپیان بەچاك پێ بفرۆشێ, ئەوە لەکۆمەڵی موسڵمانان حیساب نیە!

ڕۆژێکیان حەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) چاوی لەکابرایەك دەبێ وا ئاو دەکاتە ناو مەنجەڵێك شیرەوە, ئەبو هورەیرە بانگی کابرا دەکاو پێی دەڵێ: باشە ئەی دوژمنی خۆت, ئەی ناحاڵی: (كَيْفَ بِكَ إذا قيلَ لَكَ يَوْمَ القيامَةِ, خَلِّصِ الماءَ مِنَ اللَّبَنِ) باشە ئەگەر لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە زۆرت لێبکاو بفەرموێ: دەبێ ئەو ئاوە لەشیرەکە جیابکەیتەوە چی وڵام دەدەیتەوەو چیت پێدەکرێ؟! کابرا بیری کردەوەو پەشیمان بۆوەو تۆبەیکرد کەجارێکیتر شتی وا نەکا!

زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ هەندێ میوەفرۆش‌و قەصاب, ئەوەی کەنیشانی کڕیاری دەدەن زۆر جیاوازە لەوەی کە لەژێرەوەیەو جیاوازە لەوەی کەبۆ کڕیاری دەکێشن, کەم کەس هەیە دەستیان نەبڕیبێ‌و کاتێ هاتۆتە ماڵەوە, تەماشا دەکات ئەوەی بینیویەتی‌و بەحیسابی خۆی بەچاك‌و جوانی کڕیوە, لەگەڵ ئەوەی هێناویەتیەوە ماڵەوە زۆر جیاوازن.

ئیمانداران: بەڕاستی شاردنەوەی عەیبی ئەو شتەی کەدەیفرۆشی گوناهێکی زۆر گەورەیە, تەماشامان چۆن پیاوچاکان خۆیان لەم تاوانە پاراستووە:

دەگێڕنەوە ئیمام ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەگەڵ ئەوەدا کەخەریکی زانست‌و خزمەتی شەریعەتی ئیسلامی بوو, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر کاسپی‌و ڕەنجی شانی خۆی دەژیا, بۆیە دەستیکرد بەبازرگانی‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و لەگەڵ کابرایەك بوو بەشەریك ناوی (بیشر) بوو. ئەم بیشرە چوو بۆ وڵاتی میصر, ئیمام ئەبو حەنیفەش لەبەغداوە چل پارچە جلوبەرگی بۆ نارد کە لەمیصر بیانفرۆشێ, وەنامەیەکی بۆ شەریکەکەی نووسی تیایدا فەرمووی: وا ئەو چل پارچە جلوبەرگەم بۆ ناردی, بەڵام ئاگاداربە, پارچەیەکیات تۆزێك دڕاوی تێدایەو عەیبدارە, جا هەرکاتێ فرۆشتتن ئەو پارچە دڕاوە نیشانی کڕیارەکە بدەو بەکەمتر پێی بفرۆشە.

بەڵێ ماوەیەکی پێ چوو بیشر لەبازرگانیەکە گەڕایەوەو هاتە خزمەت ئیمام ئەبو حەنیفەو عەرزی کرد کەسەفەرە بازرگانیەکەی زۆر سەرکەوتوو بووەو قازانجی زۆری لەو چل پارچە جلوبەرگە کرد کەئەو لەبەغداوە بۆی ناردبوو, وەهەزار دیرهەم لەو قازانجە بەر ئیمام ئەبو حەنیفە کەوتووە! یەکسەر ئیمام لێی پرسی: باشە ئەو پارچە قوماشەی کەدڕابوو, بەعەیبەوە بەکڕیارەکەت فرۆشت‌و عەیبەکەت نیشاندا؟ بیشر گوتی: سوێند

بەخوا ئەی ئیمام، هەتاوەکو نەمفرۆشتو پارەم وەرنەگرتو کابرا نەڕۆیشت، ئەو قسەی جەنابتم بەبیر نەهاتەوەو دواییش هەرچەندە بۆی گەڕامو ئەملاو ئەولام کرد نەمدۆزیەوە، لەبەر ئەوە نرخی ئەو پارچە دڕاوەشم وەکو ساغەکان وەرگرتووە، بەڵام بەخوا لەڕوی کەمتەرخەمیو غەش کردنەوە نەبووە، تەنها ئەوەبوو شەیطان بیری بردمەوە!

ئیمام ئەبو حەنیفە فەرمووی: ئەی خوای گەورە، من بەریم لەو کارەو هەرگیز نامەوێماڵی حەرام تێکەڵی ماڵەکەم ببێ، خوایە پێغەمبەرەکەت صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: ئینسان ئەگەر بە لەبیرچوونەوە (النسْيان) تووشی هەڵەو تاوانێك بوو، ئەوە گوناهی لەسەر نانووسرێ، بەڵام خوایە تۆ بەشاهید بە، وا من ئەو هەزار دیرهەم قازانجەو ئەو دەستمایەیەش کەئەو قازانجەی دەست خستووم وا هەموویم کرد بەخێرو دەیبەخشم بەهەژاران، چونکە: (مالٌ قَدْ دَخَلَتْ فيهِ الشُّبْهَةُ فَلا حاجَةَ لي بِهِ)، هەرماڵو سەروەتو سامانێك گومانی کەوتە ناوو ماڵی خەڵکی بەناڕەوا تێکەڵاو بوو، ئەوا پێویستم بەو پارەیە نیەو نابێ لەکیسەو گیرفانی مندا جێگای ببێتەوە!

ئەی ئەهلی بازاڕو کاسبکارانی بەڕێز: دڵنیابن هەرگیز ماڵ بەحەرام خواردنو غەش کردن زیاد ناکات، بەڵکو ماڵی حەرام وەکو ئاگر وایە، حەڵاڵەکەی خۆیشی پێوە دەسووتێ، شاعیر زۆر جوانی فەرمووە کەدەڵێ:

جَمْعُ الحَرامِ عَلى الحَلالِ لِيُكْثِرَهُ  دَخْلُ الحَرامِ عَلى الحَلالِ فَبَعْثَرَهُ

واتە: تۆ کەحەرام کۆدەکەیتەوەو غەشو فێڵ دەکەی بۆ ئەوەی پارەیەکی حەرام بخەیتە سەر پارە حەڵاڵەکەتو زۆری بکەیت، بەڵام بزانە هەرکاتێ حەرام تێکەڵی حەڵاڵ بوو، ئەوا حەڵاڵەکەش بەخۆیەوە دەسووتێنێ.

بەڵێ، یەقینتان ببێ وایە، زۆر کەسمان بینی بەحەرام ماڵی کۆکردەوە، بەڵام لەکتوپڕدا تێداچوو، زۆر کەس بووە بەدوکانداریو میوەفرۆشیو جامبازی، کەحەرامی تێکەڵ کردووەو شتی خراپی بەچاك فرۆشتووە، دوای چەند ساڵ کەوازی لەو پیشەیە هێناوە، چووە سەیارەیەکی کڕیوە، بەڵام لەڕووداوێکی ئۆتومبێلدا لەسەریشی قەرزاربۆتەوەو ماڵە حەڵاڵەکەی خۆیشی لەدەست داوە.. مێژوو دەیانو سەدان ڕووداوی لەم بارەیەوە بۆ تۆمارکردووین، سەرنجتان بۆ دوو ڕووداو ڕادەکێشم:

**ڕووداوی یەکەم:**

ئیمامی بەیهەقی لەحەزرەتی ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕاینەوەو فەرمووی: لەزەمانی ئومەتەکانی ڕابردووی پێش ئێمەدا, کابرایەك هەبوو ئیشی ئەوەبوو شەراب فرۆش بوو (دیارە لەو زەمانەدا خواردنەوەی شەراب تا ئەو کاتە حەرام نەکراوە لەلایەن خواوە), ئەم کابرا شەراب فرۆشە, لەدێیەکەی خۆیانەوە بۆ فرۆشتن‌و ساغ کردنەوەی شەرابەکەی چوو بۆ دێیەك‌و شارێکی تر, جا دەبوایە بەناو ڕووبارێکدا برۆیشتنایە, هەربۆیە کەشتیەکی ئامادەکردو کووپە شەرابەکانی گەیاندە سەر کەشتیەکەو بەناو ڕووباردا گەیشتنە دێیەکەو شەرابەکەی زۆر باش بۆ فرۆشراو خەڵکەکە زۆر موشتەری بوون. پاش چەند سەفەرێك کابرای شەراب فرۆش, زانی موشتەری باشی بۆ پەیدابووە, ئەمجارەیان سەر تەماع کەوت‌و لەکاتی تێپەڕبوون بەناو ڕووبارەکەدا کەشتیەکەی وەستاندو سەری کووپەکانی کردەوەو ئاوێکی زۆری تێکەڵاوکرد, واتە غەش‌و تەزویری تێداکرد. بەڵێ ئەمجارەشیان گەیشتە شارەکەو شەرابەکەی زۆر باش بۆ فرۆشرا, چونکە پێشتر خەڵکی سیقەیان پێکردبوو, بەبێ لێخواردن‌و تامکردن لێیان کڕی. دوای تەواوبوونی فرۆشتنەکە پارەکەی وەرگرت‌و زۆر بەدڵخۆشیەوە بەرەو گوندەکەی خۆی گەڕایەوە. لەڕێگا کە لەناو کەشتیەکەدا بوو, مەیموونەکەیشی لەگەڵدابوو, کەبۆ هەموو سەفەرو گەشتێکی ئەو مەیموونەشی لەگەڵ خۆی دەبرد. بەڵێ لەناو کەشتیەکەدا ئەمجارەیان زۆر لەجاران دڵخۆشتر بوو, چونکە بەقەد دووقاتی جاران پارەی دەستکەوتبوو, نیوەی هەر پارەی ئاوی ڕووبارەکەبوو کە بەبەلاش دەستی کەوتبوو! بۆیە چەند جارێك پارەکەی ژماردو پاشان خستیەوە ناو کیسەکەیەوەو لەپەنا خۆیەوە دایناو خەیاڵ بردبوویەوە, کە لەناکاو مەیموونەکە پەلاماری کیسە پارەکەی داو ڕای کردە سەر چڵەپۆپەی ئەو دارەی کەچارۆکەی کەشتیە چارۆکەدارەکەی پێوەبوو. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (فَتَحَ الكيس فَجَعَلَ يَأْخُذُ ديناراً فَيُلْقيهِ في السَّفينَةِ وَديناراً في البَحْرِ, حَتَّى جَعَلَهُ نِصفَينِ), دەفەرموێ: مەیموونەکە لەسەر چڵەپۆپەی دارەکە, کیسە پارەکەی کردەوەو هەر دینارێکی دەردێناو فڕێی دەدایە ناو کەشتیەکەوەو

کابرا هەڵیدەگرتەوە، ئەمجارەیان دەستی دەخستەوە ناو کیسەکەوەو دینارێکی دەردێناو فڕێی دەدایە ئاوەکەوە. بەمشێوەیە پارەکەی کرد بەدوو بەشەوە، بەشێکی دایەوە بەخاوەنەکەی کەشەراب فرۆشەکەبوو، نیوەکەی تریشی خستە ناو ڕووبارەکەوە، واتە: ئەم مەیموونە زۆر بەعەدالەت کیسە پارەکەی دابەشکرد، ئەوەی کابرا حەڵاڵی خۆی بوو، شەرابە ئەصڵەکەی بایی ئەوەندەبوو، ئەوەندە پارەی دایەوە بەخاوەنەکەی‌و ئەوەندەشی کەبەتەزویر پەیدا کرابوو، بەئاوی ڕووبارەکە پەیدا کرابوو، خرایەوە ناو ئاوەکەوەو پارەی ئاو" دەبێ هەر بۆ ئاو بێ!

**ڕووداوی دووەم:**

ئیمامی غەزالی لە (أحیاء عُلوم الدین)دا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفـــەرمـــوێ:

کابرایەك دوو مانگای هەبوو، هەموو ڕۆژێك دەیدۆشین‌و شیرەکەی نیوەی دەکرد لەئاوو دەچوو لەشار دەیفرۆشت. ڕۆژێکیان چوو بۆ شار شیر بفرۆشێ، تا هاتەوە بارانێك باری، کردی بەلافاوو تۆفان، مانگاکانی کابرای بردن‌و مانگاکان خنکان، کابرا دەستیکرد بەهاوارکردن‌و دەیگوت: ئەی خوای گەورە باشە بۆ ئەم لافاوە هەڵساو زیاد لەهەموو خەڵکی" مانگاکانی منی لەناوبرد؟!! یەکێ لەکوڕەکانی کابرا زۆر ژیرو تێگەیشتوو بوو، گوتی: ئەی باوکە، ئەوە هەموو ئەو ئاوە بوو کەڕۆژانە دەتکردە شیرەکەوەو غەشت لەموسڵمانان دەکرد، خوای گەورە ماوەیەکی زۆر مۆڵەتی دای بەڵام تۆ هەر نەگەڕایتەوەو لەسەر ئەو کارە ناشیرینەت" کەغەش‌و تەزویرکردن بوو، بەردەوام بووی بۆیە خوای گەورە هیچی‌تری لێ قبووڵ نەکردی، هەموو ئەو ئاوەی کەڕۆژانە دەتکردە شیرەکەوە، خوای گەورە کەئاگای لەئاشکراو نهێنییە هەمووی بۆ کۆکردیەوەو هات مانگاکانی ئێمەی بردو لەناوی بردن، بەم شێوەیە حەڵاڵەکەی خۆشمان بەهۆی حەرامەکەوە لەناوچوو!

جا ئیماندارانی بەڕێز: بەڕاستی هەریەك لەئێمە لەوانەیە چەند دیمەنێکی ئاوای بینیبێ کەئینسانی وابووە زۆر هەوڵیداوە، زۆر کاسپی کردووە، سەروەت‌و سامانێکی زۆری هەبووە، بەڵام تەماشای حەڵاڵ‌و حەرامی نەکردووە، ئەوەی بەلایەوە گرنگ بووە بۆ پێکەوەنانی سەروەت‌و سامان‌و پارەو پووڵ بووە، بەڵام کاتێ زۆر دەوڵەمەند بووە، لەپڕێکدا بەڵایەك ڕووی لەخۆی‌و ماڵ‌و سامانەکەی کردووەو سەرەڕای فەقیربوونیشی

تووشی قەرزاریش بووەو کورد گوتەنی (قازانج سەری مایەی خواردووە)! پشتیوان بەخوای گەورە لەووتارەکانی داهاتوودا درێژە بەم باسە گرنگە دەدەین

داوادەکەم لەخوای گەورە کەبەرەکەت بخاتە ڕزق و ڕۆزی هەموو موسڵمانانەوە خوای گەورە بازاڕو تەرازووەکانمان لەتەرازووبازی بەدوور بگرێ ..

اللَّهُمَّ آمين

# ووتـاری ژماره بیستونۆ

# دادگەری لەکڕین و فرۆشتندا

## بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالی:

﴿ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ ﴾

(الرحمن 9)

قالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم:

( لا يَحِلُّ لأحَدٍ يَبيعُ بَيْعاً إلاّ أنْ يُبَيِّنَ آفَتَهُ, وَلا يَحِلُّ لِمَنْ يَعْلَمُ ذلِكَ إلاّ تَبَيَّنَهُ )

( رَواهُ الحاكِم وَقالَ صَحيحُ الإسنادِ )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آلِه وصَحبِه أجمَعين إلى يَومِ الدِّين..**

ئيماندارانی بەڕێز: سەلامو ڕەحمەتی خوا لەهەموو ئیماندارانی ئەهلی قیبلە بێت, خوای گەورە بەچاوی سۆزو بەزەیی تەماشای ئێمەو هەموو موسڵمانانی سەر زەوی بکات.. آمین.

بەڕێزان: لەووتاری ڕابردوودا باسی کڕینو فرۆشتنو وەصیەتی خوای پەروەردگارمان کرد بۆ کاسبکارانو ئەهلی بازاڕ, پشتیوان بەخوای گەورە درێژە بەو باسە دەدەینو دەڵێم وَباللهِ التَّوْفيق:

خوای گەورە باسی گەورەیی‌و فەزڵی نوێژی جومعەمان بۆ دەکاتو پاشان دەفەرموێ: ئەگەر نوێژی جومعەتان تەواوکرد, دامەنیشن لەمزگەوتو ماڵەکانتان, بەڵکو بەدوای کارو کاسپی حەڵاڵدا بگەڕێن ﴿ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ﴾ (الجمعة 10), وەلەبارەی گەورەیی‌و ڕێزی بازاڕو شوێنی کاسپییەوە, پێغەمبەری پێشەوامان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (الأسْواقُ مَوائِدُ اللهِ تَعالى, فَمَنْ أتاها أصابَ مِنْها), واتە: بازاڕەکان سفرەی ڕاخراوی خوای بەرزو بڵندن, هەرکەسێ هاتە سەر ئەو سفرەیە, ئەوەندەی خوا مەیلی لێبێت دەستکەوتی دەبێو بەمەحرومی ناڕواتەوە. واتە: هەرکەسێ ڕوویکاتە بازاڕ بۆ کڕینو فرۆشتنو بازرگانی‌و معامەلە, ئەوە خوای گەورە ڕەنج بەخەساری ناکاو بەقەدەر نیەت پاکی‌و ڕاستگۆیی‌و دڵسۆزی لەکارەکەیدا" خوا ڕزقی بۆ دابین دەکات.

لەزاناو خواناسی ناوداری ئیسلام ئیبراهیمی ئەدهەم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) پرسیار کرا: ئایا بەلای تۆوە بازرگانێکی ڕاستگۆی حەڵاڵخۆر خۆشەویستترە یان کەسێك کەهیچ کارو کاسپییەك ناکاتو خۆی تەرخان کردووە بۆ خواپەرستی‌و خەڵکی خێری پێدەکەنو یارمەتی دەدەن؟ فەرمووی: (التَّاجِرُ الصَّدوقُ أحَبُّ إِلَيَّ), فەرمووی: بازرگانی ڕاستگۆی دەستپاكو نیەت پاك لەلای من خۆشەویستترە لەعابیدی گۆشەگیر! گوتیان: بۆچی؟ فەرمووی: (لأنَّهُ في جِهادٍ يَأْتيهِ الشَّيْطانُ مِنْ طَريقِ المِكْيالِ والميزانِ وَمِنْ قِبَلِ الأَخْذِ وَالعَطاءِ فَيُجاهِدُهُ), واتە: بۆیە بازرگانی ڕاستگۆم خۆشتر دەوێ چونکە بەردەوام

لەجیهاددایە, جیهادەکەیشی ئەوەیە شەیطان بەرەورووی دەبێتەوە لەڕێگای کێشانەو پێوانەوە, وەلەڕێگای وەرگرتنو بەخشینەوە, ئەم بازرگانە شەیطان دەیەوێ لەڕێگای ڕاستی ئیسلام لایدا بەهۆی ئەوەی کەوای لێبکا ماڵی دونیاو پارەو سامانی لەبەرچاو شیرینو جوانتر بکاو وای بخاتە دڵەوە کەئەگەر پەنا بۆ فێڵو غەشو تەزویرو تەرازووبازی نەبات, ئەوا دەوڵەمەند نابێو ناگاتەوە بەدەوڵەمەندانو سەرمایەداران, بەڵام ئەم بازرگانە ڕاستگۆیە بەئیمانە" وەسوەسەی شەیطان کاری لێناکاو نەفرەتی لیدەکاو حەقی تەرازووەکەی بەردەستی دەداو لەکێشانەو پێوانەدا دادپەروەرو بەگوێرەی شەرع کاسپی دەکا. بەم شێوەیە ئەم بازرگانە ڕاستگۆیە بەردەوام لەجیهادو تێکۆشاندایە لەدژی شەیطانو فێڵو پیلانە ژەهراویەکانی. شتێکی بەڵگەنەویستیشە کەئینسانی موجاهید فەزڵی لای خوا زۆر زیاترە لەئینسانی عابیدو گۆشەگیر! فەرمووی: هەر بۆیە منیش بازرگانە ڕاستگۆیەکەم بەلاوە خۆشەویستترە!

ئیمانداران: بۆئەوەی ئەهلی بازاڕو کەبسابەت, ئەم ڕێزو قەدرە ببێت بەکاڵای باڵایانو دەوڵەمەندی دونیاو قیامەت بن" پێویستە ئاگایان لەم چەند خاڵە بێت کەخواو پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم بۆیان بەیان کردووین:

**یەکەم:** بەئاگابوون لەزمانی تەرازوو, وەکو خوای گەورە لەسوورەتی (الرحمن - ئایەتی 9 )دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ ﴾,

واتـــە: لەکێشانـەو پێوانـەدا دادپەروەربن, تەرازووبازی مـەکـەنو کـــەم فرۆشی ئەنجام مەدەن.

جارێکیان پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم شتی لەکابرایەك کڕیو فەرمووی: ( زِنْ وَأَرْجِحْ)(رَواهُ أصحاب السُّنَن والحاكم, قالَ الترمذي: حَسَنٌ صَحيح), واتە: جوان بیکێشەو پارسەنگی تەرازووەکە بدەوەو با شتەکە بەسووکی نەکێشی.

جارێکیان یەکێك لەپیاوە صاڵحەکان بانگ کرا بۆ ئەوەی نوێژی مردوو لەسەر جەنازەیەك بکات, لەو کاتەدا کەپیاوچاکەکە خەریکی نوێژەکەبوو, برادەرێکی چووە لایەوەو بەگوێیدا چرپاندو گوتی: مامۆستا ئەوە چۆن نوێژ لەسەر ئەو کابرایە دەکەی کەپیاوێکی فاسقو کەم دین بووە! کاتێ پیاوە باشەکە نوێژی مردووەکەی تەواوکرد

بەکابرای گوت: وام دەزانی دەڵێی ئەم کابرا مردووە" لەژیانیدا تەرازووبازی کردووەو دوو تەرازووی هەبووە، بەیەکیان شتی فرۆشتووەو بەیەکیان کڕیویەتی‌و فێڵی لەتەرازوودا کردووە! کابرا گوتی: بۆچی قوربان فاسقیەتی‌و کەم دینی" تاوانەکەی گەورەترە یان تەرازووبازی؟! فەرمووی: فاسقیەتی‌و کەم دینی تاوانێکە لەنێوان ئینسان‌و خوای خۆیدایە، بەڵام تەراززبازی تاوانێکە پەیوەندیی بەبەندەکانی خواوە هەیە، هەتا مافی ئەو خەڵکانە نەداتەوە کە لەکڕین‌و فرۆشتندا فێڵی لێکردوون‌و ماڵی خواردوون خوای گەورە عەفووی ناکات‌و تۆبەی لێ وەرناگرێ!!

ڕۆژێکیان فوضەیلی کوڕی عیاض (ڕەحمەتی خوای لێبێت) تەماشای کرد وا کوڕەکەی دینارێکی بەدەستەوەیەو خەریکی پاککردنەوەیەتی بۆئەوەی ئەو تۆزو پیسیەی کەپێوەیەتی نەبێتە هۆی ئەوەی لەکاتی کێشاندا زیاد لەوەزنی ڕاستەقینەی خۆی کێشی بێ! فوضەیل ئەم کارەی ئەم کارەی کوڕەکەی زۆر بەلاوە خۆش بوو، بۆیە دەستخۆشی لێکردو فەرمووی: (يا بُنَيَّ فعلُكَ هذا أفْضَلُ مِنْ حَجَّتَيْنِ وَعِشرينَ عَمْرَةً)، واتە: کوڕی خۆشەویستم، بەخوا ئەم ئیشە جوانەتم بەلاوە گەورەترو خۆشەویستترە لەبەجێهێنانی دوو حەجی سونەت‌و بیست عەمرەکردن!

ئیمانداران: با هەمووومان ئاگامان لەخۆمان بێ، چونکە شەرت نیە هەر دوکانداڕو ئەهلی کەسابەت‌و بازاڕ تووشی گوناهی تەرازوو و شاردنەوەی عەیبەکانی شتی فرۆشراو بن، بەڵکو ئەو جووتیارو فەلاحەش کەدانەوێڵە دەفرۆشێ، یان میوە دەفرۆشێ، ئەگەر ئەوەی نیشانی کڕیارەکەی دەدا هەمووی وەکو یەك نەبێ، ئەوەش هەر غەش‌وفێڵ کردنە، وەئەو کەسەی خاوەنی مەڕو ماڵاتە، ئەگەر ئەویش عەیب‌و نەخۆشی‌و کەموکوڕیەك لەحەیوانەکەیدا شك بەرێ، ئەوا ئەگەر لەکاتی فرۆشتندا باسی نەکرد، ئەویش ماڵەکەی حەرام دەبێ، جا دەبێ چی لەوە تاوانتر بێ ئینسان ئەو هەموو زەحمەت‌و ناڕەحەتیە بەبەروبوومێکەوە ببینێ، بەڵام لەکاتی فرۆشتندا ماڵی خۆی حەرام بکات!

ئیمامی غەزالی لە (أحياء الدين)دا دەفەرموێ: ( كُلُّ مَنْ خَلَطَ بالطَّعامِ تُراباً أوْ غَيْرَهُ، ثُمَّ كالَهُ فَهُوَ منَ المُطَفِّفينَ في الكَيْلِ، وكُلُّ قَصَّابٍ وَزَنَ مَعَ اللَّحْمِ عَظْماً، لَمْ تَجرْ العادَة بِمِثْلِه، فَهُوَ مِنَ المُطَفِّفينَ في الوَزْنِ ..)، واتە: هەرکەسێك لەگەڵ خواردەمەنیدا" جا دانەوێڵە بێ

یان شتی تر" گڵو خۆڵ یان هەر شتێکی تر تێکەڵاو بکات بۆ ئەوەی لەکاتی فرۆشتندا کێشەکەی زیادبکات ئەوە لەتەرازووبازان حیساب دەکرێت لەپێوانەدا, وەهەر قەصابێك لەگەڵ گۆشتدا ئێسقان بۆ موشتەریەکە تێبکات, کەعادەت وا نەبێ لەو شوێنو شارەدا گۆشت بەئێسقانەوە بفرۆشرێ, ئەوە ئەو قەصابەش لەتەرازووبازان حیسابی بۆ دەکرێ لەکێشانەدا!

بۆیە موسڵمانانی سەلەفی صاڵحی ئەم ئومەتە, هەرگیز نەبووە شتێکیان فرۆشتبێ ئیللا هەرچی کەموکورییەکیان لەو شتەدا شك بردبێ باسیان کردووە, ئەوەتا (واثیلەی کوڕی ئەسقەع) جارێکیان حوشترێکی نێری هەبوو بەکابرایەکی برادەری خۆی گوت: تۆ لەبازاڕ شارەزایتو خەڵکی دەناسی, بەڵکو ئەم حوشترەم بۆ بفرۆشی. کابرا لەگەڵی چووە مەیدانو حوشترەکەی بۆ فرۆشت بە (300) دیرهەم, لەو کاتەدا (واثیلە) خافڵابوو ئاگای لەمعامەلەکە نەبوو, کابرا حوشترەکەی پێش خۆی داو دوورکەوتەوە, واثیلە بانگی کرد: کاکە گیان تۆ کەئەم حوشترەت کڕی, بۆ ئەوەتە سەری ببڕیو سوود لەگۆشتەکەی وەربگری, یان بۆ ئەوەتە بۆ سواریو بار بەکاری بهێنی؟ کابرا گوتی: بەخوا بۆ سوارییو ئیشی بار کڕیومە, فەرمووی: دەی کاکە گیان, ئەم حوشترە هی منە, بەڕاستی لەڕێگادا زۆر سستەو باری گرانی بۆ هەڵناگیرێ, تۆ وا مەزانە کەوا بەڕواڵەت توندوتۆڵو قەڵەوە, چونکە قاچەکانی بۆ ڕۆیشتنو بار بێهێزن. کابرا پەشیمان بۆوەو وڵاخەکەی هێنایەوە گوتی: دەی ئەگەر وابێ لەدووسەد دیرهەم زیاتری پێ نادەم. بەم شێوەیە سەد دیرهەمی وەرگرتەوەو حوشترەکەی برد, کابرای دەڵاڵ گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێت, خۆ ئێمە ڕێك کەوتبووین, ئەویش ماڵەکەی لەبەرچاو بوو, پێی ڕازی بوو, ئیتر تۆ بۆ وازت نەهێنا؟! واثیلە فەرمووی: ئەی برای خۆم, دەزانم تۆ چاکەی منت دەوێ, بەڵام بزانە, ئەم دینە وای فێر کردووین کەدەبێ دڵسۆز بین بۆ ئیمانداران, پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرموویەتی: (لا يَحِلُّ لأحَدٍ يَبيعُ بَيْعاً إلاّ أنْ يُبَيِّنَ آفَتَهُ, وَلا يَحِلُّ لِمَنْ يَعْلَمُ ذلِكَ إلاّ تَبَيَّنَهُ)(رَواهُ الحاكِم وَقالَ صَحيحُ الإسناد), واتە: حەڵاڵ نیەو ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێك کاتێ شتێك دەفرۆشێ ئیللا دەبێ هەرچی عەیبو کەموکورییەکی ئەو شتە هەیە بۆ کڕیارەکەی باس بکات, وەڕەوا نیەو حەڵاڵ نیە کەسێکیش کەئاگای لەو معامەلەیەو دەزانێ ماڵە

فرۆشراوەکە عەیبدارە, بەڵام فرۆشیارەکە فێڵبازو حەرام خۆرەو ئەم عەیبە بەکڕیارەکە ناڵێو بەبێ عەیب پێی دەفرۆشێ, ئیللا دەبێ بچێ بەهەر شێوەیەکی بۆی بگونجێو (فیتنەیی‌و دوژمنایەتی لێ پەیدا نەبێ) کڕیارەکە تێبگەیەنێ کەئەو ماڵەی کڕیویەتی عەیبدارەو فرۆشیار فێڵی لێکردووە.

کەواتە ئیمانداری بەڕێز: هەرکاتێ حەیوانێکت فرۆشت, یان سەیارەیەکت فرۆشت, یان هەر کەلوپەلێکت بەکەسێك فرۆشت, هەر کەموکوڕی‌و عەیبێکت لەو شتەی خۆتدا شك برد لەموشتەریەکەتی مەشارەوە, با پارەی کەمتریش بکات, چونکە کەمی حەڵاڵ باشترە لەزۆری حەرام کەئەنجامی لەناوچوونە. زانای پایەبەرزی ئیسلام" ئبن سیرین, مەڕێکی فرۆشت, کابرای کڕیار لێی پرسی: ئایا هیچ عەیبی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ, ئەم مەڕە ئاڵف ژێر پێی دەخات!!

بەڵام بەداخەوە, خەڵکانێك دەبنە پەڵەیەکی ڕەش بەڕۆژی زێڕینی پاکی ئیسلامەوە بەوەی کەئەهلی مزگەوتە, نوێژ دەکا, ڕۆژوو دەگرێ, خەڵك بەپیاوی باشی دەزانن, سیقەو متمانەی پێدەکەن, بەڵام بەداخەوە کاتێ کڕین‌و فرۆشتنی لەگەڵدا دەکەی, سەیردەکەی وا نیەو دەستبڕێکی بێوێنەیە, لەپێناوی چەند دینارێکدا دەیان سوێندی ناڕەوا دەخواو عەیب‌و کەموکوڕی ماڵەکەی ناڵێ. بەڵام ئایا دینداری‌و خواناسی هەرئەوەیە شایەتمان بێنی‌و چەند نوێژو جومعەیەك بکەی‌و تەواو؟ نەخێر..

پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (لا تَزالُ لا إِلهَ إلاّ الله تَدْفَع عَنِ الخَلْقِ سَخطَ اللهِ, ما لَمْ يُؤْثِروا صَفْقَة دُنياهُمْ عَلى آخِرَتِهم)(رَواهُ أبو يَعلى وَالبَيْهَقي),
واتە: بەردەوام (لا إلهَ إلاّ الله) تووڕەیی‌و غەزەبی خوا لەسەر خەڵکی خوا لادەدات, هەتا ئەو کاتەی کەوا قازانج‌و دەستکەوتی دونیایی بەلایانەوە گرنگتر دەبێ لەڕەزامەندیی خواو بەختەوەریی قیامەت!

لەڕیوایەتێکدا: (ما لَمْ يُبالوا ما نَقَصَ مِنْ دُنياهُمْ بِسَلامَةِ دينِهِمْ فإذا فَعَلوا ذلِكَ, قالوا: لا إِلهَ إلاّ الله, قالَ اللهُ تَعالى: كَذَّبْتُمْ لَسْتُمْ بِها صادِقينَ), واتە: بەردەوام (لا إلهَ إلاّ الله) دیفاع دەکا لەو کەسانەی کەئەم کەلیمە پیرۆزەیان گوتووەو کردوویانە بەدین‌و مەنهەجی ژیانی خۆیان هەتا ئەو کاتەی کە لەپێناوی پاراستنی دینەکەیاندا بەلایانەوە گرنگ نیە چ

زەرەرێکی دونیایی دەکەن, بەڵام هەرکاتێ وایان لێهات کە لەپێناو بەدەست هێنانی دەستکەوتی مادیو دونیایی حەرامدا, گوێ بەسەلامەتی دینو ئیمانەکەیان نەدەن, ئەوە لەو کاتەدا کەدەڵێن (لا إلهَ إلاّ الله) خوای گەورە دەفەرموێ: درۆ دەکەن, ئێوە ڕاست ناکەن کەدەڵێن (لا إلهَ إلاّ الله), چونکە ئەگەر ڕاستتان بکردایە دینو ئیمانەکەتان بەقوربانی ماڵو سامانی حەرام نەدەکرد!

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وسَلّم فەرموویەتی: (مَنْ قالَ لا إلهَ إلاّ الله مُخْلصاً دَخَلَ الجَنَّةَ, قیلَ وَما إخْلاصُهُ؟ قالَ: أنْ یَحرِزَهُ عَمَّا حَرَّمَ الله)(رَواهُ الطَبَراني بإسنادٍ حَسَنٍ), واتە: هەرکەسێ بەدڵسۆزیو ساغیەوە لەدڵەوە بڵێ: لا إلهَ إلاّ الله, خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە, عەرزی پێغەمبەری خوایان کرد: ئایا نیشانەی ئیخلاصو دڵسۆزیو ساغی لەگوتنی لا إلهَ إلاّ الله دا چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کەئەو کەسەی دەڵێ لا إلهَ إلاّ الله, ئەو کەلیمەی شایەتمانە, ئەو بڕوابوونە بەتاكو تەنهایی خوا, ببێتە پەردەیەكو نێوانێك لەنێوان ئەو کەسەو ئەو شتانەی کەخوا حەرامیکردووە, بەمانای: هەرچی خوا حەرامی کردووەو فەرمانی کردووە کەموسڵمان خۆی لێ بپارێزێ, ئەم ئیماندارە کەگوتوویەتی لا إلهَ إلاّ الله, لەترسی خوا, لەبەر خاتری خوا دەستی بۆ نەباو ئاواتی بۆ نەخوازێو بەدوویا عەوداڵ نەبێ, جا هەرکەسێ ئاوا بڵێ لا إلهَ إلاّ الله, ئەوە با دڵخۆش بێ بەوەی کەإنشاءَ الله بەهەشت جێگایەتی!

خۆشەویستان: بەڕاستی دینداریو خواناسی, پیاوچاکیو صاڵحی, تەنها بەوە نابێ کەئینسان هەندێ دروشمی ئاینیو عیبادەتی بێڕۆح ئەنجام بدات, بەڵکو پیاوچاکیو دینداریی ڕاستەقینە ئەوەیە کەسوودت بۆ موسڵمانان هەبێ, وەئیمانداران لەشەڕو خراپەو فرتوفێڵو غەشکردنت ئەمین بن.. ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە, ئەوەندە ڕاستگۆیە, ئەوەندە ئەمینو دەستپاکە, هەرکاتێ معامەلەو کڕینو فرۆشتنی لەگەڵ هەرکەسێکدا بوو" هەرکە گوترا ئەم ماڵەم لەفلان کەس کڕیوە, ئیتر هەموو کەس بڵێن: دڵنیابە خێری لێدەبینیو ئەو فلان کەسە سەرڕاستو معامەلە دروستو بێغەشو تەڵەکەیە.. بەڵام پەنا بەخوا ئەگەر گوترا ئەم ماڵە, ئەم سەیارەیە, ئەم کەلوپەلەم لەفلان کەس کڕیوە, هەرچی ئەم قسە ببیستێ بڵێ: کوڕە ئاگاداربەو جوان سەیری بکە, فلان کەس جێی متمانە نیەو

سیقە بەقسەو معامەلەی ناکرێو قۆڵی دەیان خەڵکی وەکو تۆی بڕیوە, ئەوە ئەو کەسە زۆر زەحمەتە (لا إِلهَ إِلاَّ اللّه) سوودی پێبگەیەنێو لەڕیزی ئیماندارن حیساب بکرێ, هەروەکو دەگێڕنەوە: جارێکیان یەکێ لەزانایانی تابیعین ئامۆژگاریی موسڵمانانی دەکردو فەرمووی: ئەگەر بچمە مزگەوتێکەوەو ئەو مزگەوتە پڕ بێ لەخەڵك, یەکێ لێم بپرسێ: (مَنْ خَيْرُ هؤلاء؟) چ کەسێك باشترین کەسە لەناو ئەو هەموو خەڵکە زۆرەدا؟ لەوڵامدا دەپرسم: (مَنْ أَنْصَحَهُمْ لَهُمْ؟) ئایا چ کەسێکیان دڵسۆزترینو بەخزمەترینو ڕاستگۆترینو ئەمینترین کەسیانە بەرامبەر موسڵمانان؟ جا کەخەڵکەکە گوتیان: فلان کەس, ئەوە منیش دەڵێم: دەی دەتوانم سوێند بخۆم کەفلان کەس" کەئەو هەموو موسڵمانە کە لەگەڵیدا دەژینو معامەلەو کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵیدا هەیەو تا ئێستا غەشو دەست بڕییان لێ نەدیوەو چاوەڕێی خێری لێدەکەنو لەشەڕو خراپەی دڵنیان, ئەوە باشترین کەسو بەئیمانترینو خواناسترین کەسە لەناو ئەو خەڵکەدا. وەئەگەر هەر لەو مەجلیسەدا لێم بپرسن: (مَنْ شَرُّهُمْ؟) چ کەسێك لەهەموو کەس خراپترو خوانەناسترو بێدینترە لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا؟ منیش دەپرسم: ئێوە پێم بڵێن: (مَنْ أَغْشَّهُمْ لَهُمْ؟) ئایا چ کەسێك لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا, فێڵبازترینو دەستبڕترینو بێویژدانترین کەسە؟! ئەگەر گوتیان: بەخوا فلان کەس, کەم کەس هەیە شتێکی لێ کڕیبێ یان پێ فرۆشتبێو دەستی نەبڕیبێو غەشو فێڵێکی لێ نەکردبێو زەرەرێکی لێ نەدابێ! دەفەرموێ: منیش دەڵێم: (هُوَ شَرُّهُمْ), دەی ئەو کەسە خراپترینو بێدینترین کەسی ناو ئەو هەموو خەڵکەیە!

موسڵمانانی بەڕێز: مرۆڤ لەژیاندا زۆر جار تووشی هەڵەو تاوانو سەرپێچی پەروەردگاری دەبێت, سنوورەکانی خوای گەورە دەبەزێنێت, بەڵام ئەگەر ئەو گوناه و تاوانە لەنێوان خواو عەبددا بێت, ئەوە کاتێ ئینسان بەئاگا هاتەوەو تەوبەی کرد لەو خراپەو گوناهەو وازی لێهێنا, ئەوە خوا غەفوورو ڕەحیمەو تەوواب‌و لێخۆشبووەو ئەو گوناهە بەیەکجاری لەسەر ئەو عەبدەی خۆی ڕەش دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر ئەو گوناه و تاوانەی کەئینسان دەیکات, پەیوەندی بەماڵی خەڵکیەوە هەبێت, واتە: ماڵی خەڵکی خواردبێ بەهۆی غەشو فێڵ لێکردنەوە, ئەوە خوای گەورە زۆر زۆر عادلەو حەقی کەس نافەوتێنێ. ئەگەر ئەو عەبدە تەوبەی کردو وازی لەو غەشو خیانەتە هێنا, خوای گەورە

لەحەقی خۆی کەئەو عەبدە بێئەمری خوای کردووە, خۆش دەبێ, بەڵام حەقی ماف خوراوەکە هەر دەمێنێ, جا یان دەبێ لەدونیادا مافی خۆی بداتەوەو گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات, یان ئەگەر ئەوەی نەکرد, ئەوە لەقیامەتدا خوای گەورە چاکەی ئەو کەسەی کەغەشو خیانەتی لەو کەسەی تر کردووەو ماڵی بەناحەق خواردووە, چاکەکانی ئەو کەسە هەڵدەگرێو دەیخاتە سەر چاکەکانی ماف خوراوەکە, خۆ ئەگەر ئەو کەسە چاکەی نەمابوو, ئەوا تاوانی ماڵ خوراوەکە دەخاتە سەر ئەو کەسەی کە لەدونیادا مافی خواردووەو لەڕێگای کڕینو فرۆشتنەوە دەستی بڕیوە, وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: لەڕۆژی قیامەتدا زۆرن ئەوانەی کە لەدونیادا نوێژو ڕۆژوو و صەدەقەو خێرو خێراتیان کردووە, بەڵام لەڕۆژی قیامەتدا لەبەردەم مەحکەمەی خوادا موفلیسو دەست بەتاڵن ! عەرزیان کرد بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ؟! فەرمووی: چونکە ئەو جۆرە کەسانە لەدونیادا زوڵمیان لەخەڵکی کردووە, مافی خەڵکیان پێشێل کردووە, ماڵی خەڵکیان بەناحەق خواردووە ( وَأَكَلَ مالَ هذا ), خوای گەورەش چاکەکانی دەدات بەمافو ماڵ خوراوەکان, ئەگەر چاکەشی نەما ئەوا خراپەی ئەوانەی کەمافیان لایەتی, دەخرێتە سەر ئەو کەسەو بەم شێوەیە هیچ چاکەو خواپەرستیەکی نامێنێو موفلیسو ڕەنجەڕۆی ڕۆژی قیامەت دەبێ. جا بەڕاستی هیچ شتێ وەکو بازاڕو تەرازوو و کڕینو فرۆشتن نیە, چونکە ئەو کەسەی ئەوە پیشەیەتی, بەردەوام لەناوڕیایەتی, خۆ ئەگەر ڕۆژی یەك غرام غەش بکا ئەوا پەنا بەخوا دەبێ لەماوەی تەمەنیدا چی مافی خەڵکی لەسەر خۆی کۆبکاتەوەو چۆن ڕەنج بەخەساری قیامەت دەبێت!

ئەمە بەڵای گوناه و تاوانی فێڵو غەش کردن بۆ سەر تاکە کەس. ئێستا با بزانین لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە غەش کردن لەکێشانەو پێوانەدا چی کاریگەریەکی خراپی بۆ سەر کۆمەڵگا دەبێت. گومانی تێدا نیە هەر کۆمەڵگایەك فێڵو دەستبڕین لەبازاڕو ئەهلی بازاڕیدا بێت, ئەوا سیقەو متمانە لەنێوان ئەهلی کەسابەتو بازاڕو ئەو دانیشتوانەی لەو شوێنەدا ڕوودەکەنە ئەو بازاڕە" نامێنێ, چونکە ئینسان ئەگەر جارێك شتێکی بەباش کڕیو بەڵام کەهێنایەوە ماڵەوە تەماشای کرد ئەوە نیە کەئەو بەحیسابی خۆی کڕیویەتی, ئەوە جارێکی تر متمانەو بەو دوکاندارە ناکاو هەوڵدەدات جارێکی تر شتی لێ نەکڕێ,

وەمتمانەو سیقەی بەدوکاندارو فرۆشیاریتریش نامێنێ. بەمەش وای لێ دێ, بەهۆی خیانەتکارو فێڵبازو حەرامخۆرێکەوە, دەیان کەسی دەستپاکو سەرڕاستو معامەلە دروست, گومانی خراپیان پێ ببرێ, وەخەڵکی کڕیار بەیەك چاو سەیریان بکەن. زۆر جار حەرامخۆرو فێڵبازەکە بەڕاستگۆو ئەمین دەناسێو خواناسو تەرازوو پاکەکە بەخائینو دەستبڕ دەناسێ. بەم شێوەیە وای لێ دێ ئەوەشی کەڕاستگۆیەو حەڵاڵخۆرەو سوێندی درۆ ناخواو بەزمانی لووس کەس ناخەڵەتێنێ, سەیر دەکا بازاڕی ساردەو خەڵك ڕووی تێ ناکاو شتی بۆ نافرۆشرێ, ئیتر وای لێ دێ وەڕسو بێتاقەت دەبێو ئەگەر ئیمانو خواناسیەکەی زۆر قایم نەبێ, وای لێ دێ لەخشتە دەچێو ئەمیش دەست دەکا بەسوێندخواردنو شتی باشو خراپ تێکەڵاو دەکاو بەیەك نرخ دەیفرۆشێ! بەم شێوەیە بازاڕ متمانەی تێدا نامێنێو ئیقتیصادو ئابووری کەیەکێ لەسێ کوچکەکانی بازرگانیە, بەرەو گەندەڵیو داڕووخانو تەپین دەڕوات, ئەمەش کاریگەری دەبێ بۆ سەر بواری پیشەسازیو مەعمەلەکەش کەسەیری کرد باشو خراپ لەبازاڕدا هەمووی هەر غەشو تەزویری تێدا دەکرێ, ئەویش شتی باش لەکارگەکەدا بەرهەم نامێنێ, ڕۆژانە بەرهەم دروست دەکاو بەتەنگ سومعەو ناوی کارگەکەیەوە نامێنێو ساڵی چەند ناو بۆ مەعمەلو کارگەکەی دەدۆزێتەوەو ناوەکەی دەگۆڕێ بۆ ئەوەی بەرهەمە خراپەکانی ساغ بکاتەوەو خەڵکی بەشتی نوێو باشی تێبگەن. هەروەها بواری کشتوکاڵو ئاژەڵداریش بەهەمان شێوە کاتێ جووتیارو فەلاح هەستی کرد دانەوێڵەو میوەو بەرهەمەکان, بەهۆی غەشو تەزویری بازاڕەوە هەمووی وەکو یەك تەماشا دەکرێو بەیەك نرخ دەفرۆشرێت, مەگەر ئیمان بەڕەقابەو چاودێریی خوا, ئەگینا ئەویش لەفەردەیەك گەنمو جۆو نۆکدا, یان لەشەبەکەیەك پیازدا, یان لەصندووقی ترێدا, ماڵو سامانی خۆی حەرام دەکاو ئەوەی جوانە لەچینی دیارو دەرەوەو سەرەوەدا دایدەنێو ئەوەشی کەڕزیوو گەندەڵە دەیخاتە ژێرەوەو ناوەوە. بەم شێوەیە ئەو جووتیارو فەلاحەش ئەو هەموو ڕەنجو ماندووبوونو دەست قڵیشاویەی خۆیو خێزانی حەرام دەکاو ئەو دەستە قڵیشاوە ماندووەی کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ماچیکردو ڕێزی لێگرت, ئەو دەستە بەڕێزە بەهۆی غەشو تەزویرەوە تووشی ئاگری جەهەنەم دەکات! ئیتر وای لێ دێ کۆڵەکەکانی

ئابووری کەبریتین لەکشتوکاڵو پیشەسازیو بازرگانی، دادەڕووخێنو ئەو وڵاتە چونکە لەناو خۆیدا متمانەی نەماوە، لەلایەن دەوڵەتانیشەوە بەرهەمەکانی بەچاوی سووك سەیر دەکرێو بێنرخ دەبێ. وەکو لەبەرچاومانە ئەو کەلوپەلو خۆراکەی وەئەو ئامێرو دەزگایەی لەوڵاتێکی وەکو (یابان)ـەوە دەردەچێت، لەهەموو دونیادا بەچاوی ڕێزەوە تەماشای دەکرێو پێویست بەدوودڵیو گومان ناکاو وا دەزانی خۆت کێشانەو پێوانەت کردووەو بەشەخصی بۆ تۆ ئامادەکراوە! لەبازاڕدا پارەی زۆرتری پێدەدرێو لێی دڵنیای، بەڵام بەداخەوە کەلێی نووسرابوو ئەمە دەستکردو پیشەسازی عیراقە، یان ئێرانە، یان وڵاتێکی بەناو ئیسلامیە، یەکسەر گومانت بۆ پەیدا دەبێو ئەگەر باشیش بێ تۆ هەر بەخراپ لێی تێدەگەی، چونکە سیقەو متمانەی نەماوە!!

بەڵێ بەڕێزان: بەم شێوەی باسمان کرد، مەترسی گوناهی تەرازووبازیو غەشو خیانەتی بازاڕو ئەهلی کەسابەتو بازاڕ، شەڕەکەو ئاگرەکەو ئەهامەتیەکەی هەر بۆ شەخصی حەرامخۆرەکەو دەستبڕو فێڵبازەکە نیە بەتەنها، بەڵکو بۆ هەموو دانیشتوانی ئەو وڵاتەو بۆ هەموو ئابووری ئەو وڵاتەیە کـــەئەو جۆرە فێڵو تـــەڵـــەکـــەو غەشەی تێدا دەکرێ.

ئیمانداران: گوێ بگرن بۆ چاوساغو پێشەواو ڕابەری دونیاو قیامەتمان حەزرەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کەچۆن ئومەتەکەی لەخەتەرو زەرەرو زیانە گشتیەکانی کۆمەڵێك گوناھ و بێشەرعی ئاگادارکردۆتەوە کەزەرەری تەنها بۆ گوناهبارەکە نیە، بەڵکو ئەگەر بوو بەگشتیو زۆربەی خەڵکی ئەو گوناهەیان کرد، ئەوا خوای گەورە هەموو ئەو گەلە بەیەکەوە سزا دەداتو بەڵای ئەو تاوانە هەموو دانیشتوانی ئەو شوێنو وڵاتە دەگرێتەوە!

صەحابی بەڕێزی کوڕی بەڕێز" عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرموێ: (أَقْبَلَ عَلَيْنا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فَقالَ)، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ڕووی تێکردینو ئامۆژگاری کردینو فەرمووی: (يا مَعْشَرَ المُهاجِرِينَ) ئەی کۆمەڵی کۆچەریەکان، ئەی ئەوانەی کە لەمەککەوە کۆچتان کرد بۆ مەدینەو ماڵوحاڵو کەسی خۆتان لەپێناوی ڕەزامەندیی خواو پاراستنی دینو عەقیدەی ئیسلامی خۆتان"

بەجێهێشت, ئاگاداربن‌و بزانن: (خَمْسُ خِصالٍ إذا إبْتُليتُمْ بِهِنَّ, وَأعوذُ بِالله أنْ تُدْرِكوهُنَّ), فەرمووی: پێنج ڕەوشت‌و پێنج خەصڵەت هەن, هەرکاتێ پێیان گیرۆدەبوون‌و لەناوتاندا بڵاوبوونەوەو ئەنجامدران, وەمن پەنا دەگرم بەخوا کەئێوە تووشیان ببن, واتە: هەرکاتێ ئەم پێنج شتە لەهەر کۆمەڵێکدا ڕوویاندا, ئەوە با چاوەڕێی ئەو سزاو عقووبەیە بن کە لەلایەن خواوە بۆیان دێتە خوارەوە بەهۆی ئەنجامدانی ئەو کردەوە ناشیرین‌و بێ‌شەرعیانەوە:

**یەکەم:** (لَمْ تَظْهَرِ الفاحِشَةُ في قَوْمٍ قَطُّ, حَتَّى يُعْلنوا بِها, إلاّ فَشا فيهِمُ الطّاعونُ وَالأوجاعُ الّتي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ في أسْلافِهِمُ الّذينَ مَضَوا..), واتە: هەرکاتێ بێ‌ڕەوشتی‌و زینا لەناو هەر گەل‌و نەتەوەیەکدا بەئاشکرا کراو کەس نەبوو بڵێ وا مەکەن‌و شەرم‌وشکۆ لەنێوانیاندا نەمابوو, بەڵکو زیناکردن‌و بەدڕەوشتی بەپێشکەوتنخوازی‌و ئازادی شەخصی ناو دەبراو داوێن پاکی بەدواکەوتوویی‌و کۆنەپەرستی تەماشا دەکرا, ئەوە ئەو گەل‌و نەتەوەیە نەخۆشی طاعوون‌و برسیەتیەک‌و گرانیەکی وەهایان لەنێواندا بڵاودەبێتەوە کەخەڵکانی پێش خۆیان هەرگیز هەر ناویشیان نەبیستوون, وەکو ئێستا ئایدزو سفلس‌و چەند نەخۆشی سامناکی نوێی تر بەهۆی داوێن پیسی ئاشکراوە, تووشی گەلانی سەر زەوی بووە, کەئێستا بەنەخۆشی ئایدز دەگوترێ تاعوونی سەردەم (طاعون العَصر), پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم چۆنی فەرمووە ئاوا هاتۆتە دی.

**دووەم:** (وَلَمْ يَنْقُصوا المِكْيالَ وَالميزانَ, إلاّ أُخِذوا بِالسِّنينَ, وَشِدَّةِ المُؤْنَةِ, وَجَوْرِ السُّلْطانِ عَلَيْهِمْ), بەڵای دووەم ئەوەیە: هەرکاتێ کێشانە‌و پێوانە, کەموکوڕی تێدا کراو حەقی تەرازوو نەدراو تەرازووبازی هاتە ناو بازاڕو ئەهلی کەسابەتەوە, ئەوا خوای گەورە دانیشتوانی ئەو شارو وڵاتە تووشی گرانی دەکا, وەتووشی قورس بوونی ژیان‌و گوزەرانیان دەکات‌و ئینسان هەرچەند زۆر پەیدا دەکات‌و داهاتی زۆر بێ کەچی هێشتا هەر پێڕاناگاو هەموو پێویستیەکانی ڕۆژانەی بۆ دابین ناکرێ وەخوای گەورە ئەو گەل‌و نەتەوەیە گیرۆدە دەکات بەکاربەدەستی زاڵم‌و ستەمکارو بەرتیل خۆر بەسەریانەوە, فعلاً (صَدَقْتَ يا رَسولَ اللهِ وَبِالحَقِّ نَطَقْتَ) هەموویمان بەچاوی خۆمان بینیوە !

**سێیەم:** (وَلَمْ يَمْنَعوا زَكاةَ أمْوالِهِمْ إلاّ مُنِعوا القَطْرَ مِنَ السَّماء، وَلَوْلا البَهائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا)، وەهەرکاتێ خەڵکی دەوڵەمەند زەکاتی ماڵی خۆیان نەداو بەخیل بوون پێیو ئەو ماڵەی لەژێر دەستیاندایە بەهی خوایان نەدەزانیو زەکاتیان بەزەرییە ناو دەبرد، ئەوە خوای گەورە بارانی ئاسمانیان لێ دەگرێتەوەو ئەو ئاسمانە یەك دڵۆپە ئاوی لێ نایەتە خوارەوە، وەئەگەر لەبەر خاتری بێزمانو مەڕوماڵاتو کرمو زیندەوەری بێتاوانی ناو زەوی نەبوایە چاوتان بەباران نەدەکەوت. کەواتە: ئێستا کەباران دەبارێ ئەوە خوا بەزەیی بەو هەموو زیندەوەرە بێزمانە دیارو نادیارەی خۆیدا هاتۆتەوە، ئەینا دەبوایە باران لەسەر زەوی نەباریایە، بەهۆی بەلاّو ڕەشیو نەگبەتی ئەو هەموو خاوەن سەرمایەو کۆمپانیاو مەعمەلو شەریکاتەوە، کەئەو هەموو هەژارو کەساسو نەخۆشو بێچارەیە ڕۆژانە دەچێتە بەردەرگای، کەچی دەست دەنێ بەڕوویەوەو دەڵێ برۆ خوا بتداتێ، بێئاگا لەوەی کەخوا بۆیە داویەتی بەم" تا ئەویش بیدا بەهەژارو نەداران!

**چوارەم:** (وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللهِ وَعَهْدَ رَسولِهِ إلاّ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمْ عَدُواً مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذوا بَعْض ما في أَيْديهِمْ )، واتە: وەهەر گەلو میللەتێك ئەو پەیمانەی کەبەستوویانە لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا کەبریتییە لەوەی کەجگە لە الله هیچ خوایەکی تر نەپەرستنو حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم پێغەمبەرو پێشەوایان بێ، هەرکاتێ لەم پەیمانە لایانداو ئەم عەهدو بەڵێنەیان هەڵوەشاندەوەو پشتوپەنایان بەغەیری خوا بەستو شوێن کەوتووی ڕێبازی غەیری محمد المصطفى بوون، ئەوە خوای گەورە دوژمنیان بەسەردا زاڵ دەکات لەغەیری خۆیان، واتە کافریان بەسەردا زاڵ دەکاتو دەبنە ژێردەستەی دوژمنانی خواو، ئەو کاتە بەروبوومی وڵاتەکەیان دوژمنی دینو ژینیان، دەستی بەسەردا دەگرێتو ئەو میللەتە موسڵمانە دەبێ چاو لەدەستی بێگانەی کافر بێ خێری پێ بکات.

**پێنجەم:** (وَما لَمْ تَحْكُمْ أئِمَّتُهُمْ بِكِتابِ اللهِ تَعالى وَيَتَخَيَّرُوا فيما أنْزَلَ اللهُ، إلاّ جَعَلَ اللهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ)، واتە: وەهەرکاتێ سەرکردەو لێپرسراوانی ناو میللەتی موسڵمان حوکمو یاساو قانوونیان قورئان نەبوو، بەگوێرەی قورئانی پیرۆز حوکمو فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیان بەڕێوە نەدەبرد، بەڵکو ئەوەی بەدڵیان بوایە لەقورئان هەڵیاندەبژاردو دەیانگوت باشە، ئەوەشی لەقورئاندا کە لەگەڵ هەواوهەوەسی خوانەناسانەی ئەوان نەگونجایە دەیانگوت

ئەمە بەکەڵك نایەو دەبێ قانوونێکی تری دەستکردی مرۆڤ حوکمی پێ بکرێ, ئەوە ئەو کاتە خوای گەورە غەزەب لەو وڵاتەو لەو میللەتە دەگرێو دوژمنایەتیو ڕق لێبوونەوە لەیەکتریو خوێن ڕێژییان دەخاتە نێوانەوەو دانی خێر بەیەکدا نامێننو دەیان دەستەو کۆمەڵیان لێ پەیدا دەبێو هەمووشی هەر خۆی پێ ڕاستەو بەرامبەرەکەی پێ خائینو ناپاکە.. بەڵێ ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ئەو ئومەتی ئیسلامەی کەڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای گرتبۆوەو هەموو گەلو نەتەوەکان بەجیاوازی نیشتمانو ڕەنگو زمانو نەتەوەو لەژێر یەك ئاڵادا کە (لا إلهَ إلاّ الله و محمد رسُولُ الله)یە کۆببوونەوەو وەکو برای دایكو باوکی دەژیان, بەڵام بەهۆی وازهێنان لەقانوونی قورئانو داهێنانی یاسای مرۆڤکرد, ئێستا نەك چەند نەتەوە, بەڵکو یەك نەتەوەش لەناو خۆیاندا کەخوایان یەکە, پێغەمبەریان یەکە, دەچنە یەك مزگەوت, مردوویان لەیەك گۆڕستاندا دەنێژن, بەیەك قانوون ئیش دەکەن کەقانوونی غەیری ئیسلامە, کەچی هێشتا هەمووی هەر ڕقی لەوی ترەو بەیەکەوە ناگونجێنو تەباییو برایەتی دڵسۆزانەو ڕاستەقینە لەناویاندا باری کردووە!

بەڵێ ئیماندارانی خۆشەویست: دەبێ هەر وابێو هەرچی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرموویەتی حەقو ڕاستە, چونکە ﴿ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى, إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى ﴾(النجم 3 ـ 4), بەڕاستی لەهەر وڵاتێ داوێن پیسی بەئاشکرا کراو, زەکات خوراو, حەقی هەتیوو هەژار نەدرا, کەم فرۆشیو دزیو دەستبڕی بوونە مایەی ژیانو گوزەرانی خەڵك, بەغەیری دەستووری ئاسمانی خوا حوکم کراو فەرمان درا, قورئانو ڕێوشوێنو سوننەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم پشتگوێ خران, دۆستانو پەیڕەوانی شەریعەت لەهیچ جێ ڕێگەیان نەدرا, ئەو وەختە دەردو نەخۆشیو گرفتاری زۆر دەبێ, ساغیو سەلامەتیو خۆشگوزەرانی نامێنێ, پارەی پیسو ماڵی حەرام وەك ئاگری تێبەربێ نامێنێ, لاشە دێتە ئێشو ژانو, نانو گوزەران گران دەبێ, ڕەحمو بەزەییو حەقو دادگەری بار دەکا, دوژمن زاڵ دەبێو بەئارەزووی خۆی ڕەفتار دەکا.

بەڵام ئەگەر شەریعەتی ئیسلام زیندوو بکرێتەوە, عەمەل بەقورئانو حەدیس دامەزرێتەوە, کۆمەڵی موسڵمانان لەئەخلاقو ڕەفتاری پیس پاك دەبنەوە, پشتی یەك

دەگرن, لەگەڵ یەكتری دەژین‌و دەمرن, دوژمن لێیان دەترسێ, وڵات سەربەخۆو سەربڵند دەبێ, میللەت دیندارو خۆشگوزەران دەبێ.

لەكۆتایی ئەم ووتارەشدا دەڵێم: ئەی ئیمانداری كاسبكارو بەڕێز: یەقینت بەخوای خۆت هەبێ, كەئەو ڕزقەی كەبۆی دیاریكردووی هەر بۆت دەنێرێ, بەڵام تۆ پەلە مەكە بەڕێگای حەرام بەدەستی بێنی, سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن كەزانای پایەبەرز (د. عائِض القَرَني) لەكتێبە بەناوبانگەكەیدا (لا تَحْزَنْ) لاپەڕە (452) ئەم بەسەرهاتە واقیعی‌یەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: یەكێ لەپیاوە موسڵمان‌و زۆر دیندارەكانی شاری (ریاض)ی سعوودیە بۆی باسكردم كە لەساڵی (1376)ی كۆچیدا كۆمەڵێك كەس لەخەڵكی شاری جەبیل بەمەبەستی ڕاوەماسی ڕوودەكەنە قەراغی دەریاو ماوەی سێ شەوو ڕۆژ دەمێننەوە, بەڵام هەرچەندە هەوڵ دەدەن‌و ئەملاو ئەولا دەكەن تاقە ماسیەكیشیان بۆ ناگیرێ. ئەم كۆمەڵە كەسە هەر پێنج فەرزەی نوێژ جێبەجێ دەكەن, لەكاتی فرێدانی قولاپ‌و تۆڕەكە بۆ ناو ئاوەكە ناوی خوا دەبەن‌و داوا لەخوا دەكەن كەڕزقی حەڵاڵیان بەنسیب بكا, بەڵام وەكو گوتمان سێ شەوو سێ ڕۆژ دەمێننەوەو هیچیان دەست ناكەوێ. بەڵام ئەم كۆمەڵە كەسە نوێژكەرو خواناسە تەماشا دەكەن وا لەولای ئەوانەوە كۆمەڵە خەڵكێكی تری لێیە, ئەمانە یەك سوجدەش بۆ خوا نابەن, یەك نوێژیش ناكەن بەڵام هەموو جارێ كەتۆڕو قولاپەكانیان فڕێ دەدەنە ناو ئاوەكەوە, ماسی زۆر گەورەو جوان ڕاودەكەن‌و دەستكەوتی باشیان دەبێ. بۆیە یەكێ لەكۆمەڵە كەسەكەی كەهیچیان دەست نەدەكەوت, ڕووی لەخەڵكەكەی تر كردو گوتی: سُبْحانَ اللهِ, تەماشاكەن: ئێمە هەر پێنج فەرزەی نوێژ ئەنجام دەدەین, داوا لەخوا دەكەین, ناوی خوا دەبەین, كەچی یەك تاكە ماسیشمان بۆ ڕاو ناكرێ, بەڵام ئەو جەماعەتە یەك سوجدەشیان بۆ خوا نەبرد كەچی تەماشاكەن چ ماسیەكی گەورەو جوان دەگرن!!

بەڵی لەم ڕێگایەوە شەیطان وەسوەسەی شەیطانی خۆی خستە ناو دڵو دەروونیانەوەو دەڵێن: با ئێمەش واز لەنوێژكردن‌و ناوی خوا هێنان بێنین. بەڵێ نوێژی بەیانی ناكەن, پاشان نوێژی نیوەڕۆو دواتر نوێژی عەسریش ناكەن, پاشان دوای نوێژی عەسر دەچنەوە سەر بەحرو تۆڕو قولاپەكانیان دەخەنە ناو بەحرەكەوەو هەر لەیەكەم

جاردا ماسیەکی زۆر قەڵەوو جوان ڕاو دەکەن‌و دەیهێننە دەرەوەو زۆر دڵیان پێی خۆش دەبێ‌و هەر خێرا هەڵی دەدڕن کەئامادەی بکەن‌و بیبرژێنن‌و بیخۆن، بەڵام سُبْحانَ الله چی دەبینن! وا لەناو سکی ماسیەکەدا یەك دانە مرواری گران بەهای بەنرخی تێدایە، یەکێکیان پەلاماری دەداو ماچی دەکاو سەر چاوی دەنێ‌و تەماشای دەکاو دەڵی: سُبحانَ الله!! هەتا ئیطاعەی خوامان دەکردو نوێژمان دەکردو ناوی خوامان دەبرد هیچمان دەست نەکەوت، بەڵام وەختێ بێ‌ئەمری خوامان کردو سوجدەمان بۆ نەبردو سێ نوێژمان فەوتاند، چ ماسیەکی جوانمان دەست کەوت، نەك هەر ماسیەکە، ئەی ئەو مرواریە گران بەهایەی کە لەسکیدابوو، کەبایی سەدان دۆلارە! بەڕاستی ئەم مرواری‌و ئەم ماسییە گومانی خراپیان لێدەکرێ‌و پێویستە بەخۆماندا بچینەوە. بۆیە مرواریەکە فڕێ‌دەداتەوە ناو ئاوەکەوەو دەڵێ: ئومێدەوارم خوای گەورە باشترمان پێ ببەخشێ، قەسەم بەخوا ئەم ماڵەم ناوێ لەکاتێکدا دەستمان کەوت کەسەرپێچی فەرمانی خوامان کردو ناوی خوامان لەسەر نەبرد! ئەی برادەرانی خۆشەویستم، هەستن با ئەم جێگایە بەجێ‌بێڵین، چونکە لەم شوێنەدا شەیطان زەفەری پێ هێناین‌و سێ نوێژی پێ فەوتاندین.

بەڵێ ماوەی سێ میل دووركەوتنەوەو دووبارە لەقەراغ دەریا لادەدەنەوەو نوێژەکانیان بەڕێکوپێکی دەکەن‌و داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانیان لەخوا دەکەن‌و ناوی خوا دەبەن‌و تۆڕو قولاپەکانیان دەخەنەوە ئاوەکەوە، ئەمجارەیان ماسییەك بەقولاپەکەیانەوە دەبێ کەپێی دەڵێن (الكنعَد) دەریدێنن لەئاوەکەو سوپاسی خوا دەکەن‌و دەست دەکەن بەهەڵدڕینی‌و ئامادەکردنی بۆ برژاندن‌و خواردن، بەڵام سُبْحانَ الله چی دەبینن! تەماشا دەکەن هەمان پارچە مرواری کەپێشتر فڕێیان دایەوە ناو ئاوەکەوە وا لەسکی ئەم ماسییەدایە!! هەموویان بەیەك دەنگ دەڵێن: حەمدو ئەناو سوپاسی نەبڕاوە بۆ ئەو خوایەی کەئەم ڕزقە حەڵاڵ‌و پاك‌و گران بەهایەی بەنسیب کردین. ئەمجا دەستنوێژ دەگرن‌و نوێژەکەیان دەکەن‌و سوپاسی خوا دەکەن‌و جوان جوان بیردەکەنەوە کەئەم پارچە مرواریە لەڕۆژی دروستبوونیەوە" خوای گەورە بۆ ئەمانی دروستکردووەو ڕزقی ئەمانە، بەڵام جاری یەکەم کەبێ‌ئەمری خوایان کرد بەحەرامی دەستیان کەوت، چونکە هەر ماڵ‌و دەستکەوتێك خواپەرستی لەپێناوی دەستکەوتنیدا فەوتێندرا ئەو ماڵ‌و

دەستکەوتە حەرامە, بەڵام کەئەو ماڵە حەرامەیان فڕێدایەوەو ویژدانو فیطرەتیان هاتەوە هۆشو بەخۆیاندا چوونەوەو روویان کردەوە خواپەرستیو طاعەتی خوا, خوای گەورە هەمان پارچە مرواری بۆ ناردنەوەو ئەمجارەیان بەحەڵاڵی بەنسیبیان بوو! هەروەکو قورئانی پیرۆز لەو بارەوە دەفەرموێ ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا مَا آتَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ ﴾( التوبة 59 ).

بەڵێ ئیمانداران: لەئەثەرێکدا هاتووە کە: (مَنْ تَرَكَ شَيْئاً لله عَوَّضَهُ اللهُ خَيْراً مِنْهُ).. واتە: هەرکەسێك واز لەشتێکی حەرام, لەپارەو کەلوپەلێکی حەرام بێنێ لەبەر رەزامەندیی خواو لەبەر ئەوەی کەخوا نەهی لێکردووە, ئەوە با دڵنیا بێ خوای گەورە بەحەڵاڵی زۆر لەو شتەی باشتر پێ دەبەخشێ.

---

دەگێڕنەوە: جارێکیان ئیمامی عەلی (رەزای خوای لێبێت) دەچێتە مزگەوتی شاری کووفەوە بۆ ئەوەی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بکات, لەبەر دەرگای مزگەوت چاوی بەکوڕێکی گەنج کەوت, بانگی کردو فەرمووی: ئەی گەنج وەرە ئاگاداری ئەم ئەسپەم بۆ بکە هەتا نوێژەکەم دەکەم. گەنجەکەش گوتی: قوربان خەمت نەبێو من هەر لێرە دەبمو چاودێری ئەسپەکەت دەکەم. بەڵێ" ئیمامی عەلی چووە ناو مزگەوتەوەو دەستی کرد بەنوێژکردنو لەدڵی خۆیدا گوتی: دەبێ پاداشتی ئەم کوڕە گەنجە بدەمەوەو دیرهەمێکی لەحەقی ئەو وریابوونی ئەسپەمدا بدەمێ. بەڵام کوڕە گەنجەکە کەزانی ئیمام خەریکی نوێژکردنە, بەفرسەتی زانیو رێشمەی ئەسپەکە, کە بەسەری ئەسپەکەوە بوو لێی کردەوەو بردی لەبازاڕ بیفرۆشێ!! ئیمامی عەلی کاتێ نوێژەکەی تەواوکرد, دەستی کرد بەگیرفانیداو دیرهەمەکەی دەرهێناو بەدەستیەوەبوو کەبیدات بەکوڕە گەنجەکە, بەڵام کەهاتە دەرگای مزگەوت تەماشای کرد وڵاخەکەی لەوێ وەستاوەو پەتەکەی پێوە نەماوە, بۆیە ئیمامی عەلی بانگی پیاوێکی کردو فەرمووی: برۆ بۆ بازاڕو بزانە ئەو کوڕە گەنجە نادۆزیتەوە لەوانەیە ئێستا پەتی بەستنەوەی وڵاخەکەم لەبازاڕدا بفرۆشێ. بەڵێ کابرا چوو بۆ بازاڕو تەماشایکرد وا کوڕە گەنجەکە ئەملاو ئەولا دەکاتو دەیەوێ پەتەکە بەدیرهەمێك بفرۆشێ, بەڵام بۆی نافرۆشرێ! کابرا خەبەرەکەی بۆ ئیمامی عەلی هێنایەوەو ئیمامی عەلی فەرمووی: (سُبْحانَ الله!! وَاللهِ لَقَدْ نَوَيْتُ أَنْ أُعْطِيَهُ دِرْهَماً حَلالاً, فَأَبى إِلاَّ أَنْ

يَكونَ حَراماً)، واته: پاكى بۆ خوا، بەخوا من نيەتى خۆم ساغ كردبۆوه كەديرهەمێكى بەحەڵاڵى وەكو پاداشت بدەمێ، بەڵام بەداخەوە ئەو ڕازى نەبوو ئەو ديرهەمە وەربگرێ ئيلا بەحەرامى نەبێ!!

جا خۆشەويستان: با دەرسو عيبرەت لەم بەسەرهاتانە وەربگرين، يەقينمان ببێ ئەوەى خوا بۆى دياريكردووين هەر ئەوەمان بەنسيب دەبێ، جا ئەگەر بەحەڵاڵى دەستمان بكەوێ يان بەحەرامى، جا ئەگەر لەسنوورى شەرع دەرنەچين ئەوە بەحەڵاڵى دەستمان دەكەوێو پاداشتمان بۆ هەيە..

داوا دەكەم خواى گەورە قەناعەتمان پێ ببەخشێ

باوەڕمان بەڕازقيەتى خــــواى گــــەورە زياد بێ

بازاڕو كەسابەتمان لەتەرازووبازىو حەرامخۆرىو غەشكردن بەدووربێ

أللّهُمَّ آمين

# ووتاری ژماره سی

## دادگەری لەکڕین و فرۆشتندا

### بەشی سێیەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ, الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ, وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ, أَلا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ, لِيَوْمٍ عَظِيمٍ, يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾

(المطففين 1 ـ 6)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( مَن احْتَكَرَ طَعاماً فَهُوَ خاطِيءٌ )

( رَواهُ مُسلِمٌ )

الحمدُ لله رَبْ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيْدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين إلى يَومِ الدِّين..

ئيمانداران‌و خـوانــاسانی بەڕێز: سەلام‌و ڕەحـــمەتی خـــوای گــەورە لەهەمووومان بێت..آمین

خۆشەویستان: لەدوو ووتاری ڕابردوودا باسی کڕین‌و فرۆشتن‌و ئاگاداربوونی زمانی تەرازوو وەپاکیی بازاڕو ئەهلی بازاڕمان کرد لەژێر ڕۆشنایی وەصیەتە بەرزو پیرۆزەکەی خالیقمان" ڕازیقمان" زاتی الله ـ سُبحانَهُ وَتَعالى, کەفەرمووی: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ﴾(الأنعام 152), لەم ووتارەشدا پشتیوان بەخوای گەورە درێژە بەو باسە پڕ بایەخ‌و گرنگە دەدەین‌و دەڵێم وَبِاللهِ التَّوْفيق:

ئینسان ئەگەر بیەوێ موسڵمانێکی واقیعی‌و ڕاست‌و دروست بێ‌و بەو شێوەیە ژیانی بگوزەرێنێ کەهەم پیاوی دونیا بێ‌و هەم ڕووسووری قیامەت بێ, بەتەعبیری قورئانی (رجال) بێ, پێویستە لەبواری دارایی‌و ئابووریدا چاو لەدەستی کەسانی تر نەبێ‌و بەعەرەقی ناوچەوانی" ژیانی خۆی‌و ئەوانەی لەژێر دەستیدان دەستەبەربکات, لەبەرئەوەی هەرکاتێ ئینسان تووشی هەژاری‌و نەداری بوو, بەڕاستی ناتوانێ وەکو پێویست‌و ئەوەی کەخوای گەورە داوای‌کردووە, خوا بناسێ‌و خزمەتی خۆی‌و بەندەکانی خوا بکات. سەرەڕای ئەوەی کەدینەکەشی ڕوو لەکزی‌و لاوازی دەچێت, هەروەکو (لوقمانی حەکیم) ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات‌و دەفەرموێ: (يا بُنَيَّ إِسْتَغْنِ بِالْكَسْبِ الْحَلالِ عَنِ الْفَقْرِ, فَإِنَّهُ ما افْتَقَرَ أحَدٌ قَطٌّ إلاّ أصابَهُ ثَلاثُ خِصالٍ), فەرمووی: ڕۆڵەی شیرینم, بەردەوام دەست بەکاروکاسپیەکی حەڵاڵەوە بگرەو هەرگیز بێکار لێی دامەنیشە, بۆئەوەی بەو کارو کاسپییە حەڵاڵە خۆت لەفەقیری‌و هەژاری بپارێزیت, چونکە (ما افْتَقَرَ أحَدٌ قَطٌّ إلاّ أصابَهُ ثَلاثُ خِصالٍ) هەرکەسێ تووشی دەردی کوشندەی هەژاری بوو, ئەوە بەڕاستی سێ بەڵای گەورە ڕووی تێدەکات:

یەکەم: (رِقَّةٌ في دينِه), دین‌و ئیمانەکەی لاواز دەبێ, لەبەر ئەوەی ئینسانی هەژار, زۆر جار بەهۆی نەداری‌و گیرفان‌و مەتبەخ بەتاڵیەوە تووشی سوێندخواردنی درۆ, وەعدی درۆ, خۆ زەلیل کردن دەبێت لەبەردەم نامەردان‌و خـــوانەناسان بۆ دەستکەوتنی هەندێ

پارەو ماڵ, کەئەمانەش هەمووی دین‌و عەقیدەی ئیسلامەتی لاواز دەکەن. هەر بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) باسی فەقیری‌و کافربوونی بەیەکەوە کردووەو فەرموویەتی‌و هەموو ئومەتەکەی فێرکردووە کە لەخوا بپاڕێنەوەو بڵێن: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ), خوای پەروەردگارو باڵادەست, پەنات پێدەگرم بمپارێزیت لەکافربوون‌و لەهەژاری.. سُبْحانَ الله, فعلاً صَدَقَ رَسُولُ الله. ئینسان ئەگەر زۆر زۆر ئیمان‌و عەقیدەکەی دامەزراو نەبێ‌و ئیستیقامەی نەبێ لەوانەیە هەژاری تووشی لادان لەئیسلام‌و پاشگەزبوونەوەی بکات, هەروەکو لەهەموو جیهاندا ڕێکخراوە موژدەدەرەکانی ئاینی مەسیحی, لەڕێگای یارمەتیدانی هەژارانەوە, لەگەڵ خۆراکەکەدا ئینجیلێکی پڕ درۆو هەڵبەستراوی پێشکەش دەکەن‌و هەژارە داماوەکەی پێ دەخەڵەتێنن‌و وەکو گوتمان ئەگەر ئیماندارێك, ئیمانەکەی پتەوو هۆشیار نەبێ لەوانەیە بخەڵەتێ‌و بۆ خۆشکردنی گوزەرانی‌و رزگاربوون لەدێوەزمەی ڕەشی هەژاری" خۆی بخاتە تاریکایی گومڕایی‌و لادان‌و لەدینی ڕاستەقینە پاشگەزبێتەوە. خوای گەورە بەلوطفی خۆی پەنامان بدات‌و ڕاگیراومان بکات‌و بمانپارێزێ لەکافربوون‌و لەهەژارکەوتن. بەڵێ فەرمووی ڕۆڵەی خۆشەویستم, بەڵای دووەمی هەژاری ئەوەیە:

دووەم: (وَضَعْفٍ في عَقْلِهِ): بیرو هۆش‌و عەقڵی لاواز دەبێ‌و هەموو بیرکردنەوەو ئامانجێکی ئەوەیە لەو هەژارییە ڕزگاری ببێ, ئیتر هەرچەندە بیرو هۆشیشی بەهێز بێ, توانای بیرکردنەوەی نامێنی‌و لەبواری دامێنان‌و بەرەوپێش چووندا دوادەکەوێ.

سێیەم: بەڵای سێیەمیش فەرمووی: (وَذَهابُ مُروءتِهِ), پیاوەتی‌و مەردایەتی نامێنێ‌و دەیان جار ناچار دەبێ لەبەر ئینسانی نامەردو ناپاك‌و بێدین خۆی زەلیل بكاو ڕیایی‌و ڕووپامایی بکات بۆ ئەوەی نانێکی باشی دەست بکەوێ.

جا کەواتە, ئەوەی کەئینسان لەبەڵاکانی هەژاری دەپارێزێ ئەوەیە دەستی بەکارو کەسابەتێکی حەڵاڵەوە بێ, هەر بۆیە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: (ما مِنْ مَوْضِعٍ يَأْتيني المَوْتُ فيهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَوْطِنٍ أَتَسَوَّقُ فيهِ لأَهلي أَبيعُ وَأَشْتَري), واتە: هیچ جێگایەك نیە کەتێیدا مردن بەخەم بگرێ بەلامەوەخۆشتر بێ لەو شوێنەی کەتێیدا خەریکی کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵم‌و کاسبی حەڵاڵی تێدا دەکەم!!

ئیمانداران: خوای گەورە سُبْحانَهُ وتَعالى لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ ﴾(الأعراف 56), جا چاکەکاریو ئیحسان لەمعامەلەو کرینو فرۆشتندا بەوە دەبێت کەئینسانی موسڵمان, جگەلەوەی کەزوڵم لەخەڵك ناکاو مافی خەڵکی ناخواو دەستیان نابڕێو غەشیان لێناکات, سەرەڕای ئەوەش دەیەوێت بگات بەپلەی چاکـەکارانو موحسنین, یەکێك بێ لەوانەی کەخـوای گـەورە خۆشی دەوێنو لێیان ڕازییە.

جا کاسبکاری بەڕێز: تۆی ئیماندار دەتوانی بەیەکێ لەم ڕێگایانە بگەیتە پلەی چاکەکارانو ئەو کەسانەی کەخوا خۆشی دەوێنو لێیان ڕازییە:

**یەکەم** لەقازانجدا, بەوەی کەزیادەڕەوی نەکات لەقازانج خستنە سەر شتی فرۆشراو. بەڵێ لەبنچینەدا کرینو فرۆشتن بۆ قازانجە, بەڵام زۆر جار کەسی کڕیار لەبەر ئەوەی زۆر پێویستی بەو شتە هەیە, یان زۆر حەزی لێیەتی, ئەو شتەش لای ئەو فرۆشیارە نەبێ دەستناکەوێ, ئا لەم کاتەدا ئەگەر دوکاندار یان فرۆشیارەکە ئەم هەلەی نەقۆستەوەو زیاد لەقازانجی عادەتی نەیخستە سەر شتەکەی, ئەوا دەگات بەپلەی ئیحسانو خوای گەورە لەخۆی ڕازی دەکاتو دەبێت بەخۆشەویستی رَبُّ العالَمینو, خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە سەروەتو سامانەکەیەوە.

دەگێڕنەوە یوونسی کوڕی عەبید (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کەدوکانی هەبوو, کۆمەڵێك خشڵو شتی نایابو گرانبەهای هەبوو, هەندێکیان نرخەکەیان چوارسەد دیرهەم بوو, هەندێکی تریان نرخەکەیان دووسەد دیرهەم بوو. ڕۆژێکیان چوو بۆ نوێژ بۆ مزگەوتو برازاکەی لەسەر دوکانەکە دانا, لەو کاتەدا کابرایەك کەخەڵکی ئەو شارەو ئەو شوێنە نەبوو هاتە دوکانەکەو گوتی: کاکە لەو خشڵو شتە جوانانە ئەوەی کە بەچوارسەد دیرهەمە دانەیەکم دەوێ. کوڕەکەش دانەیەکی لەدووسەد دیرهەمیەکە دا بەکابرای کڕیار, وای زانی ئەمە بەچوارسەد دیرهەم دەفرۆشرێ (لەبەر ئەوەی ئەو هەر جار بەجار دەهاتە دوکانەکەو تەواو شارەزای نرخەکان نەبوو).. بەڵێ, کابرای کڕیار خشڵەکەی هەڵگرتو ڕۆیشتو چوارسەد دیرهەمەکەی دایە. لەڕێگادا کاتێ کڕیارەکە بەڕێگادا دەڕۆیشتو خشڵەکەی لەناو دەستیدا ئەملاولا دەکردو زۆری بەلاوە جوان بوو, لەو کاتەدا یوونسی

کوڕی عەبید لەمزگەوت گەڕایەوەو کەخشڵەکەی بەدەست کابراوە بینی ناسیەوە کەئەمە هی دوکانەکەی ئەوە، بۆیە لەکابرای پرسی: ئەمەت بەچەند دیرهەم کڕی؟ کابرا گوتی: بەچوارسەد دیرهەم، یوونس فەرمووی: براکەم، بەخوا ئەمە لەدووسەد دیرهەم زیاتر ناهێنێ، بڕۆرەوە بۆ لای دوکاندارەکەو دووسەد دیرهەمی لێ وەربگرەوە!

کابرای کڕیار گوتی: مەمنوونی قسەکەتم، بەڵام ئەم خشڵە لەوڵاتی ئێمە بەپێنج سەد دیرهەمیش دەستناکەوێ، من بەچوارسەد دیرهەمەکە بەلامەوە هەرزانەو ناگەڕێمەوە بۆ دوکانەکە. بەڵام یوونسی کوڕی عەبید بەزۆر دەستی گرتو بردیەوە بۆ دوکانەکەو دووسەد دیرهەمی بۆ گێڕایەوەو کڕیارە غەریبەکەش زۆر مەمنوونی ئەم هەڵوێستە ئیماندارانە بوو و ڕۆیشت. پاشان یوونس زۆر لەبرازاکەی تووڕە بوو کەچۆن توانیویەتی بەئەندازەی سەرمایەکە بەڵکو زیاتر، قازانج بخاتە سەر شتەکە، ئەویش گوتی: ئاخر ئەو خۆی پێی ڕازی بوو، منیش وام زانی کەبایی چوارسەد دیرهەمەکەیە. یوونس فەرمووی: ئاخر ئەگەر کڕیاریش ڕازی بێو بەهەرزانیشی بزانێ، نابێ قازانج لەسنووری خۆی زیاتر بخرێتە سەر هیچ شتێك

هەروەها مێژووی زێڕینی ئیسلامی بۆمانی دەگێڕێتەوە کە (محمدی کوڕی مُنکَدِر) هاوشێوەی ئەو بەسەرهاتەی پێشووی هەیە، کاتێ کابرایەکی دەشتەکی خەڵکی بیابان شتی لەشاگردەکەی کڕی، کەمحمدی کوڕی مُنکَدِر پێی زانی کەئەوەی بایی (5) دیرهەمە، ئەم بە (10) دیرهەم لەدوکانەکەی ئەو کڕیویەتی، کابرای گێڕایەوە بۆ دوکانەکەی و (5) دیرهەمەکەی تری دایەوە، کەکابرای بیابان نشین پرسی: ئەرێ ئەم پیاوە حەڵاڵخۆرە بەویژدانە کێیە؟ گوتیان: کاکە ئەوە زانای بەناوبانگو خواناسی ڕاستەقینە (محمدی کوڕی مُنکَدِر)ە، کابرا هاواری کرد: (لا إلهَ إلاّ الله، هذا الّذي نَسْتَسْقي بِهِ في البَوادي إذا قَحَطْنا)، ئەمە ئەو کەسەیە کەکاتێ لەدەشتو بیاباندا باران نابارێ، داوا لەخوا دەکەین کە لەبەر خاتری (محمدی کوڕی مُنکَدِر) بارانمان بۆ ببارێنێو یەکسەر بارانمان بۆ دەبارێ! بەڵێ، ئەم پیاوە زاناو خواپەرستە کە بەدەستی خۆی ژیاوەو معامەلەو کڕینو فرۆشتنی کردووە، بەوەی کەخاوەنی ویژدانێکی زیندوو بووەو هەرگیز قازانجی زۆری نەخستۆتە سەر کەلوپەلەکانی، بووە بەخۆشەویستی خوای پەروەردگار.

ئیمانداران: ئای چەند بەختەوەر بوون, ئەو کاتانەی کەئیمانو ترسی خوا لەدڵەکاندا حاکم بوو, تەنها بەو ئیمانە کەهۆکاری دروستبوونی ویژدانێکی زیندووبووە, بەبێ هیچ چاودێریو ڕەقابەو لێپرسینەوەیەك نزیکی نەك هەر حەرام نەکەوتوون, بەڵکو نزیکی قازانجی زۆریش نەکەوتوون, ئەو سەردەمە پرشنگدارانە بوون کەئینسانە فەقیرحاڵو نینەزانەکان چوونە ناو بازاڕو خۆیان شتیان کڕیوەو هەرگیز لەوو نەترساون دەستیان بڕنو فێڵیان لێبکەن, کەئەمەش تەنهاو تەنها تایبەتمەندی کۆمەڵگای ئیسلامیە.

بەڵام خۆ ئەوە نەبێ هەر تەنها فرۆشیارەکان وا بووبن, بەڵکو کابرای کڕیاریش ویژدانی قبووڵی نەکردووە کەشتێك لەبازاڕدا بەنرخی ڕۆژ نرخی چەند بووبێ لەوە کەمتر بدات بەفرۆشیار. تەماشای ئەولیاو خواناس شێخ سری سەقەطی بکەن, ئەو پیاوەی لەو ڕۆژەوەی کەدوکانی داناو دەستی بەکاسپی کرد, بڕیاری دابوو کەهەرگیز لەنیو دینار قازانج زیاتر نەخاتە سەر هیچ شتێك کەمایەکەی (10) دینار بێ, تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان هەندێ بادامی کڕی, هەمووی بایی (60) دیناربوو, بۆ ڕۆژی دوایی بازرگانەکانی دەوروبەر ڕوویانکردە ئەو شارەو نرخی بادەم زۆر بەرزبۆوە, بەڕادەیەك ئەو بادەمەی شێخ سری سەقەطی (90) دیناری دەکرد لەبازاڕدا! بازرگانێك هاتە دوکانەکەو لێی پرسی: ئەم بادەمە بایی چەندە؟ فەرمووی: بایی (63) دینارە. کاتێك کێشایان, بازرگانەکە گوتی: قوربان بایی (90) دینارە بەنرخی ئەمڕۆی بازاڕ, ئیحتیماڵە زیاتریش نرخی بەرز بێتەوە. شێخ فەرمووی: براکەم من (60) دینارم پێداوە, وەعدیشم لەگەڵ خوای خۆمدا کردووە لەهەر (10) دینارێك سەرمایە نیو دینار قازانج وەربگرم, بەخوا وەعدی خۆم ناشکێنمو لە (63) دینارەکە زیاتر نایفرۆشم!! کابرای بازرگانی کڕیاریش گوتی: بەخوا منیش وەعدم لەگەڵ خوای خۆمدا کردووە کەهەرگیز فێڵ لەکەس نەکەمو دەستی کەس نەبڕم, بەخوا ویژدانم قبووڵی ناکات شتێك بایی (90) دینار بێ, من بە (63) دینار بیکڕم, بەم شێوەیە خواحافیزییان لەیەکتر کردو نە کڕیار لێی کڕیو نە شێخ سری سەقەطیش پێی فرۆشت.

سُبْحانَ الله, ئەمانە چ ئینسانێك بوون, موناقەشە لەگەڵ یەکتری دەکەنو سوێند بۆ یەکتری دەخۆن بۆ ئەوەی ئەمیان بەکەم نەیفرۆشێو ئەویشیان بۆ ئەوەی مافی خۆی بداتێو لەبازاڕ کەمتری لێ نەکڕێ!!

سوێند بەخوا, غەیری ئیسلام, هیچ دینێکی تر, هیچ نیظامو پرۆگرامو حکومەتو سوڵتەیەکی تر لەمێژووی مرۆڤایەتیدا نە توانیویەتی نە دەشتوانێ, ئینسانی ئاوا پێبگەیەنێو تێبگەیەنێو پەروەردە بکات کەدروشمی هەموو تاکەکانی ئەوەبوو: (لا نَرْضى لِأَخَر إِلاَّ ما نَرْضاهُ لِأَنْفُسِنا), جا بەخوا تا ئەو ئیسلامە حوکمی پێ نەکرێو ئەو ئیمانە لەدڵەکاندا دروست نەبێتەوە, بەهیچ حوکمو یاسایەکی تری سەر زەوی بازاڕەکانمان پاك نابنەوەو غەشو دەست برین کۆتایی نایەت.

جا کاسبکاری بازاڕ: ئەوەت لەلا یەقین بێت کەهەر دوکاندارێك یان مامەڵەچییەك قەناعەت بەقازانجی کەم بکات, ئەوا زیاتر شتی بۆ دەفرۆشرێو قازانجی کەمیش ئەگەر بەردەوام بێ, سەرەنجام زۆر دەبێو بەرەکەتی تێدا دەردەکەوێ, ڕەزای خوا لەئیمامی عەلی بێ کەفەرموویەتی: (مَعاشِرَ التُّجارِ, لا تَرُدُّوا قَليلَ الرِّبحِ فَتُحْرِموا كَثيرَهُ), ئەی کۆمەڵی بازرگانان, قازانجی کەم ڕەت مەکەنەوە چونکە هەرکەسێ بەقازانجی کەم قەناعەت نەکات, قازانجی زۆریشی لەدەست دەچێ!

پرسیار کرا لەعبدالرحمن ی کوڕی عەوف (ڕزای خوای لێبێت): هۆی دەوڵەمەندبوونت چی بوو؟ فەرمووی: بەهۆی سێ شتەوە خوای گەورە بەرەکەتی خۆی بەسەرمدا ڕشتو دەوڵەمەندی کردم:

1 هەرگیز قازانجم ڕەت نەکردۆتەوە, هەر شتێك هاتبێتە سەر فرۆشتن, ئەگەر کەمیش قازانجی کردبێ هەر فرۆشتوومەو چاوەڕێم نەکردووە هەڵیبگرم بۆ گرانتر.

2 ـ هەرگیز زیندەماڵ (مەڕو بزنو حوشتر)م زۆر نەهێشتۆتەوەو زوو فرۆشتوومەتەوە

3 ـ شتیشم بەقەرز نەفرۆشتووە بەکەسێك کەزانیبێتم موحتاجو هەژار نیەو هەر لەبەر تەماحی زۆر شتم لێدەکڕێو پارەشی نیەو بەتەمایە ئەگەر قازانجی زۆری کرد ئەوجا پارەکەی من بدات. خۆم لەوجۆرە کەسانە پاراستووە.

**دووەم :** بەڵێ ئیمانداران, خاڵی دووەم, لەو شتانەی کەئینسانی معامەلەچیو کڕیارو فرۆشیار پێی دەبێت بەخۆشەویستی رَبُّ العالَمین, ئەوەیە: ئینسان لەکاتی ئەوەدا کەشت لەخەڵك دەکڕێ, یان شت بەخەڵك دەفرۆشێ, ڕووی خۆش بێ, چەند دیمەنێکی جوانە, کاتێ دوکاندارو فرۆشیار بەدەم کڕیارو موشتەریەوە نەرمونیانو

قسه خۆش‌و دەم بەزەردەخەنە بێت. هەروەها کاتێکیش کەکڕیار بەڕووی گەش‌و زەردەخەنەوە پارەکە دەدات بەفرۆشیار. بۆیە خوای گەورە ئەم کردارەی زۆر پێ خۆشەو لەهەردوو لا ڕازی دەبێت‌و بەرەکەت دەخاتە ئەو کڕین‌و فرۆشتنەوە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (رَحِمَ اللهُ عَبْداً سَمْحاً إذا باعَ, سَمْحاً إذا اشْتَرى, سَمْحاً إذا اقْتَضى) (رَواهُ البُخاري).

بەداخەوە زۆر دوکانداروفرۆشیار هەیە, کە لەوانەیە ئەهلی مزگەوت‌و نوێژیش بێ کاتێ شتێکی لێدەکڕی, زۆر معامەلە ڕەق‌و ڕوو کرژو دەم‌وچاو تاڵە, وەکو ئەوەی شتەکەت بەخۆڕایی بداتێ. کەسی واش هەیە, کاتێ شتێك لەکەسێك دەکڕێ زۆر بەڕوویەکی تاڵ‌و قسەی ڕەقەوە پارەکە دەداتە فرۆشیارو وا دەزانی ئەو کەسە بەم چەند دینارەی ئەو دەوڵەمەند دەبێت!

جا با ئاگامان لەخۆمان بێ, هەرکاتێ فرۆشیار بووین یان کڕیار, با ڕوومان خۆش بێ‌و قسەمان نەرم بێ‌و بەزەردەخەنەوە قسە لەگەڵ بەرامبەرکەمان بکەین‌و, شتمان بەهەر کەسێ فرۆشت بڵێین: یاخوا خێری لێ ببینی‌و خێرت بۆ بداتەوەو چاومان لەدوای شتەکە نەبێت, بۆ ئەوەی ڕەحمەت‌و میهرەبانی خوا بمانگرێتەوە إنشاءَ الله.

خۆشەویستان: ئیمانداری‌و خواناسی ئەوەیە لەڕەفتارو کردارو هەڵوێستدا دەربکەوێ, نەك هەر بەقسەی بێ کردەوە ئینسان خۆی بەباش‌و لەخواترس دەربخات, وەکو گوتراوە: (إذا أثْنى عَلى الرَّجُلِ جيرانُهُ في الحَضَرِ وَأصْحابُهُ في السَّفَرِ, وَمُعامِلُوهُ في الأسْواقِ, فَلا تَشكو في صَلاحِهِ), واتە: هەرکەسێك دراوسێکانی, کەماڵیان بەماڵیەوەیەتی لێی ڕازی بوون‌و مەدحیان کرد, وەئەوانەی سەفەریان لەگەڵداکردووە باسی مەردی‌و جوامێرییان کرد, کەچەند هاوڕێیەتی خۆشە, وەئەوانەی کە لەبازاڕدا معامەلەو کڕین‌و فرۆشتنی لەگەڵدا دەکەن گوتیان: بەڕاستی دەستپاك‌و معامەلە دروست‌و ڕووخۆش‌و ئەمینە, ئەوە سیقەی پێبکەو بیکە بەدۆست‌و گومانت نەبێ کەئینسانی چاکە..

هەروەها گوتراوە: (التِّجارَةُ مَحَكُ الرِّجالِ, وَبِها يَمْتَحِنُ دينُ الرَّجُلِ وَوَرْعِهِ), واتە: بازرگانی‌و کڕین‌و فرۆشتن سەنگی مەحەك‌و تەرازووی هەڵسەنگاندنی پیاوانە, هەر

بەهۆی بازاڕو کڕینو فرۆشتنەوە دینو عەقیدەو واریعیو خۆپاراستنی ئینسان لەحەرامو حەڵاڵخۆری تاقی دەکرێتەوە..

بەڵێ زۆر ڕاستە، مەردایەتیو خۆراگریو لێبوردەییو دەروون دەوڵەمەندیو واریعی لەو کاتانەدا دەردەکەوێ کەئینسانەکە لەگرمەو گاڵەی بازاڕدایەو پارەو دینارو دۆلار بەدەمیەوە پێدەکەنێو هەلی دەستبڕینی هەژارو فەقیرحاڵو کەسانی ساویلکەی بۆ هەڵدەکەوێ، بەڵام لەترسی خواو محاسەبەی قیامەت، بڕدانی نامرێنێو نزیکی حەرام نابێتەوەو دڵی کەسانی دەوروبەری ئازار نادات..

موسڵمانانی بەڕێز: گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بەنرخە بگرن:

جارێکیان کێشەی دوو کەس هاتە لای ئیمامی عومەری کوڕی خەطّاب (ڕەزای خوای لێبێت)، یەکێ لەدوو کەسەکە، بەپێی شەرع داوای شاهیدی لێکرا. کابرا چوو شاهیدێکی پەیدا کردو هێنای بۆ خزمەت ئیمامی عومەر، ئیمامی عومەر بەشاهیدەکەی گوت: من تۆ ناناسم تا سیقەت پێبکەمو بزانم تۆ بۆ شاهیدی دەشێی یان نا، برۆ کەسێك بێنە تۆ باش بناسێو شاهیدی ڕاستگۆییو پیاوباشی تۆ بدات!! بەڵێ شاهیدەکە ڕۆیشتو ناسیاوێکی خۆی هێناو ئیمامی عومەر فەرمووی: کاکە ئەم کابرایە کەدەیەوێ شاهیدی لەم مەسەلەیەدا بداو دۆستی تۆیەو تۆ دەیناسی، چۆن پیاوێکە؟ ئەویش لەوولاّمدا گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، لێی دڵنیابەو بەخوا هەتا بڵێی خواناسو پیاوی باشە. ئیتقامی عومەر فەرمووی: (أَنْتَ جارُهُ الأدْنى الّذي يَعْرِفُ مَدْخَلَهُ وَمَخْرَجَهُ؟) ئایا تۆ دراوسێی ئەم شاهیدەی کەئەوەندە ماڵەکەت لەماڵەکەی نزیك بێ ئاگات لەچوونە دەرەوەو هاتنە ماڵەوەی بێ؟ (قالَ لا)، کابرا گوتی: نەخێر قوربان، هەرگیز دراوسێ نەبووین! ئیمامی عومەر فەرمووی: (كُنْتَ رَفيقَهُ في السَّفَرِ الّذي يَسْتَدِلُّ بِهِ عَلى مَكارِمِ الأخْلاقِ؟) فەرمووی: ئایا تۆ وا بووە سەفەرت لەگەڵ ئەم پیاوە کردبێو چەند شەوو ڕۆژ لەسەفەردا پەیەکەوە بووبن، وەئاثاری پیاوەتیو مەردایەتیت لەو سەفەرەدا لێ بینیوە؟ کابرا گوتی: نەخێر هەرگیز نەبووینە ڕەفیقی سەفەر، ئیمامی عومەر فەرمووی: (فَعامَلْتَهُ بالدِّينارِ والدِّرْهَمِ الّذي يَسْتَضبِينُ بِهِش وَرَعِ الرَّجُلِ؟) فەرمووی: ئایا قەت معامەلەو کڕینو فرۆشتنت لەگەڵ کردووەو پارەو تەماع کەوتبێتە نێوانتانەوە کە بەڕاستی لەمعامەلەو کڕینو فرۆشتندا

وەرعو چاکیو پاکی ئینسان دەردەکەوێ، ئایا تۆ هیچ کاتێ معامەلەت لەگەڵ کردووە؟ کابرا گوتی: نەخێر، هیچ کاتێ شتمان بەیەکتر نەفرۆشتووەو شتمان لەیەکتری نەکڕیوە! ئیمامی عومەر فەرمووی: (أَظُنُّكَ رَأَيْتَهُ قائماً في المَسْجِدِ يُهَمْهِمُ بِالقُرآنِ يَخْفضُ رَأْسَهُ طَوراً وَيَرْفَعَهُ أُخْرى؟) فەرمووی: من وا دەزانم تۆ بۆیە ئەم پیاوەت بەلاوە باشو خواناسە، چونکە بینیوتە لەمزگەوتدا خەریکی قورئان خوێندنەو جارێك سەر نەوی دەکاو دەگریو جارێك سەر بەرزدەکاتەوە؟ بەوەدا وا دەزانی کەپیاوی چاکە؟ کابرا گوتی: بەڵێ قوربان هەر وایە. ئیمامی عومەر فەرمووی: (إِذْهَبْ فَلَسْتَ تَعْرِفَهُ)، بڕۆ کاکە تۆ دیارە ئەم کابرایە ناناسی، مادام ناسیاویەکەت هەر ئەوە بێ کە بەدوو ڕکات نوێژی مزگەوت بەپیاوی باشی بناسی مەعلووم نەتناسیوە، وەبە کابرای شاهیدی فەرموو: هەستە تۆش بڕۆ بەدوای کەسێکدا بگەڕێو بیهێنە بۆ لام کەشاهیدی چاکیو ئەمینیو ڕاستگۆیی تۆ بدات، کە بەڕاستی تۆ بناسێ، ئەویش یان بەوەی دراوسێت بێ، یان ڕەفیقی سەفەرت بووبێ، یان شەریکی معامەلەت بووبێ..

هەزارەها ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەسەر ڕۆحی پیرۆزت ئەی فاروقی ئیسلام، بەڕاستی شیاوی ئەوەی کەنازناوی (فاروق) هەڵبگری، چونکە زۆر بەوردی جیاوازیت خستە نێوان موسڵمانی ڕاستەقینەی بەکردەوە، لەگەڵ موسڵمانی قسە زۆری بێ کردەوە. خوای گەورە هەموو لایەکمان بگێڕێ لەو کەسانەی کە بەکرداروو بەگوفتار، بەهەڵوێستو بەهەنگاو ئیمانداریەکەیان دەسەلمێنن..

**سێیەم:** ئیمانداران: خاڵی سێیەم کەئینسان دەکات بەخۆشەویستی خواو ئینسانی موسڵمان دەگەیەنێت بەلێخۆشبوونو لێبوردەیی خوا، بریتییە لە (إِقالَةُ النَّادِم)، ئەویش ئەوەیە: کەسێك شتێکت پێ دەفرۆشێ، پارەکەشی وەرگرتووە، بەڵام دوایی پەشیمانەو زۆر حەز دەکا شتەکەی نەفرۆشێ. جا تۆش هەرچەندە بەشەرع بۆتەماڵت، بەڵام لەبەر خاتری خوا کەخوا پێی خۆشە دڵی ئەو پەشیمانە خۆش بکەی، ماڵەکەی دەدەیەوەو پارەکەی خۆت وەردەگریەوەو واز لەهەندێ قازانج دێنی، لەو بارەیەوە پێغەمبەری پێشەوامان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ أَقالَ مُسْلِماً بَيْعَتَهُ، أَقالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ يَومَ القِيامَةِ)(رواهُ أبو داودَ وَابْنُ ماجَةَ وَابْنُ حَبَّانَ في صَحيحِه).

بەڵام ئیمانداران: لەگەڵ ئەو سێ حاڵەی کەباسمان کرد, کەدەبنە هۆی ئەوەی کەئەو ئینسانە کاسبکارە ببێتە خۆشەویستی خواو خەڵکی خوا, لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئاگاشمان لەوەش بێ‌و بزانین کەکۆمەڵێك ڕەوشتی تر هەن کەهەر کەسێك لەکاتی کڕین‌و فرۆشتن‌و معامەلەدا, تێیدا بێنەجێ, ئەوا کارو کەسابەتەکەی حەرام دەکەن‌و بەرەکەت لەڕزق‌و ڕۆزیدا نامێنێ‌و بەر لەعنەتی خواو پێغەمبەری خواو موسڵمانان دەکەوێت.

یەکێ لەو کارە ناشەرعیانە, پێی دەگوترێ (الإحْتكار), واتە: هەڵگرتنی شت بۆ کاتی گرانی. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَن احْتَكَرَ طَعاماً فَهُوَ خاطيءٌ)(رَواهُ مُسْلِم), واتە: هەرکەسێ خواردەمەنی بکڕی بۆ کاتی گرانی تا بەگران بیفرۆشێتەوە ئەو کەسە تاوانبارە..

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (الجالِبُ مَرْزوقٌ, والمُحْتَكِرُ مَلعونٌ)(رَواهُ إبنُ ماجَة), واتە: ئەو کەسەی حەزی لەهەرزان فرۆشی بێ‌و حەزنەکات گرانی ڕوبکاتە بازاڕ با خۆیشی سوودمەند ببێ, ئەوە خوای گەورە ڕزقی زۆری بۆ دەنێرێ‌و بەرەکەت دەخاتە کاروکەسابەتیەوە, وەهەر کەسێکیش شت بکڕێ‌و بەو مەبەستە هەڵیبگرێ کە لەکاتی گرانیدا بەخەڵکی بفرۆشێتەوەو حەز بەگرانی بکات بۆ سوودی خۆی, ئەوا ئەو کەسە مەلعونەو دوورە لەڕەحمەتی خواوە.

ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە (إحياء عُلومُ الدِّين)دا دەفەرموێ: یەکێ لەپیاوانی سەلەفی صالح, لەشاری (واسِط) نیشتەجێ بوو, ئیشوکاری معامەلەو کڕین‌و فرۆشتن بوو, جارێکیان باری چەند ووڵاخ گەنمی نارد بۆ شاری (بەصرە)و نامەی بۆ وەکیلەکەی نووسی‌و فەرمووی: هەرکاتێ ئەو بارە گەنمەت گەیشتە دەست, دەست بەجێ بیفرۆشەو مەیهێڵەوە بۆ بەیانی. بەڵام کاتێ گەنمەکە گەیشتە شاری بەصرە, بازرگانەکان بەوەکیلەکەیان گوت: ئەمڕۆ مەیفرۆشە, چونکە گەنم لەبازاڕدا زۆرە, بەڵام دوای حەفتەیەکی‌تر گەنم نامێنێ‌و نرخی گران دەبێ‌و دووقاتی خۆی خێر دەکات. کابرای وەکیلیش بەقسەی کردن‌و دوای حەفتەکە بەدووقاتی خۆی قازانج فرۆشتی‌و پاشان نامەی بۆ پیاوە باشەکە نووسی‌و ئەوەی پێ ڕاگەیاند کەدوای حەفتەیەك گەنمەکەی بەسیعرێکی باش فرۆشتووەو دووقاتی خۆی قازانجی کردووە, ئەمەی وەکو هەواڵێکی دڵخۆشکەر بۆ

نووسی, بەڵام پیاوە باشەکە, کەنامەکەی خوێندەوە زۆر دڵتەنگ بوو! هەر خێرا نامەیەکی نووسی بۆ وەکیلەکەی‌و فەرمووی: فلان کەس ئاگاداربەو بزانە, ئێمە قەناعەتمان بەقازانجی کەم کردووە بەمەرجێ دینەکەمان سەلامەت بێ‌و ئیمانەکەمان نەدۆڕێنین, بەڵام تۆ بەپێچەوانەی قسەو داواکاری منەوە جووڵایتەوە, وەبزانە من نامەوێ چەندەها ئەوەندەی‌تر قازانج بکەم بەڵام شتێکی کەم لەئیمانەکەم زەرەر بکەم! بەڕاستی تۆ کارێکی ناڕەوات لەگەڵ کردم, جا هەرکاتێ ئەم نامەیەت بەدەست گەیشت, ئەوا ئەو پارەی گەنمە بەقازانج‌و سەرمایەوە هەمووی ببەخشە بەفەقیرو هەژارو هەتیوانی شاری بەصرەدا بەئومێدی ئەوەی لەتاوانی (إحتِكار) ڕزگارمان ببێ!

بەڵام جێگای داخە, لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا, زۆر جار تەنها بەپڕوپاگەندەیەك گرانی دەکەوێتە بازاڕی موسڵمانانەوەو لەماوەیەکی زۆر کەمدا هەموو کەلوپەل‌و پێویستیەکان دەشاردرێنەوەو زۆر کەس حەز دەکات بەرەو گرانتر بڕوات بۆ ئەوەی خۆی سوودمەند بێت‌و ئیتر موسڵمانان تووشی زەرەرو ناڕەحەتی دەبن, ئەوە ئیشی ئەو نیە, بەڕاستی ئەمجۆرە بیرکردنەوانە پێچەوانەی بیروباوەڕی ئابووری ئیسلامیەو دەبێ موسڵمانی هۆشیار, قیامەتی خۆی بەقوربانی دونیا نەکات.

**چوارەم:** خۆشەویستان: خاڵێکی تر کەپێویستە ئەهلی بازاڕو کەسابەت ئاگایان لێی بێ‌و خۆیانی لێ بپارێزن ئەوەیە: زیاد لەپێویست مەدحی شتەکەیان نەکەن, بەتایبەت ناوی خوا زۆر بەکارنەهێنن بۆ ڕەواج دان بەکەلوپەلەکانیان, وەکو ئەوەی بڵێ: بەخوا وا چاکەو وایەو وایە. چونکە ئەگەر پیاهەڵدانی شتەکەی درۆبێ, ئەوە ناوی خوای گەورەی سُبْحانَهُ وَتَعالى بەدرۆ بەکارهێناوەو تاوانێکی زۆر گەورەیە. خۆ ئەگەر قسەو پیاهەڵدانەکەی ڕاست بێ, ئەوە دونیاو ماڵی دونیا ئەوە ناهێنێ کەبەناوی پیرۆزی خواو سوێندخواردنەوە بەدەست بهێنرێ.

یەکێ لەپیاوە زاناو خواناسەکان کەناوی (یوونسی کوڕی عەبیدە) ڕۆژێکیان لەگەڵ کوڕەکەیدا هەندێ قوماش‌و جلوبەرگ لەسەر شەقامێك بڵاودەکاتەوە بەمەبەستی فرۆشتنیان, لەو کاتەدا کەخەڵکی دەوری دەدەن‌و تەماشای قوماش‌و بەرگەکان دەکەن, کوڕەکەی لەبەرخۆیەوە بەدەنگی بەرز دەڵێ: (اللَّهُمَّ ارزُقْنا الجَنَّةَ) خوایە بەهەشتمان

بەنسیب بکەی. دەستبەجێ یوونس بەکوڕەکەی دەڵێ: هەر ئێستا کەلوپەلەکان بپێچەوەو دەبێ لێرە بڕۆین‌و لەشوێنێکی تر بیانفرۆشین! کوڕەکەی بەسەرسوووڕمانەوە دەپرسێ: بۆچی باوکە گیان چی ڕوویداوە؟ دەفەرموێ: ڕۆڵە گیان, کاتێ گوێم لێبوو کەگوتت (خوایە گیان بەهەشتمان بەنسیب بکەی), هەرچەندە ئەمە دوعاو ئاواتی هەموو ئیمانداریکە, بەڵام لەم کاتەدا کەئێمە خەریکی کڕین‌و فرۆشتنین ئەوە هاتە دڵمەوە کە بەهۆی ئەم دوعا جوانەوە, موشتەریەکان بەپیاوی چاکمان بزانن‌و بەهۆیەوە شتمان لێبکڕن, کەواتە: دوعاو پاڕانەوەکەت لەخوا بوو بەهۆی ڕەواج دان بەقوماشەکەمان, وەبەلامەوە شتێکی ناپەسەندە کە بەهۆی دینەوە دونیا بخۆین!

**پێنجەم** : ئیمانداران: یەکێکی تر لەو شتانەی کەمعامەلەو کڕین‌و فرۆشتن حەرام دەکات بریتییە لە (النَّجش), واتە: کەسێك لەبازاڕدا شتێك دەفرۆشێ, کڕیارێك خەریکی کڕینیەتی‌و دەیەوێ لەفرۆشیار نزیك بێتەوە, لەو کاتەدا کەسێکی تر کە لەژێرەوە شەریکی فرۆشیارەکەیە, دەڵێ: ئەوە بەچەند دەیفرۆشی؟ ئەویش دەڵێ بەئەوەندە, دەڵێ: بەخوا هەرزانەو وەکو ئەوەی تۆش باش نەبوو, بەوەندە گرانتر فرۆشتیان, بەڵام لەڕاستیدا وا نیەو ئەمە تەنها وەکو چاوبەستەکی لەکڕیارەکەیەو کەلوپەلەکەی لەبەرچاو شیرین‌و بەنرخ دەکەن! وەکو زۆربەی مەزادخانەکانی ئەمڕۆ!

**شەشەم**: وەهەروەها یەکێکی تر لەو شتانەی کەئاینی ئیسلام نەهی لێکردووەو کارو کاسپیەکەت حەرام دەکات ئەوەیە: شتێك بکڕی کەبزانی ئەم شتە ماڵی تاڵانی‌و فەرهوودە, یان لەماڵێك‌و کەسێك دزراوە, یان بەزۆر لێی سەندراوە. چونکە یەکێك لەو ئالیەتانەی کەئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی تاوانکاران بەکاری دێنێ, تا تاوانەکە لەبچووکترین بازنەدا بهێڵێتەوەو مەیدانی بۆ فراوان نەکرێ ئەوەیە: کەڕێگا نادات بەموسڵمان شتێك بکڕێ, لەکاتێکدا دەزانێ ئەم شتە فەرهوودو تاڵانییە, یان بەناحەق لەخاوەنەکەی سەندراوە. چونکە ئەگەر کابرای تاڵانچی‌و دز لەبازاڕدا شتەکەی بۆ فرۆشراو بەئازادی پارەکەی وەرگرت, ئەوا سوورتر دەبێ لەسەر دزی‌و تاڵانکردن‌و بۆی دەبێ بەپیشە. بەڵام کەزانی کەس لێی ناکڕێ‌و بازاڕی نیە هەست دەکا کەکارەکەی ناڕەوایەو شەرم دەیگرێ‌و دەزانێ پارەیەکی بەئاسانی دەست ناکەوێ, لەوانەیە ئاخری واز بێنێ.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (مَنْ اشتَرى سَرِقَةً - أي مَسْروقاً - وهو يَعْلَمُ أَنَّها سرقَةٌ فَقَدْ إِشْتَرَكَ في إِثْمِها وَعارِها)(رَواهُ البَيْهَقي), واتە: کەسێك شتێکی دزراو بکڕێت‌و بشزانێت کەدزراوە, ئەوا هاوبەشی ئەو کەسەی کردووە لەتاوانەکەداو لەحەیاچوون‌و عەیب‌وعارەکەشدا.. واتە هەردووکیان وەکو یەك گوناهبارو تاوانبارن.. جا هەرچەندە ماوەیەکی زۆری چەند ساڵیش بەسەر ئەو ماڵە دزراوەدا تێپەڕی بێ, بۆ نموونە کەسێك پێش دە ساڵ لەمەوبەر شتێکی دزیبێت یان تاڵانی‌و فەرهوود کردبێ, ئێستاش هەرکەسێ دەزانێ ئەو شتە حەڵاڵ نیە, لێی بکڕێ, هەر تاوانبارەو شەریکی ئەو تاوانەیە, چونکە لەئاینی ئیسلامدا ماوەی زۆر" حەرام حەڵاڵ ناکات‌و هەر مافی خاوەنەکەیەتی. بەڵام لەزۆربەی یاسا دەستکردەکاندا دەڵێ: ئەگەر شتێك ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕی لای کەسێك, ئەوا دەبێت بەموڵکی ئەو کەسە, بەمەرجێ لەو ماوەیەدا کەس داواکاری لەسەر ئەو شتە نەبووبێ. بەڵام لەئیسلامدا ئەگەر شتێك بدزرێ‌و چەند ساڵی زۆر لای کەسێك بمێنێتەوەو کابرای خاوەن شت هیچ داواکاریشی لەدادگادا تۆمار نەکات, ئەوە ئەو شتە هەر حەرامەو هەرگیز حەڵاڵ نابێ‌و بۆ کەس حەڵاڵ نییە بیکڕێ.

زۆر بەداخەوە میللەتی کوردی موسڵمانی دەستپاك‌و حەڵاڵخۆری ئێمە زۆر کەسی وای تێدا دروستبوو کەئیش‌و چالاکییان بوو بەتاڵانچیەتی لەماڵان‌و فەرمانگەو دامودەزگاکانی حکومەتی گۆڕبەگۆڕو دەست بەسەرداگرتنی ئۆتۆمبێل‌و کەلوپەلەکانی تریان‌و ئاودیوکردن‌و فرۆشتنیان لەناوخۆداو سەرەڕای بەعەیبە نەزانینی ئەو کردەوە حەرام‌و دوور لەئینسانی‌و ئیسلامیەیان بەشانازییەوە دەیان ناوی بێماناو گاڵتەجاڕی لەکەلوپەلە تاڵانی‌و فەرهوودەکانیان دەنێن وەکو (علوج)و (تەیحان).. خوا پەنامان بدات..

لەکۆتایی ئەم ووتارەشدا دەڵێم: بەڕاستی جوانی ژیان‌و ڕێکوپێکی کاروبارەکان‌و, پاکی تەرازوو و بازاڕەکان, پەیوەستە بەبوونی ویژدانێکی زیندووەوە.. ویژدانیش کاتێ لەئینساندا دروست دەبێ کەئەو ئینسانە بەردەوام ئەوەی لەیاد بێ کەخوایەك ئاگای لێیەتی‌و چاودێرە بەسەریەوە کەئاگای لەهەموو نهێنیەکانە, وەئەو خوایە پاداشت‌و سزای ئینسان دەدات لەسەر کارو کردەوەکانی. ئینسانی ویژدان زیندوو موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات پێش ئەوەی بگاتە قیامەت‌و لەوێ موحاسەبە بکرێ (حاسِبوا أنفُسَكُمْ قَبلَ

أنْ تُحاسَبوا).. جا هەرکاتێ ئەم هەستەو ئەم ویژدانە لەدەروونی تاکەکانی کۆمەڵدا دروست بوو, ئەو کاتە کۆمەڵگا ڕێکوپێك دەبێو بەبێ ئەوەی حکومەتو چاودێری یاسای بەسەرەوە بێ, ئەوە خۆی لەخۆی دەپرسێتەوە, وەئەمەش تەنها بە لەخواترسانو ئیمان بەقیامەت فەراهەم دێت کەئینسان وا لێدەکات بڵێت: خۆ ئەگەر یاسا چاوی لێم نیەو کەس ئاگادار نیە بەسەرمەوە, اللّٰه جَلَّ جَلالُهُ چاوی لێمەو هیچیش لەخوا بزر نابێ! ئەمەش هەر قسە نیەو ئیسلام بەکردەوە ئەو ئینسانە پاکانەی دروست کردوون, هەروەکو مێژووی پڕ شکۆو زێڕینی ئیسلام دەیان بەسەرهاتی واقیعی لەسەر ئەم حەقیقەتە بۆ تۆمار کردووینو بەسەرهاتێکیان وەکو نموونە دەگرین:

لەسەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابدا (ڕەزای خوای لێبێت), موسڵمانان لەهێمنیو ئاسایشدا دەژیان, شەریعەتی خوا حاکمی سەر زەوی بوو, کۆمەڵێکی دەستو دەم پاك پێگەیشتبوو, بەڵام هێشتا خەلیفەی خواناس نە بەڕۆژو نە بەشەو ووچانی نەدەگرت, بەڕۆژ خەریکی بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکو بەشەویش یان ئەوەتا پاسەوانی شاری دەکرد, یا خەریکی شەونوێژو خواپەرستی بوو, بەڕۆژ کاروباری دنیای موسڵمانانی هەڵدەسووڕاند, بەشەویش بۆ خەجاڵەتی بازاڕی قیامەتی خۆی فرمێسکی هەڵدەڕشت.. ئای کەبەختەوەر بوون ئەندامانی ئەو کۆمەڵە ناوازەیە کەعومەری دادپەروەر شوانو لێپرسراویان بوو..

شەوێکیان خەلیفە بۆ پاسەوانی موسڵمانان لەگەڵ خزمەتگوزارەکەیدا لەماڵ دەرچوون تا ئاگاداری نەخۆشو برسیو لێقەوماوو ڕێبواری شار بن, ماوەیەکی زۆر سووڕانەوە هەتا سەرماو ماندوویتی زۆریان بۆ هێناو لەگەڵ (ئەسلەم)دا پەنایان بردە پاڵ دیواری خانوویەکی خنجیلانەو پاڵیان پێوەدا تا کەمێك بحەسێنەوە.

لەو کاتەدا دەنگی ووتووێژی دوو ئافرەتیان بەرگوێ کەوت, ئەوەبوو دایکەکە لەکچەکەی دەویست ئاو تێکەڵی ئەو شیرە کەمە بکات کە لەمەڕەکەیانەوە دەستیان کەوتبوو, تا زۆر ببێتو پارەی زیاتریان دەست بکەوێت.

کەخەلیفە لەمە گەیشت بایەخی بەوتووێژەکەیان داو گوێی بۆ گرتن, دایکەکە گوتی: کچم هەستە بەلای ئەو شیرەوەو ئاوی تێکەڵ بکە, کچەکە گوتی: دایە گیان, ئەی

ئاگاداری بڕیارەکەی ئەمڕۆی ئەمیری ئیمانداران نیت؟ دایکی پرسی: بڕیاری چی داوە کچەکەم؟ گوتی: فەرمانی بەسەر جارچییەکەیدا داوە جار بدات کەهیچ کەس ئاو تێکەڵی شیر نەکات!

دایکەکە گوتی: کچەکەم، هەستە بەلای شیرەکەوەو ئاوی تێکەڵ بکە، خۆ نە عومەرو نە جارچی عومەر هیچ کام چاویان لێت نیە! کچۆڵەکە بەدایکی گوت: دایە گیان، بەخوا شتی وا ناکەم لەبەرچاوی خەڵکدا گوێ ڕایەڵی بم و لەچۆڵیدا لێی یاخی ببم!

خەلیفە چاك گوێی لێبوو، کچێکی ئاوەها کەم تەمەن بەو شێوەیە لەخوا بترسێ‌و بەویستی خۆی لەبەر ڕەزامەندی خوا فەرمانی کاربەدەست ئەنجام بدات. بۆیە بەئەسلەمی فەرموو: ئەسلەم ئەو دەرگایە دیاری بکەو شوێنەکەش بناسەرەوە.

بەم شێوەیە ڕۆیشتن‌و چوون بەلای کاری خۆیانەوە، کەڕۆژیان لێ بۆوە فەرمانی بەسەر ئەسلەمدا دا تا بچێت بۆ ئەو شوێنەو بزانێ ئەو دوو ئافرەتە چ کارەن‌و ئایا مێردیان هەیە یان نا. ئەویش کەدەچێت سەیردەکات دایك‌و فەرزەندەن‌و هیچ کامیان مێردیان نیە، بۆیە خەلیفە بڕیاریدا ئەم کچە لەخـــواترسە حـــەڵاڵخۆرە بۆ عاصمی کوڕی بخوازێت.

ئەوەبوو ناردیانە خوازبێنی‌و بۆیان گواستەوە، پاش ساڵێك خوای گەورە کچێکی پێ بەخشی‌و ناویان نا (لەیلا)و بەشێوەیەکی ئیمانی پێگەیشت‌و (عبدالعزیز کوڕی مەروان) مارەی کردو خەلیفەی خواناس‌و دونیا نەویست" عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی لێبوو! کەعومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو بەخەلیفەی ئیسلام، ئەوەندە عادل‌و دادپەروەر بوو ناونرا خەلیفەی پێنجەمی ڕاشدین.

بەڵێ ئیمانداران: لەهەموو سەردەم‌و شوێنێکدا کۆمەڵگا پێویستی بەم مرۆڤانە هەیە، کەهیچ کەسیش چاوی لێی نیە، بەڵام یەقینی هەیە کەخوای گەورە ئاگای لەئاشکراو نهێنییەتی‌و لەترسی ئەوە خیانەت‌و غەش لەخۆی‌و لەخێزان‌و کۆمەڵگاو حکومەتی ناکات.یارەبی خوایە ئیمانێکی وامان پێ ببەخشی کەپارێزگاریمان بکات لەنزیك کەوتنەوە لەهەموو حەرامێك‌و بێفەرمانییەکی تۆ..خوای پەروەردگار خاك‌و وڵاتمان پربکەی لەڕزق‌وڕۆزی حەڵاڵ‌و لەگرانی‌و نەگبەتی بمانپارێزی..

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ الترغيب والترهيب ـ عبدالعظيم بن عبدالقوي المُنذري .

3 ـ إحياء عُلوم الدِّين ـ أبي حامد محمد بن محمد الغزالي .

4 ـ الحلال والحرام في الإسلام ـ د. يوسف القرضاوي .

5 ـ التاج الجامع للأصول ـ منصور علي ناصف, وەرگێرانی: نوری فارس حمەخان

6 ـ رياض الصالحين ـ النووي, وەرگێرانی: نوری فارس حمەخان .

7 ـ ژیانی عومەری کوری عبدالعزیز, نووسینی حبیب محمد سعید .

# ووتـاری ژماره سی‌ویه‌ك

# دادگه‌ری له‌كڕین‌و فرۆشتندا

## به‌شی چواره‌م

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ, رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّه وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاء الزَّكَاة يَخَافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ ﴾

(النور 36 ـ 37)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم

( الحَلفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ, مَمْحَقَةٌ لِلْكَسْبِ )

( رَواهُ البُخاري وَمُسلِم )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آلِهِ وصَحبِهِ أجمعين إلى يَومِ الدِّين ..**

ئيماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلامو ڕەحمەتی خواتان پێشکەش بێ. لەسێ ووتاری ڕابردوودا لەخزمەت وەصیەتی حەوتەمی خوای گەورەدابووین کەفەرمووی: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ﴾(الأنعام 152)

بۆ درێژەدان بەو باسە گرنگو پڕ بایەخە دەڵێم: چەند شتێکی زۆر گرنگ هەیە کەکاسبکارانو بازرگانەکانو ئەهلی تەرازوو و بازاڕ پێویستە ئاگایان لێی بێ, بۆئەوەی کاروکەسابەتەکەیان حەڵاڵ بێو ژیانو گوزەرانیان پڕخۆشیو شادی بێو قەبرو قیامەتیان ئاوەدانو ڕازاوەبێ.. دەفەرموون بەدڵ گوێ بگرن بۆ ئەو باسە شیرینە..

**یەکەم:** ئەی کاسبکاری بەڕێز: هەر لەو کاتەوە کەدەستت کرد بەمعامەلەو کڕینو فرۆشتنو دوکانداری, یان هەر پیشەو کەسابەتێکی تر, نیەتی خۆت پاك بکەوەو بڵێ: خوایە وا من دەست دەدەمە ئەم کارو کەسابەتەو مەبەستیشم ئەوەیە (خۆت ئاگاداری) کەتووشی چاو لەدەستی خەڵك نەبم و دەستی بەخشندەییم هەبێ, نەك دەستی سواڵو خێزانو منداڵو میوانم بێڕێز بنو بەئاگری هەژاریو نەداری بسووتێن.. خوایە تۆش ڕزقو ڕۆزیەیەکی زۆرو حەڵاڵم بەنسیب بکە, بەڵکو بەو ماڵە یارمەتی هەژارانو نەداران بدەمو بەم پیشەو بەم کاسپیەم پێویستی موسڵمانان دەفع بکەم.

جا ئەگەر بەم شێوەیە نیەتی خۆت بۆ خوا ساغ کردەوە, ئەوا إنشاءَ الله ئەو کارو کاسبیەت بەعیبادەتو خواناسی بۆ حیساب دەکرێ.

**دووەم:** با ئەهلی دوکانو بازاڕو تەرازوو ئاگایان لەخۆیان بێ, بازاڕی دونیا" بازاڕی قیامەتیان لەبیر نەباتەوە, بازاڕی ڕۆژی قیامەتیش بریتییە لەمزگەوت. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ﴾(النور 37), واتە: پیاوانێك ستایشی خوا دەکەن لەو مزگەوتانەدا کەبازرگانیو کڕینو فرۆشتن سەرگەرمیان ناکاتو غافڵ نابن لەیادی خواو ئەنجامدانی نوێژەکانو بەخشینی زەکات..

جا ئەی کاسبکاری بەڕێز: تۆش بەهۆی هاتوچۆی بەردەوامت بۆ مزگەوتو ئامادەبوونت لەنوێژی جەماعەتو جومعە, ئەوا خۆت بگەیەنە بەکاروانی خواناسان, ئـــەو

پیاوانەی کەهەم پیاوی دونیا بوون، هەم پیاوی قیامەت بوون. نەکەی بەهۆی کەسابەتەوە نوێژو خواپەرستییەکانت بفەوتێنی، دڵنیاشبە هیچ عیبادەتێك بەتایبەتی نوێژ، لەمعامەلەو کڕینو فرۆشتن دوات ناخات.

بەڕێزان: عولەماکان لەتەفسیری ئایەتی ﴿ رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾دا فەرموویانە صەحابەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هەموویان بەڕەنجی شانی خۆیان ژیاونو هەریەکەیان بەکارو کاسبیەکەوە خەریك بووە.. جا هەیانبووە ئاسنگەر بووە، لەناو دوکانەکەیدا خەریکی ئیش کردن بووە، چەکوشەکەی بەرزکردۆتەوە کە بەئاسنەکەی بەردەستی بکێشێ، لەو کاتەدا گوێی لەبانگ بووە ئیتر چەکوشەکەی لەولاوە داناوەو بەئاسنەکەی نەکێشاوەو دوکانەکەی بەجێهێشتووەو ڕۆیشتووە بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت.

جا خۆشەویستان: ئەگەر یەکێك لەئێوە لەمزگەوت دوور بوو، یان نەیدەتوانی دوکانەکەی دابخاتو هەموو کەلوپەلەکانی بەرێتە ژوورەوە، ئەوا با بەرماڵێکی لابێو هەوڵبدا بەدەستنوێژەوە بچێتە دوکانو نووسینگەکەیەوە، بۆئەوەی کەکاتی نوێژ هات، یەکسەر نوێژەکەی بکاتو دوای نەخات، لەبەر ئەوەی نوێژ ئەگەر لەسەرەتای کاتەوە جێبەجێ نەکراو ئەم کات بۆ ئەو کات دواخرا، لەوانەیە ئاخری هەر نەکرێو ئەگەر نوێژەکەش کرا ئەو فەزیلەتو گەورەییەی کەخوای گەورە باسی دەکات دەربارەی ئەو کەسانەی کەکڕینو فرۆشتن لەعیبادەتو نوێژ دوایان ناخات، شموولی ئەو ناکات.

**سێیەم** : هەر کاتێ لەناو بازاڕدا بووی، یان لەدوکانەکەتدا دانیشتبووی، تۆ یادی خوا بکەو ذیکری خوا بکە، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی بازاڕ بیری ذیکری خواو یادیخوایان نیە، هەر خەریکی بگرەو بەردەی دونیان. جا هەرکەسێ لەبازاڕدا خەریکی ذیکری خوا بێ با موژدەی لێبێت بەر ئەم موژدەیەی رَسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەکەوێ کەفەرموویەتی: (هەرکەسێ چووە بازاڕەوەو گوتی: لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيي وَيُميتُ، وَهُوَ حَيٌّ لا يَموتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير)، هەرکەسێ ئەمە بڵێت: (كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ حَسَنَةٍ، وَمَحا عَنْهُ أَلْف أَلْف سَيِّئَةٍ، وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْف دَرَجَةٍ)،(رَواهُ الترمذي وَقالَ حَديثٌ غَريب)، واتە: هەرکەسێ لەکاتی چوونە بازاڕدا

ئەم ذیکرە بکات، ئەوا خوای گەورە هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسێو هەزار هەزار خراپەی لەسەر ڕەش دەکاتەوەو هەزار هەزار پلەی بەرزدەکاتەوە..

بەڵام بەمەرجێ کە بەکردەوەش ناوەڕۆکی ئەم ذیکرە جێبەجێ بکاتو ترسی ئەو خوایە تاکو تەنهاو بێشەریکە، کەژیانو مردن تەنها بەدەستی ئەوەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو ئەوەی ئەو دەوڵەمەندی بکات بەکەس هەژار ناکەوێو ئەوەی ئەو هەژاری بخات بەکەس دەوڵەمەند نابێ، بەم یەقینو قەناعەتەوە ئەو ذیکرە بکات ئەوا ئەو پاداشتە گەورەی بۆ هەیە. بەڵام ئەگەر خوانەخواستە هەر بەقسەبوو، دڵ ئاگای لێی نەبوو، ئەندامەکانیشو کردەوەکانی ناو بازاڕیشی پێچەوانەی ناوەڕۆکو مانای ذیکرەکە بوو، ئەوا هیچ خێری بۆ نانووسرێو بگرە تاوانیشی زیاترە.

یەکێ لەپیاوە صاڵحەکان دەفەرموێ: دوو پیاو زۆر یەکتریان لەبەر خوا خۆشدەویست، ڕۆژێکیان لەبازاڕ تووشی یەکتری بوون، یەکێکیان بەبرادەرەکەی گوت: وەرە با لەم بازاڕەدا، لەم کاتەدا کەخەڵکی لەغەفڵەتو بێئاگاییدان، وەرە با ئێمە یادی خوا بکەینو داوای لێخۆشبوون لەخوا بکەین، ئەویش زۆری پێخۆش بوو، هەردووکیان بەبازاڕدا دەڕۆیشتنو یادی خوایان دەکردو باسی ئەو هەموو خێرو بەرەکەتەیان دەکرد کەخوای گەورە بۆ عەبدەکانی خۆی دروستیکردووەو سوپاسی خوایان لەسەر دەکردو داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانیان لەخوا دەکرد کەوەکو پێویست سوپاسی ئەو هەموو بەخششە لەژمارە نەهاتوانەی پەروەردگاریان نەکردووە.

بەڵێ لەیەکتر جیابوونەوو پاش ماوەیەك یەکێکیان وەفاتی کردو مرد، برادەرەکەی زۆری پەرۆش بوو، تا ئەوەبوو شەوێکیان لەخەودا بینی وا برادەرەکەی لەناو باخو بێستانێکی زۆر خۆشو دڵگیردایەو زۆر ڕووخۆشو ئاسوودەیە، لێی پرسی: براکەم خۆ تۆ مردیو دونیات بەجێهێشت، بەچی گەیشتی بەم شوێنە خۆشەو خوای گەورە لێت ڕازی بوو؟ فەرمووی: برای ئیماندارم، لەبیرتە ئەو ڕۆژەی لەبازاڕ تووشی یەکتری بووینو لەو کاتەدا بەیەکەوە باسی فەزڵو گەورەیی خوامان کرد بەسەرمانەوەو داوای لێخۆشبوونمان لەخوا کرد، سوپاس بۆ خوا لەو کاتەدا خوا لێمان خۆش بوو..جا کەواتە با ئێمەش ئەو بەهرەو خەڵاتە گەورەیە لەدەست نەدەینو بەتایبەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا کەبازاڕەکان

بوونە جێگای دەست برین‌و جێگای سوێندی درۆو زۆربوونی ئافرەتی ناپۆشتەو تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ پیاوان, لەم کاتەدا زۆر زەرووره کەیادی خوامان لەبیر نەچێ‌و وەکو ئەو پیاوە باشانە لەکاتی چوونە بازاڕدا یادی خوا بکەین‌و بیر لەو هەموو ڕزق‌و ڕۆزیە فراوانە بکەینەوە کەخەڵکانی پێش ئێمە بەخەونیش نەیانبینیوە, خوا هەمووی بۆ ئێمە فەراهەم هێناوە, یەکسەر سوپاسی خوای لەسەر بکەین‌و داوای لێخۆشبوونی لێبکەین لەوەی کەزۆر کەمتەرخەمین‌و بەکەمی سوپاسی ئەو هەموو بەخششانەمان کردووە..

**چوارەم** : لەو شتانەی کەپێویستە دوکاندارو ئەهلی بازاڕو کەسابەت ئاگایان لێی بێ ئەوەیە: نەك هەر خۆیان لەحەرام بپارێزن بەڵکو خۆیان لەهەموو کڕین‌و فرۆشتن‌و معامەلەیەکیش بپارێزن کەگومانی حەرامی لێبکرێ. واتە: شتێك لەنێوان حەڵاڵ‌و حەرامدا بێ, کەئەمەش پێی دەگوترێ (الورع), جا هەرکاتێ ویستت شتێك بکڕی, چاوەڕێی ئەوە مەکە بەڵکو کەسێك فتوایەکت بۆ بداو بۆت حەڵاڵ بکا, بەڵکو لەدڵی خۆت بپرسە, ئەگەر دڵت, ئەگەر ویژدانت ئیسراحەت نەبوو پێی‌و گومانی حەرامیت لێکرد, ئیتر وازی لێبێنە, چونکە ئەگەر لەشتە گوماناوییەکان خۆت نەپاراست, سەرەنجام ڕۆژێك تووشی حەرام خواردنیش دەبیت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێت: (الحَلالَ بَيِّنٌ) حەڵاڵ ئاشکراو ڕوونە, ئیمامی ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: حەڵاڵ ئەوەیە کەبەڵگەی ڕوونی لەسەرە کەحەڵاڵە, (وَالحرامُ بَيِّنٌ) حەرامیش ئاشکراو ڕوونە, ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: حەرام ئەوەیە کەبەڵگەیەك هەیە بۆ حەرامبوونی.. (وَبَيْنَهُما مُشْتَبِهاتٌ) وە لەنێوانیاندا چەند شتێکی هاوشێوە هەیە کەگوماندارن ـ لەحەڵاڵ‌و لەحەرامیش دەچن ـ (لا يَعْلَمُهُنَّ كَثيرٌ مِنَ النَّاس): زۆرێك لەخەڵك پەیی پێنابات: (فَمَن اتَّقى الشُّبُهاتِ اسْتَبْرَأ لدينِهِ وَعِرْضِهِ, وَمَنْ وَقَعَ في الشُّبُهات وَقَعَ في الْحَرامِ)(رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم) .

واتە: جا هەرکەسێك خۆی لەو گومان‌و شوبهانە بپارێزێت ئەوە دەخوازێت کەدین‌و شەرەفی گومان‌و لەکەی تێدا پەیدا نەبێت, وەهەرکەسیش بکەوێتە ناو گومانەوە ئەوە دەکەوێتە ناو حەرامەوە.

ئیمانداران: تەماشای خواناسانی پێشینی ئەم ئیسلامە بکە, چۆن هەرکارو کاسبییەك, کە بەهۆی خراپەکارێكو زاڵمێکەوەسوودی ماددیان لێ وەرگرتبێ, خۆیان لێ پاراستووە, ئیمامی غەزالی دەگێڕێتەوە:

کابرایەك کەئیشی بەنایی‌و وەستای دیواری دەکرد, شوورای شارێکی ئەو سەردەمەی بەقۆنتەرات گرت کەدیواری بکا, کەلەو زەمانەدا شارەکان شوورایان بەدەوردا دەکرا تا لەمەترسی دوژمن بپارێزرێ, ئەم وەستایە دەڵێ: خەریك بوو دەست بەئیشەکە بکەم بەڵام گومان‌و دوودڵیەك لەلام دروست بوو, کەئەم دیوارە دروست بکەم یان نا, تۆ بڵێی ئەم پارەی لەم ئیشەی وەردەگرم حەڵاڵ بێ یان نا! بەخۆمم گوت: باشە خۆ دروستکردنی ئەم شوورایە بۆ ئەم شارەی کەموسڵمانانی تێدا دەژیو لەدوژمنی کافر دەیانپارێزێ, کارێکی پیرۆزو خێرەو بەڵکو یەکێکە لەو شتانەی کەئاینی ئیسلام واجبی‌کردووە لەسەر موسڵمانان کەدەبێ خۆیان لەدوژمن بپارێزن‌و شوورا بۆ شارەکانیان بکەن, بەڵام هەر بەخۆشم بەخۆمم گوت: ئاخر پاشاو کاربەدەستی ئەم شارە کەمن ئەم شووراو دیوارەی بۆ دەکەم, یەکێکە لەزاڵمان‌و زوڵم لەمیللەتی موسڵمانی ڕەش‌وڕووت دەکات, بۆیە چووم بۆ لای ئەولیاو زانای ڕۆژگار (سوفیانی ثەوری)و ئەم باسەی خۆمم بۆ گێڕایەوە, ئەویش فەرمووی: مادام حاکمی شارەکە زاڵمە بەزۆرو بەکەم لێی نزیك مەبەوەو هیچ ئیشێکی بۆ مەکە, گوتم: قوربان خۆ ئەم دیوارو شوورایە کەمن دروستی دەکەم لەمەصڵەحەتی موسڵمانانەو کارێکی زەرووره بکرێ. سوفیانی ثەوری فەرمووی: (نَعَمْ, وَلكِنْ أَقَلُّ ما يَدْخُلُ عَلَيْكَ أَنْ تُحِبَّ بَقاءَهُم لِيوفوكَ أَجْرُكَ, فَتَكون قَدْ أَحْبَبْتَ بَقاءَ مَنْ يَعْصي اللّه), فەرمووی: بەڵێ ڕاست دەکەی, ئەو شووراو دیوارەی دەوری شار, شتێکی پیرۆزو باشە بەڵام بەلای کەمەوە ئەوە لەدڵی تۆدا دروست دەبێ کەحەزدەکەی داموودەزگاو حکومەتی ئەو زاڵمەی تۆ ئیشەکەت لێ بەقۆنتەرات گرتووە, بەردەوام بێو نەڕووخێ, بۆئەوەی کرێیەکەت نەفەوتێ ئەو کاتە تۆ تووشی ئەو گوناهە گەورە دەبی کەبریتییە لەوەی حەزدەکەی کەسێك لەسەر کورسی دەسەڵات بێ کەبێ‌ئەمری خوا دەکاو زوڵم لەخاكو خەڵکی خوا دەکات, جا پارەیەك بەم ڕێگایە بەدەست بێ, توخوا وازی لێبێنی باشتر نیە؟! بەڵێ وەستایەکە وازی لەئیشەکە هێنا

پیاوپاشێکی دڵ ڕووناك دەفەرموێ: ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا تێپەڕی ئەوەــە خەڵکی لەخواترس‌و حەڵاڵخۆر هەیە، ئەگەر کەسێك نەشارەزا بێ‌و غەریب بێ، ڕێی بکەوێتە بازاڕو لەکەسێك بپرسێ: ئەرێ لەگەڵ کێدا کڕین‌و فرۆشتن بکەم‌و لێی دڵنیابم کەفێڵم لێناکات، ئەوا بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێی دەگوترێ: لەگەڵ کێدا معامەلە دەکەی خەمت نەبێ‌و سیقەت پێی بێ؟ دەفەرموێ: دوای ئەوە زەمان‌و سەردەمێك دێتە پێشەوە وردەوردە ترسی خوا لەدڵەکاندا کەم دەبێتەوەو حەرامخۆری‌و دەستبڕین دەبێتە پیشە، ئەمجارەیان ئەگەر ئەو کەسە غەریبە بپرسێ: ئایا لەبازاڕدا لەگەڵ کێ معامەلە بکەم‌و لێی ئەمین بم؟! لەوڵامدا پێی دەگوترێ: لەگەڵ هەموو کەس معامەلە بکەو لەهەموو کەس ئەمین بە تەنها فلان‌و فلان نەبێ، واتە: ئەو کەسانەی کەحەرامخۆرو دەستبڕن بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.

پاشان سالان دێن‌و دەڕۆن‌و ڕۆژگارێك دێتە پێشەوە، ئەگەر کەسێکی نەشارەزا بپرسێ: ئایا لەبازاڕدا لەگەڵ کێ معامەلە بکەم‌و لەکێ ئەمین‌و دڵنیابم کەئینسانێکی معامەلە دروست‌و سەرڕاستە؟! لەوڵامدا پێی دەگوترێ: نەکەی سیقەو متمانەت بەکەس ببێ‌و کڕین‌و فرۆشتنی لەگەڵ بکەی، چونکە کەسی دەستپاك‌و ئەمین لەبازاڕدا نەماوە تەنها فلان کەس‌و فلان کەس نەبێ کەپیاوی باشن‌و لێیان دڵنیابە.. واتە ئەمجارەیان پیاوچاکەکان‌و معامەلە دروستەکان بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.

پاشان پیاوچاکەکە دەفەرموێ: بەخوا دەترسم زەمانێك بێتە پێشەوە وای لێبێت لەبازاڕدا یەك کەسی ئەمین‌و دەستپاکت دەست نەکەوێ کەبتوانی سیقەی پێ بکەی‌و معامەلەی لەگەڵ بکەی!!

بەڵێ، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کە ﴿ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى ﴾(النجم 3 ـ 4)، ئاگاداری ئومەتەکەی کردۆتەوەو فەرموویەتی: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمانٌ لا يُبالي الْمَرْءُ بِما أَخَذَ أَمِنَ الحَلالِ أَمْ مِنَ الحَرامِ)(رَواهُ البُخاري)، واتە: زەمانێك بەسەر خەڵکیدا دێ، ئینسان گوێ نادات بەوەی کەئەوەی بەدەستی دێنێ‌و پەیدای دەکات حەڵاڵە یان حەرامە!

جا خۆشەویستان: ئینسانی موسڵمان بۆئەوەی تووشی حەرامخۆری نەبێ، پێویستە (وارع) بێت، واتە: خۆی لەشتە گوماناوییەکان بپارێزێ، کە بەڕاستی ئینسان بەوە دەبێتە موتەقیو لەخواترسی ڕاستەقینە کەنەك هەر حەرام نەخوات، بەڵکو خۆیشی بپارێزێ لەهەر شتێك کەگومانی حەرامبوونی لێبکرێ، ڕەحمەتی خوا لەشاعیر کەفەرموویەتی:

وَلَقَدْ عَلِمْتُ فَلا تَظُنِّي غَيْرَهُ      أَنَّ التَّوَرُّعَ عِنْدَ هَذا الدِّرْهَمِ

فَإِذا قَدِرْتَ عَلَيْهِ ثُمَّ تَرَكْتَهُ      فاعْلَمْ بِأَنَّ هُناكَ تَقْوى المُسْلِمِ

**پێنجەم:** بەڵێ ئیمانداران: خاڵی پێنجەم کەپێویستە کاسبکاران ئاگایان لێی بێ ئەوەیە: خۆیان بپارێزن لەسوێندی درۆ.. کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە لەکڕین‌و فرۆشتندا سوێند نەخۆن‌و زۆر جار سوێندەکەش ناڕاستەو بۆ خەڵەتاندنی کەسی بەرامبەرە، بەڵام با ئاگاداربین‌و بزانین پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم لەو بارەیەوە چی فەرمووە؟!

خۆشەویستمان، دڵسۆزو ڕابەرمان حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرموویەتی: (إِنَّ التُّجَّارَ هُمَ الفُجَّارُ) بەڕاستی بازرگانەکان فاجرو لەڕێگا دەرچوو و خراپەکارن، (قالوا يا رَسُول الله: أَلَيْسَ قَدْ أَحَلَّ اللهُ البَيعَ؟) صەحابەکان بەسەرسووڕمانەوە عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا خوای گەورە بۆ خۆی معامەلەو کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵ نەکردووە، ئایا بۆچی معامەلەچییەکان‌و ئەهلی بازاڕ فاجرو خراپەکارن؟! (قالَ: بَلى، ولكنَّهُمْ يَحْلِفونَ فَيَأْثَمونَ، ويُحَدِّثونَ فَيَكْذِبونَ)(رَواهُ أحمد بِإسْنادٍ جَيِّد)، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەوڵامدا فەرمووی: بەڵێ ڕاستە خوای گەورە کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە، بەڵام بۆیە بازرگانەکان‌و ئەوانەی کڕین‌و فرۆشتن ئەنجام دەدەن دەبنە ئینسانی فاجرو خراپەکار لەبەر ئەوەی لەکاتی معامەلەو کڕین‌و فرۆشتندا زۆر سوێند دەخۆن، بەمەش زۆر گوناهبار دەبن، هەروەها زۆربەی قسەکانیان درۆن‌و ئەوەی کەمەدحی شتەکانیان دەکەن‌و لەبەرچاوی کڕیار شیرینیدەکەن وا نیە، ئینسانی درۆزنیش فاجرو خراپەکارە.

بەڵام با بازرگانە بەڕێزەکان بزانن: ئەگەر هاتو بازرگان خۆی پاراست لەسوێندی درۆو لەقسەکردن‌و وەعددانی درۆ، ئەوە دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی لەژێر سێبەری

عەرشی خوای گەورەدا حەشر دەکرێ, هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم فەرموویەتی:

(التَّاجِرُ الصَّدُوقُ الأمينُ مَعَ النَّبِيِّنَ وَالصِّدِّقِينَ وَالشُّهَداء) (رَواهُ الترمذي), واتە: بازرگانی سەرڕاستی ڕاستگۆی دەستپاك لەڕۆژی قیامەتدا هاونشینی پێغەمبەرانو پیاوچاكانو شەهیدانە.

صەحابی بەڕێز حەزرەتی ئەبوذەری غیفاری (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرمووی: (ثَلاثَةٌ لا يَنْظُرُ اللهُ إِلَيْهِمْ يوم القِيامَة, وَلا يُزَكّيهِمْ, وَلَهُمْ عَذابٌ أليم), واتە: سێ كەس, سێ تاقمو دەستە هەن لەڕۆژی قیامەتدا كەخوای گەورە بەچاوی بەزەیی تەماشایان ناكات وەپاكیان ناكاتەوەو سزای زۆر بەئێشی جەهەنەمیان بۆ ئامادەكراوە, ئەبوذەر دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم سێ جار لەسەر یەك ئەم فەرمایشتەی دووبارەكردەوە, منیش عەرزم كرد: (خابُوا وَخَسِروا, وَمَنْ هُمْ يا رسُولَ الله؟!) ئای ماڵ وێرانو خەسارەتمەند خۆیان, ئەوانە كێنو ڕەوشتیان چی بووە لەدونیادا ئەی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم؟! خۆشەویست فەرمووی: (المُسْبِلُ) ئەو كەسەی كەجلوبەرگەكەی هەڵدەكات لەبەر درێژییانو فیزو دەعیە بەسەر خەڵكا لێدەداتو بەخۆ بەزل زانینەوە بەسەر زەویدا دەڕوات.. دووەمیان: (المَنَّان) ئەو كەسەی ئەگەر جارێك لەجاران یارمەتی كەسێك بدا, بەردەوام بەچاویدا دەداتەوەو منەتی زۆری بەسەردا دەكاو لەهەموو مەجلیسو شوێنێكدا بەبیری دێنێتەوە كەئەگەر ئەو نەبوایە ئەو ئیشەی بۆ نەدەكرا, ئەوە بەڕاستی خوا زۆر ڕقی لەوجۆرە منەتكارانەیە.. سێیەم: (المُنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلْفِ الْكاذِبِ) ئەو كەسەی كە بەهۆی سوێندی درۆوە قەناعەت بەكڕیار دەكاتو كەلوپەلەكەی خۆی بەسەردا ساغ دەكاتەوە (ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووە).

لەفەرموودەیەكی تردا كەحەزرەتی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم فەرمووی: سێ كەس هەن لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەچاوی ڕەحمەتو بەزەیی تەماشایان ناكاتو پاكیان

ناکاتەوەو سزای زۆر بەئێش‌وئازاراوی دۆزەخیان بۆ ئامادەکراوە, ئەو سێ کەس‌و تاقمەش ئەمانەن:

1 ـ (رَجُلٌ حَلَف عَلى سلْعَته لَقَدْ أُعْطِي بِها أكْثَرُ ممَّا أُعْطِي وَهُوَ كاذِبٌ) کەسێکە دەیەوێت شتێك, کەلوپەلێك, ئاژەڵێك, سەیارەیەك, بەکەسێکی تر بفرۆشێ, کابرای کڕیار دەڵێ: بەوەندە نایفرۆشی؟ ئەویش سوێندی بۆ دەخوا کەلەو نرخە زیاتری پێداوەو زەرەر دەکا ئەگەر بەو پارەیە بیفرۆشێتەوە, بەڵام درۆ دەکاو تەنها بۆ خەڵەتاندنی کڕیارەکە ئەو سوێندە دەخوات!

2 ـ (وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلى يَمينِ كاذِبَةٍ بَعْدَ العَصْرِ لِيَقْتَطِعَ بِها مالَ امْرِيءٍ مُسْلِمٍ) واتە: دووەم کەس‌و تاقم لەوانەی کەخوایِ گەورە لەڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکاو پاکیان ناکاتەوەو سزای سەختیان دەدرێ لەجەهەنەمدا, پیاوێکە کە لەدوای نوێژی عەسرو لەو کاتەدا کەکردەوەکانی ئەو ڕۆژەی ئینسان بەرەو ئاسمان بەرزدەبنەوە, لەو کاتە پیرۆزەدا لەبازاڕدا, یان لەشوێنێکی تردا بەسوێندی بەدرۆ ماڵی موسڵمانێك بەناحەق دەخوا.

3 ـ (وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ ماءٍ, فَيَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ: اليَوْمَ أمْنَعُكَ فَضْلي كَما مَنَعْتَ فَضْلَ ما لَمْ تَعْمَلْ يَداكَ)(رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم), واتە: پیاوێك, ئاوێکی لەخۆی زیاد هەیە, کەسانی دەوروبەریشی زۆر پێویستیان بەو ئاوە هەیە بۆ خواردنەوەی خۆیان‌و ئاژەڵ‌و کشتوکاڵیان, بەڵام ئەو خاوەن ئاوە, ئەوەندە ڕژدو چرووکە تەنانەت دەستی لەو ئاوەش نابێتەوە کە لەخۆیشی زیادەو ئەگەر بەشی ئەوانیشی لێبدات هیچ کەم ناکات, ئەو کەسە لەڕۆژی قیامەتدا کاتێ دەچێتە بەردەم خوای گەورە جَلَّ جَلالُهُ, خوای پەروەردگار دەفەرموێ: فلان کەس, مادام تۆ ئەوەندە بەخیل‌و بێکەڵك بووی بەرامبەر عەبدەکانی من لەدونیادا, ئەوا ئەمڕۆ منیش بەخشش‌و لێخۆشبوون‌و فەزڵ‌و کەرەمی خۆمم لەتۆ گرتەوە, هەروەکو چۆن تۆ لەدونیادا ئەو ئاوەی کە لەدروست بوون‌و هاتنەدەرەوەو لەبەر ڕۆیشتنیدا هیچ دەست‌و ئازایەتی تۆی تێدا نەبوو, کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێی بەخیل بووی‌و بۆ ڕزگاربوونت لەم ڕۆژەدا چاکەت پێوە نەکرد..

حەزرەتی ئەبی سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: کابرایەکی ئەعرابی کاوڕێکی پێبوو دەیفرۆشت, منیش ویستم لێی بکڕم بۆیە چوومە لایەوەو پێم

گوت: (تَبيعُها بِثَلاثَة دَراهِمٍ؟) ئایا بەسێ دیرهەم دەیفرۆشی؟ کابرا گوتی: (لا وَاللهِ) نەخێر، سوێند بەخوا بەسێ دیرهەمی نادەم! ! ئەبی سەعید دەفەرموێ: منیش چوومە ئەولاوەو لێم نەکڕی بەڵام دوای ماوەیەك هەر لەو شوێنەدا بەسێ دیرهەمەکە بەکەسێکی تری فرۆشت، منیش ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم فەرمووی: (باعَ آخِرَتَهُ بِدُنياهُ)(رَواهُ إبنُ حَبَّان في صحيحِه)،

فەرمووی: هاوار بەحاڵی، قیامەتی بەدونیای خۆی فرۆشت! !

کەواتە موسڵمانی بەڕێز: شت لەسەرمایە مەفرۆشەو مەڵێ ئەوەندەم پێداوەو بەوەندە زەرەر دەکا، بەڵکو بڵێ بەوەندەی دەفرۆشم، جا حەزدەکەی بیکڕەو حەزدەکەی وازی لێبێنە.

شَيْخُ الإسْلام إبنُ تَيمِيَّة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: محمدی کوڕی ئیمام جەعفەری صادق (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) دەفەرموێ: هەر کاتێ گوێی لێبوایە کەسێك سوێند دەخواو دەڵێ: قەسەم بەخوا بەوەندەی نافرۆشم، یان قەسەم بەخوا وا دەبێو وا نابێ، دەفەرموێ: لەشی دەلەرزیو دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕا (إجْلالاً للّه تَعالى) لەبەر گەورەیی ناوی پیرۆزو بڵندی خوای گەورە سُبْحانَهُ وتَعالى.

برای کاسبکار، هەرگیز بەسوێندی بەدرۆ ڕەواج بەشتەکەت مەدە، لەبەر ئەوەی صەحابی خۆشەویست ئەبو هورەیرە ( ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: بەم گوێیانەی خۆم لەپێغەمبەری خوام بیست کەفەرمووی: (الحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مَمْحَقَةٌ لِلْكَسْبِ)(رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم)، واتە: سوێندخواردن برەو بەفرۆشتنی کاڵاو کەلوپەلەکە دەدا، کڕیارەکە باشتر قەناعەت دەکاتو دەیکڕێ، بەڵام پیتوبەرەکەتی کەسابەتەکە دەبا..

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (إيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الحَلِفِ في البَيْعِ فَإنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ)(رَواهُ مُسْلِم)، واتە: لەسەوداو مامەڵەدا دووربن لەسوێندخواردنی زۆر، چونکە لەپێشدا برەوو ڕەواج بەکاڵا دەدا، بەڵام لەپاشدا پیتوبەرەکەتی دەبا بەحەوادا..

ئیمامی ذەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (ما حَلَفْتُ بِاللهِ صادِقاً وَلا كاذِباً في حَياتي، تَوْقيراً للهِ تَبارَكَ

وَتَعالى, وَتَعْظيماً لَهُ), واته: لەهەموو ژیانمدا سوێندم بەخوا نەخواردووە نە بەڕاستو نە بەدرۆ, لەبەر بەقەدرو حورمەت ڕاگرتنی ناوی خوا, وەلەبەر بەگەورەزانینی خوای بالآدەستو بەتوانا سُبْحانَهُ وَتَعالى..

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلّم فەرموویەتی: (مَنْ حَلَفَ عَلى مالِ امرِيءٍ مُسْلِمٍ بِغَيْرِ حَقِّه, لَقِيَ اللهَ وَهُوَ عَلَيْه غَضْبانُ) واته: کەسێ بەدرۆ سوێندی ناحەق بخوا تا بەو سوێندە ناحەقە ماڵی پیاوێکی موسڵمان بیچڕێ بۆ خۆی, ئەوە کاتێ دەگاتەوە بەدیداری خودا, خوای گەورە لێی تووڕەیە, (إبنُ مَسعود) کەفەرموودەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەمجا پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلّم بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە, ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی بەسەرماندا خوێندەوە کەدەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَلِيلاً أُولَئِكَ لا خَلاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(آل عمران 77), واته: ئەو کەسانەی کەپەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشنو بەبەهایەکی کەمی دونیایی دەیانگۆڕنەوە, ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا بێبەشو بارەن, وەخوای گەورە قسەی خۆشیان لەگەڵ ناکا, وەبەچاوی میهرەبانیەوە تەماشایان ناکاتو ڕووی خۆشیان ناداتێ, وەپاکیان ناکاتەوەو بەهیچ جۆر نە نازیان دەگرێو نە تاریفیان دەکا, وەسزایەکی سەختی بەسوێشیان بۆ هەیە لەقیامەتدا.. (ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاریو موسلم ڕیوایەتیان کردووە).

هەر لەسەر ئەم ئایەتە پڕ هەڕەشەئامێزە لەو کەسانەی سوێندی درۆ دەخۆن بۆ فرۆشتنو ڕەواج دان بەکاڵاو کەلوپەلەکانیان, عبدالله ی کوڕی ئەبوئەوفا (ڕەزای خوای لێبێت), دەفەرموێ: پیاوێك لەبازاڕ کەلوپەلو شتومەکێکی دانابوو, هەرکەسێ بیگوتایە بەوەندە نایفرۆشی سوێندی دەخواردو دەیگوت: بەزاتی خوا خۆم زیاترم پێداوە لەم نرخەی کەتۆ دەمدەیتێ, هەتا بیکا بەتووشی پیاوێکی خۆشباوەڕی موسڵمانەوە! جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ژمارە (77)ی سووڕەتی آل عمران هاتە خوارەوەو بەو زنجیرە هەڕەشەیە پاشەڕۆژی ئەو کابرایەو هەموو ئەو کەسانەی کەئەوە ڕەوشتیانە دیاریکرد (ئیمامی بوخاری گێڕاویەتیەوە).

بەڕێزان: پێویستە ئاگاداری ئەوە بین, کەهەر سوێندێکی درۆ کەماڵی موسڵمانێکی بەهۆیەوە پێ داگیر دەکرێ, ئەو سوێندە کەفارەتی نیە هەروەکو صەحابی بەڕێز عبدالله ی کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: (كُنَّا نَعُدُّ مِنَ الذَّنْبِ الَّذي لَيْس لَهُ كَفَّارَةٌ اليَمينُ الغَموس, قيلَ: وَما اليَمينُ الغَموسُ؟! قالَ: الرَّجُلُ يَقْتَطِعُ بِيَمينِهِ مالَ الرَّجُلِ)(رَواهُ الحاكِم), کەواتە: نابێ هیچ کەس وا تێبگا کەئەگەر سوێندی بەدرۆی خواردو بەو هۆیەوە ماڵی موسڵمانێکی خوارد, ئەگەر کەفارەتی سوێند بدا خوا لێی خۆش دەبێ, نەخێر خوای گەورە بەهیچ لەو تاوانە خۆش نابێ تاوەکو ئەو کەسەی ماڵەکەی خوراوە مافی خۆی پێنەدرێتەوەو گەردنی سوێندخۆرەکە ئازاد نەکات.

**شەشەم:** ئەی کاسبکاری بەڕێز: هەرگیز چاو لەحەرامخۆرەکان مەکەو مەڵێ خۆزگە منیش ئاوا معامەلەی شتی حەرامم بکردایەو وەکو فلان‌و فلان دەوڵەمەند بوومایە, هەروەکو پێغەمبەری دڵسۆزمان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لا تَغْبِطَنَّ جامِعَ المالِ مِنْ غَيْرِ حِلِّهِ أَوْ قالَ مِنْ غَيْرِ حَقِّهِ, فَإِنَّهُ: إِنْ تَصَدَّقَ لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ, وَما بَقِيَ كانَ زَدَهُ إِلى النَّارِ)(رَواهُ الحاكِم وَقالَ صَحيحُ الإِسْناد), واتە: هەرگیز خۆزگە مەخوازن بەو دەوڵەمەندەی کە بەحەرامی ماڵی کۆکردۆتەوەو دەوڵەمەندبووە, لەبەر ئەوەی ئەگەر بیکات بەخێرو خێرات خوا لێی قبووڵ ناکات, وەهەرچەندە ماڵەکە زۆر بێ, زیاتر تووشی سزای دۆزەخی دەکات.

**حەوتەم:** ئەی کاسبکاری بەڕێز, دڵنیابە ئەوەی خوا بۆی بڕیار داوی لەڕزق‌و ڕۆزی‌و پارەو سامان, هەر ئەوەیەو زیادو کەم ناکات, کەواتە: کاسبی بکەو هەوڵ بدە, بەڵام خۆشت بەهیلاك مەدەو ئیسراحەتیش بدە بەخۆت, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (لَوْ فَرَّ أَحَدُكُمْ مِنْ رِزْقِهِ, أَدْرَكَهُ كَما يُدْرِكُهُ المَوْتُ) (رَواهُ الطَبَراني في الأوسط وَالصَغير بِإِسنادٍ حَسَنٍ), واتە: ئینسان هەرچەند غاریش بدات لەبەر ئەوەی ئەو ڕزق‌و ڕۆزییەی کەخوای گەورە بۆی بڕیارداوە, ئەو ڕزقە هەر پێی دەگات هەروەکو چۆن مردن پێی دەگات هەرچەند خۆیشی لێ بشارێتەوە.

**هەشتەم:** خاڵی هەشتەم‌و کۆتایی ئەو کەسانەی کە لەکارو کاسبیدا شەریکن با ڕاستگۆ بن لەگەڵ یەکتری‌و خیانەت لەگەڵ یەکتری نەکەن, فێڵ لەیەکتر نەکەن, هەموو

شتێکیان لای یەك ئاشکراو دیاربێ, ئەو کاتە خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە ڕزق‌و ڕۆزییانەوە, بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر شەریکەکان خیانەتیان لەگەڵ یەکتر کرد, ئەوا بەرەکەت لەماڵ‌و دەرامەتیان هەڵدەگیرێ.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم دەفەرموێ خوای گەورە فەرموویەتی: (أَنا ثالثُ الشَّريكَيْنِ ما لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُما صاحِبَهُ, فَإذا خانَ" خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِما) زادَ رُزَيْنُ فيهِ (وَجاءَ الشَّيْطانُ)(رَواهُ أبو داود وَالحاكِم وَقالَ صَحيحُ الإسْناد), واتە: خوای گەورە سُبْحانَهُ وَتَعالى فەرموویەتی: هەرکاتێ دوو کەس بوونە شەریکی یەکتری‌و پاك بوون لەگەڵ یەکترداو خیانەتیان لەیەکتر نەکرد, ئەوا منیش دەبم بەسێیەم شەریکیان - بەرەکەت دەخەمە ماڵ‌و کاسبیەکەیانەوە, بەڵام هەرکاتێ خیانەتیان لەیەکتر کردو شتیان لەیەکتری شاردەوە ئەوا من لەنێوانیان دەچمە دەرەوەو شەیطان دێتە نێوانیانەوە, واتە: بەرەکەت لەکارو کاسپی‌و دەرامەتیان هەڵدەگرم.

ئیمانداران: لەسەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم, ئەم ڕووداوە واقیعی‌و ڕاستەقینەتان بۆ دەگێڕمەوە کە لەیەکێك لەگوندەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا ڕوویداوە:

دوو برا, دوای مردنی باوکیان دوو پارچە زەوییان بەمیرات بەردەکەوێ, ئەم دوو پارچە زەوییە بەراوە لەکانیەکەوە ئاویان بۆ دەچێ کەهەردوو براکە لەئاوی ئەو کانیەدا شەریك دەبن.

ئەم دوو برایە ئاوی کانیەکە بەیەکسانی دەکەن بەدوو بەشەوە بەهۆی بەردێکی تارادەیەك گەورەوە کە لەناوەڕاستی ئەو جۆگەیەی دادەنێن کەئاوەکەی لێوە دەچێت بۆ هەردوو موڵکەکە, شەوانە برا گەورەکە لەماڵەوە بیردەکاتەوەو دەڵێ: بەخوا برا بچووکەکەم کەم دەرامەتەو تازەماڵەو من حاڵم لەو باشترە, با بچم بەشە ئاوەکەی ئەو زیاد بکەم, بەڵکو زەویەکەی ئەو بەرهەمی زیاتر بێ‌و حاڵی باش‌و خۆشتر بێ ! !

بەڵێ بەو تاریکەشەوە هەڵدەستێ دەچێ بەردەکەی ناو جۆگاکە دەجووڵێنێ‌و بەشە ئاوی برا بچووکەکەی زیاد دەکات! برا گەورەکە دەگاتەوە ماڵەوەو دڵی ئیسراحەت دەکات, لەم کاتەدا برا بچووکەکەش لەماڵەوە بیردەکاتەوەو دەڵێ: بەخوا کاکم ماڵ‌و

منداڵی لەمن زۆرترە, خەڵك زیاتر دەیناسێ‌و ماڵومیوانی زیاترە, با بچم بەشە ئاوەکەی ئەو زیادبکەم! بەڵێ بەو تاریکەشەوە هەڵدەستێ دەچێ بەردی ناوەڕاستی جۆگەکە دەجووڵێنێ‌و بەشەئاوی برا گەورەکەی زیاد دەکات.

بەم شێوەیە ماوەیەکی زۆر شەوانە ئەم دوو برایە, بەبێ ئەوەی ئاگایان لەیەکتر بێ ئاوا بەشەئاوی خۆیان کەم دەکردەوەو بەشەئاوی براکەی زیاد دەکرد, ئەوەبوو شەوێکیان خەڵکی گوندەکە گوێیان لەدەنگێکی گەورەبوو, کاتێ لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە تەماشادەکەن ئاوی کانیەکەی ئەو دوو برایە تەقیوەو ئاوەکەی نەك جۆگایەك بەڵکو چوار پێنج جۆگاش هەڵی ناگرێ!!

بەم شێوەیە بەبەرەکەتی دڵسافی‌و دڵسۆزیی ئەم دوو برا شەریکە بۆ یەکتری, خوای گەورە بەرەکەتی بەسەر هەموو ئاواییەکەدا ڕشت‌و هەموو موڵکەکان لەبێ‌ئاوی‌و سەرەو نۆرەگرتن بۆ ئاو داشتن ڕزگاریان بوو.

جا ئیمانداران: خۆ ئێمەش هەموومان براین, ئەگەر برای دایك‌و باوکیش نەبین ئەوە برایەتیەکی لەوە گەورەتر لەنێوانماندا هەیە کەبرایەتیی ئیمانییە ﴿ إِنَّما المُؤْمِنونَ إِخْوَةٌ﴾, برایەتیی ئیمانی لەبرایەتیی دایك‌و باوکی بەرزو پاکترە, لەبەر ئەوەی لەبرایەتیی ئیمانیدا خوا شاهیدی دەدات کەئێمە براین, وەبەهۆی ئیمانەوە بووین بەبرا کەئیمان پاك‌و خاوێنە, بەڵام لەبرایەتیی دایك‌و باوکیدا, دایك شاهیدە کەئێمە براین, وەبەهۆی خوێنەوە دەبین بەبرا, کەخوێن لەئەصڵدا پیسە.

جا کەواتە: با هەموومان وەکو ئەو دوو برایە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتر بکەین, بەتایبەتی لەو کاتانەی کەماڵو تەماعی دونیا کەوتە نێوانمانەوە, تاوەکو إنشاءَ الله ئاوا بەرەکەتی خوای گەورەمان بەسەردا بڕژێت.

داواکارم لەخوای ڕۆزی دەری هەموان بەرەکەت بخاتە ڕزق‌و سامانی هەمووماندەوەو هەرزانی‌و بەرەکەت بخاتە وڵات‌و میللەتمانەوە..

اللّهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز .

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمدأمین .

3 ـ التاج الجامع للأصول, منصور علي ناصف, وەرگێڕانی: نوری فارس حمەخان .

4 ـ ریاض الصالحین, الإمام النووي, وەرگێڕانی: نوری فارس حمەخان .

5 ـ الترغیب والترهیب, عبدالعظیم بن عبدالقوي المُنذري .

6 ـ الحلال والحرام في الإسلام, د. یوسف القرضاوي

7 ـ المِسْكُ والعَنبَر في خُطَب المِنبَر, د. عائِض القَرَني

# وەصیەتـــی هـــەشتـــەم

﴿ وَإِذا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذا قُرْبَى ﴾

( الأنعام 152 )

# ووتـــــاری ژمـــــاره سی‌ودوو

## دادگەری لەقسەو گوفتاردا

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقِيراً فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً ﴾

(النساء 135)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلى مَنابِرَ مِنْ نورٍ, الَّذينَ يَعْدِلُونَ في حُكْمِهِمْ, في أَهْلِهِمْ وَما وَلِ )

( رَواهُ مُسْلِمٌ )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمعين .**

ئیمانداران‌و خواناسانی بەڕێز: پشتیوان بەخوای گەورە لەم ووتارەشدا دەچینە خزمەت وەصیەت‌و ڕاسپاردەی هەشتەمی پەروەردگار بۆ ئێمەی عەبدو بەندەی دروستکراوی خۆی.. جا با زۆر بەئەدەبەوەو بەگوێی دڵ ئامادەی وەرگرتنی بین.

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾ واتە: ئەی گرۆهی موسڵمانان, کەشایەتیتاندا یان حوکم‌و بڕیارتان دەرکرد دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن, با ئەو کەسەی شایەتیەکەی لەدژ دەدەن یان بڕیاری دژ دەردەکەن خزم‌وخوێشیش بێ, چونکە هەر بەڕێگای دادپەروەرییە کاروباری وڵات ڕێك دەخرێ‌و ئاسایش بەرپا دەبێ‌و دانیشتوان مافیان پێشێل ناکرێ, تاکو کۆمەڵ ئۆخەی لەگیانی خۆیان دەکەن, دادپەروەری بناغەی فەرمانڕەواییە, کۆڵەکەی ئاشتی‌و ئاوەدانییە ژیان لەسایەی عەدالەت‌و دادپەروەریدا بەهەشتی جاویدانییە, هەر ووڵاتێك دادپەروەری تێدا بەرقەرار نەبێ دۆزەخێکی پڕ خەم‌و زووخاوە, بۆیە پەروەردگار لەچەند ئایەتدا بانگەوازی ئادەمیزاد دەکاو هەڵیان دەنێ کەهەمیشە هەوڵ بدەن, عەدالەت بەرقەرار بکەن‌و حوکم‌و بڕیاریان لەچوارچێوەی دادپەروەریدا ئەنجام بدەن. بەکورتی: وەکو چۆن پێویستە لەکێشانەو پێوانەدا (کەکردار ئامێزە) بەعەدالەت ئیش بکەن, لەشتی (گوفتار ئامێزیشدا) کەشایەتی‌و بڕیار دەرکردن بەشێکن لێی, دەبێت دادپەروەری ئەنجام بدەن.

شێخی ئبن کەثیر دەفەرموێ: (واللهُ تَعالى يَأْمُـــرُ بِالْعَدْلِ لِكُـــلِّ أَحَدٍ فِي كُـــلِّ وَقْتٍ, وَفِي كُلِّ حالٍ),

واتە: (خوای گەورە فەرمانی کردووە بەدادپەروەری بەرامبەر هەموو کەسێك لەهەموو کاتێکدا, وە لەهەموو بارودۆخێکدا).

ئیمامی ڕازیش لەتەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکێکە لەو کاروبارانەی کەشاراوەن‌و تیایاندا خوای گەورە فەرمانی کردووە بەدانەوەی ئەمانەت, وەموفەسیرینی قورئان فەرموویانە: ئەم ئایەتە فەرمانی کردووە بەوەی کەهەر کاتێ شاهیدیەکتان لابوو, بەڕاستی شاهیدیەکە بدەن‌و درێغی تێدا مەکەن‌و زیادو کەمی مەکەن. هەروەها ئەم ئایەتە فەرمان دەکات کە لەکاتی فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە

دادپەروەربن‌و لەسنوور دەرمەچن. بەڵام زانای پایەبەرز (قاضي عياض) فەرموویەتی: بەڵام مانای ئایەتەکە زۆر لەوە فراوانترە کەبگوترێ تەنها مەبەست پێی شایەتیدان, یان فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەیە, بەڵکو هەموو قسەیەکی ئینسان کە لەدەمی دێتە دەرەوە لەبانگەوازکردن بۆ ئاینی حەقی خوا, وەلەکاتی بەلگەهێنانەوەدا بۆ ڕاستی دین‌و قەناعەت کردن بەکەسی بەرامبەر, ئینسانی موسڵمان دەبێ دادگەر بێ لەقسەو گوفتاریداو بەزمانێکی سادەو ڕەوان قسە بکاو خۆی بپارێزێ لەفەنتازی کردن لەقسەکردنداو بەشێوەیەك قسەبکات کەبەرامبەرەکەی تێی بگاتو مەبەستی ئەوە نەبێ وا خۆی دەربخات کەبەرامبەرەکەی پێی موعجەب بێ! هەروەها ئینسانی موسڵمان لەکاتی فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە بەشێوەیەك ئەم کارە واجبو پیرۆزە ئەنجام بدات کەدادپەروەرانە بێ, واتە بەشێوەیەك قسە بکات کە لەکاتی فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە قسەیەك نەکات کەدڵی ئەو کەسەی خراپەکارەو ئەم ئامۆژگاری دەکات وا بتەزێنێ‌و وا ڕووشکێنی بکات کەجارێکیتر ئامادەی گوێگرتن نەبێ لەدین‌و بەرنامەی خوا. هەروەها لەترسان‌و لەبرسانیش خۆی وا لێنەکات کە لەکاتی قسەکردن لەسەر دین‌و فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە درێغی بکاتو حەقی قسەکردن لەسەر ئەو باسە گرنگە نەدات. هەروەها ئینسانی موسڵمان بەفەرمانی ئەم ئایەتە قورئانییە کاتێ باس‌و بەسەرهاتێکی گێڕایەوە دەبێ تێیدا دادپەروەر بێ‌و وەکو خۆی بەبێ زیادو کەم بیگێڕێتەوەو حەزکردن بەخزمەت بەئیسلام‌و بەرزکردنەوەی کەسایەتی ئیسلامی وای لێنەکات کەزیادەڕەوی بکات لەمەدح کردنی کەسایەتییە موسڵمانەکەو شکاندنی زیادی خەڵکانی بێدین کە لەچیرۆكو مێژووی ئیسلامدا ناویان هاتووە (بەڕاستی ئەم خاڵە زۆر گرنگەو ئەگەر ئینسانەکان ئەم فەرمانەی خوای گەورە جێبەجێ بکەن ئەوە بەڕاستی مێژووی پاكو بێگەرد لەبەردەم نەوەکانی داهاتوودا دەبێ, وەتا ئێستاش کەمێژوو وا نەنووسراوەتەوە کە لەهەموو ڕووداوو بەسەرهاتەکانی دڵنیابین, هەمووی هی ئەوەیە کەمێژوونووسەکە" هەرچەندە موسڵمان‌و دینداریش بووبێ" بەدادگەرانەوە بەپێی فەرمانی خوا باسی ناکردووەو ئەو کەسەی هاودین‌و هاوبیری بووە چاکەو شۆڕەسواریەکانی بۆ زەڕیی دەو سەد کردووەو خراپەو کەموکوڕی‌و هەڵەکانیش" کەمرۆڤ

خاڵی نیه لەهەڵەو کەمتەرخەمی" چاو لێ پۆشیوە!). هەروەها لەم سەردەمەشدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن (بەخوێندنەوەو بیستن‌و بینین)ـەوە, پێویستە ئەم ئایەتە قورئانیەو ئەم ڕاسپاردە ڕەبانییە لەڕووپەڕو بەشی یەکەمی ڕاگەیاندنەکانیاندا بێ‌و بەئاڵتوون بنووسرێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾.

بەڵێ خۆشەویستان, ڕۆشنبیران, نووسەران‌و ڕووناکبیران: ئەمە هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەر ڕاگەیاندن‌و بەیاننامە دەرکردن‌و هەڵوێست دەربڕین کەفێرمانێ دەکات خۆشەویستیمان بۆ کەسێك‌و لایەنێك‌و ڕق لێبوونمان لەکەسێك‌و لایەنێکی تر وامان لێنەکات کە لەکاتی قسەوڕا دەربڕیندا, لەدادگەری لابدەین, کە بەداخەوە ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ هەر لەڕۆژنامەو گۆڤارەوە تا ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و سی دی‌و کاسێت تا کەناڵە ئاسمانیەکان, زۆربەی هەرە زۆریان بەهۆی ئیمان نەبوون بەچاودێری خوایی‌و بڕوانەبوون بەلێپرسنەوەی قیامەت وایان لێهاتووە لەجیاتی ڕووی گەشی ڕووداوە واقیعەکان‌و شەخصیەت‌و کەسایەتیەکان وەکو خۆی بێ زیادو کەم بەمیللەت بناسێنن, بەداخەوە ڕاگەیاندن ئینسانی دز دەکاتە ئەمین‌و فێڵبازو, پاشقولگر دەکاتە سیاسی‌و, ڕەش دەکاتە سپی‌و, ناهەق بەهەق‌و خراپ بەچاك نیشان دەدات.. دەیان شتی ڕزیوو لەگۆڕنراوی زەمانی جاهیلی ئەبوجەهل دێنێتەوە مەیدان‌و بەبەرگی مۆدێرنێتەو سەردەمی نوێ‌و ئازادیەوە دەیڕازێنێتەوەو ئەو ڕزیوو بۆگەنەی زبڵدانی مێژوو وا نیشان دەدات کەهەرکەس زوو فریای نەکەوێت‌و ڕەفتارو کرداری وا نەکات بەدواکەوتوو حیسابە!

خـــۆشەویستان:لەبەرگـــەورەیی‌وگـــــرنگــــی دادگـــەرییە کەووشەی(العَدْلْ) بەموشتەقاتەکانیەوە نزیکەی (30) جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە, هەروەها خوایگەورە یەکێ لەناوە پیرۆزەکانی (العَدْلْ)ـە, کەزانایانی زمان دەفەرموون: (لَفظ العَدْلْ في الأصلِ مصدَرٌ سُمِّي بِهِ فَوُضِعَ مَوْضِعَ وَصْف {العادِلْ}, وَلَفْظُ العَدْلْ أَبْلَغُ في الدَّلالَةِ عَلى صِفَةِ العَدالَةِ مِنْ لَفْظ ـ العَادِلْ ـ).

بەڵێ ووشەی (العَدْلْ) بەلیغترە لەدەلالەت کردنیدا بۆ دادپەروەری, کەچاوگەو لەجیاتی وشەی (العادِلْ) بەکارهاتووە, هەر بۆیە خوای گەورە پاداشتی هیچ کەسێك لەچاکەکاران بەچاکە وەپاداشتی خراپەکاران بەخراپە بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك

نافەوتێنێ، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ ﴾(الانبياء 47).

واتە: ئێمە پێوەرو تەرازووەکانی دادپەروەری لەڕۆژی قیامەتدا دادەنێین‌و هیچ کەس بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێناکرێت، ئەگەر بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك لەکاری چاك یان خراپ ئەنجام درابێ دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کەئاوا بەوردی حساب‌و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین..

هەروەها خوای گەورە سُبْحَانَهُ وَتَعالى کەسەرجەم پێغەمبەرانی ناردووە، هەر بۆ ئەوە بووە کەمرۆڤایەتی فێربکەن کە بەدادگەری‌و یەکسانی ڕەفتار لەگەڵ یەکتریدا بکەن هەروەکو قورئان دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾(الحديد 25)، واتە: بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ڕەوانەکرد بەنیشانەو بەڵگەی زۆری ڕوونەوە وەنامەی ئاسمانی‌و تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن تا مەردوم بەدادو یەکسانی کار بکەن لەگەڵ یەکتریدا.. وەلەناو هەموو پێغەمبەراندا، بەتایبەت پێغەمبەری خۆمان (عَلى نَبِيِّنا وَعَلَيْهِمْ الصَّلاةُ والسَّلام) وەزیفەی یەکەمی دوای ئەوەی کەخوای گەورە بناسێنێ بەعەبدەکانی، ئیشی یەکەمی ئەوەبوو کەدادپەروەری لەناو ئینسانەکاندا بڵاوبکاتەوە، هەروەکو لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ﴾(الشورى 15)، واتە: ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بڵێ: من باوەڕم هێناوە بەو پەیام‌و پەڕاوەی کەخوا ناردوویەتی، وەفەرمانم پێداوە کەدادپەروەری بکەم لەناوتاندا..

بەڕێزان: یەکێکی تر لەو مەیدانانەی کەپێویستە ئینسانی موسڵمان تێیدا دادگەر بێ بریتییە لەو کاتەی کەدەبێتە دادوەر لەنێوان خەڵکیدا، لەو کاتەدا دەبێ بەدادپەروەری حوکم بدەیت‌و خزمایەتی‌و دۆستایەتی لەبەرچاو نەگیرێ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ﴾(النساء 58)، واتە: خوای گەورە فەرمانتان پێدەکات بەدانەوەی سپاردەکان بەخاوەنەکانیان، وەهەر کاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن..

بەڵێ ئینسانی دادپەروەر لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر عەرشی خوادا دەحەسێتەوە هەروەکو حەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إلاّ ظِلُّهُ إِمامٌ عادِلٌ..) (رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم)، واتە: حەوت کۆمەڵ هەن کەخوای پەروەردگار دەیانخاتە ژێر سێبەری ڕەحمەتی خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا کەهیچ سێبەرێك نیە بێجگە لەو سێبەرە، یەکەم کۆمەڵ: پێشەواو فەرمانڕەوای دادپەروەرە..

هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّ المُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلَى مَنابِرِ مِنْ نورٍ، ألَّذينَ يَعْدِلونَ فِي حُكْمِهِمْ، فِي أَهْلِهِمْ وَما وَلُوا)(رَواهُ مُسْلِم)، واتە: دادپەروەران لەقیامەتدا لەخزمەت خوادا دەبن لەسەر مینبەری نوور، ئەوانەی کەدادپەروەرن لەماڵو کەسوکارو ئەوانەدا کە لەژێر دەستیاندان..

ئیمانداران: شتێکی ڕاستەقینەو بەڵگەنەویستە کەتەنها ئیسلامو پەروەردەکەیەتی کەبتوانێت وا لەمرۆڤ بکات کەدادوەرو حەقبێژ بێت بەرامبەر بەهەموو کەس،و، لەبەر خواو لەترسی خوا بەسەر دەروونی خۆیدا زاڵ بێتو بەرژەوەندیەکانی بخاتە لاوە، ئەوە بەڕاستی شتێکی گرانە لەسەر دڵودەروون، بەتایبەت کاتێك ڕاستی لەکەسوکار یان لەخۆت بڵێیت، یان بەهۆی حەق گوتنەوە خۆت یان کەسوکارت تووشی ناڕەحەتیو زیانێك ببن، قورئان دەفەرموێت :

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقِيراً فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً ﴾(النساء 135)، واتە: ئەی کەسانێك کەبڕواتان هێناوە، هەمیشەو بەردەوام پایەداربن لەسەر دادپەروەریو، شایەت بن بۆ خوا لەسەر هەق، هەرچەند ئەو شایەتیدانە زیانی خۆتان یان دایكو باوکتان، یان خزمتانی تێدابێت یان هەژار، ئێوە لەسەر هەقو ڕاستی لامەدەن بۆ کەسیان، چونکە پەروەردگار لەپێشترەو نزیکترە بۆ چاودێری ئەوانە لەئێوە، واتە: مەڵێن ئەو کەسە هەژارە با ئێمە لایەنی ئەو بگرین، چونکە جاری وا هەیە هەقی دەوڵەمەندەکەیە، یان مەڵێن ئەو کەسە دەوڵەمەندە با ئێمە لایەنی بگرین، چونکە جاری وا هەیە هەقی هەژارەکەیە، کەواتە هیچ شتێکی دونیایی نابێت کارتان تێبکاتو لەڕاستبێژیو شایەتیدانی هەق لاتان بدات، وەمەکەونە

شوێن هەواو ئارەزووتان, وەئەگەر زمانتان بگۆڕنو هەق نەڵێن, وەیان لادەنو ڕوو وەرگێڕن لەهەق, ئەوە خوا ئاگادارە بەوەی کەدەیکەن, وەهەموو کەس ڕووبەڕووی پاداشتی کردەوەکانی خۆی دەبێتەوە..

لەئایەتێکی تردا خوای پەروەردگار هەمان دەرسو وانەمان دادەداو پەروەردەمان دەکات لەسەر دادپەروەری لەقسەو گوفتارو کرداراو دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾(المائدة 8), واتە: ئەی کەسانێك کەباوەڕتان هێناوە, ڕاوەستاو بن لەسەر هەقو شایەتی ڕاستی بدەنو با دوژمنایەتیتان بۆ گەلێك واتان لێنەکات کەدادپەروەر نەبن لەگەڵیاندا, چونکە ئەوە نزیکە لەپارێزکارییەوە, لەخوا بترسنو پارێزکاربن, خوا ئاگادارە بەکارەکانتان..

ئەمانەو چەندین ئایەتی تر کەهەموویان جەخت لەسەر وەصیەتەکەی خوای گەورە دەکەنەوە کەئێستا لەخزمەتیداینو دەفەرموێ:﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾(الأنعام 152)

بەڵێ ئیمانداران: پەروەردەی ئیسلامی توانی ئەو نەفامو نەخوێندەوارانە کە لەگەڵو هۆزو عەشرەتپەرستیدا توابوونەوە, بەجۆرێکی ئەوتۆ پەروەردە بکات کەهەمیشە حەقبێژ بن لەکاتێکدا کە (أنْصُرْ أخاكَ ظالِماً أوْ مَظْلوماً) لەناویاندا باوبوو, واتە: براکەت سەربخەو هاوکاری بکە ئەگەر ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو, تیرەو هۆزەکەیان ئەوەندە لا پیرۆز بوو کوێرانە دوای دەکەوتن لەهەقو ناهەقدا, هەروەکو یەکێ لەشاعیرەکانیان دەڵێت :

وَهَلْ أنا إلاَّ مِنْ ( غُزَيَّةَ ) إنْ غَوَتْ غَوَيْتُ وَإنْ تَرْشُدْ ( غُزَيَّةَ ) أرْشُدُ

واتە: من یەکێکم لەتیرەی (غوزیە) ئەگەر خوار بڕوات خوار دەڕۆمو ئەگەر ڕاست بڕوات ڕاست دەڕۆم ..

بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ئەو بیرو بۆچوونەی گۆڕیو فەرمووی: براکەت سەربخە ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو, موسڵمانان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا, چۆن ستەمکار بێت سەری بخەین؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر ستەمکاربوو ڕێی لێبگرنو مەهێڵن لەسەر زوڵموستەمەکەی بەردەوام بێو لەناحەقیدا پشتیوانی مەکەنو

کۆمەکی مەکەن, بەڵکو پێی بڵێن کەتۆ ناحەقیو ئێمە براو خزمت نین بۆئەوەی بەپشتیوانی ئێمە زوڵموستەم لەخەڵکی بکەیت, فەرمووی: ئەو ئامۆژگاریە جوانەو بەئاگاهێنانەوەیە ئەوە سەرخستنی براکەتەو ئەوە پشتیوانی لێکردنو دڵسۆزیە, چونکە ناهێڵێ لەدونیاو قیامەتدا بەئاگرو نەگبەتی زوڵموستەم بسووتێ.

بەڵێ, تەنها ئیسلام توانی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو پلەیە کەهەمیشە حەق بڵێت ئەگەر زیانی خۆیو کەسوکاریشی تێدابێت. لەملاولەولا ڕەنگە کەسێك لەکۆمەڵگایەکی نەفامیدا شتێکی وا بکات لەبەر هەرهۆیەك بێت, بەڵام کەهەموو خەڵکی یان زۆربەیان بخرێنە سەر ئەو ڕێگایە, ئەوە هەرگیز نەبووەو نابێت, چونکە خۆپەرستی (الأنانية) هێزێکە وا لەقوولایی دەروونی مرۆڤدا, وەتەنها ئیمانو بڕوایە دەتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دوای فەتحی خەیبەر, عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەی نارد بۆ لای جوولەکەکان تا بەروبوومی ئەهلی خەیبەر بخەملێنێتو لەگەڵیاندا بیکات بەدوو بەشەوە بەپێی ئەو پەیمانەی کەبەستبوویان لەگەڵ پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ,جوولەکەکان ویستیان بەرتیل بدەن بەعەبدوڵلا تاوەکو لەخەملاندنەکەدا کەم دابنێتو چاوی لێیان بێت, ئەویش فەرمووی: بەخوا بزانن لای خۆشەویسترین کەسمەوە هاتوومو بەخوا ئێوەش لەلام لەمەیموونو بەراز خراپترنو زیاتر ڕقم لێتانە, بەڵام دڵنیابن, نە خۆشەویستیەکەم بۆ ئەوو نە ڕقەکەم بۆ ئێوە, وام لێناکات دادپەروەر نەبم لەگەڵتاندا, ئەوانیش گوتیان: ڕاست دەکەیت, ئاسمانەکانو زەوی لەسەر ئەو دادپەروەریەیە ڕاوەستاون!

بەڵێ, قورئانی پیرۆز بەهۆی پەروەردە تاقانە بێوێنەکەیەوە هەردەم دەتوانێت خەڵکانی دادپەروەرو حەقبێژ فەراهەم بێنێت, لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی ئیسلام بەهەزاران ڕووداوی لەسەر ئەم ڕاستیە تۆمارکردووە, ئەوەش کــــەتۆمارنەکــــراوە لەژمارە نایەت.

بەڕێزان: گوێبگرن بۆ ئەم بەسەرهاتە شیرینە کەدادپەروەری پێغەمبەری خوامان صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بۆڕوون دەبێتەوە کەچۆن ئایەتی ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا﴾ی بەکردەوە جێبەجێکرد چونکە (كانَ خُلُقُهُ القرآن) ..

خەولەی کچی قەیس کەخێزانی سەرکردەی شەهیدانی ئیسلام حەزرەتی (حەمزەی کوڕی عبدالمُطَّلب)ـە (ڕەزای خوایان لێبێت), بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کابرایەك لە(بەنی ساعیدە) هەندێ خورمای بەقەرز بەپێغەمبەری خوا دابوو, دوای تەواوبوونی ماوەی قەرزەکە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم‌و داوای قەرزەکەی کردەوە, پێغەمبەری خواش فەرمانی کرد بەپیاوێك لەیاریدەدەرانی مەدینەیی کەبچێ خورماکە بداتەوە بەخاوەنی خورماکە! بەڵێ کابرا لەگەڵ خاوەن قەرزەکەدا ڕۆیشت‌و بردیە ئەو شوێنەی کەخورمای لێبوو, خورماکەی بۆ کێشاو دایەوە, بەڵام کابرای خاوەن خورما تەماشایکرد ئەم خورمایە وەکو خورماکەی خۆی باش نیەو بەدڵی نەبوو, بۆیە گوتی: من ئەم خورما خراپە لەجیاتی خورما چاکەکەی خۆم کەکاتی خۆی بەقەرز داومە بەپێغەمبەری خوا وەری ناگرمەوەو خورمای باشم دەوێ, کابرای مەدینەیی تووڕەبوو گوتی: (أتَردُّ عَلى رَسولِ الله؟) ئەوە تۆ شت بەسەر پێغەمبەری خوادا دەدەیەوە؟! کابرا گوتی: (نَعَمْ, وَمَنْ أحَقُّ بِالعَدْلِ مِنْ رَسُولِ الله؟) بەڵێ, شتی خراپ لەجیاتی شتی باش وەرناگرمەوەو نامەوێ, باشە چ کەسێك لایەقترە بەوەی کە بەدادپەروەری حەقی خاوەن ماف بداتەوە لەپێغەمبەری خوا؟

بەم شێوەیە هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم‌و هەموو بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە, پێغەمبەری خوا هەردوو چاوی پیرۆزی پڕبوو لەفرمێسکی خۆشی‌و فەرمووی: (صَدَقَ, وَمَنْ أحَقُّ بِالعَدْلِ مِنِّي, لا قَدَّسَ اللهُ أُمَّةً لا يَأْخُذْ ضَعيفُها حَقَّهُ مِنْ شَديدِها, وَلا يَتَعتَقَهُ), فەرمووی: ئەم کابرا خاوەن قەرزە ڕاست دەکات, ئایا چ کەسێك لەمن لایەقترە بۆئەوەی کەمافی خەڵکی بەدادپەروەری بداتەوە ؟ خوای گەورە ئەو گەل‌و میللەتە بەرز ناکاتەوەو خۆشی ناوێن لەکاتێکدا کەهەژارو بێدەسەڵات‌و بێکەسیان نەتوانێ داوای مافی خۆی لەدەستدارو دەسەڵاتدار بکات‌و حەقی خۆی بەتەواوی لێ وەربگرێتەوە.

ئەمجا فەرمووی: ئەی خەولەی کچی قەیس کەئامۆژنمی, برۆ خورمایەکی زۆر باشی بدەوەو ئەو خورمایەی بدەوە کەدڵی پێی ڕازی دەبێ, چونکە: (فَإنَّهُ لَيس مِنْ غَريمٍ يَخْرُجُ مِنْ عِنْدِ غَريمِهِ راضياً إلاَّ صَلَّتْ عَلَيْهِ دَوابُّ الأرْضِ, وَنونُ البِحارِ, ولَيس مِنْ عَبْدٍ يَلْوي غَريمَهُ وَهُوَ يَجِدُ, إلاَّ كَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ في كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ إثْماً), واتە: هەرکاتێ خاوەن قەرز لەکاتی

دیاریکراوی قەرز وەرگرتنەوەدا چوو بۆ لای قەرزارەکەو ئەویش بەڕووی گەش و دڵی فراوانەوە هەروەکو یەکەمجار کەقەرزەکەی وەرگرتبوو، ئاوا بەڕووخۆشیەوە قەرزەکەی دایەوەو دڵی خاوەن قەرزەکەی ڕازیکرد، ئەوە زیندەوەرانی سەر زەوی‌و ماسی دەریاکان دوعای خێری بۆ دەکەن، وەهەر قەرزارێ لەکاتی دیاریکراوی دانەوەی قەرزەکەدا توانای هەبوو، پارەوماڵەکەی لەبەردەستدابوو، بەڵام ئامادە نەبوو قەرزەکە بداتەوە، تاوەکو خاوەن قەرزەکە بێئومێدبوو لەوەرگرتنەوەی چونکە هەر ئەمڕۆ سبەی پێکردبوو، ئەوا بەهەموو شەوو ڕۆژێك کەئەم قەرزارە بەناڕەوا دەست بەسەر ئەو ماڵەدا دەگرێ، خوا تاوانێکی لەسەر دەنووسێ..

بەڵێ ئیمانداران: یەکێ لەو بوارانەی کەنیشانەی پێشکەوتن یان دواکەوتنی کۆمەڵ دەردەخات بواری دادگاو قەزایە. جا بابزانین ئەم وەسیەتەی خوای گەورە کەفەرمووی: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾ لەم لایەنە گەورەو گرنگەدا چۆن ڕەنگی داوەتەوەو بەرگی کرداری بەبەرداکراوە!

سەردەمی زێڕینی پڕ دادگەری حەزرەتی عومەری کوڕی خەطابە (ڕەزای خوای لێبێت)، کابرایەکی جوولەکە دێتە خزمەت ئیمامی عومەرو شکاتی هەیە لەئیمامی عەلی، بەپێی یاسای دادگا، ئیمامی عومەر دەنێرێت بەشوێن ئیمامی عەلیداو ئاگاداری دەکات کەئەم جوولەکەیە شکاتی لێت هەیە. بەڵێ گفتوگۆ دەست پێدەکات‌و هەریەك لەئیمامی عەلی‌و جوولەکە قسەی خۆیان دەکەن، لەکاتی گفتوگۆدا ئیمامی عومەر هەروەکو عادەتی جارانی، بە (أبا الحَسَنْ) بانگی‌دەکات‌و قسەی لەگەڵ دەکات. لەدانیشتنەکەدا تووڕەیی‌و ناڕەزایی بەدەم‌وچاوی ئیمامی عەلییەوە دەبینرێ، ئیمامی عومەر هەست بەمە دەکات‌و دەفەرموێ: ئەی (باوکی حەسەن) ئەوە پێت ناخۆشە لەگەڵ جوولەکەیەکدا لەبەردەم دادگای ئیسلامدا ڕاوەستێنراوی؟! ئیمامی عەلی فەرمووی: نەخێر، لەبەر ئەوە تووڕە نیم کە لەگەڵ جوولەکەیەکدا بانگ دەکرێم بۆ دادگا، ئەوە شتێکی ئاساییە بەلامەوە، بەڵام ئەوەی بووە مایەی دڵگرانیم ئەوەیە کە بەیەکسانی بانگت نەکردین، بەڵکو فەزڵی منت دا بەسەر جوولەکەکەداو ئەوت بەناوی خۆیەوە بانگ کرد، بەڵام منت بە (باوکی حەسەن) بانگ کرد، کە لەلای عـــەرەب ئـــەمـــە بۆ ڕێز لێنان‌و مـــەدح بەکار دەهێنرێ کەدەبوایە بانگی منیشت

بە(عەلی) بکردایەو لەناوهێناندا جیاوازیت نەکردینایە!

بەڵێ ئیمانداران: ئیسلام هانی ئیمانداران دەدات کەدادپەروەربن بەرامبەر ئەو کەسانەش کەخۆشیان ناوێو حەز بەچارەی ناکەن, چونکە خوای گەورە فەرمانیداوە بەدادپەروەریو پاشان فەرمانیداوە بەنوێژ, هەروەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾( الأعراف 29 ).

زەیدی کوڕی خەطاب, برای حەزرەتی عومەر, لەگەڵ کۆمەڵێك دەشتەکیدا ڕۆیشت تا فێری ئیسلامەتییان بکات, لەڕێگا لێی هەڵگەڕانەوەو شەهیدیان کرد, ئەمەش برینێکی قووڵی لەدەروونی حەزرەتی عومەردا دروستکرد. پاش ماوەیەك ئەوانە موسڵمان بوونەوەو کاتێك هاتنە لای حەزرەتی عومەرو ئەویش قسەی بۆ دەکردن, سەیری ئەوەیانی نەدەکرد کەبکوژی براکەیبوو, وەلەبەر ئەوەی موسڵمان ببوو نەیدەتوانی هیچ بکات بەرامبەری, کابراش هەستی پێکرد کە چ تاوانێکی کردووەو چەند حەزرەتی عومەریش بێتاقەتە لێی, بۆیە پرسیاری لەئیمامی عومەر کرد کەمن بەو کارەم دیارە زۆر ئازارم داوی بۆیە حەزناکەی سەیرم بکەیو چاوت پێم بکەوێ؟! حەزرەتی عومەر فەرمووی: بەڵێ هەر وایە, تۆ بکوژی برا مەزڵوومەکەمی کە بەخیانەت شەهیدت کردو ئێستا بەهۆی موسڵمان بوونتەوە ناتوانم تۆڵەت لێبکەمەوە. کابرا گوتی: باشە ئەوە وات لێدەکات کەتۆ سەرکردەی موسڵمانانیو منیش هاوڵاتیەکم لەمافو حەقی خۆم کەهەمە لەحکومەتداو بەئیمزای تۆ نەبێ نامدرێتێ, ئایا لەو مافەی خۆم بێبەشم دەکەی؟ حەزرەتی عومەر فەرمووی: نەخێر, هەرگیز ئەو ڕق لێبوونەم بۆت وام لێناکات دادپەروەر نەبم لەگەڵتاو لەمافی خۆت بێبەشت بکەم! کابراش گوتی: دە ئیتر خۆشیشت نەوێم گرنگ نیە مادام هەقو مافم پارێزراو بێ!

بەڵێ بەڕاستی ئەمە لووتکەی دادپەروەرییە کەدنیا بەخۆیەوە نەبینیوە مەگەر لەسەر دەستی ئیسلامدا, کەپەندو وانەیە بۆ هەموو موسڵمانێك کەهەقی هەموو خاوەن هەقێك بدەن.

بەڵێ موسڵمانان: بۆ دادپەروەری لەدادگاو قەزاداو یەکسانی خەڵکی لەبەردەم دادگای پڕ عەدالەتی ئیسلامیدا نموونەی زۆرمان هەیە کەگەورەیی ئەم ئیسلامە دەردەخات.

فەرموون لەگەڵ چەند نموونەیەك لەمێژووی پرشنگداری ئیسلامەوە:

دەگێڕنەوە کەئیمامی عەلی زرێپۆشەکەی لێ ون دەبێتو دەکەوێتە لای کابرایەکی جوولەکە, کاتێك ئیمامی عەلی دەزانێت زرێپۆشەکەی لای ئەو جوولەکەیەیە شکاتی لێدەکات, بەمەرجێ ئیمامی عەلی خۆی خەلیفەبوو, دەیتوانی بێ سێودوو کردن لێی بسەنێتەوە! لەڕۆژی دیاریکراودا ئیمامی عەلیو جوولەکەکە لەبەردەم قازیدا وەستانو هەریەکە قسەی خۆی کرد, قازی بەخەلیفەی گوت: من دەزانم کەتۆ ڕاست دەکەیت بەڵام بەڵگەی وات بەدەستەوە نیەو تەنها حەسەنی کوڕیشت شایەتتەو شاهیدی کوڕیش بۆ باوکی قبووڵ نیە, ئەوا بڕیارماندا زرێپۆشەکە بۆ جوولەکەکە بێت, ئیمامی عەلیش ڕازیبوو بەبڕیاری دادگا. ئەم ڕووداوە کاری لەجوولەکەکە کردو گوتی: من شایەتی دەدەم کەئەمە ڕەوشتی پێغەمبەرانەو ئەم ئاینەش هەقەو زرێپۆشەکەش هی ئیمامی عەلییە, وەمن لەسەر دەستی ئێوەدا موسڵمان بوونی خۆم ڕادەگەیەنم: أشْهَدُ أن لا إلهَ إلاّ اللهُ وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهُ.

نموونەیەکی تر لەسەر بوێری قازیو حاکمی ئیسلامی لەدادگادا کەقسەو حوکمی حەقیکردووە بەرامبەر گەورەی موسڵمانانو هەرچەندە ئەو موەزەفێكو فەرمانبەرێکی بچووك بووە لەچاو ئەمیری ئیمانداراندا بەڵام ڕاستیو دادپەروەری وای لێ نەکردووە قسەی حەق نەکاتو ئایەتی ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾ جێبەجێ نەکات, مێژووی ڕاستەقینە دەڵێ:

یەکێ لەفەرماندە سەربازییە گەورەکانی جەیشی ئیسلامی سەردەمی خەلافەتی هاروونە ڕەشید, کەخزمیشیبوو, بۆ دەربڕینی شایەتیەك کەلایەنیو پێویستە لەدادگای ئیسلامیدا شایەتیەکەی بدات, دەچێتە خزمەت ئیمام أبي یوسف (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەڵام قازی (ئەبی یووسف) دەفەرموێ: ناتوانم شایەتی تۆ وەربگرمو تۆ بەشاهید ناشێی! کابرای لێپرسراوی عەسکەری زۆر تووڕەو قەڵس دەبێ کەقازی ئاوای پێ دەڵێ بۆیە یەکسەر دەچێتە لای هاروونە ڕەشیدو شکات لەقازی دەکات, هاروونە ڕەشید بۆ خۆی دێتە لای قازیو دەفەرموێ: قوربان بۆچی شایەتی فلان کەس کەقائیدێکی عەسکەری لەشکرەکەمەو لەهەمانکاتدا خزمیشمە ڕەتکردۆتەوەو قبووڵت نەبووە

بەشاهید؟ قازی دلێرو حەقبێژ دەفەرموێ: لەبەر ئەوە قبوولّی ناکەم چونکە پێش ئەوەی ببمە قازی رۆژێکیان لەخزمەتتدا دانیشتبووم، ئەم فەرماندەیەشی لێبوو، بەجەنابتی دەگوت: (أنا عَبْدُ أميرِ المُؤْمنين) من بەندەو کۆیلەی ئەمیری ئیماندارانم! جا قوربان، ئەگەر ئەو قسەیەی ڕاست بێو کۆیلەو عەبدی تۆ بێ، ئەوە شاهیدی عەبد وەرناگیرێ، چونکە خاوەنی خۆی نیەو بیروڕای سەربەستو ئازاد نیە، خۆ ئەگەر قسەکەیشی درۆ بێ کەخزمەتکاری تۆ نیە، ئەوە درۆزنیش بەشاهید وەرناگیرێ، کەواتە لەم دوو لایەنەش بەدەر نیەو ئەم فەرماندە عەسکەرییە بۆ شاهیدیدان دەست نادا!

هاڕوونە ڕەشید فەرمووی: باشە وا شاهیدی ئەوت وەرنەگرت، بەڵام من خۆم لەنزیکەوە ئاگام لەو کێشەیەیەو دەتوانم شاهیدی تێدا بدەم، ئایا من بەشاهید وەردەگری؟ قازی ئەبی یووسف فەرمووی: نەخێر، تۆش بەشاهید وەرناگرم! هاڕوونە ڕەشید زۆر بەسەرسووڕمانەوە فەرمووی: باشە ئەی شایەتی من لەسەر چی ڕەت دەکەیتەوەو بەشاهید قبوولّت نیم؟ قازی فەرمووی: (لأنَّكَ تَتَكَبَّر عَلى الله فَلا تَخْرُج إلى الجَماعَة وَلا تُصَلِّي مَعَ عامَّةِ المُسْلِمين، وَهذا تَكَبُّرٌ عَلى الله، وَلا يَليقُ بِالعَبْدِ هذا..) فەرمووی: لەبەر ئەوە شاهیدیەکەت وەرناگرم، چونکە تۆ کەپێشەوای موسڵمانانی تەکەبور بەسەر خوادا لێدەدەیو نایەی بۆ نوێژی جەماعەت بۆ مزگەوتو لەگەڵ کۆمەڵی موسڵماناندا نوێژ ناکەیتو بەتەنها لەماڵەوە نوێژەکانت دەکەیت، ئەمەش کارێکی ناڕەوایەو نابێ بەندەی خوا بەرامبەر بەخوا وابێو مادام تۆ پێشەوای ئیماندارانی دەبێ لەناو ئیمانداراندا نوێژ بکەیو تێکەڵیان بکەیو لێیان بپرسی!

هاڕوونە ڕەشید فەرمووی: ڕاست دەکەی، من تا ئێستا هەڵە بووم، تۆبە بێ لەقاپی خوا. هەر لەو کاتەشدا فەرمانی دەرکرد کە لەبەرئەوەی مزگەوتەکە لەماڵەکەیەوەو لەکۆشکی خەلافەتەوە زۆر دوورەو ناتوانێ هەموو جەماعەتێك بگاتە ئەو مزگەوتە، فەرمانی دەرکرد کەوا مزگەوتێکی جوانو گەورە لەبەردەم کۆشکی خەلافەتو ماڵەکەیدا دروست بکرێو هەموو جەماعەتێك لەگەڵ موسڵماناندا بەکۆمەڵ نوێژ بکات (دیارە ئەو کاتە، قازی شایەتیەکەی لێوەرگرتووە!).

بەڵێ خۆشەویستان: ئەم قازی (ئەبی یووسفە) لەگەڵ ئەو هەموو حەقبێژیو دادگەریو نەترسییەدا کەچی بۆ خۆی باسێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕۆژێکیان لەدادگادا دانیشتبووم کابرایەکی گاور هاتە لامو داوای تۆمارکرد لەسەر ئەمیری ئیمانداران هارونە ڕەشید کەوا زەویەکی لێ داگیرکردووە, قازی دەفەرموێ: گوتم: ئەو زەویە ئێستا بەدەستی کێوەیە؟ گوتی: بەدەستی خەلیفە هارونە ڕەشیدەوەیە, گوتم: کێ بەزەمی ئەو زەویە کۆدەکاتەوەو دەیفرۆشێ ؟ گاورەکە گوتی: خەلیفە هارونە ڕەشید. منیش داواکەیم ئیمزا کردو ئیزنمدا بۆ ڕۆژی دیاریکراوی مەحکەمە. بەڵێ لەڕۆژی مەحکەمەدا کەخەلیفە هارونە ڕەشید خۆی ئامادەی دادگا دەبوو, یەك بەیەك خەڵکەکەمان بانگ کردە ژوورەوەو کێشەکانیان کۆتایی هات تا سەرە گەیشتە سەر کابرای گاورو هاتە ژوورەوەو لەبەردەم دادگادا وەستا, داواکەیم خوێندەوەو بەخەلیفەم گوت ئەم دەعوایە لەسەر تۆ تۆمارکراوە, ئایا قسەت چییە؟ هارونە ڕەشید فەرمووی: ئەم پارچە زەویەم لە (مەنصوور)ەوە بۆ ماوەتەوەو هیچ پەیوەندیەکی بەم گاورەوە نیە. قازی دەفەرموێ: بەکابرای گاورم گوت: گوێت لێبوو خەلیفە چی دەڵێ, ئایا تۆ کەداواکاری لەسەر ئەو پارچە زەویە, هیچ شاهیدت هەیە؟ کابرای گاور گوتی: نەخێر, بەڵام کەمن شاهیدم نیە پێویستە خەلیفە هارونە ڕەشید سوێندم بۆ بخوات کەئەم زەویە موڵکی من نیە! سُبْحانَ الله لەو دادگەریە, لەو ئازادیو سەربەستییە, گاورێك لەخاکی ئیسلامدایەو دژ بەدینی موسڵمانانە, بەڵام بەئازادی داوا دەکات دەبێ خەلیفەی هەموو موسڵمانان سوێندی بۆ بخوات, کەئەمە مێژووی مرۆڤایەتی, نە لەوەوپێشو نە لەمەودوایش بەخۆیەوە بینیویەتیو نەدەشیبینێ! بەڵێ خەلیفە بەقورئانی پیرۆز سوێندی خواردو گاورەکە دڵی قەناعەتیکردو گومانەکەی نەماو کێشەکە کۆتایی هات!

قازی ئەبی یووسف کەئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (فَما أخافُ عَلى نَفْسي إلاّ مِنْ هذا) دەفەرموێ: بەخوا لەهەموو ژیانی قازیەتیو دادگامدا, لەهیچ شتێکدا ترسم نیە کەزوڵمم کردبێو مافو حەقی هەموو خاوەن مافێکم وەرنەگرتبێتەوە, بەڵام بەخوا لەم بەسەرهاتەدا لەخۆم دەترسم کەخوا لێم تووڕە بووبێو تەواو دادگەر نەبووبم! ئەو کەسانەی لەدەوری بوون عەرزیان کرد: باشە دادگەری لەوە زیاتر چی بێ

کەئەوەی شەرع فەرموویەتی جێبەجێت کردووەو خەلیفەی موسڵمانانت بۆ گاورێك سوێند داوە؟! ئیتر لەچی دەترسی؟ فەرمووی: (مِنْ تَرْكِي أَنْ أُقْعُدَهُ مَعَهُ فِي مَجْلِسٍ واحدٍ) فەرمووی: لەوە دەترسم کەمن درێغیم کرد لەوەدا کەخەلیفە هاروونە ڕەشیدم لەگەڵ ئەو گاورەدا لەیەك مەجلیسدا نەوەستاند, چونکە کابرای گاور کەداواکاربوو بەپێوە وەستابوو, خەلیفەش کەداوالێکراو (مُدَّعى عَلَيْه)بوو لەسەر کورسی لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو کەدەبوایە ئەویش لەکاتی مەحکەمەدا بەپێوە بوەستایەو دانەنیشتایە! چونکە لەشەرعدا وەکو ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: هەرکاتێ دوو کەس چوونە لای حاکمی موسڵمانانو دادگای شەرعی, واجبە حاکم لەپێنج شتدا جیاوازی لەنێوان ئەو دوو کەسەدا (واتە: داواکارو داوالێکراو) نەکات:

**یەکەم:** دەبێ هەردووکیان بەیەکەوە لەیەك کاتدا بانگ بکاتە ژوورەوە, نەك یەکێکیان بەهۆی پلەوپایەی لەدەوڵەتدا, یان بەهۆی خزمایەتیو دۆستایەتیەوە پێشتر بچێتە ژوورەوە بۆ لایو ئەوی تریان دواتر.

**دووەم:** وەلەکاتی دانیشتن لەبەردەم مێزی حاکمدا دەبێ هەردووکیان لەیەك ئاستدا بن, واتە ئەگەر یەکیان بەپێوە وەستا دەبێ ئەوی تریشیان بەپێوە بوەستێ, ئەگەر یەکێکیشیان دانیشت ئەوی تریشیان دابنیشێ.

**سێیەم:** حاکم لەتەماشاکردنو ڕووتێکردندا جیاوازیان نەکات, نەك هەر قسە بۆ یەکیان بکاتو تەماشای ئەوی تریان نەکات.

**چوارەم:** لەکاتی گوێگرتندا, دەبێ گوێ بۆ قسەی هەردووکیان بگرێو قسە بەهیچیان نەبڕێ تا ئەوەی هەیانە دەری ببڕن.

**پێنجەم:** بەپێی شەریعەتی ئیسلامی سزایان بەسەردا بداو تەماشای ئەوە نەکات کەئەوە فلان کەسەو سجن کردن یان تۆڵە لێکردنەوە شایانی ئەو نیەو بەڵام ئەگەر هەژارو بێکەس بوو, حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ بکات!

وەئەمە هەر قسە نیەو مێژووی ئیسلامی بەکردەوە لەدادگاکانیدا هەزاران نموونەی بەکردەوەی ئەنجامداوەو لەو کاتەوەی ئیسلام حاکم نیە مەگەر هەر لەدووتوێی کتێبە شەرعیەکاندا بیخوێنینەوەو جاروبار لەمینبەری مزگەوتەکانەوە باسی لێبکرێ, وەئەگەر

لەیاسای دەستکردی مرۆڤدا باسی یەکسانیو دادپەروەری کرابێ هەر مەرەکەبی سەر کاغەزەو هەرگیز نەبووەو نەمانبینیوە سەرۆکی وولاتێك لەگەڵ هاولاتیەکدا کەکەمینە نەتەوەی وڵاتەکەیە، بەیەکەوە بەرامبەر دادگا بوەستێنرێن! بەڵکو لەبزربوونی حوکمی خوادا کێ دەتوانێ داوا لەسەر دەسەلاتدارو زۆردارو پایەدارو پارەدارێك تۆماربکات!

بەرێزان: رووداوێکیتر لەسەر سەربەخۆیی دادگای ئیسلامیو حوکم کردنی حاکم بەئایەتی ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾، کەخۆشەویستی خەلیفەو کاربەدەستو خزمایەتیو تەماعی هێشتنەوە لەپلەوپایەدا وای لەدادوەر نەکردووەکە لەیاسای شەریعەتی ئیسلامی لابداتو حەقو راستی وەکو خۆی بێ زیادوکەم نەڵێ.

رۆژێکیان خەلیفەی موسڵمانان (المُعْتَضَد) نوێنەری تایبەتی خۆی دەنێرێت بۆ لای قازی موسڵمانانو دەفەرموێ: بەقازی بڵێ: فلان کەس ماوەی چەند ساڵە قەرزارمەو پارەیەکی بەبڕی ئەوەندە لایەو چەند جار داوام کردووە نەیداومەتەوە، ئەمرۆ بیستم کە بەهۆی کەڵەکەبوونی قەرز لەسەری، خاوەن قەرزەکان هاتوونە لاتو دوای بەراست وەرگرتنی داواکانیان بەپێی شەرع، دەستت بەسەر ماڵەکەیدا گرتووەو بڕیارت داوە بەسەر خاوەن قەرزەکاندا دابەشیبکەیت، جا تکام وایە کەمنیش بەیەکێ لەو خاوەن قەرزانە بنووسەو بەڵکو شتێکم لەقەرزەکەم دەست بکەوێتەوە! قازی بەنوێنەری خەلیفەی گوت: سەلام لەخەلیفە بکەو بڵێ: قازی گوتوویەتی" بەخەلیفە بڵێ ئایا لەبیری ماوە کاتێ کەبووم بەقازی هەر خۆی پێی گوتم کەداوای هیچ داواکارێك وەرنەگرم مەگەر شاهید لەسەر راستی داواکاریەکەی هەبێ، جا ئەگەر خەلیفە شایەتی هەیە لەوەدا کەدەڵێ قەرزم لای فلان کەسە، ئەوە با شاهیدەکانی بێنێ بۆ دادگاو منیش بڕیاری بۆ دەردەکەم! بەڵێ نوێنەرەکە گەرایەوە بۆ لای خەلیفەو ئەم باسەی بۆ گێرایەوە، خەلیفە فەرمووی: بەڵێ قسەی جەنابی قازی زۆر راستەو من دوو شاهیدم هەیە کەکاتی خۆی ئاگاداربوون بەوەی کەمن ئەو پارەیەم بەو کەسە داوەو هەردوو شاهیدەکەشم پیاوی باشو راستگۆو دیندارن! نوێنەرەکە رۆیشتەوە بۆ لای قازیو قسەی خەلیفەی پێگەیاند، قازی فەرمووی: زۆر باشە، بەلام دەبێ من خۆم شاهیدەکان ببینمو بەپێی یاسا لەشاهیدەکان بکۆڵمەو کەئایا شاهیدیان قبووڵ دەکرێ یان نا، چونکـــە تەنها قسەی خـەلیفە کـەدەڵێ

پیاوی باشن بەس نیە بەتایبەت لەکاتێکدا کەشاهیدی بۆ خۆی دەدەن!

بەڵێ خەلیفە داوای لەشاهیدەکان کرد کەبچنە لای قازیو شاهیدی بۆ بدەن کەفلان کەس قەرزاری خەلیفەی موسڵمانانە, بەڵام دوو شاهیدەکە هەریەکەی بەجۆرێك خۆی لەشاهیدی دانەکە دزیەوەو شاهیدیەکەیان نەدا, بۆیە قازی ناوی خەلیفەی نەخستە ناو لیستی خاوەن قەرزەکانەوەو داواکــەی ڕەتکردەوەو خەلیفەش هیچ نارەزاییەکی دەرنەبڕی!

ئیمانداران: جارێکی تر وەصیەتو ڕاسپاردەکەی خوای پەروەردگار دووبارە دەکەینەوە کەدەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾..

با نموونەیەکی زێڕینترتان عەرزبکەم لەسەر جێبەجێکردنی بەکردەوەی ئەم وەصیەتە پیرۆزە کەموسڵمانی ڕاستەقینەو دەرچووی مەدرەسەی قورئانو پەروەردەکراوی دەستی بەسۆزو پڕ ڕەحمەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم چۆن خۆشەویستی بۆ جگەرگۆشەو بەرهەمی دڵی خۆی, کەئینسان ڕۆڵەو ئەولادی لەخۆی خۆشتر دەوێ, بەڵام ئەم هەموو خۆشەویستیو سۆزە وای لێناکات کەلەحەق لابداتو قسەی حەق نەڵێو لەگوفتارو دەربڕیندا دادگەر نەبێ. فەرموون گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتەشیرینە بگرن:

قازی دادپەروەرو بەناوبانگی ئیسلام (شورەیحی قازی), ڕۆژێکیان کوڕەکەی دەچێتە خزمەتیو لێی دەپرسێ: باوکە گیان, بەهۆی معامەلەو کڕینو فرۆشتنەوە کێشەیەکم لەگەڵ کەسێکدا بۆ دروست بووە, جا باسەکەت بۆ دەگێڕمەوە, ئەگەر شەرعو دادگا لەپشتیوانی مندایەو من سەردەکەوم ئەوە شکاتی لێدەکەمو داوای لەسەر تۆمار دەکەم, ئەگەر شەرعیش ماف دەدات بەو ئەوە نایهێنمە دادگاو بەهەر جۆرێك بێ ڕازی دەکەمو صوڵحی لەگەڵ دەکەم! قازی شورەیح دەفەرموێ: دەی بەسەرهاتو کێشەکەتم بۆ باس بکە. کاتێ بۆی باسکرد فەرمووی: برۆ بیانهێنە بۆ دادگاو شەرعیان لەگەڵ بکە. کوڕەکەش لەسەر قسەی باوکی داوای تۆمارکردو هەردوولا لەکاتی دیاریکراودا بانگ کران بۆ دادگا. بەڵام کاتێ هەردوولا قسەی خۆیان کرد, قازی شورەیح فەرمووی: بەپێی شەرع مافی ئەو کەسەیەو کوڕی خۆم تۆ دەبێ حەقی تەواوی خۆی بدەیەوە! کاتێ ئێوارە قازی

شورەیج ڕۆیشتەوە بۆماڵەوە کوڕەکەی هاتە خزمەتیو بەگلەییو عاجزیەوە گوتی: بابە گیان: (وَاللهِ لَوْ لَمْ أَتَقَدَّم إِلَيْكَ لَمْ أَلُمْكَ) بەخوا ئەگەر پێشتر نەهاتمایە خزمەتتو پرسم پێنەکردیایەو تۆ نەتفەرموایە حەقو مافی تۆیە, ئێستا کەحەقیشت دا بەبەرامبەرەکەم هیچ گلەییو دڵ عاجزیەکم نەدەبوو, خۆ من بەبێ زیادوکەم باسەکەم بۆ گێڕایتەوەو فەرمووت حەق بەتۆیە, هەرهەمان قسەش لەدادگادا کرا کەچی حەقت دا بەکەسی بەرامبەرمو من ئەو نیوە پارەیەی کە لەصوڵحو ڕێککەوتنەکە دەستم دەکەوت ئەویشم لەدەست چوو! شورەیجی قازی بەسۆزەوە سەیرێکی کوڕەکەی کردو فەرمووی: (وَاللهِ يا بُنَيَّ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ ملء الأَرْضِ مِثْلَهُمْ, وَلكِنَّ اللهُ أَعَزُّ عَلَيَّ مِنْكَ, خَشِيتُ أَنْ أُخْبِرَكَ أَنَّ القَضاءَ عَلَيْكَ فَتُصالحَهُمْ بِبَعْضِ حَقِّهِمْ).

واتە: سوێند بەخوا کوڕی خۆشەویستم, تۆ لەلای من پڕ بەم زەویە خۆشەویستتری لەوان, بەڵام بەخوا ڕەزامەندی خواو جێبەجێکردنی شەرعی خوا وەکو خۆیو {بەجێهێنانی وەصیەتی: وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى} , لەلای من لەتۆ گەورەترەو کاتێ پرست پێکردم لەوە ترسام کەئەگەر ڕاستیەکەت پێ بلێم کەشەرع پشتیوانی تۆ دەکات, بچی بۆ لای بەرامبەرەکەتو لەگەڵیان ڕێك بکەویو منیش تاوانبار ببم!

بەڕێزان: یەکێکی تر لەماناو مەبەستی ڕاسپاردەو وەصیەتی خوا کەفەرمووی ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى ﴾, ئەوەیە هەرکاتێ کەسێك قسەیەکی حەقو پڕ لەدادگەری ئاڕاستە کردی, بەسنگێکی فراوانەوە قبووڵی بکەیو ملکەچی قسە حەقەکە بی. یەکێ لەدادوەرەکان کەمەشهوورە بەڕەوانبێژیو زیرەکی ناوی (ئیاسی کوڕی معاوی)یە, بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ, لەمێژووی ژیانی دادوەریمدا کەس لەقسەدا بەسەرمدا زاڵ نەبووە, کابرایەك نەبێ کەبۆ شاهیدیدان هاتبووە دادگا بۆ ئەوەی شایەتی بدات کەفلان باخە خورمایە موڵکی فلان کەسە, وەزۆر بەڕێکوپێکی سنووری باخەکەی باسکرد, منیش لێم پرسی: ئایا چەند دار خورمای تێدایە؟ شاهیدەکە گوتی: جەنابی حاکم منیش پرسیارێکم لەبەڕێزت هەیە! گوتم: فەرموو: گوتی: باشە بەڕێزت وا ماوەی سی ساڵێکە لەم مزگەوتەدا حاکمی موسڵمانانیو ڕۆژانە لێرە دەوام دەکەی, ئایا سەقفی ئەم مزگەوتە چەند داری تێدایە؟ قازی دەڵێ: قسەکەی زۆر ڕاستو پڕ مانا بوو, تێگەیشتم من ماوەی سی ساڵە

لەم شوێنەدام نەزانم چەند دار لەسەقفەکەیدایە, ئایا ئەو کەشاهیدە لەسەر ئەوەی ئەو باخە مولّکی فلاّن کەسە چوزانێ چەند داری تێدایە! دەفەرموێ: گــوتم قسەم نەماو شایەتیەکەت قبوولّە!

بەلّێ, ئەم دادپەروەرییەی ئیسلام کەشوێنکەوتووەکانی, بەتایبەت دەسەلاّتدارو ئەوانەی لەدادگاو قەزادا ئیش دەکەن وا لێکردبوو کە لەقسەو گوفتارو بڕیار دەرکردندا دادگەرانەو عادیلانە قسەبکەنو حوکم دەربکەن با بەزەرەرو زیانی خۆشیان, یان کوڕو کەسوکاریان یان خەلیفەو فەرماندەی موسلّمانانیش تەواو ببێ, هەر ئەمەش بوو ئیسلامی گەیاندە ڕۆژهەلاّتو ڕۆژئاوا, وەلەو کاتەوە کەفەرمانڕەواو کاربەدەستانی ئیسلام خزم خزمێنەو عەشرەتگەرییو پشتیوان کردن لەدەسەلاّتدارو پشت لەزەوییدانی هەژاری تێدا هاتەکایەوە, ئیسلام بەو گەورەییو عەظیمیە بچووك بۆوەو ڕۆژ بەڕۆژ دەسەلاّتی لاواز بوو. ڕەحمەتی خوا لە (عومەیری کوڕی سەعید) کەزۆر بەجوانی ئەم ڕاستیەی باسکردووەو فەرموویەتی: ئیسلام پێکهاتووە لەدیوارێك کەوەکو حەوشەو شوورا وایە, دەرگایەکی تێدایە, حەوشەو دیواری ئیسلام دادگەرییە, دەرگاکەشی حەقبێژییو جێبەجێکردنی ئەو عەدلو دادگەرییەیە, جا هەرکاتێ دیوارەکە ڕووخاو دەرگاکە دەرهات ئەوا ئیسلام دەکەوێتە گۆڕو هەموو ناحەزو ناکەسێك چەپۆکی خۆی پێدا دەداتو بەفووی دەمی بۆگەنو پیسی, دەیەوێ نوورەکەی بکوژێنێتەوە, وەدەستە چەورەکەی خۆی بەئیسلام بسڕێ! جا فەرمووی: ئەم ئیسلامە ئازیزە بەردەوام دیوارەکەی پۆلاّینەو دەرگاکەی مەحکەمو پارێزراوەو ڕێگای گورگو ڕێوی سیفەتەکان نیە بچنە ناویەوە, تا ئەو کاتەی فەرمانڕەوایی موسلّمانان هێزو بازووی پتەوە, توندوتۆلّیو بەهێزی فەرمانڕەوای موسلّمانانیش بەوە نابێ خەلّکی سەرکوت بکاو بەشمشێر ملی خەلّکی بپەڕێنێو بەقامچی جەلّدە لەپشتیان بدات, بەلّکو فەرمانڕەوای موسلّمانان بەوە ولاّتەکەی ئاوەدان دەبێو حکومەتەکەی تۆکمەو بەهێز دەبێ, کاتێ کەدادگاو قەزا کەسی حەقبێژو نەترسو بوێر لەخەلّكو ترساو لەخوا تێیدا فەرمانڕەوا بێو حاکم بێو خۆشەویستی بۆ هیچ کەسێك وای لێنەکات لەحەقبێژییو فەرمان دەرکردنی دادپەروەرانە لابدات, وەهەروەها حکومەتو سولّتە بەدادگەری ئەرکو ماف بەسەر هەموو هاولاّتیاندا دابەش بکاتو

ڕەچاوی ئەوە نەکرێ فلان کەس نزیکی فەرمانڕەواو حکومەتەو دەبێ مافی باشتری بدرێتێو ئەرکی کەمتر لەسەر دابنرێ, فلان کەسیش چەپلە لێدەرو ماستاوچی نیە بۆ حکومەتو سولتە, دەبێ هەر ئەرکی لەسەر شان بێو لەمافی هاولاتیبوونی بێبەش بێ!

بەڕاستی ئەم پیاوە دڵڕووناکە سنگ گوشادە بەئیسلامو زمان ڕەوانە بەحەقو ڕاستی زۆر جوان پێکاویەتیو مێژووی فەرمانڕەواو حکومەتەکانیش تەنها دووبارەبوونەوەی ئەم ڕاستییەیەو مانەوەو پایەداری بۆ دادپەروەرو حەقبێژانەو, ڕیسواییو زبڵدانی مێژووش شوێنی زاڵمانو دیکتاتۆرانو ڕیابازو ترسنۆکانە, چ لەسەر ئاستی تاك یان کۆمەڵ یان حکومەت بێ..

تا وەصیەتی تۆهەم هەموولایەکتان بەخوای دادگەر دەسپێرم ..

وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ

## سەرچاوەکان

1 - تەفسیری ڕەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان, مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
2 - بەهاری دڵان, ئەندازیار عُثمان محمد رَشید, چاپی یەکەم, 2003 .
3 - لەخزمەت قورئاندا, ئەندازیار عُثمان محمد رَشید, چاپی یەکەم, 2001
4 - صَفَحات مُشرِقَة مِـــن حَياة السَّابِقين, نَذير مــحمــد مــكـــتبي, دار البَشائر الإسلامية, ط 4, 1998
5 - أخلاق القُرآن, الدكتور أحمد الشرباصي, دار الرائد العربي, ط 1, 1981.
6 - رَوائِع وَطَرائِف, إبراهيم النعمة, مطبعة الزهراء, الموصل, ط 1, 1987
7 - روائع إسلامية, إبراهيم النعمة, مطبعة الزهراء, الموصل, ط 1, 1985
8 - مِن وَصايا القُرآن الكَريم, محمد عبدالعاطي بحيري, المكتبة التوفيقية.
9 - موسوعَة الأخلاق الإسلامِيَّة, سعد يوسف أبو عَزيز, المكتبة التوفيقية.

# وەصیەتی نۆهـــەم

﴿ وَبِعَهْـــدِ اللهِ أَوْفُــوا ﴾

(الأنعام 152 )

# ووتـاری ژماره سی وسیٚ

## وەفاداری لەبەلێن و پە یماندا

### بەشی یەکەم:

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً, لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً ﴾

(الأحزاب 23 ـ 24)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( آيَةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ: إِذا حَدَثَ كَذَبَ, وَإِذا وَعَدَ أَخْلَفَ, وَإِذا اؤتُمِنَ خانَ )

( رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِهِ أجمــعين .**

ئیماندارانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلامو ڕەحمەتی خوای پەروەردگار لەئێمەو لەهەموو ئیماندارانی ئەهلی قیبلە بێت إنشاءَ الله .

بەڕێزان: لەم ووتارەدا دەچینە خزمەت وەصیەتو ڕاسپاردەی نۆهەم لەو (دە) وەصیەتو ئامۆژگاریانەی خوای گەورە بۆ ئێمەی عەبدو بەندەی خۆی, بۆئەوەی لەژێر ڕووناکی جێبەجێکردنی ئەو ڕاسپاردانەی خالیقو دروستکەرماندا, دینو ژینمان ڕووناکو پاکو جوان بێ, ژیانی دونیامان بەختەوەری بێو دونیا بکەین بەمەزرەعەی ئاخیرەتمان, لەبەر ئەوەی شتێکی بەڵگەنەویستە کەژین بەبێ دین یەکسانە بەژان, بەخەم, بەمەراق, بەدەردەسەری بۆ ئینسان خۆیو کەسانی دەوروبەریشی, بەڵام ژیان بەپێی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم بەسەربردن, واتە: ژیان لەسایەی قورئاندا بەرهەمەکەی بریتییە لەحەسانەوەو گەیشتنو تێگەیشتن لەمانای ژیانی ڕاستەقینە.

جا بەئومێدی ئەوەی دینو ژینمان پاکو بێگەرد بێو خوای گەورە لێمان ڕازی بێو کلیلی خێر بینو قفڵی شەڕ بین لەگەڵ هاودینانو هاونیشتمانیانماندا, با بچینەوە خزمەت قورئانو دانە گەوهەری نۆهەم وەرگرین کەدەفەرموێ: ﴿ وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ﴾ .

بەڵێ ئەمە یەکێکە لەو وەصیەتانەی کەپەروەردگار ئامۆژگاری ئادەمیزادی کردووەو دەفەرموێ: وەفا بەعەهدو پەیمانی خودا بکەن, ئەو شتانەی فەرمانی پێکردوون ئەنجامیان بدەن, ئەوەی جڵەوگیری لێکردوون توخنی مەکەون, بەگوێرەی نامەی خودا کەقورئانە کاربکەن, سوننەتی پێغەمبەر صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم پەیڕەویکەن, هەروەها سروشتی پاکو عەقڵی ساغ بەکاربێنن..

بەڵێ بەڕێزان: ئەم ڕستەیە لەئایەتەکەدا هەموو وادەو بەڵێنەکان دەگرێتەوە چ ئەو عەهدو پەیمانەی کەئادەمیزاد لەگەڵ پەروەردگار کردوویانە, یان ئەو عەهدو پەیمانەی ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا دەیکەن.

بەڵێ خۆشەویستان: وەفاداری وشەیەکە گوێ ئامەزرۆی بیستنیەتی,دڵ خۆشیدەوێ, هەرکەسێ خاوەنی ڕەوشتی وەفاداری بێ, ویژدانی ئاسوودەیە, بەڕاستی

ڕەوشتی وەفادارییە لەبەجێهێنانی وادەو بەڵێنەکاندا کەکلیلی ئەمانو زمانەی دڵنیاییە لەنێوان ئینسانەکاندا لەکاروباری ڕۆژانەیاندا.

جا هەروەکو لەسەرەتاوە گوتمان, وەفا بەعەهدو بەڵێن دوو بەشە, یەکەم: وەفا بەو عەهدو پەیمانەی کە لەگەڵ خوای خۆمان بەستوومانە, دووەم: وەفا بەو عەهدو پەیمانەی کەئێمەی ئینسان ڕۆژانە بەیەکتری دەدەین.

ئێستاش پشتیوان بەخوای گەورە, باسی وەفاداری دەکەین بەرامبەر ئەو عەهدو بەڵێنانەی کەلەگەڵ خوای گەورەدا بەستوومانو وەعدی جێبەجێکردنیانمان داوەبەخوا.

لەوانەیە کەسێك دوای تێڕامان بپرسێ: باشە من چ وەعدێکم داوە بەخوا؟ خۆ من سوێندم بۆ خوا نەخواردووە کەدەبێ فلان ئیش جێبەجێ بکەم, وەعدو بەڵێنم نەداوە بەخوا کەئەو ئیشوکارە بکەم یان نەیکەم! ئەی کەواتە جێبەجێکردنی ئەو عەهدو پەیمانەی لەگەڵ خوا بەستوومە, یانی چی؟! ئایا چۆن دەتوانم وەفاداریم بەرامبەر ئەو عەهدو بەڵێنانەی بەخوای گەورەم سُبْحَانَهُ وَتَعالی داون؟!

سەرەتا دەڵێم: بۆئەوەی عەبدێکی وەفادار بین بەرامبەر بەخالیقەکەمان, پێویستە وەفادار بین لەخزمەتیدا لەسێ شتدا, یەکەم: لەئیمان پێهێنانیدا, دووەم: بەدڵسۆزیو ئیخلاصەوە, دوور لەریاو ڕووپامایی کردەوەکانمان ئەنجام بدەین, سێیەم: هەرچی فەرمانی پێکردووین جێبەجێی بکەینو ئەوەی فەرموویەتی خۆتانی لێ بپارێزن" لێی دوورەپەرێز بین. هەرکەسێ توانی ئەم سێ خاڵە بەجوانی لەژیانیدا جێبەجێبکات ئەوە بەڕاستی وەفادارە بەو عەهدو بەڵێنانەی کە لەگەڵ پەروەردگار بەستوونی. قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:﴿ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً, إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً ﴾(الفتح 9 ـ 10), واتە: بۆئەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بەخواو پێغەمبەرەکەیو پشتیوانی لەپێغەمبەر بکەنو ڕێزی شایستەی خۆی لێبگرنو تەسبیحاتو ستایشی خوا بکەن لەبەرەبەیانو عەسراندا, بێگومان ئەوانەی پەیمان دەدەن بەتۆ ئەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, لەڕاستیدا هەر پەیمان بەخوا دەدەن, دەستی پیرۆزو بەتواناى خوا لەسەر دەستیانەوەیە (بەپشتگیریو یارمەتی), جا

ئەوەی پەیمانەکە بشکێنێتو لێی پاشگەزبێتەوە, ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت, ئەوەش کەپەیمانەکە دەباتە سەرو لێی پاشگەز نابێتەوە, خوای باڵادەست ئەجرو پاداشتی گەورەی پێدەبەخشێت لەئایندەدا..

بەڵی خۆشەویستان: هەریەك لەئێمە چەندین بەڵێنو وادەمان بەخوای پەروەردگار داوە, بۆ نموونە: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾(البقرة 43), ئێمەی موسڵمانیش قبووڵمان کردووە کەنوێژ بکەینو زەکات بدەین, ئایا وەعدو بەڵێنی خۆمان جێبەجێکردووە لەبەجێهێنانی نوێژەکانو دەرکردنی زەکاتیماڵو سامانمان (ئەگەر هەمانبوو)!

نموونەیەکی تر: خوای گەورە باسی چاوپاکی پیاوانی ئیماندار دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُم ﴾(النور 30), واتە: ئەی پێغەمبەر بەپیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن لەسەرنجدانی ئافرەتی نامەحرەم..

دەی تۆی ئیماندار کەئەم ئیسلامەت قبووڵکردووەو قورئانت وەکو ئیمامو پێشەوای خۆت قبووڵە, کەواتە: وەعدو بەڵێنت داوە بەخوا کەچاوت بپارێزی لەتەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم, جا خۆت هەڵسەنگێنە ئایا بەکردەوە چاوت پاراستووەو وەعدو بەڵێنەکەت جێبەجێکردووە؟!

هەروەها خوای پەروەردگار بەرامبەر ئافرەتانی ئیماندار دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾(النور 31) واتە: ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, بەئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن لەتەماشای پیاوی نامەحرەم, وەداوێنیان بپارێزن لەزینا, وەجوانی لەشولاری خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ هاوسەرەکانیان.. ئایا خوشکی ئیماندار: تۆ کەئەم فەرمانەی خوات قبووڵکردووە, واتە وەعدو بەڵێنت داوە بەپەروەردگار کەبەڵێ چاوم دەپارێزمو داوێن پاك دەبمو جوانی خۆم دەرناخەم بۆ نامەحرەم, ئایا وەفاداری بەرامبەر بەڵێنەکەت؟!

ئیمانداران: ئەگەر لەقورئانی پیرۆز وردبینەوە دەبینین دوو جۆر مرۆڤ هەیە لەجێبەجێکردنی وەعدو بەڵێندا کە بەخوای گەورەیان داوە. خوای پەروەردگار باسی جۆری یەکەممان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ

فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً ﴾(الأحزاب 23)، واتە: مەردانێکی زۆر هەن لەئیمانداران، ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا ڕاستیان کرد لەسەر ژیان و پابەندبوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێکردو مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری ڕووی تێنەکردوون..

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی صەحابی بەڕێزو شەهید (ئەنەسی کوڕی نەضر) (ڕەزای خوای لێبێت) هاتە خوارەوە. ئەم صەحابەیە بەشداری شەڕی بەدری نەکرد، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا لەسەفەربوو، کاتێ گەڕایەوەو غەزای بەدر ڕوویدابوو، زۆر ئاواتەخوازبوو کە لەبەدردا وەکو برا صەحابەکانی بەشداری بکردایە، بەڵام خۆ تازە ڕۆیشت، بۆیە بەدڵێکی پڕ لەکوڵ و چاوی پڕ لەفرمێسکی خۆشەویستیەوە بۆ خوا فەرمووی: وەعدو بەڵێن دەدەم بەخوا، ئەگەر ئەمجارە شەڕی کافرو موشریکەکان دروست ببێتەوە، دەبێ نیشان بدەم چۆن خوا لەخۆم ڕازی دەکەم! بەڵێ شەڕی (ئوحود) هاتە پێشەوەو بەهۆی سەرپێچیکردن لەفەرمانێکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەگردەکەیان بەجێهێشت، موسڵمانان تووشی شکست بوون و بەرەو مەدینە هەڵاتن و صەحابەکان بەدەنگۆی ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کوژراوە هێزی ئەژنۆیان نەماو پەرتوبڵاو بوون و بەرەی جەنگ بەقازانجی کافرو موشریکەکان بوو. ئا لەو کاتە سامناکەدا ئەنەسی کوڕی نەضر پەیمانەکەی خۆی هاتەوە بیرو شمشێری دەستدایەو بەرەوڕووی کافرەکان ڕۆیشت. لەو کاتەدا صەحابی گەورەو پایەدار (سەعدی کوڕی موعاذ) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: ئەوە بۆ کوێ ئەی ئەنەس؟! وا خەڵکی بەرەو مەدینە دەڕۆن کەچی تۆ بەرەو دوژمن هەنگاو هەڵدەگری! ئەنەس فەرمووی: ئەی سەعد بەرەو بەهەشت دەڕۆم (وَرَبِّ النَّضْرِ إِنِّي أَشُمُّ رائِحَتَها مِنْ دونِ أُحُد) فەرمووی: سوێند بەخوا من بۆنی بەهەشت دەکەم وا لەلای کێوی ئوحودەوە بۆنەکەی دێ!

بەڵێ وەعدو بەڵێنەکەی کە بەخوای دابوو، هێنایەجێ و شەڕێکی زۆر مەردانەی کردو کافرەکانی شپرزە کرد، تا ئەوەبوو بەئاواتی خۆی گەیشت و بەشەهیدی بەخزمەت خوا گەیشت. صەحابەکان دەفەرموون: دوای تەواوبوونی شەڕەکە، لاشەی ئەنەسمان لەژێر چیای ئوحوددا دۆزیەوە، زیاتر لەهەشتا برینی بەلەشەوە بوو، کەس نەیدەناسیەوە

کــەئــەوە ئــەنــەسی کــوڕی نەضرە, تەنها خوشکــەکــەی نەبیّ کە بەسەری پەنجەکانی ناسیەوە!

بەلّیّ زۆر بەدلّسۆزیەوە وەعدو بەلّیّنەکەی خۆی هیّنایەجیّو خوای پەروەردگاریش بۆ ڕیّزلیّنان لەهەلّویّستی مەردانەو وەفادارانەی ئەنەس‌و هەموو ئیماندارانی ئومەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەوەکو ئەنەس وەفادارن لەبەجیّهیّنانی وەعدو بەلّیّنەکانیان بەرامبەر بەخوای خۆیان, ئەم ئایەتەی سووڕەتی ئەحزابی ناردە خوارەوە.

پاشان خوای گەورە باسی جۆری دووەممان لەمرۆڤ بۆ دەکات, کەوەعدو بەلّیّنەکان کە بەخوای دەدەن, نایهیّننەجیّو پاشگەز دەبنەوە لیّی, دەفەرمویّ:﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ, فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ, فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقاً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾(التوبة 75 ـ 77), واتە: لەدوو ڕووەکان کەسانیّك هەن کەپەیمان‌و بەلّیّنی بەخوا داوە: سویّند بەخوا ئەگەر خوا مالّو سامان‌و دارایمان پیّ ببەخشیّت, بەڕاستی زەکات‌و خیّری لیّ دەردەکەین‌و بیّگومان لەڕیزی کەسانی چاك‌و خواناسیشدا دەبین, جا کاتیّك خوا لەفەزلّو بەرەکەتی خۆی مالّی پیّدان‌و بەهرەوەری کردن, ئەوان ڕەزیلییان تیّداکردو پشتیان لەبەلّیّنەکەیان کرد, لەکاتیّکدا کەئەوان هەمیشە لەبەلّیّن‌و پەیمان پشتهەلّکەرن!

جا ئیمانداری بەڕیّز: ئاگات لەخۆت بیّ نەکەویتە بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە قورئانیە کەباسی ئەو کەسانە دەکات کەوەعدو بەلّیّنیان بەخوا داوەو وەعدو بەلّیّنەکەیان شکاندووە. تۆی ئیماندار بیّتەوە بیرت کاتیّ سەیارەت نەبووەو بەچاوەڕیّکردنی سەیارە ماندوو بوویت, ئایا نەتگوتووە خوایە گیان بەلّیّن بیّ, ئەگەر سەیارەیەکم بدەیتیّ‌و ببمە خاوەنی سەیارەی خۆم, وەعد بیّ بۆ ڕەزامەندی تۆ پیّی برۆم‌و هاتوچۆی مزگەوتی پیّبکەم‌و خزمەتی هەژارو نەخۆش‌و هەتیوانی پیّبکەم, ئایا ئیّستا کەخوا سەیارەی پیّبەخشیوی‌و یارمەتیداوی توانیوتە سەیارەی خۆت بکڕی, ئایا وەعدو بەلّیّنەکەت جیّبەجیّ دەکەی یان لەجیاتی مزگەوت بۆ ئەو شویّنانە پیّی دەڕۆی کەشەیطان پیّی خۆشە لەجیاتی یارمەتی نەخۆش‌و ڕیّبوارو هەژار بەلایاندا تیّەپەڕی‌و کەشخەو فیزیان

بەسەردا لێدەدەی ؟ ئەگەر خوانەکردە هەڵوێستی دووەمیانت هەبێ لەپەیمان شکێنان دەبیو بەر هەڕەشەی ئایەتەکە دەکەوی!

ئەی ئەو گەنجەی کەکاتێ خێزانت نەبوو, ئارەزووی جنسی پاڵی پێوە دەنای بۆ تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم, ئایا چەند جار وەعدت بەخوا داوە کەئەگەر خوای گەورە ڕەحمت پێبکاو یارمەتیت بدات, خێزانێکی حەڵاڵت ببێ ئەوا هەرگیز چاو نابڕیتە ئافرەتی نامەحرەمو نەزەر ناکەی.. ئایا ئێستا کەخێزانی خۆت هەیە بەردەوامی لەسەر تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم, یان وەعدو بەڵێنەکەت بردۆتەسەرو چاوت بەخێزانی خۆت ڕۆشن دەبێتەوە؟ وولامی خۆت بدەرەوەو بزانە لەکامیانی, لەوەعدو بەڵێن شکێنەکان یان نا؟

هەروەها ئەو خوشکە بەڕێزەی کەدەڵێ: خوایە گیان وەعدو بەڵێن بێ هەرکاتێ چوومە ماڵی خۆمو هاوسەری حەڵاڵی خۆمم هەبوو, جلوبەرگی شەرعی لەبەردەکەمو واز لەسفووری دێنم, ئایا دوای شووکردن وەعدو بەڵێنەکەی لەبیر ماوەو جێبەجێی دەکات؟!

هەروەها ئەو خوێندکارەی کەڕوو لەپەروەردگاری دەکاتو دەڵێ: خوایە گیان ئەگەر لەخوێندنەکەمدا سەرکەوتووبوومو نمرەی باشم بەدەست هێنا, دەبێ لەپشووی هاویندا لەخزمەت قورئاندا بمو لەهاوەڵی خراپ بەدوور بم, ئەگەر خوا ئاواتەکەی هێنایەجێ, وەعدو بەڵێنەکەی خۆت لەبیرە؟ ئایا چەند کەسمان کاتێ دەردی هەژاری بەچۆکیدا داوینو گیرفانمان بەتاڵ بووە, ڕوومان لەخوا کردووەو گوتوومانە: خوای گەورە ئەگەر لەم هەژارییە ڕزگارم ببێو منیش وەکو ئەو خەڵکە دەوڵەمەند بیم, وەعدو بەڵێن بێ چاکەو پیاوەتیو مەردایەتی نەبێ بەو ماڵە نەیکەم, هەرگیز لەخۆم یاخی نەبمو ئەم هەژارییەم بیر نەچێتەوە, ئایا ئێستا کەخوا دەرگای ڕەحمەتی لێ کردووینەتەوە, ئەو وەعدو بەڵێنەی خۆمانمان لەبیر ماوە؟

کەواتە ئیمانداری بەڕێز: تۆ ڕۆژانە دەیان وەعدو بەڵێن دەدەی بەخوا, چونکە هەموو کاتێ موحتاجی بەخوا, ئایا لەکاتی نەخۆشیدا کێمان هەیە دەیان جار لەخوا نەپاڕابێتەوە کەتەنها ئەمجارە چاك ببمو لەم ئازارە ڕزگارم ببێ, ئیتر هەر خواپەرستی بکەمو چاکە نەبێ نەیکەم ؟ کێمان هەیە کاتێ ئیشوکارێکی بۆ جێبەجێ ناکرێ, پەنا بۆ خوا دەباو

دەڵێ: خوایە بەهاوارم وەرەو وەعد بێ ئەم ئیشەم بۆ بکرێو لەم گرفتە ڕزگارم ببێ, هەرگیز لەمەمنوونیت دەرنەچم, ئایا کاتێ ئیشەکەمان بۆ ئاسان دەبێ سوپاسی خوا دەکەینو ئەو فەزڵو کەرەمەی خوا لەگەڵی کردووین لەیادمان دەمێنێ, یان لەبەڵێن شکێنان دەبین.. پەنا بەخوا!

هەروەها یەکێکی تر لەو مەیدانانەی کەئینسان وەعدو بەڵێن دەدات بەخوای گەورەو پێویستە وەفا بەعەهدو پەیمانەکەی بکات, بریتییە لەبەجێهێنانی نەزر, هەروەکو خوای گەورە لەسوورەتی (الإنسان ـ ئایەتی 7)دا لەوەسفی ئیماندارانی ڕاستەقینەدا, باسی یەکێ لەڕەوشتە بەرزو باڵاکانیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْماً كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً ﴾.. واتە: ئەو بەختەوەرانە یەکێك لەسیفەتەکانیان ئەوەیە: وەفا بەنەزر دەکەن, یاخود کەبەڵێنێکیاندا وەفادارنو ئەنجامی دەدەنو ترسوبیمیان هەیە لەڕۆژێك کەشەڕی لێدەبارێتو پرشوبڵاوە!

کەواتە هەرکاتێ نەزرت کرد لەسەر خۆت کەخێرو صەدەقەکەیەك بکەیت, یان عیبادەتو خواپەرستیەك بکەیت ئەوا تۆ وەعدو بەڵێنت داوە بەخواو پێویستە جێبەجێی بکەیت. تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەی کەنەزرەکەی لەسەر خۆی واجب کردووە مردو فریا نەکەوت جێبەجێی بکات پێویستە کەسوکارەکەی دوای خۆی نەزرەکەی بێننەجێ, هەروەکو لەصەحیحی بوخاریدا هاتووەو دەفەرموێ: جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا عەرزی کرد: یا رَسولُ الله من خوشکێکم هەبوو, نەزری کردبوو لەسەر خۆی کەحەجی ماڵی خوا بکات, بەڵام مردو فریا نەکەوت نەزرەکەی جێبەجێ بکاتو حەجەکەی بکات, ئایا من دەتوانم چی بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرمووی: (أَرَأَيْتَ إِنْ كانَ عَلى أُخْتُكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قاضِيه) ئایا ئایا ئەگەر خوشکەکەت قەرزی خەڵکی لەسەر بێو بەقەرزاری مردبێ, ئایا تۆ قەرزەکەی بۆ دەدەیتەوە ؟ کابرا گوتی: بەڵێ قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە. خۆشەویست صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم فەرمووی: (فَاقْضِ اللهَ فِي دَيْنِه, فَإِنَّ اللهَ أَحَقُّ بِالْوَفاءِ) فەرمووی: دە کەواتە قەرزی خوشکەکەت کەوەعدو بەڵێنی بەخوا داوە, بۆی بدەوە چونکە بەڕاستی خوای گەورە شایانترە لەهەموو کەس کەوەفا بەو عەهدو بەڵێنانە بکرێ کە لەگەڵی بەستراوە.

بەداخەوە: زۆر کەس لەکاتی نەخۆش کەوتنی خۆی یان کەسوکاری, یان لەکاتی بەجێهێنانی ئیشێکی سەختو گراندا, یان لەکاتی ڕووداوێکی دڵتەزێندا زۆر نەزرو خێروخێرات لەسەر خۆی واجب دەکات, بەڵام کاتێ دەکەوێتە خۆشیەوەو لەتەنگانەکە ڕزگاری دەبێ وەعدوبەڵێنەکەی کەبەخوای داوە لەبیرخۆی دەباتەوەو ئامادەنیە خێرەکە بکات, وەکو ئەوەی (پەنا بەخوا) جارێکی تر ئیشی بەخوا نەبێتەوە!

بەڕێزان: یەکێکی تر لەو شتانەی کەوەعدو بەڵێن بەستنە لەگەڵ خوا, بریتییە لەوەی کەئینسان سوێند بخوا کەفلان ئیش دەکات, ئیشەکەش چاکەیەو خوا پێی ڕازیەو ئازاری بۆ کەس تێدا نیە, ئەوە پێویستە ئەو سوێندە بێنێتەجێ, چونکە ئەوە وەعدو بەڵێنە لەگەڵ پەروەردگار بەستراوە هەروەکو لەسوورەتی (النحل - ئایەتی 91)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ واتە: بەوەفاو بەئەمەك بن بۆ ئەنجامدانی پەیمانی خوا کاتێك بڕیاری دەدەنو سوێندو پەیمانو بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کەدووپات کرابۆوەو تەئکیدی لەسەر کرابوو, لەکاتێکدا کەئێوە خواتان کردۆتە کەفیلو زامن بەسەر خۆتانەوە, بێگومان خوا دەزانێت بەو کارو کردەوانەی کەدەیکەن!

خۆشەویستان: یەکێکی تر لەو عەهدو پەیمانانەی کەئێمەی عەبدو بەندەی خوا لەگەڵ پەروەردگاری خۆمان بەستوومانە, ئەوەیە کەخوای گەورە لەسوورەتی (یاسین - ئایەتی 60)دا بیرمان دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾ واتە: ئەی نەوەی ئادەم, ئایا من پێم ڕانەگەیاندن کەشەیطان نەپەرستن چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە..

کەواتە: بۆ ئەوەی وەفادار بین بۆ ئەو عەهدو بەڵێنە, دەبێ دوژمنایەتی شەیطان بکەینو بەگوێی خوا بکەین, نەك خوانەخواستە بەپێچەوانەوە شەیطان بکەین بەدۆستو دڵی ڕازی بکەین بەڵام خوای پەروەردگار لەخۆمان عاجز بکەین, بەوەفا بین لەگەڵ شەیطان, بێوەعدو بەڵێن بین لەگەڵ (الرَّحمن) سُبْحانَهُ وَتَعالى..

خۆشەویستان: ئەگەر بەوردی لەژیانی ئەمڕۆی موسڵمانان وردبینەوە دەبینین زۆربەمان لەو وەعدو بەڵێنانەی کە بەخوای گەورەمان داون, وەفادار نین

لەبەجێهێنانیانداو ئەو کاتانەی کەهەژار بووین, کەنەدار بووین, کەنەخۆش بووین, کەدەربەدەرو ئاوارە بووین, کەژێردەستەو ستەم لێکراو بووین, چەند لەخوا پاڕاوینەتەوە کەدەرگای خێرمان لێبکاتەوەو ڕزگارمان بکا.. بەڵام ئایا کاتێ خوا لەهەژارییەوە دەوڵەمەندی کردین, لەبێڕێزیو ژێردەستیەوە ڕێزداریکردینو پلەوپایەیەکی پێبەخشین, لەلەش بەباریو ئازارەوە لەش ساغی کردین, لەدەربەدەرییەوە وولاتی ڕزگارکردین, ئایا ئێستا وەعدو بەڵێنەکانمان لەبیرە کەداومانە بەخوا, ئایا بەر ئایەتی ﴿ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾ دەکەوین, یان خوا پەنامان بدات بەر هەڕەشەی ئایەتی ﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ, فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ ﴾ دەکەوین؟

جا بۆ ئەوەی ئەوانەمان کەخوا ئامانجو ئاواتەکانی هێناوینەدیو سوپاس بۆ خوا سوپاسگوزاری خواینو لەخۆمان بایی نەبووینو وەعدو بەڵێنەکان کە لەهەژارییو داماویدا بەخوامان داون لەبیرمان نەچوونەوە, بۆ ئەوەی زیاتر دامەزراو بینو وەفادارتر بین بەرامبەر بەخوای گەورە, کەخۆمانو ئەوەی هەمانە هەمووی بەرهەمی لوطفو ڕەحمەتی خۆیەتیو هیچ ئازایەتیەکی ئێمەی تێدا نیە.. وەئەوانەشمان کە بەدوو ژەم تێر بوون لەخواردنی باشو بینینی دوو دۆلارو دینار لەگیرفاندا, دوێنێو پێرێمان بیرچۆتەوەو حەزناکەین خۆشمان بەبیری خۆمانی بێنینەوە کەچەند لاتو نەدارو هەژارو داماو بووینو چەند ئاواتمان دەخواست خوا لەکەرەمی خۆی بەسەرماندا بڕێژێو ئێمەش بەو ماڵو سامانە قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبکەینو خوا لەخۆمان ڕازی بکەین کەچی ئێستا هەموومان بیر خۆمان بردۆتەوەو وا دەزانین لەوەتەی هەین هەروا خۆشگوزەران بووین, کەپەنا بەخوا ئەم جۆرەی دووەمیان مەصیرو چارەنووسی وەکو ئەم بەسەرهاتە دەبێ کەسەرەنجامی بێوەفایانو لەخۆباییان دیاری دەکات.. فەرموون با بەدڵو بەچاوی پەندو عیبرەت لێی بڕوانینو گوێی بۆ بگرین:

لەمەدینەی پیرۆزدا, لەخزمەت پێغەمبەری خوادابین صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, پێنج فەڕزە بەدەنگە زوڵاڵەکەی بیلالی حەبەشی بانگ دەدرێت, بانگ تەواو نابێ کەیەکێك لەڕیزی یەکەمی نوێژدا پێنج فەڕزە لەدوای پێغەمبەری خواوە نوێژەکەی بەجەماعەت دەکات

(لا يَفُوتُ صَلاةٌ خَلْفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم)، کابرایەکی هەژاربوو، ئەوەندە لەمزگەوتدا مابۆوە ناویان نابوو (حَمامَةُ المَسْجِد) کۆترەباریکەی مزگەوت. زۆر هەژارو داماوبوو، زەوی‌وزاری نەبوو تا کشتوکاڵی تێدا بکات، پارەی نەبوو معامەلەو کڕین‌و فرۆشتن لەبازاڕدا بکات، نەك مەڕوماڵات" مریشکێکیشی شك نەدەبرد لێی سوودمەند بێ، لەش‌ولارو توانایەکی بەدەنی وایشی نەبوو کرێکاری پێ بکرێ‌و تۆزێ بژێوی ژیانی بەرەو باشی بڕوات. بەردەوام لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوو صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم. ڕۆژگار هاتن‌و ڕۆیشتن، ڕۆژێکیان ئەم هەژارە چووە خزمەت پێغەمبەری خواو بەئەدەبەوە لەخزمەتیدا دانیشت‌و بەدەنگێکی کزۆڵەی مەحزوونەوە، لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵی پڕ لەحەسرەتدا، بەگوێی پێغەمبەری خوایدا چرپاند: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆت لەنزیکەوە دەمبینی، زۆر، لەزۆریش زۆرتر هەژارم، نەدارم، بۆ دوعایەکم بۆ ناکەی لای خوا، بەڵکو لەڕەحمەتی خۆی بەسەرمدا بڕێژێ‌و منیش وەکو ئەو خەڵکە تۆزێ ریخۆڵەم بخوسێتەوەو جاروبارێ بۆنی چێشتێ لەماڵەکەمدا بۆن بکرێ. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: ئەی کۆترەباریکەی مزگەوت (قَلِيلٌ يُؤَدِّي شُكْرُهُ خَيْرٌ مِنْ كَثِيرٍ لا تُؤَدِّي شُكْرُهُ، أَوْ: حَقَّهُ) فەرمووی: (ئەو کەمەی کەهەتە شوکری خوای لەسەر بکەی باشترە لەوەی کەبڕژێ بەسەرتداو بوغرا ببی‌و خاوەنەکەیت بیر بچێتەوە). بەڵام بێ‌سوود بوو، یەخەی پێغەمبەری خوای بەرنەداو گوتی: هەر دەبێ دوعایەکم بۆ بکەیت کەخوا لەم هەژارییە ڕزگارم بکات. مەعلومیشە پێغەمبەری خوا دوعای ڕەت ناکرێتەوە، ڕووی‌کردە پەروەردگارو فەرمووی: (أَللَّهُمَّ اغْنِيهِ بِما شِئْتَ) خوایە دەوڵەمەندی بکەی، جا چۆن دەوڵەمەندی دەکەی کەیفی خۆتە، خۆی داوا دەکات.

بەڵێ بەشوانکارەو بەر بەنیوەیی یەك دوو سەر مەڕی وەرگرت‌و ماوەی یەك دوو ساڵی پێچوو مەڕوماڵاتەکەی وا بەرەکەتی تێکەوت‌و زیادی کرد وای لێهات لەناو شاری مەدینەدا جێگای نەدەبۆوە، تا ناچاربوو ماڵەکەی بارکرد بۆ قەراغ شاری مەدینە! ئەو کەسەی تا دوێنێ هەموو فەرزێك نوێژی لەدوای پێغەمبەری خواوە لەصەفی یەکەمی جەماعەتدا نەبوایە نەدەکرد، یەك جەماعەتی بفەوتایە وای دەزانی زەرەرێکی گەورەی کردووە، ئێستا بەهۆی دووری لەمزگەوت‌و مەشغوڵی مەڕوماڵاتەوە جەماعەتی نیوەڕۆو

عەسری فەوتا. ماوەیەکی پێچوو مەغریبو عیشاو بەیانیشی فەوتا، بەینێکی تری پێچوو جومعەکانیشی فەوتاند، دوای ماوەیەکی تر نوێژەکانیشی تاکوتەرا دەکرد، ماوەیەکی تر ئیعلانی حەربی لەگەڵ پەروەردگار کرد!!

بەڵێ ئیمانداران: بەدڵ لەگەڵ بەسەرهاتەکەدا بڕۆ ماوەیەتی. ئا لێرەدا هەر لەمزگەوتی پێغەمبەری خوادایـن بزانین چی ڕوودەدا. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پرسیاری لەصەحابەکان کردو فەرمووی: أَيْنَ حَمامَةُ المَسْجِدِ؟! ئەوە کوا کۆترەباریکەی مزگەوت، کوا ئەو کەسەی کەپێنج فەرزەی نوێژ لەگەڵمدابوو، شوێنی لەڕیزی جەماعەتدا چۆڵە، باشە بۆ دیار نیە؟ صەحابەکان وڵامیان دایەوەو فەرموویان: ڕوحمان بەقوربانت بێ، کۆترەباریکەکە لەمزگەوت فڕی، تیری دونیاپەرستی، تیری باوەش کردن بەدونیادا وای لێکرد هەردوو باڵی شکاندووەو لەقوڕو چلپاوی دونیادا گیریخواردووەو ناتوانێ دەرچێت، فەرمووی: چۆن؟ گوتیان: قوربان نوێژەکانیشی واز لێ هێناون، نەك نوێژی جەماعەتو جومعە!!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بانگی کەسێکی لەصەحابەکان کردو فەرمووی: تۆ بەنوێنەرایەتی من بچۆ بۆ لایو پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا سەلامت لێ دەکاتو دەفەرموێ: زەکاتی حەیوانەکانی بنێرێ بۆ ئەوەی بیدەین بەفەقیرو هەژار، پێی بڵێ: با دوێنێی بیر بێ کەنانی نەبوو بیخوا، ئێستا حیسابی خۆی نازانێو شەو تا بەیانی حیسابو کتاب دەکاو مەڕوماڵات دەکڕێو دەفرۆشێ، با ئەو زەکاتەی لەسەری فەرزە بۆمان بنێرێ.

بەڵام سەرنج بدەن دەبێ وڵامی چی بێ؟ لەکۆترەباریکەی مزگەوتەوە چی لێهات؟ ئەو هەموو بەڵێنەی بەخوایدا کەئەگەر دەرگای ڕەحمەتی لێبکاتەوەو لەهەژاری ڕزگاری بکا، وەعدو بەڵێن بێ دەرگا لەسەر هەژارو نەداری وەکو خۆی دانەخا، وەعد بێ زیاتر نوێژو خواپەرستی بکا.. بەڵام لەجیاتی وەفا بەوەعدو بەڵێنەکانی، بێوەفایی زەڕێکی لەدڵی داو ماڵی دونیای لا خۆشەویست کردو محمدی نازدار ناوی لەدڵیدا کوژایەوە! بەنوێنەرەکەی پێغەمبەری خوای گوت: (بَلِّغْ صاحِبَكَ)، نەیگوت: (بَلِّغْ رَسُولَ اللهِ)، نەیگوت: (بَلِّغْ مُحَمَّد) نەیگوت: (بَلِّغْ حَبيبي)، بەخۆشەویستەکەم بڵێ، بەڵکو زۆر

بێئەدەبانە گوتی: (بَلِّغْ صاحِبَكَ)، بەهاوەڵەكەت بڵێ، ئەو كەسەی تۆی بۆ لای من ناردووە بۆ زەكاتی حەیوانەكانم، پێی بڵێ: (لَيْس في الإسْلامِ زَكاةٌ) زەكات لەئیسلامدا نیە، ئەوە بۆ تاوەكو من هەژار بووم ئەم زەكاتە نەبوو، كەس حەیوانێكی بەمن نەبەخشی، ئایا ئێستا ئەمە چیە داوای دەكات لەمن!!

پەنا بەخوا لەماڵی غەزەب، پەنا بەخوا لەوەعدە خیلافی لەگەڵ خوا. نوێنەرەكە هاتەوەو ئەم باسەی بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە، كاتی خۆی دوعای پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەوڵەمەندی كرد، ئێستا دوعای پێغەمبەر چیە بەرامبەری؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: یەعنی ئەم كابرایە وای لێهات نوێژی جەماعەتی مزگەوتی تەرك كرد؟ گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: جومعەشی تەرك كرد؟ گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: نوێژەكانیشی ناكات؟ گوتیان: نەخێر. فەرمووی: ئیمانیشی بەزەكات نیە؟ عەرزیان كرد: نەوەڵڵا دەڵێ لەئیسلامدا زەكات نیە! كەوابوو كافربوو ـ پەنا بەخوا!

وا بزانم پێغەمبەری خوا یەكەم دوعای شەڕە كە بەناوی تایبەت لەكەسێكی بكات، فەرمووی: (وَيْحَكَ يا.. ثَعْلَبَة، هلاكُكَ يا ثَعْلَبَة، خاتِمَتِكَ يا ثَعْلَبَة) فەرمووی: خوا بەهیلاكت بەرێ، خوا عاقیبەت شەڕت كا ئەی ثەعلەبە!!

مەسەلەكە لەپێغەمبەردا نەوەستا، لەئەصحابیشدا نەوەستا، عەرشی عەزیمیش تەداخولی كرد، خوای پەروەردگار جوبریلی نارده خزمەت رَسُولُ الله و ئەم چەند ئایەتەی سوورەتی (تەوبە)ی لەبارەی ئەم بەڵێن شكێنەو نموونەی وەكو ئەو تا رۆژی قیامەت نارده خوارەوەو فەرموون با بچینە خزمەت ئایەتەكان: ﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ واتە: لەدووڕووەكان كەسانێك هەن كەپەیمانو بەڵێنی بەخوا داوە: سوێند بەخوا ئەگەر خوا ماڵوسامانو داراییمان پێببەخشێت، بەڕاستی زەكاتو خێری لێدەكەینو بێگومان لەڕیزی كەسانی چاكو خواناسیشدا دەبین! بەڵام ﴿ فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ ﴾، جا كاتێك خوا لەفەزڵو بەرەكەتی خۆی پێدانو بەهرەوەری كردن، ئەوان ڕەزیلییان تێداكرد لەكاتێكدا كەئەوان هەمیشە لەبەڵێنو پەیمان پشت هەڵكەرن: ﴿ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقاً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾، ئەوسا ئیتر بەهۆی ئەو

بەڵێن شکاندنەیانەوە, خوا نەخۆشی دووڕوویی لەدڵو دەروونیاندا چەسپاندو دامەزراند تا ئەو ڕۆژەی ئامادە دەبن لەبەردەم دادگای خواییدا بۆ لێپرسینەوە, چونکە نافەرمانیو سەرپێچییان کردووە لەو بەڵێنەی کەدایان بەخواو بەهۆی ئەوەشەوە کەدرۆیان دەکرد: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّهَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾, مەگەر ئایا ئەوانە نەیاندەزانی بەڕاستی خوای گەورە ئاگادارە بەنهێنیو چپەو سرتەیان, ئایا نەشیاندەزانی کە بەڕاستی خوا بەتەواوی زاناو ئاگایە بەهەموو نهێنیو شاراوەکان؟!

بەڵێ ئیمانداران: کەئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە, خزمەکانی (ثەعلەبە) دوعاکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم و ئایەتەکانی قورئانیان بۆ ثەعلەبە گێڕایەوە کە لەبارەیەوە هاتوونە خوارەوە, ثەعلەبەی وەعدو بەڵێن شکێنو بێوەفا ئەمجا زانی وەزعەکە شلۆقە بۆیە زەکاتەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم و پێغەمبەر فەرمووی: تازە بەدەست من نیە, خوا قبووڵی ناکات, تازە تەواو, وەعدو بەڵێنت شکاند, بەهیلاك چووی. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەژیانی خۆیدا لێی وەرنەگرت, هێنای بۆ خزمەت ئیمامی ئەبوبەکر ئەویش لێی وەرنەگرت, ئیمامی عومەریش هەروەها, ئەوەبوو لەزەمانی ئیمامی عوسماندا دیسانەوە زەکاتەکەی هێنا, بەلاَم ئیمامی عوسمانیش فەرمووی: چونکە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەژیانی خۆیدا لێی قبووڵ نەکردیو ئیمامی ئەبوبەکرو عومەریش وەریان نەگرت, منیش ناتوانم لێت وەربگرم.. ئەوەبوو بەکافریو مونافیقی سەری نایەوە!

جا ئازیزانم: با ئاگاداربینو لەم بەسەرهاتە پەندو عیبرەت وەرگرین, تەماشاکەن چۆن سەرەتا دەیانو سەدان وەعدو بەڵێنی دەدا بەخوای گەورە کەئەگەر تۆزێ ژیانی ببووژێتەوە, چەند مەردو پیاوچاکو سەخی دەبێ, بەلاَم دوایی چۆن بێوەفابوو بەرامبەر بەو هەموو خەلاَتەی کەخوا پێی بەخشی, وەعدو بەڵێنی شکاندو وەفای پێنەکرد, خوای گەورە بەهیلاکی بردو تا ڕۆژی قیامەت بەسەرهاتەکەی لەقورئاندا تۆمارەو سەرەنجامی هەموو ئەو کەسانەش باس دەکات کەوەکو ثەعلەبە بێوەفاو بەڵێن شکێنن.

جارێکی تریش وەصیەتەکەی خوای گەورە بەبیری خۆمو ئێوەش دێنمەوە کەفەرمووی: ﴿ وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ﴾

خوای گەورە بەڕەحمی خۆی عاقیبەتی هەموولایەکمان خێرکا

لەوەفاداران بین بەرامبەر بەو هەموو خەڵاتو بەخششانەی کەخوای گەورە پێی بەخشیوینو لەژمارە نایەن ..

خوای گەورە لامان دا لەدووڕوویی .. لەبێوەفایی لەبەڵێن شکێنی

ألّلهُمَّ آمين

# ووتـاری ژماره سی وچوار

# وەفاداری لەبەلێن و پەیماندا

## بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى :

﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ, الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ, وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ, وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ, وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ, إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ, فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ, وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴾

(المؤمنون 1 ـ 8)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( المُسْلِمُونَ تَتَكافَأُ دِماؤُهُمْ: يَسْعى بِذِمَّتِهِمْ أَدْناهُمْ, ويُجيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصاهُمْ, وَهُمْ يَدٌ عَلى مَنْ سِواهُمْ, يَرُدُّ مُشِدُّهُمْ عَلى مُضْعِفِهِمْ, وَمُتَسَرِّعُهُمْ عَلى قاعِدِهِمْ, لا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكافِرٍ, وَلا ذُو عَهْدٍ في عَهْدِهِ )

( رَواهُ أَبو داود, وَقالَ: الألباني: حَسَنٌ صَحيحٌ )

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَعين إلى يوم ألدين .**

ئيمانداران‌و خواناسانی بەڕێز: پشتیوان بەخوای گەورەومیهرەبان دەچینەوە خزمەت وەصیەت‌و ڕاسپاردەی نوێیەمی پەروەردگار کەفەرمووی: ﴿ وَبِعَهْدِ اللَّه أَوْفُوا﴾

لەووتاری ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کەوەفاداری لەبەجێ‌هێنانی وەعدو بەڵێندا, دوو بەشە, یەکەمیان: وەفاداری لەبەجێ‌هێنانی ئەو وەعدو بەڵێنانەی کەئینسان بەخوای خۆی دەدات, کە لەووتاری ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە, بەشی دووەمیش: بریتییە لەوەفاداری لەبەجێ‌هێنانی ئەو وەعدو بەڵێنانەی کەئینسانەکان, بەتایبەت ئیمانداران لەنێوان خۆیاندا بەیەکتری دەدەن.بەڕێزان: بەڕاستی ژیانی بەختەوەرانە چەند بنەمایەکی هەیە, یەکێ لەوانە بەوەعدی‌و ڕاستگۆییە لەبەڵێن داندا, لەبەرئەوەی هەرکاتێ بەجێهێنانی وەعدو بەڵێن وەکو دین تەماشاکراو ژینی پێ ڕازێنرایەوە, ئەو کاتە چ تاکە کەس, چ خێزان‌و کۆمەڵ, چ حکومەت‌و دەسەڵات, قەدرو حورمەت پەیدا دەکاو سیقەو متمانە لەنێواندا دروست دەبێ. بەڵام هەرکاتێ وەعدو بەڵێن تەنها قسەی سەر زار بوو, وەکردەوەی پێنەکراو بۆ دەست پێوەنانی بەرامبەربوو, ئەوە بەڕاستی ئەگەر تاکە کەس بێ بەکەسێکی بێ‌کەسایەتی‌و درۆزن‌و بێ‌وەعد دەناسرێ‌و خەڵکی مەگەر لەبەر ناچاری ئەینا تێکەڵاوی ناکەن‌و خۆی لێ دەپارێزن. وەئەگەر خێزان بێ‌وەعدو بەڵێن بێ, ئەو خێزانە خۆشەویستی ناو کۆمەڵگا نابێ‌و خەڵکی پاک‌و چاک متمانەی پێناکەن‌و حەز بەخزمایەتی‌و دۆستایەتی ناکەن. وەئەگەر بازنەی وەعدو بەڵێن شکاندن گەورەتربوو, وەگەیشتە ئاستی حکومەت‌و کاربەدەستان‌و فەرمانبەرانی دەوڵەت, ئەوە زەرەرو زیانەکەی گشتی‌و گەورەتر دەبێت‌و ئەو حکومەت‌و سوڵتەیە بەرەو گەندەڵی ئیداری دەڕوات‌و میللەت سیقەو متمانەی بەکاربەدەستان‌و حکومەت‌و دەوڵەتەکەی نامێنێ. چونکە دەیان جار ئەمڕۆو سبەی پێکراوەو وەعدی پێدراوەو جێبەجێ نەکراوە. بەم شێوەیە ئەو حکومەتە خۆشەویستی لای میللەت‌و گەل نابێ‌و وای لێدێ کاربەدەستان لەدۆڵێکدا دەبن‌و میللەتی هەژاریش لەدۆڵێکدا دەژین‌و ئەمەش سەرەتای بەدبەختی‌و چارەڕەشی ئەو حکومەت‌و میللەتە دەبێ.

هەربۆیە کاتێ دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز دەبینین لەچەندین ئایەتدا، هەرجارەی بەشێوەیەك باسی وەفاداری لەبەجێهێنانی وەعدو بەڵێندا کراوەو بەگشتی لە (21 ئایەتی) قورئانی پیرۆزدا باسی وەفاداری بەرامبەر وەعدو بەڵێن کراوەو لەچەندین شوێندا لەگەڵ نوێژو ڕۆژوودا باسکراوە. وەکو لەسوورەتی (المُؤْمِنُون)دا کەخوای پەروەردگار باسی سیفاتو ڕەوشتو کرداری بڕوادارانی ڕاستەقینە دەکات، دەفەرموێ ئەوانەن کەنوێژەکانیان بەخشوعو ملکەچیو دڵئارامیەوە دەکەنو زوبانیان لەقسەو گوفتاری بێسوودو بێهوودە دەپارێزن، وەئەگەر خوا ماڵی پێبەخشین زەکات دەدەن، وەداوێن پاکنو دوورن لەڕەوشت نزمی، دوای ئەم ڕەوشتە بەرزانە، باسی ڕەوشتێکی زۆر گەورەی تری ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴾(المُؤْمِنون 8)، واتە: ئیمانداری ڕاستەقینە ئەوانەن کەچاودێری ئەمانەت دەکەن کەلایان دانراوەو خیانەتی لێناکەن تا دەیدەنەوە دەست خاوەنەکەی وەکو چاوی خۆیان دەیپارێزن، هەروەها چاودێری وەعدو پەیمانو بەڵێنەکانیان دەکەنو پشتگوێیان ناخەن، وەهەر وەعدو بەڵێنێکیاندا جێبەجێی دەکەن.

جا تەماشاکە ئیمانداری بەڕێز، چۆن ئەم ئیسلامە بەرزو بەڕێزە، لەگەڵ ئەوەدا کەنوێژکردنو زەکات دانو زمان پاکیو داوێن پاکی کردووە بەنیشانەو سیمای ئینسانی ئیماندارو هەرکەسێ ئەم ڕەوشتانەی نەبێ یان هەر ئیمانی نیە، یان ئیمانەکەی کزو لاوازو بێهێزو پێزە، بەهەمان شێوەش پاراستنی ئەمانەتو بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێن بەشێکە لەڕەوشتی ئیمانداران دەبێ وەکو پاراستنی نوێژو زەکات تەماشای بکرێ، کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر موسڵمان هەیە زۆر نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەداو زەکاتیش دەدات، بەڵام لەوەعدو بەڵێندا کەس سیقەی پێی نیە. ئەمڕۆ خاوەن پیشەکان دەیان وەعدو بەڵێن بەخەڵکی دەدەن کەچی هیچ وەعدێك لەکاتی خۆیدا جێبەجێ ناکەن، بۆیە ئەمڕۆ کارو پیشە، بازاڕو کڕینو فرۆشتن سیقەو متمانەی تێدا نەماوەو ئەو کەسەش کەوەعد دەداو جێبەجێشی ناکات، لەوانەیە خۆیشی بەگوناهبار نەزانێ، بەڵام قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە کەچۆن ئینسان بەنوێژنەکردنو زەکات نەدانو زیناکردن (پەنا بەخوا) دینو ئیمانەکەی کزو کوژاوە دەبێو نزیکی ئەوە دەبێتەوە ناسنامەی ئیمانداری لێ

وەریگیرێتەوە, بەهەمان شێوەش هەرکەسێ وەعدو بەڵێنی ڕاستو دروست نەبێ دەبێ لەئیمانی خۆیو عاقیبەتی خۆی بترسێو بەخۆیدا بچێتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: هەر لەبەر گرنگیو گەورەیی پاراستنی وەعدو بەڵێنە کەخوای گەورە لەسوورەتی (البقرة ـ ئایەتی 77)دا, جارێکی تر لەباسی ڕەوشتی باشو ئیمانی ڕاستەقینەدا لەگەڵ ئیمان بەخواو بەڕۆژی دواییو پێغەمبەرانو فریشتەکانو کتێبە ئاسمانیەکان, وەماڵو سامان بەخشینو نوێژکردنو زەکات دان, دەفەرموێ یەکێ لەکردارە بەرزو پەسەندەکان ئەوەیە: ﴿ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ﴾ واتە: ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کەکاتێك پەیمانو بەڵێنێك دەدەن, وەفادارن بەرامبەر پەیمانەکانیانو لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا جێبەجێی دەکەن.

هەروەها لەسوورەتی (الإسراء ـ ئایەتی 34)دا خوای گەورە جارێکی تر ئاگادارمان دەکاتەوە کەئاگامان لەوەعدو بەڵێنەکانمان بێت, چونکە بەرپرسیارین بەرامبەری, وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً ﴾ واتە: وەفا بکەن بەو بەڵێنو پەیمانەی کە بەخەڵکی دەدەن, چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لەبەرامبەر بەڵێنو پەیمانەوەو, وەعددان هەروا قسەیەکی سادە نیە بەسەریدا بڕۆیو لایەنی بەرامبەرتی پێ بەرێبکەیو بخەڵەتێنی, بەڵکو ئینسان لەدونیاو قیامەتدا بەرپرسیارە لەهەر وەعدو بەڵێنێك کە بەهەرکەسێکی دابێت..

ئیمانداران: ئێستاش بابچینە خزمەت گوڵزاری فەرموودەکانی سەروەرو سالارمان, تاجی سەرو نووری چاومان, حەزرەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بزانین ئەو پێشەوای دونیاو قیامەتو شەفیعی ڕۆژی مەحشەرمان لەبارەی بەجێهێنانی وەعدو بەڵێنەوە, وەسزای بەڵێن شکێنانو بێوەعدانەوە چی فەرمووە !

ئیمامی ئەحمەدو طەبەرانی لەصەحابی پایەبەرز (عوبادەی کوڕی صامتەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی, پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أَضْمَنُوا لي سِتًّا مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَضْمَنْ لَكُمُ الجَنَّةَ) فەرمووی: ئەی ئیماندارانی ئومەتم, ئێوە وەعدو بەڵێن بدەن بەمن کەشەش کردەوە جێبەجێبکەن, منیش زەمانەتتان دەدەمێ کەخوای گەورە بەڕەحمی خۆی, بەهۆی ئەو شەش ڕەوشتە جوانەوە دەتانخاتە

بەهەشتەوە! سُبْحانَ الله لەم موژدە گەورەیە, بەهەشت, بەڵێ ئەو بەهەشتەی کەهەرکەسێ بەقەدەر دارگۆچانێکی لێ دەستکەوێ چاکترە لەهەموو دونیاو ئەوەش کە لەدونیادا هەیە, کێش ضەمانەتەکە ئیمزادەکات؟ صادِقُ الأمین, ئەو کەسەی کە﴿ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى, إِنْ هُوَ إِلَّا وحْيٌ يُوحَى ﴾(النجم 3 ـ 4).

دەبا بزانین ئەو شەش کردەوەیە چیە؟ خۆشەویستمان دەفەرموێ ئەمانەن:

**یەکەم**: (أصْدِقُوا إذا حَدَّثْتُمْ), هەرکاتێ قسەتان کرد ڕاستگۆبن‌و درۆ مەکەن.

**دووەم**: (وَأَوْفُوا إذا وَعَدْتُمْ), هەرکاتێ وەعدو بەڵێنتان دا بەهەر کەسێك وەعدو بەڵێنەکانتان بێننەجێ‌و وەعدە بەخیلاف مەبن.

**سێیەم**: (وَأَدُّوا إذا ائْتُمِنْتُمْ), هەرکاتێ ئەمانەتتان لا دانرا, بەڕێکوپێکی‌و سەر ڕاستی تەسلیمی دەستی خاوەنەکەی بکەنەوەو خیانەتی تێدا مەکەن.

**چوارەم**: (وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ), داوێنتان بپارێزن لەزیناو داوێن پاك بن.

**پێنجەم**: (وَغُضُّوا أَبْصارَكُمْ), چاوتان لەڕوانین بۆ ناموس‌و شەرەفی خەڵکی بپارێزن‌و تەماشای ئافرەتی نامەحرەم مەکەن.

**شەشەم**: (وَكُفُّوا أَيْدِيكُمْ), واتە: دەستتان بپارێزن لەهەموو ناشەرعییەك.

صَدَقْتَ یا رَسُولَ الله وَبِالحَقِّ نَطَقْتَ, بەڕاستی هەر کۆمەڵێك, ئەندامەکانی لەقسەکردندا درۆ لەگەڵ یەکتر نەکەن‌و لەوەعدو بەڵێندا ڕاست بکەن لەگەڵ یەکترو یەکتری نەخەڵەتێنن‌و خیانەت لەئەمانەتی یەکتر نەکەن‌و لەچاوو داوێنی یەکتری ئەمین بن‌و بەدەست ئازاری یەکتری نەدەن ئەوا بەڕاستی هەر لەدونیادا ژیانیان بەهەشتە, پێش گەیشتن بەبەهەشتی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی.

کەواتە بەڕێزان: بەهەشت تەنها بەعیبادەتی ڕووت وەکو نوێژو ڕۆژوو و زەکات‌و حەج بەدەست نایەت ئەگەر ڕەوشتە بەرزو بڵندەکانیشی لەگەڵدا نەبێ کەپێغەمبەری خوا لەچەند ووشەیەکی کورت‌و پوختدا ئاماژەی پێکردن. بەڵێ ئەم ئیسلامە ئازیزە کەچۆن فێرمان دەکات بەندایەتی‌و عیبادەتمان بۆ خوای خۆمان بەو شێوە ڕێکوپێکەی کەهەیە جێبەجێ بکەین, بەهەمان شێوەش فێرمان دەکات چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتری بکەین کە بەشێوەیەك بێ لەگەڵ ئینساندا بگونجێ. کەواتە ئیسلام هەم دینە هەم ژینە,

هەر دینێكو خواپەرستیەك بەپێی ئیسلام جێبەجێ نەكرێ, هەواو ئارەزووپەرستیەیە نەك خواپەرستی, هەر ژینێكیش ئیسلام ئاراستەی نەكات ژین نیەو ژانە.

ئیمانداران: هەروەكو وەعدو بەڵێن بردنە سەرو بەجێهێنانی وەعدو پەیمان یەكێكە لەو شتانەی كەدەبنە هۆی چوونە بەهەشت,بەپێچەوانەشەوە بەڵێن شكاندنو پشتگوێخستنی وەعدو بەڵێن, دەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان نیشانەیەكی گەورەی دووڕوان (مُنافقین)ی تێدا بێتەجێ, خوا پەنامان بدات لەدووڕوویی, هەروەكو پێغەمبەری خوا صلّی اللهُ عَلَیه وَسَلّم فەرموویەتی: (آیَةُ المُنافقِ ثَلاثٌ) نیشانەی ئینسانی مونافیقو دووڕوو سێ شتە:

**یەكەم:** (إذا حَدَثَ كَذَبَ) هەركاتێ قسەی كرد درۆ دەكاتو ناتوانێ قسەیەك بەڕاستی بگێڕێتەوەو درۆیەكی تێكەڵ نەكات.

**دووەم:** (وإذا وَعَدَ أخلَفَ), هەركاتێ وەعدو بەڵێنیدا جێبەجێی ناكاتو گوێ بەوەعدو بەڵێنەكانی نادات.

**سێیەم:** سێیەم نیشانەی ئینسانی مونافیقو دووڕوو ئەوەیە: (وإذا اؤتُمِنَ خانَ) هەركاتێ ئەمانەتی لا دانرا, بەفرسەتی دەزانێو خیانەتی لێدەكاتو نایداتەوە بەخاوەنەكەی (ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان كردووە).

كەواتە: با ئاگاداربینو بزانین وەعدو بەڵێن دان بەبێ جێبەجێكردن دەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان ڕەوشتێكو نیشانەیەكی دووڕوویی تێدا بێتەجێ.

لەفەرموودەیەكی تردا كەئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕیوایەتی كردووە, پێغەمبەری خوا صلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم فەرموویەتی: (لا دینَ لِمَنْ لا عَهْدَ لَهُ) هەركەسێ وەعدو بەڵێنی دروست نەبێو بەڵێنەكانی هەر قسە بنو كردەوەیان لەگەڵ نەبێ, ئەوە ئەو كەسە دینو ئیمانەكەی تەواو نیەو لاوازە!

ئیمانداران: وەفاداری لەبەجێهێنانی پەیمانو بەڵێندا ڕەوشتی پێغەمبەرانی خوایە (سەلامی خوا لەهەموویان بێت), بۆ نمونە, قورئانی پیرۆز كەوەصفی حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیهِ السَّلام) دەكات, دەفەرموێ:﴿ وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى ﴾(النجم 37), واتە: ئەو ئیبراهیمەی كەهەموو پەیمانەكانی بەتەواوی بەجێهێنا.

هەروەها خوای گەورە وەسفو ستایشی حەزرەتی ئیسماعیل دەکاتو دەفەرموێ:
﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً ﴾ (مريم 54), واتە: ئیسماعیلیش باس بکە لەقورئاندا, بەڕاستی ئەو لەبەڵێنو پەیمانەکانیدا ڕاستگۆبوو, ئەو پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوابوو.

ئێستاش با بچینەوە خزمەت سەردارو گەورەی هەموو پێغەمبەران, تاجی سەرو نوری چاومان, خۆشەویستتر لەخۆمانو دایكو باوكو هەموو کەسێکمان, حەزرەتی محمد المصطفى صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, با بزانین چۆن بەکردەوە فێری ڕاستگــۆیی لەوەعدو بەڵێنمان دەکات.

صەحابەیەك کەناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبولحەمسائە ( خوا لێی ڕازی بێ ) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ لەپێش ئەوەدا کەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بکرێ بەپێغەمبەر, شتێکم لێکڕی هەندێ لەبەهاکەی لەسەرم مابوو, نەمدابوویە, وەعدو بەڵێنم دایە کە لەفڵان شوێندا, لەفڵان ڕۆژدا, لەو کاتەدا ئەوەی کەلەلام ماوە تەسلیمی بکەم, بەڵام بەهۆی مەشغوڵی بەشتیترەوە وەعدەکەی خۆمم لەبیر چۆوە. پاش سێ شەو ئەمجا بیرم کەوتەوە کەمن وەعدم داوە کەبچم ئەو پارەیە بۆ حەزرەتی محمد ببەم, خۆ ئەو لەوێ چاوەڕێم دەکات. بۆیە بەپەلە ڕۆیشتم بۆ شوێنە دیاریکراوەکە, تەماشادەکەم وا پێغەمبەری خوا لەوێیە هێشتا هەر چاوەڕێی من دەکات! بەتەریقیەوە چوومە خزمەتیو عەرزم کرد: قوربان, ئەوە خۆ من وەعدەکەی خۆمم بیر چووبۆوە, ئەی جەنابت لەکەیەوە لێرە وەستاوی؟ وامزانی ئەو ڕۆژە کەهاتووەو من نەهاتووم ڕۆیشتۆتەوەو ئێستا سەری لێرە داوەتەوە بزانێ نامبینێ. بەڵام پێغەمبەری خوا فەرمووی: (يا فَتى لَقَدْ شَقَقْتَ عَلَيَّ, أنا ها هُنا مُنْذُ ثَلاثٍ أنْتَظِرُكَ)(رَواهُ أبوداود), فەرمووی: ئەی کوڕی لاو, بەڕاستی تووشی سەغڵەتیو زەحمەتت کردم, ئەمە سێ شەوە من لێرە چاوەڕوانت دەکەم!

بەڵێ ئیمانداران: ئەوە پێغەمبەرەکەمانە تەنها لەبەرئەوەی وەعدیداوە لەفڵان کاتو شوێندا چاوی بەو کەسە بکەوێ, ماوەی سێ شەو وازی لەهەموو ئیشوکارێکی خۆی هێناوەو چاوەڕێی کردووە! بەڵی سێ شەو, بەقسەو ژماردن سێ شەو ئاسانە, بەڵام هەرکەسێ خۆی چاوەڕێی کەسێکی نەکردبێ نازانێ چاوەڕوانی ئــەگــەر چەند دەقیقەیەکیش بێ چەنـــــد

زەحمەتو نارەحەتە.

نمونەیەکی ترتان عەرز دەکەم لەسەر وەفاو بەڵێنی ڕاستو دروستی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, لەزەمانی پێش ئیسلامدا کلیلی دەرگای کەعبەی پیرۆز بەدەست تایەفەی (بَني عَبدُ الدَّار)ەوە بوو, کاتێکیش خوای گەورە حەزرەتی محمدی صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّم کرد بەپێغەمبەر, لەو کاتەدا کلیلی کەعبە بەدەست کابرایەکەوە بوو ناوی (عوثمانی کوڕی طلحە)بوو کەلەهۆزی (بَني عَبدُ الدَّار)بوو, ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم لەتەنیشت کەعبە دانیشتبوو, چاوی لێبوو وا چەند کەسێك لەگەورەپیاوانو ناودارانی قورەیش وا چوونە لای (عوثمانی کوڕی طلحە)و ئەویش دەرگاکەی کەعبەی بۆ کردنەوەو چوونە ژوورەوە, پێغەمبەری خواش بەخێرایی چوو بۆ لای عوثمانو فەرمووی: (يا عُثمان, هَلا أدْخَلْتَني), ئەی عوثمان, ئایا ڕێگام دەدەی منیش بچمە ژوورەوەی کەعبەی پیرۆز؟ عوثمان بەزمانێکی ڕەقو زبر وەڵامی دایەوەو گوتی: نەخێر, ڕێگا بۆ هەموو کەس هەیە تەنها بۆ تۆ نەبێ! پێغەمبەری خوا هیچ خۆی توورە نەکرد, بەڵکو بەنەرمیەکەوە فەرمووی: (يا عُثمان لَعَلَّ يَوْماً يَأتي يَكونُ المِفْتاحُ مَعي وَلا أُعْطيهِ لَكَ) فەرمووی: ئەی عوثمان, دونیا هەروا نابێ, ڕەنگە ڕۆژێك بێتە پێشەوە, من دەسەڵات پەیدابکەمو تۆ بێدەسەڵات بکەویو کلیلی ئەم کەعبەیە لای من بێتو تۆ داوای بکەیو منیش نەتدەمێ ! عوثمانی کوڕی طلحە بە لەخۆباییبوونو گاڵتەجاڕییەوە گوتی: (إنْ جاءَ ذلِكَ اليَوْمِ فَبَطْنُ الأرْضِ خَيْرٌ لي مِنْ ظَهْرِها) گوتی: دە هەرکاتێ ئەو ڕۆژە هات ئەی محمد کەتۆ کلیلی کەعبەت بکەوێتە دەستو من چاوەڕێی دەستی تۆ بم, ئەوە ئەو کاتە ناوسکی زەویو قەبر بۆ من باشترە تا ئەوەی لەسەر زەوی بژیم!

بەڵێ ئەم ووتوێژە لەنێوانیاندا ڕوویداو لەیەکتری دوورکەوتنەوە, ڕۆژگار هاتو چوو, ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە, ئیسلام هێزو دەسەڵاتی پەیداکردو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم شاری مەککەی فەتح کردو لەبتو بتپەرستان پاکی کردەوە, خەڵکی مەککە چەند کەسێکی کەمی نەبێ هەمووی موسڵمان بوون, یەکێ لەوانە عوثمانی کوڕی طلحە بوو, پێغەمبەری خوا چووە لای کەعبەوەو چاوی بە عوثمان کەوتو فەرمووی: (يا عُثمان أيْنَ المِفْتاح؟) ئەی عوثمان کوا کلیلەکەی کەعبە؟ عوثمان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا

کلیلەکەی کەعبە لەماڵەوە دامناوە، لای دایکم، بچم بیهێنمە خزمەتت؟ فەرمووی: برۆ بیهێنە. عوثمان چووە ماڵەوەو بەدایکی گوت: دایە گیان کلیلەکانی کەعبەم بدەیە پێغەمبەری خوا داوای دەکات. دایکی گوتی: ها رۆڵە گیان، ئەوە ئەو رۆژەیە کەپێغەمبەری خوا پێی گوتی رۆژێك دێ کلیلی کەعبە دەست من دەکەوێ‌و تۆ چاوەڕێی دەستی من دەکەی! عوثمان گوتی: دایە واز لەو قسانە بێنە خێرا کلیلەکەم بدەیە پێغەمبەری خوا چاوەڕێمەو موشتاقە بۆ چوونە ناو کەعبەوە تا لەبت پاکی بکاتەوە، دایکی گوتی: دەبرۆ وا کلیلەکان لەناو جلوبەرگە دانراوەکەمدایە. بەڵێ تا عوثمان کلیلەکەی دۆزیەوە ماوەیەکی پێچوو و کەمێ دواکەوت، پێغەمبەری خوا فەرمووی: عوثمان دواکەوت‌و نەهاتەوە، ئەی عومەری کوڕی خەطاب، بچۆ بۆ ماڵیان‌و کلیلەکەی لێ وەربگرەو بەپەلە بۆم بێنە! حەزرەتی عومەر چوو بۆ ماڵی عوثمانی کوڕی طلحەو لەدەرگای‌داو فەرمووی: ئەی عوثمان کوا کلیلەکە؟ لەو کاتەدا دایکی عوثمان هەستاو خێرا کلیلەکەی هێناو دایە دەست ئیمامی عومەر، چونکە دەیزانی عومەر نەرمونیانی نیە بەرامبەر هەرکەسێك کەسەرپێچی لەفەرمانی پێغەمبەری خوا بکات. ئیمامی عومەر کلیلەکەی وەرگرت‌و (عوثمانی کوڕی طلحە)ش بە بەشوێنیدا هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم، حەزرەت کلیلەکانی وەرگرت‌و رووی کردە عوثمان‌و فەرمووی: (يا عُثمان أتَذْكُرَ يَومَ قُلْتُ لَكَ: لَعَلِّي آخِذُهُ مِنْكَ فَلا أُعْطيهِ لَكَ؟) فەرمووی: ئەی عوثمان ئەو رۆژەت لەبیر نیە کە لەبەردەم دەرگای کەعبەدا نەتهێشت بچمە ژوورەوە، منیش پێم گوتی: لەوانەیە رۆژێك بێتە پێشەوە من ئەم کلیلانەی کەعبەم لەدەستدا بێ‌و تۆش چاوەڕێی ئەوە بکەی بیدەمەوە دەستت، بەڵام نەتدەمەوە، ئایا لەبیرتە؟ عوثمانی کوڕی طلحە بێدەنگ بوو، تەریق بۆوە، لەشەرمان سەری دانەواند. لەو کاتەدا عەباسی مامی پێغەمبەر هات‌و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا دەرگای کەعبە بکەوەو کلیلەکان بدە بەدەست من، با لەمەودوا بەدەست بنەماڵەی (عَبدُالمُطَّلِبْ)ـەوە بێ، کلیلەکان مەدەوە دەست عوثمانی کوڕی طلحە. بەڵام ئەوە پێغەمبەری خوایە، زۆر لەوە گەورەترە کەتۆڵە لەکەس بکاتەوەو ئەمانەت تەسلیمی خاوەنەکەی نەکاتەوە، وەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم کەداوای کلیلەکەی لەعوثمان کردو پاشان ئیمامی عومەری بۆ نارد

مەبەستی ئەوەبوو کەدوای کردنەوەی دەرگای کەعبە تەسلیمی بکاتەوە, بۆیە ئەو بەڵێنەی کە لەناو دڵی خۆیدا دابووی کەکلیلەکە بداتەوە بەعوثمانی کوڕی طلحە هەرچەندە بەزوبانیش نەیگوتبوو, هەر لەبیریبوو, بۆیە فەرمووی: (لا يا عَبَّاس, إِنَّهُ يَوْمَ بِرٍّ وَوَفَاءٍ, يَوْمَ بِرِّ وَوَفَاءٍ) دوو جار لەسەر یەك فەرمووی: نا, نا ئەی عەباس, نابێ دەست بەسەر کلیلەکانی کەعبەدا بگرمو لەعوثمانی بسەنمو بیدەم بەتۆ, چونکە ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەکردنو وەفادارییە بەرامبەر بەبەڵێنو پەیمان, ئێمە وەعدو بەڵێنمان دا بەخەڵکی مەککە, کەژیانو بیروباوەڕو ماڵو سامانیان پارێزراوەو کەس دەستیان بۆ درێژ ناکات, یەکێ لەوانەی بەر ئەو پەیمانو بەڵێنە دەکەوێ عوثمانە, کەکلیلەکان هەر لای خۆیو بنەماڵەکەی بێ, ئیتر چۆن بەڵێن بشکێنمو کلیلەکەی نەدەمەوە! پاشان بانگی (عوثمانی کوڕی طلحە)ی کردو لەبەرچاوی هەموو صەحابەکان فەرمووی: (خُذوها يا بَني عَبْدُالدَّارِ خالِدَةً مَعَكُمْ لا يَأْخُذَها مِنْكُمْ إِلاَّ ظالِمٌ) (رَواهُ الطَّبَراني) فەرمووی: وەرن ئەی بەنی عَبْدُالدَّارِ کلیلەکانی کەعبە وەریگرنو هەتاهەتایە لای ئێوە دەبێو هیچ کەس دەست درێژیتان ناکاتە سەرو کلیلەکەتان لێ ناسەنێ ئەو کەسە نەبێ کەزاڵمو خراپەکارە. بەم شێوەیە کلیلەکەی کەعبەی دایەوە بەعوثمانی کوڕی طلحە و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش کلیلی کەعبەی پیرۆز هەر لای بنەماڵەی عَبْدُالدَّارەو هیچ مەلیكو سەرکردەیەك بۆی نیە بچێتە ناو کەعبەوە بەئیزنو ڕەزامەندی ئەو بنەماڵەیە نەبێ, وەکو وەفایەك بۆ ئەو عەهدو بەڵێنەی کەکاتی خۆی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پێی دان.

ئیمانداران: صەحابە خۆشەویستەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم, وەسەلامو ڕەحمەتو بەرەکەتی خوای گەورەش بڕژێ بەسەر گیانی پاکی هەموو صەحابەکانی پێغەمبەری خۆشەویستدا, ئەم صەحابانە کەپەروەردەکراوی دەستی پێغەمبەری خوا بوون دەیانزانی بەجێهێنانی وەعدو بەڵێن لەئیسلامدا چەند گرنگەو پێغەمبەری خوا چەند سووربووە لەسەر بەجێهێنانی وەعدو بەڵێنەکانی, بۆیە لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هیچ وەعدو بەڵێنێك نیە کەپێغەمبەری خوا لەژیانی خۆیدا بەکەسێکی دابێ" بەڵام مەرگ ڕێگای جێبەجێکردنی نەدابێ, ئەوا صەحابەکان لەجیاتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وەعدەکەیان هێناوەتە جێ. لەو بارەیەوە دوو نمونەتان پێشکەش دەکەم:

**یەکەم:** ڕۆژێکیان جابیری کوڕی عەبدوڵلا، لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللّٰه عَلَيهِ وَسَلَّم بەرێگادا دەڕۆیشت، جابیر زۆر هەژارو نەداربوو، باوکی لەغەزای ئوحوددا شەهید کرابوو، شەش یان حەوت خوشکی هەبوو کەبەخێوکردنیان لەئەستۆی ئەودابوو. پێغەمبەری خوا زانی کەجابیر زۆر هەژارەو هیچ کارو کەسابەتێکیشی بەدەستەوە نیە، وەئەوەندەش نەفسی بەرزو خاوێنە هەرگیز ناکرووزێتەوەو داوا لەکەس ناکات، بۆیە پێغەمبەری خوا ڕووی لەجابیر کردو فەرمووی: (یا جابِر لَو جاءَ مالُ البَحْرَیْنِ لَقَسَمْتُ لَكَ وَلأعْطَیْتُكَ كَذا وَكَذا وَكَذا) فەرمووی: ئەی جابیر خەفەت لەو هەژارییەت مەخۆ، بڕیاروایە هەندێ کەلوپەلو خواردنو پارەمان لەوڵاتی بەحرەینەوە بۆ بێت بەشت بۆ دادەنێمو ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت پێدەبەخشم.

بەڵێ، ئەم وەعدو بەڵێنەیدا بەجابیرو چاوەڕێی هاتنو گەیشتنی ماڵی بەحرەینی دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وسَلَّم ڕوحم بەقوربانی بێ، نەخۆش کەوتو وەفاتی کردو پارەو ماڵەکەی بەحرەینی نەگەیشتە دەست. پاشان ئیمامی ئەبوبەکر بوو بەخەلیفەی موسڵمانانو هەموو خەڵکی کۆکردەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەرکەسێك قەرزێکی لەسەر پێغەمبەری خوایە، یان پێغەمبەری خوا وەعدو بەڵێنێکی پێداوەو بەڵام خۆشەویستی خوا فریا نەکەوتووە قەرزەکە بداتەوە یان وەعدو بەڵێنەکە بێنێتەجێ ئەوا با بێ لەجیاتی پێغەمبەری خوا ئێمە قەرزەکەی بدەینەوەو بەڵێنو وەعدەکە جێبەجێ بکەین. جابیر کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: منیش چوومە خزمەت ئیمامی ئەبوبەکرو گوتم: ئەی خەلیفەی موسڵمانان، پێغەمبەری خوا وەعدی بەمن داوەو فەرمووی: هەرکاتێ سەروەتو ماڵی ووڵاتی بەحرەین گەیشتە دەستم ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەمێ، ئێستاش وا پارەو ماڵەکە لەم ڕۆژانەدا گەیشتە دەست جەنابت، ئایا دەفەرمووی چی؟ ئیمامی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: دەبێ وەعدو بەڵێنی پێغەمبەری خوا جێبەجێ بکەینو وەرە با بڕۆین لە(بَیْتُ المال) لەماڵی بەحرەین بەشت بدەم. جابیر دەفەرموێ: ڕۆیشتینو چووینە سەر پارەکە، ئیمامی ئەبوبەکر مشتێکی لەپارەکە داو خستیە دەستمەوە، منیش دەستم کرد بەژماردنی، تەماشادەکەم پێنجسەد دیرهەمە، هەستام ویستم بڕۆم، ئیمامی ئەبوبەکر فەرمووی: دانیشە، جارێ ماوتە، منیش

دانیشتمەوە, ئەویش مشتی کردەوە بەپارەکەداو مشتێکی تری دامێ, دووبارە دەستیکردەوە بەپارەکەداو مشتێکیتری دامێ! منیش بەسەرسوڕمانەوە عەرزم کرد: قوربان, ئەی ئەم دوو مشتەیان هی چیە؟ ئیمامی ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی تۆ نالێی پێغەمبەری خوا فەرمووی: (إنْ جاءَ مالُ البَحْرَيْنِ لَقَسَمْتُ فَلَكَ عِنْدي كَذا وَكَذا وَكَذا) واتە: پێغەمبەری خوا سێ جار فەرموویەتی ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەمێ, بۆیە منیش سێ جار پێم بەخشیت بۆئەوەی وەعدو بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوا جێبەجێ بکەم. (ئەم فەرموودەیە بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە)

**دووەم:** هەموومان ئەو بەسەرهاتەمان بیستووە کە لەژیاننامەی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم هاتووە کە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا بەهاوڕێیەتی حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق" لەمەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە, لەڕێگادا یەکێ لەو کەسانەی کە بەتەماحی خەڵاتەکەی قورەیش کەدووسەد حوشتر بوو شوێنیان کەوتبوو, بەڵام کەلێیان نزیك کەوتەوە بەخۆیو ئەسپەکەیەوە خەریك بوو بەناخی زەویدا برۆنە خوارەوە, لەبەر ئەوە داوای ئەمانی لەپێغەمبەری خوا کردو ئیمانی هێنا, پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم فەرمووی: (إذْهَبْ يا سُراقَةُ وَلَكَ سَوارِي كِسْرى), ئەی سوراقە بگەڕێوە ڕۆژێك دەبێ کەتۆ بازنەکانی کیسرای فارست لەدەستدا دەبێ! بەڵێ سوراقە گەڕایەوەو ڕۆژگار هاتو چوو, پێغەمبەری خوا دەوڵەتە بێوێنەکەی ئیسلامی لەمەدینەدا دامەزراندو پاشان فەتحی مەککە کراو ئەوەبوو پێغەمبەری خوا لەتەمەنی (63)ساڵیدا وەفاتیکردو بەتێکڕای دەنگ" ئیمامی ئەبوبەکر بوو بەخەلیفەی موسڵمانانو ئەویش وەفاتیکردو ئیمامی عومەر بەهەڵبژاردن بوو بەخەلیفەی دووەمی موسڵمانانو ئەوەبوو لەسەردەمی ئیمامی عومەردا ئیسلام گەیشتە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو موسڵمانەکان توانییان بەعەدالەتی ئیسلام قەڵای پڕ زوڵمو ستەمی کیسرای فارس برووخێننو دەست بەسەرماڵو موڵکی فارسدا بگرن. یەکێ لەدەستکەوتی موسڵمانان بازنەکانی کیسرای پاشای فارس بوو کە لەشەڕی مەدائیندا دەست موسڵمانەکان کەوت, کاتێ دەستکەوتەکان گەیشتنە شاری مەدینەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمو ئیمامی عومەر تەماشای کرد وا بازنەکانی کیسرا لەناو دەستکەوتەکاندایە, یەکسەر وەعدو بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای هاتەوە یاد

کەکاتی خۆی بەسوراقەی دابوو, بۆیە فەرمووی: کوا سوراقەی کوڕی مالیك لەکوێیە؟ سوراقە فەرمووی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران لەخزمەتتدام. فەرمووی: وەرە پێشەوە. ئەمجا ئیمامی عومەر بازنەکانی هەڵگرتو کردیە دەستی سوراقەوەو وەعدو بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای هێنایەجێ, وەحەزرەتی عومەرو سوراقە دەستیان کرد بەگریانێکی زۆر بەکوڵو یادی پێغەمبەرو هیجرەتو جیهادو تێکۆشانو ڕووی موبارەکیو زەردەخەنەی سەر لێویو وەعدو بەڵێنی ڕاستو دروستیان کردەوە, هەموو خەڵکی ناو مزگەوتەکەش دەستیان کرد بەگریان..

بەڵێ ئەوە وەفادارییە لە بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێندا, دوای شانزە ساڵ ئیمامی عومەر هێشتا وەعدەکەی پێغەمبەری خوای لەبیرەو جێبەجێی دەکات, ئیمامی عومەر نەیفەرموو خۆ سوراقە بەشداری شەڕی مەدائینی نەکردووەو ئەو هەموو سەرکردە پاڵەوانانەی ئیسلام لەپێشترن تا بازنەکانی پێببەخشرێت نەخێر, وا بیری نەکردەوە, بەڵکو وەعدو بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای جێبەجێ کرد!

بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی کاتێ ئەم بەسەرهاتانە باس دەکەین گەورەیی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێ, ئەو ئیسلامەی ئەو مرۆڤانەی دروست کرد, ئەو مرۆڤانەی کەپێش هاتنە ناو ئەم دینە پیرۆزەوە, ئەوەی کەنرخی نەبوایە لایانو حیسابیان بۆ نەکردایە بەجێهێنانی وەعدو بەڵێن بوو. بەڵام وەکو باسمان کرد چۆن ئیسلام بەهای ڕەوشتە بەرزەکانی گێڕایەوە بۆ ناو مرۆڤایەتی بەتایبەت سەرکردەو لێپرسراوانی فێرکرد کەهەرگیز وەعدو بەڵێنی درۆ بەهاوڵاتیانو میللەت نەدەن, چونکە هەرکاتێ سەرکردەو مەسئول وەعدو بەڵێنی شتێکی بەتاکە کەسێك یان تێکڕای میللەتو گەل دا, بەڵام کەسەکە یان میللەتەکە هەر قسەی بیستو کردەوەی نەبینی, ئەوە ئەو لێپرسراوە, وەهەروەها حکومەتەکەی تووشی دوو بەڵای زۆر گەورە دەبن, یەکەم: بەر هەڕەشەی خوای پەروەردگار دەکەون کەدەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ, كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ ﴾(الصف 2 ـ 3), واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە, بۆچی شتێك دەڵێنو ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان پێچەوانەی کردارتانە؟ دزێوترین شت لای خوا ئەوەیە کەشتێك بڵێنو جێبەجێی نەکەن ..

دووەم: هەروەها بەڵای دووەم ئەوەیە: کەسیقەو متمانە نامێنێ لەنێوان حکومەت‌و میللەتدا, میللەتی ڕەش‌وڕووت‌و هەژار نائومێدو ڕەشبین دەبێ بەرامبەر هەر وەعدو بەڵێنێك کە لەلایەن سەرکردەکانی وڵاتەکەیەوە پێی دەدرێ, کە بەداخەوە واقیعی ئەمڕۆ ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کەسیقەو متمانە لەنێوان حکومەت‌و میللەتدا نەماوە, لەبەرئەوەی میللەت ئەوەندەی وەعدو بەڵێن‌و پەیمان پێدراوە, بەتایبەت لەو کاتانەی کەکاتی هەڵبژاردن‌و ئینتخاباتە, بەسەدان دروشمی بریقەدار لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان‌و گۆڤارەکان‌و دەزگاکانی ڕاگەیاندن‌و لافیتەو نووسینی سەر داروديوارەوە, نیشانی میللەت دەدرێ, هەمووی وەعدو بەڵێن دەدا کەئەگەر دەربچێت‌و متمانەی لەلایەن گەلەوە پێبدرێت, وڵاتەکەو ناوچەکە دەکاتە بەهەشتی سەر زەوی, گرانی ناهێڵێ, گەندەڵی ئیداری‌و بەرتیل خۆری نامێنێ, بێکاری باردەکاو کاری گونجاو بۆ هەموو بێکارێك دابین دەکرێ, عیلم‌و زانیاری‌و زانایان ڕەواجیان پێدەدرێ, وەدەیان دروشمی تر کە لەڕوانگەی دینی ئێمەوە ئەوە هەمووی وەعدو بەڵێنەو هەرکەسێ هەر دروشمێکی بەرزکردەوە, ئەوە پەیمانی داوە کەجێبەجێی بکات. خۆ ئەگەر وەکو ئەمڕۆ هەرئەوەندە لەبیری بوو تا دەچێتە سەر کورسیەکە (یان زۆرجار خۆی هەر ئاگای لەو دروشمە نیە) خەڵکانی هاوبیرو لایەنگری بۆی دەنووسن‌و قیامەتی خۆیان دەکەن بەقوربانی دونیاو دۆلارو کورسی ئەو, ئەوە پەنا بەخوا ئەو مەسئول‌و لێپرسراوانە کەئاوا بەچەواشەکردنی فەقیرو هەژارو دڵ سافی میللەت, بەدەنگدانی پیرەپیاوو پیرەژن‌و گەنج‌و لاوی گەل دەگەنە پەرلەمان‌و پۆستەکانی تری ناو حکومەت, بەڵام دواتر هیچ کەس لەمیللەت ناناسن, ئەوە بەفەرموودەی رَسُولُ الله, موونافیق‌و دووڕوون (وَإِذا وَعَدَ أَخْلَفَ), وەخیانەتیشیان لەپۆست‌و پلەکەیان کردووەو بۆ خزمەتی خەڵك بەکاری ناهێنن (وَإِذا اؤْتُمِنَ خانَ), وەمەعلومیشە سیاسەتیان (إِذا حَدَّثَ كَذَبَ)یە, وەئەو مەسئول‌و لێپرسراوانە دەبنە پەڵەیەکی ڕەش‌و دەبنە خۆرکەی گەندەڵکەر بۆ حیزبەکەیان‌و حکومەتەکەیان‌و هەر بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دایك‌و باوکەکان فێردەکات کەبانگی منداڵەکانیان نەکەن کەبێن بۆ لایان بۆ ئەوەی شتێکیان بدەنێ بەڵام هیچیان نەدەنێ‌و هەر بۆ گرتن‌و خەڵەتاندنیان بێ, لەبەرئەوەی ئەو منداڵە سیقەی نامێنێ بەدایك‌و باوکەکەی‌و ئەویش فێری وەعدی درۆ

دەبێ هەروەکو عەبدوڵڵای کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم لەماڵی ئێمە دانیشتبوو، لەو کاتەدا من منداڵ بووم، لەدەرەوەی ماڵ یاریم دەکرد، دایکم بانگی کردمەوەو فەرمووی: (ها تَعالَ أُعْطيكَ) ڕۆڵە گیان وەرەوە شتێکت دەدەمێ، پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ما أَرَدْت أنْ تُعْطيَهُ؟) نیازت وایە چی بدەیتێ؟ دایکم فەرمووی: خورمای دەدەمێ، خۆشەویست صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرمووی: (أمَّا إنَّك لَوْ لَمْ تُعْطه شَيْئاً كُتِبَتْ عَلَيْك كَذْبَةٌ) ئەگەر هیچت نەدایە درۆیەکت لەسەر دەنووسرا

ئەمە لەسەر ئاستی تاکە کەسو خێزاندا، ئەی ئەگەر ئەو کەسە وەعد بەخەڵك دەداتو جێبەجێی ناکات سەرکردەیەك بوو، لێپرسراوێك بوو، ئەوە تاوانەکەی گەورەترە، وەکو (ئبن حەجەری عەسقەلانی) لە (فَتحُ الباري)دا دەفەرموێ: (الغَدْرُ حُرْمَتُهُ غَليظَةٌ لا سِيَّما مِنْ صاحِبِ الوِلايَةِ العامَّةِ، لأنَّ غَدْرَهُ يَتَعَدَّى ضَرَرُهُ إلى خَلْقٍ كَثيرٍ، وَلأنَّهُ غَيْرُ مُضْطَرٍ إلى الغَدْرِ لِقُدْرَتِهِ عَلى الوَفاءِ).

واتە: پەیمان شکاندنو بەڵێنو وەعد نەبردنە سەر، حەرامیەتەکەیزۆر توندەو زۆر ناڕەوایە، بەتایبەت ئەگەر لەلایەن لێپرسراوی گشتی خەڵکەوە بێ، لەلایەن سەرۆکی حکومەتْ تا لێپرسراوی فەرمانگەیەکەوە بێ، چونکە ئەم بەڵێن شکاندنەی لێپرسراوو مەسئولە زەرەرو زیانەکەی خەڵکێکی زۆر دەگرێتەوە، بەهۆی بەڵێن شکاندنی لێپرسراوێکەوە، کەوەعدی بەخەڵك داوەو پشتگوێی خستووەو هەر بەڕێی کردوون، دەیانو سەدان هاوڵاتی دڵسۆز، دڵسارد دەبنەوەو بڕوایان بەدەسەڵات نامێنێ، هەروەها کاربەدەستو لێپرسراو ناچار نیە تا وەعدو بەڵێن بشکێنێ، چونکە توانای هەیە بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، هەم توانای هێزو دەسەڵات، هەم توانای ماددیو دارایی

بەڕێزان: لەبەر گرنگیو فراوانی باسی بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێنو زەرەرو زیانی پەیمان شکاندن بۆ سەر تاكو خێزانو کۆمەڵ، ئەم باسە لێرەدا کۆتایی دێنینو إنشاءَ الله لەوتاری داهاتوودا تەواوی دەکەین ..

تا ئەو کاتە هەموو لایەکتان بەو زاتە دەسپێرم کەسپاردە زایە ناکات ..

والسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ

# ووتـاری ژماره سی و پێنج

## وه‌فـاداری له‌به‌ڵێن و په‌یماندا

### به‌شی سێیه‌م

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى

﴿ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّه وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴾

(البقرة 177)

قالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم :

( المُسلِمُونَ عِندَ شُرُوطِهِمْ )

( رَواهُ البُخاري )

الحمدُ للهِ رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّد وعلى آلِهِ وصَحبِهِ أجمَــعين .

ئیمانداران‌و خواناسانی بەڕێزو خۆشەویست: سەلام‌و ڕەحمەتی خوای گەورەتان لێبێت. لەدوو ووتاری ڕابردوودا لەخزمەت وەصیەت‌و ڕاسپاردەی نۆیەمی خوای پەروەردگاردا بووین کەفەرمووی: ﴿ وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُوا ﴾, بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو باسە بەڕێزو بەپێزەو باسکردنی لایەنە فراوانەکانی جێبەجێکردنی وەعدو بەڵێن دەڵێم وَبِاللهِ التَوفيق:

یەکێ لەو لایەنە گرنگانەی کەئینسانی موسڵمان دەبێ ئاگای لەبەجێهێنانی وەعدو بەڵێنەکەی بێ وەفاداریە بەرامبەر بەخێزان, لەبەرئەوەی هەرکاتێك کوڕێك‌و کچێك بەحەلاڵی, بەشەرعی خوا, بەیەك دەگەن‌و دەبنە هاوسەری یەکتری, ئەوە لەو نیکاحەدا ئەوە دەخوێنرێتەوە کەوا ئەو دوو کەسە پەیمان‌و بەڵێنی وەفادارییان لەگەڵ یەکتردا بەست کەخیانەت بەیەکتر نەکەن‌و هاوسەریەتیەکەیان هەتا سەر بێ‌و بۆ دەست پێگەرم کردنەوە نەبێ, هەروەکو لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە کەپێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: (إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ توفُوا ما اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ) , شایستەترین مەرج‌و شەرتێك کەجێبەجێ بکرێ, ئەو عەهدو بەڵێنەیە کەئینسان بەهۆیەوە خێزانەکەی بۆ حەلاڵ دەبێ. با هەریەك لەئێمە لەخۆی بپرسێ: ئایا وەفادارین بەرامبەر بەخێزانەکانمان؟ ئایا ڕەفتارمان لەگەڵیدا جوانە؟ ئایا خێزانەکانمان لەسایەماندا حەساونەتەوە؟

ئاگاداربە ئەی ئیمانداری بەڕێز, تۆ وەعدو بەڵێنت بەو ئافرەتە داوە کەبۆتە هاوسەرت, ئاگاداربە چاوت لەسەر هیچ ئافرەتێکیتر نەبێت! نەکەی لێی بدەی, بەدەست‌و بەزمان ئازاری نەدەی, دڵپیسی لێ مەکە, ڕێگای سەردانی کەسوکارو ناسیاوانی لێ مەگرە, مارەییەکەی مەخۆو بەپێی توانا بیدەیە.

برای ئیماندار: ئێمە پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم پێشەواو سەرمەشق‌و چاوساغمانە ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾, با بزانین ئەو زاتە پایەبەرزە چەند وەفاداربووە لەگەڵ خێزانەکانیدا, نموونەیەك بێنینەوە کە بەڕاستی پێنووس لەئاستی نووسینیدا کۆڵە, واژەو ڕستەکان ناتوانن بچنە پاڵ یەکو حەقی ئەو وەفاداریە

بیْوێنەیە باس بکەن، نموونە بەخێزانە زیندووەکانی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلّم ناهێنینەوە، چونکە بۆ غەیری پێغەمبەری خوا دەگونجێ بگوترێ، ئینسان تا خێزانەکەی گەنجەو لەژیاندایە، مێردەکەی وەفادارو چاکەکارە بەرامبەریەو وەعدو بەڵێنێك کە بەخێزانەکەی خۆیداوە جێبەجێی دەکات، بەڵام لەدوای مردنی یان پەککەوتنی لەوانەیە ئاوڕی لێنەداتەوەو هەروەکو نەیناسیبێ وایە. بەداخەوە چەند کەسمان بینیوە کەکاتێ خێزانەکەی بەهۆی نەخۆشیەوە پەکی کەوتووە، یان خێزانەکەی چۆتە ساڵەوەو پیربووەو ئەم خۆی گەنجە، یاخود خێزانێکیتری هێناوە، لەم حاڵەتانەدا بەیەکجاری وازی لەژنی یەکەمی هێناوەو ئەو ژنەی یەکەمی تەنها بەڕواڵەت هاوسەرو مێردی هەبووە، ئەگینا لەواقیعدا هیچ مانایەکی هاوسەری لەمکێردەکەی چاو پێنەکەوتووە. بەڵام پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم، لەگەڵ هەموو خێزانەکانیدا بەبێ جیاوازی لەنێوان گەنج و پیریاندا، لەنێوان خزمو بێگانەیاندا، لەنێوان زیندوو و مردوویاندا وەکو یەك وەفادار بووە بەرامبەر بەبەڵێنی هاوسەریەتی.

نموونەیەکتان عەرز دەکەم: پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم شاری مەککەی پیرۆزی فەتح کردووەو ئاواتی لەمێژینەی هاتۆتەدی، وا ئیسلام ڕەگی داکوتا، وا بتو بتخانەکان لەناویران، وا خەڵکی: ﴿ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً ﴾، بەڕاستی ڕۆژێکی بیْوێنەیە لەمێژووی ئیسلامدا، پێغەمبەری خوا زۆر سەرقاڵو مەشغوڵە، هەموو کەس دەیەوێ قسەی لەگەڵدا بکا، داواکاری خۆی پێشکەش بکا. ئا لەم جەوە ناسکەدا، لەم هەموو کاروبارە گرنگەدا، چاوی بەپیرەژنێکی پشت چەماوەی دەست بەگۆچان کەوت، پێغەمبەری خوا وازی لەهەموو خەڵکەکە هێناو بەرەوڕووی پیرەژنەکە ڕۆیشتو دەستی گرتو هێنای لای خۆیەوە داینیشاندو عەبای موبارەکی خۆی بۆ ڕاخست! ماوەی یەك سەعات زیاتر گوێی لەقسەی پیرەژنەکە گرت، لەو کاتەدا یەکێ لەو هەموو کەسانەی کەئەم ڕەفتارەی پێغەمبەری خوا سەرنجی ڕاکێشا کەلەم وەختە ناسکەدا، وا پێغەمبەری خوا ئەو هەموو کاتەی خۆی لەگەڵ ئەو پیرەژنەدا بەسەربردو عەبای خۆی بۆ ڕاخست، حەزرەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوابوو، فەرمووی: (مَنْ هذِهِ يا رَسُولَ الله؟)، ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیرەژنە کێبوو وا ڕێزت گرتو ئەوەندە لەگەڵیدا دوای؟ حەزرەت

صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم کەچاوەکانی پڕ ببوو لەفرمێسك فەرمووی: (إِنَّها صاحِبَةُ خَدیجَةَ! کانَتْ تَأْتینا أَیَّامَ خَدیجَة)، فەرمووی: ئەی عائیشە، ئەوە یەکێبوو لەدۆستەکانی خەدیجە خاتوونی خێزانم، ئەم پیرەژنە، خەدیجەی زۆر خۆشدەویستو بەردەوام سەردانی دەکردین. عائیشە فەرمووی: (فَبِمَ کُنْتُمْ تَتَحَدَّثُونَ یا رَسُولَ الله؟)، ئەی پێغەمبەری خوا زیاتر لەسەعاتێ لەگەڵ ئەو پیرەژنەدا دانیشتبووی ئەوە باسی چیتان دەکرد؟! پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (کُنَّا نَتَذَکَّرُ الأَیَّامَ الْخَوالي)، فەرمووی: ئەی عائیشە باسی ئەو ڕۆژگارە شیرینو پڕ خۆشیەمان دەکرد کەکاتی خۆی خەدیجە لەژیاندابوو، زۆر بەخۆشی ژیانم لەگەڵدا گوزەراند، بەڕاستی باشترینو وەفادارترین هاوسەربوو. حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) غیرە گرتیو بەتووڕەییەکەوە بەپێغەمبەری خوای فەرموو: ئەوە چیە دیسان باسی ئەو پیرەژنەت کردەوە کەخەدیجەیە، کەگڵ ڕزاندوویەتی لەگۆڕەکەیدا، لەکاتێکدا خوای گەورە لەو باشتری پێبەخشیوی (مەبەستی لەخۆی بوو) کەئەم کچەو ئەو بێوەژن بوو، ئەم گەنجەو ئەو کاتی خۆی لەپێغەمبەر بەتەمەنتربوو. پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم وەفادارترین هاوسەر بۆ خێزانی خۆی فەرمووی: نا، ئەی عائیشە (لا وَالله ما أَبْدَلَني الله مَنْ هِي خَیْرٌ مِنْها، وَسَتَّني حینَ مَنَعَني النَّاسُ، آمَنَتْ بي حینَ کَذَّبَني النَّاسُ) فەرمووی: نەخێر ئەی عائیشە، نەبەخوا، خوای گەورە کەسی لەخەدیجە باشتر پێنەبەخشیوم، چونکە خەدیجە ئەو کەسە وەفادارە بوو کەکاتێ خەڵکی ماڵوسامانی خۆیان لێ قەدەغەکردم، ئەو هەموو ماڵو سەروەتەکەی خۆی بەقوربانی منو دینەکەم کرد، وەلەو کاتەدا خەڵکی بڕوایان پێنەدەهێنامو بەدرۆیان دەخستمەوە کەدەمگوت پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوام، لەوکاتەدا یەکەم کەس کەئیمانی پێهێنام خەدیجەبوو! !

بەڕاستی ئەوە وەفادارییە، ئەوە بەڵێنو پەیمان بردنە سەرە کەهاوسەر بەهاوسەری خۆی بدات. دەزانن کەی پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم ئاوا وەصفی خەدیجەی کرد؟ لەکاتێکدابوو کەچواردە ساڵ بوو خەدیجە وەفاتیکردبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم چواردە ساڵ بوو لەخەدیجە دابڕابوو، چەند ژنێتری هێنابوو، عائیشەی صدیقەی کچی ئەبوبەکری صدیقی هاوسەربوو، کەچی وەفاداربوو بەرامبەر خەدیجەو هەرگیز لەبیری نەدەچۆوە!

دەی ئازیزانم، پێویستە هەموومان ئەو ڕاستییە بزانین کەلەو کاتەدا ئینسان خوای گەورە ڕەحمی پێدەکاتو ئافرەتێکی بەڕەوشتو خاوەن دینی بەنسیب دەبێو دەبێتە هاوسەری، ئا لەو کاتەدا کەدەست دەخاتە ناو دەستی خەزووریەوەو بەشەرعی خوا لێی مارە دەکرێ، وادەزانم ئەو دەست خستنە ناو دەستە لەنێوان زاواو خەزووردا، کەهیچ پەیوەندیەکی بەژن مارەبڕینەکەوە نیەو ڕوکنێکی دروست بوونی نیکاحەکە نیە، بەڵام پێشینانمان زۆر عاقڵو دووربین بوون کەئەم دەستەیان خستۆتە ناو دەستی یەکتر، واتە: ئەم زاوایە عەهدو پەیمانو بەڵێن دەدات بەباوکی کچەکە وەبەدایکی کچەکە وەبە خودی کچەکە کەهاوسەرێکی وەفاداربێو خیانەت لەو ئەمانەتە ناکات کەتەسلیمیدەکەن، وەبەچاوی بێحورمەتیەوە سەیری ئەم کچە ناکات، وەنازی ڕادەگرێو ناهێڵێ بێنازی دوورکەوتنەوەی لەماڵی باوکی پێوە دیاربێ. بۆیە هەرکاتێ ئەو کچەی گواستەوەو هاتە ماڵی ئەمەوە، دەبێ هەموو کات ئەو عەهدو پەیمانەی کەداویەتی بەباوكو بنەماڵەی کچەکە هەر لەبەرچاوی بێو ئەگەر ئافرەتەکە هەڵەیەکیکرد چاوپۆشی لێبکاتو چاکەکانی بێنێتەوە بەرچاو.

هەروەکو گوتمان ئیماندار دەبێ چاو لەپێغەمبەری خوا بکات، دەبێ چاو لەخولەفاو جێنشینانی پێغەمبەری خواش بکات (عَلَيْكُمْ بِسُنَّتي وَسُنَّةِ الخُلَفاءِ الرَّاشِدين) ، با بچینە خزمەت خەلیفەی دووەم، فاروقی ئیسلام حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت)، ئیمامی عومەر لەگەڵ خێزانەکەیدا لەماڵەوە دانیشتووە، لەم ساتو کاتەشدا یەکێ لەدانیشتوانی شاری مەدینەی پیرۆز، وا ئەویش چۆتە ماڵەوەو لەکارو کاسپی گەڕاوەتەوەو چاوەڕوانی ووشەو قسەیەکی نەرمو بزەیەکی سەر لێوی خێزانەکەیەتی کەماندووبوونی لاشەی دەرکا، بەڵام ئەمجارەش وەکو هەموو جارەکانی تر، ژنەکەی لەجیاتی بەخێرهێنانەوەو باوەش بۆ گرتنەوە، بەڕوویەکی تاڵو ناوچەوانێکی گرژو زمانێکی زبرو دەنگێکی بەرزو بەقیژەو هاوارەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوەو ماڵی لێدەکات بەدۆزەخ، بۆیە کابرا تەحەمولی نامێنێو دەڵێ: قەسەم بەخوا دەبێ بچم لەخزمەت ئەمیری ئیمانداراندا شکاتت لێبکەم! سُبْحانَ الله، ئەمیری ئیمانداران لێپرسراوی سیاسیو عەسکەری موسڵمانانە، هەروەها چارەسەرکاری کێشەی نێوان ژنو

مێردەکانیشە! بەڵێ کابرا ماڵەوە بەجێدێڵێو ڕوودەکاتە ماڵی ئیمامی عومەرو لەدەرگا حزیك دەبێتەوە, بەڵام چی دەبیستێ, وا ژنەکەی ئیمامی عومەریش دەنگی بەسەر ئیمامی عومەردا بەرزکردۆتەوەو دەیان پرتەوبۆڵەو داواکاری هەیە, کابرا بەخۆی گوت: جا شکاتی چی بکەم, خۆ حاڵی منیش هەروەکو حاڵی ئەمیری ئیمانداران وایە, باشتر وایە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. لەو کاتەدا ئیمامی عومەر دەرگای ماڵەوەیانی کردەوەو دەیویست لەماڵ بچێتە دەرەوە تا ئەو کاتەی ژنەکەی هێمن دەبێتەوەو پاشان بگەڕێتەوە! ئیمامی عومەر چاوی بەکابرا کەوت وا لەبەر دەرگای ماڵەکەیان وەستاوە, فەرمووی: کاکە گیان چی دەکەی لێرە؟ بۆچی هاتووی؟ ئەی بۆچی نەهاتیتە ژوورەوەو دەتەوێ بگەڕێیتەوە؟! کابراش گوتی قوربان, لەدەست ژنەکەم هەڵاتم کەبێم لای جەنابت شکاتی حاڵی خۆم بکەم, بەڵام بەخوا کەگوێم لەدەنگی ژنەکەی تۆش بوو کە لەدوورەوە دەبیسترا و بەسەر تۆدا هاواری‌دەکردو دەیقیژاند, ئیتر بەخۆمم گوت: ئەوە ئەمیری ئیمانداران ژنەکەی ئاوا بەسەریدا هاوار دەکاتو تەحەمولی دەکات, ئەی باشە من بۆچی خۆم ڕانەگرم؟! بۆیە ویستم بگەڕێمەوە. ئیمامی عومەر فەرمووی: براکەم بوەستە با تێتبگەیەنم کەبۆچی ئارام دەگرم لەسەر دەنگ بەرزکردنەوەی خێزانەکەم بەسەرمدا, خێزانەکەم منداڵم بۆ بەخێوو پەروەردە دەکات, جلوبەرگم بۆ دەشوات, خواردنم بۆ ئامادەدەکات, لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێ نەیان کاتو شەرعەن واجب نیە لەسەری, جا ئەو خێزانەم ئەو هەموو ئیشەم بۆ دەکاتو ئارام دەگرێ لەسەری, ئایا من جارێك تەحەمولی نەکەم ئەگەر دەنگی بەسەرمدا بەرزکردەوە؟! ئەی کەواتە وەفاداری چیم بەرامبەری؟!

بەڵێ کابراش بیری کردەوەو دڵی قەناعەتی کردو گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی‌و لەئەمیری ئیماندارانەوە فێری دەرسی وەفاداری بوو بەرامبەر ئەو بەڵێن‌و پەیمانەی کە لەنێوان ژن‌و مێرددا هەیە.

ئیمانداران: ئەگەر مێژووی پرشنگداری ئیسلام بخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێ کەئیمانداران نەك هەر لەکاتی ئاشتیدا بەڵکو لەکاتی شەڕو جەنگیشدا, لەو کاتەدا کەدوژمن ڕەحم‌و سۆزی نیە بەرامبەر دوژمنەکەی, ئا لەو کاتەدا هەڵگرانی پەیامی قورئان, هیچ وەعدو بەڵێنێك کەدابێتیان لێی پەشیمان نەبوونەوەو جێ‌بەجێیان کردووە..

با بچینە خزمەت تاجی سەرو نووری چاومان حەزرەتی محمد المصطفی صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم لەصولْحی حودەیبیەدا، یەکێ لەبەندەکانی ڕێکەوتننامەکە ئەوەبوو: هەرکەسێ لەموشریكو کافران، موسڵمان ببێو بێتە لای پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم، دەبێ پێغەمبەری خوا تەسلیم بەکافرەکانی بکاتەوەو لای خۆی وەرینەگرێ، پێغەمبەری خوا ئەم مەرجەی قبووڵکرد، هیشتا ئیمزا لەسەر خاڵەکانی ڕێکەوتنەکە نەکرابوو کەکوڕێکی گەنج لەمەککەوە لەدەست بتپەرستان ڕایکردو خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خوا لەحودەیبیەو موسڵمان بوو، ئەم گەنجە ناوی (ئەبوبەصیر) بوو، لەو کاتەدا دوو کەسیش لەمەککەوە بەشوێنیدا هاتبوون کەبیگرنو بیگێڕنەوە، داوایان کرد کە بەپێی ڕێکەوتنەکە ئەبوبەصیریان بداتەوە، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئاخر خۆ هێشتا ئیمزامان نەکردووەو ئەم پێش ئیمزاکردنەکە گەیشتۆتە لامانو موسڵمان بووە، کافرەکان گوتیان نەخێر، هەر دەبێ بماندەیتەوە! بەڵێ پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلّم لەگەڵ ئەوەدا کەدڵی وەکو مەنجەڵ لەتاوی ئەبوبەصیری گەنجو دڵسۆز بۆ ئیسلام دەکوڵا، دەیزانی ئەو بێویژدانانە بیبەنەوە چی لێدەکەن بەڵام بۆ بەجێهێنانی وەعدو بەڵێنەکانی، چونکە هەموو ڕێکەوتننامەیەك بەڵێندانە بەجێبەجێکردنی، جا بۆ وەفا بەعەهدو پەیمان ئەبوبەصیری دانەوە، تا ئەوەبوو خوای گەورە دەرگای لەئەبوبەصیر کردەوەو پاشان ڕزگاریبوو، باسەکەی بەدرێژی لەسیرەدا باسکراوە.

نموونەیەکی تر لەسەر بەجێهێنانی وەعدو پەیمان تەنانەت لەکاتی شەڕیشدا ئەو بەسەرهاتەیە کەحوذەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خوا لەخۆیو باوکی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: هیچ شتێ وای نەکرد کەمن بەشداری شەڕی بەدر نەکەم تەنها ئەوە نەبێ کەکاتێ منو باوکم لەمەککەوە بەرەو مەدینە هیجرەتمان کرد، لەڕێگا کافرەکانی قوڕەیش گرتیانینو گوتیان: ئەوە بۆ لای محمد دەڕۆن؟ گوتمان: نەخێر، تەنها دەمانەوێ بگەینە شاری مەدینەو بۆ خۆمان لەوێ بژین، (فَأَخَذُوا مِنَّا عَهْدَ اللهَ وَمِيثَاقَهُ لَنَنْصَرِفَنَّ إِلى المَدِينَةِ وَلا نُقاتِلُ مَعَهُ) حوذەیفە دەفەرموێ: وازیان لێ نەهێنانینو بەریان نەدایین هەتاوەکو وەعدو بەڵێنیان لێ وەرنەگرتین کەتەنها دەچینە شاری مەدینەو بەشداری شەڕ ناکەینو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ناچینە مەیدانی شەڕەوە، ئەمجا وازیان

ـهێناین‌و ئێمەش گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم کەلەو کاتەدا خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ شەڕی بەدرو پێویستی بەتاکە کەسێکی موسڵمانیش هەبوو. ئێمەش چووینە خزمەتی‌و بەسەرهاتەکەمان بۆ گێڕایەوەو باسی عەهدو بەڵێنەکەمان کردو عەرزمان کرد ئایا بەشداری شەڕ بکەین یان نا؟ پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم فەرمووی: (إِنْصرِفا، نَفي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَنَسْتَعينُ اللهَ عَلَيْهِمْ) فەرمووی: نا، ئێوە بەشداری شەڕ مەکەن لەگەڵمان‌و بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، وەعدو بەڵێنەکەتان مەشکێنن، ئێمە داوای کۆمەك‌و یارمەتی لـەخـوا دەکەین کـە بەسەر دوژمنانـدا سەرمان بخات!

سُبْحانَ الله لەگەورەیی ئەم ئیسلامە، لەگەورەیی ئەو پێغەمبەرە صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم کە (كانَ خُلُقُهُ القُرآن) کاتێ لەجەنگدا، هەموو هێزی کوفر کۆبۆتەوە بۆ لەناوبردنی ئیسلام‌و موسڵمانان، کەچی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: وەعدو بەڵێن مەشکێنن‌و بەشداری شەڕ مەکەن لەدژی کافران! کەئەمە لەهەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا نە بووەو نە دەشبێ!

بەڕێزان: نموونەیەکی ترتان بۆ باس دەکەم لەمێژووی زێڕینی ئیسلامدا. لەیەکێ لەجەنگەکانی نێوان موسڵمانان‌و کافرەکاندا کابرایەکی موسڵمان دەیەوێ کەسێکی دەست کەوێ کەکاتی خۆی باوکی ئەم موسڵمانەی شەهیدکردووەو ماڵەکەی خواردووە‌و ئەم تەمەنی منداڵ بووەو ئەو موجریمەی نەبینیوەو بەشێوەی دەموچاو نایناسێ، وەهەواڵیشی پێگەیشتووە وا لەو لەشکرەدایە کەئێستا ئەمان شەڕیان لەگەڵ دەکەن، بۆیە زۆر بەجیدی بەشوێنیدا عەوداڵ بوو، بەڵام چۆن بزانێ ئەو دوژمنە دوو جار دوژمنەی کێیە؟ پەلاماری یەکێ لەکافرەکانی داو خستی بەزەویداو شمشێری خستە سەر ملی‌و گوتی: پێم بڵێ فلان کەسی کوڕی فلان کەس کێیە وا لەم لەشکرەدایە؟ خێرا نیشانم بدە، کابرای کافر دەڵێ: بەسەرچاو پێت دەڵێم بەڵام بەیەك مەرج، دەڵێ مەرجەکەت چیە؟ کافرەکە دەڵێ: وەعدو بەڵێنم بدەیە کەئەگەر پێم گوتی کێیە ئازادم بکەی‌و نەمکوژی! موسڵمانەکە گوتی: وەعدو بەڵێن بێ پێم بڵێ فلان کەس کامەیە من تۆ ئازاد دەکەم‌و بەدەستی من ناکوژرێی! کابرای کافر گوتی: ئەو کەسەی تۆ بەشوێنیدا دەگەڕێی

منم! موسڵمانەکە شمشێرەکەی لەسەر مل لابردو فەرمووی: ئاخ، تازە وەعدو بەڵێنم پێدای کەئازادت بکەم، برۆ لەبەرچاوم لاچۆ، تازە ناتوانم بتکوژم!

سُبْحانَ الله لەو ئەخلاقە بەرزە، ئینسان لەدوای دوژمنی باوکەکوشتەی خۆی بگەڕێ کەچی لەژێر دەستیدا بێ، بەڵام لەبەرئەوەی پێشتر وەعدی داوەتێ کەنەیکوژێو ئازادی بکات، وازی لێ بێنێو نەیکوژێ، چونکە ئیسلامو ئیمان فێریان کردووە کەنابێ بەڵێنو پەیمان بشکێنێ ئەگەر بەکافری دوژمنی دینو ژینیشی دابێ! لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (أَيُّما رَجُلٍ أَمَّنَ رَجُلاً عَلى دَمِهِ، ثُمَّ قَتَلَهُ، فَأَنا مِنَ القاتِلِ بَرِيءٌ، وَإِنْ كانَ المَقْتُولُ كافِراً) (رَواهُ إبنُ حَبَّان).

واتە: هەرکەسێك دڵنیایی بدا بەکەسێك کەخوێنێ نارێژێو نایکوژێ، وەئەمینیبکاتەوە، پاشان وەعدو بەڵێنەکەی بشکێنێو کەسەکە بکوژێ ئەوە من لەبکوژەکە بێبەریمو ئەو کەسە بەئومەتی خۆم نازانم با کوژراوەکە کافریش بێ!

ئەمەیە رێزی ئینسان، ئەمەیە مافی مرۆڤ، ئەمەیە ئەخلاقی بەرز تەنانەت لەمەیدانی جەنگو دوژمنایەتیو لەکاتی شەڕیشدا.

نموونەیەکی تر: کاتێ کەفەرماندەی سوپای فارسەکان کەناوی (هورموزان) بوو، بەدیلی کەوتە دەست موسڵمانەکانو هێنایانە خزمەت ئەمیری ئیمانداران ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەم هورموزانە یەکێبوو لەدڕندەترینو سەرسەختترین دوژمنی ئیسلامو موسڵمانان، ئازارو ئەشکەنجەی دەیان موسڵمانی بەدەستی خۆی دابوو. بۆیە حەزرەتی عومەر زۆر لێی بەداخ بوو ئێستا وا بەدیلی لەبەر دەستیایەتی، فەرمووی: هورموزان وەرە ئیمان بێنەو موسڵمان ببە، سەرو ماڵو خوێنت پارێزراو دەبێ. بەڵام هورموزان ئامادە نەبوو موسڵمان ببێ، بۆیە ئیمامی عومەر لەتۆڵەی ئەو هەموو صەحابەدا کەئەم دوژمنی خوایە بەدەستی خۆی شەهیدی کردبوونو ئەشکەنجەی دابوون، ویستی بیکوژێ، بەڵام ئەم فەرماندە سەربازییە ڕووی لەئیمامی عومەر کردو گوتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان، من زۆرم تینووە، تۆش ئەگەر هەر دەمکوژی بەتێرئاوی بمکوژی باشترە نەك بەتینوویەتی، چونکە بۆ تۆ هیچ فەرق ناکات، بۆیە تکات لێدەکەم پێش کوشتنم مۆڵەتم بدە جامێ ئاوی سارد بخۆمەوە. ئیمامی عومەر

فەرمووی: قەیناکا ئاوی ساردی بۆ بێنن. بەڵێ جامێ ئاویان بۆ هێناو هورموزان بەدەستیەوە گرتو گوتی: ئەی سەرکردەی موسڵمانان، ئایا هەتا ئاوەکە نەخۆمەوە نامکوژیو مۆڵەتم دەدەی بەئیسراحەت ئاوەکە بخۆمەوە؟ ئیمامی عومەر فەرمووی: بەڵێ وەعد بێ هەتا ئاوەکە بەئیسراحەت نەخۆیتەوە ناتکوژمو لەناوت نابەم! یەکسەر هورموزان جامە ئاوەکەی ڕشتو هاواریکرد: ئەی سەرکردەی موسڵمانان وەعدو بەڵێنەکەت جێبەجێ بکە، تۆ وەعدو پەیمانت دامێ تا ئاوەکە نەخۆمەوە نەمکوژی، خۆ منیش ئاوەکەم نەخواردەوە، کەواتە نابێ بمکوژیو پەیمان بشکێنی. ئیمامی عومەر زۆر تووڕەبوو، فەرمووی: ئەی دوژمنی خوا فێڵت لێکردم، ئێستا چیت لێبکەم! پاشان ڕاوێژی بەصەحابەکان کرد کەئایا بیکوژێ یان وەعدو بەڵێنەکەی بەرێتە سەر، هەموویان فەرموویان: قوربان تازە ئەمینت کردۆتەوەو وەعدت داوەتێ، نابێ بیکوژی. بۆیە ئیمامی عومەر وازی لێهێناو نەیکوشت. ئەمجا هورموزان کەئەم وەفادارییە لەبەجێهێنانی عەهدو پەیماندا لەموسڵمانان بینی، موسڵمان بوو، ئیمامی عومەریش ڕاوێژی پێکردو سوودی زۆری لەڕەئیو بۆچوونەکانی هورموزان وەرگرت!

بەڵێ ئیمانداران، ئەم ئەخلاقە بەرزو پەسەندانەبوو کەوای دەکرد خەڵکی بەدڵی خۆیانو بەبێ هیچ زۆرو فشارێك بێنە ناو ئاینی پاکی ئیسلامەوە. بۆ نموونە: کاتێ موسڵمانەکان فەتحی وڵاتی شامیان کردو لەشکری ئازادیبەخشی ئیسلامی گەیشتە شاری (حمص)و ڕۆمەکانیان لەشارەکە کردە دەرەوەو شاری حمصیان ڕزگارکرد، دانیشتوانی شارەکە (نەصرانی) گاور بوون، موسڵمانەکان داوایان لێکردن کەموسڵمان ببن، بەڵام ئەوان گوتیان موسڵمان نابینو لەسەر دینی خۆمان دەمێنینەوەو ساڵانە بڕێك پارە دەدەین بەئێوەی موسڵمان لەجیاتی ئەوەی کەئێوە ئیدارەی شارەکەمان دەکەنو لەدوژمن دەمانپارێزنو سەربازیمان پێناکەن. بەڵێ موسڵمانان پارەکەیان لێوەرگرتنو ماوەیەکی پێچوو، لەشکری شکاوو دۆڕاوی ڕۆمەکان خۆیان کۆکردەوەو کۆمەکو سوپایان لەسەرکردایەتییانەوە پێگەیشتو پەلاماری شاری (حمص)یان دایەوە. سەرکردەی سوپای ئیسلامی لەحمص داوای لەسەربازەکان کرد کەشارەکە بەجێبێڵن چونکە هێزەکەیان کەمەو کۆمەکیان پێنەگەیشتووەو لەوانەیە نەتوانن بەرەنگاری ئەو هەموو

جەیشەی ڕۆمەکان ببنەوەو ئەگەر شەڕیش بکەن شارەکە لەنێوان هەردوو سوپادا وێران دەبێو دانیشتوانە بێدیفاعەکەی تیادەچن. لەبەر ئەوە بڕیاری چوونە دەرەوەیان لەشاردا، بەڵام خۆ ئەوان پارەی ساڵانەیان لەدانیشتوانی شارەکە وەرگرتووە کەبیانپارێزنو چاودێرییان بکەنو نەهێڵن دوژمن بێتە سەریان، بەڵام ئێستا ناچارن شارەکە بەجێدێڵن، بۆیە بانگی پیاوماقووڵو ڕیش سپیانی شارەکەیان کرد کەهەموویان گاوربوونو پارەکەیان هەمووی بەبێ دیرهەمێك کەمی دانەوەو پێیان گوتن: ئێمە ئەو پارەیەمان بۆیە لەئێوە وەرگرتبوو تا لەدوژمن بتانپارێزین، ئێستا کەنەتوانین لەشارەکەدا بمێنینەوەو بەرەنگاری دوژمن ببینەوە دەبێ پارەکەتان بۆ بگێڕینەوە. دانیشتوانی شاری (حمص) کەئەمەیان لەموسڵمانان بیست، ئەم وەعدو بەڵێن بردنە سەرە، ئەم ڕاستگۆییو بەویژدانییە کەتا ئێستا بەوشەش نەیانبیستووە نەك بەکردەوە بیبینن، یەکسەر هەموویان بەیەك جار موسڵمان بوونی خۆیان دەربڕیو دەستیان خستە ناو دەستی سوپای ئیسلامییەوەو بەیەکەوە بەرەنگاری لەشکری داگیرکەری ڕۆمەکان بوونەوە!

أللهُ أكبَر، یەك شاری تەواو، شارێکی گەورەی وەکو (حمص) بەبینینی ڕەوشتێکی موسڵمانانە، کەڕەوشتی وەفاداریبوو بەرامبەر بەبەڵێنو پەیمان" بەیەکجار هەموو دانیشتوانەکەی موسڵمان بوون!

بەڕاستی ئیمانداران ئەمڕۆ موشکیلەی ئێمە موشکیلەو گرفتی ڕەوشتە بەرزەکانە، چونکە ڕۆژئاوا تەماشای نوێژکردنو ڕۆژووگرتنمان ناکات، ئیشیان بەوانە نیە، بەڵکو تەماشای ڕەوشتو ئەخلاقی ئەهلی ئیسلام دەکەن. جا کاتێ دەبینن موسڵمانان بەداخەوە، وەعدو بەڵێن دەدەنو نایبەنە سەر، لەقسەکردندا درۆدەکەن، ئەمانەت ناپارێزن، ئازاری یەکتری دەدەن، وا دەزانن ئیسلام ئا ئەوەیەو ئیسلامیان بەو پاكو سپیەتیە لەلا ناشیرینو ڕەش دەبێ، هەروەکو کەسێکی ڕۆژئاوایی کاتێ دیراسەیەکی قووڵو وردی ئاینی ئیسلامی کردو بەهەموو قەناعەتێکەوە ئیمانی هێنا کاتێ هات بۆ حەجو تەماشای موسڵمانانی کرد، کەتەنانەت لەکاتی حەجیشدا، لەو شوێنە موبارەكو پیرۆزەشدا، دەمەدەمێو شەڕەقسەیانەو ئازاری یەکتری دەدەنو لەگیروگرفتو موشکیلەی یەکتری ناکۆڵنەوە، ڕووی لەخوای گەورە کردو فەرمووی: (الحَمْدُ لله، إنِّي

أسْلَمْتُ قَبْلَ أنْ أرى المُسلِمينَ) واتە: سوپاس بۆ خوا کەمن موسڵمان بووم پێش ئەوەی موسڵمانان ببینم! چونکە ئەگەر پێشتر ئەو ئیسلامە گەورەی نەناسیایەو لەکردەوەی موسڵمانانەوە تەماشای ئیسلامی بکردایە ئەوا ئامادە نەبوو بێتە ناو ئیسلامەوەو وەکو دین و ژین قبووڵی بکات.

بەڵێ ئیمانداران, ئەو کاتانەی کەترسی خواو ڕۆژی دوایی لەدڵەکاندابوو, ئەو سەردەمانەی کەبەهۆی ڕووناکی ئیمان و ئیسلامەوە هیممەت بەرزبوو, تا لەو ساتانەدا ئیمانداران هەربەڵێنێکیان بەکەسێك دابێ, بەدڵنیاییەوە جێبەجێیان کردووە, مێژووی پرشنگداری موسڵمانان ڕووداوی وای بۆ تۆمارکردووین کەئێستا بەگێڕانەوەی سەرسام دەبین, هەرئەوەندەمان بۆ دەمێنێتەوە کەبڵێین سوپاس بۆ تۆ خوای گەورە کەئێمەت هیدایەتدا بۆ ئیسلام, سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگار کەئێمەش یەکێکین لەو کاروانەی کەپیاوانی بەمانا (پیاو) بەتەعبیری قورئانی (رِجال)ی ئاوای تێدا هەڵکەوتووە, شانازیدەکەین بەئیسلامی بوونی خۆمانەوە, مێژوو دەڵێ:

کابرایەکی ئیمانداری خەڵکی ئەندەلوس, پیاوێکی ڕیش سپی بەتەمەن, لەسەروەت و ساماندا باخێکی جوان و دڵگیری هەبوو, ڕۆژانە بۆ خۆی لەباخچەکەیدا کارو کاسپی دەکردو خزمەتی باخەکەی دەکردو ژیانی خۆی و تاقانە کوڕە گەنجەکەی پێ دابین دەکرد. ئەوەندە ئەو کوڕە تاقانەیەی خۆی خۆشدەویست دڵی نەدەهات کارو کاسپی پێ بکا, هەر لەماڵەوە بەجێی دەهێشت, ئەم کوڕە تاقانەیە دوای لەخەو هەڵسان و نان خواردن دەچووە ناو بازاڕی شارەکەو لەگەڵ هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی خۆیدا هەندێ یاری و گاڵتەوگەپی دەکردو کەبێتاقەت دەبوو ڕووی دەکردە باخەکەی باوکی. بەڵام ڕۆژێکیان لەکاتێکدا کە لەبازاڕبوو, لەگەڵ کوڕێکی ئەندەلوسیدا کەموسڵمان نەبوو, دەبێتە دەمەقاڵێیان و شەڕیان دەبێ و سەرەنجام کوڕە ئەندەلوسیەکە کەناموسڵمانە, کوڕە تاقانە موسڵمانەکە دەکوژێ و بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی کەدەست کەسوکاری کوڕە کوژراوەکە نەکەوێ و نەیکوژنەوە ڕادەکات و لەشار دەچێتە دەرو ڕوو لەباخی پیاوە پیرەکە دەکات کەباوکی کوڕە کوژراوەکەیە. چونکە نازانێ کەئەو کوڕەی ئەم کوشتوویەتی کوڕی ئەم پیاوە پیرەیە! بەڵێ خۆی دەگەیەنێتە باخەکەو هاوار بۆ پیاوە پیرەکە دەباو دەڵێ:

مامەگیان کوڕێکم کوشتووەو ئێستا هەڵاتووم, کەسوکاری بەشوێنمەوەن, تکات لێدەکەم پەنام بدەو لەم باخەدا بمشارەوەو وەعدو بەڵێنم بدەیە کەتەسلیم بەکەسم ناکەی! پیاوە پیرەکەش بەزەیی پیادێتەوەو لەژوورە بچکۆلەکەی ناو باخەکەیدا حەشاری دەداتو بۆ خۆی دێتەوە بۆ ناو باخەکە. لەو کاتەدا براو ئامۆزای مامە پیرە بەهەڵەداوان خۆیان دەکەن بەباخەکەداو دەڵێن کوا ئەو کوڕە گەنجەی کەخۆی کرد بەم باخەدا, چی لێهات؟ پیاوە پیرەکە دەڵێ: بۆچی, چی بووە؟ دەڵێن: ئەو کوڕە گەنجە, کوڕە تاقانەکەی تۆی کوشتو هەڵاتو ئێمەش بەشوێنیەوەینو چاومان لێبوو هاتە ئەم باخەوە. کابرا پیرە بەبیستنی هەواڵی کوژرانی تاقانەکەی, ڕووناکی چاوەکەی, هێزی پشتو ئەژنۆی, ئومێدی دوارۆژی, داردەستی پیریو پەککەوتەیی خۆیو خێزانی, بەرچاوی تاریك دەبێ, هێز لەئەژنۆیدا نامێنێ. وا بکوژی کوڕەکەی لەژێر دەستیایەتیو خۆی شاردوویەتیەوە, خەریك دەبێ هاواربکاتو بڵێ: بڕۆن وا لەو ژوورە بچکۆلەدا شاردوومەتەوەو نەمزانیوە کوڕەکەی منی کوشتووە, هەر ئێستا بڕۆن بیکوژنەوە, بەڵام یەکسەر بیری ئەو وەعدو بەڵێنەی دەکەوێتەوە کەچەند دەقیقەیەك پێش ئێستا بەو کوڕەی داوە کەتەسلیم بەکەسی نەکاتو ئاشکرای نەکات. بۆیە بەخزمەکانی دەڵێ: ڕاست دەکەن ئەو کوڕە هاتە ئەم باخەوەو لەم لایەوە لەباخەکە ڕایکردو ڕۆیشت! بەم شێوەیە براو برازاکانی خۆی بەهەڵە دەباو لەباخەکە دەیانکاتە دەرەوە بۆ ئەوەی وەعدو بەڵێنەکەی نەشکێنێ! پاشان دەچێتە ژوورەکەوەو بەکوڕەکە دەڵێ: هەی ماڵوێران کەماڵی منت وێران کرد! خۆ تۆ کوڕە تاقانەکەی منت کوشتووە, بەڵام چی بکەم تازە وەعدویەڵێنم پێداوی کەپەنات بدەمو تەسلیم بەکەست نەکەم, وا وەعدو بەڵێنەکەم بەجێهێناو خزمو کەسوکارەکەمم لێ دوورخستوویتەوە, تۆش بڕۆ بەلایەکدا هەتا لەم شوێنە دوورنەکەویتەوە نە خۆمو نە هیچ کەسم دەستت بۆ نابات!

بەڕاستی ئەمەیە وەعدو بەڵێن جێبەجێکردن.. ئا لەو کاتەدا کەقاتلی جگەرگۆشەت لەبەردەستدا بێو تەنها بۆ پاراستنی وەعدو بەڵێن تۆڵەی لێ نەکەیتەوەو نەیکوژیتەوە!

خۆشەویستان: بەڕاستی وەعدو بەڵێنو پەیمان تەنها قسەیەکی سادە نیەو لێپرسینەوەی لەدوا نەبێت, بەڵکو لەدونیاو دوارۆژدا ئینسان بەرپرسیارە بەرامبەر هەر

وەعدو بەڵێنێك كە بەكەسێكی دەدات, وەهەر كاتێ ئینسان خاوەنی وەعدو بەڵێن نەبوو, ئەوە یەكێ لەنیشانەی دووڕوو (مُنافِق)ی تێدا دێتەجێ (وَإذا وَعَدَ أخْلَفَ), هەر بۆیە صەحابەكانی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیهِ وسَلَّم" هەركاتێ وەعدو پەیمانێكیان بدایە هەرگیز لێی پەشیمان نەدەبوونەوە, بۆ نموونە: لەكتێبی (حَیاةُ الصَّحابَةِ)دا دەفەرموێ: كاتێ كەعەبدوڵڵای كوڕی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) لەنەخۆشی سەرەمەرگو وەفاتیدا بوو, بەكەسوكارەكەی خۆی فەرموو: ئاگاداربن‌و بزانن كەپێش چەند ڕۆژێك لەم نەخۆشیەم, فلان كەس داخوازی فلان كچەمی كرد بۆ كوڕەكەی, منیش گوتم: با بزانین چۆن دەبێ, ئەگەر كچەكەم ڕازی بێ لەوانەیە بتاندەمێ, دوایی كەهاتمە ماڵەوە بەكچەكەم گوت‌و ئەویش ڕازیبوو كەشوو بەكوڕی فلان كەس بكات, بەلام من بەسەردا نەخۆش كەوتم‌و وەڵامم نەدانەوە, ئێستا بەشاهید بن وا من كچەكەمم لەكوڕی فلان كەس مارەكرد, چونكە نامەوێ وەعدە بەخیلاف دەرچم‌و بەیەك لەسەر سێی نیشانەكانی دووڕوویی‌یەوە بگەمەوە بەلیقای خوا.

سُبْحانَ الله, وەعدو بەڵێن بردنە سەر لەلایان ئەوەندە گەورەبوو, وەعدی تەواویشی نەداوە, هەر نیمچە وەعد بووە كەفەرموویەتی با بزانین چۆن دەبێ بەلام لەوە ترساوە بمرێ‌و وەعدە بەخیلاف دەرچێ!

جا كەواتە ئیمانداران: با ئێمەش بەخۆماندا بچینەوەو ئاگامان لەوەعدو بەڵێنەكانی خۆمان بێ, هەر كاتێ وەعدو بەڵێنمان بەهەركەسێك دا جێبەجێی بكەین بۆئەوەی سیقەو متمانەمان لەدەست نەدەین‌و لەنیشانەو سیفاتی (مونافیق)و دووڕوان بەدووربین, هەزار ڕەحمەت لەشاعیر كەفەرموویەتی:

إذا قُلْتَ في شَيءٍ - نَعَمْ - فَأتِمَّهُ　　فَإنَّ - نَعَمْ - دَيْنٌ عَلَى الحُرِّ واجِبُ
وَإلاَّ فَقُلْ لا تَسْتَرِحْ وَتُرِحْ بِهــا　　لِئَــلاَّ يَقُولُ النَّاسُ إنَّــكَ كـاذِبُ

واتە: هەركاتێ بۆ ئیش‌و كاروكردەوەیەك گوتت (بەڵێ) جێبەجێی دەكەم, ئەوا لەقسەی خۆت پەشیمان مەبەو ئیشەكە تەواو بكە, چونكە ئەو (بەڵێ)یە قەرزە لەسەرت‌و هەتا ئیشەكە جێبەجێ نەكەی لەژێر ئەو قەرزی (بەڵێ)یە دەرناچی, خۆ ئەگەر دەزانی ئەو ئیشوكارەت بۆ جێبەجێ ناكرێ ئەوا كاتێ گوتیان ئایا فلان ئیشمان بۆ دەكەی؟

یەکسەر بڵێ (نەخێر) ناتوانم جێبەجێی بکەم، چونکە بەو (نەخێر)ە ئاسوودە دەبیو کەس ناتوانێ بڵێ درۆزنەو درۆی لەگەڵ کردم، چونکە وەعدو بەڵێنت نەداوەتێ.
شاعیرێکی تریش فەرموویەتی:

لا تَـقُولـَنَّ إذا لَمْ تُــرِدْ	أنْ يَتِمَّ الوَعْدَ في شَيءٍ نَعَمْ
حَسَنٌ قَولُ نَعَمْ مِنْ بَعْدِ لا	وَقَبيحٌ قَــولُ لا, بَعدَ نَــعَمْ
إنَّ لا بَعْدَ نَـعَمْ فـاحِـشَةٌ	فَبِلا فَابْدَأْ إذا خِفْتَ النَّدَمْ
وَإذا قُلْتَ نَعَمْ, فَاصْبِرْ لَها	بِنِجازِ الوَعْدِ إنَّ الخُلْفَ ذَمْ

واتە: هەرکاتێ لەدڵدا نیازت نەبوو کردەوەیەکو ئیشێك بکەیو وەعدو بەڵێنێك کەدەیدەی جێبەجێی بکەی، ئەوا هەر لەسەرەتاوە مەڵێ (بەڵێ) دەیکەم، بەڕاستی زۆر جوانو مەردانەیە کەسەرەتا بڵێی بۆم ناکرێ بەڵام پاشان بەکردەوە جێبەجێی بکەی، وەچەند ناشیرینە سەرەتا بڵێی (بەڵێ) جێبەجێی دەکەم پاشان بۆت جێبەجێ نەکرێو بڵێی ناکرێ، لەبەرئەوەی ناکرێ دوای (بەڵێ باشە) ناپەسەندو ناڕەوایە، بۆیە هەرکاتێ ویستت وەعدی شتێك بدەی بڵێ وەعد نادەم جێبەجێی بکەم ئەگەر لەپەشیمان بوونەوەو شەرمەزاری دەترسی، وەهەر کاتێکیش وەعدو بەڵێنت دا ئەوا ئارامی لەسەر بگرە، چونکە هەموو بەڵێن جێبەجێکردنێك ماندووبوونو زەحمەتو مەصڵەحەت فەوتانی خۆتی تێدایە، بۆیە دەبێ بەسەبرو ئارامو خۆڕاگر بی، لەبەرئەوەی بەجێنەهێنانی وەعدو بەڵێن، دەبێتە مایەی سووکیو ریسوایی بۆ خاوەنەکەی.

خوای گەورە بمانگێڕێ لەو کەسانەی وەعدو بەڵێنەکانیان دەبەنە سەرو..

یارمەتیمان بدا بۆ بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێنەکانمان..

اَللّٰهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان

1 ـ قورئانی پیرۆز.

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمد أمین.

3 ـ تەفسیری ڕەوان, مامۆستا مەلا محمودی گەلاڵەیی.

4 ـ أخلاق المُؤمِن, الأُستاذ عمرو خالد, دار المعرفة, بیروت, ط1, 2002.

5 ـ نَظرَةُ النَّعيم, إعداد مَجموعَة مِنَ المُختَصِّين بِإشراف: صالح بن عبدالله وعبدالرحمن محمد ملوح, دارُ الوَسيلة, ط3, 2004.

6 ـ مِن وَصايا القُرآن الكَريم, محمد عبدالعاطي بحيري, المكتبة التوفيقية.

7 ـ رِياض الفالِحين, أحمد بن محمد طاحون, دار التربية.

8 ـ مُرشدُ الخَطيب, عبدالرحمن المصطاوي, دار المعرفة, بيروت, ط1, 2002.

9 ـ مِنْ وصايا القُرآن الكَريم, محمد عَبدُالعاطي بحيري, المكتبة التوفيقية.

# وەصیەتی دەهـــەم

﴿ وَأَنَّ هذا صِراطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾

(الأنعام 153)

# ووتاری ژماره سی وشەش
## شوێنکەوتنی ڕێبازی ڕاستی خواو
## دوورکەوتنەوە لەڕێچکەو ڕێبازە لارەکان

**بەشی یەکەم**

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ يا أيُّها النَّاسُ قَدْ جاءَكُمْ بُرْهانٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَأنْزَلْنا إلَيْكُمْ نُراً مُبيناً, فَأمَّا الّذينَ آمَنُوا بِاللهِ وَاعْتَصَمُوا بِهِ فَسَيُدْخِلُهُمْ في رَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إلَيْهِ صِراطاً مُسْتَقيماً ﴾

(النِّساء 174 ـ 175)

قالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم:

(ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً صِراطاً مُسْتَقيماً وَعَلى جَنَبَتَيِ الصِّراطِ سُورانِ فيهِما أبوابٌ مُفَتَّحَةٌ وَعَلى الأبْوابِ سُتورٌ مُرخاةٌ, وَعَلى بابِ الصِّراط داعٍ يَقُولُ: أيُّها النَّاسُ ادْخُلُوا الصِّراطَ جَميعاً وَلا تَتَفَرَّجُوا, وَداعٍ يَدْعُوا مِنْ جَوْفِ الصِّراطِ, فَإذا أرادَ أنْ يَفْتَحَ شَيْئاً مِنْ تِلْكَ الأبْوابِ قالَ: وَيْحَكَ لا تَفْتَحْهُ فَإنَّكَ إنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ, وَالصِّراطُ الإسْلامُ, وَالسُّورانِ حُدُودُ اللهِ ـ تَعالى ـ وَالَبْوابُ المُفَتَّحَةُ مَحارِمُ اللهِ تَعالى, وَذلِكَ الدَّاعي عَلى رَأْسِ الصِّراطِ كِتابُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ, والدَّاعي فَوْقَ الصِّراطِ واعِظُ اللهِ في قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ)

( رَواهُ أحْمَد)

**الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آلِه وصَحبِه أجمـــعين .**

ئیمانداران‌و خواناسانی بەڕێز, لەخزمەت قورئانی پیرۆزداین‌و گەیشتینە وەصیەت‌و ڕاسپاردەی دەیەم‌و کۆتایی خوای پەروەردگار کەدەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هذا صِراطي مُسْتَقيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبيلِه ذلكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (الأنعام 153), واتە بێگومان ئەمەی کە لەوەصیەت‌و ڕاسپاردەکانی ڕابردوودا باسکرا ڕێبازی منە کەڕاستە, دە ئێوەش شوێنی بکەون, شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە جیاتان دەکاتەوە لەڕێبازی خوا, ئەوەش پەروەردگارتان فەرمانی پێکردوون, بۆئەوەی خواناس‌و پارێزکار بن..

بەڵێ بەڕێزان: خوای پەروەردگارمان - سُبْحانَهُ وَتَعالى - فەرمووی: ئەم ڕێبازەی من تایبەتمەندییەکی هەیە کە - ڕێگای ڕاستە - بێگومان ڕێگای ڕاستیش ڕووناک‌و کراوەیەو ئینسان کەپێیدا دەڕوات بەرچاوی ڕوونە, هەر ڕێگایەکیش لێڵی تێدا نەبوو و ڕۆشن بوو, ئەوە ترسی تێدا نامێنێ, کەترسیش نەما ئینسان نەفس‌و دەروونی ئیسراحەت‌و دڵنیا دەبێ‌و هەست بەئارامیی‌و ئاسوودەیی دەکات. جا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم باسە, با بچینە خزمەت ئەو (نۆ) وەصیەت‌وڕاسپاردەو ئامۆژگاریانەی پەروەردگار کەئێمە لە (سێ‌و پێنج) ووتاری ڕابردوودا لەخزمەتیاندا بووین, با وردبینەوەو تێبگەین کەچۆن لەو نۆ وەصیەتەدا درەختی بەنرخ‌و پڕ بەرەکەتی ئەمینی‌و دڵنیایی خۆیی‌و شاراوەیی ناو دەروونی ئینسان. وەدڵنیایی‌و ئارامی کۆمەڵایەتی‌و ناو کۆمەڵگا بەگشتی! کاتێ سەرنجی کۆمەڵەی یەکەم لەوەصیەت‌و ئامۆژگاریەکان دەدەین دەبینین دەبنە مایەی ئارامیی‌و ئاسوودویی‌و دڵنیایی نەفس‌و دەروون بۆ تاکی ئینسان بۆ نموونە هەرکاتێ ئینسان دڵی وابەستەی خوای خالیق‌و دروستکەری بوو, بیروباوەڕی دامەزرا لەسەر ئەوەی کەخوای گەورە تاک‌و تەنهاو بێ‌هاوەڵە تەنها دەسەڵاتدارە لەکەونداء هەر ئەو دەتوانێ ببەخشێ‌و ئینسان دەوڵەمەند بکات, هەر ئەویش دەتوانێ هەژارو دەستکورتی بخا, ژیان‌و مردن هەر بەدەستی ئەوە, توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو بەرامبەر ویست‌و ئیرادەی ئەو خوایە مەحاڵ نیەو هەموو شتێك لەنێوان کاف‌ونوندا جێ‌بەجێ‌دەکرێت.

جا هەرکاتێ ئینسان ئەم بیروباوەڕە لەدڵو دەروونیدا چەسپا ئەوا هەموو کات دڵگوشادو خاوەن هیواو بەرچاو کراوە دەبێو هەرگیز کۆتوزنجیری نائومێدیو بێهیوایی ناتوانن کرۆڵو لەرزۆکی بکەنو پشتی لەزەوی بدەنو نائومێدی بکەن, چونکە دەزانێ ئەو عەبدی خوایەکە کەتواناى بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هە رکات هاواری بۆ بەرێ بەهانایەوە دێ, کەئەمەش وەصیەتو ئامۆژگاری یەکەم بوو کەفەرمووی: هیچ شتێ مەکەن بەهاوبەشو شەریکی خوا. وەصیەتی دووەم باسی خێزانی کرد, لەبەرئەوەی هەرکاتێ خێزان لەسەر بنەمای توندوتۆڵی دامەزراو پەیوەندی نێوان رۆڵەو نەوە بەدایكو باوکەوە لەسەر بنەمای خۆشەویستیو ڕێزگرتنو گوێڕایەڵی بوو, وەباوكو دایك, منداڵو جگەرگۆشەی خۆیان بەبەرەکەتی ماڵو زیادبوونی ڕزقوڕۆزی دەزانی, نەك ترسی ئەوەیان هەبێ نانخۆرێکیان زیادبێو بۆیان بەخێو نەکرێ, ئەو کاتە ئەو خێزانە دڵئارامو بەختەوەر دەبنو خێزانێکی لەژیاندا سەرکەوتوو دەبن, ئەمەش وەصیەتی دووەمو سێیەم بوو کەباسمان کرد. وەصیەتی چوارەمیش کەفەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ جێبەجێکردنی دەبێتە مایەی ئارامی دەروونو پاککردنەوەی نەفسی ئینسانو خاوێن کردنەوەی سلوكو ڕەفتاری, لەبەرئەوەی هەرکاتێ ئینسان کارێکی بەدڕەوشتی ئەنجامدا ئەوا لەکاتی بیرکردنەوە لێی, ترسو دڵەڕاوکە دەیهەژێنێ, لەکاتی ئەنجامدانیشیدا ترسو شەرمەزاری ناو ناخو ویژدانی دەلەرزێنێ, وەلەدوای ئەنجامدانیشی بەردەوام لەترسو دڵەڕاوکێو حەزەرکردندا دەبێو چاوەڕێی وەرگرتنی سزای ئەو خراپەیە لەدڵیدا دروست دەبێو دەزانێ هەر پێی دەگات جا ئەمڕۆ بێ یان سبەی.. جا کەواتە هەرکاتێ ئینسان بەگوێی خوای خۆی کردو لەفاحیشەو پێشەکیەکانی دوورکەوتەوە, ئەوە هەموو کات دڵو دەروونێکی ئارامو پڕ لەدڵنیایی دەبێت, لەهەر زەمانو مەکانێکدا بێو هەر ئاستێکی ئابووریو کۆمەڵایەتی هەبێ, مەردانەو سەربەرزانە ژیان بەسەر دەبات.

وەصیەتو ڕاسپاردەی پێنجەمیش باسی یەکێکی تر لەو شتانە دەکات کەمایەی ئیسراحەتو دڵنیایی دڵو دەروونە ئەویش بریتییە لەسەلامەتی ژینگەو شوێنی ژیانی ئینسان, کەدوور بێ لەپیاوکوژو خوێن ڕێژ, لەبەرئەوەی ئەگەر ئینسان ژیانی هەمووی تێروتەسەلو خۆشی بێ بەڵام لەشارو گەڕەكو شوێنی کەسابەتو بازاڕیدا لەخۆی ئەمین

نەبێ ئەوا ژیان هیچ تامو چێژێکی نامێنێو مرۆڤ بەختەوەری لەدەست دەدات, کەئەمەش وەصیەتی پێنجەم بوو کەفەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾.

ئەم پێنج وەصیەتو ڕاسپاردەیەش میحوەرو بەشی یەکەمی دە وەصیەتەکە بوون کە بەجێبەجێکردنیان, ئینسان دڵنیا دەبێو نەفسی ئیسراحەت دەکاتو خۆشبەختی دونیاو دوارۆژ دەبێت. جا لەگەڵ دڵنیایی تاکەکەسی پێویستە لایەنی کۆمەڵایەتیو کۆمەڵگاش ئەمینیو ئاسوودەیی تێدابێ, کەئەم لایەنەش لەمیحوری دووەمی دە وەصیەتو ڕاسپاردەکەدا دەخوێنرێتەوە, هەروەکو وەصیەتی شەشەم ئاماژەی دا بەپاراستنی مافی هەتیوو دەستدرێژ نەکردنە سەر ماڵو سامانی بەناڕەوا. لەوەصیەتی حەوتەمیشدا باسی پاکی بازاڕو کەسابەتو تەرازوو کرا لەتەرازووبازیو خیانەتو تەزویرو فرتوفێڵ.

وەصیەتی هەشتەمیش دەرسی حەقبێژی فێری کۆمەڵگا دەکات کەئینسان زمانی هەر بەحەقو قسەی ڕاست بگێڕێ, با ئەو ڕاستی گوتنەش بەزەرەری خۆیو نزیکانو خزمانو هاوبیرانیشی تەواو بێ.

وەصیەتی نۆیەمیش ڕەوشتی پڕ بەهاو بایەخی وەفاداری بەرامبەر بەوەعدو بەڵێن, فێرکردنیو بەجێبەجێکردنی هەریەك لەم وەصیەتانەش کۆمەڵگا لەترسو دڵەڕاوکێو نائەمینایەتی بەدوور دەبێو ژیان بەمانای ڕاستەقینە ژیان دەبێو نابێتە ژانوژار. جا لەکۆتاییدا خوای گەورە وەصیەتی دەیەممان ئاڕاستە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً ﴾(الأنعام 153) , واتە: ئەوەی کەگوترا لەو نۆ وەصیەتەی ڕابردوودا کەدەبنە مایەی ئارامیو ئاسوودەیی بۆ تاکو کۆمەڵ, ئەوە ڕێبازی منە کەڕێبازێکی ڕاستو بێقۆڵتو پێچە, ئەوە دینی خوایە کەهەمووی بۆ بەختەوەری مرۆڤە. بەڵام ئایا ئینسان هەرئەوەندە بزانێ کەئیسلام ئەم عەقیدەو ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پاكو پەسەندانەیە, وەناو لەخۆی بنێ موسڵمانو شوێنکەوتەی ئیسلامو شارەزا بێ لەبارەیەوە, ئایا ئەوە کافیەو بەسە؟! خوای گەورە دەفەرموێ: نەخێر, بەڵکو ﴿ فَاتَّبِعُوهُ ﴾ شوێنیبکەونو بەعەمەل جێبەجێی بکەن, نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ﴾, واتە: نەچن شوێن ڕێبازە جیاجیاکانی ئەموئەو بکەون, ڕێبازە گومڕایەکانو قۆرتو پێچ پێچەکان, کە لەئەنجامی شوێنکەوتنی

ئەو کوێرە ڕێیانەدا سەرتان پێ دەکێشێ بۆ پەرتەوازەبوون و دووبەرەکی و لادان لەڕێبازی ئاینی ئیسلام و بەرنامەو پرۆگرامە نموونەییەکەی.

خۆشەویستان: لێرەدا پێویستە سەرنجێکی وردو واقیعیانەی ئایەتەکە بدەین و بڵێین: هەرچەندە هەریەکە لەڕەوشتە پەسەندەکانی وەکو داوێن و دەست پاکی و ئەمینی و خوێن نەڕشتن و تەرازووپاکی و بەزەیی هاتنەوە بەهەتیوو ڕێزو حورمەت و مافی نێوان دایك و باوك و ئەولادو حەقبێژی و وەعدو بەڵێن بردنەسەر، نەك هەر تەنها ئاینی ئیسلام بەڵکو جگە لەئاینە ئاسمانیەکانیتر زۆرێکیش لەبەرنامە دەستکردەکان ئەم ڕەوشتانە نەك هەر بەشتی باش دەزانن بەڵکو بانگەشەشی بۆ دەکەن، بەڵام ئەوەی تایبەتمەندی ئیسلامە ئەوەیە کەئەم ڕەوشتانە بەشێکی گەورەن لەئاینی ئیسلام، بەجێبەجێکردنیان ئینسان پاداشتی دەست دەکەوێ و بەجێبەجێ نەکردن و پشتگوێخستنیان تاوانبار دەبێ و سزابار دەبێ لەدونیاو دواڕۆژدا. خاڵی دووەم: ئیسلام هەر عیلمی ڕووت نیە بەمەسەلەکان، بەڵکو زانست و کردەوەیە بەیەکەوە، وەکو فەرمووی: ﴿ فَاتَّبِعُوهُ ﴾ ، کەواتە: کەس بەنووسینی سەر پێناسەکەی کەلێی دەنووسرێ (مُسْلِمْ) وەبەوەی شارەزایی لەدین هەبێ، بەبڕوادار ناناسرێ و ئەگەر ئیمانداریش بێ مادام کردەوەی نیە، ئیمانێکە لەکوژاندنەوەدایە.

سێیەم: ئینسانی موسڵمان دەبێ ئاگاداری دوو لایەن بێ بۆ پاراستنی ئیمان و عەقیدەکەی، یەکەم: موو بەموو شوێنکەوتووی ئیسلام بێ و پەیڕەوی ئەمرو نەهیەکانی بکا، دووەم: شوێن هیچ پەیڕەوو پرۆگرامێك نەکەوێ کە لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا پێچەوانەو دژ بێ. ئەو کاتە دەتوانێ بڵێ وەصیەت و ڕاسپاردەکانی خوای گەورەم لەژیانمدا جێبەجێکردوون و لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام لاڕێ نەبووم و دامەزراوم! خوای گەورە هەموو لایەکمان ڕاگیراوو ڕاوەستاو بکات لەسەر شەقامە ڕاستەکەی خۆی ..أللّهُمَّ آمين.

ئیمانداران: بەڕاستی لەڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا، کەهۆکارەکانی بەرەو بێدینی بردن برەوی تەواویان پێدراوەو دڵسۆزان و خەمخۆرانی دین و ژین وەکو پێویست ڕێگایان بۆ خۆش نەکراوە، زۆر گرنگە بزانین بەهۆی چییەوە لەسەر شاڕێگای ئیسلام و ئیمان دامەزراو دەبین و لانادەین، سوپاس بۆ خوای باڵادەست کەقورئان و فەرموودەکانی سەروەرو پێشەوامان هیچیان بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە کەباسی نەکەن، هەرچی دەرگای

خێره کلیلەکەیان داوینەتە دەست, هەرچی دەرگای شەڕو خراپەکاریو لادێنیە قفڵەکەیان داوەتە دەستمانو نیشانەی سووریان لەبەردەم داناوە.. دەبا بچینە خزمەت قورئانو سوننەو بزانین هۆکارەکانی دامەزراوبوون لەسەر ڕێگای ڕاست چینو چۆن دەتوانین پەیڕەویان بکەین:

**یەکەم:** شارەزابوون لەقورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وسَلّم وەدەستگرتن پێیانەوە, لەبەرئەوەی خوای گەورە بۆ خۆی لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلاً﴾(الفرقان 32), واتە: یەکێ لەبیانووی کافرەکان ئەوەبوو کەدەیانگوت: ئەوە بۆ قورئان بەیەك کەڕەت بۆ محمد ڕەوانە ناکرێت؟ خوای گەورە وڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین, تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین, بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژینو دەیگەیەنین.

هەروەها قورئانی پیرۆز هەرکەسێ دەستی پێوە بگرێ دەیگەیەنێتە سەر ڕێگای ڕاست, هەروەکو فەرموویانە: (القُرآن هُوَ حَبْلُ الله المَتين, وَنوره المُبين, مَنْ تَمَسَّكَ بِهِ عَصَمَهُ اللهُ, وَمَنْ اتَّبَعَهُ هُدِيَ إلى صِراطٍ مُسْتَقيم), واتە: قورئانی پیرۆز پەتو حەبلی بەهێزو نەپچڕاوی خوای گەورەیە, نوورو ڕووناکی ئاشکراو نەکوژاوەی پەروەردگارە, هەرکەسێ دەستی پێوە بگرێ خوای گەورە لەسەرگەردانی دونیاو قیامەت دەیپارێزێ, هەرکەسێ شوێنی بکەوێو بیکاتە بەرنامەی ژیانی ئەوا هیدایەت دەدرێ بۆ سەر شاڕێگای ڕاستی ئیمانو ئیسلام..

بەڵێ دەبێ دڵنیابین تاکە ڕێگای ڕزگاری ئەو قورئانە پیرۆزەو بەرنامەی خواییە, وەکو لەئایەتی (100 ـ 101)ی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقاً مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ, وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنْتُمْ تُتْلَى عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَنْ يَعْتَصِمْ بِاللَّه فَقَدْ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە, ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێك لەوانە بن کەکتێبی ئاسمانیان پێدراوە ـ وەکو جوولەکەو گاور ـ دوای ئەوەی کەئێوە ئیمانو باوەڕتان هێناوە, دەتانگێڕنەوە سەر ڕێبازی کوفرو بێباوەڕی, جا ئێوە چۆن کافر دەبن لەکاتێکدا

کەئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوەو پێغەمبەرەکەی لەناوتاندایە {دوای وەفاتیشی بەسیرەتی پاکو بێگەردی هەر لەناوماندایە}, جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێتو پەیرەوی لەبەرنامەکەی بکات, ئەوە بەڕاستی بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاستو دروست هیدایەت دراوە.

بەڵێ موسڵمانان, وەعدی خوایەو ﴿ إِنَّ اللّهَ لا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴾(آل عمران 9), هەرکەسێ دەست بەقورئانو سیرەو سوننەتی رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بگرێ, دەبێ دڵنیابێ کە لەسەر ڕاستی ئیسلام دامەزراو دەبێو بەئیمانەوە بەخزمەت خوای خۆی دەگات.

خۆشەویستان: ئەی عاشقانی (صراط المُستَقيم), گوێ بۆ ئەم موژدەیەی پەروەردگارتان بگرن کە لەسوورەتی (النِّساء ـ ئایەتی 174 175)دا بەئێوەی ئیمانداری دەداتو دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمْ بُرْهَانٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُوراً مُبِيناً, فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَاعْتَصَمُوا بِهِ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَاطاً مُسْتَقِيماً ﴾, واتە: ئەی خەڵکینە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو نیشانەی ئاشکراتان بۆ هاتووە کەمحمد پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمو نوورو ڕووناکیەکی ئاشکراشمان بۆ دابەزاندوون کەقورئانە, جا ئەوانەی کەباوەڕیان بەخوا هێناوەو شوێنی بەرنامەکەی کەوتوون, ئەوە لەئایندەیەکی نزیکدا خوا دەیانخاتە ژێر سایەی فەزڵو ڕەحمەتی خۆیەوەو هیدایەتو ڕێنموونییان دەکات بۆ لای خۆی لەڕێگەی ڕێبازێکی ڕاستو دروستەوە.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ (الحج 54), واتە: بێگومان خوا هیدایەتدەری ئەوانەیە کەباوەڕیان هێناوە بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاستو دروست. وەلەبارەی پێغەمبەری خواشەوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾(المؤمنون 73), واتە: بێگومان ئەی محمد تۆ بانگیان دەکەیت بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاستو دروست.. کەواتە: هەرکەسێ وەڵامی پێغەمبەری خوای دایەوەو شوێنکەوتووی سوننەتەکانی بوو, ئەوە بەڕاستی ڕێگای ڕاستی ئیسلامی گرتووەو لێی لانەداوە.

بەڵێ ئیمانداران: هەروەکو قورئان‌و سونتە ئاگاداریان کردووینەتەوە کە بەهۆی چیەوە ڕاگیراوو دامەزراو دەبین لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام، بەهەمان شێوە ئاگاداریشیان کردووینەتەوە کە بەهۆی چیەوە لەڕێگای ڕاست لادەدەین‌و گومڕاو سەرلێشێواو دەبین.. خوا پەنامان بدات.. لەبەرئەوەی کاتێ فەرمووی: ﴿ فَاتَّبِعُوهُ ﴾ شوێنی ئەم ڕاستە ڕێبازەی من بکەون، یەکسەر فەرمووشی: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ﴾، واتە: نەچن شوێن ڕێبازە جیاجیاکانی ئەم‌وئەو بکەون، ڕێبازە گومڕاییەکان‌و قۆرت‌و پێچ پێچەکان کە لەئاکامدا سەرتان پێ دەکێشێ بۆ پەرتەوازەبوون‌و دووبەرەکی‌و لادان لەڕێبازی ئاینی ئیسلام‌و بەرنامەو پرۆگرامە نموونەییەکەی.

جا ئەگەر سەرنج بدەین ڕێبازی خوا هەر یەك ڕێبازەو تاقانەیە بۆیە دەفەرموێ ﴿ سَبِيل ﴾ ، بەڵام ڕێچکەو ڕێبازەکانی دەستکردو هەواو ئارەزووی مرۆڤ زۆرن، بەدەیان‌و سەدان‌و لەژێر هەزاران ناونیشاندا بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لادان لەڕێی خوا، بۆیە فەرمووی: ﴿ السُّبُلَ ﴾ بەکۆ (جَمْعْ) باسی‌کرد، وەئەوەشی کەلەم ئایەتەوە تێی‌دەگەین، وَاللهُ أَعْلَمْ ئەوەیە: هەر میللەتێك شوێن بەرنامە تاقانەو بێ‌وێنەکەی ئیسلام نەکەوتن‌و چوونە سەر ڕێگای دەستکردو هەڵقوڵاوی هەواو هەوەسی مرۆڤ، وازیان لەشیفاو صەیدەلیەی ئاسمان هێناو میکرۆب‌و ڤایرۆسی سەر زەوییان کردە دەرمانی دەردەکانیان، ئەوا ئەو کۆمەڵگاو میللەتە لەیەك دەپچڕێن‌و دووبەرەکی‌و ئاژاوەو تەفرەقەو جیاجیایی‌و دوژمنایەتی‌و خوێن ڕشتن دەکەوێتە نێوانیانەوە. مێژووی کۆن‌و نوێش‌و ئەمڕۆش باشترین شاهیدحاڵی ئەم حەقیقەت‌و ڕاستی‌یەیە، کەئەوانەی لەسەر غەیری مەنهەجی خوا کۆبوونەوە لەناو حیزب‌و لایەنەکەی خۆشیاندا ناکۆك‌و دژ بەیەك‌و بەخوێنی سەری یەکتر تینوون‌و هەوڵی لابردن‌و کەنارخستنی یەکتری دەدەن، چ جای ئەوەی کە لەبەرنامەو ڕێکخراوی خۆیدا نەبێ.

کەواتە: لادان لەشەرع‌و ڕێبازی ڕاستی خوا، جگە لەماڵوێرانی قیامەت مایەی دووبەرەکی‌و لەیەك ترازان‌و ناکۆکی‌و ناڕێکی ئینسانەکانە لەنێوان خۆیاندا.. جا بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری مانای ئایەتە قورئانیەکەو دەستنیشان کردنی ڕێگەو ڕێچکە لارو هەڵدێرەکان، پێغەمبەری خوا لەفەرموودەکانیدا ڕوونی کردۆتەوە وەکو ئەو فەرموودەیەی

کەئیمامی ئەحمەدو ترمذی (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: (خَطَّ لَنا رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم خَطّاً ثُمَّ قالَ: هذا سَبيلُ الله)، واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا بەدەستی موبارەکی خەتێکی ڕاستی کێشا، پاشان فەرمووی: ئەمە ڕێگای ڕاستی پەروەردگارە، (ثُمَّ خَطَّ خُطُوطاً عَنْ يَمينِهِ وَعَنْ شمالِهِ، ثُمَّ قالَ هذِهِ سُبُلٌ مُتَفَرِّقَةٌ، عَلى كُلِّ سبيلٍ مِنْها شَيْطانٌ يَدْعُوا إِلَيْهِ) واتە: ئەمجا لەلای ڕاستو چەپی خەتە ڕاستەکەوە کۆمەڵێ خەتی کێشان، ئەمجا فەرمووی: ئەم ڕێگایانە هەموویان ڕێگای گومرایین، ڕێچکەیەك نیە شەیطانێکی بەسەرەوە نەبێو بانگەوازی ئادەمیزادی بۆ نەکا. پاشان پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَأَنَّ هَـــذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَـــاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَـتَفَـــرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ﴾..

لەفەرموودەیەکی تردا کەئیمامی ئەحمەدو ترمذیو نەسائی (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەنەواسی کوڕی سەمعانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی: خوای پەروەردگار بەنموونەو مەثەل باسی ڕێگای ڕاستی ئیسلامی کردووەو فەرموویەتی: ئاینی ڕاستو دروستی من ڕێگایەکی ڕاستو ڕێکە لەهەردوو قەراغی ڕێگاکە دوو شوورەو دیوار هەن، دەرگای کراوەیان تێدان، دەرگاکان پەردەیان پێوەن، پەردەکانیان دادراوەتەوە، لەسەر دەرگای هەر ڕێبازێك لەو ڕێبازانە، بانگەوازکەرێك هەیە، بانگ دەکاو دەڵێ: خەڵکینە وەرن بۆ سەر ئەم ڕێبازە ڕاستەو هەمووتان پێیدا بڕۆنو پەرتەوازە مەبن، بانگەوازکەرێکی تریش لەژوور ڕێگاکەوە بانگ دەکات، ئەگەر یەکێك بیەوێ دەرگایەك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێ: کوڕە نەکەی دەخیلت بم! تۆ ئەو دەرگایە بکەیتەوە کێشت دەکاو ڕاتدەکێشێ. جا پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: ڕێگا ڕاستەکە ئیسلامە، شوورەو دیوارەکان پەرژینو سنوورەکانی خوان، دەرگا کراوەکان شتە حەرامەکانن، بانگەوازکەری سەر ڕێگاکە قورئانی خوایە، بانگەوازکەری ژوور ڕێگاکە ئامۆژگاریکردنی خودایە کە لەدڵی هەر موسڵمانێکدا هەیە..بەڵێ، بەڕاستی هەرکەسێك وڵامی قورئانەکەی خوا نەداتەوەو بەڕێگا ڕاستەکەدا نەڕواتو گوێ بۆ ئامۆژگاری خوا نەگرێ کە بەڕەحمو ڕەحمەتی خۆی

خستوویەتیە ناو دڵی هەموو موسڵمانێکەوەو هەرکاتێ ئینسان وویستی دەرگایەکی حەرام لەخۆی بکاتەوەو سنووری خوا بشکێنێ، یەکسەر دڵی دەهەژێنێو پێی دەڵێ: نەکەی، بچیتە ناویەوە تیادەچیتو بەئاسانی ڕزگارت نابێ. جا کەسێك بەگوێی ئەم دوو ئامۆژگاریکارە بەسۆزە نەکاتو لەڕێگاکە لابدات خۆی زوڵمی لەخۆی کردووەو خۆی موستەحەقی سزای دونیاو دوارۆژ کردووە.

ئیمانداران: پێغەمبەری خۆشەویستمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئاگاداری کردووینەتەوە کەڕۆژێك دێتە پێشەوە، خەڵکی جیاوازیو دووبەرەکیو کێشەوبەرەی زۆریان دەکەوێتە نێوانەوە وەکو دەفەرموێ: ( وَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى إِخْتِلافاً كَثِيراً)، جا وەکو دەردەکەی دیاریکردووە، دەرمانەکەشی دەستنیشان کردووەو فەرموویەتی: کاتێ ئەو زەمانە هاتە پێشەوە (فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الخُلَفَاءِ الرَّاشِدِين المَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، عَضُوا عَلَيْها بِالنَواجِذِ)(رَواهُ أَحمَد وأَبوداود والترمِذي وَقالَ حَسَنٌ صَحيح) فەرمووی: لەو کاتەدا وەصیەتو ئامۆژگاری بێت بۆتان کەدەست بەسوننەتو ڕێبازی منەوە بگرن، وەبەشوێن ڕێبازی خولەفای ڕاشدینی مندا برۆن کە لەدوای خـــۆم دێن، بەددان قەپی پێدابکەنو لێی لامەدەن.

بەڵێ هەرکەسێ لەڕێبازی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم لابدات، ئەوە گومڕاو سەرلێشێواوە، وەکو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: (لَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ)(رَواهُ مُسلِم)، واتە: هەرکاتێ وازتان لەسوننەتو ڕێبازی پێغەمبەری خوا هێنا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئەوە گومڕابوون! هەروەها إبن القَيِّمْ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەپێشەکی کتێبەکەیدا بەناوی (طَريق الهِجْرَتَيْن وَباب السَّعادَتَيْن)دا دەفەرموێ: شێخ جونەیدی بەغدادی فەرموویەتی: هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بەڕەزامەندی خواو خۆشبەختی دونیاو قیامەت، هەموویان داخراون، تەنها ڕێبازی پێغەمبەری سەروەرو سالار نەبێ ـ عَلَيْهِ الصَّلاة وَالسَّلام، لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی فەرموویەتی: (وَعِزَّتي وَجَلالي لَوْ أَتُوني مِنْ كُلِّ طَريقٍ، وَاسْتَفْتَحُوا مِنْ كُلِّ بابٍ لَما فَتَحْتُ لَهُمْ حَتَّى يَدْخُلُوا خَلْفَكَ يا مُحَمَّد)، واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: بەعیزەتو جەلالی خۆم، ئەگەر خەڵکی سەر زەوی لەهەموو ڕێگایەکەوە بێن بۆ لام، وەلەهەموو دەرگایەك بدەن، دەرگایان لێناکەمەوە

هەتا بەشوێن تۆدا نەیەن بۆ لام ئـــەی پێغەمـبەری خـــۆشەویست ـ ئەی مـــحمـــد ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ! !

هەروەها ئیمام الزهري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (الإعْتصامُ بِالسُّنَّةِ نَجاةٌ, لأنَّ السُّنَّةَ كَما قالَ مالك: مِثْلُ سَفينَةِ نوحٍ, مَنْ رَكِبَها نَجا, وَمَنْ تَخَلَّفَ عَنْها هَلَكَ), واتە: دەستگرتن بەسوننەتو ڕێبازی پێغەمبەری خوا, ڕزگاربوونو نەجات بوونە, لەبەرئەوەی سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, وەکو ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: وەکو کەشتیەکەی حەزرەتی نووح ـ عَلَيْهِ السَّلام ـ وایە, هەرکەسێ سواری ئەو کەشتیە بوو ڕزگاریبوو لەخنکانو تیاچوون, هەرکەسێکیش نەچووە ناویەوەو دواکەوت, خنکاو لەئاودا غەرق بوو سەروماڵی تێداچوو!

ئیمانداران: زانایەکی دڵڕووناك, نموونەیەکی زۆر جوانمان بۆ باس دەکات لەسەر ڕۆیشتن بەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلامدا لەگەڵ ڕۆیشتن بەکوێرکە ڕێگاکانی بەشەردا, دەفەرموێ: نموونەی خەڵکی لەژیانی ئەم دونیایەدا وەکو نموونەی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر وان کەمەبەستیانە بگەنە ناو کۆشكو تەلارێکی ڕازاوەو جوانو گەورەو بێوێنە, بۆئەوەی بگەنە ئەوێو بەخۆشی ژیان ببەنە سەر, کاتێ لەهەموو لایەکەوە کۆدەبنەوەو دەگەنە بەردەرگای شووراو حەوشەی کۆشکەکە کە لەدووری چەند سەد مەترێکەوە بۆی کراوە, تەماشادەکەن بەخەتێکی زۆر جوانو گەورە خاوەنی کۆشکەکە لێی نووسیوە: ئەی خەڵکینە ئاگاداربن من هەرچواردەوری ئەم کۆشکەم بەلوغم چاندووە, بەڵام لەناوەڕاستدا ڕێگایەکی ڕاستم هێشتۆتەوە, هەرچەندە ئەو ڕێگا ڕاستە دوورو درێژەو ئەوەی بەو ڕێگا ڕاستەدا بڕوات ناڕەحەتیو درێژی ڕێگاکە ماندووی دەکات, بەڵام ئەگەر سەبرو ئارامی هەبێ بەسەلامەتی دەگاتە ناو کۆشکەکە, بەڵام تکاتان لێدەکەم, ئاگاداربن نەچن ئارام نەگرنو بەلای ڕاستو چەپی ڕێگاکەدا لابدەن, چونکە لوغم لەژێر قاچتاندا دەتەقێتەوەو بەهیلاك دەچن.

بەم شێوەیە خەڵکەکە هەمووی نووسراوەکە دەخوێننەوە, بەڵام هەرئەوەندە چوونە ئەودیو دیوارەکەوە, ئیتر کۆمەڵێك لەو خەڵکە ڕەنگینی کۆشکەکەو ڕازاوەیی دارودیوارەکەی هەموو شتێکی بیردەباتەوەو بۆئەوەی زووتر بگاتە ناوی, ڕێگا ڕاستەکە

بەجێدەهێڵێو دەیەوێ بەلارێیەکدا خۆی بگەیەنێتە کۆشکەکە, بەڵام هەرئەوەندە لەرێگاکە لایدا لوغمێك لەژێر پێیدا دەتەقێتەوەو گیانی لێ دەستێنێو بەهەناسە ساردی سەر دەنێتەوە! لەولاوە کۆمەڵێك لەخەڵکەکە تەماشای ئافرەتێکی گۆرانیبێژی جوان دەکەنو بەدەنگو لاشەی سەرسام دەبنو دەیانەوێ بەزووترین کات خۆی بگەیەننێ, بەڵام هەر کە لەرێگا راستەکە لایاندا بەدەردی ئەوانەی پێش خۆیان دەچنو لوغم دەیانبات بەئاسماندا و بەئاواتی خۆیان ناگەن. کۆمەڵێکیتر لەکۆشکەکەوە بانگ دەکرێن وەرن بۆ لای ئێمە ببنە سەرۆکو سەرکردەمان, بەخۆمانو ماڵو سەروەتمانەوە لەخزمەتتاندابن, ئەمانەش بەتەماحی گەیشتن بەکورسی دەسەڵات, لەرێگا راستەکە لادەدەنو بەڵام پێش ئەوەی بگەنە سەر کورسیو کولێرەکە گیانیان لەدەست دەدەنو دەست بەتاڵ سەر دەنێنەوە!

کۆمەڵێکی تریش لەخەڵکەکە, جوانیو بریسکەی ئەو هەموو زێڕو زیوەی ناو کۆشکەکە, ئەو هەموو فەرشە ئاوریشمینە نایابە عەقڵو هۆشیان لا ناهێڵێو ئەو نووسراوەی سەر دەرگای حەوشەو شووراکە گوێ نادەنێو روو لەرێچکۆکەیەکیتر دەکەنو بەرەو کۆشکەکە مل دەنێنو لەرێگا راستەکە لادەدەن, بەڵام خۆ پێشتر چارەنووسیان لەنووسراوی سەر دەرگاکەدا دیاریکرابوو, بۆیە بەچارەنووسی رەشی خۆیان دەگەنو بەبێ ئاگایی ئەم دونیایە بەجێدێڵن. بەم شێوەیە تەماشادەکەی بەهەزاران کەس, لەسەدان کوێرکەرێو لارێوە رۆیشتوون, بەڵام هەموویان لەناوچوون, تەنها ئەوانە بەسەلامەتی دەگەنە کۆشکەکە کەئارامگرو لەسەرخۆن, نووسراوی سەر دەرگاکەیان کردۆتە نەخشی سەر دڵو مێشکیانو هەرکاتێ ویستبێتیان چاو لەو خەڵکە بکەنو لەرێگاکە لادەن, خێرا نووسراوو ئاگاداریەکەیان هێناوەتەوە پێش چاوی خۆیانو گەراونەتەوە سەر رێگا راستەکە, سەرەنجام بەسەلامەتیو بەدەستو قاچو چاوی ساغەوە دەگەنە ناو کۆشکەکەو دەبینن ئەوەی ئەوان لەدوورەوە چاویان لێی بووەو خەریك بوو لەتاوانی لادەن, ئەوە هەر هیچ جوانیو رازاوەییەك نەبووە لەچاو ناو کۆشکەکەدا, وا ئەو دەنگو رەنگەی کەخەڵکەکەیتر لەبەر خاتری گەیشتن پێیان لەرێی راست بۆیان لاداو بەهیلاك چوون, وا ئەو جوانو نازدارانە ناو کۆشکەکەیان ئاوەدانتر کردۆتەوەو لەخزمەتو

پێشوازییاندان. خۆ ئەو بریسکەی زێڕو فەرشە ڕەنگینانەی کە لەدوورەوە ئاوی چاوی ئینسانیان دەبردو بەهەزاران خەڵك بۆ گەیشتن پێی، ئارامی نەماو خۆی خستە بەر ڕەحمی لوغمو ئاگرو بەناناکامی سەری نایەوە، ئێستا ئەمان بەسەریدا هاتوچۆ دەکەن‌و لەژێر پێیاندایە. لەهەموو ئەمانەش گەورەتر ئەوەیە کەخاوەنی کۆشکەکە دێتە پێشوازیان‌و بەخێرهاتنیان دەکات‌و ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەوان دەردەبڕێت کە بەگوێرەی نووسراوی سەر دەرگاکە بەڕێگا ڕاستەکەدا هاتن‌و ئارامیان گرت‌و نەخەڵەتان.

جا بەڕاستی ئەمە نموونەی ئینسانەکان‌و ژیانی دونیاو بەرنامەی خواو بەهەشتی بەرینە، هەرکەس لەڕێگا ڕاستەکەی خوا لایدا بەهیلاك چوو، بەئامانج نەگەیشت، جا هەر ڕێگایەکی گرتبێ، فەرموودەی خوایە: ﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ﴾.

بەڵێ هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ دەیانەوێ موسڵمانان لەڕێبازی ڕاستی ئیسلام دووربخەنەوەو دەیان دروشم‌و ناوی وەکو دیموکراتی، سەرمایەداری، سۆسیالیستی، سۆشیاڵ دیموکرات‌و.. هتد، دەکەن بەڕێبازو ڕێگای گەیشتن بەبەختەوەری مرۆڤایەتی، ئەوە تەنها خەیاڵ پڵاوییەو مێژوو ئەو ڕاستییەی سەلماند کەمرۆڤایەتی، دەیەهاو سەدەها ڕێبازی غەیری ئیسلامی گرتەبەرو تەجروبەی کردو تاقیکردەوە، هەرچەندە لەهەندێ کات‌و وڵاتدا، لەو کوێرکە ڕێگایانەوە بۆ ماوەیەك دەسکەوتی ماددیی‌و دونیایی‌و هێزو دەسەڵات‌و پلەو پایەیان بەدەست هێنا، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانی خۆشبەختی بۆ مرۆڤایەتی مسۆگەر بکەن، لەبەر ئەوەی ئارامی‌و دڵنیایی‌و ئاسوودەیی ناو دڵ‌ودەروونی تاکە کەس، وەدڵنیایی‌و بەختەوەری‌و ئەمینی ناو کۆمەڵگا بزر دەبێ‌و نادۆزرێتەوە کاتێك مرۆڤ لەمەنهەج‌و ڕێگای ڕاستی خوا لابدا.. هەروەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ شاهیدە کەووڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی دونیا لەبواری ماددیدا، بۆ نموونە (سوید) ڕێژەی نەخۆشیە دەروونییەکان‌و شێت بوون‌و خۆکوشتن تێیدا لەهەموو وڵاتانی تر زیاترە ! !

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبّاً عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيّاً عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾(الملك 22)، واتە: ئایا ئەو کەسەی کەدەمەوڕوو کەوتووەو بەو

حاڵەوە دەڕوات, چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاستو ڕەواندا بەڕێکوپێکی دەڕوات بەڕێوە؟!

بەڕێزان: ئەمە خاڵی یەکەم بوو لەو هۆکارانەی کە بەدەست پێوەگرتنو تێگەیشتنیان دامەزراویمان لەسەر شەقامە ڕێگەی ڕاستی پەروەردگار بۆ دروست دەبێ, إنشاءَ اللە لەووتاری داهاتوودا خاڵەکانی تریش باس دەکەینو هەموومان بەدڵو بەزمان دەڵێین:

یارەبی خوایە ڕاگیراوو دامەزراومان بکەی لەسەر ڕێبازی ڕاستو دروستی خۆت..لەقورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەری پێشەوامان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم زیاتر شارەزامان بکەیو تێیبگەینو ڕەفتاری پێبکەین..

ئـــەوانەمــان کـــەچاکین چاکترمان بکەی..

ئەوانەمان خراپو لارین هیدایەتمان بدەی ..

أللَّهُمَّ آمين..

# ووتاری ژماره سی وحەوت

## ڕاگیربوون لەسەر ڕێبازی ڕاستی ئیسلام

### بەشی دووەم

قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يا بَني آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبينٌ, وَأَنْ اعْبُدوني هذا صِراطٌ مُسْتَقيمٌ ﴾

(يس 60 ـ 61)

قالَ رسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم:

(مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ في الدِّينِ, وَإِنَّما أَنا قاسِمٌ وَيُعْطي اللهُ, وَلَنْ يَزالَ أَمْرُ هذِهِ الأُمَّةِ مُسْتَقيماً حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ أَوْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ)

( رَواهُ البُخاري)

الحمدُ لله رَبِّ العالَمين, والصَّلاةُ والسَّلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّد وعلى آله وصَحبِه أجمَـعين .

ئیمانداران‌و خواناسانی ئەهلی قیبلە, سەلام‌و ڕەحمەتی خوا لەئێمەو هەموو موسڵمانان بێت بەگشتی.

بەڕێزان: لەووتاری ڕابردوودا لەخزمەت وەصیەت‌و ئامۆژگاری دەیەم‌و کۆتایی دە ڕاسپاردەو ئامۆژگارییەکانی پەروەردگاردا بووین کەفەرمووی: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾(الأنعام 153), لەووتاری پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کەچەند هۆکارو ڕێبازێك هەن بەدەست پێوەگرتن‌و ئاگاداربوون لێیان, زیاتر دامەزراوی‌و ئیستیقامەمان لەسەر (صِراطَ المُستَقيم)ی خوای گەورە زیاتر دەبێ.

باسی خاڵی یەکەممان کرد کەبریتی بوو لەشارەزابوون لەقورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی حەزرەتی رَسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم پاشان کارکردن پێیان, لەبەرئەوەی ئێمەی ئەهلی ئیمان‌و ئیسلام" ئێستا لەسەردەمێکدا دەژین کەئەگەر بۆ چەند ساتێکی کەم لەقورئان‌و سوننەت بێ‌ئاگابین تیادەچین‌و سەرگەردان دەبین, وەئەگەر لەسەر قورئان‌و سوننەش ڕاگیراوو دامەزراوبین إنشاءَ الله بەر ئەو موژدە گەورەیە دەکەوین کەپێغەمبەری سەروەرو سالارمان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بەئومەتەکەی داوەو فەرموویەتی: (بَدَأَ الإسلامُ غَريباً وَسَيَعودُ كَما بَدَأَ غَريباً, فَطوبى للغُرَباء)(رَواهُ مُسلِمٌ), واتە: ئەم ئیسلامە شیرینە بەغەریبی هاتووەو کەدەشگەڕێتەوە بۆ مەیدانی ژیان هەر بەغەریبی دەگەڕێتەوە, جا بەختیاری‌و سەرفرازی‌و خۆشبەختی دونیاو بەهەشتی نەبڕاوەی قیامەت بۆ غەریبەکان!

جا ئایا غەریبەکان چ کەسانێکن, ڕەفتارو گوفتاریان چۆنە؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لەچەند ڕیوایەتێکی جیاوازدا بۆی ڕوونکردووینەتەوەو فەرموویەتی: (الَّذينَ يُصلِحُونَ ما أفسَدَ النّاسُ مِنْ بَعْدي مِنْ سُنَّتي)(رَواهُ التُرمذي), واتە: غەریبە بەختەوەرەکانی ئومەتم ئەو کەسانەن کەئەوەی خەڵکی لەدوای من لەڕێوشوێنی من تێکیان داوە چاکی‌دەکەنەوە.. لەڕیوایەتێکدا: (الَّذينَ يَفِرُّونَ بِدينِهِمْ مِنَ الفِتَنِ), واتە: ئەو کەسانەی کە لەبەر فیتنەو بێ‌دینی‌و گومڕایی هەڵدێن‌و ڕادەکەن‌و دین‌و بیروباوەڕەکەیان

ڕزگاردەکەن. هەروەکو لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم دەفەرموێ: (يَأتي عَلى النَّاسِ زَمانٌ, الصَّابِرُ فيهِمْ عَلى دينِهِ كَالْقابِضِ عَلى الجَمْرِ)(حَديث صَحيح رَواهُ الترمذي), واتە: ڕۆژگارێك بەسەر ئەم خەڵکەدا دێت, ئینسانی ئارامگرو خۆگر لەسەر دین‌و بیروباوەڕی ئیسلامەتی خۆی, وەکو ئەو کەسە وایە کەدەستی لەسەر ژیلەمۆو پشکۆی ئاگری سوورە !

واتە هەرکەسێ بیەوێ ئیمانەکەی سەلامەت بێ‌و لە (صِراط المُسْتَقيم) لانەدات, دەبێ زۆر ئارامگرو خۆڕاگر بێ‌و تەحەمولی ئازاری جەستەیی‌و دەروونی‌و زەرەری ماڵی‌و مادی‌و مەنصەبی بکات‌و چۆك دانەدات! لەبەرئەوەی خۆشەویستمان حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئاگاداری کردووینەتەوە لەسەردەم‌و زەمانێکی ترسناك بۆ لەناوچوونی دین‌و ئیمان‌و خزان‌و لاڕێبوون لەسەر شاڕێگای ئیسلام, وەکو فەرموویەتی: (بادِرُوا بِالأعْمالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللَّيْلِ المُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِناً وَيُمْسي كافِراً, وَيُمْسي مُؤْمِناً وَيُصْبِحُ كافِراً, يَبيعُ دينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيا)(رَواهُ مُسلِمٌ), واتە: پەلەبکەن بۆ ئەنجامدانی کاری چاکەو بەسوود بۆ دونیاو دواڕۆژی خۆتان پێش ئەوەی کەکۆمەڵە فیتنەیەك بێنە ڕێگاتان کەوەکو تاریکەشەوی بەهار وان, کەئینسان تێیدا بەرپێی خۆی نابینێ, ئا لەو سەردەمی فیتنەی بێدینیەدا ئینسانی وا هەیە کەبەیانی لەخەو هەڵساوە ئیماندارو موسڵمان بووە, بەڵام کەئێوارەی ئەو ڕۆژەی لێ هاتووە کافربووەو لەدینی محمد چۆتە دەرەوە. وەئینسانی وا هەیە ئێوارە ئیماندارو موسڵمانە, بەڵام بەیانی کەڕۆژ دەبێتەوە لەدینی محمد چۆتە دەرەوەو کافربووە ! خوا بەلوطفی خۆی پەنامان بدات.

ئەمەش هەمووی لەئەنجامی دانیشتن لەگەڵ ڕەفیق‌و کۆڕوکۆمەڵی خراپ کەتانەو تەشەر لەدین‌و لەخواو پێغەمبەرو قورئان‌و شەریعەتی ئیسلامی دەدەن‌و بەکۆنەپەرستی‌و دواکەوتوویی دەزانن‌و گاڵتەوگەپ بەشوێنکەوتووەکانی دەکەن. جا ئەو کەسەی کەئیمانیشی هەیە کەڕەزامەندی لەسەر قسەکانیان نواندو سەری بۆ لەقاندو سەلماندی‌و ڕووی گرژ نەکرد بەرامبەریان‌و مەجلیسەکەی بۆ بەجێنەهێشتن (کاتێ توانای بەرپەرچ دانەوەیانی نەبوو) ئەوە ئەویش پێی کافر دەبێ‌و لەئەهلی قیبلە دەردەچێ.

کەواتە ئیمانداران: ئەوەی کە لەکافربوونەوەو لاڕێبوون دەمانپارێزێ دەستگرتنە بەقورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم تاوەکو عەقیدەیەکی وا لەدڵماندا دروست ببێ کەبۆ هیچ مەبەستێکی دونیایی شوێنکەوتووی ئیسلام نەبین, هەروەکو قورئانی پیرۆز لۆمەو سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کەخواپەرستیەکەیان مۆلەقەو دامەزراو نینو دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ﴾ (الحج 11), واتە: هەندێك لەخەڵكی هەیە, تەنها لەیەك حاڵەتدا خواپەرستی دەكات, ئەویش ئەو حاڵەتەیە كەدونیا بەدڵی ئەو بێت, خۆ ئەگەر تووشی تاقیكردنەوەیەك هات, سواری سەری خۆی دەبێتو هەڵدەگەڕێتەوە, ئا بەو حاڵەتەی دونیاو قیامەت لەدەست خۆی دەداتو زەرەرمەندی هـەردوو لایەو هەر ئەوەشە خەسارەتمەندو زەرەرمەندی ڕوونو ئاشكرا..

ئەم ئایەتە قورئانیە دەربارەی هەندێك عەرەبی كۆچەری هاتۆتە خوارەوە كەهاتن لەمەدینە جێگیربوون, جا هەركامیان لەش ساغو تەندروست بوایەو ماینەكەی بزایەو ژنەكەی كوڕی ببوایەو مەڕوماڵاتو حوشتری باش زیادی بكردایە, دڵئارام دەبوو و دەیگوت: لەو كاتەوەی هاتوومەتە سەر ئەم ئاینی ئیسلامە لەچاكە زیاتر تووشی هیچ نەبووم, بەڕاستی ئاینێكی چاكەو خێرو خۆشی پێوەیە, بەڵام ئەگەر یەكێك حاڵەكەی بەپێچەوانەوە بوایە دەیگوت: لەو كاتەوەی هاتوومەتە سەر ئەم ئاینە لەخراپە زیاتر تووشی هیچ نەبووم, لەوەتەی موسڵمان بووم مەڕوماڵاتم نەخۆش دەكەوێو حوشترم دەمرێو ژنەكەم كچی دەبێو كاسپیم بێبەرەكەتە, هەروەكو ئەوەی بڵێ: ئەم دینی ئیسلامە شوومەو مایەی نەگبەتیە بۆم بۆیە وازی لەدینی ئیسلام دێناو كافر دەبۆوە!

بەداخەوە لەم سەردەمەشدا هێشتا كەم نین ئەو بەناو ئیماندارانەی كەهەر لەكاتی لەش ساغیو دەوڵەمەندیو خۆشگوزەرانیو بێوەییدا چاك لەخوا دەپاڕێنەوەو باش هاتوچۆی مزگەوت دەكەنو شوكری خوا دەكەن, بەڵام كەنەخۆشیەك تووشی خۆیان یان ژنو منداڵیان هات, یان ئەولادێكیان مرد, یان تووشی زەرەرو زیانێكی مادی هاتن, یەكسەر دەست دەكەن بەكوفر كردنو دەیان ووشەی ناشیرینو بێئەدەبیان بەرامبەر

خوای گەورەو قەزاوقەدەری خوا - نَعوذُ بِالله لەدەم دێتە دەرەوەو نوێژ ناکەن‌و هاتوچۆی مزگەوت ناکەن!

بەڵام ئیمانداری ڕاستەقینە دەبێ وەکو صەحابەکانی پێغەمبەری خوا بێ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، بۆ نموونە حەزرەتی خالیدی کوڕی وەلید (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێ کە لەگەرمەی جەنگی (یەرمووك)دا نامەی خەلیفەی موسڵمانان ئیمامی عومەری کوڕی خەطابی بەدەست گەیشت، کەفەرمانی پێدابوو بەگەیشتنی ئەم نامەیە تۆم لەسەرکردایەتی سوپای موسڵمانان لابردو (ئەبوعوبەیدە)م کرد بەسوپاسالاری لەشکرو تۆ وەکو سەربازێك لەژێر فەرماندەیی ئەودا دەبی! کاتێ حەزرەتی خالید نامەکەی خوێندەوە وەك خواناسێکی بەئەمەکی دامەزراو، هاوسەنگی خۆی لەدەست نەداو فەرمووی: زۆر باشەو ملکەچم. هەر خێرا ئەبوعوبەیدەی بانگ کردو فەرمووی: لەم ساتەوە تۆ سەرکردەی سوپایت‌و منیش دەبمە سەربازێکی گوێڕایەڵی تۆ! هەندێ لەنزیکانی خالید عەرزیان کرد: قوربان ئاخر خۆ تۆ هیچ شکستێکی سەربازیت بەسەر نەهاتووە یان بێ‌فەرمانیەکی خەلیفەت نەکردووە، بۆچی کتوپڕ لەقیادەوە کردیەوە بەجوندی، ئایا چۆن بێ مشتومڕ قبووڵت کرد؟! حەزرەتی خالید بەوپەڕی دامەزراویەوە فەرمووی: (من لەپێناوی ئیمامی عومەردا ناجەنگم، بەڵکو لەپێناوی ڕەزامەندی خوای ئیمامی عومەردا دەجەنگم!).

بەڵێ خالید وەك لەبواری سەربازیدا سەرکەوتنی زۆری بەدەستهێنا، لەبواری جەنگی دەروونی خۆیشیدا سەرکەوتنی بەدەستهێناو زاڵبوو بەسەریدا، کەئەمەش دیارە کارێکی ئاسان نیەو خەڵکانێکی زۆر هەن لەبانگەوازدا نەك بە لەسەرکار لابردن بەڵکو تەنها ڕووگرژیەکیان بەسە کەواز لەهەموو شتێك بهێنن!

بەڵێ ئیمانداران: ئەم ئیسلامە ڕاستەڕێگایەکەو نابێ ئینسانی موسڵمان بەرەو دواوە ئاوڕ بداتەوەو ئەملاولا بکات، هەروەکو قورئانی پیرۆز لەبەسەرهاتی حەزرەتی لوطو گەلەکەیدا ئەو دەرسەمان تێدەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴾(الحجر 65)، واتە: ئەی لوط، لەبەشی کۆتایی شەودا خێزان‌و شوێنکەوتووەکانت لەئیمانداران لەدێیەکە ببەرە

دەرەوەو خۆت لەدوایانەوە برۆ، با هیچ کەس لەئێوە لانەکاتەوەو ئاوڕ نەداتەوە، برۆن بۆ ئەو شوێنەی کەفەرمانتان پێدراوە.

سەرنج بدەن فەرمووی: ﴿ وَلا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ ﴾ کەس لەئێوە ئاوڕ نەداتەوە، چونکە - واللهُ أعلَمْ - دوور نیە لەکاتی ئەو ئاوڕدانەوەیەدا شەیطان زەفەر بەدڵیان بێنێو بیری کەسوکارو نیشتمانو خاکی لەدایکبوونیان بخاتەوە کەپاش ماوەیەکیتر لەناودەچنو خوا غەزەبیان لێدەگرێ، ئیتر بەم سۆزو عاطیفەیە بگەڕێنەوەو لەدینەکە پاشگەزببنەوە، لەبەرئەوەی یەکێ لەو هۆکارانەی کەشەیطان بڕوادارانی پێ سەرقاڵ دەکات (إستفزاز)کردنە هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ﴾(الاسراء 64).. جا پیاوانی شەیطانیش لەهەموو کاتو سەردەمێکدا بەهەمان هۆکاری شەیطان خەڵکی سەرقاڵ دەکەن بۆیە دەبێت بڕواداران هۆشیاربنو لەسەر ڕاستەشەقامی ئیمانو ئیسلامەتی بەدامەزراویو بەرچاوڕوونیەوە برۆن بەرێداو ئاوڕ لەشەیطانو پیاوانی نەدەنەوە، چونکە گورگ کاتێ ئاسکی بۆ دەگیرێت کەئاسکەکە ئاوڕبداتەوەو بۆ دواوە بڕوانێ، هەر بەو ئاوڕدانەوەیە، ئەو ئاسکە تیژڕەوە خێراییەکەی کەم دەکاتو سارد دەبێتەوەو گورگەکە پێی دەگاتو لەناوی دەبات.

هەزار ڕەحمەتو ڕەزای خوا لەفاروقی ئیسلام عومەری کوڕی خەطّاب بێت کەفەرموویەتی: (الإسْتِقامَةُ: أنْ تَسْتَقِيم عَلى الأمرِ وَالنَّهي، وَلا تَروغَ رَوَغانَ الثَّعالِبِ)، واتە: ئیستیقامە ئەوەیە کە بەگوێرجوگوێی بەشارێگەی ئیسلامدا برۆیتو وەك ڕێوی ئاوڕ بەملاولادا نەدەیتەوە..

خۆشەویستان: هەموو ساردبوونەوەیەكو ئاوڕدانەوەیەك بەلای دونیا پەرستیو ڕێچکەو ڕێبازە لارەکان، دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی ئیمانیو سەرەنجام هاتنە خوارەوەی پلەیەك لەبەهەشتی بەریندا. با دوو نموونە بێنینەوە:

**نموونەی یەکەم:** لەغەزای (خەیبەر)دا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ئاڵاکەی ئیسلامی دایە دەست ئیمامی عەلیو پێی فەرموو: برۆ بۆ فەتحی قەڵای خەیبەرو ئاوڕنەدەیتەوە، ئەویش چەند هەنگاوێك ڕۆیشتو پاشان وەستا بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە هەندێ پرسیاری لەحەزرەت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم کــردو ئەویش وەڵامــی دایەوەو ئەمجا ئیمامی عەلی بەرەو

قەڵاکە ڕۆیشتو ئاوڕی نەدایەوە هەتا فەتح کرا!

**نموونەی دووەم:** لەجەنگی موئتەدا لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم سوپایەکی سێ هەزار کەسی نارد بۆ شام بەسەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریثەو فەرمووی: ئەگەر زەید تووشی شتێ هات با جەعفەری کوڕی ئەبی طالیب سەرۆکو ئاڵابەدەست بێ، ئەگەر جەعفەریش تووشی شتێ هات با عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بچێتە جێگای، ئەگەر عەبدوڵڵاش تووشی شتێ هات با موسڵمانان بۆ خۆیان فەرماندەیەك هەڵبژێرن. کاتێك سوپای ئیسلام گەیشتە (معان) بیستیان کەدوژمن (200) هەزار کەسن، کەوتنە ڕاوێژ لەناو خۆیانداو خەریك بوو ڕایان بێتە سەر ئەوەی کەهەواڵ بدەنەوە بەپێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تا بزانن یارمەتیان بۆ دەنێرێ یان فەرمانی بەچیە. عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کەوتە هاندانیانو گوتی: خزمینە بەخوا ئەو شتەی ئێستا پێتان ناخۆشە ئەوەیە کەئێوە هەوڵی بۆ دەدەن، ئەویش شەهیدیە، ئێمە بەباوەڕی ئاینەکەمانەوە دەجەنگین، ئێمە یەکێ لەو دوو خۆشیو چاکەیەمان دەستگیردەبێ، سەرکەوتن یان شەهیدی. لەسەرەتای جەنگەکەدا زەیدی کوڕی حاریثە شەهیدبوو، ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب بوو بەفەرماندەی لەشکری ئیسلامو ئەویش هەردوو قۆڵی لەشەڕەکەدا قرتانو ئاڵاکەی بەبەینی هەردوو ڕانی گرتبوو، دواتر شمشێریان لەهەردوو ڕانی داو شەهیدبوو، ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرتو ڕاڕاییو دوودڵیەکی تووش بوو، بەڵام هەر خێرا ئامۆژگاری نەفسی خۆی کردو بەچەند دێڕە هۆنراوەیەك بەخۆی گوت: ئەی نەفسەکەم، خۆ ئەگەر لەم شەڕەشدا نەکوژرێی ڕۆژێك هەر دەبێ بمری، خۆ لەدەست مردن ڕزگارت نابێ، ئەی نەفسەکەم ئەوەی چەند ساڵە ئاواتی بۆ دەخوازی کەشەهیدبوونە لەپێناوی خواداو گەیشتنە بەکاروانی شەهیدانی ئیسلام، وا ئەمڕۆ نزیك بۆتەوە، دە بڕۆ مەیدانو ئاڵای ئیسلام بەرزبکەوەو لەدوژمن بدە، یان سەرکەوتنی ئیسلام یان گەیشتنەوە بەهاوەڵان، زەیدو جەعفەر.

بەڵی چووەوە مەیدانو شەڕێکی زۆر مەردانەو دلێرانەی کردو سەرەنجام بەپلەی بەرزی شەهیدی گەیشت. ئینجا موسڵمانان لەسەر وەصیەتو ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ، خالیدی کوڕی وەلیدیان کرد بەسەرکردەی خۆیانو ئەویش

پاش چەند ڕۆژێك شەڕكردن توانی سوپای ئیسلام ڕزگاربكاو بەكەمترین زیانو كوشتار بیانگێڕێتەوە. خالید لەبارەی ئەو ڕۆژەوە دەفەرموێ: لەجەنگی موئتەدا ڕۆژێكیان نۆ شمشێر لەدەستمدا شكا, وەشمشێر نەبوو لەدەستمدا خۆی بگرێت تەنیا شمشێرێكی یەمانی نەبێت.

با ئەمان لەم مەیدانە خوێناویە جەرگبڕەدا بەجێ بێڵێنو بچینەوە شارەكەی رسُولُ الله, شاری مەدینەی مونەوەرە, دەبینین وا حەزرەت صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لەناو یارانیدا دانیشتووەو دەستی بەدەموچاویەوە گرتووەو هەموو صەحابەكان ووردو بێدەنگ سەرنجی دەدەنو كەسێك قسەیەك ناكاتو كەس گوێی لەدەنگی هەناسەیەكیش نیە. پاش ماوەیەك خۆشەویست دەستی لەسەر دەموچاوی لابردو فەرمووی: ئێستا خوای گەورە دیمەنی جەنگی موئتەی هێنایە بەرچاوم, چاوم لێیە زەید ئاڵاكەی هەڵگرتو شەهیدكرا, پاشان جەعفەر ئاڵاكەی هەڵگرتو شەهیدكرا. ئینجا بێدەنگ بوو, ئەنصارەكان ڕەنگیان تێكچوو ترسان لەهەڵوێستی عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە, چونكە پێش ڕۆیشتنیان پێغەمبەری خوا هەواڵی دابوو كەدوای جەعفەر, عەبدوڵلا دەبێتە سەركردە, ئەی بۆ باسی عەبدوڵلای نەكرد, تۆ بڵێی هەڵاتبێ؟ هەموو خزمەكانیو مەدینەییەكان ترسان! پاشان حەزرەت صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: وا عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە ئاڵاكەی هەڵگرتو شەهیدبوو. ئینجا فەرمووی: لەبەهەشتدا هێنرانەبەرچاوم لەسەر تەختی ئاڵتوونی دانیشتوون, عەبدوڵلام بینی تەختەكەی تۆزێ نزمترە لەزەیدو لەجەعفەر, صەحابەكان فەرموویان: قوربان بۆچی؟ خۆ هەرسێكیان لەیەك شەڕداو لەیەك مەیداناو بەدەستی یەك دوژمن شەهیدبوون, ئیتر هۆی چیە عەبدوڵلا لەبەهەشتدا نەگەیشتۆتە پلەی ئەوان؟ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فەرمووی: هەردوو فەرماندەكە (زەیدو جەعفەر) بەبێ دوودڵیو وەستان چوونە مەیدانی شەڕو شەهیدبوون, بەڵام عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە هەندێ دوودڵیو ڕاڕاییو سڵەمینەوەی تووش بوو, بۆیە لەبەهەشتدا بەهۆی ئەو دوودڵیو ڕاڕاییەوە پلەیەك هاتە خوارەوەو نەگەیشتەوە بەدوو هاوەڵە شەهیدەكەی پێش خۆی!

جا ئیمانداران: ئەم ڕووداوەمان بۆ ئەوە گێڕایەوە كەئەگەر دوودڵیو سڵەمینەوەو ساردبوونەوە لەشەهیدیدا, لەپلەوپایەی قیامەت تۆزێ كەم بكات, ئایا ئاوڕدانەوەو هاتنە

دواوەو ساردبوونەوەو مەیل جوولان بۆ لای ڕێچکەو ڕێبازە دەستکردەکان دەبێ چۆن پلەوپایەی ئیمانی ئینسانی موسڵمان دابەزێنێ؟!

بەڵێ بەڕێزان: ئەمە خاڵی یەکەم بوو کە بەهۆیەوە ڕاگیراوو دامەزراو دەبین لەسەر دینو ڕێبازی ڕاستی خوا, کەبریتی بوو لەشارەزابوونو شوێنکەوتنی قورئانو سوننەت. ئێستا با بچینە سەر خاڵی دووەمو هۆکاری دووەمی ڕاگیراوبوونمان لەسەر صِراط المُسْتَقیمی خوا کەئەویش بریتییە لەپاڕانەوەو لاڵانەوەو لەدەرگای خوا دانو داواکردن بەملکەچیو دڵسۆزیەوە کەڕاگیراوو دامەزراومان بکات لەسەر ئەم دینە حەقەو لامان نەداو لارمان نەکات, هەروەکو ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەدایکی ئیماندارانەوە عائیشەی کچی حەزرەتی ئەبوبەکرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم عادەتی وابوو کاتێ هەڵدەستا بۆ شەونوێژ, دەسنوێژی دەگرتو نوێژی دادەبەستو لەناو نوێژەکەیدا پێش خوێندنی سوورەتی الفاتحة, ئەم دوعایەی دەخوێندو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ جَبرائيلَ وَميكائيلَ وَإِسْرافيلَ, فاطِرَ السَّماوات وَالأَرْضِ عالِمَ الْغَيْبِ والشَّهادَةِ, أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبادكَ فيما كانُوا فيهِ يَخْتَلِفُونَ, اهْدِني لما اخْتُلِفَ فيهِ مِنَ الحَقِّ بِإِذْنِكَ إِنَّكَ تَهْدي مَنْ تَشاءُ إِلى صِراطٍ مُسْتَقيمٍ)؛ واتە: ئەی خوای گەورە, ئەی پەروەردگاری جوبریلو میکائیلو ئیسرافیل, ئەی ڕاگری ئاسمانەکانو زەوی, ئەی ئەو کەسەی کە بەنهێنیو ئاشکرا ئاگادارو زانای, تۆ دادوەری دەکەیت لەنێوان بەندەکانتدا لەوەی کەکێشەو ناکۆکییان لەنێوانیاندا هەیە, خوای گەورە هیدایەتم بدە لەناو گێژاوی دووبەرەکیو ناکۆکی نێوان ئەو خەڵکەدا بۆ ڕێگاو ڕێبازی ڕاستودروست بەئیزنو ئیرادەی خۆت, بەڕاستی هەرکەسێ خۆت مەیلت لێبێت هیدایەتی دەدەیو ڕێنمایی دەکەی بۆ سەر ڕێگای ڕاست..

بەڵێ ئیمانداران: ئەوە پێغەمبەرەکەمانە ئاوا لەخوا دەپاڕێتەوە بۆئەوەی لەسەر ڕێبازی ڕاستی ئیسلام دامەزراو بێت. هەروەها حەزرەت صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم هەمیشە دوعای دەکردو دەیفەرموو: (يا مُقَلِّبَ الْقُلوب ثَبِّتْ قَلْبي عَلى دينِكَ)(رَواهُ الترمذي), واتە: ئەی ئەو کەسەی کەدڵەکان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکەی, دڵەکەم لەسەر دینی خۆت ڕاگیراوو دامەزراو بکە..

بێگومان هەر لەبەر گرنگی دامەزراویە لەسەر ڕێگای ڕاست کەئێمەی ئیماندار لەهەموو ڕکاتێکی نوێژەکانماندا, جا فەرز بێ یان سوننەت, واجبە سوورەتی الفاتحة بخوێنین کەئایەتی: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾(الفاتحة 6)ی تێدایە, کەمانای ئەوەیە: خوایە هیدایەتمان بدە بۆ ڕێگای ڕاست.

جا خۆشەویستان: ئەگەر بەووردی سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین کەهەموو ئیماندارێکی ئومەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, بەگەورەو بچووکەو لەبەریەتی, دەبینین سێ سەرنجمان دێتە ناو مێشکو بەرچاو:

**یەکەم:** بەکارهێنانی وشەی (الصِّراط) کەووشەی (صِراط) واتە: ڕێگای پێدا ڕۆیشتن. جا خوای پەروەردگار بۆیە بەرنامەی ئیسلامی بە(ڕێگا) شوبهاندووە, بۆئەوەی تێبگەینو بزانین کەهەروەك چۆن ئینسان ناتوانێ بەبیروباوەڕ یان بەقسەی ڕووت بە (ڕێگا)دا بڕوات, بەڵکو پێویستی بەهەوڵوتەقەللاو تێکۆشانێکی جەستەییو کردەوەیی دەکات, بەهەمان شێوەش پابەندبوون بەبەرنامەو ڕێبازی خواوە بەبیروباوەڕو قسەی ڕووت نایەتەدیو ڕەنجو ماندووبوونو ئارامگرتنی پێویستە.

**دووەم:** دەفەرموێ (مُستَقیم), چونکە هەروەکو چۆن ئەگەر بتەوێ ڕێگایەکی ڕاست درێژبکەیتەوەو قوڵتو پێچی پێنەکەی, ناچار دەبی دەیان کۆسپو دۆڵو شیو ببڕی, بەهەمان شێوەش ئەگەر بتەوێ ڕێگای ژیانت بەبێ قوڵتو قولابو فیسقو گرێ ببڕی کەبریتییە لەخواپەرستیو موسڵمانیەتی, ئەوا ناچاری سەدان گیروگرفتو کەندو کۆسپ ببڕیو لەگەڵ سەدان کوێرەوەریو دەردەسەریو کێشەوبەرەدا ڕووبەڕوو ببی, بەڵێ مادام بتەوێ پابەندی بەرنامەی خوا بیو لێی لانەدەی ناچاری سەدان جار لەگەڵ بەرژەوەندی شەخصیو هەواو نەفسو شەیطانو دوژمنو ناحەزانی خواو خەڵکو ناهەمواریو دەردەسەریدا بەشەڕ بێی.

**سێیەم:** ووشەی (إهْدِنا) هیدایەتمان بدە, چونکە بەڕواڵەت نابێ موسڵمان بڵێ (اهْدِنا) ڕێنماییمان بکە, لەبەرئەوەی موسڵمان بەکەسێك دەگوترێ کەڕێنمایی کردنی بۆ هاتبێتەدی, کەواتە: بە بەکارهێنانی (إهْدِنا) (تَحصيل الحاصل) دێتەدی, بەڵام ئەگەر قووڵتر لەئایەتەکە ووردبینەوە دەزانین کە چ (تَحصيل الحاصل) دروست نابێو ووشەی

(إهْدِنا) پڕ بەپێستی ئەو شوێنەیە کەتێیدا بەکارهاتووە, لەبەرئەوەی ژیانی ئینسان بریتییە لەکۆمەڵێك هەڵوێست, ئینسان لەماوەی ژیانیدا لەهەر ڕۆژو ساتێکدا چەند جار تووشی ڕووداوی جۆراوجۆر دەبێو هەر ڕووداوەش هەڵوێستی تایبەتی پێویستە. بەڵام دۆزینەوەی هەڵوێستی ڕاست لەناو کۆمەڵە هەڵوێستێکی هەڵەدا شتێکی ئەستەمو دژوارە, لەبەرئەوە پێویستە ئینسان لەهەر ڕۆژێکدا چەند جار داوا لەخوای گەورە بکات کەڕێنمایی بکات.

هەروەکو ئیمامی ڕازی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەتەفسیرەکەیدا (مَفاتیحُ الغَیْب), دەفەرموێ: کاتێ ئینسانی ئیماندار دەڵێ ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾, واتە وەکو بڵێت: ئەی خوای گەورە, لەم ڕێگایەی مندا خۆشەویستانو نزیکانی من زۆرن, هەریەکەیان بانگم دەکات بۆ ڕێگاکەی خۆی, دوژمنانو ناحەزانیشم هەر دەیانەوێ لەڕێگا ڕاستەکەی تۆ لامدەنو بەرەو ڕێگایەکی تر بمبەن, شەیطانیش بەرەو ڕێگای سێیەم بانگم دەکا, شەهوەتو هەواو ئارەزووشم دەیانەوێ بەرەو لاڕێو ڕێچکەیەکی تر بمبەن, جا منیش کەئینسانم, عەقڵو هۆشم زەعیفو لاوازە, تەمەنو عومریشم کورتە, لەناو ئەو هەموو بانگەدا سەرم گێژی خواردووەو نازانم بەرەو کام ڕێگا بڕۆمو بەقسەی کێ بکەم. جا خوایە تۆ بەڕەحمی خۆت هیدایەتم بدەو ڕێنماییم بکەو بمخەرەسەر ڕێگایەك کەلەوسەریەوە بمخاتە بەهەشتەوە, ڕێبازێکی ئاسانو بێگرێوگۆڵ.

هەروەها ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: (صِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ) ئەو کاتە بۆ ئینسان فەراهەم دێ کەئەو ئینسانە ڕوو لەغەیری خوا وەرچەرخێنێو بەهەموو دڵو هۆشو بیریەوە ڕووی لەخوای تاكوتەنها بێ, بگاتە حاڵەتێك کەئەگەر خوای گەورە فەرمانی پێبکات کەجگەرگۆشەی خۆی بەدەستی خۆی سەرببڕێ, بەگوێی خوا بکاتو سەرپێچی نەکات, هەروەك حەزرەتی ئیبراهیم وای کرد, وەئەگەر خوای گەورە ئەمری پێبکات کە لەبەر دەستی کەسێکی تردا بکەوێ بۆ سەربڕین, گوێڕایەڵ بێ, هەروەکو حەزرەتی ئیسماعیل, وەئەگەر فەرمانی پێبکرێ کەخۆی بخاتە ناو دەریاوە سەرپێچی نەکات وەکو حەزرەتی یوونس, وەئەگەر خوای گەورە فەرمانی پێبکات کەببێتە قوتابیەکی گوێڕایەڵ بۆ مامۆستایەك کە لەزانیاریدا لەو زاناترە, یا گەیشتبێتە پلەی هەرە بەرزو لەپلەوپایەدا زۆر

لەمامۆستاکەی بەپشتەوەتر بێ, گوێڕایەڵ بێ بەعەوداڵیەوە بەشوێن مامۆستاکەیدا بگەڕێ, وەکو حەزرەتی مووسا لەگەڵ خدردا. وەئەگەر فەرمانی پێبکرێ کە لەسەر فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە بەردەوامو خۆڕاگربێ, با باجەکەیشی سەربڕینو لەتکردنی لاشە بێ بەدوو کەرتەوە, هەر ئامادەبێو سووربێ لەسەر کارە پیرۆزەکەی وەکو حەزرەتی یەحیاو حەزرەتی زەکەریا (سەلامی خوا لەهەموو پێغەمبەران) بەتایبەتی لەسەروەرو سالاری پێغەمبەران حەزرەتی محمد المصطفی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بێ..

بەڵێ ئیمامی ڕازی بەردەوام دەبێ لەفەرموودەکەیو دەڵێ: کەواتە تێدەگەین کەمەبەست لە ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾ شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی خوایە لەخۆڕاگری بەرامبەر ئازارو ئەشکەنجەو ناڕەحەتیدا, وەدامەزراوی لەسەر بەڵاو موصیبەتو تاقیکردنەوەو خۆڕاگریو ساردنەبوونەوە کەبێگومان ئەمەش پلەیەکی بەهێزو بەپێزو بەرزەو هەموو کەس, بەڵکو زۆربەی خەڵکی توانای گەیشتن بەو پلە بەرزەیان نیە. بەڵام شوێنکەوتوانو حاڵیبوان لەڕێبازی پێغەمبەران, دەڵێن: ئەی خەڵکینە مەترسن, خەمبار مەبن, لەبەرئەوەی هەرشتێك لەدینی خوای گەورە کەخوا فەرمانی پێکردبێ بەگرانی نامێنێتەوەو هەرئەوەندە شانی بدەیتەبەر, خوای گەورە ئاسانی دەکات. هەروەکو لەئایەتەکەدا کەدڵێی ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾ مانای ئاسانیو نەرمی ڕێگاکە دەردەکەوێ. چونکە خوای گەورە نافەرموێ: بڵێن خوایە بمانخەیتە سەر ڕێگای ئەوانەی کەلێیان دراوەو کوژراونو دەربەدەرکراون لەپێناوی دینەکەی تۆدا کەپێغەمبەرانن, بەڵکو دەفەرموێ: بڵێن: ﴿ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾, کەواتە: هەموو ئەشکەنجەو ئازارو لێدانو کوشتنو دەربەدەرکردنو سووکایەتی پێکردنەی کەپێغەمبەرانو سەرجەم صاڵحانو چاکانو پاکان لەپێناوی ئەم ڕێگە ڕاستەی خوای گەورەدا تووشیان هات, هەمووی خەڵاتی خوایەو ویسامی شەرەفە لەیەخەیان دراوەو موسڵمانی ڕاستەقینەش دەڵێ خوایە وەکو ئەو پێغەمبەرانەو ئەو چاكو پاکانە ڕاگیراوو دامەزراوم بکەو هەرچی لەو ڕێگایەدا تووشم دەبێو لەسەر ئەو دینە پاکە پێم دەکرێ هەمووی بەخەڵاتو بەخشش وەردەگرمو سوپاسی تۆی لەسەر دەکەم, جا هەرکەسێك

ئاوا لەخوا بپاڕێتەوەو ئاوا بەکردەوە لەپاڕانەوەکەی حاڵی ببێ بەڕاستی ڕاگیراوو دامەزراو دەبێ لەسەر ﴿ صِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾و وەصیەتەکەی پەروەردگار جێبەجێ دەکات کەفەرمووی: ﴿ وَأَنَّ هَـــذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُـــوا السُّبُلَ فَتَفَـــرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ﴾.

ئیمانداران: بەڕاستی هەرکەسێ لەم دونیایەدا لەسەر ڕێی ڕاستی ئیسلام لانەداو ڕوو لەکوێرکە ڕێو ڕێچکان نەکات، ئەوە إنشاءَ الله لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر (پردی صِراط)یش قاچی جێگرو دامەزراو دەبێو وەکو هەورەبرووسکە بەسەر پردەکەدا دەپەڕێتەوەو دەگاتە بەهەشتی هەتاهەتایی. هەروەکو ئیمام إبن القَيِّم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك لەم دونیایەدا خوای گەورە هیدایەتی داو بەڕێبازی ڕاستی خوادا ڕۆیشت، ئەو ڕێبازەی کەپێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانیەکان لەبەر خاتری ئەو ڕێبازە ڕاستە هاتوون کەخەڵکی بانگ بکەنو دەستیان بگرنو بیانخەنە سەر ئەو شارێگە ڕاستە، هەرکەسێ لەسەر ئەو ڕێگا ڕاستە لەدونیادا بژیو لەسەر ئەو ڕێگایەو لەپێناوی ئەو ڕێگا بێوێنەیەدا بمرێ ئەو لەڕۆژی قیامەتیشدا خوای گەورە ڕاگیراوی دەکات لەسەر ڕۆیشتن بەسەر ئەو پردەدا کە بەسەر پشتی جەهەنەمدا ڕاکێشراوە.

جا بەئەندازەی ئەوەی ئینسان لەدونیادا لەسەر ئەم شارێگەی ئیسلامە دامەزراوو دڵنیا بووبێ، بەو ئەندازەیەش قاچەکانی توندوتۆڵو ڕاگیراو دەبن لەسەر ئەو پردە سامناکەی کە لەسەر پشتی جەهەنەم دانراوە. جا بەئەندازەی تیژ ڕۆیشتنو ئاوڕ نەدانەوە بەلای ئەم ڕێبازو ئەو ڕێبازدا لەدونیاداو ساردنەبوونەوە لەدینداریو خواناسیو گەیاندنی ئەم دینە بەخەڵکی، بەو ئەندازەیەش ئینسان لەسەر پردی صِراط دا بەتیژی دەپەڕێتەوە. جا هەموو ئەو ئارەزوو و هەواو هەوەس پەرستیو پارەپەرستیو دونیاویستییەی کەئەگەر بەشێوەیەکی شەرعی بەدەست نەیەن، لەدینی خواو ڕاستە شەقامەکەی ئیسلام ئینسان دووردەخەنەوە لەدونیادا، هەر ئەم شتانەش دەبنە ئەو قولاپانەی کە بەئەملاولای پردی صِراطەوەنو هەرکەسێ لەم دونیایەدا دەستی بۆ بردبنو ئاواتی بۆ خواستبن، لەدونیاشدا بۆی دەبنە قولاپو قاچی دەگرنو دەیبەنە جەهەنەمەوەو وەکو لەدونیادا لەڕێگای ڕاستی ئیسلام لایاندا، لەوێش لەڕێگا ڕاستەکە کەبۆ بەهەشت دەچێ لایدەدەنو جەهەنەمی پێ

دەبینن. جا ئینسان دەبێ تەماشای خۆی بکاو حیساب بۆ خۆی بکا چەندە حەزت لەبێ شەرعیو حەرامو ڕێبازی دژ بەڕێبازی خوایە، ئەوەندە قولاپەی ئاگرین لەسەر پردی صراط چاوەڕێت دەکات قاچت بگرێ.. خوا پەنامان بدات.

جا ئیمانداران: با ئاگامان لەخۆمان بێ، با زیاتر خۆمان بەقوربانی ئەم دینە پاکە بکەین، بەغەیری ئەم ئیسلامە ڕازی نەبین، واز لەڕووناکی زێرینی ڕۆژئاسای ئەم دینەی خۆمان نەهێنینو بەتەمابین لەبەر فتیلەو مۆمی خەڵکیدا بەرچاومان ڕووناك بێ! با ئێستا خەمی سەر (پردی صراط)مان بخۆینو قولاپەکانی سەر ڕێگامان لابەرین ئەویش بەسوورتربوونمان لەسەر ڕێبازی ئیسلامو وازهێنان لەهەر شتێك کەخواو پێغەمبەرەکەی نەهیان لێکردووە، جا پێش کۆتایی هێنان بەوەسیلەو هۆکاری دووەمی ڕاگیراوبوونمان دامەزراوبوونمان لەسەر شاڕێگای ئیمانو ئیسلام کەدوعاوپاڕانەوەیە لەخوا، هەموومان بەدڵ ڕوودەکەینە پەروەردگارو بەزوبان دەڵێین: یارەبی خوایە ڕێنمایی هەموومان بکەی لەهەموو هەڵسوکەوتو کردارو گوفتارێکی ژیانماندا، ڕێنماییەکی وا کەببێتە هۆی هێنانەدی ژیانێکی موسڵمانانەی خۆشوبەلەزەت لەدونیاداو هێنانەدی ڕەزامەندی (الله)و بەهەشتی بەرین لەپاشەڕۆژدا.. جا ئەی خوایە ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾..

هۆکاری سێیەم: هاوەڵی کردنی کەسانی وورەبەرزو دامەزراوو خواناس لەژیانیانداو شوێنکەوتنی سوننەتو ڕێبازیان لەدوای وەفاتیان. بەڵێ، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ﴾(التوبة 119)، یان شێخ عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: (سِيرُوا مَعَ الهِممِ العالِيَة) واتە: هاوەڵو هاودەمی هیمەت بەرزان بنو لەگەڵ ئەوانداو شان بەشانی ئەوان بەڕێدا بڕۆن.

بەڵێ ئیمانداران: خوێندنەوەی ژیننامەی چاکانو پاکانو جیهادو هەوڵو تێکۆشانیان بۆ ئەم دینەو ڕاگیراویو ئارامگریو نەبەزینیان بەرامبەر ناحەزانو ناکەسانی ئەم پەیامە شیرینە، باشترین یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی کەئێمەش ڕاگیراوو دامەزراو بین لەسەر شاڕێگای ئیمانو ئیسلام وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ﴾(هود 120)، واتە: ئەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّم، هەموو ئەوانەشت بۆ دەگێڕینەوە لەچیرۆكو هەواڵی پێغەمبەران

بۆ ئەوەی کەدڵی تۆی پێ دابمەزرێنین‌و دڵنیات بکەین..

هەر لەقورئانی پیرۆزدا خوای گەورە داوا لەحەزرەت صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّم دەکات کەچاو لەپێغەمبەرانی پێش خۆی بکا لەهەموو ئەو کارە گرنگ‌و مەزنانەی کەکردوویانەو بیانکاتە سەرمەشق‌و (قُدوَة) بۆ خۆی, هەروەك دەفەرموێت: ﴿ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ ﴾(الأنعام 90), واتە: ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێبێت) ئەو کەسانەن کەخوا هیدایەتی داون, تۆش ئەی محمد صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وسَلَّم, ئەی ئیماندار, شوێن ئەوان بکەوەو بیانکە بەسەرمەشقی خۆت..

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: ئێمەی موسڵمان لەڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا, لەهەموو کاتێ زیاتر پێویستمان بەوە هەیە کەژیاننامەی پێغەمبەران بخوێنینەوەو دەرس‌و ئامۆژگارییان لێوەرگرین, بەتایبەت ژیاننامەو سیرەی حەزرەتی رَسُولُ الله صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وسَلَّم هەروەکو قورئان دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً ﴾(الأحزاب 21), واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواوو ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لێبکەن‌و شوێنی بکەون, بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە, سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە, هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن‌و زمانیان بەیادی ئەو پاراوە.

بەڵێ ئێمە لەکاروانی ئیمان‌و ئیسلامەتیدا, ئەگەر سەیری ئەوانە بکەین کە لەپشتمانەوەن, ئەوا حەزرەتی ئادەم‌و نوح‌و ئیبراهیم‌و باقی پێغەمبەران‌و ئەو بڕوادارانە دەبینین کە لەگەڵیاندابوون‌و بێوچان خەباتیان کردووەو بۆ خوا تێکۆشاون, جا چاولێکەری‌و هەڵگرتنی جێ پێیان سەرفرازی‌و سەلامەتی لەدوایە, هەروەك چۆن کەسێك بەکێڵگەیەکی مینرێژکراودا بیەوێ بڕوات دەبێ جی پێی ئەوەی پێش خۆی هەڵگرێت کەڕێگاکەی کەشف کردووەو بەسەلامەتی هەنگاوی ناوە, ئەگینا تیادەچێت.. بەڵێ دوانەکەوتن لەکاروانی صالحان‌و خواناسان مەسەلەیەکی گرنگە بۆ دامەزراوی لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام‌و گەیشتنە مەنزڵ‌و ڕێ وون نەکردن, دکتۆر (محمد إقبال) لەهۆنراوەیەکیدا باس لەوە دەکات ئەگەر بۆ ساتێك کەسێك لەکاروانێکدا سەرقاڵ بێت بەسرکێکەوە کە بەقاچیدا چووە بۆئەوەی دەریبێنێ, سەر هەڵدەبڕێ کاروانەکە

دوورکەوتوتەوەو بەجێیان هێشتووە, بەمەش چەندەها (میل) ڕێگاکەی دووردەکەوێتەوەو ڕەنگە لەبرسیەتیو تینوویەتیدا بمرێت یان گورگ بیخوات, هەروەك دەفەرموێت:

لَحْظَةً يا صاحِبي أنْ تَغْفَلْ　　　أَلْفُ ميلٍ زادَ بُعْـدَ المَـنْزِلِ

رامَ نَقْش الشَوك حينا رَجل　　　فَاخْتَفى عَنْ ناظِرَيه المَحْمَل

پێغەمبەری خوا صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فەرموویەتی: (إِنَّما يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القاصِيَةِ) واتە: گورگ لەمەڕی دوورە ڕان دەخوات.

شتێکی ئاشکرایە کەشەیطان لەتاکە کەسێکەوە کە بەتەنهایە نزیکەو لەدوانەوە دوورەو لەسیانــەوە زیاتـــر دوورترەو ناتوانێ بەئاسانی زەفەریان پێ بەرێتو لەڕێ لایان بدات.

هۆکاری چوارەم: کەدەبێتە هۆی دامەزراویمان لەسەر (صِراط المُسْتَقيم) بریتییە لەپەروەردەی ئیمانی, واتە: ئیمانەکەمان لەسەر بنچینەیەکی ڕۆشنو پلە بڵند دامەزرابێو دووربێ لەئیمانی کوێرانەو چاولێکەرانە, هەروەکو صەحابی بەڕێز (سُمْرَة بن جُنْدُب)(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: (تَعَلَّمْنا الإيمانَ قَبْلَ القُرآن, ثُمَّ تَعَلَّمْنا القُرآنَ فَازْدَدْنا بِهِ إيماناً), واتە: ئێمەی صەحابەکانی پێغەمبەر صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم یەکەم جار فێری دەرسی ئیمان دەبووینو پێغەمبەری خوا ئیمانی لەدڵەکانماندا دەچاند, پێش ئەوەی فێری قورئانمان بکا, ئەمجا کەئیمانمان لەدڵدا دروست بوو فێری قورئانیش بووینو بەقورئانەکە ئیمانمان زیادی کرد.. بەڵێ ئەمە پەروەردەی پێغەمبەری خوابوو بۆ صەحابەکانی کەبەرهەمێکی زۆر ـتوندوتۆڵی ئیمانی دروستکرد لەدڵەکانداو لەمەیدانی جیهاددا چاونەترسو تێکۆشەری کردنو لەهەڵوێستە دژوارو سامناکەکاندا نموونەی خۆڕاگریو نەبەزی بوون, با نموونەیەك بێنینەوە:

لەخەلافەتی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابدا (ڕەزای خوای لێبێت), ئیمامی عومەر بۆ گەیاندنی نوورو ڕووناکی ئیسلام بەهەموو کونوکەلەبەرو شوێنە تاریکەکانی ژێر ستەموزوڵمی سەرکردە خوانەناسەکانی ئەو ڕۆژگارە لەفارسو لەڕۆم جەیشێکی گەورەی پێکهێناو بەرەو ڕۆمەکان بەڕێی کردن بەمەبەستی گەیاندنی ئەم ڕێگا ڕاستەو دەست گرتنی خەڵکی لەڕێبازە لارو چەوتەکان بەرەو ئەم شەقامە ڕێگە ڕاستو دروستەی

ئیسلام, بۆ ڕزگارکردنی بەندەکان لەبەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای تاکوتەنها. بەڵێ سەرکردایەتی ئەم سوپایەشی سپارد بەصەحابی گەورەو بەڕێز, عەبدوڵلای کوڕی حوذافە (ڕەزای خوای لێبێت), سوپا بەڕێکەوتو گەیشتە سنووری ڕۆمەکانو شەڕ لەنێوان هێزی ئیمانو بەرەی کوفردا دەستی پێکردو شەڕێکی زۆر توندوتیژ بوو, بەدەیان صەحابی شەهیدبوو, سەدانیش لەڕۆمەکان کوژران, سەرەنجام لەئەنجامی تێکەڵاوبوونی هەردوو لەشکرو زۆر چوونە پێشەوەی سەرکردەی موسڵمانان بۆ ناوجەرگەی شەڕ, عەبدوڵلای کوڕی حوذافە کاتێ بەخۆی زانی وا لەناوجەرگەی سوپای دوژمندایەو بەدەیان شمشێر بەدەستو ڕم بەدەست چواردەوریان گرتووە, خۆ نەشدەکرا خۆی بکوژێ بەدەستی خۆی بۆئەوەی دەستی دوژمنی نەگاتێ, چونکە لەدینی ئیسلامدا ئینسان نەك هەر لەسەری حەرامە بەناهەق خوێنی خەڵکی بڕێژێ, لەسەری حەرامو قەدەغەشە کەخوێنی خۆیشی بڕێژێو خۆی بکوژێ, بۆیە بەناچار بەدیلی کەوتە دەستی دوژمنو نزیکەی سەد صەحابی تریش بەدیل گیرانو بردیانن بۆ لای سەرۆکی ڕۆمەکان, ئەویش گوتی ئەمانە کامیان سەرکردەکەیانە؟ عەبدوڵلا فەرمووی: من سەرکردەیانم. بۆیە ئەویان جیاکردەوەو بردیانە شوێنێکی تایبەت, پاشای ڕۆم وەکو هەموو ئەوانەی پێش خۆی وەتا ئێستاشو تا قیامەتیش, ئەم هەنگاوانە لەگەڵ دیلو خەڵکی بەرامبەری خۆیان بەکاردەهێنن بۆئەوەی بیانهێننە سەر ڕێبازی خۆیانو لەمەبدەء و بیروباوەڕی خۆیان لایانبدەن. مێژووی کۆنو نوێ ئەم هەنگاوانەی تێدا دەخوێنرێتەوە, تەنها کەلوپەلەکانی ئازارونەشکەنجە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە! بەڵێ پاشا گوتی: ئەی عەبدوڵلا من تۆم بەکەسێکی خاوەن غیرەتو توانا دێتە بەرچاو, حەزناکەم بتکوژمو لەناوت بەرم, دەزانم تۆ محمد خەڵەتاندوویتیو بەقسەی ئەو فریوت خواردووە, ئێستاش کەوتوویتە دەست ئێمە, وەرە بەقسەم بکەو واز لەدینی محمد بێنەو وەرە سەر دینی مەسیحیەت نیوەی موڵكو سامانی خۆمت پێشکەش دەکەم. بەڵێ ئەمە قۆناغی یەکەمە کەسەروەتو پارەو ماڵی دونیایە. بەڵام بزانین هەڵوێستی ئەو کەسەی لەمەدرەسەی بیروباوەڕی محمدی دا پەروەردە بووبێ وەڵامی چی دەبێ؟! عەبدوڵلا فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر هەرچی سەروەتو سامانی تۆیە, نەك نیوەی, وەهەموو موڵکی دونیام بدەنێ لەدینی محمد پاشگەزنابمەوە بۆ ماوەی

چاوترووکانێکیش!! پاشا زانی ئەم پیاوە بەهیممەتە ماڵی دونیاو تەماع کاری تێناکات بۆیە پەنای بردە بەر هەنگاوی دووەم‌و پێی گوت: دەی کەواتە دەتکوژم. عەبدوڵلا فەرمووی: هەرچیت پێخۆشە وابکە! پاشا فەرمانی کرد عەبدوڵلایان بەدارێکدا هەڵواسی‌و بەتیرئەندازەکانی خۆی گوت: بەشێوەیەك تیربارانی بکەن کەتیرەکان پێستی ژێر پێی بگرێ‌و مووی سەری بەرێ، بەڵام بەقەستی کوشت پێوەی مەنێن‌و هەر بیترسێنن! بەڵێ ئەمەشیان بەکارهێناو چوونە لایەوەو گوتیان: ئایا لەدینی محمد پەشیمان بوویتەوە؟ فەرمووی: وەڵامی من هەر ئەوەی یەکەم جارە، بۆ یەك چاوترووکانیش ئامادە نیم واز لەدینی محمد بهێنم! پاشای رۆمەکان هەنگاوی سێیەمی بەکارهێناو فەرمانی کرد مەنجەڵێکی گەورەیان هێنا کەمس بوو، خستیانە سەر ئاگرو پڕیان کرد لەرۆنی زەیت هەتاوەکو زەیتەکە هاتە کوڵ، ئەمجا فەرمانی کرد موسڵمانێکی دیلکراویان هێناو خستیانە زەیتەکەوەو گۆشت‌و ئێسقانی لەیەکتر جیابۆوە!! (هەروەکو بەعسیەکان شۆڕشگێڕو نەیارەکانی خۆیان لەتێزاب هەڵدەکێشان‌و گۆشت‌و ئێسقلانیان لەیەك دەکردنەوە).. سیاسەت‌و حوکمی کوفر لەکۆن‌و نوێ تەنها ئامرازەکانی ئەشکەنجە پێدانیان فەرقی کردووە!!

پاشای رۆم بەعەبدوڵلای گوت: خۆ چاوت لێبوو بە چ شێوەیەك هاورێکەتم کوشت، ئەگەر تۆش پەشیمان نەبیتەوە چارەنووست وەکو ئەو دەبێ. عەبدوڵلا فەرمووی: ئامادەم. بەڵێ پاشای رۆم فەرمانی کرد بەپاسەوانەکانی‌و دەستەی سزادان کەعەبدوڵلای کوڕی حوذافە هەڵبگرن‌و بیبەن لەسەر مەنجەڵە پڕ لەرۆنەکەدا کەصەحابەکەی تێدا شەهیدبوو، رابگرن‌و با سەیری قرچان‌و قوڵپەی رۆنەکە بکات. کاتێ عەبدوڵلا سەیری مەنجەڵەکەی دەکرد گوتیان: واز لەدینی محمد بێنەو ببە بەمەسیحی‌و گیانی خۆت رزگاربکە، ئەم هەلە لەدەست مەدە! عەبدوڵلا چەند فرمێسك لەچاوی پیرۆزیدا هاتنە خوارەوە، گوتیان: پاشا لەوە دەچێ بترسێ‌و پەشیمان بوبێتەوە وا دەگری. پاشا فەرمانی کرد بیگێڕنەوەو بیهێنن بۆ لام. پاشای رۆم گوتی: ئەی عەبدوڵلا ئەوە لەترسی مردن‌و ئەو تەعزیبە توندە گریای؟! وادیارە پەشیمان بوویتەوە لەدین‌و بیروباوەڕەکەت! عەبدوڵلا فەرمووی: باش بزانە ئەی پاشا، چاوی من لەترسی مردن فرمێسکی نەڕشت،

بەڵام بەخوا من بۆ ئەوە دەگریم تەنها یەك ڕۆحم هەیەو یەك جار دەمرمو تەواو, بەخوا خۆزگە دەخوازم کە بەئەندازەی هەر تاڵە موویەك کە بەلەشمەوەیە ڕۆحێکم ببوایەو ئەوەندە جار لەپێناو دینی خوادا بخرامایە ئەو مەنجەڵە پڕ لەڕۆنە قرچاوەوە بەڵکو خوای گەورە لێم ڕازی بێ!

پاشای ڕۆمی بەبیستنی ئەم هەموو هیممەتو خۆڕاگریە, ئەم کێوە لەبن نەهاتووە لەغیرەتو بوێریو دلێری, ئەم سووربوونو دامەزراوییە لەسەر عەقیدەو بیروباوەڕ, بەچۆکدا هاتو دوا ڕێباز بەحیسابی خۆی کەعەبدوڵلای صەحابەو قوتابی مەدرەسەی پێغەمبەری ئیسلامی پێ تەنەزول پێ بکا, ئەوەبوو کەگوتی: عەبدوڵلا حەیفە پیاوی وەکو تۆ بکوژرێ بەڵام بۆ ئازاد بوونت مەرجێکت بۆ دادەنێم کەئەوەیە: بێیت سەرم ماچ بکەی! عەبدوڵلا فەرمووی: هەرگیز نامەوێ بەتەنها ڕزگاریم لەدیلیەتیو بچمەوە ناو ماڵومنداڵی خۆم لەکاتێکدا ئەو هەموو دیلە موسڵمانەی کەسەربازی من بوونو منیان بەبرا گەورەو سەرکردەی خۆیان قبووڵ کرد, ئێستا ئەوان ئەشکەنجەو ئازار بدرێنو بکوژرێنو ژنو منداڵیان بێوەژنو هەتیو بکەوێ, بەڵام من کەسەرکردەیانم ڕزگارم ببێ, ئەوە نامەردیەو لەموسڵمانان ناوەشێتەوە! ئا لێرەدا سیاسەتی حەکیمانەو ژیرانەی سەرکردەیەکی موسڵمان دەکەوێتە کارو عەبدوڵلا بەپاشای گوت: بەڵام ئەی پاشای ڕۆم, من ئامادەم سەرت ماچ بکەم بەمەرجێ هەرچی دیلی موسڵمان هەیە ئازادی بکەی! پاشای طاغوتو ملهوڕو خۆ بەزل زان گوتی: ئامادەم هەموو دیلە موسڵمانەکان ئازادبکەم بەس ئەوەندە تۆی قارەمان دابێیتەوەو سەرم ماچ بکەی! بەڵێ عەبدوڵلا کوڕی حوذافە (ڕەزای خوای لێبێت) سەری پاشای ماچ کردو خۆیو هەموو دیلە موسڵمانەکان ڕزگاربوونو هاتنەوە بۆ شارەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, شاری مەدینەی پیرۆزو چوونە خزمەت ئەمیری ئیمانداران, حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت), عەبدوڵلا بەدووروودرێژی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە, ئیمامی عومەر فەرمووی: (حَقٌّ عَلى كُلِّ مُسْلِمٍ أنْ يُقَبِّلَ رَأس ابنَ حُذافَة, وَأنا أبْدأُ), فەرمووی: پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کەسەری عەبدوڵلای کوڕی حوذافە ماچ بکات وەمن یەکەم کەسم کەسەری ماچ دەکەم. پاشان هەستاو سەری عەبدوڵلای ماچ کردو ئەمجا صەحابەکان یەك بەیەك

هەستان‌و سەری عەبدوڵلایان ماچ کرد!

بەڵێ ئیماندارانی خۆشەویست: ئەمە ئیسلامەکەی ئێمەیە, ئەمە هەڵوێستی خوێندکارو دەرچووی جامیعەی رَسولُ الله یە کەلەسەر دەرگاکەی نووسراوە: ﴿ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ﴾, موسلمانی تێگەیشتوو وەکو عەبدوڵلای کوڕی حوذافە هەڵوێستی توندو نەگۆڕاوە بەرامبەر کافرو خوانەناسان, تەنەزول بۆ هیچ شتێکی مادی ئەم دونیایە ناکات لەموقابیلی دۆڕاندنی دینەکەیدا, بەڵام لەبەر خۆشەویستی موسڵمانان, بەڵام بۆ بەرژەوەندی میللەت, بۆ ڕزگارکردنی گەل لەسەربڕین‌و سەرپەڕاندن ئامادەیە سەری کافریش ماچ بکات!

ئەمەیە سیاسەتی ئیسلامی واقیعی کەحەزرەتی عومەر مۆری کردو بوو بەسوننەت (عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الخُلَفاءِ الرَّاشدينَ مِنْ بَعْدي), عەبدوڵلا نەیفەرموو: ئەی پاشای ڕۆم ئەگەر سەری خۆم‌و سەدان موسڵمان بپەڕێنی ئامادەنیم سەرت ماچ بکەم, بەم هەڵوێستە ناسیاسی‌و نەزانانە سەری خۆی‌و موسڵمانانیش بەپەڕاندن بدات, بەڵکو هەلی گونجاوی قۆستەوەو خۆی‌و ئیماندارانی ڕزگارکرد. ئیمامی عومەریش نەیفەرموو: دەبێ سەری عەبدوڵلا بپەڕێنم چونکە تەنەزولی بۆ کافر کردووە, بەڵکو ئافەرینی لێکردو سەری ماچ کرد!

بەڵێ خۆشەویستان: لەئیسلامدا سەرپەڕاندن نیە, سەر ماچ کردن هەیە, لەدینی ئێمەدا ئەو سەرە بۆ بڕین‌و پەڕاندن باشە کەسەرێکە پڕە لەخیانەت بەخۆی‌و دین‌و بەمیللەتی‌و بەگەل‌و نیشتمانی‌و هەمووی بۆ بەرژەوەندی شەخصی خۆی‌و دەستکەوتنی مادەو دینارو دۆلار بەدوژمن دەفرۆشێ‌و میللەتیش‌و شوێنکەوتوانیشی چۆن دەژین‌و دەمرن ئەوە گرنگ نیە, ئەو سەرە موستەحەقی بڕینەو دەبێ لەسەر کورسی‌و دەسەڵات لابرێ, بەڵام:ئەو سەرەی کەبۆ غەیری (الله) نەوی ناکرێ‌و تەنەزول بۆ هیچ مادەیەکی دونیایی ناکات‌و گەورەترین سەرمایە بەلایەوە عەقیدەو بیروباوەڕەکەیەتی, ئەو سەرەی کەعیزەتی هەیە, جا کرێکارێکی سەربڵندەو بەعەرەقی ناوچەوان‌و دەستی قڵیشاو نانی خۆی‌و خێزانی پەیدا دەکات‌و دەستی بەخشینی هەیەو دەستی سواڵی نیە, دەستی دزینیماڵی خەڵکی نیە, دەبێ ئەو دەستەو ئەو سەرە بەرزە ماچ بکرێ‌و ئافەرین بکرێ.

ئەو فەرمانبەرەی لەفەرمانگەکەیدا هەرچەند مووچەی کەم بێو مەسرەفی زۆربێ بەڵام سەری بۆ بەرتیلو پارەی خیانەت نەوی نەکاتو بەیەك چاو سەیری میللەت بکاتو خیانەت بەدائیرەو ئەوەی لەژێر دەستیدایە نەکات دەبێ ئەو سەرە ماچ بکرێو لێپرسراوی وەزارەتەکەی سەری مـــاچ بکات, نـــەك لەسەر ئـــەوەی دزو بەرتیل خـــــۆر نیە نەقڵو فەصڵ بکرێ!

لەئیسلامدا ئەو سیاسەتمەدارەی کەکاروباری میللەتی موسڵمانی بەدەستە, ئەوەندە لێزانو ووریایە لەمەیدانی دیپلۆماسیەتو سیاسەتدا کەعەقیدەو بیروباوەڕی خۆیو میللەتەکەی دەپارێزێ, لەهەمانکاتیشدا لەشوێنو کاتی گونجاودا سەری دوژمنی کافر ماچ دەکات تا سەری گەنجانی میللەتەکەی لەسەر پەڕاندن ڕزگاربکات, بەڕاستی ئەو سەرە لێزانەو پڕ حیکمەتە سەری ئیماندارەو دەبێ هەموو میللەت سەری ئەو مەسئولو لێپرسراوەی ماچ بکات.. بەڵام چی دەکەی لەدوو دەستەو تاقمی ناحەزو ناکەسو دژ بەئیسلامو موسڵمانان:

دەستەی یەکەم: دەستەیەکن هەر لەیەکەم ڕۆژی دروست بوونیانەوە بۆ دژایەتی ئیسلام دروست بوونو شەوو ڕۆژیان خستۆتە سەر یەك بۆئەوەی ئیسلام لەبەرچاوی خەڵك بخەنو هەرچی دەستە چەورەکەی خۆیانە بەئیسلامو موسڵمانانی بسڕن! ئەمانە ئامانجو هەدەفیان ئەوەیە ئومەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم ڕوو لەکەعبەی پیرۆز نەکاو ڕوو لەهەموو ماڵو بەیتێکی تر بکات.

دەستەی دووەم: خەڵکانێکن کە بەناوی ئیسلامەوە خەبات دەکەنو بەحیسابی خۆیان دینی خوا نوێ دەکەنەوە, بەڵام لەئەلفبای سیاسەتی ئیسلامی شارەزا نینو هەرئەوەندە دەزانن بکوژنو ببڕنو بڕوایان بەهیچ لەیەك حاڵیبوونو نزیکبوونەوەیەك نیە. ئەمانە وەکو منداڵی خوێندنی سەرەتایی وان کەهێشتا پیتەکان بەباشی ناناسێ, بەڵام بڵێت من مامۆستای زانکۆمو دەرسی زانستی سیاسی دەڵێمەوە! ئایا هەرکەسێ بەم منداڵە بڕوا بکاو بڵێ ڕاست دەکەی, سەرلێشێواو نیە؟! ئایا خوێندنو زانستو زانکۆ بەم ئیدیعایەی منداڵە تازە زمان بڕاوە ناشیرین دەبێ؟ دەی ئیسلامیش کەسێك دەتوانێ ئیدیعای هەڵگرتنو پیادەکردنی بکات کە لەهەموو گۆشەو لایەکی ئەم ئیسلامە, چ ئابووری, چ کۆمەڵایەتی, چ

سیاسی, شارەزابیو بەموو لێی لانەدا.

لەکۆتاییدا دەڵێم: با ئاگامان لەخۆمان بێ, ئاگامان لەدینو بیروباوەڕی ژنو منداڵمان بێ, ئاوا وەکو صەحابەکان دەست بەم ئیسلامەوە بگرین, ئاوا لێی تێبگەینو لێی شارەزابین, دڵ گەرمتر بین بۆ هاتن بۆ مزگەوت, سیقەو متمانەمان بەڕێگاکەمان زیاتر بێ, ئێمە لەکاروانێکداین کە (124) هەزار پێغەمبەری پێدا ڕۆیشتووە, ئەگەر خۆشمان هیچ نەبین بەلانەدان لەو ڕێبازە ڕاستەقینەو ئەو کاروانە دووورودرێژە إنشاءَ الله لەگەڵ ئەواندا حەشرمان دەکرێو دەچینە بەهەشتی بەرین.

دەبێ هەموومان ئەو حەقیقەتە بزانین کەئەوەی بەکەڵکی دونیاو قیامەتمان دێ تەنهاوتەنها ئیسلامەکەی خۆمانە کە لەپێش لەدایکبوونمانەوە لەگەڵمانە, کەدایكو باوکمان بەم دینی ئیسلامە بەحەلاڵی بەیەك گەیشتوونو ئێمە ئەصڵێکمان هەیەو دەزانین ئەوەی کێین, لەدوای لەدایکبوونیشمانەوە بەبانگی ئیسلام گوێمان کراوەتەوە, بەشەرعی ئیسلامیش دەزانین کامە حەلاڵەو کامە حەرامە, چی چاکەیەو چی خراپەیە, لەکاتی مردنیشماندا ئەوەی لەسەر ڕێبازی ئەم ئیسلامە ڕاگیراوو دامەزراو بوویێ لەژیاندا بەر ئەو موژدەیە دەکەوێ کەقورئان بەئیمانداارانی دەداتو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ, نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ, نُزُلًا مِنْ غَفُورٍ رَحِيمٍ ﴾ (فصلت 30 ـ 32), واتە: ئەوانەی بەڕاستی گوتیان: پەروەردگارمان الله یە, پاشان بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە بوون, ئەوە لەسەرەمەرگدا دەستەدەستە فریشتە دادەبەزێن بۆ لایان, پێیان دەڵێن: هیچ ترسو بیمێکتان نەبێت لەداهاتوو, هیچ غەمو پەژارەیەکتان نەبێت بۆ ڕابردوو, مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی کەکاتی خۆی بەڵێنتان پێدەدرا..

بەڵێ ئیمانداران, دەبێ ئاگامان لەخۆمان بێ, بەردەوام شەیطانو شەیطان سیفەتان لەجنۆکەو لەئینسان دەیانەوێ ئەم ڕێگە ڕاستەی ئیسلاممان لەبەرچاو ناشیرین بکەن, هەروەکو شەیطان خۆی ئەوە دەڵێو قورئان بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێت, شەیطان گوتی: ﴿ قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ, ثُمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ

أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ ﴾ (الأعراف 16 ـ 17), واته: شەيطان گوتی: خوای گەورە بەهۆی ئەوەی کەتۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد, ئەوە سوێند بێت منیش لەڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشمو لایان دەدەم لەڕێگای ئیسلام, پاشان سوێند بەخوا لەبەردەمیانەوە, لەپشتیانەوە, لەلای ڕاستیانەوە, لەلای چەپیانەوە بۆیان دێمو دنیایان لا خۆشەویست دەکەمو گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەمو دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاسگوزارین.

جا بەڕێزان: لەم قسەو ئیعترافەی شەیطانەوە تێدەگەین هەرکەسێ بیەوێ تانەوتەشەر لەئیسلام بداو ڕێگای ڕاستی ئیسلام بەدواکەوتنو کۆنەپەرستی نیشانی موسڵمانان بداو بیری دونیاپەرستی لەدڵی خەڵکیدا بڕوێنێو بڕوابوون بەقیامەتو کارکردن بۆی لەهۆشو بیری خەڵکیدا لابەرێو کزبکات ئەوە بێگومان بن شەیطانەو لەبەرگی ئینساندایە, جا با دۆستو دوژمنی دونیاو قیامەتی خۆمان بناسین.

خـــــوای گەورە بەڕەحمی خۆی ئیمانمان زیاد بکا..

دامەزراوو ڕاگیراومان بکا لەسەر ڕێبازی پاکی ئیسلام..

ئەوانەمان چاکین چاکترمان بکا.. ئەوانەمان خراپین هیدایەتمان بدات..

اللَّهُمَّ آمين

## سەرچاوەكان


1 ـ قورئانی پیرۆز.

2 ـ تەفسیری ئاسان, بورهان محمدأمین.

3 ـ پوختەیەك دەربارەی ئیسلام, م. علی باپیر, چاپی یەكەم, بەغداد, 1984.

4 ـ لەخزمەت قورئاندا, ئەندازیار عثمان محمد رشید.

5 ـ خواناسی, ئاین, ئیمان, علی باپیر, چاپی یەكەم, نووسینگەی تەفسیر, هەولێر, 2000.

6 ـ بەهاری دڵان, ئەندازیار عثمان محمد رشید, چاپی یەكەم, 2003.

7 ـ تفسیر إبن كثیر, إبن كثیر, دار الكتب العلمیة, ط 1, 1998.

8 ـ نَضرَةُ النَّعیم, إعداد مجموعة مِنَ المُتَخَصِّصین بإشراف صالح بن عبدالله ـ إمام وخطیب الحَرَم المَكِّي, و: عبدالرحمن بن محمد ملّوح ـ مدیر دار الوسیلة للنشر والتوزیع, دار الوسیلة, جدّة, السعودیة, ط 3, 2004.

9 ـ صَحیح وصایا الرسُول, سعَد یوسف أبو عزیز, المكتبة التوفیقیة.

10 ـ منهاج الهدایة الإسلامیة, محمد المختار السَّلامي, دار الغرب الإسلامي, ط 2, 1995.

11 ـ المُتْجَر الرَّابِح في ثَواب العمَل الصَّالِح, للحافظ الدُمیاطي, دار الحدیث, القاهرة, ط 1, 2004.

# الدين والحياة

تاليف: فاتح ملا رسول شارستيني

حاکم لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: ( أيكم يبايعني على ثلاث؟ ) کێ پەیمانم دەداتێ لەسەر بەجێهێنانی وەسیەتنامەکانی سێ ئایەت؟ ئەمجا پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرموی: ( قل تعالوا أتل ماحرم ربكم عليكم ) هەتا کۆتایی ئایەتەکانی خوێندەوە ئەمجا فەرموی: هەر کەسێ پابەند بێ پێیانەوە پاداشتی لای خودایە، کەسێك هەمووی جێبەجێ نەکردن و لێی کەم کردنەوە، خودا لە دونیا - پێی ڕشت و سزای دا، ئەوە تۆڵەو عیقابە، ئەگەر بۆ قیامەت بۆی هەڵگرت ئەوە کاری ئەو لای پەروەردگارە، بیەوێ سزای دەداو بیەوێ لێی خۆش دەبێ...

ئیبنومەسعود دەفەرموێ: کەسێك دەیەوێ سەیری ڕاسپاردە (وەسیەت)ەکانی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- بکا، ئەو وەسیەتنامەی تا لەدونیا دەرچوو لەسەریان بوو، بائەم ئایەتانەی قورئان (قل تعالوا أتل ماحرم ربكم) تا دەگاتە (تتقون) بخوێنێتەوە..

**لەم کتێبەدا**

سی و حەوت ووتاری ئامادەکراو دەخوێنیتەوە لە بوارەکانی عەقیدە و بیر و باوەڕو کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری لە ژێر ڕۆشنایی فەرموودەکانی قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

ژمارەی سپاردنی ( ٧٥٤ )ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ

چاپەمەنی سیما - سلێمانی - شەقامی مەولەوی

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر

چاپەمەنی سیما - سلێمانی